# کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان

بەرگی سێهەم

کەلیموللا تەوەحودی

وەرگێڕانی : عەدنان بەرزنجی

سلێمانی ٢٠٠٩

# کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان

وسینی: کەلیمولڵا تەوەححودی

ەرگێڕانی: عەدنان بەرزنجی

ابەت: مێژوویی

ۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولڕەحمان فەرەج

یراژ: ۱۰۰۰ دانە

رخ: ۷۵۰۰ دینار

مارەی سپاردن: ۱۹٤۹ ی ۲۰۰۹

ەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

اپی : یەکەم ساڵی ۲۰۰۹

وردستان -سلێمانی

**www.serdam.org**

ۆ پەیوەندیکردن بە زنجیرەی کتێبەوە: **kteb@serdam.org**



سەرچاوە/ حرکت تاریخی کرد به خراسان

مؤلف: کلیم الله توحدی(کانیمال) ، چاپ: سازمان چاپ مشهد، ناشر: مؤلف ، مشهد ۱۳۷۱ ایران

پێشکەش بە:

خـــوێنی پـــاکی شـــەهیـــدان و ئـــەســـیراز
پێـــشکەش بـــە خوێنـــدکاران و قوتابیـــان
مندالانی بێ سووچ و تاوانی میانە و تەورێـ
کە لە بۆمبای سەدام گیانیان لە دەست دا
لە بەفرانباری ١٣٦٥دا شەهید بوون.

# ناوەڕۆك

# پێشەکی وەرگێڕ

هەمیسان کۆچ، دەمکۆچێنێ و بەرەو باکووری خوراسان دەمبات تا بەشێکی تر لە بەڵگەکانی کوردانی ئەو دەڤەرە بێنمەوە سەر زمانی کوردی. واتا ئەو زمانە هەژارەی کە بە پێچەوانەی بەربلاوی و پاراوییەوە کەوتووەتە بەر شالاوی نەهامەتی زلهێزەکانەوە و لە مێژووی سەرانسەر ماتەمینی کورددا وەک تاپۆیێکی ڕەش دیارە، هەر چەند زۆربەی کەسان لە ڕابردوودا هەوڵیان بەقەوەت بووە بۆ ڕزگاری زبانی کوردی، وەک: ئەحمەدی خانی، نالی، حاجی قادری کۆیی، هەژار و... بەڵام نەبوونیَ دەسەڵاتی سیاسی بەردەوام ئازاری زۆری داوین و ئێستا لە سایەی حکوومەتی هەرێمی کوردستانی باشوورەوە زبانەکەشمان لە ساڵی ٢٠٠٨ کە بە ساڵی زمانی زگماکی لە دنیادا ناسرا، کۆدی پێی درا و هەموان وەک زبانێکی زیندوو دەیناسن و هەموومان گەشاینەوە.

خوێنەرانی ئازیز! پاش دەرچوونی بەرگی ١ و ٢ی «کۆچی مێژووی کورد بۆ خوراسان»، بە چەند هۆوە بەرگەکانی‌تری کەوتە درەنگ و قەزا، کە بڕێکیان بریتی بوون لە:

١- کێشەی خۆم و سەرقالیم بە کارانێکی‌تر و کتێبانێکی‌ترەوە کە دەرفەتێکی بۆ نەما بوو و ئەم کتێبەش زۆر بە حەجم بوو.

٢- وەرگێڕانی ئەم کتێبەم (بەرگی ٣ و ٤) وەکو ڕاهێنانێ دانا بۆ قوتابیەکانم لە بەشی کوردی زانستگای کوردستان و فێرگەی ڕاژە کە هەموان چاک دەزانن کاری قوتابی زۆر شپرزە و بەو بۆنەوە دووبارە لە سەرەتاوە بۆ دووەمین جار وەرمگێڕاوە کە هیوادارم ئێوەی خاون ڕا و ئەندێشە لێم ببوورن.

ئەم دوو بەرگە داگری زۆربەیەک بەڵگەی‌تری کوردەکانی خوراسانن لە سەردەمی قاجاڕ و پالەویدا و هەروەها باسی سەفەرنامەی ئەو کەسانەی دەکات کە هاتوونەتە کوردستانی خوراسان و بیروڕای خۆیانیان سەبارەت بەو خەڵک و ئاو و خاکە دەربڕیوە و هاوکات باسی بوومەلەرزەی قووچان و شەڕی کورد و تورکمان و

ئاماژە بە پاڵەوانێتی تاقمێک لە کوردان وەک ئەڵڵاوێردیخان، جەجووخان و... و ئاوڕدانەوە لە نامەی هەڤاڵانی نووسەر پاش چاپبوونی بەرگە پێشووکان کە تاقمێکیان بۆ خۆی بەڵگەیەگی گەورەیە لە ناساندنی فەرهەنگ و مێژووی ئەو دەڤەرە.

هیوادارم بتوانم لە کەمترین کاتدا بەرگەکانیتری ئەم کتێبە وەربگێڕمەوە سەر زبانی کوردی.

لە ئاکامدا لە هەمووی ئەو دۆستانەی یارمەتیان داوم بۆ چاپی ئەم کتێبە سپاس دەکەم کە بریتین لە: ڕەزا ئەسەدی، حەسەن سالحی، هەورامان بەهرامی، ڕۆژین یوونسی، مینا جەعفەری، نگین...، مووسا تەسبیحی، دلئارام ناسری، سامان شێخئیسماعیلی، سۆما بوزورگی، سادات ئیسماعیلی، ئارەزوو قادرمەزری، سیما بیورانی، فەرید ڕەزەوی، کوبرا واعیزی، گوڵباخ بەهرامی، سوەیلا سولتانی، شاهۆ حوسەینی و شەریفە سەلیمی. و هەروەها کاک ئاری عەبدی کە ئەرکی ڕازاندنەوەی ئەم کارەی بە ئەستۆ بووە.

هیوام سەرکەوتنی هەر مرۆڤێکی تێکۆشەرە

بە سپاسەوە

عەدنان بەرزنجی - پاییزی ٢٠٠٨ سنە
Adnansanandaj@yahoo.com

# پێشەکی نووسەری کتێب

چگونه شکر این نعمت گزارم
که زور مردم آزادي ندارم

سپاس بۆ خوای گەورە کە دووبارە ئیزنی ژیانی دامێ تا بتوانم بنووسم و لە خزمەتی فەرهەنگی ئێراندا بم.

زۆر سپاسی ئێوەی بەڕێز دەکەم کە یارمەتیتان داوم بۆ نووسینی ئەم بەرهەمە، بە تایبەت سپاسی ئەو کەسانەی دەکەم کە بۆ چاپی دووەمی ئەم کتێبە هاندەرم بوون. کەسانێ وەک: عەباس سولحدۆس و عەلی گورجی (مودیری کتێبخانەی پێشوو) کە بۆ بلاو کردنەوەی بەرگی دووەم و سێهەم تەقەلای زۆریان داوە.

ئێستا کە ١٢ ساڵ لە چاپی یەکەمی ئەم کتێبە تێپەڕیوە، ولاتمان تووشی ئالوگۆڕی زۆر هاتووە، بە تایبەت لەم دوو ساڵەی دواییەدا، بارودۆخ تووشی شێوانێکی باش بووە، هەر چەند من ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوی کێشەی زۆرم بۆ بە دی هات. کوشتنە زنجیرەییەکان لەم ساڵانەدا هەموو قەڵەمبەدەستێکی ترساندووە، بەلام قەڵەم بەدەست بێترس دێتە مەیدان و حوکمە ئازادی ئەوێ.

وەک لە چاپی یەکەمدا گوتم، مەبەست لە ژیان تەنیا خواردن و خواردنەوە و خەو نییە. ژیان گۆڕەپانی خەباتێکی گەورەیە.

«ژیان دارێکە پێی دەڵێن ئاوات    لە بەری ناخورێ بێ هەوڵ و خەبات»

ئێمە نابێ بە تێکشکانێک لە ناو بچین، و بە سەرکەوتنێکیش لەخۆ بایی ببین.

دەبێ دان بەو ڕاستیەشدا بنێم کە مێژووی ئێمەی کوردی خوراسان بە تایبەت ژیانی هونەریمان، لە بوارەکانی مۆسیقا و گۆرانی کاریگەرییێکی بەرزی لە سەرمان هەبووە. ئێمە ئاهەنگ و داستان و مەقامی زۆرمان هەیە کە کوردانەن، مۆسیقی و هونەرمان مێژوومانە و بە پێچەوانەشەوە مێژوومان هەر هونەرمانە.

ئاهەنگە عیرفانیەکانی دیوانە شێعرییەکەی جەعفەرقولی زەنگەڵی مەلەکوششوعەرای کورمانج و داستان و گۆرانیە پاڵەوانیەکان و پێدا هەڵگوتنەکان وەک: خەجی، ئەڵڵامەزارە، سەکینە، بۆمەلەرزەی قووچان، سەردار عەوەز، جەجووخان، ئەسیران (لێ یارێ)، ئاتامەرگان، شوجاعودەوڵە، خانی کەلمیشی (کەلیدەر) و... کە هەموویان باسی سەروەری فەرهەنگی کورد دەکەن. نووسەر بۆ کۆکردنەوە و نووسینی چەندین ساڵ ئازاری دیوە، هیوادارم ڕۆژێ بتوانم «مێژووی مۆسیقای ئێران» کۆ کەمەوە و بیخەمە بەر دەستی خۆینەرانی هێژا.

سپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی نووسەر و هونەرمەندانی بەڕێز موحەممەدڕەزا دەرویشی و موحەممەد نووریزاد و هەروەها فلیمی سپیدار کە سەبارەت بە جەجووخان بوو دەکەم. هیوادارم بۆ دروستکردنی فلیمی «ئاخرین بەرە» کە من خەریکی ڕازاندنەوەیم یارمەتیم بدەن.

ئێستا زۆر شانازی دەکەم کە توانیوومە بە پێچەوانەی ئەو هەموو ئازار و کێشەی هەبوومە ئەم بەرگەش لە چاپ بدەمەوە، هیوادارم خوێنەرەکانم بتوانن ئەم کتێبەش بکڕن و بیخوێنن بە پێچەوانەی نرخی باڵای کتێبەکان.

ئومێد ئەکەم بتوانم ساڵی داهاتوو لەگەڵ بەرگی ٦دا هەمیسان بەرگی ٣ لە چاپ بدەمەوە.

لە ئاکامدا سپاسی ژن و منداڵەکانم دەکەم کە کێشەی زۆرم بۆیان بەدی هێناوە، هەروەها سپاسی دوو زاواکەم حەمید موحەممەدی و مەسعوودی عەلینژاد و مەحموودی کوڕم دەکەم، بە مووچەی کارمەندیەوە بۆ چاپ زۆریان هەوڵ داوە. هەروەها لە هەموو کەسێ کە بە هەر جۆرێک توانیوویانە یارمەتیان کردووم، سپاس دەکەم و بە ئەم شێعرەی سەعدیەوە دوایی دەهێنم بە وتەکانم:

کنونت که امکان گفتار هست بگو ای دل برادر به لطف و خوشي
که فردا چو پیك اجل در رسد به حکم ضرورت زبان در کشي

مەشهەد، هاوینی ١٣٧٨ی هەتاوی

کەلیموڵڵاتەوەحودی

## شوێنی کوردەکانی خوراسان لە سەردەمی ناسرەدینشا

کوردەکانی خوراسان لە سەردەمی ئاشتی پارێزی ناسرەدین‌شاهەم وەکوو سەردەمەکانی ڕابردوو شوێن و بەها و پلەوپایەی مێژوویی خۆیانیان پاراستبوو،بەنیگاهێک بەدووهەمین سەفەری ناسرەدین‌شا بۆ خوراسان ئەم مەبەستەمان بۆ دەردەکەوێ. ڕەنگە برێک نارەزابن، چ پێویستیێک هەیە کە ئەم بابەتانە کە وەکوو سەفەرنامەی ناسرەدین‌شا بۆ خوراسان چاپو بڵاو بوەتەوە، لێرەشدا دەبێ بهێنرێت؟ بەڵام بە هۆی ئەوەی کە نووسەر بنەمای کاری خۆی لەسەر کۆکردنەوەی مێژوو، کولتوور، جوگرافیا و فولکلۆری کوردەکانی خوراسان داناوە، خۆی سوورە لەگێڕانەوەی ئەوە، چوونکە لەوانەیە ئەم سەفەرنامانە هەرکامیان بە شێوەیەکی جیاواز بەدەست خوێنەرانی کتیبەکانم کە لە ناو ودە رەوەی وڵات دان، گەیشتبێت و بە هۆی ئەوەوە لەگۆشەیەک لە مێژوو و کولتووری خۆیان بێهەوال بمێنن، یان لە ناسینی(ناسینەوەی) برێک لە خێڵە کوردەکان و شوێنی ژیانیان ئاگاداریان نەبێت. لەم ڕووەوە بەهەڵبژاردنێک لە نووسینەکەی ناسرەدین‌شا لە گەشتی بەهاری ١٣٠٠ بۆ خوراسان کە لە ڕێگەی شاهڕوود و چل‌دوختەرو چەمەن‌کاڵپووش لە خۆرئاوای بجنۆرد بەرەو ناوچەی خوراسان ڕۆیشتووە دەست بەکار ئەبین. ناسرەدین‌شا لە یارموحەممەدخانی سەهامووددەولەی ئیلخانی شادلوو و دەسەڵاتداری بجنورد وتورکمەن‌سەحرا بەم جۆرە ناو دەبات:

چووین تا گەیشتینە ملەیەک. مێرگی کاڵپووش دەرکەوت. لەوێوە گوڵە بەڕۆژەیان لێنا وچێشتی نیوەڕۆشمان خوارد. لە ناو گوڵە بەڕۆژەکەدا بەرەو چیمەنی کاڵپووش دووربینم خست. ڕەش‌ماڵە سپیەکانی هۆردووگە لە نێوان چیمەنی سەوز بە ناز و جوانی دیارەوە ئاشکرا بوو. یارموحەممەدخانی سەهامووددەولە دەسەڵاتداری بجنۆرد چەند ڕۆژێکە هاتووەتە ئێرە. ڕوکنوددەولە [برای ناسرەدین‌شا ودەسەڵاتداری خوراسان] ئەوی نارد کە سفرە برازێنێتەوە. سوارەی بجنۆردی و ڕیش‌سپیەکانی خێڵی تورکمانی گووگڵان کە بە ئەودا ڕاسپێردراون، هەمویانی

لەگەڵ خۆی هێناوە ناو مێرگە کە نیشتەجێ بوون. لە دوورەوە دیار بوون. دوای سەیر کردن چێشتی نیوەڕومان خوارد... [ناومێرگەی کالپووشدا]. مەجدەددەولە مریشکێکی زەنگۆلە باڵی گرتبوو، هێنای بۆمان. دواتر زەنگۆلە باڵێکی زۆر لە بەر دەم ئێمەوە هەڵقولان، منیش دوو زەنگۆلە باڵم پێکا. مریشکی زەنگۆلەباڵ لە جۆری هووبەرەیە کە لە زمانی فەرەنسیدا «ئوتار»ی پێ دەڵێن. مریشکێکی گەورەیە، پەڕی جوانی ڕەشوسپی هەیەولە کاتی فڕیندا چوونکە دەنگی زەنگ لە نێوان باڵیەوە دەردێت بەم چەشنە مریشکی زەنگۆلە باڵی پێدەڵێن. هەندێک کە لێخوڕاین سەهامووددەولە، سوارەکانی بجنۆردی کە زیاتر لە شەشسەد نەفەر بوون هێنایە سەر ڕێگا، سەفیان بەستبوو، سەهامووددەولەش خۆی لەسەر پێ وەستابوو. هەموویان ئامادە بوون و هاتن. تورکمەنەکانی گووگلان و سەرشناسەکان و ڕیشسپیەکانی ئەوانیش لە هەر خێڵێکی هاتبوون.

**شەممە هەشتی ڕەمەزانی ١٣٠٠:** ئەمڕۆ لە کالپووش ڕاوەستاین. چێشتی نیوەڕۆمان لە ماڵ خوارد، دوای خواردنی نیوەڕۆ یارموحەممەدخانی سەهامووددەولە تورکمەنەکانی گووگلان و ڕیش سپییەکانی شادلووی ئامادە کرد. ساعێدەددەولەش بانگەواز کراوبڕێک فەرمان وبڕیاری پێویست لە کارەکەی ئەوان‌دا درا، پێنج ساعەتی مابوو بە خۆرئاوا سوار بوین و چوینە سەیران. لای ڕۆژهەڵاتی کالپووش کێوێکی نەرم هەبوو لایێکی دارستان بوو. میرئاخوڕ مەجدەددەولە چەند کەس لە سوارەکانی شادلووی بردە ژوورەوە، دارستانەکەیان خاوێن کرد، چەند بەراز لەگەڵ منداڵەکانیان دەرهاتن، دوو مێ بەرازی گەورەش هاتنە خوارەوە بەرەودەشت چوون. بڕێک بە دووربین دەوروبەرمان سەیر کرد. لە لایەن ڕۆژهەڵاتەوە مێرگێکی وشکی بێئاو دیار بووکە مێرگی دانیالی[1] پێ دەگوترا. ئەمیر ئەسلانخان کوڕی ئەفراسیاوخانی دەسەڵاتداری نەردین دەیگوت گۆڕی دانیالیش لەوێیە و جێ

---

[1]- قەبری دانیالی نەبیش لە خووزستانە، هەروەها قەبری ئەیووبی پەیغەمبەریشمان هەیە. دەگوترێ ئەم دانیالی نەبیە، گۆڕی دارای (داریووشی) سێهەمە کە لە شەڕ لەگەڵ ئەسکەندەری ڕوومی شەڕی کردبوو و لێرەدا کوژرا. دوای زاڵ بوونی عەرەبەکان، لە بەر ئەوەی ئەم جۆرە گۆڕانە لە زیان بە دوور بن بە یەکێ لە پێغەمبەرەکان ناویانیان ناوە، وەها کە گۆڕی کوورش بە گۆڕی دایکی سلێمان ناسرا.

زیارەتی خەڵکی ئەم ناوچەیە و باوەڕێکی تەواویان هەیە. بە دووربین لە ناو مێرگـەی دانیال‌دا چەند کەری کێویمان چاو پـێ کـەوت. پۆڕەکـان هێنـدە لـەوێ زۆرە کـە ئەتوانی هەزار دانە ڕاوکەی.

**یەکشەمە نۆی ڕەمەزان:** دۆینێ شەو هەور و تەمێکی زۆر هاتە سەر و کاتێـک کە خەوتین دەستی کرد بە باران و تا بەیانی باری. بەیانی لە خـەو هەڵـساین دوای یەک دوو ساعەت سوار بووین و لێخوڕاین.

لێرەوە ڕێگەیەکی بۆ بجنۆرد هەیە کـە لـە دەشـت و ئـارموتلی تێپـەر دەبـێ و ڕیەکەیشی دوومال بە بجنۆرد نزیکترە. هەموو شـوێنێکی ئـاوای هەیـە و ماڵـەکانی نزیکترن. بە پێچەوانەی ڕێـی جـاجروم و هتـد، ماڵـەکانی ڕێـی بـەم جۆرەیـە: لـە کاڵپووش بۆ دەشت زۆرتر لە چوار فرسەخە. قەرقاول و ئاوی هەیـە. لـە دەشـت بـۆ ڕوباتی قەرەگەز چوار فرسەخە، قەرقاول و ئاوی هەیە. لە ڕوباتی قەرەگەز بـۆ ڕوبـاتی عەشق چوار فرسەخە، ئاویشی هەیـە. لـە ڕوبـاتی عەشـق هـەتا چواربیـدیش چـوار فرسەخەو ئاویشی هەیە.

**دووشەممە دەی ڕەمەزان:** دۆینـێ شـەو بـڕیارمان دابـوو کـە ئەمـڕۆ بـۆ ڕاوی قەرقاول بڕوین بۆ دەشت. یار موحەممەدخانی سەهامووددەولـە و [ئـەمیر ئەسـلان] کوڕی ئەفراسیاوخان ئەیانوت زۆرتر لە سێ فرسەخ ڕێی نییە. بەیانی دوو ساعەت بـە خـۆر هـەلاتی مـابوو لـە خەوهەڵـساین، و سـوار بـووین، لەگـەڵ سەهامووددەولـە و ساعێدەددەولە [دەسەلاتداری ئەستەرئاباد] لەگەڵ سێسەد چوارسـەد سـواردا سـوار بوین و چوین.

**سێشەممە یانزەی ڕەمەزان:** ئەمڕو پێویستە لە کاڵپووش بـۆ نـەردین بـڕوین. بەیانی ڕۆیشتین. ئاغاکان و ڕیش‌سپیە تورکمەنەکانی گووگلان کە جل و بـەرگیان لە بەر کردبوو، لە بەر درگەی هێوانەکە وەستابوون هاتنـە پێـشەوە. دوای بینینیـان بەرەو ڕۆژئاوا چوین. هەموو شوێنێک سەرسەوز، پـڕ لـە گوڵـی جۆراوجـۆر و لـە نـاو ڕێگەدا ئالفێ زۆر بوو، بە شێوەیەک کە تا سینەی ئەسپەکەی دائەپۆشاند. گەیـشتین بە قەو پاڵی تەپۆلکەکە کە یەکجار لەژێرەوە ئاسکێکی گەورە پەیدا بوو کـە بـە لای ئێمە و سوارەکانی ژوورەوە ڕابرد. لە ئەسپ دابەزین پێنج شـەش گوللـەمان تەقانـد، چونکە زۆر دوور بوو نەی پێکا.

**ناوی خێڵەکانی تورکمەنەکانی گووگڵان بەم جۆرەیە:**

غایی، قەرەباڵخان، قەرخ، نیقاق، سەنکریک، ئای دەروێش، چاقدبیگدلی، بایەندر، توختمێش، ئەرکەکلو، عەرەب، کەرکز (مەفدووم قولی - شاعری تورکمەن- هەر لەم خێڵی کەرکز یان گرگزەیە).

**سنووری چوار لایەنی گووگڵانی گورگان نشین بەم جۆرەیە:**

ڕۆژهەڵات لکاوە بە بیابان و دەشت کە لە ڕووباری گورگان سەرچاوە دەگرێ و ئێستا چۆڵە و دەبێ سەهامووددەولە ئاوەدانی کاتەوە. بیابانی سووقەوسەمەڵقان؛ باشوور: لە سەر سنووری کاڵپووش و کۆساری فەرەنگ و فارسیان.

ڕۆژئاوا: نەگەیشتووە بە بیابانی گومەزی قابووس و ئاقی سەوز.

باکوور: لکاوە بە ڕووباری ئەترەک و چناران.

بە کورتی چوار ساعەتی ماوە بە ڕۆژئاوا بە داخەوە سواربووین، چونکە لێرە کە ڕەشماڵمان هەڵدا یەکێک لە بەشەکانی بەهەشتە و لە جیهان‌دا شوێنێکی وا پەیدا نابێت. چوین تا گەیشتین بە شاری نەردین. ئەمسال چوار پێنج ڕۆژ بەر لە نەورۆز لێرەدا بوومەلەرزەیێکی توند هاتبوو، قەڵای نەردینی ڕووخاندبوو.

**چوارشەممە دوانزەی ڕەمەزان:** ئەمڕۆ دەبێ بڕوین بۆ دۆڵ. ڕێگەیەکی حەوت فرسەخی تەواوە و هەموو شوێنێکی بیابانە و گەرم و بێ‌ئاوە. بیابانێکی وشکە کە یەک دڵۆپ ئاو پەیدا نابێت، یەک فرسەخ کە چوین لە بان تەپۆڵکەیەکەوە بۆ چێشتی نیوەڕۆ وەستاین. دوای چێشت خواردن سواری کالیسکە بوین. بەرەوماڵ چوین. سەهامووددەولە ئەسپێکی بەستبوو بە دورەشکەوە، ئاویان لێ بار کردووە و گاریچی جل‌وبەرگی سپی لە بەر کردبوو، بە شێوەی نیزامی ئاویان ئەدا بە خەڵک. یەک فرسەخ کە لە شوێنی چێشت خواردن دوورەوە بووین حەوزەوێرانێ لەکۆنەوە لێرە بووە کە سەهامووددەولە لە سەر چاوکەکەوە چاڵێکی هەڵکەندبوو و ڕەشماڵێکی لێ دابوو و حەوزچەیێکی مسی دروست کردبوو، سەقا ڕاوەستاوە و بەردەوام لە ئاوی چاڵەکەی ئەکێشا بان و ئەیڕژانە ناوی. میوەی زۆری لە دەور حەوزچەکەدا دروست کردبوو و ئەیاندا بە خەڵک.

**ڕۆژی پێنجشەممە سێزدەی ڕەمەزان:** دەبێ لە دۆڵەوە بڕوین بۆ جاجروم.

**ڕۆژی هەینی چواردەهەم:** ئەمڕۆ لە جاجروم وچان درا. هەوای جاجروم گەرمە

و بایێکی قورسی هەیە کە زۆرجار هەڵ ئەکات.

**ڕۆژی شەممە پازدەهەم:** ئەمڕۆ پێویستە بڕوین بۆ چوارده سنخاس. حەوت ساعەت بە ڕێگەدا چوین تا گەیشتین. ئاخر ئەم مێرگ و کێوانە سەر بە جوێن، پاتەختی جوێن یا ئاغانشینی ئەوێ «چەغتایە». هۆزی کوردی کەیوانلووش هەر لەوێن.

**یەکشەممە شازدەهەم:** ئەمڕۆ لەماڵی سەنخاس‌وچان‌درا. دوای نیوەڕۆ و پاش خواردنی عەسرانە بەرەوماڵ چوین. سەهامووددەولەش ئەمڕۆ لە گشت شوێنێکدا لەگەڵماندا بوو.

**دووشەممە حەڤدەهەم:** ئەمڕۆ دەبی بڕوین بۆ چواربید. چوار فرسەخ ڕێگایە. هەندێک کە بەرەو ژوور ڕویشتین گڵکۆی قسنێک لەسەر تەپۆلکەیێک‌دا بوو. وتیان قسنی ئیبرایم برای حەزرەتی ڕەزا و کوڕی مووسای کوڕی جافرە. سواری کالیسکە بووین و گەیشتین بە مێرگی شۆغان و ڕوبات عەشق. لەڕاستی‌دا ئەم مێرگە دەبێ مێرگی تەوەری پێ بگوترێ. بەو بۆنەی کە تەوەر لە قەد پاڵی کێوەکەیە. ئەم مێرگە شوێنی دانیشتن و ماڵی هوزەکانی شادلووە کە ڕەش ماڵیان هەڵداوە و ژین‌وڕایەتی دەکەن. گوندەکان زۆر بووگن و ئیستاش خەریکی ئاوەدانین [لەمەو دوایە کە هۆزەکانی شادلوو دەسیان لە ڕەشماڵ‌نشینی کێشاوە و دەبنە کەلاوەنشین]. لە کێوەکە تێپەڕین بە گۆندێکی چکۆلەی‌تر گەیشتین کە سەهامووددەولە تازە ئاوەدانی کردبوو، لە پێش‌دا گوندێکی ڕووخاو بوو کە «هندانە خراپەی» پێ دەگوترا، ئیستاکە ئاوەدان کراوە نێوی «حەمە ئاوایە». یارحەمەخانی سەهامووددەولە کوڕی یەزدان قولی‌خانە کە مردووە. یا نە لە کاتی دەسەلاتداری نوسرەتوددەولە لە فارس‌دا بەرەو شیرازیان ناردووە، تاکوو لەوێ‌دا عەمری خوای کرد، یەزدان قولیخان برای حەیدەر قولیخان و جافر قولیخان خوالێخۆشبوو بوو کە سەهامووددەولە دەبێتە برازای ئەوان.

**گوندەکانی سەر ڕێگای ئەمڕۆمان بریتین لە:**

١- پاشماوەی تیرەکانی کەیوانلوو لە دەوروبەری ڕادکان نیشتەجێن و دەسەڵاتداری ڕادکان لە دەورەی ناسرەدین‌شا، خانەکانی کەیوانلوو بوون. کەیوانلووەکانی جوێن ٤٥٠ بنەماڵەن.

٢- قسنێک بەم دیاردانەوە لە قووچان، یەکێکیش لە سیرجانی کرمان و چەند دانەی تریش بەم نێوە و ڕەسمەوە لە ئازەربایجان و مازەندەرانەوە هەن. پێش لە شۆڕشی ئیسلامی تابلۆی قسنی قووچان« السلطان ابراهيم بن علي موسي الرضا» سوڵتان ئیبرایم کوڕی عەلی کوڕی مووسای ڕەزا بوو و لە کەتیبەکەیشی بەهێڵی سیاح کە لە کاتی ئەمیر حوسەین‌خان نووسرابوو، هاتووە: لە دایک بووی شای خوراسان «قرەالعین بتول». پاش شۆڕش بە سوڵتان ئیبرایم برای ئیمام ڕەزا گۆڕا؛ بەڵام خوالێخۆشبوو شێخ عەبباسی قومی ئەیگێڕێتەوە: کە ئیبرایم برای ئیمام ڕەزا لە یەمەن لە لایەن مەئموونی عەبباسییەوە بە میری گەیشت، پاشان لەوێ ڕاپەڕی و دوایی دیل‌کرا و دواتر لە بەغدا عەمری خوای کرد و گۆڕەکەیشی لە گۆڕستانی قوڕەیش لای باوکی نێژرا.

لە دەربەند بەرەوئەولا، کووەشۆقان، بامی، پشتبان، چەپە، چەغدی، دووبورجەشۆغان، حەسار ئیسماعیل، کوتلی لە ڕۆژهەڵاتی چاربیدەیە لەسەر ڕێی تەوەر. حەمە ئاوا کە تازە ئاوەدان کراوەتەوە و لە لای دەستی ڕاستی بەرزانلووەوەیە. [واتا چەند تیرە لەکوردەکانی بارزانی]

**سێشەممە هەژدەهەم:** ئەمڕۆ دەبی بڕوین بۆ فیرووزە، ڕێی چوار فرسەخە. واتا ئەو ڕێگایە کە هەژدە ساڵ پێش [هەڵبەت شانزە ساڵ پێش یانێ لە ساڵی١٢٨٤ مانگی] لە چوار بیدەوە ڕۆیشتین بۆ فیرووزە، چوار فرسەخ بوو، بەڵام ئەمساڵ سەهامودەوڵە نێو دۆڵ ودەشتەکانی لای چەپەوە کالیسکە ڕێیەکی تازەی درووست کردووە. دووفرسەخ دوورتر بووەتەوە. لای چەپی قەراخی دۆڵەکەوە قەلاییکی چکۆلەیە ناسراوە بەشیرین سوو. چەند خێزانێک لەوێ‌دان (لە کوردەکانی شادلوو)، ئێرە زووتر گوند نەبوە. شانزە ساڵ لەمەوبەر حەیدەر قولیخانی سەهامودەوڵەی خوالێخۆشبوو [کوڕی یار حەمەخان] ئاوەدانی کردەوە و ئیستا

یۆسۆ بەگی شادلوو لەم قەڵایەدایە. ڕێگای کالیسکە لەهەموو شوێنێک چاک و
بێعەیب بوو. کالیسکە بە ڕاحەتی دەڕۆیشت. هەندێک تر کە چوین [وا دەرکەوت
ڕوکنوددەولە لەگەڵ گەورەکانی خوراسان لە مەشهەدەوە بۆ پێشواز هاتبوون].
کەسانێک کە لەگەڵ ڕوکنوددەولە لە مەشهەدەوە هاتبوون بریتین لە: یەلەنگ
تووش‌خان دەسەڵاتداری[جەلایر]، دەسەڵاتداری کەلات، دەروێش عەلی‌خانی
خوافی دەسەڵاتداری خواف، میرزا عەلی کوڕی موستەشارولموڵک، ئەڵلا یارخان
دەسەڵاتداری پێشووی دەرەگەز. سەد کەس سوارەی هەزارەیی [خوافی] و سەد
کەسی تریش سوارە [کورد] کەلاتی کە لەگەڵ ڕوکنوددەولە هاتوون و بە سەف
ڕاوەستابوون.شاخەکانی کێوی سەهلووک [لەم شوێنە] کە هەموو جێگایەک بەرەو
ڕۆژهەلات کێشراوە. ئەو لای کێو بەشی‌خاکی ئەسفەراینە و ئەم لایشی بەشی
شادلووە. لە ڕەختیان ڕابردین لای دەستی ڕاست بڕێک گوندی‌تریش هەیە. وەکو
حەسار و نیستانە و گریوان. ئەمڕۆ زوورتر لە گوند [فیرووزە] ٢٠ کەس لە
کوردەکانی شادلوو هاتبوونە پێشوازی. [ئەمانە ئەویندارەکان یانێ مۆسیقاژەنەکانی
خێڵی شادلوو بوون]. دەهۆڵگەلێکی نامۆیان بوو وەکوو تەپڵە گەورەکانی قەزاقەکان
زوڕنایشیان هەبوو. زۆر جوانیان لێ ئەدا. وەکوو ئەو چیچانیانە کە لە قەفقا
دیبوومان. [جێگای سەرەتایی کوردەکانی شادلوو بەرلە سەفەوییە هەرقەفقاز بوو]
شتێک لەمانە کە زۆر پێکەنینی بوو، ئەوە بوو کە پیاوەگەورە ڕیش‌سپیەکان
سەرمەقولانجیان لێ ئەدا. [لەوانەیە سەرمەقولانج بردن بەڕای ناسرەدین‌شا لە
ڕیش‌سپیەکان جێ سەر سووڕمان بێت، بەڵام ئەمەیشی ئەویندارانە زانیوە و گەورە
بچووک و پیر و لاو و ژن و پیاو، هەمویان جوان سەمادەکەن وسەرمەقولانجیان
ئەدا] بە کورتی ئوردووگای ئێمەیان دوای باخەکانی گوندی فیرووزە لێ داوە
خێڵەکانی شادلوو کە لە سەر ڕێگادا یەیلاق دەکەن خێڵی خەمپرانلوو و خێڵی
دیرانلوو بوون. نەسەبی شادلوو دیرانلوویە، [کە دراوە پاڵی ناوچەیێک لە باشووری
قەفقاز. هۆی سەرەکی ئەوە کە کوردەکانی شادلوو زۆرتر لەگەڵ زمانی تورکی دۆستر
بوون و بەوە قسە ئەکەن، هەرئەم پێشینە مێژوویەی ئەوانە لە قەفقاز کە لەگەڵ
خێڵی تورکی قاجاڕ و عوسمانی هاوسێ بوون]

**ڕۆژی چوارشەممە نۆزدەی مانگی ڕەمەزان:** یەک سەعات لە دەستە گوزەرابوو، لە خەو هەستاین؛ ئەمڕۆ دەبێ بڕوین بۆ بجنۆرد. ڕێگا دوو فرسەخە. سواری ئەسپ بوین و چوین. لەم دوو فرسەخ ڕێگا بەرەو بجنۆرد هەمووی ئاوایی و دێهات و باخاتە و زەراحەت و ئاوایی پێکەوەن. هەموو باخە دیاری کراوەکان پڕ لە دار و هەمووی ئەم زەراحەت و ئاواییانە لە ڕووباری عەینولەتیف لەگەڵ کانیەکانیتریش لەوێ سەرچاوە ئەگرن. بەهەوەل گوندێ کە گەیشتین نێوی ئەرک موحەممەدخانە. پاشان دێهات لەبان دێهات و ئاوایی لەسەر ئاوایی [هەمووی جیگایێ ئاوەدانیە] جگە لە بجنۆرد، یەک فرسەخ کە ڕۆیشتین سەهامووددەوڵە فەرمووی لای دەستی ڕاستەوە کانیەکی جوان هەیە بۆ خواردنی چێشت (نیوەڕۆ) بڕوین بۆ ئەوێ، سەهامووددەوڵە لەگەڵ ئەمین حەزرەت زووتر ناردمان بۆ ئەوێ تا بڕۆن گوڵەبەڕۆژە لێبنن. خۆیشمان پاشان گەیشتینە کانیەکە، بەڕاستی کانی وجێگایەکی خۆش بوو. تەختە بەردێک بوو وەکو کانیعەلی تاران. لە ژێر بەردەکە و دەورووبەریا ئاوێکی ساف و سووکی لێ دەرئەهات، ماسیشی هەبوو، شەش حەوت چناری کۆنەی گەورەی پیر لە دەورووبەری کانیەکە سێبەری خستبوو. گومەزێکیش هەبوو کە تەواو ڕوخابوو هەر ئاوگردی ژێرەکەی مابوو و دیار بوو کە ئەوێ ناوبانگی پێش قارداشە. یانێ پێنج برای کوردەکانی شادلوو. دانیشتوانی ئەم شوێنانە بڕوای زۆریان بەم پێنج برا هەیە. بە سەهامووددەوڵە فەرمان درا گومەزێکی تازە لەسەر گۆڕی ئەواندا هەمیسان دروست بکات. نانمان خوارد. دوای نان دوو کوڕی سەهامووددەوڵەیان هێنا. تەمەنی یەکێکیان ۱۰، ۱۱ ساڵ بوو، ئەویتریشیان ۸ ۹ ساڵ. نێوی کوڕی گەورەی، نەسرەتوڵڵاخان و کوڕی چکۆڵەی سلێمانخان بوو. پاشان سوار بوین دیسان لە ڕێگای دەستی ڕاستەوە کە کالیسکە ناچێت بە ئەسپ چوین و هەروەها باخ و ئاواییەکان پێکەوە لکابوون. [لە ڕۆژگاری جافر قولیخانی سەهامووددەوڵە براکەی حەیدەر قولیخان و هەروەها لە دەورەی یارموحەممەدخان تا کۆتایی دەورەی سەردار موعەزز شاری بجنۆرد بە تایبەت ئەو شارە خۆی هەموو کاتێک بەرەو سەرکەوتن چووە، سەرسەوزی باخات و زەراحات کە شا باسی لێ ئەکات، شایەتی ئەم داواکاریەیە کە ئیلخانەکانی شادلوو سەرنجێکی تایبەتیان بە حاڵی ژیانی خەڵک و ئاواییەکانی ئەو ناوچە بووە]. نیو فرسەخ بە ماڵ مابوو لە پێشەوە سەفی سوارەی

جنراڵ کە مارۆڤ قارەمانی ڕووس دەسەڵاتداری ئاخاڵ لەگەڵ سوارەکانی خۆی هاتبوو، گەیشتە لامان. پیاوێکە کورتە باڵا، ڕیشێکی زۆری هەیە. وەرگێڕانەکەی یەحیا بەگە کە لە لایەن دەوڵەتی ڕووسەوە لە بجنۆرد بەرەو شەهبەندەری دەچێت. [ئەم یەحیا بەگە بۆ ڕووسەکان لەم ناوچەدا، بە تایبەت لە ناو تورکمەنەکاندا هاتوچووی هەبوو، زانیارییەکانی خۆی بە ڕووسیا ڕاپۆرت ئەدا] بە قەی سەد سوارەیش لە سوارەکانی قەزاقی ڕووسی هاوڕێ سەردار (قارەمان) بوون. لەوان گوزەراین گەیشتین بە سوارەکانی تورکمان کە قارەمان، مەشازولئیلەی لەگەڵ خۆی هێنابوو، یانێ بەقەی پەنجا کەس بوون. لەگەڵ قارەمانا (سەردارا) خۆشمان ڕابوارد. دوایی ڕاپورتێکی دەرهێنا و پێشکەشی کرد و دوای ئەوە مۆڵەتی پێ درا کە لە دواوە بێت. خەڵکی شار لەسەر ڕێگادا وەستابوون. شار بەقەی دە هەزار کەس بە چاو ئەهاتن. هەروا کە چوین لەبەر شار و دەروازەی بجنۆرد ئەگوزەراین. قەڵاو کۆشکی دەورووبەری شار هەر ئەو قەڵایەیە کە پاشانیش هەر بووە. لە شار کاتی خۆرئاوا چوین هەتا شەقامێک کە سەهامووددەولە تازە درووسی کردبوو، وەکوو شەقامی سەڵتەنەت ئاوایە (تاران) ڕۆیشتین. ئێرە ڕێگا بەرەو باشوور بوو. شەقامەکە دەڕوات تا ئەو باخەکە سەهامووددەولە تازە درووستی کردبوو و ماڵی ئەمڕۆی ئێمەیە، شەقامێکی زۆر باشە. سوارەکانیش تا گەیشتین بە ئالاقاپوو [عالیقاپوو] کە لە بەر باخ لێیان دابوو. لەوێ دابەزین و ڕۆیشتینە ناو باخەکە. باخێکی زۆر باشە، حەوزێکی زۆر باشی هەیە. حاڵ و وەزعێکی زۆر باشیان درووست کردووە.[٢] باخەکە پلیکانییە و پلیکانی زۆری بوو. حەوزگەلێکی چکۆلەی زۆر لە ژێر ڕێزەی هەوەڵەوە هەیەتی. کلاوێکی فەرەنگی لە بان حەوزی گەورەوە درووستیان کردووە بە شێوەی پێچاوپێچە. چوارپایە (بڕبڕە) دەخوات. میچی حەوزخانەکە هەمووی تەختەو سپی کارییە. ئەم حەوزە و فوارە سەفایێکی زۆری هەیە. ئەم باخە ئەو باخە نییە کە سەفەری پێشوو هاتبوین، ئەو باخە هەروا ماوەتەوە و درووستیان کردووە و زۆر باخێکی خۆشە و ئێستاش ڕوکنوددەولە لەوێ دانیشتووە، بەڵام ئەم باخە

---

٢- ڕەسمی بیش قارداش لە بەرگی دووهەم لاپەڕەی ٤٧٨ کێشراوە و ئیستا کەلاوەکەی بە هۆکاری دوکتور ئەمانوللای شادلوو کوڕەزای یان کچەزای سەردار موعەزز لەبارودۆخی درووست بوونە.

پەیوەندییێکی بە باخە کۆنەکەوە نییە. باخە کۆنەکە خوالێخۆشبوو حەیدەر قولیخان سەهامووددەولە درووستی کردبوو. ئەم باخەیشە (باخە تازەکە) یار موحەممەدخانی سەهامووددەولە ئێستا درووستی کردووە. دار سێوە کۆنەکانی پڕ بارن کە ئێستا لێرەدا هەوەڵی سێوە و وەختی زۆر بوونی سێوەکانە، سێوی جوانی هەیە. مێوە باشەکان لە بجنۆرد زۆرن. دارەکانی قەیسی ئیرە شتێکی سەیرە. لەهیچ کوێ داری قەیسی وا نەبیندراوە، بەقەد دارە گوێزەکان کۆنن. بەڕاستی سەیر کردنیان هەیە. ئەم ئاوە کە لەم فوارە دێتە دەر و لە ئاوی ڕووباری عەینوللەتیفە، کەمێک ئاوەکەی قوڕئاویە. ئەو گوندانەی کە ئەمڕۆ لە سەر ڕێگا دیمان بریتین لە: ئەرکی موحەممەدخان، زەراحەتی شاپەسەن بەرانبەری بیش‌قارداشە، قەڵای ئەڵڵاوێردیخان کە گوندێکی ناسراوە و باخاتێکی زۆریشی هەیە. مەهتان کە لای ڕاستی شەقامبڕەوەیە و بەڵام بڕێک دوورە، باخاتێکی زۆریشی هەبوو. ئاوێکی زۆر باشی بوو کە ئاوە پیسەکەی ئەڕواتە ناو ڕووباری عەینوللەتیفەوە، خێڵی غەمپرانلوو لەوێدا نیشتەجێ بوون و خێڵی دیرانلوو لە ئەرکی موحەممەدخان دادەنیشتن. زەوی حەڵقەسەنگ، قەڵای عەزیز گوندێکی ناسراوە ونزی کە بە شار. حەوشەی شیرعەلیبەگ هەر ئەم باخ و ئاوایییە کە ئێمە لەوێ دانیشتوین. هەوای بجنۆرد خۆشەو(نە سەردە و نە گەرم) وەکوو هەوای شەمیرانە، ئێلاخی زۆر چاکە. [لەو بوارەوە لە شەمیران چاکترە][٣]. ڕۆژانی پێنج شەممە و هەینی ٢٠و٢١ مانگی ڕەمەزان بە ئیشی دەوڵەتی خەریک بوون.

**شەممە ٢٢:** بەیانی ئەمڕو سێ ساعەت گوزەراوە بە مەبەستی ڕۆیشتن بۆ عەلی ئاوا، سوار بوین کە باخێکە لە سازەکانی سەهامووددەولە [حەیدەر قولیخان] و هەژدە ساڵ پێش کە هاتبوین بۆ ئێرە، هەر هاتین بۆ ئەم باخە. باخێکی خۆشە و کڵاوی فەرەنگی زۆر چاکی هەیە. وەختێ سوارکاری ڕوکنوددەولە و موستەشارولمولک و

---

٣- دیرانلووەکان کە بنەڕەتی خێڵی شادلوون، ئەم کاتە لە شاری بجنوورد و گوندەکانی نەجەف ئاوا [لە پاشماوەی نەجەف عەلی خانی شادلوو لە نزیک قوردانلوو]، و لە قەڵای مەموودەرمانە و لە قەرە جەنگەڵ و بڕێکیش لە کەلاتەی نەقد و هەروەها لە ئەسفەراین لە دێیەکانی حەسار وچوار بورج نیشتەجێ بوون.
لە یاداشتەکانی ئاغەی کیان ڕەببانی دیرانلوو.

سەهامووددەوڵە و میرزا موحەممەد قولیجێگری وەزارەت کە لە بجنۆرد دایە لە بەر تەجیر ڕاوەستابوون کە بڕیک کاریان پێ کرا. دوای برێ قسەکردن سواری کالیسکە بوین، هەموو جێگەیێک لە شەقامە تازەکەی هەر ئەم باخە کە دانیشتبوین چوین، لە شەقام ڕوێشتینە دەرەوە و لە تەنیشت شارەکە لە درگای تەلارە تازەکان کە ئیلخانی سەهامووددەوڵە سازی کردبوو گوزەراین، بە لای باکووری بجنۆردا ڕوێشتین [مەبەست شەقامی ئێستای هۆڵی ئاوێنەی سەرداره (قارەمانج)] عەلیئاوا لە لای باکووری بجنۆردەوەیە. لە ئوردووگا تا عەلیئاوا یەک فرسەخە. ژووری شار ڕووبەڕووی عەلیئاوا چیمەنێکە کە ئێستا ئالفەکەیان خواردووە. خێڵی شادلوو لە ناو ئەوٚ چیمەنەدا ڕەشماڵیان لێ دابوو، ماڵیان هەیە و نزیک بە هەشتسەد خێزان [ڕەشماڵنشین] دەبن. ئەم خێڵانە لە زستاندا لە گوندەکانی دەوروبەری بجنۆرد نیشتەجێ ئەبن و هاوینەکانی هەر بەم چیمەن و دەشتانەدا دێن و دەچن، ڕەشماڵ لێ ئەدەن. ئەمانە لای باکووری بجنۆرد کە هەر ئەو عەلیئاوایە ماڵیان هەیە لە خێڵی یەقانلوون (بوقانلوو) لە لای خۆرئاوای بجنۆرد جێگای خێڵی ئاماژە پێ کراوی عەبدئاوایە کە گەرمیانە و لە خۆرهەڵاتیانەوە، خانبلاغ و باغجقەیە. بە کورتی هەموو جێگەیێک ڕوێشتین تا گەیشتین بە عەلیئاوا. عەلیئاوا و باخ و کلاو فەرەنگی هەر بەو حاڵە ماوە کە لە سەفەری پێشوودا دیبوومان، بە سەهامووددەوڵە فەرمان درا کە دەستکاریەکی باشی باخ و دیوارەکان و عەمارەتەکەی بکات.

**یەکشەممە ٢٣:** ئەمڕۆ لە ماڵ ماینەوە تا عەسر بە ئیش کردن گوزەرا. حوسەینعەلی خان، دەسەڵاتداری ئەسفەراین کە بانگمان کردبوو هاتە لامان چۆنکە خەلکی ئەسفەراین لە ئەو ناڕازی بوون، بە ڕوکنوددەولەمان گوت،تا لای ببات. ئەمشەو عەزدەلمولک ژنراڵ کەماروٚڤ دەسەلاتداری ئاخاڵ لە لایەن دەولەت بۆ مێوانی بانگهێشت کراوە، شەو هەموو خاوەن پوستەکانی ڕووس وئێرانیەکان لە سەر نانی ئێوارە ئامادە بوون و زۆر بە بانگهێشت کراوەکان خۆش گوزەرا بوو.

**دووشەممە ٢٤:** ئەمڕو چێشتی نیوەڕۆمان لە ماڵ خوارد. پێنج ساعەت بە ئێوارەی دەمێنێ دەبێ بڕۆین بۆ شار بۆ ماڵی سەهامووددەولە تا چایی و عەسرانە بخۆین و لەوێ بروین بۆ ئوردووگای عەسکەری کە لە چیمەنی پشت شار لێیان داوە. ژنراڵ کەمارۆڤ دەسەلاتداری ئاخاڵ و خاوەن پوستەکانی ڕووس بۆ سان و

ڕاهێنانی سپا ئەهاتن. لە درگای ئالاقاپوو سوار بوین و هەر لەو شەقامەوە بەرەو شار چوین. دوایی شار [نەخۆشخانەی ئێستای بجنۆرد] ماڵی سەهاموودەوڵەیە. دیواخانەیەکی زۆر جوانی هەیە. حەوزێکی درێژ و زۆر خوش و خاس لە نێوان ماڵەکەدایە. حەوزخانەیەکی زۆر خۆشیان هەیە. جۆگەی تایبەتیشی هەیە کە لەو حەوزەدا بە قەد دوو سێ بەرد [ئاشگەڕ] ئاوی خاوێن دێتە دەر و لەنێو حەوزخانەکەیش حەوزێکی جوانی هەیە کە ئاوێکی خاوێنی زۆر باش بە نەرمی لە ناویا هەڵئەقوڵێ. هەمووی زەوی و حەوز وحەوزخانە وحەوزە درێژە گەورەکە لە بەردی مەڕمەڕە. ژوورگەلێک کە بەرەو حەوزخانەکان دەڕوانن. حەمامێکی چکۆلەی باشی مەڕمەڕیشی هەیە. لە نێو بجنۆردا کانزای بەردی مەڕمەڕی هەیە، بەڵام مەڕمەڕەکانی بە جوانی و خاسی مەڕمەڕەکانی کانزاکانیتر نییە. بەحەق سەهامووددەوڵە عەمارەت و حەوزخانە و باخچەکانی بە تەواوی حەز درووستی کردووە.

**سێشەممە ٢٥:** ئەمڕۆ دەبێ لە بجنۆرد ڕێ بکەوین و بڕوین بۆ نەودێ. لە ڕۆژنامەی سەفەری پێشوو کە پێنج فرسەخ ڕێگایە، بەڵام لە ڕاستیدا ڕێیەکە چوار فەرسەخ و نیوە. کەمارۆڤ و خاوەن پۆستەکانی ڕووسیش ئەمڕۆ لە ڕێگای گەرمخانە و فیرووزەی قووچان بۆ ئاخاڵ سەردانیان کرد، یەک سەعات و نیو لە دەستە گوزەرابوو، سواری ئەسپ بوین. ڕێگای دەشتمان گرتە بەر بۆ هەموو جێگەیەک لە تەنیشت شارەکەوە دەچوین. دوای شار بورجێکی جوان دیاربوو [ئەم قەڵایە، شارەوانی بجنۆرد لەم ماوەیەدا ڕووخاندبووی. ئەو شەقامەی کە لە گۆڕستانی شەهیدەکانی دوایی دێت لە پەراوێزی خۆرئاوای بورجەکە ئەگوزەرێت]. دیارە ماڵی شیرموحەممەدخان برای حەیدەر قولیخانی خوالێخۆشبووە ئەبێ جێگایەکی خۆش بێت. سوارەکانی شادلوو لە لێوار ڕێگاکە ڕاوەستابوون. لە دۆڵ و تەپەکانی گوزەراین. پاش تەپۆڵکەکان، دۆڵی حەمیرە بە حەمید، گوندێکە لە لای ڕاستەوە بە قەد حەوت هەشت خێزان خەڵکی هەیە. لێرەوە ڕێگای هەیە دەڕوات بۆ بابائەمان و لەوێوە دەڕوا بۆ گەرمخان. گوندی بابا ئەمان بەو بڕیارە کە وتوویانە هۆی نێونانی ئەوەیە کە لە کاتی زوودا قسنێک هاتووە بۆ ئەم گوندە، خەڵکی گوندەکە ویستبوویان، قسنەکە بکوژن. قسنەکە هەڵهاتبوو، خۆی خستبووە باوەشی پیاوێکی پیر و گوتبووی: بابا

ئەمان و هەر ئەو پیاوە پیرە سەری قسنەکەی بڕی بوو. بە هۆی ئەوە ئەم گوندە ناسراوە بە بابا ئەمان [هەڵبەت ئەم وتانە ئەفسانەیە. ڕەنگە بنیاتنەری ئەم گوندە کەسێک بە ناوی ئەمان‌یان بابا ئەمان بووە. بە کورتی لە دۆڵی حەمید دیسان تەپۆڵکەی زۆر هەیە. لەسەر ڕێگا دێی گوگ‌کەمەر بوو. زۆرگوندێکی بە ناوبانگ و ئاوەدانە. ئاوی ئەم گوندە دەڕوا بۆ بابا ئەمان. دیسان تاویێ بە ئەسپ و بە کالیسکە چوین لای دەستی ڕاستەوە گوندی بەیغویە. دەوروبەری ئێرە هەمووی بێستانە. گەرمەشانی و کاڵەک و شووتی و کوولەکەیان نابوو. [دوای قاوەتوون، سوار بوین چوین] تا گەیشتین بە گوندی چناران. گوندی چنارانیش گوندێکی گەورە بوو. لە چناران گوزەراین بەقەد نیو فرسەخ کە چوین گەیشتین بە ئوردووگاکەی نەودێ.

**چوارشەممە ٢٦:** ئەمرۆ دەبێ بڕوین بۆ عەبدئاوا کە بەشێ لە خاکی قووچانە. ڕێگای ئەمرو دەیانگوت چوار فەرسەخە. تا ماڵ بە سواری چوین. سەهامووددەولە و شیرموحەممەدخانی شادلوو هەردووکیان ئەمرۆ مۆڵەت دران، ڕۆیشتن. نیو فرسەخ لە خاکی بجنۆرد یانێ لە نەودە دەگوزەرێ زەوی و زەراحەتێکی ناسراوە بە «هەزار جەریب» کە سنووری خاکی قووچانە، یەک فرسەخ کە چوین ئەسپ سوارەکانی شوجاعوددەولە دەسەڵاتداری قووچان لە دوورەوە دیار بوون[٤]. داوای ئەسپمان کرد

---

[٤]- لە گولانی ئەمساڵ [١٣٦٥] لەگەڵ ئاغەی کێخا نادری‌بەدرانلوویی لە بجنوورد بە مەبەستی لێکۆڵینەوە بۆ نەودە بۆ ماڵی ئاغەی یاقۆبەگ لە گەورەکان و شیاوی پشت بەستنی نەودە ڕویشتین. یاقۆبەگ دەیگوت، خەڵکی نەودە لە خێڵی زەعفەرانلوویە چۆنکە ئاپۆرەی شادلوو سەبارەت بە زەعفەرانلوو کەم بوو، ناسرەدین‌شا لە سەفەری (گەشتی) هەوەڵی خۆی بۆ خوراسان هات بۆ ئێرە، و سنووری نێوان قووچان وبجنووردی دیاری کرد، و لە هەزارجەریبیشا بەردێکی دانا کە سنووری نێوان شادلوو و زەعفەرانلوو بێت، لە سەر ئەو بەردە ڕێزە بەردی زۆریان ڕژاندووە بە شێوەی چیلەبەردینە دروستیان کردبوو کە بە چیلەشا ناسراوە. بڕیار وابوو ڕۆژێکی‌تر یاقۆبەگ بمانبات ئەوێمان پێ نیشان بات، بەڵام چونکە مینی‌بووسی نەودە بەرەو بجنوورد بەیانی زوو ڕێی ئەکەوت، بە ناچار ڕێی کەوتین و نەمانتوانی نیشانەی سنووری نێوان شادلوو وزەعفەرانلوو ببینین. ئەو شەوەیش چونکە هەواڵیان‌دا کە بڕیار دراوە کە زەراحەتی ئەوێ کە دەوروبەری ٧٠-٨٠ تون بەرهەمی هەبوو ببیرن، زۆر تووڕە و نارەحەت بوو، وەزعی شێوا، چەن ڕۆژ دواتر هەواڵ گەیشت کە مردووە. پیاوێکی خاس و ئارام ولە مێژووی سەد ساڵەی پێشووی ناوچە ئاگادار بوو کە لە بەرگی چوارم ئەو زانیاریانەی کە بە ئێمەدا کەلکمان لێ وەرگرت. هەروەها ڕەسمی ئارامگەی شەهیدەکانی نەودە کە لەگەڵ ئەو خوالێخوشبووە گرتمان، لە کۆتایی کتێبەکەدا چاپ دەبێت.

و سواری ئەسپ بوین، بڕێک کە ڕوێشتین لە نێو تۆزدا شوجاعوددەوڵە دیار بـوو کـە ڕاوەستا بوو. حەمە قولیخان بـرای شـیرموحەممەدخان کـە بـرای جـافر قولیخـانی سەهاموددەوڵەیە. و نادر شای ئەفغانیش لەگەڵ شوجاعوددەوڵە ڕاوەسـتابوو. پاشـان خانەکان و ئاغاکانی سوارەی زەعفەرانلوو دیار بوون. نزیک بە هەزار کەس سوارە دیار بوون. بە حەق سوارەکان جوان ڕیکخرا بوون و لاوانێکی ئازا و قابیل بوون. هەموویان بە ئەسپی بە نرخ و جلوبەرگی پاک و خاوێن. تا دوایی سەف، سوارەکان ڕۆیـشتن و پاشان لە ناو کالیسکە دانیشتن و چوین[٥]. لای چەپەوە زەویـەکی کـشت و کـاڵ لـە سەر ڕێگا بوو ناسراوە بە شورجە [شۆڕک] کە قەڵایەکی چکۆلە و چوار پێـنج خێـزان خەڵکی دانیشتووی بوون. کەو و هەڵۆ زۆر لە ناو ڕێیدا بە چاو هاتن. بـڕێک کـە لـە شوورجە دوور بووینەوە لای دەستی ڕاستەوە لە نێو مێرگدا گونـدێک دیـار بـوو کـە ئاودەوە [ماڵی ئیرانلووەکان] دەیانگوت: لە ملکەکە هاتین بـەرەو ژوور دۆڵـی بوزئـاوا دیار بوو کە ملکەکە هەر لێرەیە. لای دەستی ڕاستەوە گوندی زورم و بوزئاوایە. زورم گوندێکە زۆر ناسراو و خاوەن سێسەدماڵ خێزان [کە زۆربەیان خێڵی تورکی قارشـی قووزیە و کەمتریان کوردی زەعفەرانلوون] باخاتی زۆری هەیە. لە شاری بجنۆرد کـە هاتین بۆ نەودە.

گونـدەکانی سـەر ڕێـی بـریتین لـە: قـەڵای عـەزیز لای باشـوور. حەسـاری شیرعەلیبەگ، بیدەک، دووبرار، نەودە، ئاققەڵا، قشلاق، لەنگەر، بـاغچق، عـەلیئـاوا، کەلاتەی باقرخان، قەڵای حەسەن عەلیخان، یەنگی قەڵا، حەمزانلوو و بازخانە.

**پێنجشەممە ٢٧ ڕەمەزان:** ئەمڕۆ لەم ماڵـە دانیـشتین. سـوار بـوین ڕوێـشتین بەرەو باشوور بـۆ دیـتنی گونـدی زورم. شوجاعوددەوڵـە [ئـەمیر حوسـەینخـان] و ئیبرایم خان جێگری زورم کەوتبوونە بەر. نیو فرسەخ کە چـوین بـە هـەوەڵ بـاخ و بێستانی زورم گەیشتین. باخ و بێستانی زۆری هەیە. بە قەد چوار پێنج بەرد ئـاو لـە گوند خورەی دێت. باخەکانی هەموو جۆرە داری هەیە، بەتایبەت داری گوێز کە زۆر گەورە و بەهێزن. بەڵام باخەکان وەکو دارستان بوون. هەموو شوێنێک لـە سـێبەری دار ئەڕوێـشتین تـا گەیـشتین بـە ئـاوایی وتـەلارەکانی گونـد. ئـاواییکی ناسـراوە.

---

[٥]- زورم یازدەوارم واتە دۆڵی بەهەشت. بە بۆنەی سەر سەوزی ئەم دۆڵە ئەم ناوەیان داناوە.

شوجاعوددەولە لای چەپەوە باخێکی نیشان‌دا کە کانی هەبوو. دابەزین و ڕۆیشتینە ناو، باخێکی پڕ لە دار. هەسێلەکە ئاوێکی خاوێنی بوو کە کانی لە نێو ئاوەکەدا هەڵ ئەقوڵی. ماسی ڕەشی زۆر بوو. گوڵەبەڕۆژەمان نابوو، قاوەتوونمان خوارد. دوای قاوەتوون هەستاین بڕێک بە پێ ڕۆیشتین لە ئاوی دۆڵەکە کە لەنێوان گوندەکە بوو گوزەراین. لەولا ماڵی مورتەزابەگ کوڕی مین باشی بوو کە لە خێڵی تورکی قووچانن. مورتەزابەگ خۆی حاکمی، زورمە و مین باشی بوو، باوکیشی دەسەڵاتداری شیروانە. ماڵێکی خۆش بوو. خێڵی کوردی خوراسانی کە لە قووچان و بجنۆرد دائەنیشتن لە خێڵی شەتاقی ئازەربایجانن. کوردەکانی دانیشتووی قووچان ئیری ئویماقن و کوردەکانی بجنۆرد خورده ئویماق. لە شەقاقی ئازەربایجانیش دوو خێڵ هەر بەم ناوە ناسراون و بە ناوبانگن. کورد [لە زورم] خێڵی تورکیشیان هەیە کە زمانیان تورکی‌یە و هیچ کوردی نازانن. میرزا حەمەخان نۆکەر تا ئەو تاقیگەیە کە [لە دۆڵی زورم بەرەو تەختی میرزا]یە. ئەیفەرموو شوجاعوددەولە ڕۆیشتووە و گەڕاوەتەوە، ڕێگاکەی خراپە. بە کورتی ئەم گوندە زۆر گوندێکی بە ناوبانگە، نزیک بە سێسەد و پەنجا خێزان دانیشتووی هەیە. عەسر هەڵگەڕاینەوە بۆ ماڵ.

**هەینی ٢٨ مانگی ڕەمەزانی ١٣٠٠:** ئەمڕۆ دەبێ بڕۆین بۆ شیروان. لێرەوە تا شیروان دوو فرسەخ و نیو ڕێگایە. [ناسرەدین‌شا بۆ بینینی قەڵای گیلارد لەو ڕێگاوە ڕۆیشتەوە بۆ شیروان] گوند لە نێو دۆڵێک‌دایە لە تەنشت کێوێکەوە لە کۆنەوە دوو قەڵای ژووری دێ درووستیان کردووە[٦]. یەکێ لەم لای دۆڵەکەوە، ئەوی تریش لەولا. زۆر قەڵاییێکی سەخت و گەورە و کۆنە. بە قەی حەوت هەشت بەرد ئاوی

---

[٦]- زاوله کوردی بە مانای دۆڵە، کە گۆڕدراوی زابە. ئاغای جابانی لە کتێبی بە نرخی خۆی بە نێوی «سرزمین و مردم قوچان» (ولات وخەلکی قووچان) لە لاپەڕەی ٣٧٨ تا ٣٨٣ بابەتی زۆری سەبارەت بە زورمەوە هێناوە لەوانەیە بە وتەی سەردێر نێوی هێناوە کە زوارەم پاتەختی دەسەڵاتداری ئەڵلایارخانی هینگ‌باشی بووە و ئەڵلایارخان ماوەیێک جێگری دەسەڵاتی شوجاعوددەولە لە قووچان بووە، کوڕەکەیشی شاڕوخ‌خان دەسەڵاتی شیروان لە ئەستۆی بووە. بەم شێوە دەبێ بگوترێ کە حکوومەت‌نشین بووە. لەم ماوەی ڕابردووەدا دەسەڵاتی ئەوێ بەدەس شاپوورخان پاسەوانی زەعفەرانلوو بوو.

هەیە. گوڵە بەڕۆژەیان نابوو قاوەتوونمان خوارد. سەنیعوددەولـە ڕوژنامـەی ئـورووپی خوێندەوە. [لەوێوە سوار بوین بەرەو شیروان ڕێکـەوتین تـا] گەیـشتین بـە گونـدی زەرمەقان [زەرمەغان] کـە دراوە بـە حـەزرەتی ڕەزا (د.خ). خێـڵەکانی سـویدانلوی زەعفەرانلوو لەم گوندە و بیاوانی دەوروبەری ماڵ و ڕەشماڵیان هەیـە کـە زسـتان و هاوین لە نێو دەوار دائەنیشین و وەرزی کۆچ بۆ گەرمیان هەر لەم دەشتە دەژین. لـە دێینیشتەجێ نابن. خێزان و دانیشتوانی ئەم گوندە کەم بوو بـە قـەد سـی خێـزانی نیشتەجی بوو. سەعات و نیوێک لە گیلارد هاتوین تا گەیشتین بـەو ڕێگایـە کـە بـۆ شیروان دەڕوات. لێـرەوە تـا شـیروان یـەک فرسـەخ و نیـو ڕێگەیـە. لای ڕاسـتەوە گوندێک ئەبیندرێت، کە نێوی تەناسوانە. کانی و ئاوی هەیە کە ئاوەکەی بۆ شـیروان دەڕوات، و لە ژێر دەستی ئەم گوندە بۆ شیروان هەموو شوێنێکی تاک تـاک و بـەش بەش باخ و ئاواییە. بـڕێک لـە خێـڵەکانی سـویدانلوویش لـە تەنیـشت ئـەم دێـی تەناسواندان و لەم ڕێگا دەواریان هەڵداوە و دانیـشتوون (ماڵـیان هەیـە) و هـەموویان خاوەنی پۆڵ و پارە و ئاژەڵن. ڕوو بە خۆرئاوا چوین تا مێرگ و گوندی شـیروان دیـار بوو. مێرگێکـی بـاش و باخـاتی زۆری هەیـە. سـەعات و نیـوێکی بـە ئێـوارە مـابوو گەیشتینە ماڵ. قەڵای شیروان هەر ئەو قەڵای کۆنەیە. خەڵکێکی زۆر لە توجـار لـە شاری شیروان هاتبوونە سەر ڕێی. وا دیارە دانیشتووی زۆری هەیە، واتە بەم شـێوەیە کـە دەیـانگوت بـە قـەد سێـسەد خێـزان دەبـێ، حەرەمـسەرای ئێمـەیان لـە نـاو باخێکیتری ئەو جێگایە کە ١٨ساڵ پێش لە سەفەری پێشوومان‌دا دەواریان لێـدابوو، لێیان دا. ئەمڕۆ لە ژووroوی شیروان [باکووری خۆرئاوای شیروان] لە لای خورئـاواوە بە قەد نیو فرسەخ گوندێکی سەوز بە باخاتێکی زۆرەوە دیار بوو. دەیانگوت نێوی ئـەو گوندە زیارەتە. چونکە قسنێک لەوی نێژرابوون گومەزێکی هەیە کە زیارەتگایە و بەم ناوە ناسراوە. باخ و داری زۆری هەیە کە سـەر سـەوزییەکەی لـە بەرانبـەر سـەوزایی حەزرەتی عەبدولعەزیم (د.خ) [لە تاران] بـەرچاوترە[٧]. دەبـێ شـوێنێکی زۆر خـۆش

[٧]- ئاغەی (موحەممەد) حەمە عەلی قوربانی کوڕی عەلی ئەسفەر خەڵکی پیر شـەهیـد دانیـشتووی شیروان لە جۆزەردانی ٦٥ بە نووسەر گوتی: من خۆم لە کوردەکانی سویدانلووم و هەمووی خەڵـکی گوندی پیر شەهیدیش لە کوردەکانی سـویدانلوون. لـە گونـدی پیلـەش دەوروبـەری ٨٥ خێـزانی سویدانلوو هەیە و ٤٠ خێزانی ئەوێ لەگەڵ چیانلوون. حاجی عەبدولعەلی وحاجی حوسەین خان و

بێت[٨]. [ئەگەر ناسرەدین شا دەڕۆیشت بۆ زیارەت لە دوو شت بەهرەمەند دەبوو، شوێنێکی تری زۆر باشی زیارەت کە هێشتا پێ نەگەییوە و دیکەی‌تر مێشی مالاڕیای پیاو داخەرکە زۆر بوو].

**شەممە ٢٩:** ئەمڕۆ ئەبێ بڕوین بۆ بەرزل‌ئاوا. مالّی حسابی لە فەیزئاوا بوو. شوجاعوددەولە مالەکەی لە بەرزل‌ئاوایە. سێ فرسەخ ڕێگایە. یەک فرسەخ کە ڕۆیشتین [لای چەپەوە] جێ کشت‌وکالّی کەم لە سەر ڕێی‌دا دیار بوو، ئاواییێکی لێ بوو، ناسراو بە ئەمیرئاوا کە چوار پێنج سالە ئەمیر حوسەین‌خانی شوجاعوددەولە ئاوەدانی کردوەتەوە. حەوت هەشت خێزانی هەیە. [ئێستا دەوروبەری ٥٠ خێزانی هەیە. گەلاڕێزانی ٦٥]. حەوزێکی هەیە کە دەوروبەری پڕ لە دار و ئاوێکی هەیە کە کشت و کالّی پێ ئەکەن. لە نزدیکی ئەمیر ئاواوە لە لای دەستی چەپەوە گوندێک هەیە کە ناسراوە بە ئەلّلائاوا. گوندێکی زۆر ناسراوی گەورەیە. بە کورتی بلّێم وەختی قاوەتوون گەیشتین و نانمان خوارد. پاشان سواری کالیسکە بوین چوین بە ئەندازەی دوو سەعات و نیوو کە ڕۆیشتین گەیشتینە مال [بەرزل ئاوا]. [جەژنی ڕەمەزان ناسرەدین‌شا لە بەرزل ئاوا ڕێ کەوتووە.]

**ڕۆژی یەک شەممەی شەوال ١٣٠٠:** دەبێ بچین بۆ چیمەنی لەیلی. [مەبەست ئولنگ[٩] لەیلی‌یە زۆر گەورە و سەرسەوز و بە ناوبانگ بوو]. نیو فرسەخ کە ڕۆیشتین لە نێو ڕێگادا گوندێکی بە ناو بانگ [ژووری تەپۆلکەیێ] دیار بوو ناسراو بە «بەرگز» شوجاعوددەولە وتی ئەوە جێگای نان خواردنە. ئەمرمان کرد بڕۆن لەوێ قاوەتوون ئامادەکەن. دەشتی ئەمڕۆ هەموو شوێنێکی بەرهەمی کشت و کالّ و بێستان و نێو ڕێگە هەمووی دێهاتی بە ناو بانگ [وەکوو بەغەن و سوککە و...] و باخانێکی زۆری هەیە. (هەلّبەت لەم مێرگەدا ٧٠ بەش دێم بوو). ئەم مێرگە میان ولایەتی قووچانی

---

حاجی کەریم لەگەلّ چیانلوو لە دەوارنشینەکانی بە ناو بانگی (ناسراوی) کوێستانی شایجانن (شاهیجانن). پاشماوەی سویدانلووکان لە شیروان و بجنوورد و شوێنانی دیکە دانیشتوون. موحەممەد ئەمین سویدی نووسەری «سبائک الرهب فی معرفه قبایل عرب» بە گومانم لەم خێلە بێت.

[٨]- خەلکی گوندی زیارەت، بڕێک لە کوردەکانی شیخ ئەمیرلوو و بڕێکیش تورکن.

[٩]- ئەلّلا ئاوا کە دامەزرێنەری ئەلّلا ویردی خانی زەعفەرانلوو مامەی شوجاعوددەولە بوو.

پێ دەڵێن. مێرگێکی زۆر گەورەیە و لای چەپ و ڕاستیەوە شاخی زۆر هەیە [لای ڕاستی شاخی شایجان و لای چەپی شاخی کیسمار]. گەیشتین بە کەلاتەی سەیمەعسووم کە خۆی ئیستا زیندووە و خاوەنی ئەم ملکانەیە. ڕۆجیاپەڕیزیان لێ نابوو[١٠] قاوەتوونمان خوارد. سەنیعوددەولە گەیشتە ئەوێ، بڕێک ڕۆژنامەی ئورووپی خوێند. دوای نان خواردن خەڵکی جوێن کە بە هۆی کەم کردنەوەی [سەرانە و باجدان] بۆ ئوردووگا هاتبوون و بڕێکمان کەم کردووە و ئەمرمان دابوو ئەمینوسوڵتان [سەدر ئەعزەم[١١]] هات بۆ لامان. هەر لەوێ بە ئەوانیش ڕەحم و لوتفمان کرد. گشتیان دوعایان کرد بۆمان. پاشان سوار بوین و بەرەو ماڵ چوین. لە دێی نەجەف ئاوا کە گوندێکی بە ناو بانگەوە گوزەراین. لای چەپەوە نزیک داوێن کێوەکە، شاری کۆنەی خەبووشانە کە ڕووخاوە. گوندێکی گەورەش لە نزیک ئەودا هەیە کە ئیستا لەوێ ناسراوە بە خەبووشان. سەنیعوددەولە لەسەر ئەسپەکەی ڕۆژنامەی ئورووپی ئەخوێند. بڕێکیتر کە ڕۆیشتین لە نێوان ڕێگادا قەلای کۆنەی توند و تولی لەگەڵ چالی قووڵ و بورج و حەسار ئەبیندرا. لە شوجاعوددەولە پرسیمان، گوتی عەلی ئاوایێ کە ڕەزا قولیخانی باوکی [ئیلخانی گەورە] لە سەردەمی خاقان خوالێخۆشبوو فەتحعەلیشا درووستی کردووە و خێزانی لە ئاخاڵ هێناوە و نیشتەجێ بوون. و لەو وەختەدا ئاو و ئاوایی هەبوە و بە نەجەفی ئەشرەفیان داوە. گوتمان ئاوەکە دەرهێنن و دیسان ئاوەدان بێتەوە. گەیشتین بە گوندی غەرقاب، واتە هەوەڵ لە گوندی یام گوزەراین کە گوندێکی ناسراوە. تەپۆڵکەیێکی گەورە وەکوو شاخ لە کۆنەوە لەوێ درووست کراوە. لە یام هاتین بۆ غەرقاب کە نێو چیمەنی لەیلییە. سوارەی دەرەجزی [دەرەگەزی] و موحەممەد عەلیخان دەسەلاتداری دەرەگەز لەگەڵ دوو برای بە ناو قەراخان و ساریخان لەگەڵ حاجی شا موحەممەدخان فەرمانبەری وەزارەتی دەرەوە کە لە دەرەجەزەوە هاتبوون، گەیشتنە لامان. موحەممەد عەلیخان برای ئەڵلایارخانە و ئەمانە کوڕەکانی سلێمانخانی دەرەجەزین. چیمەنی

---

[١٠]- ولاتی (سەرزەوی) قووچان بەسێ بەشی خوار ولات، نێو ولات وژوور ولات دابەش دەکرێت.

[١١]- لە سەر ئەمەوە شاری هەوەڵی خەبووشان لە شوێنی گوندی خەبووشانی ئێستایە کە لە باکووری تیتکانلوو بووە.

لەیلی چیمەنێکی زۆر باشە. شەش سەعاتی بە ئێوارە مابوو، ڕۆیشتینە ناو ژوورەکە[12] [چونکە سەعاتەکانی ئێوارە قورمیش بوون و سەعات ١٢ وەختی ئێوارە بوو، واتە لە سەر سەعات شەش گەیشتنە ماڵ] عەسر وەلامی نامەکان و نووسراوەکانی تارانمان نووسی (چونکە ڕوژی ڕۆیشتنی پۆست بوو) و ڕۆیشتین[13].

**ڕۆژی دووشەممە دووی شەوال:** ئەمڕۆ دەبێ بڕۆین بۆ قووچان. ڕێگا دوو فرسەخە. بەیانی یەک سەعات و نیو لە دەستە گوزەرا [واتە سەعات ١:٣٠ ئێوارە، کە کاتژمێر لە سەر ١٢ ڕاوستابوو] سوار کالیسکە بوین، چوین بە قەد گۆڕەپانێکی ئەسپ ڕێی چیمەن بوو. شوجاعوددەولە کە دوێنێشەو ڕۆیشتبوو بۆ شاری قووچان ئەمڕۆ هاتەوە و لە نیوەی ڕێیدا گەیشتە لامان. هەوەڵ ڕێی کەوتین، لای ڕاستەوە ڕێی کەلاتەی جافرئاوا و کەلاتەی سەفدەرخان ئەبیندرا. خوراسانیەکان بە شوێنی کشت و کاڵەوە بوون، بڕێک کە چوین لای دەستی ڕاستەوە گوندی جافرئاوا دیار بوو. جافرئاوا تاپۆی شوجاعوددەولەیە. قەڵای جافرئاوا کە حەوت ساڵ پێش بوومەلەرزە خراپی کردبوو، دیار بوو بوومەلەرزە وای پێ کردبوو کە دەتگوت سەد ساڵە ڕووخاوە، زۆر پێمان سەیر بوو. بەڵام خەڵکی زۆر لە وەخت بوومەلەرزەکە و ڕووخانی قەڵاکە نەمردبوون. ئەو ڕۆژە کە بوومەلەرزە هاتبوو تەواوی خەڵکی جافرئاوا ڕویشتبوون بۆ گوندێکیتر بۆ زەماوەن و جگە لە هێندێ خەڵک و سەگ و پشیلە کەسێکیتر لەوێ نەمابوو. بەرانبەری ئەم جافرئاوا کاول بوو، لای چەپەوە ڕێگای جافرئاوای نوێیە کە شوجاعوددەولە دروستی کردووە کە گوندێکی زۆر ناسراو و خۆشە، ٢٠٠٠ خێزان و ڕەعیەتی هەیە. ئەملاو ئەولای ڕێگا و هەروەها هەموو شوێنێکی دێهاتە و زۆر ڕێک و پێک بوو. لە لای چەپەوە دوو دێی گەورە ئەبینرا کە ناویان «ئوتار و یوسو ئاوا» بوو مامۆستایان و شەیخولئیسلامی بجنۆرد و بازرگان و دووکاندارەکانی شاری قووچان هەموویان هاتبوونە پێشواز و دوولای ڕێگاکەیان گرتبوو. کالیسکەیان ڕاوەستان و ماوەیێک لەگەڵ شەیخولئیسلام و مامۆستاکان قسەمان کرد. فیلەسووفێ کە لە قوتابیانی خوالێخۆشبوو حاجی مەلاهادی سەبزەوارییە کە دوکتورێکی بێسواد و

---

[12]- ڕەزا قولیخان ئەم گوندەیە بە ناو حەزرەت عەلی (د) ناو ناوە و بەخشیویە بەو حەزرەتە.

[13]- لە ڕاستیدا بووکێکی موبارەک بووە، کە زەماوەنەکەی بووەتە هۆی ڕزگار بوونی گیانی خەڵکەکە

خەڵکی قووچان بوو. ئەمڕۆ لە ناو ڕێگەدا تەپوتۆزێکی زۆر هات و کلاوەکانی لە سەر داخستین، ڕۆجیاپەرێزەکان[١٤] با بردیانی. پێش لە هاتنی با بەو قەناعەتە گەیشتین شووشەکانی کالیسکەکەمان داخست، ئەگینا زۆر زەرەری ئەدا. بە کورتی لە ڕێگەیێکی پێچاوپلووچ ڕوێشتینە ناو باخەکە. هەر ئەو باخەیە کە هەژدە ساڵ پێش لە ئێستایش لەوێ دەوارمان هەڵدابوو. بەڵام ئێستا ئاوەدانترە. چوار بێستانی لە ناو ڕاستی باخەکەدا درووست کردووە. هەمووی باخەکە دار ترێ و دار قەیسیە. دار قەیسیەکان لە ناو ڕاستی باخی ترێدایە. باخێکی گەورەیە. لە [باخی] عەشرەت ئاوا [کە ناسرەدینشا لە تاران درووستی کردووە] تۆزێ بچووکترە. دیواری باخەکەیان تازە بەکاوگڵ چنی بوو[١٥] دیواریان سپی کردبوو. ناوی باخ شوێنی دانیشتنی ئێمە و حەرەمسەراکەیە.

**سێشەممە٣ شوال:** لە قووچان ڕاوستاین. ڕۆژانە تەپوتۆز و شەوانە بێدەنگی بوو. ئەمڕۆ پاش نیوەڕۆ ئێستیورتی ئینگلیسی کە ماوەیەکە هاتبوو بۆ خوراسان لەگەڵ میرزا عەبباسخان پارێزەری دەوڵەتی ئینگلیس کە دانیشتووی مەشهەد و بەڵام ئەفغانییە هاتن بۆ لامان. ئێستیورت لە تارانیش هاتووە لامان، بە فارسی قسە دەکات. لە قووچان دەروێشە، ناوی فەقیر موحەممەدعەلی بوو، زۆر سەیر بوو. دەڵێن بیست ساڵە لە دیوێکی تاریکدا کە لەوێ چاوچاو نابینێ ژیان بە سەر دەبا. زۆربەی کەس بۆ دیتنی ئەو بەرەو ماڵەکەی ڕێ کەوتوون. بەو جۆرەی کە ئەڵێن زۆر کەم قسەیە و ئەگەر نوورێکی کەم بە دیوەکەی بگات سەروچاوی خۆی دائەپۆشێ تا کوو دیار نەبێت. ئەڵێن باخومولکێکی زۆر و برا و فامیلی زۆریشی هەیە.

**ڕۆژی چوارشەممە چوارمی شەواڵ [مانگی]:**[١٦] ئەمڕۆیش لە قووچان ڕاوەستاین

---

١٤- لە بارەی شەیخولئیسلامی بجنووردەوە دەتوانن سەیری کتێبی «ایران دیروز» بکەن.

١٥- کلنل ئێستیورت کە چاوپێکەوتنەکانی خۆی لەئێران وخوراسان چاپ کردووە، وابزانم هێشتا بە فارسی وەرنەگێڕاوە. ئێستیورت لەو ئەفسەرە ئینگلیسیەکان لە ئێران بوو کە پێشڕەوی ڕووسەکانی لە باکووری ئێران لە ژێر چاو بوو، ڕاپۆرتەکانی خۆی بە ناسرەدینشای ئێران و دەوڵەتی بریتانیا دادەگەیان.

١٦- لە بەرگی دووهەمدا نووسراوە گەلێک لەبارەی فەقیر موحەممەدعەلی نووسراوە هەروەها چاوکەن لە«ایران دیروز»- ئەرفەعوددەولە، لاپەڕەی ١٣١-١٢٨.

تا دوانیوەڕۆ لەماڵ ماینەوە، دوانیوەڕۆ ئەمانەویست سوار بوین و بڕۆین بۆ دیتنی شاری قووچان لە بەر ئەوەی بای تونێک دەهات و خۆڵ وخاک زۆر بوو، لەوێ ماینەوە و خەریکی برێ کاری دەوڵەتی بوین.

**پێنج‌شەممە پێنجەم:** ئەمڕۆ ئەبێ بڕوین بۆ عەلی‌ئاوا. سێ فرسەخ ڕێگەیە و سەر بە خاکی قووچانە. دوو سەعات تێپەڕیوە. سوار بوین، خۆڵ و خاکێکی زۆر بوو لەبەر ئەوەی زەوینی قووچان خاکێکی زۆر نەرمی [بە بۆنەی بوونی لافاوەکانی لقەکانی ڕۆخانەی ئەترەک] هەیە و پاش توزێ جووڵانەوەی سوارە وپیادە بە هەڵکردنی هەوا خۆڵ و خاکێکی زۆر هەڵسا، سواری کالیسکە بوین و کاتێ ڕوانیمان، ڕێگای کالیسکەیان لە هەموو جێگایێک لە پاڵی شارەوە ساز کردووە. گەیشتین بە باخی ئەبولحەسەن‌خان کوڕی شوجاعوددەوڵە کە ڕکنولدەوڵە [برای ناسرەدین‌شا و حاکمی خوراسان] لەوێدا نیشتەجێ بوو. عەمارەتەکە سەردەرگایێکی بوو و سەوزەڵانی دارەکانی لەسەر دیواری باخەکە ئاشکرا بوو. تۆزێ کە لەو باخەی کە خوالێخۆشبوو فەتعەلی‌شا سازی کردووە، گوزەراین بەرەو دەستی چەپ ڕۆیشتین لەوێدا شوێنێک هەیە ناسراوە بە کوردخانە [بڕوانن بۆ بەرگی یەکەم] کەڕەز قولی‌خان لەو کاتە لەهەر هۆزە کوردێ کۆی کردبوو و لەم قەڵایە مەنزڵی دابوونێ [تاکوو نوێنەرانی تەواوی عەشیرەتەکانی کورد لەشەڕ لەگەڵ فەتعەلی‌شا و عەبباس میرزا ڕاستەوخۆ بەشداریان بێت لەبەر ئەوەی کوردەکانی خوراسان حوکوومەتی قاجاڕیان بە ڕەسمی نەدەناسی هێشتا سەفەویەکانیان خۆش ئەویست. تەنانەت دەسەڵاتی نادرشایشیان هیچ کاتێ بە ڕەسمی نەناسی و لە ئاکامدا نادر کە خۆیان دەسەڵاتیان پێ دابوو لە ناویان برد] بەڵام [کوردخانە] ئیستا کەلاوەیە[١٧]. بە ئەسب ڕۆیشتین لەسەر خاکرێژی قەڵای کوردخانە گوزەراین. شاری قووچان و ماڵەکانی شار هەموویان دیار بوون. دەوری شاریش چاوانە و خاکرێژ و قەڵایە. لەئاخری شارەوە لەسەر ڕێگەوە دەروازەیێک هەیە کە لەبەر دەروازەکە گومەز و مەرقەدی شازادە ئیبراهیم. ئیمامزادەیێکی ڕاستەقینەیە، گوتوویانە ڕۆڵەی عەلی کوڕی

---

[١٧]- ئەمیر حوسەین‌خان لە پاوشا داوای کرد ئیزن بدات تا دووبارە قەڵای کوردخانە[کوردئاباد] ڕێک بخات بەڵام شائیزنی ئەم کارەی بە تەمیرنەدا و لەم کارە بەرگری کرد.

مووسەڕەزایە (دروود و سڵاوی لێ بێ). گۆڕی ئیمامزادە تۆزێ ڕووخابوو. شوجاعوددەولە پینە و پەڕۆی دەکات. مەنجەنیق وچێو بەسیان ڕێک خستووە و دەسیان کردبوو بە دروست کردنی. مەرقەدی ئیمامزادە وا لە ناو شاردا. بە کورتی لەم دەروازەیە کە تێپەڕین ئەوەندە خۆڵ و خاک بوو دیسانەوە سواری کالیسکە بوین. لە دوای ئەم دەروازەیە ڕێ دەگاتە بیاوان و هەراوێک و هەموو شوێنێک ڕاستەوخۆ ڕوو بە ڕۆژهەڵات ئەڕوا.

یەک فرسەخ کە ڕۆیشتین وەلیخان سەرکردە کوڕی ساعێدودەولە لە ناو بیابان‌دا بینرا. تۆزێکی‌تر کە لە شوێنی ڕۆژهەڵاتی شاری کۆن لە تەنیشت ڕێگە و بانی ئێستایی تاران بۆ مەشهەد] ڕۆیشتین، شوێنی دەستی چەپ تەپەیێک بوو، لە بان تەپەکە دێیێک بوو و چەن بنەماڵەی تێیدا بوو. ئەم دێیە بە سێ ناو ناسراو و بە ناو بانگە.«نادرتەپە» و«فەتح‌ئاباد» و«قەڵا کەلب ئاقاسی». فەتح ئابادی ئەڵێن لەبەر ئەوەی لەڕابردوودا لەم شوێنە هیچ ئاواییێک نەبووە و تەنیا سەوزەڵانیک بووە کە بە سەوزەڵانی فەتح ئاباد ناویان لێ بردووە. بەڵام نادر تەپە لەبەر ئەوەی ئەیانگوت کە نادرشای ئەفشار لە چەمەنی فەتح ئاباد ئوردووی داوە و ئەویان لەبانی ئەم تەپەیە کوشت. قەڵای کەلب ئاقاسی بەم بۆنەوە ناویان لێ بردووە کە کەلب ئاقاسی ناوی نۆکەری ئەڵلاهیارخان ئاسەفودەولە ئەم دێیە لەسەر ئەم تەپەیە داناوە و ئاوەدانی کردووە. پاش ئەم تەپەیە دێ و باخێک بوو. نەهارەکەمانیان لەو شوێنە ئامادە کردبوو. بە کالیسکە یەکسەر ڕۆیشتین بۆ ناو باخەکە. باخێکی زۆر خۆش بوو تۆم ڕۆجگارپەرێزیان وەشاندبوو. دوای نەهار سوار بووین و ڕۆیشتین بۆ دیتنی ڕۆخانەی [ئەترەک]. ئەمە ڕۆخانەیێکی گەورەیە و بە قەد حەوت، هەشت بەرد ئاوی هەیە. کانی و سەرچاوکەکەی لە میاب و کەپکەنە [کەپکان] کە ئەم دوو شوێنە بەشێکە لە خاکی دەرەگەز. لێرە هەتاکوو میاب و کەپکەن چوار فرسەخە و ئەم دوو دێیە لە نێو دۆڵدایە و سەرچاوکەی ڕۆخانەکە [ئەترەک] لە نێوان دۆڵەکەوە دەڕوا. لە قووچان هەتا موحەممەدئاباد کە ناوەندی حوکوومەتی دەرەگەزە نۆ فرسەخە. خەڵکی میاب و کەپکەن لە تایفەی کوردی شادلوون. هەروا کە لە سەفەرنامەی پێشوودایش ووسیومانە دەوروبەری ڕێگەکەیش دێهاتی زۆری هەیە. لەبەر ئەوەی ناوەکانیان لە سەفەرنامەی پێشوودا نووسراوە ئیتر لێرەدا دووپاتی ناکەینەوە. لەم دەشتە خێڵێکی

زۆر ڕەشماڵیان هەڵداوە. کە لە تیرەی قووچەکانلووی زەعفەرانلوون [مەبەست قاچەکانلووە]. خێڵی زەعفەرانلوو دوو عەشیرەتی زۆر بەرزی هەیە. یەکێ عەشیرەتی کەیکانوو کە لە شیروان و هەرێمی ئەو شوێنە ڕەشماڵیان هەڵدابوو [سەرتاسەری ناوچە سنوورییەکانی ئێران و ڕووس لە ئاشخانەی بجنۆرد هەتا ناوچەی سەرحەدی قووچان و دەرەگەز هەمووی کەیکانلوون کە ئەمڕۆ بەسێ لقی بیچرانلو، سیوکانلوو و کەنیکانلوودا بەش کراون] ئەوی تر عەشیرەتی قووچەکانلوو کە لەم دەشتە ڕەشماڵیان داوە. کۆتایی قسە ڕۆیشتین تا گەیشتین بە گوندی فەرخان[١٨] کە لە سەر ڕێگەوە بوو. لە فەرخان تێپەڕین ئوردوو و مەنزڵێ کە عەلیئابادە ئاشکرا بوو. ڕۆیشتین لە بەر سەراپەردە دابەزین. سەراپەردەکەی ئێمەیان زۆر دوورتر لە ئاوایی دانابوو. شوجاعوددەولە سێ قەتار وشتر [هەر قەتار حەوت وشترە] و دوو ئەسبی پێشکەش کردبوو. دوانیوەڕۆ هێنایان لە دەرەوەی سەراپەردە گەڕاندیان. دوو سەر ئەسپیان لە دەرەگز هاوردبوو.

**ڕۆژی جومعە شەشەم:** ئەبێ بڕۆین بۆ سوهان. پێنج سەعاتی ڕێک بە ڕێگەدا ڕۆیشتین، گەیشتین بە گوندی کەڵاتە میرزا موحەممەد عەلی مستەوفی قووچان کە لە دەستی چەپی شەقامەوەیە. پێش لەمە ئێرە دێیە کاولەیێک بووە، میرزا موحەممەد عەلی تازە ئاوەدانی کردووە، لە کەڵاتە تۆزێ کە تێپەڕین گەیشتین بە«دیزئاباد» کە لەسەر ڕێگەوەیە و مەکۆی عەشیرەتی [کورد] قاسمانلووە. قاسمانلوویش تیرەیێک لە خێڵی زەعفەرانلوون. لە دیزئاباد تێپەڕین پاشان گەیشتین بە دێ جەعفەرئاباد[ژوور] کە دووبارە لەسەر ڕێگەیە. لە جەعفەرئاباد کە تۆزێ چوین گەیشتین بە«دەوڵەت ئاباد». لە دەوڵەت ئاباد تێپەڕین گەیشتین بە دێ «یەساقی» کە ئەویش دێیکی بە ناوبانگە لەسەر ڕێگەیە و سەر بە قووچانە. دوای یەساقی ئیتر ئاوایی نییە. هەموو جێگەیێک وشک و قاقڕە. بەڵام دەستی ڕاست لە خوارەوە تاقمێ گوندی تاکوتەرا ئەبینرێ کە هەمووی سەربە قووچانە. لە شوێنی دەستی ڕاست لە نێوان دەشتەوە دوو تەپۆڵکە هەیە کە بە ناوبانگە بە«تاس تەپە[١٩]»

---

[١٨]- فەرخان لە گەورەترین ئاواییەکانی قووچانە کە لە باکووری تاقیگەی ڕێگەی قووچان دامەزراوە ولە عەشیرەتەکانی سیسوو، پیری، حاج شەعبان، مەمیش و ڕەستوو پێکهاتووە.

[١٩]- شەڕی کوردەکانی قووچان لەگەڵ کولنێل موحەممەدخان پسیان هەر لەم تاس تەپەیە بووە کە

و لێنەوە سنووری نێوانی خاکی قووچان وڕادەکانە[پاشان نەهارمان لە مووچنان خوارد و پاشان بەرەو ڕادەکان ڕێ دەکەوین. حاکمی ڕادەکان موحەممەدکازمخان کوردی کەیوانلووە. لەسەر ڕێگەوە ئاسکی زۆر دەبینن کە تاقمێکیان ڕاو دەکەین.

**ڕۆژی حەوتم شەوال [مانگی]:** دەچنە ناو ڕادەکان کە ئەڵێ: [کۆتایی قسە دوای تێپەڕکردنی دوو فرسەخ ڕێ گەیشتینە ماڵ. هەژدە ساڵ پێش[لە ساڵی١٢٨٤] کە هاتین بۆ ئەم شوێنە. سەراپەردەکەمانیان لە نزیکی کەوێلێک کە خوالێخۆش بوو موحەممەد ڕەزا خان[کەیوانلوو] حاکمی ئەوێ پاش ئەو سەفەرەی ئێمە سازی کردووە سەرا پەردەکەمانیان دانابوو کە شوێنێکی زۆر باشە. لەسەر مەرقەدی ئیمامزادە ئیبراهیم قووچان چەند لاپەڕە قورئان بەخەتی میرزا بایسونقوڕ کوڕی میرزا شاهڕوخ کوڕی ئەمیر تەیموور[بە دەستی کوردەکانی زەعفەرانلوو هەڵگیراوە و بۆ ئەم شوێنە هێناویانە] بە خەتێکی گەورە و زۆر جوان نووسراوە. فەرمانمان دا و لاپەڕەیان هێنا تا بۆ تاران بیبەین و لەوێ، پینەو پەڕۆی کەن و لە ئەنتیکەخانەی دەوڵەتیدا[٢٠] داینێن. لاپەڕەکان زۆر گەورەیە بەڵام دڕاوە.

**یەکشەممە هەشتەم:** ئەمڕۆ ئەبێ بڕۆین بۆ «چەشمە گێلاس» نزیک شەش فرسەخ ڕێگەیە. ڕادەکان قەڵاییکی هەیە کە بۆ دیتنی ڕۆیشتین. قەڵاییکی غەریبە. پاش ڕوانینی سواری کالیسکە بوین و ڕۆیشتین، یەک فرسەخ کە لە قەڵا دوور کەوتین هەوەڵ دێیێک کە بینرا گوندی «قەیس‌ئاباد[٢١]» بوو کە خواری ئەم دێیە لە

---

بە کوشتنی کولنیل دوایی پێ هاتووە کە لەبەرگی چوارەمدا ئەگوترێ. لەبارەی تاس تەپە گۆرانییێک هەیە کە ئەڵێن:

ئیر و نۆوێ مەی دەڤانە دەڤە چوو نەتاس تەپانە تا چووم هاتیم شیرین یانە

مانای وایە: ئەمڕۆ نۆرەم بوو کە بڕۆم بۆ لای وشترەکان وشترەکان ڕۆیشتوون بۆ تاس تەپەکان تا ڕۆیشتم و گەڕامەوە یارەکەم شیرین‌یان بە ڕەقیب دابوو

[٢٠]– شەیخورەییس قاجار بەرلە ناسرەدین‌شا چەند لاپەڕە لەم قورئانیە بۆ مەشهەد هێنابوو کە ناسرەدین‌شایش لەکاتی هاتنەوە بۆ مەشهەد هاتە دیتنی قورئانەکانی حەرەم

[٢١]– «قەیس ئاباد» کە لە بەرگی دووهەم ژێرنووس لاپەڕەی١٨١ گوترا وادیارە لە کوردەکانی قەیسانی بێ، لە خەزەڵوەری ئەمساڵ[١٣٦٥] کە لەگەڵ کاک مووسا ڕەمەزانی زراوکانلوو بۆ ئەو شوێنە ڕۆیشتم ئاشکرا بوو قەیسانی نین و لە کوردەکانی شەیخەکانلوون کە لە ساڵی١٢٥٩ ی مانگی ئێنەیان ساز کردووە و کەم کەم نیشتەجێ بوون کە ٨٠ بنەماڵەی شەیخەکانلوو و ٧٠ بنەماڵەی خەلانلوون

ڕاستیدا له وەرزی بەهاردا بەهەشتێکە. زەنبەقی شینی زۆری هەیە کە لە بەهاراندا چرۆ دەکا و سەفای سەوزەلانیەکە زۆر دەکاتەوە لە بەشێک لەم سەوزەلانیەدا کشتوکاڵیان کردبوو. گوندی «قەیس‌ئاباد» سەربە ڕادەکانە. تەواوی ئەم پای کێوە لە دەستی ڕاست پێکەوە دێ و ئاواییەکە هەمووی ئەم دێهاتانە سەربە چنارانە. تەواوی ئەم شەش فرسەخە کە لە ڕادەکان هەتا چەشمە گێلاس بە ئەندازەی هەر سەد یا یەک پارچە دێ و ئاواییە کە بە ئەژمار نایەت. سەوزی باخەکان ودارەکان هەموویان بە یەکترەوە بەسراوە. دێیێکی بە ناوبانگە هەر لە شوێنی دەستی ڕاستەوە بینرا کە ناوی«شوترپا» و وەقفی حەزرەتی ڕەزایە (درووود و سلاوی خوای لێ بێ). تۆزێک کە ڕۆیشتین دێییک بینرا، فەرمووومان برۆن لەوێدا ڕۆجگارپەرێز ببەن نەهار سازکەن. ناوی ئەم دێیەش هەم نەهرئاباد و هەم هاشم ئابادە. شوێنی دەستی چەپ دوو دێ بینرا. ناوی یەکێ سەیدئاباد و ئەویان «خوون‌ئابادە». ئەم دوو دێیە پێکەوە لکاون. ئەمڕۆ لە ڕێگە فەتحوڵلاخان پیزەکی لەگەڵ دەستەی سواری پیزەکی گەیشتە لامان. پیزەکی تایفەیێکە کە هەر لەم دەشتی چناران و پشتی ئەم کێوانە دادەنیشن. لە خوون‌ئاباد کە بە ڕادەی یەک فرسەخ ڕۆیشتین ئوردوو ئاشکرابوو. سەراپەردەکەمانیان لە چێشمە گێلاس داناوە. شوێنێکی زۆر با سەفایە و ئاوی کانیەکە زۆر سارد و سافە.

**دووشەممە نۆهەم:** ئەمڕۆ لە چەشمە گێلاس ڕاوستاین. کەوێکی زۆر لە کێو دیار بوو و لە لێو کانیاوەکانەوە ئاو دەخۆن و دەڕۆن. دوێنێ و ئەمڕۆ تاقمێک لە نەوکەرەکان چەند کەویان کوشت. پاشان قەدەغەنمان کرد، ئیتر کەسێ تیر نەخات. چەشمە گێلاس ماسیگەلێکی گەورەی زۆری هەیە. ناوەکانی دێهاتەکان لە ڕادەکان بەرەو ئەملا کە دوێنێ بینرا لەم قەرارەیە: شوێنی دەستی چەپ هەومالْزەوی و مەزرای موغان کە سەر بە ڕادەکانە. پاشان ناوەندی ڕێ قەیس‌ئابادە. دەستی چەپی قەیس‌ئاباد سەرەتا مەهری‌ئابادە. ژوورەوەی مەهری‌ئاباد گوندی چەهچەهەیە. گوندی چەهچەهە لکاوە بە عەلی‌ئابادەوە. تۆزێ لەوێ خوارتر غێزێل‌حێسارە [قزل‌حێسار]. لە دوای ئەوە شوترپا و یەک فرسەخ لە شوترپا خوارتر قەلعەڕەزایە کە خوالێخۆشبوو موحەممەد ڕەزاخان [کەیوانلوو] ڕادەکانی خاوەنی بوو و پاشان بەش بەرەکانی، ئەوێیان فرۆشتووە بە میرزا مووسا مستەوفی، لێرە ئاکامی

خاکی ڕادەکانە و هەوەڵی خاکی پیزەکی [پازووکی][٢٢]. شوێنی دەستی ڕاست سەرەتا زەوی و مەزرای[٢٣] زینگرە کە تایبەتی ڕادەکانە. پاشان گۆباغ و چەمەن گۆباغە. پاشان گوندی دارستانی چناران کە پێکەوە لکاون و ئەم دەشتەی وەکوو باخێک پێ کردووە. چناران و کەلاوەکانی ئەمیرئاباد لەم شوێنەوە بە ئەندازەی یەک فرسەخ ئاشکرایە. چەشمە گێلاس بەشی پیزەکیە و ڕایەتەکانی پیزەکی لەو شوێنە کشتوکاڵ دەکەن. پیزەکی ناوی عەشیرەتێکی تایبەتی لە عەشیرەتەکانی کوردی زەعفەرانلووە و خۆیان لە نێوان چناران و ڕادەکان و میان وەلایەت [قووچان] شوێنێکیان هەیە کە بە پیزەکی بە ناوبانگە و بریتی لە حەوت، هەشت پارچە دێیە کە بە ناوبانگ[ترین] ئەوان چەشمە گێلاس و قەلای وەکیڵخانە. قەلای وەکیڵخان وا لە سەر تەپەکە و جێگای نیشتەجێ بوونی سەرۆکەکەیانە. پیزەکی لە دووسەد بنەماڵە کەمترە. پەنجا سوار ئەدات. حاکم و سەرکردەکەیان فەتحوڵڵاخان پیزەکییە کە لە ڕێگا لەگەڵ سوارەکانیدا گەیشتە لامان.

**ڕۆژی سێشەممە دەیەم:** ئەمڕۆ ئەبێ بڕۆین بۆ چەمەن قەهقەهە. چوار فرسەخی قورس ڕێگەیە. توزێ کە ڕۆیشتین لەسەر ڕێ موحەممەد ڕەحیم خان حاکمی چۆلاییخانە کە شەست سەر سوارەی چۆلاییخانەی سپاردوویە بە ئەو، لەگەڵ سولەیمان ئاغای برای و کوڕی موحەممەدخان ڕاوەستابوون. شوجاعودەولە ئەوانی پێناساند، کوڕەکانی موحەممەد وەلیخان چنارانیش کە یەکیان خان باباخان و ئەویشیان عەلیخان بوون. بە کورتی ڕۆیشتین لە قەلای وەکیڵخان تێپەڕین کەوتینە ڕێ و هەموو شوێنێک بەرەو ڕۆژهەلات بوو تا گەیشتین بە کاڵدێوینێ [دوین] کە سەرحەدی ئێمە وا لە نێوان خاکی پیزەکی و میان وەلایەتدا. ڕۆخانەیێک لە ناوەندی کاڵ دێوین دەڕوا کە ئاوەکەی دەچێتە ناو چەشمە گێلاس و دەڕوا بۆ مەشهەد. ئەم ئاویشە وەقفی حەزرەتە. ناوچەکانی پیزەکیش زۆر ئاوەدانە.

[٢٢]- لە ڕێزمانی کرمانجیدا پیتی«الف» دەبێتە«ی» وەکوو بار کە دەبێتە بێر وپازوکیش دەبێتە پێزەکی.

[٢٣]- گوندە کانی زینگر و شەیخکانلو و قەلای سادوو[زێرامکانلوو] وچوار مێهن، شەیخکانلووە موحەممەد ئاباد شەیخکانلوو[موستەکانلوو] ومیللی هەموویان هانە ئەم ناوچەیە کە لە خەزەلوەری ئەمساڵ[ساڵی٦٥] لە بارەیانەوە لێکۆڵینەوەم بوو. زینگر خراب کراوی زنگل و زنگانلووە.

هەموو ڕێگەوبان و گوندی بە یەکتر دەگەنەوە و پێکەوە لکاون. لە ناوچەی چناران زۆر ئاوەدان‌ترە. دێهاتەکانی ئێرە زۆرتریان وەقفی حەزرەتە و بڕێکشی بەشی پیاو ماقۆلان و بڕێکیشی بۆ ڕایەتە. [زۆرتری زەوییە چاکەکانی ئەم ناوچەیە وەقفە و خەلکی بەستەزمان لە خۆیان هیچ ئاو و ملکێکیان نییە] لەم ناوچەی میان وەلایەتە عەشیرەتی بادلوو [بادێلانلوو] وحەمزەکانلوو[٢٤] [لە تایفەکانی بە ناوبانگی کوردی زەعفەرانلوو] نیشتەجێن. عەشیرەتی بادلوو خەلکێکی هەیکەڵداری بە ناوبانگی درێژن و تۆزێ کە ڕوانیمان، گەیشتین بە دێیە بچکۆلەیێک کە ناویان بە «پایین دێ» دەبرد. نەهار لێنە بوین. ئەم ناوچەگەلیشە وەقفی حەزرەتی ڕەزایە. پاش نەهار سوار بوین و چوین شوێنی دەستی ڕاست ناوچەی شاندیز لە پای کێوەکە ئاشکرا بوو. گولـمەکانیش ئەبینرا. چوار سەعاتی بە خۆرئاوا مابوو، چووینە مالەوە. سەراپەردەکەمانیان لە چەمەن قەهقەهە دانابوو. [لێرەدا ماموستاکانی مەشهەد هەروەها شەیخوڕەییس قاجاڕ ئەگەیشتنە لای ناسرەددین‌شا]. بڕێ لە زەوی و بەزرەکان لە دوورەوە ئاشکرا بوو، شوێنی دەستی چەپ کەلاتەشابەندە، چێمەنێک کەلاغ مەلبەندی عەشیرەتی حەمزەکانلوو سەر بە گولـمەکانە. کەلاتە حەبەشی سەر بە پیزەکییە. کەلاتە حەسەن، سەییدئاباد، چقوورئولەنگ، چەهچەهە،

---

[٢٤]- حاجی خان حەمزەکانلو سەرلە شکر داگیرکەری دێهلی وبالوێزی نادر لە عوسمانی هەر لە کوردەکانی حەمزەکانلوو بووە. چاوکەن لەبەرگی هەوەل سەبارەت بە خێلەکان و عەشیرەتەکانی ناوچەی ڕادەکان کە لەگەلاڕیزانی٦٥ لێکولینەوە لەسەری کراوە ئاشکرا بوو کە ئیلبەیگیەکانیان لە کوردەکانی کەیوانلوو بوون. ئاغەی ئیسماعیل عەلی‌پوو سیووکانلوو گوتی: باوکی گەورەمان لە قەزەلحەساری چناران بۆ ئەم شوێنە هاتووە باقی سیووکانلووەکان لە قەزەلحەسار و چنارانن کە بنەمالەکانی حاجی ئەمروللا وشوکروللا وعەباسعەلی لەوانن. باقی سیوکانلوەکان لە ئووغازن. بەم بۆنەوە مالیاتەکانیان بە قووچان ئەدا. بۆررالییەکانیش«Borrali» هانە قەلای حاج نەسیر چناران وقەزەلحەسار. هێیزولانلوەکانیش هان لە عەلی ئاباد وئەو پەڕی چەهچەهە وقەیس ئاباد. ئاغەی عەلی ئەسغەر جانکانلوو گوتوویە کە ئێمە سێ ساڵ لەمەوپێش لە قەدیر ئابادەوە بۆ ڕادەکان هاتووین و٣٠ بنەمالەین کە لە کێوی برگیش کەلیدەر کە جێگای ڕەشماڵ نشینی با پیرانمان بووە بۆ ئەم شوێنە هاتووین. کۆمەلی ڕادەکان نزیکی یەک هەزار بنەماڵەن کە نیوەی زۆرتریان کورد وپاشماوەی فارس زمانن. ئاغەی قوربان موحەممەد جەعفەری دانیشتووی مەقسوود ئاباد گوتی: ئێمە سەر بە قووچان و لە عەشیرەتی شارەمانین و کوردەکانی مەقسوودئاباد لەم عەشیرەتانەن. شارەمانی٢٥ بنەمالەیە. تورسانلوو٦٠ بنەماڵە- ورانلوو ٧ بنەماڵە- جافرکانلوو ٢٢ بنەماڵە. تووپکانلوو ٨ بنەماڵە.

ئوچدوختەر، موحەممەدئاباد، شەمس‌ئاباد، ئاب دووش گۆن، چوار بورج، کەلاتە بادلوو، قەهقەهە. ئەم گوندانە تا کال دیوین ناوچەی پیزەکیە و دوو سێ ئاوایی لە بەشی گوڵمەکان و باقیش سەربە میان وەلایەتە. کەلاوەکانی شاری کۆنی تووس لەدەستی چەپی ئوردوو وەکوو کەلاوەکانی شاری ڕەی وەک تەپۆڵکە ئاشکرایە. خەڵکی ئەم ئاواییە زۆرتریان لە خێڵەکانی بادێللو و حەمزەکانلوو و باقیشیان ڕایەتە خۆیین.

**چوار شەممە یازدەهەمی شەواڵ [مانگی]**: ئەمڕۆ ئەبێ بڕۆین بۆ مەشهەدی پیرۆز. یەک فرسەخ کە چوین شوجاعودەوڵە [ئەمیرحوسەین خان] و ئەمین حەزرەتم نارد تاکوو شوێنێ بۆ نەهار دابنن. ڕۆیشتن و لەدەستی چەپ باخ و دێیێک کە ناوی«کەشف» بوو و بەشی مندالانی خوالێخۆشبوو میرزا عەلیڕەزای مستۆفی خوراسانە[٢٥]». لێرەوە ناسردین‌شا لە ناوچەی کوردنشینی خوراسان لەم ڕێگەیە ئەچێتە دەرێ و ئەڕواتە ناو مەشهەد کە پێویست بە گوتنی نییە. لە تەواوی ئەو کاتەی کە شا لە مەشهەددا بووە و سەرۆکان و خانەکانی خوراسان کە ئەگەیشتنە لای ناسرەددین‌شا، شوجاعودەوڵە بە شا دەیانی ناساند[٢٦]. ئەمیر حوسەین خان ناسرەددین‌شای هەتاکوو نەیشابوور ڕوانە کرد و پاشان بۆ ناوچەی حوکوومەتی خۆی لە قووچان گەڕاوە. لەم سەفەرەیە کە بە گوێرەی سەنیعوددەوڵە، یار موحەممەدخان سەهامووددەوڵەی ئیلخانی بجنۆرد و ئەمیرحوسەین خان شوجاعوددەوڵە ئیلخانی زەعفەرانلوو خەلاتی زۆریان وەرگرت و نازناوی ئەمیر توومانی (سپاپۆرتی)یان پێی درا. لە گەڕانەوەی ناسرەددین‌شا لە نێوان سەبزەوار و شاهڕوود جارێکی‌تر یار موحەممەدخان بەرەو پیری هاتووە کە ناسرەددین‌شا گوتوویە: لەبەر قەلای زیدەر ڕابوردین کە بینیمان لە پێش یار موحەممەدخان سەهامووددەوڵە حاکمی بجنۆرد ئاشکرا بوو وگەیشتە لامان و وت و وێژ کرا.

**ڕۆژی شەممە نۆزدەهەمی شەواڵ [مانگی]**: ئەمڕۆ لە مەیامەی بارمان خست و تەواوی ڕۆژ بە ئیش کردن تێپەڕ بوو. سەهامووددەوڵە کە لە بجنۆردەوە هاتووە.

---

[٢٥]- سەفەرنامەی ناسرەددین‌شا بۆ خوراسان، بەخەتی میرزا موحەممەد ڕەزا کەلهور، لاپەڕەی١٦٤.

[٢٦]- سەفەرنامەی ناسرەددین‌شا، لاپەڕەکانی ١٨٠و ١٨٦و ١٩٦و ١٩٨.

ئەمرۆ تەشریفی هێنا و ئەسپێکی پێنج ساڵەی زۆر باشی ساز کردووە پێشکەشی کرد.

**یەکشەممە بیستەمی زیقەعدەی ١٣٠٠ی کۆچی:** ئەمرۆ ئەبێ بڕوین بۆ «ئەرمیا» خەلاتێکمان پێشکەش کردبوو بە سەهامووددەولە و لەبەری کرد و گەیشتە لامان، پاشان مەرەخەس بوو تا بڕوا بۆ بجنۆرد.[٢٧]

سەبارەت بە پێروزبایی نەورۆز و تاریفی ئەمیرحوسەین خان شوجاعوددەولەی ئیلخانی زەعفەرانلوو: ئەمساڵ بەهاری نوێ موبارەک هاتەوە لە ملکی تووس، هاورێ ئەمیری گەورەی دنیا بە بۆنەی هاتنی ئەو خۆش‌تر لە بەهەشتە یاخوا مەگەر ئەم بەهارە لە بەهەشتەوە هاتووە ئەرێ لە بەهەشتەوە هاتووە بەڵام کاتێ کە ئەو دەیەویست لەم جیهانە بەرەو بەهەشت بڕواتەوە، بەهاری بۆ خۆی دەستنیشان کرد و گوتی: فێری سەفەرت دەکەم وریا بە، سەرەتا کە لە بەهەشتەوە ڕێت کەوتە جیهان ئەبێ بڕویتە خزمەتی ئەمیری خوراسان ئەگەرچی بە ڕەسم و بەزمی ئەمیر زۆر شتی جوان هەیە کە لە بەهەشتا خودا داینەناوە؛ بەڵام بە ڕەسمی پێشکەشی لەگەڵ خۆتا ببە لە پێشکەشیەکانی بەهەشت زۆر بە کارت دێت. پارچەی حەریر تاقە تاقە لەگەڵ خۆتا ببە شەمامە و عەتر هەڵگرە بار دوای بار گزگی ماڵەکەی کە لە ئەگریجەی حووریەکانی دەستە دەستە لەگەڵ خۆت ببە، لە لقەکانی تووبا تا سەمەر دەدا بەستە بەستە ببە و لە سێبەرەکەیدا بنوە، نۆکەرەکان لەگەڵ خۆتا ببە بە جامی نوورەوە بۆ دیداری بەرێزیان لە جیاتی دڵدارانی مەی گوسار تاتای برژانگی فریشتەکان ببینە، پاش لابردنی شەدەکانیان بۆ سەرخۆشی ئەمیر لەگەڵ خۆتا گوڵانی خۆش‌عەتر و بۆ ببە، بە هەورەکان ئاوی کەوسەر و تەسنیم[٢٨] ببە و لە کاتی بەربەیان‌دا بۆ جامەکەی ئەو بیهێنە، هەر شتێکت هێنا لە بەهەشتەوە زیادی بکەرەوە نیوەیکی بۆ ڕاست ببە و نیوەی تری بۆ چەپ؛ بەڵام هەر کاتێ باروبنەت بەست و ڕۆیشتی بۆ جیهان هەوەڵ باروبنەکەت لە جێگای سەربەرزی جیهاندا بکەرەوە ئەبینی عەمارەتێک کە زۆر بەرزە و حوکومەتێکی زۆرداری تێدا هەیە کاخێکە کە لە

---

[٢٧]- هەر ئەو بروانامە، لاپەڕەی ٢٣٢.

[٢٨]- تەنسیم= چاوکەیە کە لە بەهەشتا. فەرهەنگی عەمید- ل:٢٩٧.

ئاسمان بەرزتر و جوانترە، لەوێدا هەموو سەعادەت و گەورەیی دێت و ئەڕوا و ئەستێرەی سەربەرزی دەبینیەوە، بێئیزن گرتن بۆ ئەو شوێنە مەڕۆ، لە نۆکەرانی ئەمیر داواکاری بکە، ئەگەر ئەمیر تۆی وەرگرت ئەوکاتە خاکەکە ماچکە و بڕۆ، پاشان لە بەرانبەر قیبلەی ئەمیرانی ڕۆژگاردا نوێژ بکە، هەوەڵ لەمن کە باخی بەهەشتم، ڕێ و شوێنی سلاو و ڕێزگرتن بە جێ بێنە، پاشان هەر شتێکت لە بەهەشتەوە بە پێشکەشی هاوردووە دانە دانە بە ئەدەبەوە بیدە بە ئەمیر و پاشان بە با بڵێ کە ئافاق گزگ بدا و بەهەور بڵێ کە بباریێتە سەر کێو و دەروبان، ئەگەر کاری کشت و کاڵەکەی باش نیە هەمیسان زیندووی بکەوە و کاریان بدەرێ، گەنم و جۆ، کێو و دەشت بڕازێنەوە. بە سەوزەلانی جوان، دەشت و دەر فەرش بکە و عەتر و بۆنی خۆش بدە لە زۆڵفی سونبوڵەکان و جامی زەڕ بدە بە دەستی نەرگسە بچکۆلەکان، کێوەکان وەکوو لەعل پڕ لە گولالە بکە و دەشتەکان وەکوو مرواری شاهانە پڕ لە گۆلی ژالە بکە، بڵێ بە هەرچێ باڵداری خۆشدەنگە بێن، بڵێ بولبولەکان ئاهەنگی خۆشی و چەنگوتار لێ بدەن، دەسبەنێ لە ئەڵماس بە دەستی یاسەمەن بکە و گۆشوارەیێک لە بەردی لەعل بە گوێ ئەرغەوانا بکە، بڵێ لە جەژنی ئەمیردا بەرق پێکەنینی قاقا بکات و لە تووڕە بوونی ئەمیر بڵێ هەور شیوەن و زاری بکات، لە گولالەکانی باخ ساقی دروست بکە تاکوو نەرگسەکان بەربەیان خومار بن و بشەکێنەوە بەو بۆنەوە کە ئەمیر ئەیەوێ بڕوا بۆ تواف لە دەرگای ئیمام کە نووری خودایە، کوڕی کچی پێغەمبەر جگەرگۆشەکەی ڕەسوولی خودا و سوڵتانی جن و ئینسان و خودای مێلووره و مار؛ کەسێ کە حوکمی قەزاوەتی ئیمزا کردووە - حەزرەتی ڕەزا- کە گیان هەموو کات لە بەردەمیدایە، خودا بەم خولقاندنەی خۆی ئافەرینی گوت کە زاتێکی گەورەی خولقاند، وایە لەم سەفەرەتدا دەبێ هاوڕێ ئەو بی، چۆن سەفەری گەورەیی و عەزمەتە تۆ ئەبێ پێ لە سەر عەرزدانەنی تا ئەو پا هەڵدەگرێ، ژێر پای گوڵباران بکە، ئەو کاتە ئەیەوێ دابەزێ لەغاوی بۆ ماچ بکە و ئەو کاتەی ئەیەوێ سوار ببێت وزەنگی بۆ بگرە و ئەو کاتە ئەمیر ڕۆیشتە ناو زێنی پیرۆز و هەموو کەس و هەموو شت گەیشت بە گەورەیی، خۆر لە بەرانبەریەوە وەک

سێبەرە، تـو ڕاوەسـتە بـە سـەد ئەدەبـەوە دەسـتی بەنـدەیی بکێـشە لـە وتـەی «سەبووری[٢٩]» وێژەری تایبەتی ئەو، ئەم شێعرە ئاودارەی بۆ بخوێنەوە، ملکی شـا لـە بۆنەی تۆ سەرکەوتووە خۆر و مانگ بە تیـشکی نـووری تـۆ دەناسـرێن، لـە نـەیزەی ڕاستی تۆ دوژمن ناکار کراوە لە شەمشێری لاری تۆ ملکی شـاریار ڕاسـت ئەبێتـەوە، دەستی تۆ لە کاتی پێشکەش کردندا بە پاشای دەریایە تێخی تـۆ لـە ڕۆژی شـەڕدا وەکوو هەورێکی لە ناوبەرە هەم تریفەی نووری خودای لە سـەرەتای بـەزمدا و هـەم نەترسی دەوڵەتی شاهی لە گۆڕەپانی ڕەزمدا، تـۆ خـوەری ڕوژهـەلاتی کـە نـووری دەسەلاتی تۆ هەتاکوو ڕۆژئاوا ڕۆیـشتووە، دونیـای قـەدر و گـەورەیی تـۆ بـێحـەد و بێپایانە، دەریای بەخششی تۆ بێپایان و کەنارە، هەروەها میهـری تـۆ لـە پیـاوەتی، چەرخی تۆ لە عەزەمەت، هەوری تۆ لە بەخشش و کێوی تۆ لە ماقۆڵی تـۆ لقـی ئـەو دارەی کە لە ڕێژاوی گەورەیی ڕیشەی سـەرکەوتوویی هەیـە و لـە ڕێـز و حورمـەت گەلا و باری هەیە، تۆ ئەو جلەی عێـزەتی کـە خـودا لـە بـەرتی کـرد کـە ئاسـەڕی گەورەیی و تار و پۆی مەنزیلەتە، ئەو کەسەی لە تێخی تـۆ و لـە پەنجـەی عیزرایـل داڵدەخواز بووە، ئەو کەسەی لە بەخشیشی تۆ عاقیبەت بەخیر ئەبێت، لە ڕەحمـەتی خودا عاقیبەت بەخیر بووە. پاوشایی بە گەورەیی تۆ شانازی دەکات ئـەی بنەماڵـەی گەورەیی! ئەی گەوهەری شانازی ئەو کەسەی خۆی لە گەورەییدا وەکوو تۆ دادەنـێ ڕۆژگار بە ڕیشی پێدەکەنێ، قورئان لە کوێ و تورەهات لە کوێ، مزگەوت لە کـوێ و دەیر لە کوێ، پیرۆزی لە کوێ و بەزین لە کوێ، مینبەر لە کـوێ و چێـو لـە کـوێ، خودا لە کوێ و مەخلووق لە کوێ و ژیان لە کوێ و مەرگ لە کوێ، فریشتە و پـەری لە کوێ، تیشک لە کوێ و ئاگر لە کوێ گەورەیی و تاجی سەر لە کـوێ و پـێلاو لـە کوێ، شیرینی لە کوێ و تاڵی مەنزەل لە کوێ، ژووری خۆر لە کوێ و وردە تیـشک لە کوێ، دەریا لە کوێ و دلۆپ لە کوێ، گوڵ لە کوێ و دڕک لـە کـوێ، ئەگـەرچی

---

[٢٩]– «سەبووری» نازناوی شاعێر بوو ناوی موحەممەدکازمو لە کوردەکانی دەنبلـی ئـازەربایجانـە کـە باپیرانی هاتوون بۆ کاشان. میرزا کازملە نەوادەکانی میرزا ئەحمەدی کاشانیە کە لە کاشان بۆ تاران‌و لێنەوە بۆ خوراسان هاتوون. ئەو برازاگی مەلێکولشوعەرای کاشانیو باوکی مەلێکولشوعەرای بەهـاری خوراسانیە. بنەماڵەی فەتحعەلیخان سەبا مەلێکوشوعەرا کە لە با پیرانی سەبووریە لە سەردەمی نادر بۆ کاشان کۆچیان کردووە. دیوانی سەبووری پێشەکی. لاپەڕەی٦.

شەیتان لە ئەزەڵ فریشتە بووە بەڵام هەرگیز ناتوانێ ببێ بە پیاوچاکی خوا، تۆ وەکوو شاڵێکی زێڕینی کە تەواوی خەڵک بە تۆ شانازی دەکەن تۆ مایەی شانازیت بۆ خێڵی جەلیلی و ئیلخانی، پشت و بازۆی ئەم خێڵە بە تۆوە وەستاوە ئەی ئەمیر«سەبووری» ئەو شاعێرەی کە شێعری بە دیاری دەنارد بۆ شاعێران. لەڕووی ڕاستیەوە ستایشی تۆی کردووە، وتن و بویژی بۆ تۆ خۆش‌تر لە شیر و شەکرە، لە سەردەمی منداڵیدا، ئەمڕۆ کە هەموو کەس چاوەڕوانی گەورەیی و بەخشندیی تۆن تاکوو ڕۆژگار هەیە لە ساڵ و مانگ و حەفتە و شەو و ڕۆژ هەموو کاتێ ئەمڕۆت لە دوێنێت و ئەم ساڵیش لە پارت خۆشتر بێ، هەموو کاتی ژیانت بە سەرخۆشی تێپەڕ بێت، لەم شێعرەدا بەخشیشی تۆ لەگەڵ قافیەدایە، ئەر دووپات کراوەتە، نە عەیبە و نە عارە، لەبەر ئەوەی یادگاری تۆ لە ڕۆژگاردا بمێنێتەوە با لە منیش ئەم شێعرە بۆ یادگار بمێنێتەوە[٣٠]، لە تاریفی [ئەمیرحوسەین خان] شوجاعوددەولەی زەعفەرانلوو قاسیدی بای شەماڵ بۆنی خۆشی لە تاتارەوە هێنا یان لە ڕێگەی وەفانامەی سەرداری. مردبووم بەم نامەیە زیندوو کرامەوە، ئەم نامەیە ئاوی حەیات بوو، شوکر بۆ خودا کە لە باخی ئەوینەوە نەهاڵی ئومێدی من لە هەوری بەخشش سەمەری گرت، سەروکاری من لەگەڵ خەڵکا نییە بەو بۆنەوە قاسید نامەی جوانی لە گەورەیێک هاوردووە، پیاوی مەزن و گەورە، بەڕێز شوجاعوددەولە کە لە مۆلکی ئەوەوە نامەبەر ڕەوح و ڕەیحانی هاورد ئەو کاتە خوەری فەلەک کاخی گەورەیی ئەوی بینی بە ئومێدەوە ڕووی کردە لای دیوارێک کە سێبەری هەیە زەمانە بێ‌هاوتاکانی ڕوژگار زۆری بردووە تاکوو ئەم بێ‌هاوتای ئێستاییە بەدی بێنێ. تیرە و تایفەی وەکوو سەدەفێک بوو بەو بۆنەوە خودا ئەیەویست ئەم گەوهەرە بەدی بێت، ئەو هەموو شتانە کە چەرخی زەمانە بە دی هێناوە، هیچ یەکیان وەکوو ئەستێرەی پڕ ڕووناکی ئەو نین، ئەو هەموو نەخشانە کە قەڵەمی خۆلقاندن بە دی هێناوە، هیچ‌یەکیان وەکوو ئەم نەخشە نەبووە، گەورەیی ئەگەر مەرامی گەردوون بوو، ویستی هەر کەسێ گەورە بکات گەورەی کرد هەرکەسێکیشی بە قسەی نەکرد و فەرمانی نەبرد ڕۆژگاری ڕۆشن بوو، ئەگەر هەژارێک چووە بەر درگاکەی بە دەستی

---

[٣٠]- دیوانی سەبووری- لاپەڕەی ١٩٠.

خالی نەگەڕایەوە و بە دەستێکی زۆر پڕەوە گەڕایەوە، ئەگەر شاعیرێک ستایشی ئەو بکات وەک شاعیرانی یەمەنی پێ دێت، ئەگەر لەبیر چوونەوەی ئەو منی پەکەر کرد؛ بەڵام لە ڕێ ئەودا من دووبارە هیوام هەیە. بولبولی هەستم بە تەواوی خامووش بوو، هەمیسان ئەو گەورەییە هێنایەوە وتار، وەک وشترێکی نێر کە لە قافڵە جێ دەمێنێ، منیش وەها بووم. بەڵام ستایشی تۆ ئەی ئەمیر هێناومیە سەر هێڵ. هەستی من لە ئاگر بوو، بەڵام ئەمیر لەهەر گرێ و دەردێک ئازادی کردم، هەر هونەرمەندێک کە ویستی سەرەتا ببێ بە هونەرمەند، بە ستایشی ئەمیرەوە توانی ببێ بە هونەرمەند، ئەی قەڵەم دووبارە بێژە و ڕامەوەستە کە گەورەیی ئەمیر دووبارە کارتی خستەوە ڕێ.[٣١]

## کێشەکانی ئەمیرحوسەین خان و قەهرمان خان نایبولحوکوومە

ئەمیرحوسەین خان کەم تا زۆر بە بۆنەی بەڵگە ناسراوەکانەوە ناسیوویانە. لەو بەڵگانە وەدەست دێ کە ئەو کەسێکی بێهاوتایە لە مێژووی خوراسان بە تایبەت لە قووچاندا ئیلخانییێکی دەسەڵاتدار بوو، سەختگیر، دلێر، زیرەک، نەترس و عادڵ و بەرزیخواز و ڕایەتپەروەر بووە. ئاغەی شاکری بە گوێرەی مودیری دیوانی ئەفشار کە ڕۆژگارێ لە لاوترین سەرقەڵەمەکانی شوجاعوددەولە بووە هاوردوویە کە: ئەمیر حوسەین خان حاکمێکی دەسەلاتداری بە توانا بووە و لە مەجالیسی گشتی عەزاداری حەزرەتی سەییدوشوهەدا (سلاو و درووودی خوای لێ بێ) کە هەموو ساڵێ لە دەهەی عاشوورا پێک ئەهات لەسەر کورسیە تایبەتیەکەی خۆی دائەنیشت و بە جلی فۆرم و قەنارە و تیرەوە قیافەی حاکمەکانی بە خۆی ئەگرت. ئەو لە حوکمدان بۆ خراپەکاران سەختگیر و بێگوزەشت و بێڕەحم بووە [و ئەحکامی شەرعی ئیسلامی لە هەرێمی حوکوومەتی خۆی بەسەختی جێ بە جێ دەکرد، بەم بۆنەوە لە ناوچەی قووچان دزی و ئیشی ناشرین کەمتر ڕووی ئەدا کە وابوو یەکێ لە مستۆفیەکانی کە مەحکووم بوو بەوەی ڕشوەی لە خەڵکی وەرئەگرت قامکیان بڕی بوو] و بەم بۆنەوە لە دەورەی ئەوا قووچان ئاسایشێکی هەبوو. بە جۆرێ کە شۆڕشە

---

[٣١]- دیوانی سەبووری مەلێکولشوعەرای ئاستانی قودسی ڕەزەوی- لاپەڕەی١١٣.

لەسەریەکەکانی تورکەمەنەکان تەواویان سەرکوت کراون. خوالێخۆشبوو ئەمیرحوسەین‌خان - سوڵتانی بێ‌تاج- ساڵێ دوازدە هەزار خەروار خەرمان دەرامەتی ملکی بووە و هەرێمی ملکەکانی لە چنارانی مەشهەد تاکوو چنارانی بجنۆرد درێژەی بووە[٣٢]. ئەڵبەت ئەمیرەکانی کوردی خوراسان بەتایبەت حوسەین‌خان خۆیان سوڵتانی بێ‌تاج نەدەزانی؛ بەڵکوو ئەوان نە تەنیا خۆیان بە سوڵتان یا پاشای تاجدار دەزانی بان‌تر لەوە واتا خۆیان شاهەنشا دەزانی[٣٣]. لەبەر ئەوە بوو کە بازێ لە شاکانی ئێرانیان بە ڕەسمی نەدەناسی. بەو جۆرە کە نادرشای ئەفشار و جێگرەکانی و هەروەها پاوشاکانی زنجیرەی قاجارپیەیان بە داگیرکەری تەختی شاهەنشاهی ئێران دەزانی و لەهەر دەرفەتێکدا لە بەرانبەریان شۆڕشیان دەکرد. ئەوان لەبەر ئەوەی خۆیان شاهەنشا دەزانی کە سەدان و بەڵکوو هەزاران ساڵ بوو کە پێشەوایی یەکێ لە گەورەترین و چارەنووسانەترین خێڵەکانی شۆڕشگێڕی ئێران چ لە سنووری ئێران و ڕۆم و چ لە خوراسانەوە وەئەستۆ بوو و گەورەترین پارێزگارانی نیشتمان و سنوور دارەکانی وڵات بە ئەژمار ئەهاتن و خەزانە و ئامێری شەڕ و ئاشتیان هەبوو لە حاڵێکدا هیچ یەک لە سەردەمدارەکان لە دوای ئیسلام لە ئێراندا تەنانەت شاهەنشایی درێژی سەفەویەیش ئاوا پلە و بنکە و دەسەڵاتیان نەبووە. بەڵکوو ئەوان چەن کاتێک وەکوو ئەستێرە ئەدرۆشن و پاش چەن ڕۆژێک ئەکوژێنەوە و نەیانتوانیوە لە تەواوی ئێرانیش‌دا حوکوومەت بکەن. بەو جۆرە کە بووداق‌خان موکری گوتوویە: هەرگیز بە شا ئیسماعیل (دانەری زنجیرەی سەفەویەکان) دەرفەت نادەن کە ئاوی ناوچەی موکریان (مەهاباد) بنۆشێ[٣٤]. بەڵام

---

[٣٢]- ئەترەکنامە- شاکری لاپەڕەی٧١.

[٣٣]- ئاغەی حاج غولامڕەزا شێخ ئەمیرلوو دانیشتووی گوندی زیارەت شیروان بەڵگەکانی لەبارەی ئیمامزادە بوونی زیارەت بە من مەرحەمەتی فەرمووە کە دروست بوونی وتارەکەم نیشان ئەدات. لەوێدا ئەحکامێک کە لە ئیلخانی کورد لە دەورەی نادرشاوە بەمەو لایە و ئیلخانانی زەعفەرانلوو دەردەخرا. لەسەر ناوەکەی هاتووە کە[حوکم عالی بوو]- [دەستوور عالی بوو] ویاکوو ئەوەی[موقەڕەر بووە] کە ئەمە ڕادەگەینێت کە ئەوان وەکوو شایێک ئەمرۆ نەیان دەکرد وتەمامی سەربەخۆ بوون. ئەم بەڵگانە بەو بۆنەوە کە پێوەندی بە ئیمامزادەی زیارەت هەیە لە کتێبی[امام رضا در ادبیات کرمانجی] پیشان ئەدرێت.

[٣٤]- بڕوانن بۆ عالەم ئارای عەباسی ومێژووی مەهاباد؛ سەید موحەممەد سەمەدی وشۆڕشی

ئەمیرەکانی قەڵا، ڕیشەیان لە خێڵا کوتابوو، بە خێڵێک حوکوومەتیان دەکرد کە لەکاتی پێداویستی ئەیانتوانی لە کورتە کاتێک سەد هەزار پیاوی شۆڕشی شمشێر لەدەس و سوارە و دوژمن‌کوژ وەکوو نەجەف سوڵتان قەراچورلوو و حاجی‌خان حەمزەکانلوو و تەهموورس شادلو، حەسەن‌خان ڕۆشنی خاونی نەیزەی دوو شاخ ببەنە ناو گۆڕەپانی شەڕ و چارەنووسی مەیانی شەڕ دەربخەن. بەم بۆنەوە شای ڕاستەقینە ئەمانە بوون. ئەگەرچی خۆیان شا نەخوێندووە و پاشاییان نەکرد؛ بەڵام شاتەراش بوون. ئەوان بوون کە شایان لەسەر تەخت دادەنا یاکوو لەتەخت هەڵیاندەگرت. دەوڵەتی شا ئیسماعیل سەفەوی بە یارمەتی ئەم کوردانی خوراسانە و بە پێشەوایی ڕوستەم بەگ چامشگەزک هێزی گرت و نادرشایش هەر ئەم کوردانە هێنایانە مەیدان و لەمەیدان خستیانە دەرێ. موحەممەدحەسەن خان قاجاڕ باوکی ئاغە موحەممەد خانیش کە داوای سەڵتەنەتی ئەکرد. سەبزعەلی‌بەگ کورد قەراچورلوو سەری بڕی و خستیە بەر پای کەریم خان زەند و زنجیرەی زەندییەی هێنایە ڕووی کار. کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتی خاین و وڵات فرۆشی قاجاڕ هەر لە ڕۆژی هەوەل تا دواین کات لە شەڕ و شۆڕشا بوون. ڕەزاخانیش هەر ئەوان پاش کوشتنی کولونێل موحەممەدخان پسیان هێنایانە ڕووی کار و دووبارە فەرهادخان توپکانلوو، وەلیخان قەهرەمانلوو دەیانەویست بە کوشتنی ڕەزاشا لە قووچانەوە شوێنی مێژوو بگۆڕن کە تەیموورتاش بەرگری ئەم مەبەستە بوو. شۆڕشی سەعادەتقولی‌خان کەیکانلوو بەرانبەر ڕەزاشا و هەروەها شۆڕشی فەرەجوڵلاخان بیچرانلوو «هەڵۆی کوێستانەکانی خوراسان، پاش خەرمانانی ١٣٢٠ و پاش لە ناو چوونی موحەممەدڕەزا شا پەهلەوی هەر لەم بارەوە بوو کە لە دوای ئەو کەریم‌خان بیچرانلوو کە لە شەڕی شەقامی لە تاران کوژرا هەموویان ئاڵادارانی ئەم دەستە لە هەڵمەتەکانی ڕزگاری‌خوازی خەلکی ئێران و ڕزگاری لە ژێر زۆری شاهەنشاکانی دەس نیشانەی ڕووس و ئینگلیز و ئامریکا بوون.» دەوری کوردەکانی خوراسان هاوشانی گەلانی ئێران هەمووکاتێ لە ڕێگای دوور و درێژی مێژوودا خۆی نواندووە و

---

کوردەکانی موکری؛ ئەحمەد شەریفی و کورد و کوردستان؛ موحەممەد ئەمین زەکی و کتێبە مێژوویەکانی تر.

خۆی ئەنوێنێ و ئەمە بە جوانی دیارە و وڵامی گیانبازانی کوردی خوراسان بەرانبەر شەڕی عێراق دژی ئێران ئەم ئومێدە بە ئێمە ئەدات. بۆ بیر هێنانەوەی نووسراوەکانی سەرەوە پێویست بوو بگەڕینەوە بۆ سەری نووسراوەکانی بنەڕەتی کە دوژمن هەموو کاتێ دەیەویست کێشە بخانە نێوان کوردەکانی خوراسان و لە یەکگرتوویی ئەوان بەرگری بکات. ئەمە بەدەستی عەباس میرزا نایبوسەڵتەنەی قاجاڕ کە خۆ فرۆشی ڕووس بوو شەڕی قووچانی بەیارمەتی دوو پەل لە لەشکری ڕووس و بە سەرکردەیی ڕاستەوخۆی ئەفسەرانی ڕووسی و ئینگلیز بە قازانجی خۆی دوایی هێنا، پێکهات و کوردەکانی خوراسان کە تا ئەو کاتە سەرعێلی و دەسەڵاتداریان هەبوو بە دوو سەرعێلی زەعفەرانلوو و شادیلوودا بەش کرابوون و ئەوانی لە بەرانبەر یەک دانا، تا لە کێشەی نێوانیان بە قازانجی حوکوومەتی خۆی کەڵک وەر بگرێت. ناسرەددینشایش کە لە ترسی زۆری ئەمیرحوسەین خان ئیلخانی زەعفەرانلوو تووشی ترس هاتووە دەیەویست قەهرەمانخان کە لە ئامۆزاکانی شوجاعوددەولە و لە نەتەوەی ڕۆشەن خان[35] بوو لە بەرانبەری ئەمیر دابنێت و بەم جۆرە ئەم فەلاکەتە گەورە لە سەر ڕێگای خۆی هەڵگرێ. ناسرەددینشا لە دوژمنی نێوان ئەمیر حوسەینخان و بنەماڵەی ڕۆشەنی کەڵکی وەر ئەگرت، بەم جۆرە کە پاش ئەوەی سامخان شوجاعوددەولە داگیرکەری هەرات و برای گەورەی ئەمیرحوسەین خان بە دەستی حە کیمی تایبەتی ناسرەددینشا مەسموووم کرا و لە ناو چوو (١٢٧٥ مانگی). قودرەتوڵڵا ئاغا ڕۆشەنی ئامۆزای شوجاعوددەولە کە لە شەڕی هەرات شۆڕشگێڕی و گیانبەخشانی زۆری کردووە و بە شمشێری سامخان ناوبانگی دەرکرد بوو. بە جێ سامخان بە حوکوومەتی قووچان گەیشت. ئەمیرحوسەین خان کە سەرۆکی ئیلی زەعفەرانلوو بوو بە مافی خۆی دەزانی لە بەرانبەری بووەستێ. لە ئاکامدا پاش هاتنی نوێنەر لە تاران و زانایانی خوراسان بڕیار درا جلی تایبەتی و تازیانەی تایبەتی کە نیشانەی حوکوومەت بوون

---

[35]- قەهرەمان خان کوڕی نەجەفقولی خانی کوڕی حەسەن خان خاوەنی نەیزەی دوو شاخ کوڕی ڕۆشەنخان هاوچەرخی فەتحعەلی شای قاجاڕ بوو کە لە شیکردنەوەی ژیانی موحەممەد ئیبراهیم خان ڕۆشەنی دوایین ئیلخانی زەعفەرانلوو لەبارەی ئەمیرەکانی بنەماڵەی ڕۆشەنی کە زۆرکات حوکوومەتی ئەسفەراینیان هەبوو زۆر قسە ئەگوترێ. ئەڵبەت لە بەرگی چوارەمدا.

بۆ ئەمیرحوسەین خان بێت و دەسەڵاتەکانی تریش لە دەستی قودرەتوڵڵاخان. ئاشکرایە کە ئەمیرحوسەین خان نەیدەتوانی حاکمێکی بێدەسەڵات بێت، بەم بۆنەوە لە شەڕ لەگەڵ تورکەمانەکان لە ئاقدەربەندی سەرەخس ئەو جۆرە کە گوتوویانە سەعادەت قولیخان ئووغازی ناچاری کردبوو کە لە پشت سەرەوە قودرەتوڵڵاخان بکوژێت، بەم جۆرە ڕەقیبی ئەمیرحوسەینخان کوژرا کە خوێنەکەیان کردە مل تورکەمانەکان. بەڵام تورکەمەنەکان گوتیان ئەگەر لە بەرەوە تیری خواردبێت کاری ئێمەیە و ئەگەر لە پشت سەرەوە خواردبێتی کاری سوارەکانی ئەمیرحوسەین خۆی بووە و چونکوو قودرەتوڵڵاخان هیچ کاتێ پشتی لە مەیدانی شەڕ هەڵنەدەکرد، ئاشکرا بوو کە لە پشتەوە تیری خواردووە بەڵام ئەمیرحوسەینخان دەرفەتی نەدا کە ئەمە بڵاو بێتەوە و بەم جۆرە ڕەقیبی لە بەرانبەر خۆی لابرد. پاش ئەم ڕووداوە خوشکی قەهرەمان خان کە کچی مامۆی قودرەتوڵڵا ئاغا و لە ژنانی هێژای ڕۆشەنی بوو کردیە خێزانی خۆی و نایبولحکوومەتی قووچان و حوکوومەتی ئیسفراینیشیدا بە قەهرەمان خان و ئەوی خستە ڕێگە بۆ ئیسفەراین تا لە بەر چاوی دوور بێت. لەباری نیزامیەوە قەهرەمان خان مەقامی میرپەنجی [سەرلەشکری] هەبوو. بەڵام دوژمنانی ئەمیرحوسەین خان کە لە سەر لە ناو بردنی ئەوا بوون هەمووکات لە بێهێز کردن و کێشە خستن لە نێوان سەر ئیلەکان دەیانکۆشی تا لە ئاوی لێڵ ماسی گرن. بەم بۆنەوە کاتێک ئەبولحەسەنخان کوڕی ئەمیرحوسەینخانی بەرانبەر باوکی هەڵخڕان و کاتێک قەهرەمان خانیان بە شۆڕش ناچار دەکرد و بڕێک لە مەلاکانی قووچان لەوانە خوالێخۆشبوو ئاخون مەلاموحەممەد کازم هەمەدانیش لەم کارەساتە دەستیان هەبوو. ناوبراو کاتێ کە سام خان ئیلخانی زیندوو بوو فەرمانی پێ درابوو کە لە سەر خاکی ئیلخانی گەورە خوالێخۆشبوو ڕەزا قولی خان قورئان بخوێنێ[٣٦]. ئەو لە

[٣٦]- لەم بارەوە گرێبەندی ژێرەوە لەلایان ئەسەدوڵلابەگ پاڵێوراوی سام خان لەگەڵ خوالێ خۆش بوو مەلا موحەممەد کازم و باقی مەلاکان بەسراوە: بە ناوی خوای مەزن، ئەم نامیلکەیە بۆ ئەوەی نووسرا کە حازر بوان، بەڕێزان مەلاحوسەین ومەلا موحەممەد تەقی ومەلا موحەممەد کازم قووچانی لەڕووی مەیل وئیرادەی خۆیانەوە و بە بێ زۆر لەبەرواری ١٧ ڕەمەزانی ساڵی١٢٧٤ ی کۆچی[؟] بە ماوەی ساڵێکی تەواوی هەتاوی، گەیشتن بەوەی کە گەورەپیاو سام خان شوجاعودەولە سیوشەش

بنەڕەتدا هەمەدانی بووە و لە ساڵی ١٣٢٦ مانگی لە قووچان لە دنیا دەرچووە. قەهرمان خانیش زۆرتر لە کۆڕەکانی پەند و نەسیحەتی عالماندا بووە و وتراوە کە هەر کاتێ ئەڕوا ناو کۆڕی دەرسی حاجی ئیبراهیم موجتەهید سەبزەواری (لە شاگردەکانی حاج مەلا هادی سەبزەواری) موجتەهید بۆ ڕێزی ئەو لە جێ هەڵئەسا و بەم بۆنەوە شاگردەکان بازخواستیان دەکرد کە لە بەر پای خانێک بۆ چی هەڵئەسیت و حورمەتی عیلم دەشکێنی. حاجی لە یەکێ لە ڕۆژەکان کە قەهرەمان خان هاتووەتە ناو، ئەویش باسێکی زانستی، ئایینی و فەلسەفی لە نێوان قەهرەمان خان و شاگردەکانی خۆی بە کێبەرکێ دانابوو و قەهرەمان خان لەوێ سەرکەوتوو بووە و پاش ڕۆیشتنی ئەو، موجتەهید سەبزەواری بە شاگردەکانی گوتووە: ئێستا بینیتان کە من لەبەر پای چ کەسێ هەڵئەسام، ئەم خانە زانایە: شاگردەکان داوای لێ بوردن دەکەن، پاشان زۆرتر لە ڕابردوو لە قەهرەمان خان ڕێز دەگرن. ئەگوترێ کە قەهرەمان خان قوتابخانەیێکی بە ناوبانگی هەبووە. هۆی لێقەومانی قەهرەمان خان ئەمە بوو کە لەگەڵ هێزی ئەمیرحوسەین خانی ڕووبەڕوو بوو و کێشەکانی ملکی نێوانیان لە سەر زەوی و زارەکانی ئیسفراین بوو و بە هۆی ئەوە کە بەڵگەیێک لەم بارەوە بە مۆری شازادە حێساموسەڵتەنە والی خوراسان لە ساڵی ١٢٨٩ مانگی نیشان دەدەرێ، هەرچۆن بێت قەهرەمان خان جارێکی تر وەکوو ڕەقیبێک بۆ ئەمیرحوسەین‌خان خۆی نواند. ناسرەددین‌شایش کە لە هێز گرتنی ئەمیر لە خوراسانەوە دەترسا، بە شوێن بیانوییێک ئەگەڕا تاکوو ئەو لە خوراسان دوور خاتەوە، بەم بۆنەوە بڕیاریان دا بە قەهرەمان خان کە لەم کاتەدا لە قووچان دەرکرا بوو دەسەڵاتی پێ بدەنەوە. شا دەیکۆشی کە قووچانیش وەکوو باقی ناوچەکانی وڵات لە دێهاتەوە، هەتاکوو شار کە بوو بە ملکی شازادەکانی قاجار بیهێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. لەبەر ئەمە ئەمیرحوسەین خان بانگ دەکا بۆ تاران و دەست بە سەری دەکا و ئەنووشیروان میرزای بۆ حوکوومەتی قووچان و قەهرەمان خانیش بۆ جێگری حوکوومەتی ئەو هەڵدەبژێرێ؛ بەڵام ئەبولحەسەن خان کوڕی ئەمیرحوسەین خان

---

تمەن وەک پارەی خزمەتکار بدات بە بەڕێز ئەسەدوڵلا بەیگ تاکوو ئەویش بەهەرکامەیان ١٢ تمەن بدات واتا هەر مانگێ تمەنێک بۆ هەرکامەیان

لە هاتنی ئەوان بۆ ناو قووچان بەرگیری دەکات. دەسەڵاتی ئابڕۆ نەماوی قاجاڕ دەنگی دەردێت و ئاشکرا دەبێت کە جارێکی تر کوردەکانی قووچان ئامادەن کە دژ بە دەسەڵات بووەستن و هەر چۆن بێت حازر نین مەیدان خاڵی کەن و بیدەن بە دەستی قاجاڕەکان. بەم بۆنەوە ناسرەددین‌شا بە جێ‌بەجێ کردنی والیەکانی خوراسان و دەس بە داوێن بوونی مەلاکانی خوراسان دەیەوێ لە ڕێگەی دڵخۆشی‌دان و نەرمی ئەبولحەسەن خان لە قووچان دوور بخاتەوە و شازادەی قاجاڕ لەوێدا دامەرزێنێ، کە ئەم دەستبڕینە بێ‌ئاکام دەمێنێت و شا لە ئاکامدا ناچار دەبێت ئەمیرحوسەین خان بنێرێت بۆ قووچان لە بەر ئەمە ئەبولحەسەن خان هەڕەشەی لە ناسرەددین‌شا کردووە و گوتوویە ئەگەر ئیلخانی لە زیندان ئازاد نەکرێت خاکی تاران بە ئەسپەکانی زەعفەرانلوو دەڕژێنێتە دەریای مازەندەران دایکی ئەبولحەسەن خان لە تورکەمەنەکانی یەمووت بووە و توانیبووی تورکەمانەکانیش دەگەڵ خۆی یەکگرتوو کات، لەبەر ئەمە شا زۆرتر لە پێش دڵەڕاوکێ بوو و وای بە چاک زانی کە ئەمیر بنێرێت بۆ حوکوومەتی قووچان، بەو مەرجە کە ئەبولحەسەن خان بە ناوی بارمتە بڕوا بۆ تاران. بەڵگەگەلێک کە بە دەستی ئێمە گەیشتووە بە چڕ و پڕی دەیانڵێینەوە و ئەم ڕاستیە دەردەخات کە کێشەکانی قەهرەمان خان و ئەمیرحوسەین خانیش چەن ساڵ درێژەی پێ دێت مەرگی قەهرەمان‌خان بۆ خاتری ڕێزگرتنی شا لە ئەو لە لای ئەمیرحوسەین‌خان لە ساڵی ١٣٠٠.

کاتێک کە شا لە بجنووردەوە بۆ قووچان ڕێ کەوت. لەنزیکی شیروان کە قارەمان خان و سوارەکانی لە پاڵ ئەمیر حوسەین‌خان دی سرنجی‌دا لە عەمەڵیاتی نیزامی و ئەسپ سواری ئەوان. سەری لەقاند بۆ ئەو وپێی گوت: ئیزی‌قارە گوزی‌قارە، ئاتی‌قارە، بورگی‌قارە، حەیف کە ئەم میداڵە زەرد ڕەنگەی ئاوێزانی خۆی کردووە و هەمووی ڕەشتی شێواندووتە یەکا[٣٧]. شا بۆ ئەوەی کە زۆرتر قارەمان‌خان بناسێنێت، خەلاتێکی لە تارانەوە بۆی نارد کە بوو بە هۆی مردنی.

---

[٣٧]- بە مانای: قارەمان خان، خۆی ڕەش، چاوەکانی ڕەش، ئەسپەکەی ڕەش، کڵاوەکەی ڕەش، حەیف کە ئەم میداڵە تەلایی زەرد ڕەنگەی ئاوێزانی خۆی کردووە و ڕەشتی تەواوی شێواندووەتە یەکا.

## باسی ئەبولحەسەن خان و شۆڕشی قووچان

ئەمیرحوسەین‌خان شوجاعودەوڵە دوو کوڕی بوو، یەکێک ئەبولحەسەن خان و دیکەیشیان موحەممەد ناسرخان. ئەبولحەسەن خان کە دایکی لە تورکمانەکانی یەمووت بوو لە ساڵی ۱۲۷۱ی مانگی لەدایک بوو. دوو ڕەگە بوونی هەر لەسەرەتای سەردەمی منداڵیەوە ڕوون و ئاشکرا بوو و نەترس و بێباک و زۆرتر لە ژیانی لە کێو و دەشتدا تێپەڕ کردبوو و بە شوێنی کۆ کردنەوەی سوپا و قۆشەن و عەمەلیاتی نیزامیەوە بوو. بە پێچەوانەی ئەو، موحەممەد ناسرخان برای بچووکی ئارامتر و داخوازی زانیاری و بەدەس هێنانی زانایی و دەروێش مەسلەکی و ئینسانێک دێموکرات بوو. لە ساڵی ۱۲۸٤ی مانگی کە ناسرەددین شا هاتە قووچان و ئەبولحەسەن خان کە لەو سەردەمەدا ۱۲ ساڵی بوو دی و بێباکی ئەوی بۆ دەرکەوت (کە لە بەرگی هەوەڵدا لەسەری ڕۆیشتین). لە دوایی ئەوەی کە ئەبولحەسەن خان پای هێنا رادەی لاوی، لەگەڵی خەڵەتاندنی کەسانی دیکە لە بەرانبەری باوکی هەڵسا و سالانێک لە کێوەکانی باکووری قووچان لە بەرانبەری باوکیدا کارشکێنی کرد. لە دواییدا ئەمیرحوسەین‌خان توانیویەتی ڕام و فەرمانبەری خۆی کات و لە مل‌نەدان ڕایگرێ و ئەم مەسئەلە لە هەواڵی بولجر ئەندامی کۆڕی ئینگلیزی لە ئاسیا هاتووە[38] لە ساڵی۱۲۹۲ مانگی کە ناسرەددین شا ئەمیرحوسەین‌خانی دەعوەت کردە تاران و پاشان بە ناپیاوی بازداشتی کرد[39] و بە شوێنی ئەوەوە بوو کە دەستی ئەم بنەماڵە لە سەرۆکایەتی قووچان ببڕێتەوە. لەبەر ئەوە شازادە ئەنەوشیروان میرزای قاجاڕی بە سەرۆکایەتی قووچان دانا و قارەمان‌خانی کردە نایبولحوکوومەی ئەوێ، هەندێ لە خەڵکی قووچانیش بە

---

[38]- بە سوپاس لە کاک قودرەتوڵلا ڕەوشەنی زەعفەرانلوو کە ئەم وتاری وەرگێڕاوەتەوە و بۆمی ناردووە

[39]- جارێکی تریش لە ساڵی۱۰۳۸ی مانگی ئەمیر حوسەین خان بانگ ئەکرێتە تاران کە ئێعتێمادوسەڵتەنە لە (خاترات وخەتەراتی) خۆی هێناویە کە [یەک شەممە۲۲ی جەمادیولئەوڵ ئەمیر حوسەین خانی شوجاعوددەولەی قووچانی کە بانگ کرابوو، دوێنێ هاتووە، ئەمرۆ بە بۆنەی ئەمینوسسوڵتان[سەرۆک وەزیر] شەرەفیاب[خزمەتی‌شا] بوو]

دژایەتی ئەبولحەسەن خان، بوون بە پشتگیری تورکەمەنەکان و هێرشیان کردە سەر قووچان و لە هەمان کاتدا کە ئەم هەواڵە خەلافی هاتبوو و ئەبولحەسەن خان هیچ کاتێک بە غیرەتی خۆی ڕێگای نەئەدا کە تورکمانەکان بهێنێت و خەڵکی هاوخوێن و هاوڕەگەزی خۆی بکاتە ئامرازێک بۆ تالانیان. ئەبولحەسەن خان سەرۆکی دەستنیشاندەی شای بە قووچان ڕێ نەدا و هەڕەشەی لە شا کرد کە ئەگەر باوکی، ئەمیرحوسەین‌خان ئازاد نەکات چاوەڕوانی وەڵامی سەختی کوردانی خوراسان بێت. ناسرەددین شا کە ئابڕووی کەوتە مەترسی، حوکمی نیزاموددەوڵە والی پێشووی خوراسانی دەرکردووە و زەهیروددەوڵەی والی تازەی نارده خوراسان و فەرمانی پێدا کە کۆڕێک لە زانایانی خوراسان بنێرێتە قووچان تاکوو لەم ڕێگاوە ئەبولحەسەن خان فەرمانبەر و ئارام بکات. میرزا حوسەین‌خان سپەهسالاریش کە ئەمیرحوسەین لە ماڵی زیندانی بوو ئەحمەدعەلی خان نوێنەری خۆی نارد بۆ قووچان و نامەیێکی دوور و درێژی بۆ ئەبولحەسەن خان نووسی کە خۆی بداتە دەس دەوڵەتەوە. هاتنی والی تازە بۆ خوراسان لە ناوچەی سەبزەوار و هاتنی نوێنەرانی زانای خوراسان و نوێنەری سپەهسالار بۆ قووچان لە یەک کاتدا بوو. سەرۆکایەتی کۆڕی زانایانی خوراسان لە سەر شانی ئاقا میرزا ئەحمەد بوو کە لە مەلایانی موحتەرەمی خوراسان بە ئەژمار دەهات. شازادە ئەبولحەسەن میرزای قاجاڕ [لەبەرەی فەتحەلی شا] ناسراو بە شێخ ڕەئیس کە خۆی لە مەلایانی بە ناو بانگ و خاوەنی ئاسەواری جۆربەجۆرە، ئەوی هاوڕێیی کرد کە کتێبی (بەدایعوسسەمەر و وقایعوسسەفەری) خۆی لەو بارەوە نووسیوە. زانایانی دیکە وەکوو: مەلا عەبدولجەواد و شێخ موحەممەد حوسەین نەیشابووری و ئاقامیرزا بابا، خادەمی قوتابخانەی بارگای ئیمام ڕەزا و... کۆڕی ناوبراو دوای هاتن بۆ قووچان تێ ئەگەیێن کە ئەبولحەسەن خان پیاوێکی نەترس و بە هۆش و ڕامیار و وەتەن‌پەرەستە و خۆی بە تەنیایی لە بەرانبەری هێرشی تورکمانەکانی تالانکەر شەڕی کرد و پاش لێکۆڵینەوە لە خەڵک، ئەزانن کە هەندێ لە بەرانبەری ئەو درۆیان گوتووە تا شای لێ تووڕ دەن. ئێستا وا باشە لە زمانی شێخ ڕەئیس بیبیسن:[٤٠] بە حوکمی ئیلزامی ئیقتزای ئێبرام لە لایەن زانایانی میللەت و

---

[٤٠]- هاوردن لە بەدایعوسسەمەرو وەقایعوسسەفەر. شێخوڕڕەئیس قاجاڕ. نوسخەی خەتتی کورت کراوی

نوێنەرانی دەوڵەت بۆ ڕاکێشانی ئەبولحەسەنخان و لە ناو بردنی ترسی خەڵکی قووچان و دڵنیا کردنی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە، لێ بران بۆ ڕۆیشتن بۆ سەفەر.

پاش قسەکانی جەنابی ئاقامیرزا ئەحمەد موجتەهێد و سەلەمەڵڵا، نیوەڕۆی چوارشەممە ٢٩ی سەفەری ١٢٩٢ی مانگی لە مەشهەدی موقەددەس هاتینەوە. بای توندی بەهاری شنەی گرت و بەفر و باران یەک لە شوێن یەک بە توندی دەباری. [لە نێوانی ڕێگای مەشهەد و چناران هەندێ سوار دەبینران]. ڕوون بوو کە ئەحمەد عەلیخان هاوڕێ جەنابی ئەشرەف ئەکرەمی سپەهسالاری گەورە[بنیاتنەری مزگەوتی سپەهسالاری تاران و سەرۆک وەزیری ئەو سەردەمە] بوو و خێرا چوو بۆ قووچان. بە حاڵی خەمم خوارد و لەگەڵ خۆما گوتم: ئەم ڕێگا کە تۆ دەڕۆی بە گۆڕستانە. پێنجشەممە هەوەڵی ڕەبیعولئەوەڵ گەیشتینە چناران و جومعە دووهەمی ڕەبیعولئەوەڵ چووینە ڕادەکان[41]. نزیک بە ڕادەکان موحەممەد کازمخان برای موحەممەد ڕەزاخان [کەیوانلوو] ڕێ و ڕەسمی پەزیرایی بە جێ هێنا. لاوێک عاقڵ و تەواو ژیرم بینی. چۆن موحەممەد ڕەزاخان [سەرۆکی ڕادەکان] لە مەشهەد بوو، بە جۆرێک چاودێری لە میوانان دەکرد کە بە نەهاتنی نەمانزانی[42] و خەممان نەخوارد. کاتی ئێوارە مەهدی قولیخان کوڕی خانلەرخان [لە بەرگی هەوەڵ و دووهەم لە بەیەک گەیشتنی ناسرەددین شا و خانلەرخان و دیکەی خانەکانی کەیوانلوو لە ڕادەکان قسەکرا] کە مامۆی موحەممەد ڕەزاخانە، هات... شوێنی دوایی شوورچەیە. [لەیرەدا شێخوڕڕەئیس لە پیداهەلگوتنی جوانی باخی سەرسەوز و خوڕڕەمی خانلەرخان قسەی نەکردووە. لەم باخانە ئێستا ئاسەوارێک نیە و نووسەر لە گەلارێزانی ساڵی ٦٥ ڕۆیشتۆتە ئەوێ، هیچ نیشان و ئاسەوارێ لە ئەوانە بەرچاو نەکەوت و بەهۆی بەربلاو بوونی قەلای کۆنی ڕادەکان

---

قوتابخانەی ئاستان قودسی ڕەزەوی.

[41]- ئاماژە بە ئەم زەربولمەسەڵە کە:

ئەترسم کە بە کەعبە نەگەیی ئەی ئەعرابی  ئەم ڕێگای تۆوە دەڕۆی بە تورکستانە

بە مانەی ئەوە کە ڕێگای پڕرەنج وبێدەسهاتێ ئە ڕرۆیت.

[42]- بنەماڵەکانی کەیوانلوو ڕادەکان لە مێوان نەوازی ناودار بوون کە لە بەرگی هەوەڵ ودووهەم لەم بارەوە و تارهاییک هاتووە.

ئەم باخاتە بە ماڵ و دەزگا گۆڕاونەتەوە. نووسەر بە شوێنی پیداهەڵگوتنی خۆی ئەڵێت: بە پێ باش بوونی سەلیقەی خانلەرخان ئافەرینمان پێ گوت، خانی ڕادەکان کە کانیڕادی بوو، لە خەڵکی ڕادەکان ماڵئاوایمان کرد. واردی شوورچە بووین کە لە هەوەڵی خاکی قووچانە. جێگاییکی بێسەفا و چۆڵ لە پاکی، ئاوی بێتام و شۆر و خەڵکی سەخت و دوور لە تەمکین. هەواڵی ڕێ کەوتنی ئەبولحەسەن خان بۆ سەرحەد [قووچان و ئاخاڵ] لەگەڵ بەشێک هەواڵ وایان گوتووە کە بە پێچەوانەی دۆستایەتیەوە قەت شک نەئەڕوا کە ئەبولحەسەن خان بە تەواوی جوانی ئاسەواری بەختەوەری و کاردانی پێشان بدات. هاوکات لەگەڵ ئەم مەترسیانە، سوارێک گەییشت و نووسراوێکی گەیاند. شێخولئیسلامی قووچان بوو لە هاتنی ئەحمەدعەلی خان [نێردراوی سپەهسالار بۆ قووچان] لە حەرەکەتی جەنابی شەریعەتمەئاب و یارانی ئاگادار بووە، کەسێکی لەگەڵ سواری تایبەت ناردووە [و گوتیان]کە تا بە درۆ بڵێت ئەبولحەسەن خان بە سەرحەد گەیشتووە، بۆیە پێویستمان زانی کە بێئەندێشە تەشریف بێنن و ئەبولحەسەن خان بەخێر هاتنتان ئەڵێت و ئاڵۆزی لە نێوانتاندا نامێنێ. وەرگرتنی ئەم نووسراوەیە کەمێک بوو بە هۆی خاترجەمی و ئاسایش. ئەحواڵاتی ئەبولحەسەن خانم لە سوار پرسی. هەر چەند لەزمان تێ ناگەیشتن بەڵام ئەوەندە ڕوون بوو کە گوتی چەند ڕۆژێکە ئەبولحەسەن خان لە قووچانەوە حەرەکەتی کردووە و لە شەش فرسەخی شارەوەیە [نزیکی ئیمام قولی] و شاری قووچان کەسی تێدا نەماوە. گوتم: ئەم شتە زۆر سەیرە [ئەوەی کە ئەبولحەسەن خان شاری چۆڵ کردبێ] لە ئەم چەن ڕۆژەدا بەم شێوە [؟] بۆچی لە لایەن دەوڵەتەوە [بۆ گرتنی شارەکە] کەسێک نەهاتووە و تەواوی تێکۆشانەکان بۆ هێرش بۆ ئەوە بووە کە ئەبولحەسەن خان قووچان چۆڵ بکات. کاتێ کە ئەمەمان زانی. شڵەژاین. لە ئەحمەدعەلی خان پرسیارم کرد: چی ئەکەن؟ گوتی: دوو شەو دوای هاتنمان بۆ قووچان و حەسانەوەی ماندوویەتی بە هۆی داخوازی ئەبولحەسەن خان، چووە لای؛ سەرجەم وڵامی (شێخولئێسلام)مان لەگەڵ برێک شتیتر نووسی و ناردمان کە دوا ڕۆژ ئەگەیین بە قووچان. یەکشەممە ڕۆژی چواری (ڕەبیعولئەوەڵ) ڕێ کەوتین، نزیک بە جافرئاوا «حاجی موحەممەد» کە لە سوارەکانی قووشخانە بوو دوو نووسراوەی لە لایەن «ئەبولحەسەن خان»ەوە هێنا.

ئەو نامانە باسیان لە چاکەی مرۆڤ ئەکرد و داگری دڵپاکی ئەو بوون. نووسیبووی: بە بۆنەی ئاسایش و پاراستنی سنوورەکان ڕێکەوتم[٤٣] پێش لەوەش هەواڵی خۆپاراستنمان پێ درابوو و ئەمن داماو بووم لەم شوێنەدا چەند ڕۆژێک ڕاوەستم. دوای گەییشتنی مزگێنی هاتنی جەنابی شەریعەت مەئاب گوتوویەتی: زوو بگەڕێنەوە، هەواڵی ئامادە بوونم نارد و بەیانی کە ڕۆژی چواری مانگە، بەخت یار بوو و قەبووڵ دەکات و منیش هیوام ئەوەیە بە بۆنەی ئەم کارە چاکەوە کە بە پاکی تەنیا بۆ خودای گەورە کردووتانە، خەڵکی ئەم دەوروبەرە بە ئاسایش بگەن و بۆ جەنابی بەڕێز [شەریعەت مەئاب] ئەو پەڕی ئاسایش و دڵنیا بوون پێکهات. تەختەکەیان هێشتەوە و [بۆ ئەوەی کە بە تەختەوە چاک ڕێ ئەکەوتن]. بە کورتی و بە چاکی وڵامی نامەکەی [ئەبولحەسەن‌خان]م داوە، هەوا تۆزێک ساردی کرد. باران نم‌نم و هێور هێور هاتە خوارەوە. لە «فەرخان» کە لە دوو فرسەخی قووچان بوو بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ دابەزین. نۆکەرەکەی من «ئەکبەر» کە بەیانی زوو پێش لە خۆرهەڵاتن بۆ هێنانی هەواڵ ناردبووم بۆ قووچان، لێرەدا پێمان گەییشت و وتی کە ئەمڕۆ «ئەبولحەسەن خان» خۆی نەیتوانیوە بێت بۆ شار. خانووەکەمان دوور بوو، بەڵام موحەممەد قولی بەگ کە فەرمانداری شاری قووچانە و لە لایەن ئەبولحەسەن خان ئەم کارەی پێ سپێردراوە لە ئاکامدا بە پەلە هات بۆ شار ویستی شوێن و پێویستیەکانی ئەوانەی کە بۆ شار هاتوون ڕوون بکاتەوە، ئەمشەو ئەبێت لە قەڵای کەربەلایی ئاغاسی کە ها لە نێوان یەک فرسەخی شارەکەدا، بمێنن تا دوارۆژ لەگەڵ ئەبولحەسەن خان بێینە ناوی شار. لەم کاتەدا عەلی خان‌بەگ قووچانی کە پیاوێک پیرەمەرد و خۆش‌کەیف بوو، لە لایەن فەرماندارەوە هات و داخوازی گەورەی بوو. ئەسپەکانمان ڕوویان کرد لە قەڵای کەربەلایی ئاغاسی. لە ماڵی حاجی عەبدولەوە هات و ڕاوەستاین. «حەکیم شەفایی»مان لێرەدا دی [ناسرەددین شایش لە بەسەرهاتی سەیرانی خۆی‌دا لەم حەکیم شەفاییە -زانای بەشی فەلسەفەکە لە قوتابیانی (مەلا هادی سەبزەواری) بووە- باسی کردووە] پەیمانێک [؟] و خۆشحاڵی

---

[٤٣]- ئەیالەت یان باشتر بڵێم بەرپرسی، زەهیرە بوو کە لە جێگای نێزامودەوڵە هاتووە بۆ خوراسان.

زۆرێک پێک هاتووە.[٤٤]

عەلی خان بەیگ و براکەی میرزا ئەبولقاسم مستەوفی قووچان حازر بـوون. لـە بیر و باوەڕەکان و ئاکـامی کارەکـانی ئەبولحەسـەن خـان حـەزمان ئـەکرد تۆزێـک هۆشمان ببێـت، وتیـان: لـە دوای نـاردنی [موحەممـەد ناسـرخان شوجاعودەولـە] براکەی خۆی، بۆ ڕێز گرتن لـە نێردراوەکـانی دەولـەت و دەرەوەی وڵات چـووە بـۆ سنوورەکان. بڕێک لە لاتولووتەکان کە حەزیان لە هێرش و ئاژاوەیە، لە نێو خۆیـان باسیان وابوو کـە ئاژاوەیـەک بکـەن و بـە پێچەوانـەی مەسـڵەحەتی ئێـستا، جـم و جووڵێکیان ببێت. بەڕێز ماموستای ئایینی «مەلا کازم موجتەهێدی هەمەدانی»یـش لەم کارەدا بەشداریان کرد و [لەگەڵ خۆیـان هاوڕێیـان کـرد] و درۆی ئاژاوەگـەریان پێوە لکاند. ئەبولحەسەن خان دوای بیستنی ئەم ڕاڤەیە بەرانبەر بە کات [؟] «سـەی نەقیب»ێ کە دانەری ئەم ئاژاوە دەزانی بە سزا و تاوانی خـۆی گەیانـد و مانـای ئـەم شێعرەی مەولەویەی پێ حاڵی کرد:

هەر کەس لە حەق شـتێکی خوێنـدەوە
لایـــان بـــرد و دەمیـــان بـەستـــەوە

لەوە دەچێت کە ئەبولحەسەن خان چاکەی خۆی لـە گەڕانـەوەی بـۆ قووچـان نەزانیوە. بۆ «موحەممەد قولی بەگ» هەواڵمان نارد کە بڵێت بە ئەبولحەسەن خـان (لە لایەن ئێمەوە) مەبەست بە یەک گەیشتن و دیتنی ئەوە و لەوە دەچـێ لـە هـەر شوێنێک و هەر کاتێکدا پێش بێت. لە هەر کاتێک و لە هەر شـوێنێک کـە هـەواڵ بنێرێ، ئێمە ئامادەین و چاوەڕوانین...

سبەینی ڕۆژی دوایی «موحەممەد قولی بەگ» هـات و نامـەی ئەبولحەسـەن خانی نیشان ئێمەدا کـە تێـدا نووسـرا بـوو «سـوارەکانی ئەلئـەمان» تورکەمـەن لـە بەرانبەری شێرە کوڕەکانی کوردا نەیانتوانیوە بووەستن و لە شەڕێک کـە لـە نزیکـی

---

[٤٤]– لەم بەشەوە بۆ ئەولا شێخ رەئیس بە جێگای وتنی ئەسلی باسەکە و باز کردن و لە سەر چـوونی ئەم باسە کە چەپالەیەک لە دروست بوونی ئەم باسە بـەشـدار بـوون و زۆرتـر دەسـتی کـردووە بـە ڕازاندنەوەی بێ پایە و فرەتر هۆشدان و زۆرتر چاولێکردن کە وتنی یاساکانی جگە لە کوشتنی کاتی خوێنەر، دەسکەوتێکی نیە. بەم بۆنەوە باسەکە کورت ئەکەینەوە.

سنووری «قۆشخانە» پێش هاتووە، ئەوانە تێکدراون و هەڕایان کردووە و سەری کوژراوەکان و ئەسیرەکان لە دوای ماوەیەک دێت بەرەو قووچان. بە موحەممەد قولی بەگ فەرمانی دابوو بۆ ڕێز گرتنی ئێمە تێبکۆشن و کۆتایی نەکەن بۆ ئەوەی کە ئێمە لە ئاسایش‌دا بین.

لەم ڕێز گرتن و موحەببەتی ئەوانە، زۆر سپاسمان کرد: لەگەڵ «موحەممەد قولی‌بەیگ» سوار بووین و بەرەو شار ڕێ کەوتین تا لە قەڵای فیلوو (فیلاب) کە نزیک بە شارەکەیە بە خزمەتی ئەبولحەسەن خان گەیشتین و لەوێش‌دا لەگەڵ ناوبراو چووینە شار و لە فیلاب چاوەڕوانی ئەبولحەسەن خان ماینەوە. جێگری ئەبولحەسەن خان و چەند کەسێک لە قووچانیەکان لەوێدا بوون. هەتا کاتی نیوەڕۆ لە ئەبولحەسەن خان هیچ هەواڵێک نەبوو، ئێمەش زۆر دڵتەنگ و ترسا بووین لەوەی کە نەوەک کەڵەکێک لە کارا بێت، میرزا موحەممەد عەلی مستەوفی کە یەکێک لە هاوڕێیەکانی ئەبولحەسەن خان بوو هات و وتی کە سەرکارئاغا نەهاری لە ڕێگەدا خواردووە و منیان بە پەلەوە ناردووە کە بیانووی دێر هاتنیان ببرم کە کاتی نیوەڕۆیش چاوەڕوانی ئەو نەبن. پێکەوە نەهارمان خوارد و چاوەڕوان ماین و گوتمان: بێ کە چاوەڕوانیت کوشتمانی. سێ سەعات بەر لە خۆرئاوا هێزەکانی ئەبولحەسەن خان دەرکەوتن. ئەبولحەسەن خان و ئەحمەدعەلی خان سلامیان کرد و ئێمەش وڵامی سلامیانمان داوە. ئەمن «ئەبولحەسەن خان»م لە ئەو پەڕی هۆش و زاناییدا دی و لایەقی هەر جۆر گەورەی و سەرۆکایەتی بوو، زۆر کەم قسە و پڕ مایە بوو. دیار بوو کە لێهاتوو و زۆر بە تین بوو بە پێچەوانەی هەواڵە خراپەکان کە بەرانبەری ئەو دراوە و بە درۆ بە ملهوڕی تاوانبار کرابوون. ئەم لاوە ماقوڵە زۆر کوڕە خاسە و قسە گوێدەر بوو.

ئەحمەدعەلی خان نێردراوی سەرۆکی هێز و ئەوانی‌تر، لە جوولانەوەی خراپی بەرپرسانی پێشوو و کارهاییکی گەند کە لە ڕووی زانست و بە قەستی دڵسارد کردنی ئەم لاوە بووە. درێژەیێکیان پێدا و چەند هەواڵێک درا کە زۆر سەرمان سوڕ ماوە. ئەگەر بەو جۆرە وا بیستوومانە و بەو جۆرە وا ئەزانین بمەوێ کە باسی بکەین و شی بکەمەوە، پێچەوانەی بایەخەکانە.

هەرچەن کە ئەبولحەسەن خان لە کاتی گوتنی ئەم قسە بێ‌دەنگ بوو و بیری

ئەکردەوە، بەڵام دەسکەوتی ئەم باسانەی لە خزمەتی جەنابی «شەریعەت مەئاب»دا وتمان کە باوەڕی خەڵکی ئێمە بۆ نۆکەری و بێگاری دەوڵەت چۆن کەم ئەبێتەوە کە کار بە دەستانی دەوڵەت قسەی گەندەکان و ناحەزانیان لەبارەی ئێمەوە بێ بیرکردنەوە باوەڕ دەکەن، بێ‌ئەوەی کە لە ڕاست و درۆ بوونی هەواڵەکە بیر بکەنەوە. هیوای ئێمە هاتنی ئێوە بوو. شەهادەتی ئێوە لە بێ‌تاوانی ئەم گەلەدا ئاسوودە بوونی خەڵکی قووچان لە ئەو دروانەی کە بە ئەوانیەوە ئەلکێنن، ئەبێ بە هۆی ڕووسپی بوونی ئێمە. ئەوان بە هۆی ملنەدانی ئێمەوە دەڵێن کە بۆچی ئەنەوشیروان[45] میرزامان بە قووچان ڕێگا نەدا. لە ئەحمەدعەلی خان و تەواوی خەڵکی ئێرە بپرسن و بە متمانە بگەیێن کە کاتی هاتنی ئەنەوشیروان میرزا بۆ سوڵتان مەیان[46]، چەند جار نامەم تایبەتی بۆ نووسیوە کە لە هاتنی ئێوە ڕێز دەگرم. بەڵام خەڵکی قووچان داخوازیان ئەوەیە کە قارەمان خان لەگەڵ خۆت نەهێنیت و بە تەنێ بێنە قووچان، تا قسەکانی خەڵکی قووچان لە خزمەتی ئەولیای دەوڵەت، وڵامی بدرێتەوە. ئەگەر داخوازیەکەی ئێمە لە لایەن ئێوە قەبووڵ کرا و شا بە نامەکەی ئەوان وڵامی داوە، ئێوە خۆ بپارێزن. ئەگەر جۆرێک تر بوو ئێمە لە دەستووراتی دەوڵەت هەڕا ناکەین، و هەرجۆرێک دەستوور بە ئێمە بدەن، ئەیبەین بە ڕێوە. بەڵام بە بۆنەی ئەوەی کە ئەنەوشیروان میرزا بە دەوری گرینگ و ڕەفتاری خەڵکی قووچان ئاشنا نەبوو، لە وڵامی پاڕانەوەی ئێمە، پەنای برد بە تووڕەیی و زۆر گوتن بە ئێمە. کەسی نارد بۆ تاڵان کردن و قەتڵی مرۆڤی بێ‌تاوان و دێهاتی و هاوکات نامەی نووسی بۆ مەشهەد و سەبزەواریش بۆ هێنانی سەربازی کۆمەکی و هاوکات خۆی حازر کرد بۆ شەڕێک لەگەڵ ئێمە و خەڵکی قووچان وایان دەزانی کە کار بە دەستانی دەوڵەت بەم جۆرە بە ئەو مەعمووریەتیان داوە. بەم بۆنەوە ویستیان کە پەنا بۆ کێوسانەکان ببەن و لە جێگای خۆیانەوە کۆچ بکەن بۆ وڵاتێکی تر. لەم کاتەدا بوو کە هەواڵی لە کار

---

٤٥- «ئەنەوشیروان میرزا» ناسراو بە «زیائوددەولە» کوڕی «موحەممەد ڕەحیم میرزا زیائوددەولە» کوڕی نۆزدەهەمی «عەبباس میرزا»ی وەلیعەهد بووە کە لە ساڵی ١٣٠١ی مانگی سەرۆکی (سێمنان و دامغان و شاهروود و بەستام) بووە و لە ساڵی ١٣٠٥ بە سەرۆکایەتی لوڕستان و برووجرد گەیشتووە. (ڕجال ئێران- بامداد، بەرگی ١، ل ٧٣)

٤٦- سوڵتان مەیان لە دێهاتەکانی نێوان قووچان و سەبزەوارە.

لابردنی نیزامولدەولە، لە تارانەوە هات[٤٧] و حوکمی هاوردنی ئەنەوشیروان میرزا لە مەشهەدەوە گەییشت و لە لایەن نایبولئیالە و لە لایەن سەرۆکی خوراسانەوە فەرمانی ماندنەوەی من لە قووچان دەرکرا. ئەمە کە تەلەگرافیان کردبوو، کە ئەبولحەسەن خان، تورکمانەکانی خارەزمی لەگەڵ خۆیدا هاودەست کردووە و بە قووچان ڕێگای داوم، لە تەواوی خەڵکی ئەم ناوچە بپرسن، لەبەر ئەوەی کە پێشتر بازەرگانانی تورکمان بۆ مامڵە کردن ئەهاتنە قووچان، لەم سەردەمە کە (باوکم لە قووچان نەبوو و ئەرکی ئەم ناوچە لە سەرشانی من بوو) تەنیا یەک نەفەر تورکەمەنیش لەم شارە نەبینراوە، چۆن دەتوانم لەگەڵیانا ئاشتی بکەم، ئەوان لەم گیر و گرفت و شێواوی ئێمە خراپ کەڵکیان وەرگرت و بە بڕوای خۆیان منیان لە پشتەوە ترساندووە و بۆ قۆشخانە هێرشیان کردبوو و ژن و منداڵی خەڵکیان ئەسیر ئەکرد کە من سوارانێکم نارد و خۆمیش ڕۆیشتم، شەڕیان کرد، سپاس بۆ خودا کۆڕێک لە تورکمانەکان ئەسیر بوون و هەندێ کەسیان کوشت کە دوا ڕۆژ نەهێنەکان ئەدرکێنن، کە ئەمە خۆی ئەبێ بە هۆی ڕاستی وتار و کاروباری ئێمە و سەربەرزی ئێمە لە لای ئەولیای دەوڵەت و دوژمنان و حەسوودەکانی ئێمە بێ ئابڕوو و ناهومێد دەبن. دەردەم چاییمان خوارد و هەستاین و لە فیلابەوە ڕێ کەوتین. چۆن جەنابی شەریعەت مەئاب لاواز بوو لە سەر تەخت دانیشتن و من (شێخی سەرەکی قاجاڕ) سوار بووم لەگەڵ ئەبولحەسەن خان و ئەحمەدعەلی خان بە دەم قسە کردنەوە ڕۆیشتینە شار. لە نزیکی شاردا تەواوی خەڵکی قووچان لە سادات و کەسبە (سەوداگەر) و هەمووی مرۆڤ بۆ پێشواز هاتبوون.

دوای هاتن بۆ شار لە ماڵی حاجی ئیبراهیم قووچانی کە بۆمان ئاشکرا کرا بوو دانیشتین و ئەبولحەسەن خان ماڵئاوایی کرد و ڕۆیشت بۆ ماڵی خۆی.

شەو بە بیری جەنابی شەریعەت مەئاب و بە فەرمانی پێویست لە لایەن ئەبولحەسەن خان ئیزنی دیتنمان خواست تا وتوویژ بکەین و شوێن ببەینە سەر جێ و شوێنی وتار و خەیالاتی ئەبولحەسەن خان. یەک سەعات لە شەو ڕۆیشت،

---

[٤٧]- حوسەین خان نیزامودەولە پاش حیسامودەولە، سالی ١٢٨٩ تا موحەڕەمی ١٢٩٢ کۆچی سەرۆکی خوراسان بوو. لەم ساڵە لە کار دەرکراو و دوو ساڵی دوایی، لە حاڵێک کە خۆی دابوو لە شێتی و لە تارانا مرد.

هاتمە لای ئەبولحەسەن خان، هەموو جۆرێک قسەمان کرد، دوای کار، بە دڵنیایی نامەی دەوڵەتی و نەتەوەیی درا بە ئەو، بە شێوازی ژێر نووسرا بوو:

«ئەمیری گەورە، ڕۆشنایی چاوان! مەبەستی کارەکەرانی نەتەوە و داخوازانی دەوڵەت و نۆکەرانی حەزرەتی ئاسمانی بەربڵاو، دوای لەبەر چاوگرتنی کەڵکی دەوڵەت هەمیشە و جگە لە چاودێری خێر و مەسڵەحەتی ئێوە و پاراستنی ئابڕوو و مایەی بنەماڵەی ئێوە و پاراستنی پوختی و سەقام و ئاسایشی ئەو سنوور و سنوورنشینانە نیە و بەڵام لەو کاتە کە ئەو پێشامەدە بۆ سەرۆکی ئەمیران [ئەمیرحوسەین خان] شوجاعوددەوڵە ڕووی دا، بۆ ئێوە ڕوون و ئاشکرا بوو کە لە لایەن ئێمەوە لە هەر کاتێک و بە هەر شێوازێک بۆ پشتگری لەم نیەتە پاکە کۆتاییمان نەکردووە و سپاس بۆ خودا بە بۆنەی پاڵپشتی کردنی شاهەنشای گەورە و پیرۆزی ئیسلام پەنا و ئەولیای دەوڵەتی هەمیشەیی کارەکان کە گوترا تا ئەمڕۆ بێئەنجام نەماوە و لەم پلە و پایەدا بە هیچ جۆرێک خاوی و نەرمییێک لە کاری ماڵی باوکی ئێوە و ئەو سنوورە نەکراوە... بەڵام مەبەست دروست کردنی کاری ئێوەیە. لە ڕێگای بە دەست هێنانی ئەم مەبەستە ئەبێ سێ کار بکەین؛ هەوەڵ هەر ئەو جۆرەی کە جەنابی ئەمجەد ئەشرەف سەرۆکی گەورە نووسیویانە و نیاویەتیە سەرشانی ئەحمەدعەلی خان (دانراوی خۆیان). بێبیر کردن و شک کردن بە ئەوپەڕی متمانەوە گەیشتینە خزمەتی ئەوان و ڕێک کردنی کاری خۆتان تەواو بدەن بە دەستی کۆمەکی گەورەی جەنابی موعەزیون‌ئیلاهـ. دووهەم بەڕێز و پایەبەرز حاجی زەهیروددەوڵە وەزیری دەرباری وەک ئەوان... (؟) ئەبێ بە هۆی ئەوە کە ئێوە خۆ بدەن بە دەستی دەستوور و فەرمانی ئەوان و دەڵنیای ئەوان بن، بەڵام بە هیچ جۆرێک نابێت ئێوە بە جێ بێڵێت و لە کۆمەک و گەورەیی خۆی چاوپۆشی کا، ئێوە لە چاودێری ئەو بێ بەش نابن. سێهەم ئەگەر شک و دوو دڵییێک لە دوروستی ئەم دوو ڕێگای ڕاستە کە بە یارمەتی خودای مەزن بە مەبەست دەگەن، بۆتان پێش هات و لە حاڵێک کە بە بڕوای داواکارانی دەوڵەت و نۆکەرانی حەزرەت بە هیچ شێوەیێک ڕێگای نیە، بە هۆی ئەوەی کە ڕادەیێک دوروست کردنی کاری ئێوە بەربڵاوتر بکەینەوە. ئەم ئاکامەش بە بڕوای ئێمە ئەگەڕێتەوە بۆ چاکی و دوروستی و خێر و ئەدەب کردن؛ کە لەگەڵ هەرکام لە هاوکارەکانی و هاوڕێیانی خۆی کە

ویستتان هەیە لە ئەوپەڕی ئاسایش و متمانەی خەیاڵ بێماتڵی بڕۆنە مەشهەد و تا هاتنی خەڵکی بەندیخای ئەیالەتی گەورە لەم خاکە موقەددەسە بچووکە ڕاوەستن و چاوەڕوانی تەشریفهێنانی جەنابی بەڕێزی ئەوان بن کە بە هومێدی خودا دوای هاتنی موبارەکی ئەوان بە داخوازی داواکارانی دەوڵەت و بەندەکانی حەزرەت هەنگاوێ گەورەی بۆ دوروست کردنی کاری ئێوە هەڵگرتووە و لە ئێرە و لە دارولخەلافەی قاهێرە پێداویستیەکانی ئەم کارە خێرەی بە خۆشحالیەوە ئامادە کردووە و بە یارمەتی خودا ئاکامی خێری ئەم کاری ئێوە دەبینرێت لە گەورەیی خودای مەزن شکێ نیە کە کارەکانی ئێوە هەمووی وەکوو وێنەیە بۆ خەڵک تا چاوی لێ ببرن و هەروەها ئەبێ بە هۆی ئاسایش و ڕاحەتیتان، بەم جۆرە کەسێک حەز ناکات کە لە شوێنێک لە شوێنەکانی کاری ئێوە کەمی و کۆڕی ببینرێت، بەم جۆرە گەورەیی و ئابڕووی ئێوە ئەپارێزرێت و پەلە ئەکرێت لە ئاسایش و ڕاحەتی کاری ئێوە و بەم بۆنەوە کارێک بەرزتر لە ڕادە کە لەم سات و کاتە کەوێنەی بۆ هیچ کەسێک نەکراوە، پێشنیارمان کردووە، بەم مانا کە لە جەنابی ئاقا میرزا و ئەحمەد موجتەهێد سەلەمەڵلایش داخوازی و تکامان کردووە ڕازیانمان کردووە کە بە گەورەیی و پایەبەرزی و ماقوڵی خۆیانەوە تەشریف بهێننە ئەوێ و شێخوڕڕەئیس کە پێویستیان بە پێدا هەڵگوتن نیە، ڕۆیشتن بۆ خزمەتی ئەوان.

پێویستی نیە کە بە بۆنەی ئێوەوە بڵێین کە لە ڕابردوودا چ جۆر چاودێریهایێک لە لایەن دەوڵەتی قاهێرەوە کراوە و هەروەها چ کارێکیش کراوە کە کەمتر هومێدەواری بە هاتنی ئەو جۆرە چاودێریانە ئەکرا. بەڵام بە بۆنەی ڕێکوپێک کردنی ئەم جۆرە کەرستانە کە کەمتر کەسێک دەتوانێ، ئەگەر خودای نەکەردە کەم کارێک کرا، ئەبی لۆمە نەکەن، ئێمە بە خۆتان هومێدمان هەیە کە عەقڵی سالمی ئێوە و بژنەواییتان ناهێڵێ کە خودای نەکەردە کار بە ئەوێ بکێشێت. ئەحمەدعەلی خان نێردراوی جەنابی موستەتاب ئەشرەف ئەمجەد سەرۆکی گەورەش لە خزمەتی جەنابی شەریعەتمەداری پایەبەرز هاتوونەتە قووچان، کە لەگەڵی ئەوە ئاکامی کارەکان، سەرۆکی نووری چاوان بکەونە ڕێ. جەنابی موتمەئێنولمولک...، کوڕەزادەی نەیێرودەوڵەی نایبولئیالە، جەنابی حاجی موستەشارولمولک پێشکاری وڵات، جەنابی شەریعەت مەئاب حاجی شێخ موحەممەد ڕەحیمی موجتەهێد،

جەنابی سەروەر حاجی میرزا... ئەلـلاموجتەهێد و... ئەبولحەسەن خان دوای دیتنی پێشنیارەکانی نوێنەرانی دەوڵەت و مەڵبەند، لە بواری یەکێک لە سێ ڕێگای وتراوەوە لەگەڵ مندا ڕاوێژی کرد و نووسراوەی جەنابی شەریعەتمەئاب حاجی میرزا ئیبراهیم موجتەهێد سەبزەواری بە من پیشاندا کە ئەوی هان دابوو بۆ پاراستنی سوارانی حەزرەتی ئەیالەت و باشتر لە دڵنیا بوونی خۆ لە دڵنیا کردنی ئەبولحەسەن خان نووسیبووی لەگەڵی نووسراوە کە جەنابی جەلالەتمەئاب حاجی زەهیروددەولە سەرۆکی خوراسانی نارد بوو کە خاوەنی ئیمانە و زۆر قسەی ڕاست بوو. بەم جۆرە لە ئاکامدا بڕیار بە ئەوە درا کە ڕۆژێکی‌تر لە قووچان ڕاوستن، تا جەنابی حاجی موجتەهێد سەبزەواری بێن و جەنابی شەریعەتمەئاب ئاقا میرزا ئەحمەدیش بە بۆنەی پاڕانەوە هاوڕێی بکەین لەگەڵی ڕۆیشتن بۆ سەبزەوار و بگەیێتە خزمەتی حەزرەت ئەیالەت و بڕیار وا بوو کە بەیانی زوو ئەبولحەسەن خان بێتە مالی ئێمە، جەنابی ئاقا بۆ سەبزەوار و مەشهەد نامە بنووسن و هاتنی ئێمە ڕابگەینن. پێنج سەعات لە شەو ڕۆیشت هاتینەوە بۆ ماڵ.

ڕۆژی سێ‌شەممە ٦ی ڕەبیعولئەوەڵ لە خەو هەستاین. نوێژ بۆ خودای تاک کرا، خەریکی نۆشینی چای بووین کە حەکیم شەفایی هات. جەنابی مەلا کازم و هەندێک لە گەورەکان و پایەبەرزان هاتن... ماتڵی ئەبولحەسەن خان بووین، کەمێک دێر بوو. نووسراوەییێکمان بۆ بە بیر هێنانی خان نارد. کاتێک کە هاتن ئێمە نەهارمان ئەخوارد. ئەحمەدعەلی خان و موحەممەد عەلی مستەوفی قووچانیشی حازر بوون. لە لایەن ئەبولحەسەن خان نووسراوەییێک بۆ خزمەتی حەزرەتی ئەیالەت بریتی لە دەسەلات پەیدا کردن و ملدانی ناوبرا و نووسرا و لە ڕێگای عەلی‌موحەممەد بەیگ قۆشخانەیی کە هەڵگری سەری تورکەمانان بوو نێردرا بۆ سەبزەوار و نووسراوەییێکیش بە ناوی زانایانی نەتەوە و نوێنەرانی دەوڵەت نووسرا و لە ڕێگای سواری لە دەوڵەتخانەوە ڕەوانە کرا و جەنابی شەریعەتمەئابیش بە خەتی خۆی ئەوەی وا گوترا بۆسەبزەوار و مەشهەد نووسی و هەر لەو پێشگایە کەسێک لە لایەن ئەبولحەسەن‌خانەوە چوو کە بە دیاری شێخولئیسلام سەعاتێ بۆ ڕۆشتنی ئەمرۆ و سبەینی ڕوون بکاتەوە، دوای ڕەوانە کردنی سوار بۆ هەر دوو لا، بە ئەوپەڕی خۆشی و شایی تا نزیکی خۆرکەوتن دانیشتین. دوروستی باوەڕەکان و دڵنیایی و

بەرزی بیر و ئەندێشەی ئەبولحەسەن‌خانمان لەو کۆڕە بۆ دەرکەوت کە گوتی چۆنکە من و ئەم خەڵکە بە قەولی ئێوە دەسەڵات پەیدا نەکەین و دڵنیا نەبین و ئێستە نەتەوەی ئێمە لە ئێوەیە. تەڵاق و نیکاح و حەرام و موباح بە پشتگیری ئێوە بێ، بە هەڵەی دەزانین و ئەگەر بمانەوێ لە دەستووری موجتەهێدەکان سەرپێچی بکەین ژنەکانمان لە ماڵی خۆمان حەرامن و بە فەرزی شەفاعەت و ناوجێگەری ئێوە لە خزمەتی سەروەرانی دەوڵەت پلەی وەرگرتن نەگرێ و لەگەڵی مندا هاوڕێ بە عەهد و پەیمان رفتار نەکرێت، دوو کەیف‌خۆشی لەم چۆنیەتە بۆ خۆم ئەبینم. هەوەڵ ئارام ئەبم کە دوای ئەوە کە زانایان و موجتەهێدەکان ئەم عەیب و عیللەت و نەقس و کەساسەیان بۆ میللەت ڕەوا ئەبینن بۆ منیش خۆش ئەبێ. دووهەم ئەوپەڕی ڕێز و سوپاسم هەیە کە قارەمان‌خان، -کەسێکە کە ساڵانێک پەروردەی نێعمەتی ئێمە بوو- دەستی بە من نەگەیشت و باسکی من هەڵنەگیرسا و جگە لە ئەمانە، تەواوی ناخۆشیەکان لە خۆم دیوە و هەرشتێک بێت بە دڵم بووە. لە ئارام کردنی خەیاڵی ئەبولحەسەن خان ئەوەی بە سەڵاح بوو وترا. ئەحمەدعەلی خانیش زۆر هاوڕێی و کارئاگایی بە خەرج دا و کارەکەی جەنابی سەرۆکی خوراسانی گەورە کە لە دڵنیاکردنی ئەبولحەسەن خان بۆی نووسیبوو پیشانی‌دا و پاشان کۆڕەکە دوایی هاتووە. شەو حاڵێکی خۆشمان هەبوو. سوپاس بۆ خودا مەبەست دەسکەوت و زەحمەتەکان بە خۆڕایی دەرنەچوو و بە باشی کاری ئەبولحەسەن خان دەچووە پێشەوە و کەسانێ لە خەڵک کە ئاگاداریان بوو لە چۆنیەتی حەزم و ویست و تین و ڕێک‌وپێکی ئەو، شتهایێکیان وت کە بوو بە هۆی سەرسوڕمانی خەڵک. بێ‌شک زیادەویژی لە شوجاعەتیدا کەمە و زۆر دەس و دڵ بازیش بوو.

شێومان خوارد و خەونێکی خۆشمان کرد. ئێوارەی ڕۆژی دوایی، دوای گەڕان لە ناوی شار دامانە ناو باخەکانی هەنگووردا. مەیوەکان لە ژێری خاک جوولا بوونەوە و پێستی زستانیان خستبوو. ئەم شیعرەم خوێند؛

تا ڕۆژێک ئەبێ مەیو لە خاک بێتە بان
حەیفە ئیتر گیا لە خاک بێتە بان

قەبرستانێک لە دوایی ئەم باخانەوە بوو، گوتم: تەواوی خەڵکی قووچان بە

وەسیەتی ئەو هۆنەرە گوێ ئەدەن کە ئەڵێ: من جیا لە کەناری مەیو بە خاک مەسپێرن.

پاشان بۆ دیتنی فەقیرموحەممەدعەلی ڕۆیشتین. حوجرەییێکی تاریکی هەبوو، لە ڕوخسار و قیافەی ئاسەواری بەرەو پێش چوون و ڕێنموونی دیار نەبوو و لە قسەکانیدا شوێنی عێرفان و ویژدانم نەدی. تۆزێک شێخ موحەممەدحوسەین لەگەڵیا قسەی کرد. دوایی گەڕاینەوە بۆ ماڵ. نێردراوی ئەبولحەسەن خان هات، چوینە ماڵی خان. هەمووی هاوڕێیەکان حازر بوون. دوای ناساندنی میوانەکان، پرسیارمان کرد کە حاجی ئیبراهیم کەی دێن. ئەبولحەسەن خان گوتی کە حاجی میرزا ئێبراهیم ئەبێ سبەینێ بێن و ئێمەش دوا ڕۆژی بڕۆین بۆ سەبزەوار. بە دڵنیایی و سووکی خەیاڵەوە خەریک بووین چاییمان ئەخوارد کە یەکێ لە کارەکەرانی ئەبولحەسەن خان هاتە ناو و پچەی بۆی کرد و ڕستەییێکی لە گوێچکەیەوە گوت: تێ گەیشتین کە ئەبێ هەواڵێک بێت. ئەبولحەسەن خان بە بۆنەی دانیشتوانی کۆڕەکە بێ‌هیچ تێکچوونێ چووە دەرەوە. دوای چارەکێ هاتەوە، ئێمە گوتمان خێر بوو. وڵامی‌دا جەنابی حاجی موجتەهێد سەبزەواری هاتوونەتە دوو فرسەخی و ئەمشەو ناچار ئەبین لەوان پەزیرایی بکەین. گوتمان: تەکلیفی کاری ئێمە ئەبی بە چی؟ گوتی: ئەگەر مەیلتان لە سەری بێت ئێوەش ئەتوانن بێن.

میرزا موحەممەدعەلی مستەوفی کە لەوێ بوو گوتیان لە خزمەتی ئێوەدا سوار ئەبم، گوتی: نا، بە هۆی پێک‌هێنانی کەرستەی هاتنی جەنابی حاجی، ئەمشەو لە شارا بمێنەوە. ئەم ڕاوێژ کردن و ئەم دوور ئەندێشیانە کە ئاسەواری پەلە کردن و نیشانەی تەفسیر و شۆڕشی ئەبولحەسەن خان بوو بە جۆرێک ڕوون بوو، کە بە بۆنەی پەرێشانی من کە چۆنیەتی پێشوازی لە حاجی بەم جۆرە نیە، بەڵام قسەم نەکرد.

لەم کاتە جەنابی شێخ ئەبووتوراب سەبزەواری هاتنە ناو و چۆن ئەبولحەسەن‌خانیان ئامادەی ڕۆیشتن دی، گەڕانەوە. داوای ئەسپم کرد کە لەگەڵی ئەبولحەسەن خان هاوڕێیی کەم، کاتێک کە ئەسپەکەی ئەبولحەسەن‌خانیان هێنا و سوار بوو و بە منی گوت کە لە دەرەوەی دەروازە چاوەڕێی ئێوەم. کاتی خۆر کەوتن بوو کە لە دەروازە ڕۆیشتینە دەرەوە. لە ڕێگادا ئەسپەکانمان تاودا. سوارێک لە

دوورەوە ئاشکرا بوو. غارمان‌دا گەیشتینە ئەبولحەسەن خان لە حالێک کە سێسەد سوارە دەوریان لێ دابوو. سواری ئەسپ بوو و بە ئەوپەڕی بێباکی و نەترسی سلاوی کرد. یەک کەس لە سوارەکانی بانگ کرد و بە کوردی خراپی پێ گوت و لە ئەسپ دایبەزاند و ئەسپەکەی‌دا بە کەسێکی‌تر. لەگەڵ چەند کەسی‌تر بە زمانی کوردی چەند قسەی کرد. بۆ منی ڕوانی و گوتی: کە ئەمە بوو بە هۆی دڵنیایی و متمانەی ئێوە؟ و ئەبێ ئاکامی کار ئەوە بێ کە بە هۆی دەسەلات پەیدا کردنی من، قارەمان خان و ئەنەوشیروان میرزا لەگەڵ پانسەد سوار مەعمووری دەسگیر کردنی من بن؟

گوتمان شایەت ئەم هەواڵە بە پێچەوانەوە گەیشتبێت بە دەستی ئێوە؟ گوتی تازە دێر بووە. بۆ هەموو ڕێگەکانیش سواریان ناردووە و بەستوویانە. گوتم: بەم حالەوە چی دەکەن؟ گوتی: من تا کاتێک هامە سەر زینەوە، لە ئاسایشدام و کەسێک ناتوانێ بگاتە من. ئەمەی گوت و ئەسپەکەی تاودا. بە سەرشۆڕییێک ئاوا هاتمەوە. یەک سەعات و نیو لە شەو تێپەڕی، هاتمە ناوی شار و گەیشتمە خزمەتی جەنابی سەروەر و گوتم کە هەڵمانیان خەڵەتاند. زۆری نەخایاند کە ئەحمەد عەلی خان و خەڵکی قووچان هاتن و دۆس و دوژمنی ئەبولحەسەن خان بەم پەلە کردنی بێ‌جێگای قارەمان خانە و هاتنی بێ‌پایەی ئەنەوشیروان میرزا جنێویان‌دا و بە حالی خۆ ئەفسووس و داخیان خوارد. هەندێک لە خەڵکی قووچانیش ئێمەیان بە درۆزن ناسی لە حالێکدا کە حەق بەوان بوو. ئەحمەد عەلی زۆر دەردەدار بوو و تووڕە بوو کە من لە ئاشکراکردنی حەقیقەتی ئەم کارە سەرپۆشی ناکەم و پڕ دڵمە لە ڕاز و بۆیە بە دەوڵەت هەواڵ ئەدەم کە کەسانێک وا بە بۆنەی مەبەستی خۆیانەوە، ئەم بنەماڵە ئازا و خزمەتگوزاریانە تاوانبار کردووە؛ لە حالێکدا کە ئەبولحەسەن خان دەسەلاتی پەیدا کردبوو و بە نەخشەکانی پیسی خۆی ئەم ئاشتی بوونیانە داگە بە یەکا و نەیانهێشتووە ئەم کارە بە ئاشتی و خۆشی تەواو بێت.

لە شێخ ئەبووتوراب داخوازی ئاگادار کردنی هەواڵەکان بووین، گوتیان حاجی شەرێعەتمەدار بە ئەوپەڕی دڵنیایی لە سەبزەوارەوە کەوتوونەتە ڕێ و حەزرەتی ئەیالەت لە حەسانەوەی خەیاڵی ئەوان لە بارەی ئەبولحەسەن خان بە «نووسین» و «گوتن» شتێک کەمیان دانەناوە و بە موحەممەدناسر خان (برای ئەبولحەسەن خان)یش خەلاتیان داوە و موحەببەتیان پێ کردووە و لەگەڵی شەریعەتمەئاب

هاوڕێ بوو. دوای دڵدانەوەی ئەوان کە خێری حاڵ و سوودی ماڵی خۆیان لە دوروست کردنی ئەم کارە نازانی. شەریکی قارەمانخان بوون کە لە کاتی چوونی ناوەختی ئەنەوشیروان میرزا و قارەمانخان ئیزنیان گرت و دەستەیێک سواری سەبزەواری بە گەڕاندنەوەی موحەممەد ناسرخان مەعموور کران. ئەنەوشیروان میرزا و قارەمانخان دوێنێ لە عەباسئاوا (سەبزەوار) گەیشتنە خزمەتی جەنابی ئاقای موجتەهێد سەبزەواری و حوکمی ئەیالەتیان ڕاگەیاند کە لە سەر ڕۆیشتن بۆ قووچان بیر بکەنەوە کە خەیالات بە جۆرێکیتر بوو. جەنابی سەروەر تووڕە بوو و بە زۆر قسەی دەرئەهات، ئەبێ بە قەوڵی گەورەکانی نیزام بکرێت، ئیدی بۆچی بە زانایانی دینی ئەم ڕەنج و سەختیە و سەرشۆڕیە کرا؟

دوای ئەم وتارانەی سەروەرە و ئەو بیانوانە، ئەوان لە نێوان خۆیاندا باشیان بەوە زانی کە شەوانە بێنە ناوی قووچان. دووبارە لەم لێبڕانە گەڕانەوە و لە ترسی بەزیندا چاوەڕوانی هاتنی سوارەکانی هەزارە و سەبزەوار بوون و بۆ تەفتیشی حاڵەتی ئەبولحەسەن خان، کەسێک عورزەی هاتنی بۆ قووچان نەبوو، منیان ڕەوانە کرد و ئەنەوشیروان میرزا نووسراوەیێکی بۆ ئێوە و ئەحمەدعەلی خان نووسی. ئەمڕۆ کاتێک کە گەیشتم دیم ئەبولحەسەن خان لەم کارانە ئاگایان بووە و دەیەوێ لە قووچان بڕواتە دەرێ.

نووسراوەی ئەنەوشیروان میرزام خوێند، نووسی بووی: ئێمە بە دوو هەزار نەفەر سوارە و پیادە لە عەباسئاواین و زۆرتر لە یەک شەو لێرە ناوەستین. ئەگەر ئەبولحەسەن خان بە نەسیحەت و ڕێنموونی ئێوە هیدایەت کرا، قووچان چۆڵ بکەن و بۆ هەر شوێنێک کە حەز دەکەن بڕۆن.

بە هەر جۆرێک کە بوو شەو لەگەڵ پەژارە و پەرێشانی سەرکرا و بە حاڵی دەوڵەت و خەڵک خەفەتمان ئەخوارد. ئەحمەدعەلی خان لەم پێشامەدە زۆر تووڕە بوو. ناچار سوار بوین. هەندێک لە خەڵکی قووچان ڕایانگەیاند کە ئەمڕۆ بمێننەوە؛ بەڵام قەبوڵمان نەکرد. دوو سەعات لە نیوەڕۆ تێپەڕی کە گەیشتینە فەرخان لە یەک فرسەخی قووچانەوە، ڕەعیەتێکی زۆر بە دیتنی ئەبولحەسەن خان خۆشحاڵ و سەرکەیف بوون کە باش قسەیان لێ دەکرد. کەربەلای دین موحەممەد کە وێژەریان بوو زۆر تاریفی کرد. گوتی: ئەگەر دەوڵەت لە کار لابردنی

شوجاعوددەولەی بە بیانووی ئاسایشی ئێمە بە باش زانیوە، بۆچی قارەمان‌خانی کردووە بە سەرۆکی ئێمە کە هەمووی خراپەکان لە ژێری سەری ئەودایە و ماڵ و ئەسپاوی حاجی سەیید باقری پاش لاچوونی شوجاعوددەولە تالان کردووە؟ ئێمە خەڵک چۆن کامەران بین کە شادلوو (بوجنۆردیەکان) و دەرەگەزیەکان لە خۆیان گەورەیان بێت و گەورەی ئێمە پەنای بردووەتە تورکمانەکان و دەوڵەتی ئێمە بداتە دەستی قارەمان‌خان؟ ئەو لە حاڵێکدا ئەم قسانەی ئەگوت کە فرمێسک لە چاوانی ئەهاتە خوارەوە و خەڵکی قووچانیش وەکوو ئەو بە حاڵی ئەبولحەسەن خان و زۆر لێکراوی ئەو ئەگریان. لەم حاڵەتە تاساین و لە ئەوان داوای لێ بوردنمان کرد. خەریکی چای نۆشین بووین کە سوارێک کە ئەبولحەسەن خان بۆ مەشهەد ناردبووی هات، نامەیێک لە حاجی موستەشارولمولک گەیشت. لە حاڵێکدا کە ئێستا بە پێچەوانەی ئەوەی کە لەو نامەیەدا نووسرابوو ڕووی دابوو. پارەیێکمان دا بە سوار و ناردمان بۆ قووچان تا لە جێگری موحەممەدقولی‌بەگ و خانی نادیار ئەبولحەسەن خان هەواڵێک بێنێ. شەو لە سەر ماڵێک لە فەرخان کۆڕێکمان دامەرزاند. حەکیم شەفایی و سەبووری (مەلەکوششوعەرای ئاستانی قودس) کە چەند مانگ بوو هاوڕێی ئەبولحەسەن خان بوون و لە بارودۆخی ئاگادار بوون و لە پیاوەتی و بێ‌باکی ئەو شتهاییێکیان دەزانی کە ئەگەر حەکیم شەفایی بە جوانی بۆمان ڕوونی نەدەکردەوە؛ بەڵام قسەکانی سەبووری بۆمان وەکوو گەورە کردنەوەیێکی شاعێرانە دەر ئەکەوت. دوای شێو، سوارێ کە ناردبوومانە قووچان هاتەوە و گوتی کە لە هاتنی ئەنەوشیروان میرزا سەرۆکی تازەی قووچان هێشتا هەواڵێک نیە و ئەوان تا لە دەرچوونی ئەبولحەسەن خان لە ناوچەی قووچان متمانەیان نەبێت، ناگەڕێنەوە ناوی شار. ئەبولحەسەن خانیش چووە قۆشخانە و لەوێ ئەکەوێتە ڕێ بۆ فیرووزە، لە هاوڕێیانی ئەو هەندێک هاتوونەتەوە. هەموومان لەم بارودۆخە خەمبار بوین کە تا ئێستا کە ئەبولحەسەن خان لە دەوڵەت ناهومێد نەبوو، وابوو و ئێستا کە هومێدی لە دەس داوە، ئێشی ئەم سنوور و خەڵکی ئەم ناوچە چلۆن ئەبێت؟ و ئەگەر ئەو پشت بداتە تورکمانەکان، دەوڵەت لەگەڵ گیروگرفتێکی زۆر ڕووبەڕوو دەبێت. لە فەرخانەوە کەوتینە ڕێ. لە نێوی ڕێگا ئەسیرەکانی ئازاد کراوی دەوڵەتی ڕووسمان دی کە لەگەڵ ماڵ و خێزان و مناڵ

ئەڕوانەوە بۆ ماڵی خۆیان. وا بیرم کردەوە و سەرسام بووم کە خودا لە یەک جێگا دوژمن ئەکاتە هۆی خێر کە بەم جۆرە تووی خۆشەویستی لە دڵی خەڵکی ئێران بچانێت و لەم پلەی ئێمە بە مەیلی خراپی شەخسی، دەوڵەتی ئێمە مەجبوور ئەبێت کە ئیلی گەورە و سنووری ڕێک، خراپ و پڕ لە شڵەژاوی بکات. نیم فرسەخ لە شوورچە چوین کە سوارێک هات و بە ئەوپەری ترس و پەرێشانی گوتی کە چەند سوارێک هاتوون تا حەکیم شەفایی و سەبووری بگەڕیننەوە بۆ قووچان کە ئەنەوشیروان میرزا، حەقی دەرمانی لە حەکیم شەفایی و حەقی دەست خۆشانەی کە لە قووچان گیرا بوو لەوان وەرگرێتەوە. پاش بیستنی ئەم هەواڵە بە ناڕەحەتیەوە گەڕاینە دواوە و قسەهاییێک ناجۆرمان حەواڵەی سوارەکانی ئەنەوشیروان میرزا کرد، جارێکتر سوار بوین و کەوتینە ڕێ. نزیکی خۆرکەوتن گەیشتینە قەڵای سەییدەکان (سەییدئاباد) و چوینە ماڵی میرزا مووسا. شیخ تەقی واعێز کە لە قووچان ئەهاتەوە، حازر بوو. ئاقا بیگلەر بجنۆردی (شادیلوو) کە دوو، سێ ساڵە لە ترسی یار موحەممەد خانی ئیلخانی پەنای بردووەتە حوکوومەتی قووچان و لەم ماوەدا خزمەتگوزاری ئەبولحەسەن خان بوو. لێردا ڕەوتی هەواڵەکانمان لەو پرسیار کرد. دەرکەوت چەند فرسەخێک لەگەڵ ئەبولحەسەن خان ڕۆیشتووە و دوایی گەڕاوەتەوە.

**ڕۆژی شەممە دەیەمی ڕەبیعولئەووەڵ:** نەهارمان لە قولی قووچان خوارد. لەوێ کەوتینە ڕێ، گەیشتینە مووسائاوا.

**یەکشەممە یازدەهەم:** گەیشتینە ئەبوو بەسیر.

**ڕۆژی دووشەممە دوازدەی ڕەبیعولئەووەڵ:** چوینە ناو شاری مەشهەد، و بە خەمباریەوە لەم سەفەرە پڕ ڕەنج و بێ دەسکەوتە گەڕامەوە و لە دڵی خۆمدا گوتم: «من و گۆشەی ویرانەی پیرەژن»

## بەربەرەکانێی ئەمیرحسەین خان لەگەڵ ناسرەددین شا

لە گەورەپیاوانی ئیل و ئاغای سلێمان خان ڕۆشەنی داستانێکی زۆر سەیرم لە بارەی ئەمیرحسەین خان شوجاعوددەولە بیستبوو . باوەڕکردنی بۆ من دژوار بوو تاکوو لەم ئاخرەدا لە وەختی خوێندنەوەی گۆڤاری یەغما چاوم بە نوسراوەیکی دروشت کەوت. ناسرەدین شا و شوجاعوددەولە نووسراوەی «ئیقبالی» کە لە یەکێ لە گۆڤارەکاندا چاپ کرابوو لەوێدا ئاماژەی بەوە کردبوو کە شوجاعوددەولە دلێر و نەترس بوو. ناسرەدین شا لە سەفەرێک بۆ خوراسان[٤٨] کاتێ گەیشتە قووچان، شوجاعوددەولە یەکێ لە گەورە پیاوانی باکووری خوراسان بووە، لەو هەرێمەدا مرۆڤێکی بە هێز و دەسەلاتێکی زۆری هەبوو. گەیشتە خزمەتی پاشا لە توانایی ئەو زۆر دەترسا چۆن ئەگەر لەگەڵ شادا دوژمنی بکردبایا شا نەیدەتوانی ئەو شۆڕشە بخەوێنێ. بەم بۆنەوە ویستی بە کەڵەک لەگەڵ خۆیدا بیبا بۆ تاران. پێی گوت شوجاعوددەولە تۆ لەگەڵ من وەرە بۆ تاران، تاکوو بە باشی لە تۆ کەڵک وەرگرین و کاری باشت بدەینێ. ئەویش چەند پێشکەشی هێنایە خزمەتی پاشا و پاشا چاوی بە بوخچەیێک دەربەسراو کەوت، کاتێ کردیانەوە پاشا سەری مەزهەردەولەی لە نێوی‌دا بینی و زۆر ترسا، بەڵام بە ڕووی خۆیی‌دا نەیهێنا. ڕۆژی دوایی کاتێ ویستی سواری ئەسپەکەی ببێ، بە شوجاعوددەولەی گوت کەسێ لە تۆ لایەق‌تر و باشتر بۆ حوکوومەتی هەرێمی قووچان و بجنوورد و دەوروبەر و سنوورم پەیدا نەکرد، لێرەدا بمێنە و خزمەتی خۆت ئەنجام بدە. بەڵام ڕیشەی کارەکە ئاوەها بوو کە شوجاعوددەولە لە ناسرەدین شا ویستبووی ئیزنی بدات ماڵەکەی ڕەزا قولی‌خان ئیلخانی کە عەباس میرزا (باوا گەورەی ناسرەدین شا) لە شەڕی قووچاندا خراپی کردبوو دروستی کاتەوە. ناسرەددین شا لە پێشنیاری درووست کردنەوەی ماڵەکانی رەزا قولی خان و دژی قووچان تەکانێکی خوارد و هیچی نەگوت، واتا ئەم پێشنیارەی قبووڵ نەبوو. بەڵام لەم ئەندێشەدا بوو ئەگەر شوجاعوددەولە وەکوو باوکی لە قووچاندا شۆڕش هەڵگرسێنێ. ئایا لە دەرگای پاشایەتی ئەودا کەسێ هەیە

---

[٤٨]– سەفەری دووهەمی ناسرەدین شا بۆ خوراسان سالی ١٣٠٠ کۆچی.

شوجاعودده‌وڵە دەسگیر بکا و سەرکوتی بکا یا نە؟
ناسرەددین شا ئەوشەوە تاکوو بەیانی لە بارەی ئەم کارەساتەوە بیری دەکردەوە و نەخەوتبوو. زۆر جار بیری دەکردەوە ئەگەر ئەمشەو ئەمیرحسەین خان من بگرێ و پاشایەتی خۆی ڕابگەیەنێ لە قووچاندا ئایا کەسێ پەیدا دەبێ لەگەڵ ئەودا بەربەرەکانی بکا، هەر جورێ بوو ئەو شەوە تا بەیانی ڕابۆرد و بەیانی دوای نان و چای چوو بۆ مەشهەد، شوجاعودده‌وڵە بۆ ڕوانەکردنی پاشا لە قووچان هاتبووە دەرەوە. ناسرەددین شا لە ئەوی ویستبوو بۆ هاتنی تاران خۆی ئامادە بکا و هەر لەوێدا حاکمی تازەی قووچان دەناسرێ و گوتبووی دەسەڵات دەدا بە دەستی ئەوەوە.
شوجاعودده‌وڵە لەگەڵ حاکمی تازەدا کە لە شازادەکانی قاجار بوو هاتەوە بۆ شار. دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە ڕەمەزان خان وەزیری خۆی بانگ کرد و دوو مجری پێ دا وتیَ مجریەکان لە نێوان ڕێگەدا بدە بە پاشا. ڕەمەزان خان وەکوو وتەی شوجاعودده‌وڵەی بە ڕێوە برد و هەر دوو مجریەکەی لە بەردەمی پاشا دانا و گوتی: ئەی پاشا! سەرۆک شوجاعودده‌وڵە ئەم دوو مجریەی پێشکەش کردووە و گوتوویە کە مجریە سەوزەکە دەتوانی لە بەرانبەری کەسانی دیکەدا بیکەیەوە، بەڵام مجریە سوورەکە چۆن تایبەتی پاشایە لە نهێنیدا بیکەرەوە. ناسرەددین شا ئەڵێ مجریە سەوزەکە بکەنەوە؛ کە کردیانەوە، پڕی بوو لە زێڕی گران کە وەکوو ئەو زێڕانە لە خەزێنەی پاشادا نەبوو، پاشا لە خۆشیدا هاواری کرد: ئافەرین بۆ تۆ ئەی شۆجاعودده‌وڵە. دەوروبەرەکانی لەم بەخششی شوجاعودده‌وڵە سەریان سۆڕ مابوو، چۆن ئەو ئاوا کەسێ نەبوو کە باج بدات. ڕەمەزان خان هەروەها وەکوو وتەی شوجاعودده‌وڵە ئیزنی بەخشندەیی گرت و سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و ڕۆیشتەوە بۆ قووچان. شەو کاتێ ناسرەددین شا ڕویشت بۆ شوێنی خەوی خۆی، ویستی مجریە سوورەکە ببینێ، کاتێ درگای مجریەکەی کردەوە سەری بڕاوی حاکمی نوێ بێدەسەڵاتی قووچانی بینی کە لە نێوی ئەو مجریەدا بوو. پاشا خێرا درگای مجریەکەی بەست. ڕۆژی دیکە شوجاعودده‌وڵە لە قووچانەوە هات، لە کاتێکدا ٦٠٠ کەس لە باشترین سوارەکانی عەشیوتی زەعفەرانلوو لە دوای ئەوەوە بوون، گەیشتە ئۆردووی ناسرەددین شا و لە ئەسپەکەی هاتە خوارەوە و ڕێزی پاشای گرت، پاشا بە سەرسووڕمانەوە تواشای کرد و دوایی فەرمانیدا بە شوجاعودده‌وڵە کە سوار بێ.

شوجاعوددەوڵە سوار بوو، کەوتە دوای پاشا، تـاکوو پاشـا هاتـە مەشـهەد سـوارەکانی زەعفەرانلوو پاراستنی ئۆردووی پاشایان گرتە ئەستۆ. پاشا چـەن ڕۆژێ لـە مەشـهەد مایەوە، دوای ئەوە لە ڕێگای نەیشابوورەوە ڕویشت بۆ تاران، شوجاعوددەوڵە تا نزیکـی سەبزەوار ئەوی ڕوانە کـرد. دوای ئـەو پاشـا سەربەسـتی پێـی دا و ئـەویش لەگـەڵ پاڵەوانەکانی پیرۆزی زەعفەرانلوو هاتەوە بۆ قووچان. پاشـا دوای گەیـشتن بـە تـاران ویستی لە شوجاعوددەوڵە تۆڵە بستێنێ، چۆن لەگەڵ ئیشی ئەودا ئاشنایی هەبوو، بـۆ بزواندنی یەک دەس جل‌وبەرگی بۆ قارەمان خانی ئامۆزای شوجاعوددەوڵە نـارد کـە ئەمیرحسەین خان بیدا پێ. ئەمیر لە بۆ قارەمان خان کە لەم کاتەدا لـە ئێسفەراین بوو هەواڵی نارد کە بێ بۆ قووچان و خـەلاتی پاشـا وەربگـرێ. ژنەکـەی ئـەمیر کـە خۆشکی قارەمان‌خان بوو بۆ براکەی هەواڵی هـەنارد کـە نـەی بـۆ قووچـان وە ئـەم خەلاتەی وەرنەگرێ؛ بەڵام ئەو گوێ نەدا بە قسەی خۆشکی، چـۆن ئیلخـانی ئـەوی خواستبوو قارەمـان ڕویـشت. شوجاعوددەوڵـە لێوانـێ شـەربەتی بـۆی هێنـا تـاکوو بیخواتەوە ئەویش خواردیەوە و خێرا کەوتە زەوی. دوای چەند کاتێ کـە چـووە نێـو حەمامەکەوە چاوی پێ کەوت کـە نـە تـەنیا قارەمـان خـان مـردووە بەڵـکوو ڕەش بووەتەوە و هـەموو مووەکـانی دەم و چـاوی ڕزاوە. ئەسـپە ڕەشـەکەی ئـەو تۆڵـەی قارەمان خانی لە شوجاعوددەوڵەی سەندەوە و ئەوی دا بە زەویا و کوشتی.

## ڕێ و ڕەسمی نەورۆز لە لایەن ئەمیرەوە:

کوردەکانی خوراسان وەکوو ئێرانیـەکانی دیکـە هـۆگری فەرهـەنگ و ئـەدەبی باوباپیر و نەتەوەی خۆیانن و نەورۆزیان ڕێز گرتووە و خۆشـیان ویـستووە و «نـەورۆز بەگ» یانێ نەورۆز بەگی و «میر نەورۆزی» یانێ ژنی بەگی، نەورۆزیان بـە ئەوپـەڕی خۆشیەوە تا ساڵەکانی دوایی بـاو بـووە، هـەموو خەڵـک چ ژن و پیـاو و پـیر و لاو، دەوڵەمەند و هەژار لەو جەژنـەدا کـۆ دەبوونـەوە. ئێمـە لـە فەرهـەنگی کرمـانجی‌دا ڕاڤەمان بـۆی دانـاوە و بـە هیـوای ئـەوەین کـە بتـوانین چـاپی بکـەین و پەخـشی بکەینەوە.

پیاوە گەورەکان و خانەکان و بەگەکانی کورد هـەر کامیـان بـۆ حـاڵ و هـەوا و

بارەگای خۆیان لە نەورۆز ڕێزیان دەگرت و ئاهەنگیان دەگێڕا، وەکوو ئەمیر حسەین خان کە بچووکتر لە پاشای وڵات بوو، وایان نووسیوە: هەمووساڵێ جێژنی نەورۆز لە گەورە ماڵی ئیلخانی «ئەمیر شوجاعوددەولە» جێژن دەگیرا، دوو شەو بە جێژنی نەورۆزی مابوو هەموو شتێکیان بە فەرمانی ئەمیر ئامادە دەکرد، یەک سینی زێڕی بچووک پڕ لە زێڕ دەکرا. نزیک ١٠٠٠٠ تمەن و یەک سینی گەورەی نوقرە لە پێنج هەزار زێڕ و شایی سپی پڕیان دەکرد. شەش حەوت سینی گەورەی دیوانی لە دوو قرانی کە نۆکەرەکان بە سابوون شۆردبوویان و قرانەکانیان تێ دەکرد و بە باشی ئەیانچنی، لە ڕۆژی نەورۆزدا کاتی سڵاو کردن لەو جێگادا کە ئەمیر تەنیا بە جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ و شمشێری زێڕبافەوە ئەهات و چۆکی دائەدا، کاردێکی زێڕینی لە کەمەردا بوو، شمشێر و عەسای زێڕینی بە دەستەوە بوو، سەر شانەی زێڕین بوو. سەرتیپ و سەرهەنگەکان بە لیباسی ڕەسمی سەوز و سوور[٤٩] و شمشێرگەلێ زێڕین ئاوێزان کراو لە پێشدا، موجتەهێدەکانیش لەوێ بوون، دوایی جێگری حکوومەت و بنەماڵەکانی حوکوومەت وەکوو خانی گەورە ئەمیر برای ئەمیرحسەین باوکی خەسرەوخانی خاڵۆی موحەممەد قولیخان باوکی ئەمیرمحەممەد خان و خان بابا موزەفەر کوڕی سامخان ئیلخانی، پاشان نووسەرەکان و مستەوفی و میرزاکان و خانەکان و خزمەتگوزارەکان کە هەموویان زەوی و باخیان بوو و پاشان باخەوانەکان و خەڵکی دیکە، سەید و مەلا و بازاڕی و تا ئەگاتە نۆکەر و هەر کام دوقەرانیان وەرئەگرت. جێگای کارمەندەکان لەم زەمانەدا خاڵی بوو. شاعێرەکان شێعری خۆیان دەخوێندەوە و یەکێ دەتمەن یان پێنج تمەن خەڵاتیان وەرگرت. بە کورتی ئەم کارەیان تەواو دەکرد. زۆران و شەڕی بەران و شەڕی کەڵەشێر دەستی پێ دەکرد و سەرۆکی قووچان بە خاوەنی ئەوانە خەڵاتی دەدا، ئەو پاڵەوانانەی کە پیرۆز دەبوون دوو قەران خەڵاتیان وەردەگرت. دوایی ئەم کارەساتە تەواو دەبوو و سەرۆک پێشکەشی زۆری ئەدا بە فەلاکانی هەژار. گزگ بۆ سپوورەکانی شار، پارەی چێوی گوناهکارەکان، بزمار و تەناف بۆ چادر و ئەسپ و

---

[٤٩]- خوالێخۆش بوو سەرۆکی دیوان لە بارەی وەزیر ئەمیرحسەینخان کە بە ڕەمەزان خان ناسرابوو، قسەیکی نەکردووە، بێگومان ڕەمەزان خان بە نێوی سەرۆکی وەزیران و سەرۆکی دەوڵەت یەکەم کەسێ بوو کە بۆ وتنی پیرۆزبایی و سلاو ئەگەیشتە خزمەتی ئەمیر و جێژنانەکەی خۆی وەردەگرد.

قاتر و وشتر پارەی کەندنی بیرەکانی شار و دێ، تەلاری زەماوەند لـە بنەماڵـەی زاوا لە دوو تا پێنج تمەن وەردەگیرا، کەمێ لـە مووچـەی کارمەنـدەکانی دەوڵـەت لـەم ڕێگاوە بە دی دەهات، چۆنکوو لەو سەردەمەدا پـارەی نـەوت و گومرێـک و ماڵـیاتی سۆک و قورس و دەیەکی مەعاشی حکوومەت لە دەوڵەمەنەکان بە دەست دەهـات. موڵکی ئەوانەی کە زەوتیان کردبوو و کەسێکیان نـەبوو مافیـان بـستێنێ. هـەروەها خودی ناسرەددین شا لە کەلەپوور و ماڵی ئەمیر بەشی وەردەگرت، ئەوەندە بزانە کە ئەو سەهۆڵە لە یەخچاڵە سروشتیەکان‌دا دروست دەبوو، و پارەی ماڵە سەرۆکەکان و خانەکان، فەلاکان ئەیاندا و هەروەها حەماڵی و ئیشەکانی دیکە تا ئەگا بە سـەقایی و دارشکاندنەوە ئەوان بەڕێوەیان دەبرد.[٥٠]

**دادپەروەری ئەمیر حسەین خان:**

دادپـەروەری ئەمیرحـسەین خـان و ئیلخانـەکانی کـورد دوو چاوگـەی هـەبوو چاوگەی بنەڕەتی قانوون، دووهەمیش ئایین و باوڕ بـوو؛ ئێمـە بەڵـگەی زۆرمـان بـە دەستەوەیە بە تایبەت لە دوایین سەرۆکی زەعفەرانلوو یانێ خوالێخۆشـبوو ئیـبراهیم خان ڕۆشەنی «موزەفەروسەڵـتەنە» لـە دەسـتماندایە کـە لـە فەرهـەنگی کۆمەڵـی کرمانج کەڵک وەرئەگیردرێ. لە دیواخانی ئەمیردا یاسایەکی بە نێـوی دادپـەروەری ئایین داناوە و چەند نووسەر و دادپەروەر لەوێ بوون. لە بـارەی دیواخـانی گـەورەی ئەمیرحسەین خان شتانێ زۆر نووسـراوە و لـە کـاری دادپـەروەری ئـێڵ و ناوچـەی قووچان قسەی نەستەق هەیە، تا ئەو جێگا کـە کاتـێ یـەکێ لـە نووسـەرەکانی لـە کەسی دیکە بەرتیلی گرتبوو، فەرمانی‌دا پەنجەیان بڕی؛ بەڵام ئەوەی کـە ئەڵـێم لـە نووسراوەکان‌دا نەهاتووە و تەنیا سینە بە سـینە بـە ئێمـە گەیـشتووە. لـە یـەکێ لـە ڕۆژەکانا پیاوێکی نە پیر و نە لاو شاڵی کوردی بەسـتبوو و شـواڵ و کـەوای کـوردی (چۆخۆڕانگ) لە بەریدا بوو، لە بەر ماڵـی ئـەمیر لـە ئەسـپ هاتـە خـوارەوە و بـۆ داد ڕویشت بۆ لای ئەمیر. سکاڵاکەی ئەمە بوو کـە ئـەو پیاوێکـە حـەیوانی هەیـە و لـە کێوەکانی شاجان ژیان دەباتە سـەر. یـەکێ لـە شـوانە لاوەکـان کچەکـەی ئـەوی

---

[٥٠]- ئەترکنامە- شاکری- ل ٧٧- گێڕانەوە لە یادداشتەکانی سەرۆکی ئۆترو کنامە. دیوانی ئەفشار

ڕفاندووه. له سەردەم ئەمیردا به بۆنەی زەبەندی ئیشی ئەو، ئەم کارانەیان نەدەتوانی بکەن، ئەو کەسەی کە ئەو کارەی کردووه به توندی سزا ئەدرا. ئەمیر لەم هەواڵە زۆر ناڕاحەت بوو و ڕاسپێردراوەکانی نارد بۆ کێوی شاجان. ڕۆژی دوایی شوانەکەیان هێنایە دادگا، له ناو کورداندا ڕەسم وەها بوو، کچیان تا تەمەنی ٢٥ ساڵان به شوو نەدەدا تا بۆ باوک و دایکی کار بکا، چۆن کاری ژنان له پیاوان له نێوی ئیلدا زۆرتر بوو. ئاشکرایه کوڕان و کچان به ئازادی کە له سروشتی کویستانا بوویان له وەها تەمەنێکدا وەکوو لۆکه و ئاگر وا بوون و له برووسکەی ئاگری ئەوین، شەڕ دروست دەبوو. کوڕ، کچی ئەویناری خۆی له ئەوەڵ کاتدا له باوک و دایکی داوا دەکرد و ئەگەر کچیان پێ نەدابای، پێکەوه بەڵێنیان ئەدا له ژوانگایێکدا سوار ئەسپ دەبوون و ئەڕویشتن و ڕایان دەکرد. له ئیلێکەوه بۆ ئیلێکی دیکه دەڕویشتن و پەنایان دەبردە سەرۆکی ئەو ئیله و یان خۆیان دەگەیاندە قووچان یان شیروان و یان یەکێ له شارەکانی دیکه و دەچوونه لای مەلای ئەو جێگەیه و پێکەوه زەماوەنیان دەکرد و چۆن به ئەویناری کوڕ و کچەوه ئەم کارە دەبڕایەوه، هیچ کاتێ پایەی ئەو بنەماڵە خراپ نەدەبوو کە ئەمڕۆ له کۆمەڵگای شاریدا زۆر ئەم شتانه دەبینین. له دوای لێکۆڵینەوه ئەمیرحسەین خان خۆی لەگەڵ سکاڵاگەردا زانی کە ئەم سکاڵایه وەکوو ڕاکردن وایه کە شوانەکە چەن ساڵێکه به بۆنەی ئەوینداری کچە سەرۆکەکەوه، شوانی کردووه و هەموو جۆرێ نۆکەری خۆی به جێ هێناوه تا بەڵکوو سەرۆکەکەی لێخۆش بێ و کچەکەی پێ بدەن. باوک کچەکە چۆن شوانەکە دەوڵەمەن نەبوو ئەم پێ گەیشتنەی بۆ خۆی به کەم و کۆڕی دەزانی کە کچەکەی بەو نەدا بووڕ و شوانەکە له سەر بڕیاری پێشوو کە پێکەوه بوویان، له کێوی شاهیجان پەیمانی ژیانی هاوسەری خۆی و ئەو کچەی به شاهێدی ئەستێرەکانی ئاسمان، بولبول و باڵندەی جوان و ڕەنگاوڕەنگی کوێستان بەستبوو و پاش ماوەیەک بووکەکە زکی پڕ بوو بوو. به هۆی سکاڵای باوکی کچەکە ئەمیرحسەین خان کە گوێ به قسەی شوانەکە دابوو و له نێو ماڵەکەدا چەپ و ڕاست دەڕویشت و دەهات و هاواری دەکرد؛ مەگەر تۆ له سزای ئەمیر نەترسای کە ئاوا کارێکت کرد؟

شوان به زمان کوردی گوتی: خان گیان! من هەرچی بەم بێئایینه گوتم مەکە سەرۆک وا له قووچاندا ئەگەر ببیسێ، پێستی سەرت دەردێنێ، حاڵی نەبوو کە

نەبوو. ئێستاش خان گیان ئەوەش شمشێری تۆ، ئەویش گەردنی من. ئەمیر بە کەنینەوە پشتی کردبوو لە شوانەکە تا شوانەکە بە کەنینەکەی نەزانێ. ئەمیر سەری هەڵگەڕاندەوە و بە ڕواڵەتێکی توندەوە گوتی ئێستا بە تۆ و ئەویش ئەڵێم سزاتان دەدەم. دوایی فەرمانیدا شەلاخیان بدەن و ٨٠ زەربە شەلاخی دا لە شوانەکە، بە هۆی کاری خراپێکەوە کە کردوویە؛ باوکی کچەکەیشی لۆمە کرد، بە بۆنەی ئەوە کە بە خوازبێنی شوان و داوای کوڕ و کچ گوێیان نەداوە، لەو کاتەدا ١٠٠ تمەن لە خەزێنەکەی خۆی بە نێوی دیاری بە ئەم بووک و زاوا بێباکە درا کە تاکوو بەو پووڵە ژیانی خۆیان دروست بکەن و پێکەوە ژیانی خۆیان دەست پێ بکەن و ئەوانیان ناردەوە بۆ شاهیجان و بوون بە بووک و زاوای شوجاعوددەوڵە.

## لەبارەی دیلیە تورکمانەکانەوە کە ئەمیرحسەین خان دیلیانی کردبوو لە لە کاتی هێرشیان بۆ خوراسان:

تورکمانەکان لە بەرانبەری ئازاد کردنی دیلەکان ئەبوایە پارەیان لە خاون دیلەکان بگردایە، یاکوو ئەو دیلانەی کە لە ژێر دەسەلاتی تورکمەنەکاندا بوون ئاڵوگۆڕ دەکران. لە یەکێ لە هێرشەکانی ئەمیرحسەین خاندا بۆ سەر تورکمەنەکان، یەکێ لە دیلەکان گوتی: من هونەرمەندم. چۆنکوو کوشتنی هونەرمەندان یاکوو دیل گرتنی ئەهلی هونەر بە لای کورەکانەوە دروست نەبوو. کاتێ لە خزمەت ئەمیردا ئەمەیانە گوت، ئەمیر ئەوی ئامادە کرد و قسەکانی بیست و دەستووری دا کە دووتاری بۆ بێنن. ئەمیر لە کاتێکدا شمشێرەکەی لە بان ڕانیەوە دانابوو و لە چادری تایبەتی خۆیدا دانیشتبوو و ئەمیرەکانی زەعفەرانلووش لەوێدا بوون و بەو هونەرمەندە تورکمەنە گوتی: ئەگەر مووسیقاییێک لێ بدەیت و من پەسەندی کەم ئازادت دەکەم، ئەگەر وا نەبێ، بەم شمشێرە دەتکوژم، هونەرمەندی تورکمەن قۆڵی هەڵماڵی و تاری لێ دا و هاواری لە دڵی تار دەرهانی و مووسیقاییێکی دوای مووسیقای دیکە دەردەهانی؛ بەڵام ڕواڵەتی ئەمیر هەروا گرژ بوو. هەر ناڕاحەتتر دەبوو و ئەوانەی کە لەوێ دانیشتبوون، زانیان کە هونەری ئەم پیاوە بە ناوی یەک هونەرمەند ئەمیر پەسەندی ناکا، چۆن ئەمیر مووسیقی جوانی

دەزانی و حەتمەن دەیکوژێ؛ لە ئاخرین کاتدا بوو کە پەنجەی هونەری پیاوە تورکمەن دەنگیکی دیکەی لە تارەکە دەرهێنا کە بۆ ئەمیر و کەسانی دیکە هەست بزوێن بوو و تا ئەو کاتە دەنگی وایان نەبیستبوو. کەمکەم ڕواڵەتی ئەمیر گەشایەوە و گیانی هونەرمەند لە خەتەر دوور کەوتەوە. خوالێخۆشبوو ڕەحیم خان بەشێ لەم مووسیقایە بۆ ئێمە زیندوو کردەوە و خۆشبەختانە بەشێکی لە ڕادیوی کوردی خوراسان بەر لە مردنی ئەم هونەرمەندە بڵاو بۆیەوە. ئێستا شریتی ناوبراو کە بە دەستی ئاغەی سەفەری موڕادی دروست کراوە لە ئارشیوی ڕادیودا هەیە و بە مووسیقای شوجاعوددەوڵە ناسراوە، ئەم مووسیقایە گۆرانی لەگەڵدا نییە؛ بەڵام لە ئاخری هەر بەشێکدا ئەم ڕستە دەبینرێ کە ژەنیار دووپاتی دەکاتەوە: (سەرۆک گیان). مەبەست سەرۆک شوجاعوددەوڵەیە، لەم مووسیقایەدا بە باشی دەبیسرێ کە خودی دیل ئازادی خۆی بە گوتنی سەرۆک گیان لە ئەمیر تکا دەکا.

## پیاوانی قوچان لە بەرابەری ئەمیردا:

ئەمیرحسەین خان جیا لە پیاوانی حکومەتی و نووسەران و وەرگێڕان (ڕووسی- ئالمانی و ئینگلیسی و فەرانسەوی) یساوڵباشی، سەقا و نۆکەر و... ژمارەی ٣٢ ئیلبەیگی کە هەرکامیان سەرۆکی ئیلی خۆیان بوون و چەند خان و بەگیان لە خزمەتدا بوو. لە دوورترین شوێنەکانەوە ئەگەیشتنە خزمەتی و هەواڵی کارەکانی خۆیان دەدا، ئەگەر یەکێ لەو سەرکردانە کارێکی بکردبای کە ئەمیر خۆشی لێ نەهاتبای بێچارە تا هەڵدەگەڕاوە، لە ترسی ئەمە کە نەکوا میر تووڕە بێ لێ، نیمەگیان دەبوو. کاتێ دەسەڵاتدار ڕزگار دەبوو، پارەی نەزر دەکرد. ئاغەی شاکری گێڕایەوە -کە لە پیاوانی دەورەی ئەمیرحسەین قارەمانخانی میرپێنج جێگری حکوومەتی پێشووە و کوڕی مامی میر کیتفانە و کتێبی زۆری بووە-: وەلی خان (بیگلەر بەیگی قووچان) باوکی تاجموحەممەد خان بەهادوری [بادلی- بادلانلوو] کە پیاوێکی زانا بووە و میرئاخوڕی میرحسەین خانی لە ئەستۆ بوو. بە وتەی بەڕێوەبەری دیوانی، ئەفشارخان و پیاوەکانی دەورەی میرحسەین خان کە پێش خزمەتی خۆڕایی بوون؛ بەڵام هەموویان دەوڵەمەند بوون و بە کشمیری ئاراستە کە

دەوروبەری بە زێڕ ئاراستە کرابوو لە پەنای حەسێڵی زۆر گەورەی مەڕمەڕ کە لە سێ فوارە هەمیشە ئاو وەکوو گولاو دەهاتە دەرێ و لە دەوروبەریا ڕادەبواردن. ئەم حەسێڵە لە نێوانماڵی دەرەوە لە پێشی گوڵخانەکەدا بوو.

خانەکان بە سەف و بە خۆشیەوە وەستابوون [بە ئیلی خۆیان شانازیان دەکرد کە لە شەڕدا سەرکەوتبوون] لە دەوری سەرۆکیان‌دا ڕادەوەستان. لە لایەکەوە نۆکەر و جێنیشینەکان و بە شمشێری زێڕ و نوقرە و عەسا و فشەنگەوە ڕاوەستا بوون. درەختەکانی نارنجیان دەچنیەوە، نزیکەی ٥٠٠ کەس لەو کۆمەڵگادا هەموو کات نانی بەیانی و شێویان دەخوارد، تا ئەو کاتەی میر لە دەرەوە بوو جیا لە دەنگی ئاوی فوارەکان کە نەیاندەتوانی پێشی بگرن کەسێ نەیەتوانی بقۆزێ و بانگیان لە هەرکام لەمانە بکردبای کەوشەکەی دەردەهێنا «فاخلع نعلین» و خێرا دەچووە خزمەتیان. لە بان ئاجۆرە خاوێنەکانەوە دەچوونە پێشەوە و دەستوورەکەیان پێڕەوی دەکرد. هەر کەسێک کورتە سەرنجێکی بدایە دەبووە خاوەن هەموو شتێک ئەگینا ئەگەر وا نەبوایە هەموو شتێکی لە دەست دەچوو و یان کە ماڵەکەیان ئاگر ئەدا یان ماڵەکەیان تالان دەکرد. خوالێخۆشبوو حاج موحەممەد بەیگی یساوڵباشی مامۆی ئاغەی هوژەبرولمەلێک... عێمارەت و ماڵەکەی تالان کرا «وەکوو ماڵی باب و باپیرانی ناسر لەشکەری حەبیب خان...» یان لە یونگی ئاگردا باوە گەورەی ئادینە قولیان زەجر و داخ کرد تا مرد جا وازیان لێ هانی. ماڵی باوک مسرخان لە جریسان ئاگر درا و تالان کرا. ئەمیرحسەین خان لەم هەموو بنکەیە دەستی هەڵنەگرت تا توانی دەسەڵاتی خۆی سەقامگیر بکات و بەرنگاری ناسرەددین شاش ببێتەوە. هیچ دەسەڵاتدارێک نەیتوانی بەرنگاری ئەو ببێتەوە.

بنەماڵەکەشی کە بە حکوومەت ئەگەیشتن و تامی دەسەڵاتی باپیرانیان چێشتبوو و بۆیە کارێکیان بە سەر خەڵکی هەژار دەر ئەهاورد کە خەڵک ناچار ئەبوان چراموو‌شییان هەڵئەگرت و لە تاریکی‌دا بە شوێن ئەمیرحسەین‌خان‌دا دەگەڕان. ئەو شتەیکە دۆخی کۆمەڵ دەگۆڕێ ئەوەیە کە کۆمەڵگا بە شوێن پێشکەوتندا دەڕوا، ئازادی گوتن و قەڵەم و ڕێز دانانی دەسەڵات و خەڵک بۆ ئازادی هاوڕێ ڕێبەرێکی بەرز کۆمەڵگا دەخاتە پەنای قانوونێکی چاک. سەبارەت بە خودی قانوونیش هەروەها باسمان هەیە کە لەلایەن چ کەسگەلێکەوە و لە چ کەش و هەل

و مەرجێکدا نووسراوە و تۆمار کراوە. لە بەر ئەوەی جاروبار یاسا ئەڵێ بڕۆن کڵاو بنە سەر خەڵکی. دەسەڵاتداران کە دەنگی خەڵکیان بۆ گرینگ نەبوو لە هەر فورم و لە هەر جۆری کە بن، خەڵک ناتوانن دژی سیاسەتیان بوەستن. ئەمیرحسەین خان هەروەها کە خۆی بە شاهەنشا دەزانی ئیزن بە تاوانبارانی سیاسی حکوومەتی خۆی نادات سەر بەرز بکەنەوە و ئەیزانی کە ئەگەر روویان پێ بدات ئاکامی خراپ دەبێت. ئەمرۆ کە لە دوایی سەدەی بیستەمداین زۆربەی وڵاتانی جیهان، کوشتن و بڕین زۆر خراپترە لە چەرخی ئەمیرحسەین‌خان، هەروەها بابەتگەلێک دەبینین کە ئەمیرحسەین‌خان لەگەڵ دژەکانی سیاسی خۆیدا زۆر بە توند و تیژی بەرەو روو نەدەبوەوە وەک ئەمرۆکەی جیهان. نووسەری ئێرانی دوێنێ (ایران دیروز) کە بۆ دیاری کردنی خەتی سنووری لە لایەن ناسرەددین شا بۆ قووچان هاتبوو و ماوەیێک میوانی ئەمیر بوو و ئەڵێ: من ناوبانگی خوالێخۆشبوو فەقیر موحەممەد عەلی قووچانیم بیستبوو و زۆر کەسێک لە بارەیەوە باسی دەکرد. کە وایە لە خودی شوجاعوددەوڵە ئەمیرحسەین‌خانم پرسیوە و کە ئەم کەسە لە کوێوە هاتبوو و بڕوای ئێوە لە بارەی ئەوەوە چییە؟

گوتی: ئەو خەڵکی قووچانە. باوکی ئەو کڵاودۆز بوو. لە سەرەتای حکوومەتمدا یەکێ لە زانایان (خوالێخۆشبوو مەلا موحەممەد کازم هەمەدانی خەڵکی قووچان)[١] خەڵکی لە من هەڵخڕاند. ئەم هەژارە تفەنگێکی بووە و زۆر چاکی لێ دەزانی و بەو لەوەی بێتە نێو دووکان دەچوو بۆ شکار و هیچ کاتێ دەستی خاڵی هەڵنەدەگەڕایەوە. بە بۆنەی دلێری ئەوەوە شۆڕشگێڕان ئەویان بە ناو سەرۆک هەلبژاردبوو. شۆڕشگێڕان چەند حەوتە لە شەڕ و شۆڕدا دەبوون؛ لە دوایی شۆڕشگێڕان یان دەکوژران یان پەنایان دەهێنا و دەبەخشران. هەژا موحەممەدعەلی چۆن زۆر ئازا بوو خۆی بە دەستەوە نەدا، دەرباز بوو، ماوەیێکی زۆ لە کێوەکاندا خەریکی شکار کردن بوو. پاش سەفەرێکم بۆ تاران لە کێوەوە هات خوارەوە و لەو باخەدا کە ملکی باجی بوو، دوو ژێر زەوی درووست کرد و دونیای

---

[١]- تواشا کەن بە هەواڵی شیخ سەرۆکی قاجار لە کتێبی بەدایع و سەمەر و وەقایع سەفەر کە پێش ئەمە هاوردراوە.

تەرک کردووە و لەوێدا عیبادەتی دەکرد. لە هاتنەوەدا کاتێ کە دیم بە مـن ئـازاری ناگات لێ بوردم. من خۆم نەڕویشتم بۆ لای ئەو؛ بەڵام زۆر کات نۆکـەرەکانی خـۆمم دەنارد بۆ لای، کە دەهاتنەوە بڕێ شتی سەرسووڕ هێنـەریان دەگـوت و ئێـستا ژێـر زەوینەکەی ئەو بووەتە جێگای زیارەتی دێهاتیەکان. لە شوجاعوددەولەم پرسـی کـە ئەبێ من بڕۆم ئەم پیاوە ببینم؟ گوتی: لە لای منەوە هەرگیز بـەرگریت لـێ نـاکرێ؛ بەڵام ئەڵێن بۆ چوونە نێو ژێرزەوی دەبـێ ئیـزنی ئـەو وەرگـرین[٥٢]. سکاڵای خـان باباخان لە دەستی ئەمیرحسەین‌خان لەلای ناسرەددین شـاوە وتـرا، دوای کـوژرانی سام خان ئیلخانی براکەی حسەین‌خان لە جێگای ئەودا بوو بە سـەرۆکی قووچـان و هەموو دوژمنانی خۆی وەکوو ڕەزا قولی‌خان برازای سام‌خان لە گۆڕەپـانی شـۆڕش‌دا خستە دەرەوە هەرچەند کەسانێ لە حکوومەتی ڕەزا قولی‌خانی دووهـەم ناسـراو بـە خان باباخان لە قووچان‌دا پشتیوانیان دەکرد، حـسەین‌خـان نزامووددەولـە سـەرۆکی خوراسان بوو؛ بەڵام کەسێکی وەکوو میرحسەین خان ئەمەی قبـووڵ نـەدەکرد کـە نازە لاوێک ببێ بە سەرۆک و ئەو لە پەراوێزدا بمێنێتەوە، بەو جۆرە دەسـەڵاتی نـەدا ە دەستی باباخانەوە. ناسرەددین‌شا بە ئەمیرحسەین‌خـانی گـوت: بـێ بـۆ تـاران، و چون سەرۆکی خوراسان[٥٣] بوو بە یاریدەری خان باباخان ئەویشی بۆ پێتـەخت بانـگ کـرد. ناسـرەددین‌شـا بـە پـێ ئاشـنایەتیێک کـە لـە ئەمیرحـسەین‌خـان بـووی و ەمیرحسەین خان لە شەڕەکانی هەرات و خوارەزم و بوخارا و باکووری خوراسان لـە ەڕ بەرگری لە سەربەخۆیی ئێـران خـۆی نیـشان دابـوو. پاشـا دەیـزانی خانـەکانی نۆڕشگێڕی کورد لە کەسێ وەکوو خـان باباخـان ناترسـن و بەسـەرهاتی خوراسـان ـراپ دەبـێ و ئاسایـشی ئـەم هەرێمـە خراپتـر دەبـێ، بـەم بۆنـەوە خـەڵاتی ەمیرحسەین‌خانی کرد و هاوکات کردیشی به سەرۆک و ئیلخانی ئیلی زەعفەرانلوو ئەویش بە گـەورەییێکی زۆر و تایبەتـەوە هاتـەوە بـۆ قووچـان و بـە خـان باباخـان ەرفەتی حکوومەتی دا و لە شانسی پیسی خـان باباخـان، نزامووددەولـە لـە تـاران‌دا ۆچی دوایی کرد. خان باباخان بە ناچاری بە شـیوەن و گریـان نامـەیێکی بـۆ پاشـا

---

٥٢- ئێرانی دوێنی. یادداشتەکانی ئەرفەعودەوله.

٥٣- ڕێنموونی کتێب، گۆڤار- خولی ١٥ ل ٤٨٧.

نووسی. ئاغەی حسەین مەحبووبی ئەردەکانی وتارێکی ئاوەهای نووسیبوو، ئەم وتار
لە پێش دەستی خوێنەرانی بەڕێزدا دادەنرێ و لە کۆگای بەڵگەکانی جەنابی
حسەینعەلی غەففاری جێگری حکوومەتەوە و لە سەردەمی وەزارەتی حکوومەتی
باوە گەورەی ئەوان یانێ فەڕوخخان ئەمیروددەولەی کاشانیەوە[٥٤] لەوێدا ئاماژەی بە
یەکێ لە سەرەکیترین بنەماڵەکانی ئێران یانێ بنەماڵەی ئێلخانەکانی زەعفەرانلووی
قووچان کردووە کە جێگای سەرنجە. سام خان ئێلخانی کوڕی ڕەزاقولیخان
کوڕەزای ئەمیرخان کورد زەعفەرانلوو لە ئەمیرە بە ناوبانگەکانی ئێلی زەعفەرانلوو کە
لە کاتی خۆی لەو هەرێمەدا زۆر بەڕێز بووە و بە لای سەرۆکە ئەفغانەکانەوە
خۆشەویست بوو لە سەردەمی حکوومەتی سەرەتایی حێسامو سەڵتەنە لە خوراسان
لە بارەی ئەو دەوڵەتەیەوە خزمەتگوزاری زۆری بە جێ هێنا و چۆن کۆچی دوایی
کرد براکەی ئەمیرحسەین خان بوو بە جێگری، ئەویش لە گەورەیی براکەی
بێدەسەڵاتی و لاواز بوونی ڕۆژ لە دوای ڕۆژی دەوڵەت زۆرتر کەڵکی وەردەگرت
بە هێزێکی تەواوەوە لە قووچاندا حکوومەتی دامەزراند و لە ئەمیرانی گەورەی
خوراسان و ئەمیرانی گەورەی ئێران بوو و لەگەڵ بنەماڵەی براکەیدا کردارێکی
باشی نەبوو. ئەم وتارە پێشاندەری کاری ئەمیرحسەینخان شوجاعوددەولەی
لەبارەی برازاگەکەی ڕەزا قولیخانەوە، ئەم ڕەزاقولیخانە بە هۆی ئەوەی هاوناوی
باوە گەورەی بووە، پێیان دەگوت خان باباخان کە وەکوو فەتحعەلیشا بەر لەوەی
کە بگاتە حکوومەت باباخانیان پێ دەگوت، بە ناو باوا گەورەی فەتحعەلی خان
قاجار.

نامە هەر چەندمۆر و مێژووی لێ نییە، بەڵام خاڵی وای هەیە ساڵەکانی
نێوان١٢٨١ تا ١٢٨٥ کۆچی پیشان دەدا. بە ڕاقەی کە لە ناساندەکانا دەگوترێ.

**ئەم دەقە:** قوربان، خاکپای خشڵی پیرۆزت بم. ئەلحەمدولیلا دادخوازی
کۆیلەکانی گەورەم قەدری دەسەلات کەمترین ماڵزای ڕەزا قولیخان جێنشینی
خوالێخۆش بوو شوجاعودەولەی (جێ پەناو خاونی ڕزق و ڕۆزی/ کە گیانمان بە

---

[٥٤]- فەڕوخ خان ئەمیندەوڵە ئەو کەسیە کە بڕیاری ١٢٧٣ پاریس لە بارەی جیا بوونەوەی هەرات لە ئێران بە نوێنەری دەوڵەتی قاجار گوتی درووستە.

قوربانی بێ) تا ڕادەییێکە کە ئەگەر من ئەویش ئازار بدەم لـە ڕووخۆشـی و گـەورەیی پاشای تکای هەڵبڕین و بەرگری ئەوەی نەکردووە و لە ئەوانە هاتوونـە ژێـر فـەرمانی خوسرەوانە تکایە سەرکوتیان نەکات. ، باوکم وخوالێخوەش بـوو شـوجاعودەولـە لـە خزمەت حکوومەت گیانیان دا، دوای ئەوەی تەمەنم ئەو کات هەشت سـاڵان بـووم و باپیرێکی پیرم بوو کە سەرپەرستم بوو. شتێک پێش هات کە من و باپیر لەگەڵ دوو سەر ئەسپ لە قووچانەوە بۆ مەشهەد هاتین و نزیک بە سێسەد هەزار تمەن و ئەسپ و وشتر و قاتر و شمشێر و تفەنگ و سێسەد جووت ئاقـاری فرۆشـی و زەوی و مـاڵ (هی باوکم بوو) هەموویمان لـە قووچـان دانـا... هـاتین بـۆ مەشـهەد.زۆر سـەخت دەگوزەرا. باپیری پیرم ئەم ساڵ کۆچی دوایی کرد. بەم تەمەنی کورتە چیم بەسەرا هات.! و لە ئەم کاتە دینـارێ لـە کەلـەپووری بـاوکم کـە هـەمووی بـە لای ئـەمیر حسەین خان مامۆیـەوە بـوو نەیـداوە. دوای مـەرگی بـاوا گـەورەی پـیرم، جـەنابی غیرەدولمولک و شـەهابولمولک ئـەمیرتوومان، جـەناب موجتەهێدولعەسری شـێخ عەبدولڕەحیم بڕێک لەو ماڵەیان بۆ هێنامـەوە. ئێـستا دەبیـنین ئەگـەر بەخـشین و گەورەیی پاشا نەبێ بە سانایی نێوی بنەماڵـەی شـوجاعودەولـە لـە بـەین دەچـێ. هیوادار و تکاکاری لە درگای خودای پەنا دەهەندەی خوسرەوانە ئەو جۆرەیە کە:

١- ئەمنیان بە نۆکەری منداڵی نەواب موسـتەتاب فەلـەک ئەشـرەف گـەورە و سەربەرزی شازادەی ئەعزەم دەرهانی کە کەسێک زاتی ئازارمی نەبێت

٢- فەرمان و دەستوور بدات کەس تەماع لە ماڵی من نەکات

ئاغەی ڕادەکانی مێژووی ئەم نامەی نێوانی ساڵەکانی ١٢٨١ تا ١٢٨٥ نووسـیوە. اوڕی نووسەر بە وەیە کە مێژووی نامە ئەبێ پێش لە ساڵی ١٢٨١بێ . چۆن کـۆچی خوالێخوەش بوو سامخان کە ئەبێ ماوەی ساڵ ١٢٧٤ یا ١٢٧٥ بێ. ڕەزاقولیخان لـە ئەم بارە وە گوتوویە : کاتێ باوکم کۆچی دوایی کرد، هەشت ساڵە بـووم یانـێ ئـەبێ ساڵی ١٢٦٧ یا ١٢٦٦بێ. بابەتێ ئەبینم لـە سـاڵ ١٢٨٤ کـە ناسـرەدینشـا دێ بـوو قووچان و ئەم ڕەزاقولیخانە بە هاوڕێیی ئەبولحەسەنخان کوڕی ئەمیرحسەین خان هەر کام زاری یەک ئەسبی پێشکەشی ئەمیر حسەینخانیان گرتبوو و بـۆ خزمـەتی ناسرەدینشای دێنن کە حەکیمولمولک لە سەفەرنامەی خـۆی دەنووسـێ « چـۆن یەغاوی ئەسپگەل یەکێ لە دەستی ئەبولحەسەن خان و یەکێتر بە دەسـتی خـان

بابا خان کوڕی خوالێخوەش بوو سام‌خان ئیلخانی بوو و کاتی پێشکەش کردن ئەسبی خان بابا خان کە منداڵێکی دوازدە ساڵە بوو و لەغاوی ئەوی بە دەستەوە بوو پەلاماری برد و ئەوی خستە زەوی، بەڵام لە ئازاری بە ئەو نەگەیاند و ئەم منداڵە بچووکە کە نەترس و زاتی لە باوکی خۆی بە دیاری بردووە، ئێستاش لەغاوی ئەسبەکەی لە دەست بەر نەداوە و لە هیچ شتێک ناترسێ.پاشاش خەڵاتی کرد بەچەقۆیێکی زێڕ.[٥٥]

حەکیمولمولک لێرەدا دەڵێ خان بابا خان لە ساڵی ١٢٨٤دا منداڵێکی دوازدە ساڵە و بچووک بووە بەم بۆنەوە ئەبێ ناوبراو لە ساڵی ١٢٧٢ یانێ ساڵی ئابڵۆقەدانی هەرات بە دەستی سام خان و ساڵێ بەر لە گرتنی ئەو شارە بووە. ئەوان کاتێ توانیوویانە لە کاتی مردنی باوکی‌دا هەشت ساڵە بوو بێ. سام خان لە ساڵی ١٢٨٠ کۆچی دوایی کردووە. لە حاڵێک‌دا هەروەها کە لە ڕاڤە نووسینی سام خانا گوتمان لە ساڵی ١٢٧٥ وا سەمیان داوە پێ، هەروەها لە کاتی هاتنی پاشا بۆ قووچان، خان‌باباخان لە دوور خراوەی مەشهەددا هاتبووەوە بۆ قووچان و ئەم کارە بە بۆنەی خوێندنەوەی سکاڵای ئەو و سفارشتی بە ئەمیرحسەین‌خان بووە ئەگەر نە خان بابا خان نەیدەتوانی بێتەوە بۆ قوچان. بە بێ‌شک خوایشتی سەرۆکی خوراسان و شێخ موحەممەدڕەحیم و کەسانی دیکە بە لای ئەمیرحوسەین میرخانەوە گرنگێکی وەهای نەبووە وە ئەبوایە کارەساتەکە لە خوراسان‌دا تەواو بوایە و نەئەبووە ئەوەی کە سکاڵا بەرێن بۆ پاشا. ناو براوان ئاوەها ڕەزا قولی خانیان بە ئاوا سکاڵاییێک هەڵخڕاند لە دوای ئەوەی کە ئەمیرحسەین‌خان بە خوایشتی ئەوان گوێ نەداوە . ئەڵبەت میر حسەین خان خۆی بە ناو مافداری هەموو خەزێنە و ملک و ئاقار و کە لە براکەیەوە –سام‌خان ئیلخانی– بە جێ مابوو زانیوە کە لە باوا گەورەکانیەوە بە جێ ماوە و هەروەها کە هەموو دەزگای حکوومەت بە هەموو شتەکانیەوە بە ناسرەدین‌شا گەیشتووە کەسانی دیکە نەیانتوانی لەوە کەڵک وەرگرن. ئەڵبەت وەکوو ڕەسم و عادەتی سەرۆکی حکوومەت، براکان مافێکیان نەبووە. تەنیا لە بڕێ شت‌دا برا یا

[٥٥]- ڕۆژنامەی حەکیم‌مولمولک یان گەشت‌نامەی ناسرەدین شا بۆ خوراسان [ساڵ ١٢٨٤ ق چاپی سەنگی ل ٣٣٠] لە کتێبی کتێبخانەی ئەمیر حسەین خان کە خوالێخوەش بوو ئاغەی غولامحسەین ڕەحیمیان بە دیاری بە منی دا.

خوشک جێنشینی برادەر بوو هەروەها کە لە ئاخرەکانی ساسانیان‌دا دەیبینین هەروەها میرحسەین‌خان ملک و ئاقاری قارەمان‌خان کوڕی مامۆی خۆی دوای مردنی ئەو بە دەستی هێنا و کردی بە تایبەتمەندی خۆی و بە سکاڵای خوشکی قارەمان‌خان بە حساموسەڵتەنەی سەرۆکی خوراسان هیچ سەرنجی نەدا. قارەمان‌ئاوای ئیسفەراین ملکی ئەم قارەمان‌خانە بوو و میرحسەین‌خان وەری گرت و دوایی دای بە ئاستانی قودسی ڕەزەوی کە لە باشترین زەوینەکانی کشتوکاڵی ئیسفراین بوو کە لە بارەی ناکۆکیەکانی خان بابا خان و میر حسەین خان خواڵێخوەش بوو سەرۆکی دیوانی ئەفشار هاوردوە کە حسەین‌خان نزامودەوڵە ناسراو بە شاسەوەن سەرۆکی خوراسان، خان‌بابەموزەفەروسەڵتەنە ئامۆزای سام خانی کردە حاکمی قووچان، لە حاڵێکدا منداڵێکی بچووک بوو. بەڵام میرحسەین‌خان کە بۆ تاران خوازرا بوو و شانزام دەوڵەیشی خواستبوو. نزامودەوڵە لە تارانا دەمرێ و میرحسەین‌خان دەگەڕێتەوە قووچان و موزەفەروسەڵتەنە لە حکوومەت دەردەکا. شۆڕشەکانی خان‌باباخان بۆ بە دەس هاوردنی سەرۆکایەتی لە دوای مەرگی میرحسەین‌خان درێژەی هەبوو و بڕێ لاینگری ئەو و بڕێ لایەنگری موحەممەدناسرخان کوڕی میرحسەین خان بوون. کە لە ڕاپۆرتی میرزا عەسکەری موجتەهێد هاتووە و دیسان ناسرەدین‌شا بە موحەممەدناسرخان یاری دەدا و دەسەڵاتی ئیلخانی زەعفەرانلوو دوای سەرەخۆشی بە بۆنەی کۆچی باوکی بەو دراوە و هاوکات بوو بە بەرپرسی سنووری نێوان ئێران وڕووس

دەقی سەرەخۆشی ڕاسپاردەی ناسرەدین‌شا بە موحەممەدناسرخان وەهایە: ئەگەر شوجاعودەوڵەی پیر کۆچی دوایی کرد شوجاعودەوڵەی لاومان هەیە و دامان‌سپاردووە لەگەڵ موحەممەدسادق‌خان ئەمین‌نزام بڕوا بۆ فیرووزە وگوندی ناوبراو خالی کا و بیدا بە ڕووس.[٥٦]

---

[٥٦]- ئوترۆکنامە ل ٨٠ بە گوتەی یادداشتەکانی سەرۆکی دیوان.

## ئاکاری میر حسەین خان لە بارەی زانایانەوە:

میرحسەین خان پیاوێکی ڕۆشنبیر بوو. زانایان و پسپۆرانێ کە دەیانتوانی شتێ خێر بکەن زۆر خۆشی دەویستن و لەوان ڕێزی دەگرت. ئاکاری لە بارەی حاج سەیاح مەحەلاتی ئەو مامۆستا ئایینی و شۆڕشگێڕ و پەرەسەن ئێدیعای ئەم ڕاستەقینەیە کە پیاوێ وەکوو میر لە بەرابەر ئەودا خۆی بە بچووک دەزانی و لەو تکا دەکا کە چەند ڕۆژێ لە قووچاندا بمێنێتەوە تاکوو لە زانستنی ئەو کەڵک وەرگرێ هەروەها بوونی چەند نەفەر وەرگێڕ رووسی و فەرەنگی مامۆستای هەندەران لە دەزگای ئەمیردا ئەم ڕاستەقینە دەرازێنێتەوە هەروەها کاتێ لە تاران دادەبینین لە گەڵ یەک پزشک باش خوراسانی بە ناوی میرزا غولام عەلی شاملوو سەرۆکی پزشکان لەگەڵدا دەبێ لەگەڵ خۆیدا بۆ قووچان دەیبات تاکوو لە خزمەتی هاوولایەتیەکانی خۆیدا بێ وە سەرۆکی پزشکان لە چاکترین پزشکانی ئەو زەمانە بوو لە زەمانی میردا هەر کام لە گوندەکانی قووچان یەک نەفەر مامۆستای ئایینی هەبوو کە ئەمانە لە قوتابخانەی قووچاندا بوون و خەڵکیان ڕێنموونی دەکرد بە جۆرێ کە هەموو پیاوە پیرەکانی ئێمە و پیرەژنەکان بڕێک لەوانە دەناسین، قورئان خوێن و قورئانیان لە بەر بووە چەند ساڵێکە ئەمانە کۆچی دواییان کردووە و کاتێ لە گوندەکاندا کەسێ دەمرێ کەسی دیکە نییە بۆ ئەو قورئان بخوێنێ هەموو مامۆستایان قوتابخانەکانیش قورئان نازانن، لە زەمانی میرحسەین خان مامۆستا ئایینیەکان لەگەڵ ئێلدا دەرۆیشتن بۆ گەرمیان و کوێستان و بە ئیشەکانی ئاکاری، داد، زانستی خەڵک کاری خەڵکیان دروست دەکرد. مەک گرە گوورە ئێسکاتلەندی کە لە ژوییەی ۱۸۷۵ هاتبوو بۆ قووچان، لە بارەی میر حسەین خانەوە دەڵێ: سەرزەوی قوچان زۆر دەوڵەمەند بوو و ئەگەر گەلی قووچان زۆرتر و حکوومەتی وڵات دڵسۆزتر و باشتر بوایان بێشک لەم ناوچە سوودی زۆرتریان بە حکوومەت و خەڵکی ئیران دەگەیان.

سەرۆکی قووچان شوجاعودەوڵە لە زاناترین و چاکترین سەرۆک ئێران بوو هەموو خەڵکی قووچان بە گیان و دل خۆشیان دەویست تازە لە بارەی چلۆنی

ئەندیشەی ڕاسپاردەکانی حکوومەتەوە و شێوەی حکوومەت کە چەوسانەوە و خراپ بوو نەیدەتوانی کارێکی بنەڕەتی بکات[٥٧] پێشوازی گەرم و مێوانداری چاک میر حسەین خان لە ئەبولحەسەن میرزا شیخ ڕەییس قاجار کە مامۆستایانی ئایینی شۆڕشگێڕ و ڕەخنەگر ناسرەدین شا بووە و بەم بۆنەوە کەرەسەی ئاس فودەولەی شیرازی لە مەشهەدا دوور خرابووەوە.[٥٨] بەلگەی دیکە لە بۆ نەترسی و بێباکی و ڕەندی و دلێری میرحسەین خانە کە پیاوێکی دەرکراو و تەرک کراوە وەکوو ئەوی پەنا دەدا و یاری دەدا، ئەم کارە کەسێکتر ناتوانێ بیکات، جگە لە میرحسەین‌خان نەبێت بەم بۆنەوە شیخ ڕەییس لە قەسیدەیێکی درێژدا سکالا و سپاس یانێ سکالا لە ئاس‌فودەولە سەرۆکی خۆراسان و کەم خۆشەویستی ناسرەدین شاوە پەزێراییکی گەرم و مێوانداری و خۆشەویستی میر حسەین خان لە میر سپاس دەکات کە بۆ نموونە بڕێ لەوانە دەخۆینیتەوە لەم شێعرەدا شاعێر، خودی کارەساتەکە دەلێت و دوایی دلامی دەداتەوە.

پیاوی زانا ئەرکی چیە؟ بێبەش
ئەهلی هونەر بەشیان چیە؟ زیان
زانایی چ پاشەکەوتێکی هەیە؟ دلی ناخۆش
گەورەیی چ کەلکێکی هەیە؟ دلێکی پەریشان
لە هەست و ئەندێشەوە چی هەیە؟ خەم

---

[٥٧]- جۆغرافیای مێژوویی خوراسان- تاهیری ل ٩١.

[٥٨]- میرزا عەبدولوەهاب خان شیرازی کە سەرەتا ناز ناوی نەسیرودەولە بوو لە سالی ١٣٠١ ک لە بارگای ناسرەدین‌شا بە ناز ناوی ئاسەفوددەولەی پێی دراو. و بە حکوومەتی خوراسان وسیستان گەیشتووە و بە پشتیوانی پوولی میرزا شەفیع موستەشارولمولک هاتەوە بۆ مەشهەد و ڕاسپاردەی ئەویش دوو سالَ و کەمێ درێژەی بوو و لە دوای هاتنی سالی ١٣٠٣ بە بۆنەی ئازارێک کە بە ئەبولقاسم خان قەرایی گەیشت کوڕی موحەممەد خان بە ئامانجی داگیر کردنی ئاقارومولکی ئەو ئاسایی بوو و ئەوی لە بەستی حەرەمدا خستە دەرەوە. خەلکی خوراسان بۆ ئەو هەلفڕیان و بە ئەویان گوت شێت و بڕێ باوڕیانە خودی ئەو هەروەها ترسی سیاسەت‌دا، خۆی‌دا لە شێتی. ئاکاری ئەو بۆ شێخ رەییس قاجار لە ئەم سالەی ١٣٠٣ هەروەها کە ئەو ناچار بوو بۆ قووچان بڕوا و دەرچێ و بە شوجاعودەولە پەنا ببات هەموویان لە شتگەلێ بوون کە شا فەرمانی دەرکردنی ئەوی‌دا بوو ئەو دوای یەک سالَ بە نەخۆشینی سەکتە کۆچی دوایی کرد.

بۆ گۆڤاری یادگار، سالَ پێنجم، ژمارەی ٧ و ٨ ل ٢٧ و ٣٨ ڕاڤەی ئاس‌فودەولە بڕوانن.

میوەی درەختی گەورەیی چیە؟ کەموکۆڕی
پیاوی هوشیار کییە؟ تۆمەتبار
پیاوی چاک کیە؟ بوختیانکەر
خەڵکی خوراسان چۆن سپاسی پاشایان نەکرد
سەخت لەویان کێشا تۆڵەی پێنەزانی
فەرمانداری ئێمە یەک فریشتە بوو، بە جێگای ئەو[٥٩]
درنجێ هات لە جێگای تەختی سلێمان
ئاسفی نیاز پیس بوو خانی درۆیین
کەسێ ناتوانێ بڵێ جگە لە مرۆڤی پەست و
شێتێک هات و پچڕاندی ئاڵقە
دێوێ هات هەڵات بوو لە بەندیخانە
ویستی کە لە گەڵم لەنج بکات
توندی قولاپی خۆی و تیژی ددان
تاقەکێ لە مندانەماوە
دای لە سەرم کۆچ و دووری
باکەوەکەری شانس و شکۆمە
تاکوو بە جێگای ئاسایشی سەرۆکان بگەم
جێگەی میران، ئەوانەی کە شێر دەکوژن
جێ پەنای دراوسێ، دەوڵەتی دلێریی ئێران
پیاوێکی پیاوانە کە لە زەماندا قارەمان بوو
خۆشەویستی گەورە، ئیلخانی خوراسان
لە ڕێگای پاراستنی شارا شەڕی هەڵبژاردووە
لە بۆ پارێزگاری ئایینی پیرۆزی زۆری بە دەست هێناوە
لە ڕۆژی شەڕدا وەکوو پاڵەوان لە گۆڕەپاندا

---

٥٩- فەرمانداری رابردوو، مێرزا موحەممەد تەقی خان ڕۆکنەدەولە بۆ ناسرەدین شا بوو کە لە مانگی شەعبانی ١٣٠١ لایبردو ئاسەفودەولە پارەیێکی زۆرتر ئەدا و بە حکوومەتی خوراسان و سیستان دەگا. مێژووی پیاوانی ئێران- مەهدی بامداد، ج ٣ ل ٣١٤.

لە ڕۆژی بەخشین‌دا، ڕاست و درووست وەکوو هەوری بەهار وایە
نێوی لە جێهان‌دا پەخشە و بووەتەوە و لە ئاڵمان [٦٠]
و رووسەوە دەنگی گەیشتووە
پەنای منی‌دا خودای گەورە پەنای با
یاری منی‌دا خوا نگاداری بێ
دڵی لە خەم و پەژارە ئازاد بێ
هەر وەکوو من کە کۆیلەیی کاری چاکم [٦١]
لە سایەی مێهرەبانی و خۆشەویستی ئەودا
زستانی ساردیشمان گەرم بوو
کارەبای یەمانی وەکوو تێخی حاکم زۆر بە تیشک و جوان
هەوری بەهاری وەکوو دەستی بەخششی حاکم وایە
گوڵی سۆمبۆڵ بە باشی بۆ کە
وەکوو خەڵکی مەست، ئەگەرچی خوازەری ئەوەیە

٦٠- شۆرەتی ئەمیرحسەین‌خان ئیلخانی لە رووس و ئالمان گوزەرا بوو.
٦١- کاتێ کە شێخ رەییس لە مەشهەد بە ویستی قووچان و عەشق ئاوا ڕای کرد، ئە م دوو ماڵە (تاقە شیعرە)ی کەرەسەی نایەبوسەڵتەنە کوڕی ناسرەدین شا بۆ شای هەنارد:
نایەبوسەڵتەنە لە گوتنی بە شاهی پاک سرووشت
کە یەکێ لە خەڵکی خوراسان ئەم نالەی بۆ من نووسیبوو
ئاسفومولکی خوراسان پیرۆزی تۆ بێ
ئێمە ڕێگای عەشق و خوشە ویستی‌مان گرت، چ مزگەوت و چ
و ناسرەدین شا لە جواوا نووسی:
شا جواوی خوێ بە تۆ بەم جۆرە لەم نامە نووسیوە
ئاسف ئەگەر زۆڵم بکات، زوو تۆڵە دەبینێ
هەر کەسێک ئەو سپاس، ئاکام کاری کە کێشا
شێخ رەییس لە کۆچی دووهەمی خۆی بە عێشق ئاوا وتوویە:
پەککۆی (سەیری) مەداری خراپم ئە گەر بە عێشق ئاوا
کەسێ نەیدیوە کە بێت، دڵی لە عێشق ئاوا
بە ر جەوەندی کار پەیجۆری مەکە لە منی خراپ کە دووبارە
ڕێگای عەشق‌مان گرت، هەرچێ پێش هات گرنگ نییە
هەڵبژاردنی گران- ل ٩٧.

ئەم پەژارەیە بەڵگەیک بوو کە ئەو هەروەها
ئەو وەکوو کۆیلەی گێژ ماندوبوو
نیوەی چاژان دووره، سەور و تاقەت فەرسا
من لە دەستی سەرۆک و ئەو لە هە وری بەهار
بەردی سەفێکی شکاند نە نانەت دڵی من
دەستی بەخشین لە مێهرەبانی (خۆشەویستی) ئەو قەرە بوو کرد
لە خێزانی ئەو قەت یاد (بیرێ) ناکا
هەر کەسێ میوانی ئەو بووە
لە ڕواڵەتی شاد و دەستی بەخشش و دڵی لێ بوردوو
ناتوانین جێهان پەیدا بکەین
لەسەری ئەودا تەنیا گوێدانی سەرۆکە
لە دڵی ئەودا تەنیا فەرمانبەری سوڵتانە[٦٢]
لە ترسی شمشێری ئەو دوژمن ڕادەکا
وەکوو خووک لە ترسی شێردا ڕادەکا..
فێڵ قەوی دەترسێ کە دەڕوا بۆ
گۆڕەپان وەکوو تووڕە
سێبەری گەورەیی ئەو گەیشتووەتە جێهان
پایە و پلەی گەورەی ئەو گەیشتووەتە ئەستێرەی کەیوان
سەری سەوزو ڕواڵەتی سوور بێ لە خۆشیدا
تاکوو گوڵی لالە و ڕەیحان لە بەهاردا دەڕوێ
دەر درگاوانەکانی لە ئە نجومەندا ڕاوەستاون
وەکوو نۆکەران لە بۆ باخی بەهەشت
هەموو مانگەکان وەکوو رەمەزان پیرۆز بێت
تا ئەو کاتەی رەمەزان لە دوای شەعباندا دێ[٦٣]

---

[٦٢]- ئاماژە بە ئەو هەوالانەیە کە دووژمنەکانی ئەمیر داویانە بە ناسرەدین شا کە ئەمیر ئەیەوێ شۆڕش لە بەرابەری پادشایەتی قاجارەوە بکا و شێخی سەرۆک ئەوە بە درۆ دەر دەخاتەوە.
[٦٣]- شێعری ئاخر ئاماژە بە رەمەزان خان وەزیر شوجاعدەولە.

له کاتی گەبارۆی قووچان شوجاعودەوله گوتوویانە: بە ئێوە ئەڵێن، بە هاتنی ئێوە (گەورە) بەهار هاتووە، پای سۆمبوڵ و سەدای بولبۆڵ ناتوانین ببەسین کە نەڕۆحن و نەگوتن. منی بچووک (هەژار) ئەگەر و حاڵەتی نابوودا بوایام، گەورەیی خوای گەورە بە یاری و دەستگیری جەنابت ژیانی بە من دەبەخشی و جێگای گەورە ی دوێنێ شەو له خۆشی ئەنجوومەنی گە ورە شێعرێکم بۆ هات نزیکی شادی له خۆنی ئێوەدا تەواو کرا. هیوای ئەوەی بە چاوی دلۆڤان و خۆشیەوە تواشای کەی.[٦٤] وا دیارە شێعری ئاماژە پێ کراوی شێخی سەرۆک هەر ئەمەیە کە پێشکەش بە شوجاعودەولە کراوە و ئەوانەی کە ئاماژە پێ کراوە. مامۆستاکان و زانایانی شاری مەشهەد، کە لەوێدا ئاماژە بە قووچان و لێبواردنی ئەمیر و شەرابی پیاوانەی لەوێدا بوو:

بەو بۆنەوە له پیچ و خەمی زولفی تو وەکوو شانە واین کە لەوێدا مـن و دڵ و ماڵ ماینەوە.

بە بیر و باوڕ و بڕوای دەرونم دەتوانم دنیا بگرم هەروەها کە شەم ئەتوانێ پەروانە دیلی خۆی بکات.

ڕۆژگار منی خستە سووچی خەبووشان من بە پارە کەوتمە گۆشەی وێرانە.
ئەی مسڵمانەکان له مێحرابا ئارام بگرن کە ئێمە ڕێگەی مەیخانە دەگرین.
ئێمە جلی ڕیامان نەپۆشیوە و لە دەس دلبەر، دەفر و پیاڵە دەگرین.
هە ر ڕێگەیک کە بیستمان هەر قسەیک کە وێژەر وتی چێروکێکە.
من لەگەڵ مەی پەرەستانە عەهدێکی کۆنم بۆ ئەو کاتە کە پەیمان نوێ بوو هەموو پیاڵەمان بە دەس گرت.

زین پس من و آن خوشەي انگور و سـر خـم
صد شکر دل از سبحەي صد دانە گـرفتیم

له وڵاتی سلێمانی خێرەد[٦٥] له ئاسەفی دێوانە باجمان وەرگرت.

---

[٦٤]– مۆنتەخەب و نەفیس ل ٨٦.

[٦٥]– لەوەی کە شێخ ڕەییس وڵاتی قووچانی بە وڵاتی سلێمانی خێرە ناو بردووە مەبەست له سلێمانی

بابم پێم ئەڵێت: لە شاری خەبووشان لە جەژنی نەورۆزدا هەمووی گەورەکان کە بۆ دیتنی هاتبوون ئەسپێ کە ناسرەدین شا بە دیاری بە ئەمیری دابوو هاوردیان. من کە تازە لاوێک بووم . لە کن بابمەوە و میرزا و حسەین مونشیباشی وێستا بووم، ئەمیر چاوی بە من کەوت پرسیارێکی لە میرزا عەلیئەکبەر کرد، کە دەتوانین بە ئەم ئەسپە ئاسک بگرین؟ و من زوو وتم نە قوربان، بە ئەم ئەسپە ناتوانین ئاسک بگرین. دەرباریان زۆر ناراحەت بوون و بیریان کردەوە کە ئەمیر بە خاتر ئەم نەزانی منە، ئازارم دەدات چون ئەوان هەستیان کرد کە مەبەست ئەمیر لە وشەی ئاسک، ئاسکی بیابانە، بەڵام مەبەستی ئەمیر لە مانای ئاسک عەیب و نەقس بوو. هەروەها لە فەرهەە نگەکان و بورهانی قاتعدا بە ئەم مانا هەیە: لەبەر پیری مێشکت عەیبدار بووە و لە دنیادا ڕۆژگارت مردووە.

ئەو کاتە کە ئەمیر سەرسوڕمانی دەرباریانی دیت بوو، فەرمووی من شتێکم وت و ئەو زانی، بەڵام ئێوە نەتان زانی. پاشان فەرمووی کە من لە ناو مۆنشیانیا بم. ئەم میرزا عەلی ئەکبەرە کە پاشان بە ناوی بەرپرس دیوان ناوبانگی دەرکرد بە زمانەکانی عەرەبی و ڕووسی و فەڕانسە قسەی دەکرد و زۆر خۆش خەت و ئەهلی زەوق بوو. شانازیان بێقازانج دەفروشت و هەڤالان دەیانکڕی؛ بەڵام ئێمە نەمان کڕی.

ابنای زمان را همه اطوار زنان بود
ما دامن مردان را مردانه گرفتیم

لە بەشێکیتردا لە بارەی ڕێزی ئەمیرولئومەرا ئەمیر حوسەین خان لە بارەی خۆی قسە ئەکات و ئەڵێت ئەمیر لە حەد و ئەنازە زۆرترە کە بتوانین بڵین لەگەڵ ئێمە باشتر لە ئەوە بە، کە لەگەڵ ئەوانە هەیت.

---

خێرەد، ئەمیر حوسەین خانە، نابێ سەرمان سوڕ بمێنێ، چونکە ئەمیر حوسەین خان زۆر وشیار و زانا و بە هێز بووە و لە تەنیشتی زانایان و وێژەرانی بە ناوبانگ زۆر دادەنیشت وەکوو کوڕی ڕەمەزان خان کە بە زمانەکانی ڕووسی و ئینگلیزی قسەی کردووە یا میرزا بابای مۆنشی یا ڕەمەزان خان کە لە زانایانی ڕۆژگار بووە. هەموویان دەڕۆنە سەر ئەوەی کە ئەمیر چون خۆی زانا و وریا بووە تێدەکۆشا کە دەرباریان و هەوالانی هەموو زانا و شارەزا بن. ئاغا مەلا ئێددین ئەفشار کوڕی عەلیئەکبەر بەرپرسی دیوان ئەفشار بە یەکێ لە مونشیەکانی شوجاعۆدەولە ئەڵێت: زانایی ئێوە زۆر بەرزە.

از نقش ريا جبهەي تزوير فروشوي
زين پس ز پي عشق بتي ماه جبين باش...

بۆ کۆڕی تایبەتی ئەمیرولئومەرا بڕۆ و لە بارەگا یا گۆشەنشین، بە هەشتی برین بە.

لە ڕوبەڕوی ئەمیر بە نەرمی قسە بکە تا نزدیک بەخت و ئێقبال بێ.
بە پلە یەکی چاک گەیشتووە کە ناتوانین بڵین کە لەگەڵ ئێمە باش‌تر بە.
چون ڕەفیق من بوو و منی پەنادا ئەی خودای گەورە یاری دەدەری بە.
ئاسەف دێوانە ئەڵێت: لە چاوی من خەبووشان وەکوو کاشانە.

لوطي شيراز كاش پيشتر آيي
تا كه به كاشان كنند مغز تو پاشان
ميشي و با قوچ سر به سر گذاري؟
ترسمت آخر شوي نطيحەي قوچان

لەم بەشە ئەڵێت ئاسەفوددولەی شیرازی والی خوراسان و جێگری ئاستانی قودس.

ئەڵێت کە خەبووشان لە چاوی منەو وەکوو کاشانە. پاشان ولامی داوە کە ئەگەر ڕاست ئەکەی بێ بۆ کاشان تا لاوەکانی زەعفەرانلوی خەبووشان مێشکت وەکوو خاک نەرم بکەن. پاش ئاسەفی وەکوو مەڕێک دەزانی کە لەگەڵ قۆچا شەڕ بکا.
لە قەسیدەیکا لە بارەی سێفەت باش و بەخشش ئەمیرحوسەین خانەوە ئەڵێت:

شوجاعوددولەی عادڵ و دەریا دڵ
كه دست جود آن با ذل قرار بحر و كان بيني

دوژمن هێز و توانای ئەمیری نەدی بوو و کاتێک کە بایەخی ئەمیری بینی گرێ لە سینگی دەرچوو. لە گۆزەکەی مەی بگرە و لە دوژمنی دەس هەڵ بگرە لە

بارەگای نیشتەجێ بە ئەگر، بەهەشت یا خۆشیت دەوێ.[٦٦]

ڕۆژهەڵات ناسان و زانایان کە لە سەردەمی ئەمیردا لە قووچان دیداریان کرد، ئەمیر حوسەین خان والی بە هێز و دلێر و بەڕێز و زانا ناسراوە. بەڵام لە ڕۆژگاری ئەوا وێرانەکانی کە لە زەمانی باوکیا ڕەزا قولی خان بۆ شەڕ لەگەڵ نایبوسەڵتەنا چوو. بوومەلەرزەی قووچان، فرسەتی بە ئەمیر نەدا کە قووچان پێشکەوتنی هەبێ. بە هەر حاڵ، قووچان لە زەمانیا هێمن‌ترین ناوچەی ئێران بوو. هەڵبەستی ژێرەو لە شەیخ ڕەیسە.

هەڵبەستی کۆچ و نامەی چەند، نوسراوی ڕەزامەندی، لە شوجاعوددولە و کوڕی ئەبولحەسەن خان.

لە سروشتی ئاسەفی دێوانە ئاوێنەی بیر و باورم ژنگاو بوو.

شنەبا بە سلێمانی زەمانی ناسرەدین شا بلێ، لە حوکوومەتی تۆ دین پایدارە.

لە دوای چەند بەیتەوە لە بارەی ئاسەفوددەولە وەبە ناسرەدین شا ئەڵێت:

لەگەڵ ئەهل ئیمان و زانایان وەها ڕووبەڕوو بوو کە تەنانەت لەگەڵ کافران وا ڕووبەڕوو نەبوون.[٦٧]

ئێبنی زیاد زۆر ئازار بێ‌گوناحی وەکوو هانی و موسلێمی‌دا و لە کووچە و بازاڕا دەیانیکێشا.

شانازی و فەخرِ کارو دەرەجەی منی گرت لە حالێکا من غافڵ بووم.

من ناتوانم کە لە تووسا بمێنمەوە بۆ خەبووشان دەڕوم.

وەکوو جەعفەری تەیار کە بە خاتر شرک و کفر بۆلای‌نەجاشی فڕی.

ڕێ من لەگەڵ خەڵکی زەعفەرانلوا هەیە کە ڕۆخسار[٦٨] دوژمنی زەرد و

---

[٦٦]- مونتەخەب نەفیس- لاپەڕەی ١٣.

[٦٧]- کومەڵێ لە والیان و پوڵداران دەبەنگ و نەزان کە لە بیر پلە و پارەوە بوون خەیاڵ ئەکەن کە ئەگەر لە مامۆستایان و زانایان پلە و کار بگرن بێ‌قازانج ئەمێنن بەڵام نازانن کە مامۆستایان و زانایان کە بە دەرەجە و پارە کەلک دەگرن وەکوو ئەوەنە کە دەرەجە و پوڵ بە فووێک دێت و بە فووێک دەچێ. شەرەف هەر جێگا و پلەیێک بە کەسێک هەیە کە لەوێ دادەنیشێ و کار دەکات کە ئەڵێن، شرف‌المکان بالمکین. شێخ سەعدی ئەڵێت، هونەرمەند بە هەر ڕێگەیێکدا بڕۆن ڕێزیان دەگرن.

[٦٨]- مەبەست لە ڕەنگ ئاسەفودەولە، لە بیستن دەنگ و باسی پەناهەندەگی شێخورەیس بە شوجاعودەولە لە ترسا زەرد بوو.

زەعفەرانی دەکات.

بە دڵ لەگەڵ خەڵکی زە عفەرانلوا خۆشی ئەکەم کە زەعفەران شادی و خۆشی ئەدات.

بە ئەم خەڵکە ئەبێت پەنا ببەین چون نەتەوەیکی باشیان هەیە.

دەوڵەتی دلێر، زانای چاک، ئیلخانی، تەنیا ئەمیر خوراسان، ئەمیر ڕۆژهەڵاتە.

بە هۆی دادی ئەو خەبووشان وەکوو بەهارە کە بولبول لە خار ئازار نابینێت.

بۆ فەرمانبەرداری لە شا لە هەر کاتێکدا حازرە و بۆ هەموو کاری حازرە گیان فیدا کات.

لە خاک قووچاندا بە خاتر مێهر ئەبولحەسەن خان لە هەر جێگەیکا ڕاوەستاین بە مێوانی قەبوولمان‌یان کرد.

بەرەبەیانێک لە بیر یەساغی[٦٩] و حەقا بووم کە حەق‌پەرەستان داوای عەفوویان دەکرد.[٧٠]

کە یەک بارە کشیکچی خان و خولامەکان و سوارەکان ڕوخساریان زەرد بوو.

دژمن خەیاڵیان ئەکرد کە دەتوانن ئێمە لە خەوا بگرن؛ بەڵام بەختمان بێدار بوو خودا یار مەتیمانی‌دا.

سمي سامي من، ميزبان من
كشيد تيغ و برون جست در ميان حضار
ز قهر گرفت به مهدي كه اي خرد حال
ز جان گذشته در اين جايگه نموده گذار

مەگەر تۆ نازانی کە ئەم شێخە مێوانی منە و ئێمە لە بەرانبەر مێوانا گیان و دڵ

---

[٦٩]- یەساغی [ساقی] گوندێک لە جەعفەرئاوا لە قووچان کە ٤٣٧ کەسی هەیە.

[٧٠]- لە کاتێکدا کە ئەمیرحوسەین خان بۆ شیروان چوو شێخ ڕەییس لە دێ یەساقی نیشتەجێ بوو خەبەری بە ئاسەفودەولە گەیشت. پاشان کشیکچی باشی خۆی لە مەشهەدە و بە سواران دەوڵەتی بە یەساقی نارد کە شێخ بگرن و بۆ مەشهەدی ببەن کە بە هێرشی ئەبولحەسەن خان و سواران بلاوەیان کرد و بە زین.

ئەدەین.

ئەگەر بە تەرەف شێخ ڕەیس بڕۆی خراپ حاڵت دەگرین
کەسێ کە دەوڵەت و مللەت بە دەسیەوەیە
لەگەڵ دوژمنا دووسی ناکا مەگەر لە نەتەوەم کەسێ نەمابێ.
ئەم شەڕە وەختێ بە گوێ خەڵکی قەڵا گەیشت بچووکان و گەورەکان هەموو حازر بووین
سواران بە تێغ و تیر غاریاندا یەکێ بە دار و یەکێ بە دیواردا دەڕۆین
لە سەریان بەرد دەباری وەکوو ئەسحاب فیل زەلیل بوون.
ئەبولحەسەن خان پیاوەتی کرد و وتی گەورەکان ئەبێت ئەم کارە بکەن.
وەکوو هەتاو لە ڕۆژ هەڵات، بەختەوەر بوو دژمن لە بەخت دوور بوو.
ئەڵێت بە شوجاعوددولە کە لە شیروانەو بۆ نزیک ئەوان بێت.
لە ئەوەی کە قووچان وەکوو خانە خۆی خۆتە و ئێمە بە دڵ و گیان بە هیوای دیداری تۆیین.
بە هێمنی بۆ شاری خۆت بگەڕەوە و کە سەختی ڕۆژێ ئاسان دەبێتەوە.
کڕنۆش و کەرەمی کرد و گەردەلوولی لە دامەن دوور خست.
ئەگەرچە من شاعر نیم؛ بەڵام ئەم هەڵبەستەم هۆنیوەتەوە بۆ ڕاهێنان.
تەمەن بە سەر دەچێ و زەمان دەڕوێ و تەنیا خاسی و خراپی هەیە.
پاش چەند مانگ دانیشتن لە قووچان ئەم هەڵبەستە هونراوەتە وە:
ئەی ئەمیر هونەردۆس کە بارەگات قبلەی ئارمانەکانە.
خودا زەکاتی بەر دوو کەس واجب کرد: دارا و زانا.
ئەگەر ماڵ و زانست بەخشی هەم ماڵ و هەم زانستت زۆر دەبێ.
خودای گەورە لە ڕەحم خۆیی هەڵبژاردووە، بۆ من، زانست. بۆ تۆ، ماڵ و پارە.
لە هەر حالا من و تۆ لە ئەدای حەقا مەجبوورین. لە هەمان کاتدا دەبێ هەر دوو لامان حەق بدەین.
ئەگەر پرسیارت کەم بێت زێڕ و سیم تۆ زۆرە بە بەخشش پرسیارەکانت زۆر ئەبێت.
علیم و زانست من زۆر بووە و زمان قادر بە وتنی نیە.

لە حکمەت و کەلام و وشە وفقە و مەنتق زۆرە.
ئەگەر پرسیار نەکەی لە گەوهەر زانست و عێلم شارەزا نابیٚ.
ئەگەر واعێز یەک بارە بیٚدەنگ بێت زمان لاڵ بێت عەجیبە.
من لە دەرس و زانستا تێکەڵ بووم و لە تەرک عادەت بەلا و ڕەنج[٧١] بە دەس دێت.
ئەگەر هەست لە ڕۆژ شادیدا بە موسیقا و ئەوین پێک دێت.[٧٢]
ئەگەر لە دەرسدا خوێندەواران پرسیار بکەن، من شاد و خۆشحال ئەبم.
بە هۆی زانست و زانایی تۆ ئەستێرەی شانس ڕووت تیٚدەکا.
ڕێگەی خراپی ببەستە و درگای عەدڵ باز کە، ستەم نابوود کە، پیاڵەی مەی بگرە و دوژمنایەتی لابە.

## ئەمیر حوسەینخان لە ڕوانگەی بولجەری بریتانیاییەوە

ئەمیر حوسەین خان یا لە بەر ئەوە کە باشتر شارەزا بن شوجاعدەولە والی شاری سنووری قووچان و ناوچەکان، یەکیٚ پیاوە ناودارەکانی ئێرانە. پێوەندی لەگەڵ شا، دروس وەکوو شوالیەکانی لەگەڵ شاکانی ئەو زەمانەیە. شوجاعدەوڵە لە مەڵبەندی خۆ یا سەربەخۆیە، تەنیا هۆیەک کە والییە و شازادەی سەربەخۆی

---

[٧١]- شازادە شێخ ڕەیس کوڕی موحەممەد تەقی میرزا حێساموسەڵتەنە کوڕی فەتحعەلی شا، لە زانایان و مامۆستایان و وێژەوانی ئازادە بووە و دەرس و خوێندنی لە ژیانی ئەشرافی و شازادەیی باشتر زانی، قوتابخانەی قووچان لە ڕادەیکا، نەبوو کە شێخ ڕازی بکا. لە ئەمیر داوای کرد کە، کەرستە باشتر ساز بکات. بەلام دیسان نەیتوانی، لە کەسێک زانست فێر نەبووە و وەکوو وێژەری زانست بۆ هەموو بووە و شار بە شار گەڕاوە و لە زۆربەی شارەکانی وەکوو قووچان و بوخارا و سەمەرقەند گەڕاوە و پاشان ڕووی کردووەتە ئێستەمبووڵ و حەجاز. لە زەمانی مەرگ ئەبولحەسەنخان و ئەمیر حوسەینخان و وێرانی قووچان لە زەلزەلەی ساڵی ١٣١١ ک. لە هێندا بووە. و نەیتوانیە لە جێگەیکا نیشتەجیٚ بێت و ڕووناک بوو، بیٚ ئەوەی کە سەرچاوەی نووری بێت. شێخ ڕەیس لە ساڵی ١٢٦٤ لە تەورێزا لە دایک بوو لە ١٣٣٦ مانگی لە تارانا لە دنیا دەرچوو لە شابدولعەزیما لە تەنیشت مەقبەرەی ناسرەدین شا نێژرا، وەسیەتی کرد بوو کە لە مەشهەددا بنێژریٚ؛ بەلام ئایەتولا ئاقازادە کوڕی مەلا خوراسانی هەڕەشەی کرد کە ئەگەر تەرمی شێخ لە مەشهەددا بێت ئاگری ئەدات ناچار لەویٚ نێژرا.

[٧٢]- ئاماژە بە هۆگری ئەمیر حوسەین خان بە مۆسیقا و وێژەیە.

ئێرانی نیه ئەمەیە کە جار جار خەڵات و پارەی بۆ تاران ناردووە. لە هەمووی ناوچەکانی باکووری خوراسان قسەی وەکوو یاسایە و هەمووی والیانی شاری خوراسان قسەو کارەکانی دەکەنە سەرمەشق خۆیان. شوجاعدەوله و لە پاش مەرگ برای گەورەی [سام خانی ئیلخانی] کە ۱۸ یا ۲۰ ساڵی پێش والی قووچان بوو و فەرمانڕەوایی قووچان بە دەس ئەو بنەماڵەیەو بووە.

ئەمیر حوسەین خان لەگەڵ یەکێ لە ژنەکانی براکەی کە تورکمەن و زۆر پارەدار و خزمی نووروێردی خان بوو زەماوەنی کرد و ئەم ژنە پاشان مەحرەم و نازەنین [ئەمیر] لە ناو چوار ژنانی دیکەیا بوو، و ئیستەش زیندووە.[٧٣] نەتەوەی شوجاعدەوڵە ئێرانی بوون و بەڵام سیمای ئەو وەکوو ئەفغانیەکان بوو.[٧٤] پیاوێکی کورتەباڵا و پێنج ئینچ، لاواز، ڕەشتاڵە، و لووت درێژ و وەرزش کار و بێنەزیر لە تیرە نازیدا. هەمووی ڕۆژان لە بیابان و کوێستانا بووە. ڕاوکەری زیرەکِ و ژیانێکی پڕ زەحمەت و پیاوی کاردان وەکوو ئوروپاییەکان. پیاوێکی زانا. کەمێک فەرانسە و ئینگلیزی دەزانیێ، و تورکی دەزانی.

باش قسە ئەکات. زۆر کتێب خوێن و کتێبەکانی ئۆوێن OWEN هەیە، کە بە فارسی وەرگێڕدراوە. شوجاعدەوڵە پیاوێکی سیاسەتمەدار و لە سیاسەتا شارەزا و کارەکانی ڕووس لە ناوچەی قەراقرووم لە ژێر نەزەریا بووە.زۆر ڕقی بوو لە ڕووس ئەگەر غەدر لە ئاووخاکەکەی بکەن. ئەمیر حوسەین خان وەکوو ئوروپاییەکان دەژیا وەکو ئەوان جلی لەبەر ئەکرد. شواڵ و کوتی نیزامی دەپۆشی عادەت و ڕێ و ڕەسمی ئوروپاییەکانی بە کار دەبرد. شەراوی زۆر پێ خۆش بوو و تەنانەت یەکێ لە باش‌ترین شەراەکانی دروس ئەکرد و دەی خوارد. نیشتمانی ژێر فەرمانی لە خوراسانا باش‌ترین باخەکانی‌ترێ هەیە، ئەمیر حوسەین خان خوێ شەراوێک سپی دروس ئەکات. یەکێ لە تایبەتمەندیەکانی کە زۆر باشە سەروازێکی چاک و زۆر شوجاع و کارامەیە. وەکوو هاودەم و هەواڵێکی باش و خولق خۆش و دل‌کێش و

[٧٣]- مونتەخەب نەفیس- شێخ ڕەیس قاجار- چاپ سەنیگ تاران- لاپەڕەی ٢٥.

[٧٤]- خەلکی ئەفغانستان بنەماڵەی پارت و ئاریایەکانن کە لە شەڕ لەگەڵ ئەسکەندەر مەقدوونی لە زەمان ڕووسانی ستەم‌کار لە تایبەتیەکانی نەتەوەیان هەیە کە ژێر ستەم بێگانە نەچوون. لە سەدەی سێزدەهەم کە بە نەخشەی ئیستیعمار، ئەفغانستان لە ئێران جودا بووەتەوە.

دەس و دڵ ئاوەڵا. بەم سیفاتە، پیاوێکی کۆمەڵایەتی و ڕووشن‌بیر. تەنیا عەیبێک کە بە چاو دیێت وەختێکە کە باسی نووروێردی خان دەکات، دەتوانرێ بە پێی زۆرشت ڕوون بێتەو.

ئەمیرحوسەین خان پاش چەند ساڵ دوای مردنی براکەی لە قووچانا حکومەتی کرد. ڕووداوێکی گرینگ ڕووی نەدا. تا ١٠ ساڵ پێش شا بۆ تاران بانگی کرد. شوجاعدەوڵە فرمانەکانی شای قەبووڵ کرد و بۆ تاران چوو و شا دیل و زیندانی کرد. شا دەیویست کوڕی خۆی بکات بە والی خوراسان[٧٥] و دەترسا کە شوجاعدەوڵە گوێ بە فەرمانی شازادە نەدات، و والی شاری قووچانی دیل کرد. شازادە بۆ مەشهەد چوو و شوجاعدەوڵە زیندانی بوو. شازادە یەک مانگ حکومەتی کرد. شەوێ بەرپرسی چەکداران کە هەڤاڵی شوجاعدەولە بوو نزیک شازادە بوو و وتی کە بە زووی دەکوژرێی و سەری لە لەشی جیا دەبێت و بۆ شا دەیوەن. شوجاعدەوڵە هیچ ڕێگەیک و هیوایکی بۆ ڕزگاری لە زیندان نەبوو و تەسلیم بوو، تا هەواڵێک لە لایەن شاوە هۆی ئازادی و هاتنی بۆ قووچان بێت.

شوجاعدەوڵە گەڕاوەتەوە بۆ قووچان، بێ ئەوەی کە لەگەڵ شا دیدار بکات و سپاسی هەواڵێ کە بەرپرسی سپای بوو بکات. کاتێ شوجاعوددولە گەڕاوەو بۆ قووچان دەروازەی شاریان بۆی نەکردەوە. کوڕە گەورەکەی ئەبولحەسەن خان[٧٦] لە دووری ئەو خۆی کردە والی قووچان، ئەو کاتە کە بابی گەڕاوە و کوڕ قەبوولی کرد و هۆی یاریدەری ناڕاستە و خۆی شازادە والی خوراسان بوو. ڕێگەی باوکی بۆ شار نەدا.

شوجاعوددەوڵە لە کاتێکا نەبوو کە دەس لە حکوومەت هەڵگرێت. گەڕانەوەی خۆی بۆ قووچان و بجنورد بە خەڵک وت و یاران و هەوالانی خۆی کۆ کردەوە بۆ شۆڕش لەگەڵ کوڕەکەی چەکدارانی حازر کرد و بۆ قووچان چوو و ئەبولحەسەن خان هەلات. شوجاعوددەوڵە گەیشتە حکوومەت و بڕوای بوو کە لە دیلی شا ئازاد بێت، دیسان بە جێگای خۆی گەیشت. کوڕی بۆ تاران چوو. ئەبولحەسەن خان بە

---

٧٥- سەبارەت بە دزینی کچی نووروێردی خانە کە ژنی ئەبولحەسەن خان کوڕی ئەمیر حوسەین خان بوو.

٧٦- لە دەقەکەدا عەبدولحەسەن خان هەڵەیە.

پێچەوانەی بابی لە لایەن پاشاوە ڕێز و سپاسی ئاراستە کرا پاشاوتی‌بۆ حکوومەت قووچان ئەی گەڕێنێتەوە پاشا لە هاتنی شوجاعوددەولە بۆ قووچان ناڕاحەت بوو و بیستی کە لە قووچانا تووشی شۆڕشی خەلک بێت، ئەبولحەسەن خانی بۆ قووچان گەڕاندەوە کە یاریدەری بابی بێت و کارەکانی بۆ تاران ڕاپۆرت بدات.

شوجاعوددەولە نەیتوانی پێچەوانەی کوڕی کار بکات چون پێچەوانە وەستانی فەرمانی پاشا بوو، بەلام لە دەروونەوە تێکۆشا کە کوڕەکەی بکوژێت. ئەبولحەسەن خان بە مەبەستی بابی پەی برد و بە تورکەمەن پەنای برد. لە سنووری قووچانا چیرۆک و دەنگ و باسی دیکە هەیە. نووروێردی خان کچێکی جوانی بوو کە لە جوانیدا بە ناوبانگ بوو و بە گوێ شوجاعوددەولە گەیشت و شوجاعوددەولە تێکوشا کە بە دەسی بێنێت کە دەس بە فێلبازی بدات و کەسێ دلنیا [وەکوو بیچاغ سەردار] کە بۆ ناوی تورکمەن بۆ دەشت بڕوێت [خوارەزم] و لە کاتێ باشدا کچەکە لە دێ ئاخال [ناوچەی ئاخال ئیستا لە خاکی ڕووسیەدا هەیە] بدزێ و پاداشێ باش بگرێ. ئەو کەسە بۆ ئاخال ڕۆیشت، پاش، وەیەک ژیان لە ناوی تورکمەکاندا کاتێ کە کچ لە چادری خۆی. هاتە دەر، هێرشی بۆ برد و کچی لە پەتوودا پێچاوە و لە سەر ئەسپ کە لە پێش سازی کرد بوو سواری کرد و بۆ قووچان ڕۆیشتن، بەلام تەنیا لە بیر خەتەرێ کە لە لای تورکمەنەکانەو بوو بە خەتەرێ کە لە ڕووبەڕووی بوو فکری نەدا، بە شتێ بایەخدار کە لەگەلیا بوو لە ڕووبەڕووی کوڕی شوجاعوددەولە قەراری گرت کە دوژمنی باوکی بوو، ئەبولحەسەن خان چاوی بە ئەم کچەوە بووە و لە کابرای پرسی کە بۆ کوێ دەڕووی چیرۆکی وت و وتی کە بۆ ئەمیر حوسەین‌خان دەی با. ئەبولحەسەن خان کابرای مەجبوور بە تەسلیمی کچی کرد [دزێ کە لە دز بدزێ دزیە] و هیوای پاداشی بە کابرا دا. دز کە نەیتوانی لەگەل کوڕی شوجاعددەولە ڕووبەڕوو بێت. پارەی گرت و کچی تەسلیمی کرد. ئەبولحەسەن خان کچی ڕەییس نەتەوەی تورکمن ئاخالی بە دەس هاورد و زەماوەنی کرد و ڕووداوەکانی تورکمەنەکان و بابی بە جێ هیشت. بە ئەم زەماونەوە ئەبولحەسەن خان، هەوالان و یارانی لە ناو تورکمەناندا بە دەس هێنا و ئەوانی بەر دژی‌بابی هەلخراند و شۆڕشی کرد، بە ئەم مەبەستە کە قووچان بگرێت چەند جار لە دەوروبەر قووچاندا شەڕی کرد و هۆی پەناهەندە بوونی بابی لە قووچاندا بوو

تەنانەت بابی لە ترس کوڕەکە یا بە مزگەوت پەنای برد. شوجاعوددەولـە وەختـێ بارودۆخی خراپ دی لە نەزەر نیزامیەو لە بەرانبەر کوڕەکـەیا کز و لاواز بـوو [چـون کورد و تورکەمەن یارمەتیان ئەدا] دەسی بە فێڵی سیاسیدا کە زۆر لە کوڕەکەی بـە هێزتر بووە وت و وێژی لەگەڵ کوڕەکەیدا دەس پێ کرد و هیوای پێدا کـە پوسـت و دەرەجەی زۆر گەورەی بۆی هەڵ بژێرێ بە شەرتێ کـە کـوڕ چـەکدارەکـان بـە وڵاتی خۆیان بیگەڕێنێتەوە. پاشان ئەبولحەسەن خان بوو بە فەرمانـدەی چەکـدارانی خوراسان و بەڵام دەوامی نەبوو و دەرکریا و چەند نەخشەی سیاسی دژی ئەو دروس کریا و پاشان ڕووی کردەوە ناو تورکمەنەکان. کردار نادروسی لەگەڵ چەند تورکمەن و بە تایبەت بە دزینی کچی نووروێردی خان جێگای باشی لە ناو ئەواندا نەبوو بـەڵام مەجبوور بە پەناهەندە بـوون بـوو و شـەوێ بـێ هـەواڵ و تـرس یـەک ڕاس بـەرەو ڕەشماڵی سەرۆکی تورکمەنەکان چوو. یاسای مێوان نەوازی تورکمەنـەکان لـە ئـەو کاتا لە هە ر ئازار و ڕەنجیک بە دوور بـوو. دوا ڕۆژ ڕەیـس تایفـەکانی تورکمەنـەکان جەم بوون و داوای خوێنی، کەسێ کە کچـی ڕەیـس نەتـەوەکانی دزی بـوو کـرد. نووروێردی خان مێوانەکـەی خـۆی بـۆ کـۆڕ داوەت کـرد و سـەبارەت بـە کچەکـە پرسیاری کرد. ئەبولحەسەن خان وڵامی داوە کە بە ژنی خـۆی قـەبوولی کـردووە و دوای ئەم وڵامە ڕەیس تورکمەنەکان مێوانی خۆیان بە گەرمی گرت و ئەم زەماوەنـە گیان کوڕی شوجاعوددەولەی ڕزگار کرد. پاش ساڵی ١٨٧٨ زایینی (١٢٩٦ کـۆچی) ناوی ئەبولحەسەن خان لە لایەن دەولەتەو بۆ مرو چوو بوو.

شوجاعوددەولە دوای ئازادی لە دەس گیر و گرفت کوڕەکەی، دیسان بە گـیر و گرفتێکتر لە ئاو و خاکی خۆی ڕووبەڕوو نەبوو و قەلەمروی خۆی دووبـارە بـە دەس هێنا و کردار و ڕەفتاری، گۆڕی و خەتاکارانی زۆر جەریمە کرد. ئەڵێن زۆر کەسان لە قووچان گوێ و لووت و قامکیان بڕان و فەلاقەیانی کـردو ئـەم کارانـە ئاسـایی بـوو. کوشـتن و سـەر بـڕین ئاسـان بـوو. ئەڵـێن کـە ئەڵـلاهیارخان دەرەگـەزی[٧٧] و یارموحەممەدخان [سەهاموددەولە ئیلخانی شادلوو و بجنۆرد] لـە والیـانی قووچـان بوون، هەر چەند کە ئەوان لە کار چەکداران و گیر و گرفتەکان چارە گەریان دەکـرد

[٧٧]- ئەڵلاهیارخان والی دەرگز بوو، چون نەیتوانی ئیدارەی کات، ئەمیر حوسەین خان دەری کرد.

و ئەم کارە بەرگری هێرشی هەر ساڵەیان بە ئۆردوگـای تورکمەنـەکانی لـە بـەهاری هەر ساڵا ئەبوو. ئەم هێرشە ڕووداوی هەر ساڵە هەیە و هێرشە گرینگـەی هـر سـاڵ پاش ئاو بوونی بەفر لە کوێستانا دەسـی پـێ ئـەکرد و لـە سـەرەتای مـانگی [مـەی MAY] بەهارا دەسی پێ ئەکرد و ئەم هێرشە زۆر تاوان و کوشـت و کوشـتاری تێـدا بوو. تا ئەنازەی سێ هەزار پۆند هەیە و ماڵیاتێکە کە بە زۆر چەک لـە تورکمەنـەکان جەم ئەبێتە و مەبەستی ڕازی کردن شای ئێرانە. ئەم شۆڕش و هێرشـە لـە بەرانبـەر دزی تورکمەنەکانا ئەبێت و زۆر تورکمەن دیل و زیندانی ئەکات.

زۆر ئیرادە کراوە کە ئەم گیر و گرفتە حەل بێت بەڵام پـیرۆز نـەبوونی حاکمـان خوراسان تـا ڕادەیـەک ئـەم گـیر و گرفتیانـە زۆرتـر کـرد. چەنـد سـاڵ پـێش شـا چەکدارێکی کردە بەرپرسی ئەوەی لە نزیکەو ببینێ و لە بەرانبەر ئەم شۆڕشا بێسێت و هێرشێ بە کار ببات کە هەمووی غەنایم بە شا بگەیت. دەستکەوت بە شا گەیـشت بەڵام هێرش تەواو نەبوو. و هێرش بۆ دەرئامەدی حاکمان درێژەی بوو.

چون بە ئاکارێ دروس یارمەتی نەدا بوو چون حاکمان نە تەنیا ماڵـیاتێ کـە بـە خەزانەی، شا ئەدرا بۆ مەسرەف خۆیان نیاز بە دزی و تالان کردن هەبوو. لـە ئاکـامدا لە بارەی هێز و زۆری ڕاستەقینەی شوجاعوددەولەوە ئەڵێن. قەلەمرەوێک زۆر گـەورە و پۆڵدارە کە ناوەندی هەزاران ئەسپ و وشتری لـە خوراسـانا هەیـە. بیـست هـەزار پیاوی جەنگجۆی هەیە کە زۆربەیان زانا و چەکدارن. شار حکومەتی قووچان، زۆر بـە هێز و دیوارەکانی سەختە. ئەم شارە لە سـنووری بـاکووری خوراسـانـد هەیـە و لـە نەزەر تجارەتەوە و زۆر گرینگە. توانایی نیزامی بە هۆی حاکمـانی بجنـۆرد و دەرگـز هێز ئەگرێت.

شوجاعوددەولە ئەڵێت کە لە ئـەحوال ئێـران ناڕازیـە و هـۆگری، بـە نەتـەوەی سەڵتەنەتی نیـە. ئەڵـێت کـە نیـشتمانەکەی تـووش پەرێـشانی و دەرد بـووە و ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژ لە هێز و توانایی مەملکەت کەم ئەبێت و ئیتر مەملکـەت ئێـران هێزێـک گەورەی نیە. ئە م قسە چ دروس یا چ نادروس بێت نەزەر شوجاعوددەولەیە.

بە خاتر ئەم ئاکارە ناخۆشە و ئاکاری چەند ساڵ پێشی لە تارانـا، نـەزەرێ باشـی سەبارەت بە پاشا نیە. ئەم بیر و بـاوەڕی حاکمـە ئێرانیـە، ڕۆشـنبیری‌یـە بـەڵام لـە خۆدسەری ئەوان کەم ناکاتەوە. ئەم فکر و بـیرە بـە هـۆی تـەرەقی ڕووسـەکان لـە

تەرەف دەریای خەزەر لە باکوور و ئینگلیزەکان لە لایەن سیستان و باشوور لە ئەمیردا ساز بوو. فکریان کرد کە بە زوویی خوراسانیش بە دەس رووس و ئێنگلیز دەکەوێت. ئەگەر یەکیان نەیگرێت بە دەس هە ر دوویان ئەکەوێت [پاشان ئەم کارە هاتە ئاوارە]. بێغەرەز تماشای ئەحواڵی ئەکرد و چاوەڕێ بوو کە کامیان خوراسان ئەگرن و سەردەکەون.[٧٨]

## قووچان لە چاوی فریزر

جەیمز بیلی فریزر بازرگان ئنگلیزی لە سەرەتای هاتنی بۆ ئێران لە ساڵی ١٢٣٧ کۆچی (١٨٢١ زایینی) لە ڕێگەی هورموز و بووشێهر و شیراز و قوم و تاران خۆی بە مەشهەد گەیاند، زانیاری زۆری داوەتە دەستەوە، وەکوو ئامارێک لە شاری مەشهەد کە ٣٢ هەزار تا ٤٠ هەزار کەس خەڵکی هەیە بۆمان باش بوو. فریزر پاشان لە ڕێ تووس و ڕادکان گەراوەتەوە بۆ قووچان و لە نەورۆزی یەکەمی خاکە لێوە هاتە ناو شار. سەبارەت بە ئاو و هەوا، قووچانی باش و ئارام دی. دەنووسێ کە: «قووچان یا خەبووشان کە لە سەردەمی دوورەوە بە مەڵبەندی تێکۆشان بە ناوبانگ بووە، بە وتەی جوگرافیدانانی کۆن یەکێ لە چاکترین ناوەندەکانی کشت و کاڵ گەنم و جو و پەروەرشتی مەڕ بووە».

شاعەبباس گەورە، بە هێزترین شای سەفەوی کە هێز و دەسەڵاتداری نەتەوەکانی کورد لە ناوچەی ڕۆژئاوای ئێراندا ئەترسی، سەرەتا ئێرادەی کرد کە چل هەزار بنەماڵەی کورد لە ئەو ناوچەی بە تایبەت لە مەڵبەندەکانی سنووری ئێران و عوسمانی بە باکووری ڕۆژهەڵات ئێران کۆچ بدات. باری جوگرافیای و ئاو و هەوای باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران لەگەڵ ناوچەکانی ڕۆژئاوا جیاوازە و بە ئەم هۆیە شاعەبباس بە تواو هێزیەوە تەنیا پانزدە نەتەوەی کوردی کۆچدا. ئە م کوردانە لە چناران تا قووچان و لە قووچان تا دوورترین شوێنی گورگان لێک هەڵبران. پاشان لەگەڵ بارودۆخی ئاو و هەوای نوێ تێکەڵ بوون و بە زۆر کردن کشت و کاڵ و ئاژەڵداری ئەم ناوچەی ئێرانە یارمەتیاندا.»

---

[٧٨]- Central Asian Portraits...By: Demetrivs Charies Boulger.

لەو کاتا کە فریزر هاتە ناو شاری قووچان، بە هێزترین و گە ورەترین نەتـەوەی کورد، - زەعفەرانلوەکان- شـار و گونـدەکانیان لـە بەرانبـەر تورکمەنـە بیابانگـەردە دزەکانەوە دەپاراست.

بازرگانی ئنگلیزی، قەڵاو و کەرستەی بەرنگاری شـاری بـاش و ڕەزامەنـد زانی، دیوارێک کە لە دەورانـدەور شارەوە دە تا دوانـزە پـا ئەسـتوور بـوو و بـە ئەنـدازەکانی مەعلووم بورجگەلێک بۆ چاودێری و پشتیوانی و لە خـوار دیوارەکـەوە کونـایێکی زۆر قوولی ساز کردبوو. [ڕەزا قولی خان ئیلخانی کـوردێکی گـەورە لـە ئـەم زەمانـا کـە قووچان حکوومەتی کرد. کەسێکی نیزامی بوو و بـە باسـی ئێـستێراتژیک و نیزامـی بۆی زۆر گرینگ بوو.]

بـازاڕ قووچـان وەکـوو بەشـێ لـە شـارەکانی ئێـران مەرپۆشـی نـەبووە. هـیچ وێرانەیەکی نیە و شار بە بوونی خانووبەرهی باش و محکەم و پانزە تـا بیـست کـەس دانیشتوی هەیە. [نیوەی خەڵکی مەشهەد لە ئەو زەمانا]. لـە بـەرگی یەکـەمدا لـەم بارەوە باس کرا و لە فریزر زۆرمان نووسی.

## شەڕی قووچان لە چاوی ئێلێکساندر برنس

برنس دوو ساڵ پاش ئاسوور کاناڵی لە ساڵی ١٢٤٨ مانگی بۆ خوراسان هات. بـە قسەکانی برنس گەیشتن بە مەشهەد هاوکات سـەرەتای شـەڕێ بـۆ کـە لـە نێـوان شازادە عەبباس میرزا و ئیلخانی قووچان، ڕەزا قولی خان زەعفەرانلو بـووە. لـەو کاتـا (رەبیعول ئەوەڵ) خەسرەو میرزا کوڕی. شازادە عەبباس میرزا لە نەبوونی باوکی [کە بۆ شەڕێ قووچان چوو] ئەرکی سەرشان والی [مەشهەد] ئەکرد. پایەداری ڕەزا قولی خان زەعفەرانلۆ ئیلخانی قووچان لە بەرانبەر کەمتر لە سێزدە هـەزار کـەس سـپای شـەڕ [کـە دوو هـەنگ لـە سـالداتەکانی ڕووس بـوون] و تۆپخانـەی بـە هێـز کـە نایبوسەڵتەنە عـەبباس مـیرزا لـە ژێـر نـەزەر ئەفـسەرانی ئینگلیـزی [و سـەرهەنگ برووسـکی لەهـستانی کـە ڕاپۆرتـەکانی شـاراوە بـۆ ڕووسـیە دەنـارد] ئامـادە بـوو. نەخشەیک لە هێز و دەسەڵاتداری خانەکانی زۆردار خوراسانە کە فـەرمانی هـاتنی نایبوسەڵتەری بۆ خوراسان دەر کرد بوو. تەسلیم بوون [ڕەزا قولی] خـان زەعفـەرانلو

و ئەوەی کە قووچان کەوتە دەس عەبباس میرزا، دەنگ و باسێکی زۆر خۆش بوو کە بە وتەی برنس هەمووی خەڵک بە تایبەت بەرپرسانی حکوومەتی خۆشحاڵ کرد. بە هۆی ئەم ڕووداوە سێ ڕۆژ لە مەشهەد [بە فەرمانی خەسرەو میرزا کوڕی عەبباس میرزا] چراخانی کرا.

برنس بە دەعوەتی نایبوسەڵتەنە لە مەشهەدەوە بۆ قووچان چوو. کە شوجاعەت و شاکاری نایبوسەڵتەنەی نۆکەر و خزمەتکار ڕووس و ئینگلیز ببینێ. برنس ئەڵێت «سێ ڕۆژ بەر لە ئەوە کە لە مەشهەد چوین و گەیشتینە قووچان. ئەڵێن کە ئەم ناوچە سەردترین ناوچەی خوراسانە و ڕەنگە ئەم وتەیە دروس بێت. چوون لە کاتێکدا کە هەتاو لە ئاسۆدا دیاری‌دا لە مانگی سپتامبر (ڕەزبەر) گەرما بە ۲۹ پلەی فارێنهایت (۱/٦ ۱پلەی سانتیگراد ژێر سفر) هات بوو. چوون ئاو لە ۲۰٦ پلەی (۹٦/٦ پلەی سانتیگراد) دەکوڵی. ڕوون معلووم بوو کە ئێمە لەدوری چوار هەزار پا سەرتر لە ڕوی ئازادی دەریا قەراری گردووە. پانایی شیوی قووچان لە نێوان ۱۲ تا ۲۰ میل هەیە، و لە پای تەپەکاندا جار جار بە ناوچەی سەر سەوز و پاراو کە باش‌ترین مێوەی هەیە... هەروەها سەفەر لە چەند گوند کە لە سەر ڕێگەمان بوو ماتڵ بووین. بەڵام بە خاتر شەڕ لە گەڵ کوردەکانا هەمووی گوندەکان خاڵی کەوت.

برنس لە بارەی دیوار و بتەوی تەلای قووچان و ئەسباب شەڕ کە لە ژێر نەزەر عەبباس میرزا لە شەڕ لەگەڵ ئیلخانی زەعفەرانلوو بە کار هاتبوو، باسێک ڕێک و تەواوی نووسی. لە ژێر دیوارەکەی قەلای قووچان چەند ڕۆژ بەر لە ئەوەی کە هەشت هەزار کەس پشتیوانی کورد بە فەرمان ڕەزا قولی خان زەعفەرانلو چەکیان داناو دەروازەکانی شاریان باز کرد. بۆ هەوەڵ جار ئێلێکساندر برنس بۆ دیداری عەبباس میرزا چوو. [عەبباس میرزا یەک ساڵ دوای شەڕی قووچان لە ۱۲٤۹ مانگی و فەتحعەلی شا لە ساڵ ۱۲۵۰ مانگی لە دنیا دەرچوو.][۷۹]

[۷۹]- بەڵگەی پێش لاپەرەی ٥٦- هیوادارین لە داهاتوودا سەفەرنامەی برنس هەمووی وەرگێڕین و چاپی بکەین تا زۆربەیێک لە مێژووی تاریک ئێران ڕوون بکات و ئاگاداریێکی زۆر لە شەڕی قووچان بدات بە دەستەوە.

## نی‌پیه لە قووچانا

لە ئاکامی سەدەی سێزدەهەم کۆچی چاودێری ئوروپاییەکان، بە تایبەت ئینگلیزەکان، بە خاتر داپۆشان قازانج خۆیان لە هیندووستانەو بۆ خوراسان پاش بۆ قووچان گەڕانەوە. بەڵام ڕووسەکان لە مەڵبەندەکانی باکووری خوراسان زۆرتر چوون و مەڵبەندە خالیەکانی دانە دانە گرت. بەگرێ گیراوەکانی ئینگلیز بە شکڵ و جلی جۆراجۆر بۆ خوراسان چوون. ئەم کارە تەنیا ئاکامێک کە بۆ ئێمە بووی، ئێمەی لە بارودۆخی یەک سەد ووردەیک ساڵ پێش خوراسان ئاگادار کرد و ئەگەرنە ئێمڕو ئێمە لە ڕابردوو و مێژووی حکومەت قاجار ئاگا نەبووین.

بە وتەی ئەبولقاسم تاهێری: «نووسینی سەفەرنامەی مەگرە گورە و جیهانگەڕانی دیکەی ئینگلیزی بێ‌دەلیل نیە و نابێ لە چاو دوور بێت کە ئەنگیزەی سەفەری مەگرەگور و سەروان جی.سی.نی.پیە[٨٠] کە کەم‌تر لە یەک ساڵ پێش لە سەفەر ژنراڵ ئێسکاتلەندی خۆی بە خوراسان گەیاند کۆ کردنی ئامارێک دروس لە کۆمەڵی شارەکان و گوندەکان و ئامارێک دروس سەبارەت بە ئێستێراتژیک و نیزامی خوراسان بووە. بۆ تێگەیشتن بە هۆی ئەوە کە ڕووسەکان شار خیوە لە ١٢٧٠ ک. لە سەرەتا بۆ ماوەیێک و پاش بیست ساڵ (١٢٩٠ م بەرانبەر ١٨٧٣ زایینی) بۆ هەمیشە بە دەس هاورد لە نێوان ١٢٨١ و ١٢٨٥ تاشکەند و سەمەرقەند و بوخارایان بە دەس هێنا لە سەفەری مگرە گورە[٨١] و نی‌پیە باوڕ خەڵک ئەوە بوو کە شاری مەرو بە دەس سپای ڕووس دەکەوێ. جی.سی.نی.پیە بەرپرس بوو کە خۆی بە دوورترین ناوچەی باکووری ڕۆژهەلات خوراسان بگەینێت و هەرچێکی دی‌بوو ڕاپۆرت بدات. لە پاییز و زستانی ساڵی ١٢٩١ مانگی لە ناوچەیێکی گەورە لە ڕۆژهەلاتی ئێران لە فیرووزکیوتی [ئەفغانیستان] تا سەرەخس و دەرەگەز [و قووچان] سەفەری کرد و نووسراوەکانی خۆی بۆ هیندووستان و حکوومەت ئینگلیز دەنارد. ڕوون نیە کە چاودێری و لێکۆلێنەوەی کاپتین نی‌پیە تا چە ئەنازەیک بە ڕووداوەکانی مێژوویی

---

[٨٠] - G.C.Napier. Narrative of a Jovney througk the province of khorasan in ١٨٧٣. By col. C.M.Mac Gre gor. Lindon ١٨٧٩.

[٨١]– مەگرە گورە ڕاپورتی خۆی بە «گەشتێگ لە ئەیالەتی خوراسان» لە ساڵی ١٨٧٥ م نووسیوە.

شکڵ ئەدات، بەڵام نووسراوەکانی یارمەتی زۆری بە ناسینی سروشتی خوراسان داوە.[٨٢]

نیپیە لە سەفەری خۆی بۆ سنوورەکانی باکووری ئێران لەگەڵ خانەکانی کورد خوراسان وەکوو دیدار لەگەڵ ئەمیر حوسەین خان شوجاعوددەوڵە و ئاماژە دەکاتە سەر ئەم باسە کە لە زەمان ڕەزا قولی خان زەعفەرانلووی ئیلخانی قووچان و نەجەفعەلی شادلوو ئیلخانی بجنۆردکارێ باشی وەکوو نیشتەجێ کردن تورکمەنەکان لە ناوچەکانی خوراساندا کردووە. بە وەسیلەی ئەمیر حوسەین خان و حەیدەر قولی خان شادلوو درێژەی هەبوو و ئەم کارە لە ئاکاری ژیانی چەتەکانی تورکمەن ئەسەرێ باشی هەیە، چوون چەند کەسیان بە نیپیە وت بوویان دزی و چەتەیی کارێکی دروس نیە، پیاوە بە ناوبانگەکانی نەتەوەی تورکمەن پاشان کەمتر لە چەتەیی و دزینا بە شێوەی ڕاستەوخۆ هاوکاریان ئەکرد. هەر چەند ئەم دزین و چەتەییە تا ئاکامی زەمانی قاجار و سەرەتای زەمانی پەهلەوی درێژەی هەبوو، بەڵام بە خاتر ڕووسەکان لە ناوچەکانی تورکمەن و بە دەس گرتنێ ناوچانە تاڵان کردن کەم بوو.

نیپیە دوای مەشهەد و قووچان لە ناوچەکانی تووس و ڕادەکان و گوندەکانی ئەم ناوچە دیداری کرد، تایبەتمەندی و ئامار و لێکۆڵینەوەی جوگرافیایی باشی سەبارەت بە ئەم باسە کردووە و ئەسەر شەڕەکانی سالار و نایبولسەلتەنە لە خوراسانا لە ژیانی خەڵک و کاول کردنی گوندەکانی دیتووە.

نیپیە، چنارانی پێش لە وشکە ساڵی، جێگەیک ئاوەدان و قەرەباڵغ بوو، «گوندێک وێران بە چل تا پەنجا ماڵ و لە دەوری هەزار کەس» دی بوو. ناوچەی پووڵدار کە بە وتەی موسافرەکان، لە سەرەتای سەدەی سێزدەی کۆچی، بە دارا بوونی باخەکانی سەر سەوز، زەوی گەورەی کشت و کاڵ و دارەکانی چنار زۆر بە ناو بانگە، جێگەیک وێران بۆ ڕێچکەی خەڵکی بێدەسەڵات و هەژار و بێ‌ماڵ بوو کە ئیتر نەیان ئەتوانی بە شەش داری چناری گوندەکەوە تاڵان بوون، بە دەس

---

[٨٢]- جوگرافیای مێژووی خوراسان- تاهێری- لاپەرەی ٩٧. نیپیە ڕاپۆرتی خۆی لە بارەی جێگەی قووچان و ئەبیوێرد و کەلات و سەرخس و دەرگز لە بەرانبەر وەبەرکەوتنی ڕووسەکان لە مەیدانی ئینگلیز پیشان ئەدا.

چەکدارەکانی عەبباس میرزا ڕزگار بوون، شانازی بکەن. لەم کاتـا، نیپیـە ڕادەکـانی بە پێچەوانەی ناوچەی چناران ئاوەدانتر بینی. لە خۆدیَ گوندە کە پانسەد کەس لـە کوردەکانی زەعفەرانلوو بە ناو:

Collection of Jovrnal and Reports Received From Captain the HonG.C.Napier on Special Dvty in Persia. Landon ١٨٧٤.

ئەژیان. ئاو و مەراتع دەوروبەر ئەم ناوچە زۆر بوون. و خەڵکی ڕادەکان لە نێـوان حەوت و هەشت هەزار ماڵ بوون.

لە کاتی دوور بوون لە چناران نیپیە پاش لە ڕەد بوون لە دەشتێک لە باشووری ڕۆژئاوا بە قەڵای کۆنی ئەمیر ئاوا گەیشت. ئەم قەڵایە لە چـاوی مێعمـاری و جـۆری ماڵ جوان بوو. هەر چەن کـە ٥٢ سـاڵ لـە وێـرانی بـە دەسـتی عـەبباس مـیرزای نایبوسەڵتەنە دەگوزەرێ. نیپیە ئەڵێت کە لە شەڕی ١٢٤٨ ک. ئەم قەڵا بە شـەش حەوتە لە بەرانبەر چەکداران ئێـران و ڕووس بـەرنگاری کـرد. و لـە ئاکامـدا قـەڵای ئەمیرئاوا بە هۆی تەقینەوەی بارووت بە یارمـەتی موهەندسـەکانی ڕووس و ئینگلیـز ڕۆخا، هۆی پەرێشانی ڕەزا قولی خان زەعفەرانلوو و کرانەوەی دەروازەکانی قووچـان بوون. [تماشای بەشی ئەوەڵ کەن.]

نیپیە دوو ساڵ بەر لە بوومەلـەرزەی دڵتـەزێن بـۆ خـاکی قووچـان چـوو، بـە شارەزایی و زانایی کە لە باس دیمەنەکانا ئەڵێت دیوارە وێرانەکانی شـاری دڵتـەزێن لە چاو خوێنەر دروس ئەکات... نیمەی ماڵەکانی شار وەها وێـران بـووە کـە دروس کردنیان ئێمکانی نیە و مەگرێ گورێ بەر لە نیپیە نووسـیویە موسـافر بـە هـەر ڕوو تماشا ئەکات ئاسەواری وێرانی و کاولی بە ڕووناکی ئەبینرێ.

پاش تماشای وێرانیەکان و دیمەنەکانی دڵتەزێنی قووچان، نیپیە لـە تماشـای خەڵکی ساق و گوندەکانی ئاوا و پوڵدار کە لە سەر ڕێگـەی سـەرەخس و دەرەگـەز [کە بە هۆی بوومەلەرزە خراپ بوو] دیتوویە، زۆر خۆشـحال بـوو. لـە دەوروبـەر دێ تۆیل و ئاوایی یووسف خان کوردەکانی تایفەی کەیوانلوو مەردمێک جوان، باڵابـەرز و دڵنیاتر لە خەڵکی گوندەکانیتر و لەم بـارەو دەنووسـێ: هـەموو جلـێ دەپۆشـن و زانیم کە پیاوەکانیان کورتەباڵا؛ بەڵام قەڵەو و بە هێزن. لە ناویانا چاوی ڕەنـگ شـین و میش زۆرە. بـەڵام بـە پێچەوانـەی ئـاوەدانی و هـێمنی ناوچـە، نیپیـە ناوچـەی

دەرەگەزی کە زەوینگەلی ئاواتر و باش‌تر لە ناوچەی قووچانە، خەراپی و ویرانی کـەم و بە هۆی دزی تورکمەنەکان خاڵی لە خەڵک بوون و ئەڵێت کە ترس لە هێرشی لـە پڕ تورکمەنەکان ئەوەندە بوو کە هیچ کەس لە ناوچەی کەلات و ئەبیورد و دەرەگـەز ئامازە بـە دانـشتن و کـشت و کـاڵ ناکـا. نی‌پیـە لـە ڕێ دێ کـەپکان [نیـشتمانی جەجووخان] کە لە پای باکووری کێوی ئەڵـلاهووئەکبەر دایـە، خـۆی بـە ئـەبیورد گەیاند و ئەڵێت: ئەبیورد ئیتر وەک ڕابردوو نیە بە خاتر دزی تورکمەنەکان گرینـگ نیە و کوردەکان زەعفەرانلوو ئەو جێگەیانە بە جـێ هێـشت. نی‌پیـە مەڵـبەندی پـڕ بەرەکەت ئەبیوێرد تاریف ئەکات و ئەڵێت پڕ بەرەکەتی زەوی ئەوەندە بـوو کـە وەزن شووتیەکان ئەبیوێرد زورتر لە ٢٥ کیلۆ بوو و هەر بەزر گەنمێک سـەد دانـەی دروس ئەکرد.[٨٣]

موسافرەکانی دیکە کە لە باکووری خوراسان و قووچان دیتنیان کـرد. ئـەتوانین ئێدموندئو دانوان ناو ببەین کە لە قووچان بۆ مەشهەد و بۆ سەرەخس هـاتووە تـا کـە کار ڕووسەکان لە مەلبەنـدەکانی بـاکووری خوراسـان ڕاپـۆرت بـدات بـە دەوڵـەتی ئینگلیز. کە گوندەکان نێوان قووچان و سەرەخس ناو ئـەبات و لـە ئـەوان نەخـشە و نووسراوەی جوگرافیای و ئامـاری دەگرێـت، ئودونـوان لـە سالـی ١٢٩٨ مـانگی لـە مەشهەدەوە بۆ مەرو، دەڕوێ.

بەر لە چوون ئودونوان لە قووچان بۆ مەشهەد دەگوترا کە گۆگ تەپـە بـە دەس سەربازەکانی ڕووس کەوتووە. بەڵام ئەم وتەیە درۆ بوو. چوون لە دەوری ٩ مانگ بەر لە ٢٤ی ژانوییـە ١٨٨١ (سـێهەمی ڕەبیعولئـەوەڵ ١٢٩٩) ئـەم ناوچـە کەوتـە دەس چەکدارانی ڕووسـیە. ئـەم ڕووداوە نێـوان تورکمەنـەکانی نـاو بـردوو بـە پـشتیوانی گەورەیان خراپ بوو. لە ئاکامدا هەمووی تکەکان لە بەرانبـەر عـەلیخانۆف[٨٤] ئەفسـەر موسڵمان ڕووسی کە خەڵکی داغستان بوو، چەکی دانیـا و پـاش سـێ سـاڵ، مـەرو قانوونی ناوچەیک لە ئێمپێراتووری ڕووسیەی تەزاری بوو و نەخشەی ڕووسـەکان بـۆ بە دەس هێنان مەڵبەندەکانی باکووری ئێران کاریان کرد و پاش دوانزە سـاڵ (١٣١١

٨٣_ جوگرافیای تاریخی خوراسان- تاهێری- لاپەرەی ١٠٠.

٨٤ - Edmon do. Donovan.

مانگی هەوکات بە مردن ئەمیر حوسەین خان شوجاعوددەولە) کە کراس نوویێک[85] سەرەتای هێکیێ ئاسنی ئاسیای ناوەڕاست - ڕووس بوو.

بەلام بۆ بە بەدەس هێنانی زانیاری لە سەرچاوەکانی لێکولێنەوەی شەورەوی کەلک وەردەگرین کە ئەم جارە بۆ نووسەر پێک نایێت لە ڕاپۆرت سەبارەت بە ئاسیای ناوەراست دەورەی قاجار کە لە یەکێ لە گۆڤارەکانی تاراندا بلاو بووەتەوە و لە کتێبخانەی غولامحوسەین ڕەحیمیان بوو، سەبارەت بە عەلیخانۆف ئەلێت کە: یاوەر عەلیخانۆف کە لەگەل ژنرال کمارۆف لە سەفەر ١٣٠٠ ناسرەدین شا بۆ خوراسان لە قووچاندا بۆ بینینی ناسرەدین شا گەیشت کاتێ لەگەل یەکێ لە بەرپرسانی بەرزتر لە خۆی دەرگیر بو، بە پێی قانوون ئەرتش ڕووسیە کۆچ درا و کۆمەلی سپای ڕووس پلە و نیشانەکانی گرت و وەکوو سەربازێک ساویلکە خزمەتی کرد و بە ئەم جۆرە لە ژێر حکوومەتی ژنرال ئوسکوبلوف بۆ شەڕی خیوە چوو و لە گەمارۆی گوگ تەپپەدا پلەی پەرچەمداری بوو و دوایی بە پلەی جێگری گەیشت. عەلیخانۆف گوگو تەپپەی بە تی ئێن تی تەقاندەوە.

تزاری سەرەڕای دەنگدربڕینە توندەکانی دەولەتی ئێران، دەمی رووباری ئەترەک لە دەستیاندا بوو. ڕووسەکان بۆ بە دەست هێنانی زانیاری ورد و سەرنج ڕاکێش، هەندێ کەسی شارەزا و شۆفاری نۆیانیان بۆ باکووری خوراسان نارد تاکوو بوار خۆش کەن بۆ پێشرۆیشتن بە نێو ئێران و گەیشتن بە ئاوە گەرمەکانی کەنداوی فارس پێک بێنن. هەندێک لەم کەسانە بریتین لە: گۆلادی چۆف، سۆکۆلۆف، ئەمینۆف و عالیخانۆف بە هۆی لێکۆلینەوە سەرنجڕاکێشەکانیان و کۆکردنەوەی ئامار و زانیاری دەگمەن و ئامادە کردنی پلانە وردەکانی جوگرافیایی، لە لێکۆلینەوە گەورەکانی جوگرافیای ئاسیای ناوەندی بوون.

سەر حەلقەی ئەم مەکتەبە، ژنرال وێنۆکۆفە کە زانیاریی سیستم و جوگرافیایی لە خۆیدا هەلگرتبوو و سەبارەت بە پێشکەوتنی کەل و پەلەکانی ئیمپراتووری تزاری، یارمەتیی لە زانستی جوگرافیا وەرگرت. زانستی وێنۆکۆف سەبارەت بە ڕەچەلەک و بارودۆخی جوگرافیای باکووری ڕۆژهەلاتی خوراسان و ئاسیای

---

[85]- بڕێک لە بەسالاچوان ئەلێن لە عەلیخانوف لە کوردەکانی ئیروان ڕووسیە بووە.

ناوەندی، ئەوەندە قوول و ورد بوو کە ئەنجومەنی شایی جوگرافیای لەندەنیش ئەوی بە گەورەترین بەڵگە لەم بارەوە دەزانی.

ویستە سیاسەکان و هۆگریی تاکی وێنۆکۆف بوو بە هۆی ئەوە کە جوگرافیادان و توورِیستی رووسی بە ناوی لێسار، دیسان هەنگاو بنێتە نێو خاکی ئێران و لە سووچی باکووری ڕۆژهەڵاتی خوراسان بە وردی «پلان هەڵگرێت». و ئەم کار و بارە داگیر کەرانە لە کاتێکدا ڕووی‌دا کە دەوڵەتی گەندەڵی قاجار، لە خەوی خۆشی خۆیدا بوو بە تەواوی بێئاگا و بێلایەن بوو لە بارودۆخی وڵات و هات وچووی نامۆکان بۆ وڵاتی ئێران، و ئەم هۆکارانە بووە هۆی لە ناو چوونی وڵاتە پڕ داهاتەکان و ئەو شوێنانەی کە جەماوەری زۆریان بوو. مێژووی خوراسان و بە تایبەت مێژووی کوردەکانی خوراسان و ڕۆلی ئەوان لە سەر ناوچە، ئەو کات بە تەواوی روون دەبێتەوە کە بە دەست هێنانی بەڵگە و سەنەدە ناوبراوەکانی ئاماژە پێکراو بۆ نووسەرانی داهاتوو مسۆگر بێت.

لێسار زانستوانی رووسی دووهەمین بەرپرسایەتی خۆی بۆ خوراسانی لە بەهاری ساڵی ١٨٨٢ زایینی (١٢٩٩ مانگی) دەستپێکرد و لێکۆلینەوەکانی خۆی درێژە پێدا سەبارەت بە ڕاکێشانی هێلی شەمەندەفەر لە نێوان عیشق ئاوا و قووچان و مەشەد و هەروەها سەبارەت بە ڕاکێشانی هێلی شەمەندەفەر لە رێگای گۆگتەپەوە بۆ گەرماب و بجنۆردیشی لێکدایەوە و لە ئاکامدا بەوە گەیشت، ئەم ئەنجامەی کە هێلی شەمەندەفەری ناوبراو دەبێ لە ڕێگەی سەرەخس بۆ نێو ئێران ئەنجام بێت تا کوو خەرجی کەمتر ببێت و...[٨٦]

دوو ساڵ دوای بەرپرسایەتی لێسار، ئینگلیزیەکان کە لە پێشکەوتنی رووسەکان بەرەو هێندووستان ترسا بوون یەکێ لە ئەفسەرە پایەبەرزەکانی خۆی، بە ناوی لاسدێنی نارد بۆ خوراسان و ئەفغانستان. لامسدێن سەبارەت بە لێکدانەوەکانی خێڵە سەر سنووریەکانی ئێران و ئەفغانستان، کورد بوونی خێڵی فیرووزکۆیی داکۆکی دەکات کە هەندێ بیر و بڕوایان وایە لە کاتی تەیمووری شەل، مەترسی شۆڕشی تورکمەنەکان تکە نەبوو. کەسانی خێڵی فیرووزکۆیی کە بە ڕای هەندێ لە

---

٨٦- Krasnovodsk.

توویسته شارەزاکان، ئازاترین شەرکەرەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران ناسراون، لەو ناوچەیە کە کوێستان و گەمێنیان دەکرد کە لە باکوور بە تیربەندی تورکستان و لە باشوور بە هەریروود و سپیکێو دەگەیشتەوە. لە سەرەتای سەدەی چواردەی کۆچی مانگی فیرووزکۆیەکان (خەڵکی فیرووزکۆ) زۆرتر لە دە هەزار بنەماڵە بوون کە دوو هەزار و پێنسەد بنەماڵە لەوان لە کن هەریروود و لانیکەم دوو هەزار بنەماڵەی تریشیان لە بالامورغاب کۆ ببونەوە. بنچینەی مێژووی ئەم خێلە بۆ ئێمە دیار نییە، هەر ئەوە دەزانین کە ژێدەری سەرەکیی باوو باپیریان، کێوەکانی کوردستان بووە، و پاشان لە نێوان ئاڵوگۆڕە بەردەوامەکاندا، باوکەکانیان ناوچەی فیرۆزکۆیان بە نیشتمانی دووهەمی خۆیان زانیوە. لە ساڵی ٧٩١ کۆچیدا، شۆڕشی خوراسان بە شیمانەیەکی زۆر تەیموورە (شەل) کوردەکانی فیرۆزکۆی بۆ ناوچەکانی باکووری خوراسان گواستەوە تاکوو ئەم ئازا و شۆڕشگێرانە بکات بە لەمپەرێک لە هاست هێرشی داگیرکەرانی باکووری. لە سەردەمی تەیموورەوە تا نێوەراستی دەورانی پاشەیەتیی نادر، فیرووزکۆییەکان لە باکووری خوراساندا دەژیان. نادر بە چاکتری زانی کە دوبارە خەڵکی خێل بگەڕێنێتەوە بۆ فێرووزکۆ، بەڵام کوردەکانی فیرووزکۆ کە زیاتر لە سێ سەدە و نیوە لە دەوروبەر ماوەرائوننەهر ژیا بوون و خوویان بە کەش و هەوا گرتبوو، فیرووزکۆیان بە شوێنێکی تەنگ و ناخۆش دەزانی، هاوکات لەگەڵ ئەو شەڕ و شۆڕانەی کە بە شوێن مردنی نادر رووی‌دا، دیسان فیرووزکۆیان بە جێ هێشت و گەڕانەوە[٨٧] بۆ وڵاتی تازەیان [ناوچەی ئاماژە پێکراو]

## سەفەری ییت بۆ قووچان

ئارتوور کەمبێل ییت کارمەندی کۆمسیونی دارشتنی سنووریی ئێران و رووس لە لایان دەولە تی ئینگلیزتان بوو بە بەرپرس و ناردرا بۆ خوراسان و لە ساڵی ١٣٠٢ مانگی (١٨٨٤ و ١٨٨٥ زایینی) لە قووچانەوە تاکوو سەرەخس و هەراتی خستە ژێر چاودێرییەوە. کە هیوادار بن لە بەرگی چوارم ئاوڕ بدەینە سەر ئەوانە.

---

٨٧- جوگرافیای مێژووی خوراسان بە ڕای تۆریستەکان- ئەبولقاسمی تاهری، ل ١٢٧.

## بەرپرسایەتیی بیچاغ سەردار لە لایەن شوجاعوددەولەوە

پیاوچاکان لە مێژووی ئێران هەمووکات ڕۆڵی چاکیان هەبووە و لە سوار چاکی و پیاو چاکی و دەست وەشاندن لە دوژمن، بە ناوبانگ بوون. یەکێک لەو پیاو چاکە پایەبەرزەکانی کورد بیچاغ[٨٨] سەرداری جەلالی نیشتەجێی فیرووزکۆیە کە دەکرێ ناوی لێبەرین. بیچاغ سەردار بێجگە لەوە کە خاونی قۆل و شان بوو لە نێو شەڕەکانیش لە بیر و شێوەگەلی پیاو چاکیی خۆی ئەوپەڕی کەلکی وەردەگرت. سەرەتا مەبەستەکانی دەستنیشان دەکرت، پاشان پلانی بۆ دەکێشا کە بۆ گەیشتن بە مەبەستەکەی دەبێ لە چ کەلوپەلێ کەلک وەرگرێ، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی بە سەرنجدان بە بارودۆخی شوێن، کەمترین ماوەی بۆ بەڕێوە بردنی پلانەکەی خۆی لە بەرچاو دەکرد. ئەو هەمیشە لە پلان و بەرێوە بردنی پلانەکانی خۆیدا سەرکەوتوو بوو، بۆیە شوجاعوددەولە بانگی ئەوی کرد و گوتی: ئەسپی مەلاقوش، نووروێردی خانی تورکەمەنم هەتا یەک حەوتەیتر لە تۆ دەوێ. کەلوپەلی پێویست لە ڕەمەزان خانی وەزیر وەرگرە بۆ لای ئەتەگ بڕۆ. بیچاغ سەردار لە حاڵێکدا کە دەستی لە سەر سینگ دانابوو، سەری دانەواند، پاش ماوەیەک بەرەو مەبەستەکەی کەوتە ڕێ، شەوەکی خۆی گەیاندە دیواری قەلاکە و چووە سەر. ئێستا چۆن توانیی لە دەست سەگەکانی تورکەمەن ڕزگار بێت و بە مەبەستەکەی نزیک ببێت، بۆمان نادیارە، بە قسەی خۆی دەڵێن کە کاتی خۆی بەو شوێنەکە ئەسپی لێبوو گەیاند، شەو تەواو بوو و ڕووناکی بەیانی دیار بوو. بە ناچار خۆی لە ژێر کەلوپەلی وشترەکانی تورکەمەن لە نزیکی ئەسپەکەی شاردەوە. تەواوی ئەو ڕۆژەی لە حاڵێکدا بردە سەر کە لە ژێر کەلوپەل (کورتانی وشترەکە) خۆی کۆ کردبووە. دەرفەتێک دەست نەکەوت.

سەگەکان بۆ هەر لایەک دەڕۆشتن، دەروازەی حەوشێ داخرا بوو. هیوادار بوو بە هاتنی شەو دەرفەتێک پێک بێت، بەڵام کاتێ کە، پاش ئاوا بوونی ڕۆژ بینی دەروازەکەیان بە زەنجیرێکی گەورە قفل کرد بوو، زۆر نائومێد بوو و بەم شێوە سێ

---

[٨٨]- وا دیارە، بیچاغ وشەیەکی تورکیە، بەلام لە نێو کوردەکان باوە و بە مانای کارد یان چەقۆی تیژە.

شەو و ڕۆژ بێنان و ئاو لە نێو جێگاکەی بێئەوە کە، بوێریێ جوولانەوەی بێت تێپەڕ کرد. ئێوارەی ڕۆژی سێهەم، کە گاکانی تورکەمەن لە دەشت و دەر، ئەهاتنەوە، پیرەژنێک دەروازەی کردەوە و دوایی ئەوە کە گاوگوێرەکەکان هاتنە نێو حەوشێ و پیرەژن خەریکی ئەملا و ئەولا کردنی ئەوان بوو لە بیری چوو دەروازەکە داخات، بیچاغ سەردار کە وەکوو هەڵۆیەک بۆ دزینی ڕا، گوێی خۆی تیژ کردبوو، دەرفەتی لە دەست نەدا و وەکوو فەنەر هەڵبەزی و خۆی گەیاندە تەوەرێک کە بۆ شکاندنی دار لەو نزیکیانە دایانا بوو، بە دەستیەوە گرت و بەرەو ئەسپەکە هەڵات و لە یەک چرکەدا بە تەواوی هێز، تەوەرەکەی وەشاند و زەنجیری قامچی ئەسپەکەی کوت کرد و وەکوو پلینگێک نیشتە سەر ئەسپەکە و ڕفاندی. ئەسپ هاواری کرد و وەکوو کارەبا لە دەروازەوە بۆی دەرچوو.

نووروێردی خان تا هاواری ئەسپی بیست هەڵاتە دەر و هاتە هەیوان، بینی کە بیچاغ سەردار قامچی لە ئەسب دەدا و بە نێو بیابان هەڵێت. هەناسەیەکی هەلکێشا و گوتی هەی پیاو چاک، تۆ بردتەوە، ئیتر هیچ ئەسپێ پێتناگاتەوە، قامچی مەدە لە ئەسپەکەم و جەرگم مەکە بە خوێن. بۆ هەر کوێ بتەوێ دەتگەیەنێ دوایی کاتێ دەیان کەس لە سوارانی تورکەمەن لە دەرگای ماڵی ئەو پیاوە کۆ بوونەوەو لە خانەکەیان داوا کرد ئیزینان پێبدا و دوای کەون و بیگرن. بەڵام خان گوتی و ئیتر هیچ ئەسپێک پێی ناگا. ئەگەر شەلاخی لێبدات وەک هەڵۆ دەفرێت، من دەزانم ئەوە دەبات بۆ شوجاعوودەوڵە، چون کە هیچ کەس شیاوی سوار بوون لە سەر ئەو ئەسپەی نییە. شوجاعوددەوڵە چەند جار[٨٩] هەواڵی نارد بوو و ئەسپەکەی لە من داو کردبوو؛ بەڵام قەبووڵم نەکرد. ئێستا ئەو بردوویەتییەوە[٩٠]

---

٨٩- ئەمیر حوسەین خانی شوجاعوددەولەی ئیلخانی زەعفەرانلوو بە هۆی ئەوە کە خۆی پاڵەوان و ئازا و سوارێکی بێوێنە بوو، و هۆگریی تایبەتی بوو و بە ئەسپ و سوارکاری پتەو بۆ و پەروەردە کردنی ئەم دوانە بە تەواوی تێدەکۆشا.

٩٠- شاعەبباسیش جارێک دەستی بردووە بۆ دزینی ئەسپی دلخوازی خۆی و ئەسپی بە ناوبانگ «غەزاڵ»ی لە ئیمپراتووری عوسمانی دزیوە. [سەبارەت بەم ئەسپە نووسیویانە کە لە رەچەڵەکی عەرەبیە و سەرەتاهینی سوڵتان عوسمان بووە. شا عەبباس تاریفی ئەوی لە ئیسفەهان بیست بێئەوەی کە ببینێ دڵی لێچوو. دەیانگوت کە یاڵ و کلکی ئەم ئەسپە لە کورک نەرمترە و کاتی هەڵاتن وەها توند دەڕوا کە قاچەکانی لە سەر زەوی نابیندرێ. شاعەبباس کە دەیەوست غەزەڵ بـ

بەم شێوەیە هێشتا ڕۆژی دوایی خۆر نەکەوتبوو کە بیچاغ سەردار هاتە نێو قووچان (کۆن) و ئەسپی تەحویل دایە بەرپرسی ئاخوڕی شوجاعوددەولە. شوجاعوددەولە کاتێ بیستی بیچاغ ئەسپەکەی هێناوە، لە ژوورەوە هاتە دەر و لە باوەشی گرت و نێو چاوانی ماچ کرد و خەلاتی زۆری پێدا و شادمانی کرد.[٩١]

لایەنگەرانی بیچاغ سەردار وەکوو سەردار گۆڕا بوون و سەردار ئازار و حەسەن و بەگوو و توحفە گوڵ لەگەڵ رووسە تزارییە داگیر کەرەکاندا کە فیروزەیان داگیر کردبوو زۆریان شەر کرد.

موحەممەد کوڕی قیباس کوڕی بیچاغ سەردار، کە لەگەڵ عیسووقەچەکی[٩٢] جریستانی بۆ ماوەیەک بە شەڕە چریکیەکانی خۆی، تەنگی بە رووسەکان هەڵچنیبوو، لە کۆتاییدا لە نێو ئەشکەوتێک لە نزیکی قەلای باقر لە ڕۆژئاوایی عیشق ئاوا کەوتنە نێو داوەوە، رووسەکان لە هەر لاوە یاساخیان دان و تەقەیان لێکردن بەلام زیانی زۆریان لێکەوتەوە و پاشەکشیان کرد و لە کۆتاییدا هاویشتە نێو ئەشکەوت و ئەوێیان تەقاندەوە. موحە ممەد کوڕی قیباس لەگەڵ شەش کەس لە

دەست بێنێ. بۆیە یەکێ لە دزەشاڕەزاکان بە ناوی ملک عەلی قومی کە چەند جار گرترا بوو و دیسان بەخشیبوویان، کردە بەرپرسی دزینی غەزاڵ و پێی گوت کە ئەگەر ئەسپەکە نەهێنێ دەکوژرێ. مولک عەلی چوو بۆ ئیستانبول و بە فێلبازی ڕۆیشتە نێو تەوێڵەی تایبەتی و ماتڵی غەزاڵ بوو و لە ئاکامدا ئەو ئەسپەی دزی و لە ڕێگا غەیری عادیەکان هێنایەوە بۆ ئێران و پێشکەشی شای کرد.

ژیانی شاعەبباس- ب ٢- ل ١١٢]

تاج موحەممەد خانی بادلانلووش لە قووچان، بە موحەممەد باقری پالەوانی، سەلماند کە ئەسپە دڵخوازەکەی لە دێهاتی یەزدان‌ئاوا بدزێ. و ئەو شەوەکی هاتە نێو تەوێڵەی ئەسپ و ئەوی لە نێو بەفردا گوم کرد تاکوو جێتاچی دیار نەبێت و لەوێوە بردی بۆ دێهاتی مورغزار.

٩١- بە شیمانەیەک ئەم ئەسپە یەکێک لەو دوو ئەسپە بەناوبانگەیە کە شوجاعوددەولە کاتی هاتنی ناسرەدین شا بۆ قووچان لە ساڵی ١٢٨٤ پێشکەشی شای کرد و ناسردین شا کاتی هاتنەوە بۆ تاران لە دەروازەی شار نیشتە سەر ئەو ئەسپە تاکوو خۆی و ئەسپەکە نیشان بدات، و بەم شێوە. ئەو دوو ئەسپە کە شوجاعوددەولە پێشکەشی شای کرد ناوی یەکێکیان ڕەخش و ئەوەی تریشیان ناوی شمشاد بوو.

٩٢- عیسووقەچەک گۆردراوەی ناوی [عیسا چکۆلەیە] کە پیاوێکی ئازا لە تایفەی مەلەوانلووی جریستان بووە.

هاورێیانی خۆی کوژران، بەڵام عیسووقەچەک زیندوو ما و توانیی هەڵێت. ڕووسەکان بە خوێنی موحەممەد تینوو بوون، چونکە لەوەش پتر لە هەزار کەسیانی کوشتبوو، ئەمڕۆ زۆرتری منداڵانی بیچاغ سەردار و ئەمان ناو لە عیشق ئاوا و فیرووزەن. و لە کۆماری تورکەمەنستان یەکیەتیی سۆفیەت شیاوی و لێهاتوویی خۆیان نیشاندا و تایبەتمەندییەگەلی خۆیان دەرخست.

ڕاپۆرتی میرزا نەسروڵلا خانی مسباحولمەلێک (موشیرولمەلێک و موشیروددەولەی دوایی) سەرۆکی ئیدارەی کار و باری ئێران و ڕووس سەبارەت بە ئاخافتن لەگەڵ «پۆتێسۆف» وەزیر موختاری رووس لە ئێران سەبارەت بە ناکۆکیەکان سەر سنووری سەرەخس و قووچان کە بە دەست نووسی خۆی بە دەست قەواموددەولە وەزیری کار و باری دەرەوە بۆ ناسرددین شا ڕاگەیاندراوە:

### ڕاپۆرتی چاوپێکەوتن لەگەڵ وەزیر موختاری ڕووس

ئێوارەی چوارشەمە ۲۱ موحەڕەمی ۱۳۰۹- وەزیر موختاری ڕووسی دی و سەبارەت بە ملپێچیی ڕووسەکان لە جەنگەڵی یساری هەریروود.[۹۳] وتوویژی پێویستیان کردووە. وەزیر موختار پلاین سەر سنووری هێنا و تەماشای کرد و گوتی: دوو «یاغلی تەپە»[۹٤] لەو سەر سنوورەدایە، یەکێ لە قەراغ هەر ئەم ڕووبارە کە خاکی ئاخاڵە (لای ڕووسەکان) و یەکێکی کە یاغلیتەپە کە لە یساری هەریرووود (تەژەن) کە ئەویش شانزا وەرس و نیو (مەبەست تەپەی لوقمان بابایە) لە باکووری سەرەخسی ناسریدایە و هاوڕێ لەگەڵ بڕیارنامەی هێڵی سەر سنوور بە نێوانی دوو فەرسخ کە چواردە وەرس بێت لە باکووری سەرەخسەوە دەگاتە تەژەن، ئەم یاغلیتەپە کە نووسیویانە هی ئێرانەو شانزە وەرس و نیو تا سەرەخس (ناسری) نێوانی هەیە واتا دوو وەرس و نیو خوارترەوەیە لە هێڵی سەر سنوور، ئەگەر گومانتان هەیە ئاوڕ بدەنەوە سەر پلانەکانی خۆتان بە پێی قیاسەکە بە وردی ئەو

---

۹۳- لای چەپی ڕووبار لە نێو خاکی ئێرانە کە ئیستا بە پاسگای جەهانبانی بە ناوبانگە، چونکە تیمسار بەهانباتی پاشان ئەم بەشەی بە پێی ڕێکەوتنی دولەتەکانی ئێران و ڕووس وەرگرتەوە.

۹٤- مەبەست [قانلوو تەپە]یەکە سەری خانی خارەزمیان لەسەر ئەو تەپە بڕییەوە.

ڕوون بکەن، دیار دەبێ، دیسان ئەگەر گومانتان هەبوو برووسکە بنێرن بۆ بەڕێوەبەری سەرەخسی ناسری و بپرسن کە بۆچی لە نێو وڵاتی ئێرانماڵی دارییان درووست کردووە (؟)[95]

یان هۆ دەهێنێتەوە کە یاغولیتەپە خاکی ئێران نییە، کۆتایی پێدێنێت. پاشان گوتی لە بارەی «خەیر ئاوا» وەڵامی من گەیشت و بۆ بەڕێز ئەشرەف وەزیری گەورە نووسیم کە خەیرئاوا کە «کۆر پاتکین» لەوێ وێستاوە، تاکوو خەیرئاوای ئێران، چوار وەرەس مەودای هەیە واتا ئەم خەیر ئاوایە کە حاکمی ئاخاڵ (ژنراڵی ڕووسی فەرماندەری ئاوی خەزەر) لەوێ وێستاوە، چوار وەرەس لەولاتری هێڵی سەر سنوورە. بەڕێوە بەرانی قووچان[96] هەر ئەوەی کە ناوی خەیرئاوان بیست لێکۆڵینەوە برووسکەیان نارد...»[97]

## دستنووسی ناسردین شا سەبارەت بە پلان هەڵگرتنی لە فیرووزە

دەستنووسێک هەیە لە ناسرددین شا بۆ وەزیری گەورە، سەبارەت بەوە کە ئەندازیارێک بۆ پلان هەڵگرتنی لە ناوچەی فیرووزە بنێردرێت. لە قووچانەوە بۆ فیرووزە. پاش ئەوە کە ناسرددین شا بە پێی بڕیارنامەی ئاخاڵ لە ۲۹ موحەڕەمی ۱۲۹۹ شارەکانی باکووری خوراسانی بە ڕووسەکان بەخشی و چون بە پێی ئەم بڕیارنامە، فیرووزە، ناوچەیەکی لەبار و خۆش و سەوزی ئاوی خەزەر بوو، هێشتا

---

[95]- پاشان هەر لە شوێنی ئە م ماڵە دارییانە پاسگایەکی گرینگ دروست کرا کە ئێستا لە خاکی ئێراندایە و بە پاسگای رووسەکان بە ناو بانگە.

[96]- مەبەست لە بەڕێوەبەرانی قووچان ئەمیر حوسەین خانی شوجاعوددەولە زەعفەرانلووە و خەیرئاوا هەر ئەو دێهاتە بە ناوبانگە سنوورییەیەکە ئازایەتی ژنانی کورد لە نێو شەڕ لەگەڵ تورکەمەنەکان نیشاندرا کە لە نێو کتێبی [کۆچی مێژووی کورد بەرگی یەکی ل ۳٤۲ هاتووە یان ئاماژەی پێکراوە.] کاک مسباحولمەلێک [موشیروددەولە] کە لێرەدا ڕاپۆرتی ئەمیر حوسەین خانی شوجاعوددەولەی بە لێکۆڵینەوە باس دەکات. خۆشی هیچ زانیارییەکی سەبارەت بە پێشرۆیشتنی ڕووسەکان و هێرشیان بە خەیرئاوا نەبووە. هەروا کە چەند ساڵ دوایی، رووسەکانی ناوچەی فیرووزە تا بێخ دیواری خەیرئاوایان داگیر کرد.

[97]- ل ۱۰۱ بەڵگەگەڵ سیاسی سەردەمی قاجار- ئیبراهیمی سەفایی- بەڵگە سەبارەتە بە کار و باری بەندەری گەز.

بەشی خاکی قووچان مابوو، رووسەکان پلانی جیا کردنەوەیان کێشاوداوایان لە ناسرددین‌شا کرد تاکوو فیرووزەش بەوان بدات. هەر بۆیە چون پاشا زانیاریەکی سەبارەت بە بارودۆخی جوگرافیایی فیرووزە نەبوو فەرمانی ناردنی پلانکێشی‌دا بۆ لای رووسەکان. و لە سالی ١٣١١ ک ئەمیر حوسەین خانی شوجاعوددەولە حاکمی قووچان دەکاتە بەرپرسی تەحویل‌دانی فیرووزە بە ڕووسەکان. ئەمیر حوسەین خان لەم سالەدا کاتێک دێتەوە بۆ فیرووزە، دەکوژرێ و سالی دوایی موحەممەد ناسر خانی شوجاعوددەولە کە بەرپرسی بەرێوە بردنی ئەم حوکمە دەبێ و موحەممەد ناسرخان کاتێ دەچێ بۆ ئەوێ کە دەبینێ ڕووسەکان لە پێشەوە ئەوێیان داگیر کردووە و پێویست بە هاتنی لیژنەی ئێرانی نەبووە.

## دستتووسی ناسردین شا له سالّی ۱۳۱۰ مانگی

«بەڕێز وەزیری گەورە پێویست بە ئەندازیارێکی شیاو دەکات کە بە ئەسپێکی چالاک بڕوا بۆ قووچان، پلان و بارودۆخی فیرووزە و چۆنیەتی ئەوێ بنووسێ و لە زووترین کاتدا بینێرێتەوە.

رامگەیاندە موخەبێرودەولە کە سبەینێ ئەندازیارێک بێنێت، فەرمانی کاری پێبدەم و بڕوات، دەبێ فەرمانی کاری کامل و خەرجەکەی پێبدەن، زوو بەڕێی کەن با بڕوات. بە هیچ شێوەیەک زانیاریی دروستمان لەوێ نییە. عێزەتودەولە بکەن بە بەرپرس با زوو بڕوات بۆ هەمەدان.»[٩٨]

## ڕاپۆرتێک له مردنی ئه‌میر حوسه‌ین خانی شوجاعوددەولّه و خه‌زێنه‌ی به شکۆی ئه‌و و بوومه‌رەزرەکانی کاولکه‌ری قووچان

گوترا کە ئەمیر حوسەین خانی شوجاعوددەولە لە لایەن ناسرەددین‌شا بەرپرس بوو تاکوو ناوچەی فیرووزە بداتەوە بە ڕووسەکان و کاتێ کە لەگەل «ئەمین نزام» بۆ ئەو شوێنە، لە فارووج کەوتە ژێر جەستەی ئەسپەکە و بۆیە لە ڕۆژی یەکشەممە ١١

---

٩٨- بەلگە سیاسیەکانی قاجارِیە- سەفایی، ل ٢٤١.

ڕەبیعولئەولی ۱۳۱۱ مانگی کۆچی دوایی کرد.[99]

یووسف خانی هەراتی نووسەری بەحرولفەواید کە لە مامۆستاکانی فێرکەری سواری زەعفەرانلوو لە نێو دام و دەستگای ئەمیر حوسەین خانی شوجاعوددەولەدا بوو دەڵێ دوای مردنی ئەمیر: «ڕۆژی ۳ی جەمادییولئەوەڵ ۱۳۱۱ مانگی لە خەبووشان چوومە مەشهەد لە حاڵێکدا ۳ سەر ئەسپ و ۲ کەس نۆکەر بۆ من مابووەوە؛ بەڵام جێی سپایە، چون شەوی هەشتی جەمادییولئەوەتی ۱۳۱۱ی مانگی لە قووچان بوومەلەرزەیکی گەورە ڕووی‌دا. کە بوو بە هۆی مردنی دوانزە هەزار کەس»[100] (۵۸ ڕۆژ دوای مردنی ئەمیر)

لە بەرگی یەکەمی کتێبەکە گوترا کە چون ئەبولحەسەن خان کوڕی ئەمیر حوسەین خان چەند حەوتە پێش مردنی باوکی لە تاراندا کوژرا، پاش مەرگی ئەمیر حوسەین خان بە ڕواڵەت خەڵک لایەنگەریەکی زۆریان دەکرد لە حکوومەتی خان‌باباخان (ڕەزا قولی خان کوڕی سام خانی شوجاعوددەولە). بەڵام بەو کارانە کە کوڕە مامەکەی، موحەممەد ناسر خان دەی‌کرد، حوکوومەتی خۆی لەسەر خێڵی زەعفەرانلوو کە م ماوە کرد و ئەوی لە پانتای سیاسەتی قووچان لابرد.[101] بۆ ڕوونبوونەوەی زۆرتر ئەوە ئاوڕ دەدەینەوە سەر وتاری کاک حوسەینی خەدیوی‌جەم لە گۆڤاری فەرهەنگی خوراسان کە لە کتێبێکی دەستنووسی «گێرانەوەی ئەحواڵی قووچان» بەم شێوە دەیگێڕێتەوە:[102] «هەر چەند ئەم بەندە کە کەمترین دوعابێژانی «کوڕی خوالێخۆشبوو ئەلمەغفوورولمیرزا موحەممەد ئیبراهیم و مۆبتەهێدی

---

[99]- بۆ زانیاریی زۆرتر ئاوڕ بدەنەوە سەر بەرگی یەکەم کە هەروا بە زووی چاپ دەبێتەوە.

[100]- بە حرولفەواید- موحەممەد یووسفی هەراتی.

[101]- بۆ زانیاریی زۆرتر ئاوڕ بدەنەوە سەر بەرگی یەکەم کە هەروا بە زووی چاپ دەبێتەوە.

[102]- کاک حوسەینی خەدیو کە ئەم وتارەی لە گۆڤاری فەرهەنگی خوراسان هێناوەتە دەر دەڵێ: کتێبی دەستنووسی تایبەتی ئاماژە پێکراو لە کتێبخانەی نەتەوەیی بە ژمارەی ٦٧١ چەسپاوە و نووسەری ئەو بە ناوی [کوڕی خوالێخوش بوو مەغفوورلمیرزا موحەممەد ئیبراهیم و موجتەهدی عەسکەری ڕەزەوی] ناساندووە کە خۆی بوومەلەرزەی قووچانی بینیوە، ئەم کتێبە بە فەرمانی موعتەزدوسەڵتەنەی قاجاڕ کە گوتراوە بۆ زیارت هاتووە بۆ مەشهەد نووسیوە بەوی پێشکەش کردووە کە ئێستا لە کتێبخانەی نەتەوەییدایە. (گۆڤاری فەرهەنگی خوراسان- سالی ١٣٥٤- ژمارەی ٨- ل ١٥)

عەسکەری» لە بنەماڵەی بەڕێزی ئیمام جومعەی خوراسان، چوار مانگ لەوە و پێش بە پێی بانگهێشت و پێداگریی خوالێخۆش بوو [ئەمیر حوسەین خان] شوجاعوددەولە و هەروەها... بە بۆنەی خزمەتی و نزیکایەتی نێوانمان، تەنیا لە بەر قەبوولکردنی بانگهێشت و پاش مردنی خوالێخۆش بوو ئەبولحەسەن خان [میر پەنجە کوڕی ئەمیر حوسەین خان] لە مەشهەدەو ڕۆیشتم بۆ قووچان و ئەم ماوەیە لەوێ مامەوە. هەڵبەت شێوەی میوانداریی خوالێخۆش بوو شوجاعوددەولە کە جەنابتان [شازادە موعتەزدوسەڵتەنە] ئاگاداری هەن و لە یادی موبارەکتاندا ماوەتەوە، بە تایبەت لە هەموو لایەنێکەوە میوانی بەو پەڕی سەرنجەوە ڕادەگرت و ئاگاداریی دەکرد.

یەک دوو حەوتە لە هاتنی من تێپەڕ نەببوو سەرەتای مانگی رەبیعوسانی ساڵی ۱۳۱۱ (ز) بوو کە بەڕێز ئەمین نزام [لە تارانەوە] هات و خوالێخۆشبوو شوجاعوددەولە بۆ بەخێر هاتنی ئەوان شێوەیەکی دابین کرد و موحەممەدناسرخانی کە ئێستا شوجاعوددەولەیە لەگەڵ پەنجا سوار و چەند کەس لە گەورە پیاوانی نارد بۆ پێشوازی و لە دەرەوەی شاری قووچان باخی خوالێخۆشبوو ئەبولحەسەن خانی دابین کرد بۆ شوێنی مانەوەی چەند ڕۆژە بۆ میوانەکان و هەروەها پێشوازیەکی تێر و تەسەلی لە بەڕێز ئەمین نزام و هاوڕێکانی کرد و سەرێک ئەسپ و کەل و پەلەکەی بەو پەڕی پێداویستییەکانیەوە پێشکەش کرد.

پاش حەوتەیەک مانەوە بۆ پشوودان و خۆشۆردن ڕۆژی ۸ی مانگی رەبیعوسانی لە قووچانەوە هاوڕێ لەگەڵ ئەمین نزام بەرەو فیرووزە ڕێکەوتن لەم نێوانەدا چەن جار خوالێخۆش بوو شوجاعوددەولە بە ئێعەی دەگووت و ڕایدەگەیاند: چونکە فیرووزە بەو پەڕی خۆشی خۆیان ئامادە بوون و لەو پەڕی گوێڕایەڵیدا بە ویستی خۆیان لە فیرووزەوە شوێن و جێی خۆیان دەڕۆن. وێدە چێت کە من لە لایەن خۆمەوە یەک دوو کەس بۆ بەڕێوەبردنی ئەم خزمەتە بنێرم. کە لە بیست ڕۆژ کار و باری فیرووزە بەو پەڕی ئاسایی و باشیەوە بەڕێوە دەبەن و ئەوان دڵگەرم و ڕازی دەکەن ئەم خزمەتە ڕاگەیاندراوەی منە و لە ڕاستیدا کۆمەڵێک خەڵک ئاسوودە دەکەن؛ بەڵام چونکە لە لایەن ئەولییای دەوڵەتی خاون شکۆوە حوکم بە ڕۆیشتنی تاکی خۆم دراوە، هەر بۆیە دەبێ کۆمەکێکی زۆر و خەڵکێکی زۆر لەگەڵ خۆم

ڕاگوێزم و بییابەم. بەڵێ لەو یەک دوو ڕۆژە کە خوالێخۆشبوو شوجاعوددەولە و بەڕێز ئەمین نزام خەریکی کۆچ بۆ شوێنی بەرپرسایەتیی خۆیان بوون، من بە بۆنەی هاتنی زستان هێنا، ویستم بۆ [مەشهەد] بڕۆم، خوالێخۆشبوو شوجاعوددەولە هەر جۆرێک بوو نەیهێشت بڕۆم و بە زۆر منی هاوڕێی سەفەری خۆی کرد...

یەکەم ماڵ دێهاتی خارووج بوو کە سێ فرسەخ لەولاتری قووچاندا بوو و ڕۆژێکیتر پاش خواردنی نانی نیوەڕۆ هەر چەند کە ئەم ماڵە لە هەموو لایەکەوە زۆرتر لە یەک فرسەخ مەودای نییە و دەکرا لە ماوەی یەک ساعەتدا زۆر بە ئاسایی بگەین. خوالێخۆشبوو شوجاعوددەولە هە ر ئەو کاتە کە ئیتر دەستی لە خواردن هەلگرت سواری ئەسپ بوو، و چونکە لەو ماڵەدا مەیلی بوو سوارکاری لە سەر ئەسپ بکات، ئیتر سوار پەیتوون نەبوو، کەسانیتریش سوار بوون و پەیتوونەکانیان بە جێهێشت، هەموویان سوار ئەسپ بوون.[١٠٣] و دەیگووت: چون ئاسمان بێهەوێ و زەوی سافە، ئەمڕۆ پێمخۆشە ئەسپ سواری کەم. هێشتا ئەسپەکان پێنسەد هەنگاویان هەڵنەگرتبوو و شەشسەد هەناسەیان نەکێشا بوو کە لە نەکاو ئەسپی خوالێخۆشبوو شوجاعوددەولە بێئەوەی شتێک قەوما بێ،تەنیا لەبەر سه رکەشی بە سەر هە ر دوو قاپی ڕاست وێستا و زوو بە پشتەوە هەڵگەڕا، سوارکەر لە ژێرەوە و ئە سپ لە سەرەوە مابوو. پاس جووڵانەوەی ئەسپەکە، کۆمەڵێک کە پێکەوە بووین لە ئەسپەکان هاتینە خوارەوە. ئەو خوالێخۆشبووەمان لە سەر زەوی هەڵگرت و بە سینگ و شانی، یەک دوو کەس ڕامان گرت، بەڵام چۆن؟ کڵاوەکەی شکا بوو، سەر و دەم و چاوی پڕ لە خۆڵ، ڕەنگ لە دەم و چاویدا نەمابوو، بە جەستە لەرزۆکەکەی دەیناڵاند و هاواری دەکرد.

هەروا خۆڵیان لە سەر دەم و چاوی لابرد و هەر کەس کە لەوێ بوو بە زمانی خۆی ئەوی دلداری دەدا. تۆزێ حاڵی چاکتر بوو. زوو بە ڕاخەر و نەمەدی ئاوداری یاساخیاندا و بۆ ئاگاداری لە بەرانبەر تەواوی ئامادە بوان و هاوڕێتان پێکەوە گوتیان: دەبێ هەوەڵ، بکرێتەوە [!!] و پاشان خەریکی دەرمانێکیتر بین . من و بەڕێز ئە مین نزام لە بەر دیتنی جەستەی لاواز و تەمەنی زۆری خوالێخۆشبوو

---

[١٠٣]- بۆ زانیاریی زۆرتر ئاور بدەنەوە سەر بەرگی یەکەم.

شوجاعوددەوڵە نەمانهێشت خوێنی لێبگرن و لێوەکان. ئێستخارەش یارمەتی نەدا [کە خوێنی لێبگرن] بەڵام ڕەگیان بڕی و شەست مسقاڵ خوێنیان لێگرت.[١٠٤] ئەوەی گوتمان: ئێستا کە فەرمانی خوێنڕێژی دە کەن[١٠٥]، لانی کەم مەهێڵن خوێنی زۆر بڕژێت و تێکۆشن کەمترین خوێنڕێژی ڕوو بدات. بەڵام گوێیان ڕانەگرت و ئاوڕێکیان لێنەدایەوە. پاش خوێن گرتن بە بۆنەی خوو بە تەریاک و بەڵای کەوتنە سەر زەوی. لە ناکاو بە تەواوی حاڵی گۆڕا و زۆر توونیی بوو. بە هیچ جۆرێک نەیدەتوانی تەریاک بخوات یان هەڵکێشێت، لەو کاتەدا نامەیەکیان نووسی و لە حکوومەتی عەشق ئاوا [رووسیە] دوکتوریان ویست. میرزا سادقی دوکتۆر کە هاوڕێی خوالێخۆشبوو شوجاعوددەوڵە بوو خەریکی دەرمانی ئەو بوو. وا دیاری کرا، قارچ و ئەزنۆ و دەندە و کەلەکەشی لە قووچانەوە هات و خەڵک لە هەموو لایەکەوە بۆ سەردانی هاتن. بەیانیی ڕۆژی دووهەم، حاڵی ئەو خوالێخۆشبووە تۆزێک باشتر بوو، وا بوو کە زۆربەی خەڵک پێیان وابوو ساغ و چاک دەبێتەوە. تەنانەت خۆشی دەیگووت، ئەگەر تا سبەینێ حالم چاکتر بوو ڕێدەکەوتن و لەگەڵ بەڕێز ئەمین نزام دەڕوین، ئەگینا ئەم کۆمەڵە لەگەڵ ئەو دەنێرم و خۆم بۆ دەرمان دەگەڕێمەوە بۆ قووچان.

هەموومان شاد بوین لە قسەکەی و دیتنی چاکتر بوونی حالی ئەو و هەر کام لە ئێمە تۆزێ ماڵمان لە بەر سلامەتیی ئەو بەخشی. ئێوارە دیسان حاڵی گۆڕا و لاواز بووەوە. هەر کەس بە خەیاڵی خۆی شتێکی دەگوت. هەندێک شادمان و هەندێکیتریش نارەحەت بوون. شەوەکی کۆمەڵێک لە سە ر خۆوە زالوویان خستە سەر دڵ ئەو خوالێخۆشبووە [!!]. من کە هاتم و دیم خوێنێکی زۆر لە ئەندامی زالووەکان ڕۆشتووە و بە ڕێکەوت ئەو شەوە تۆزێک حاڵی باشتر بوو، بەڵام نزیک بەیانی لە هۆش چوو و تا ئێوارە هەر بێهۆش بوو و یاوە زۆرەکەی مایەوە. لای هەڵاتنی ڕۆژ تۆزێ عارەقی کردەوە. ئەو شتەی گوتم ئێستا دەبێ هەر جۆرێ کە

---

[١٠٤]- ئەمە بۆ لە قاچ دەرهێنانی لاوێکی بە هێز بەسە چ بگات بە پیرە پیاوێک.

[١٠٥]- بە شیمانەیەک ئەم کار و بارە بکوژانە لە لایەن کۆمەڵێک دەسەلاتدار کە ڕازی نەبوون ئەمیر لەم گوتراوەیە ڕزگار بێت، بۆیە بۆ مردنی زووتری ئەو تێدەکۆشین و بە ڕواڵەتی دۆستی، ڕێبازی دوژمنایەتیی خۆیانیان بەرێوە دەبرد.

وردە وردە چاکی کەینەوە کە ئەم نەخۆشـییە دووپـات نەبێتـەوە و ئـەگـەر دووپـات بێتەوە زۆر بە سەختی لا دەچێ، هیچکەس لە سەر ئەم قسە نەکۆڵییەوە و ماوەیەک تێپەڕ نەببوو کە پاش سێ سەعات دیـنسان گەڕایـە سـەر حاڵـی یەکـەمی. مـن بـە گۆڕینەوە لە ڕەشماڵی خوالێخۆشبوو شوجاعوددەولـە هەسـتام و چوومـە ڕەشماڵـی خۆم و مردنی ئەوم تا بەیانی بە ئاشکرایی دەبینی. بەیانی زوو بوو، دیم کەسێک مـن لە خەو هەڵدەستێنێ و دەڵێ: زەحمەت بکێشن و بێنە نێو ڕەشماڵی نـەخۆش کـە کارێکی بە ئێوەیە. زوو هەستام و ڕۆیشتم، لە نێـو ڕێگـا هـەرچی پرسـیارم لێکـرد و ئەحواڵم پرسی شتێکی نەگووت. هە ر چوومـە ژوور، دیم شوجاعوددەولـە لەوێیـە و منی لە بەر گوتنی شەهادەت ویستووە و دەیانگوت ببوورن، لە ئۆردوودا جگە لە ئێـوە کەسێکی لێنەبوو، دیمـان کـە ئێـستا نـەخۆش دەمـرێ، بێئـەوەی کـە شـەهادەت بگوترێ. بۆیە بە ئێوەمان، زەحمەتدا و هێناتانمان. [ئەمیر مردنی خۆی پێش‌بـینی کردبوو و بە سوور بوون لە سەری نەیهێشت بۆ مەشهەد بڕۆن و ئەوانی بۆ ئاوا کاتێـک، لەگەڵ خۆی هێنابوو بۆ ئەم سەفەرە دوایی نیو سەعات شایەتیی‌دا و ڕوحی پیرۆزیـی فڕی بۆ لای خوا.[١٠٦]

پاش مردنی شوجاعوددەولە دوو سێ کەس [هە ر ئەوانە کـە ڕەگـی ئـەمیریان وەک ڕەگی ئەمیر کەبیر لە سەرجێگای نەخۆشـیدا، دەدڕانـد و خوێنیـان دەڕژانـد و زالوویان لە سەر کەلەکە و دڵی دادەنا، تاکوو ئەم شێرە خرۆشانەی کوێستان لە سـەر

---

[١٠٦]- ئاغای شاکری مێژووی مردنی ئەمیری [یەکشەمە، ١١ی ڕەبیعولئەوەڵی ١٣١١ مانگی] نووسیوە، لە حاڵێکدا ڕۆژی ١١ەی ڕەبیعولئەوەڵی ١٣١١ دەبێتە ڕۆژی هەینی. بە پێی ئـەمـە مـردنی ئـەمـیر دەبێتە ڕۆژی هەینی ١١ەی ڕەبیعولئەوەڵی ١٣١١ کە بەرابەرە لەگەڵ ڕۆژی کۆتایی مانگی ١٢٧٢، کە لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە بە هەڵە، ١٢٧٣ چاپ کراوە.

سەبووری مەلکوشوعەرای خوراسان بە بۆنەی ئەم ڕووداوە دەڵێ:

ان پـیل فـکن شـجاع بـی‌شـبه و قریـن
کـز دولـت شـه داشـت مقـام فـرزین
دیـدی کـه پیـاده شـد بـه یـک بـازی اسب
مـات امـد و رخ نهـاد بـر نطـع زمـین

ڕێگای خۆیان هەڵگرن]. هەموان داخدار بوون.[١٠٧] بەڵام بە تایبەت دەردکێشان و خەمداگرتنی ڕەمەزان خان [وەزیری شوجاعوددەوڵە] نەدەهاتە گوتن. بە کورتی، هەر کە بووە بەیانی، بەڕێز ئەمین نزامیش هات و تەرمەکەیان بەرەو قووچان برد. پاش گەیشتن بە قووچان تەرمەکەیان لە ئوجاغزادەی کە لە وێدا بوو دانا تاکوو بە ڕۆژا بەرەو مەشهەدی بڕۆن.

ڕۆژی دووهەمی پرسەی خوالێخۆشبوو شوجاعوددەوڵە بوو کە موعتەمێدوسسولتان نەواب موحەممەد جەعفەر میرزا، سەرۆکی برووسکەخانەی موبارەکی مەشەد، بە بۆنەی زۆر بوونی دیاردەویەکیەتییەکە لەگەڵ خوالێخۆشبوو شوجاعوددەوڵە بوو، دانیشتنێکیان بوو لەگەڵ بەڕێز مۆعتەمێدوسسولتان حاجی یاریدەری دوکتۆرەکان کە بە تایبەت لە لایەن حەزرەتی ئەشرەف ئەمجەدی گەورە [شازادە مۆئەیدودەوڵە][١٠٨] خێڵە گەورەکان کە بۆ پرسە و سەرخۆشی هاتبوون.

---

[١٠٧]- گۆرانی بە ناوبانگ و حەماسیی [هاهای رەشید خان سردار کول قوچان] بۆ کۆچی رەشید خانی قووچان لە رۆژی ناشتنی تەرمەکەی، خەلک هەموو پێکەوە دەیانهۆینیەوە و چەند جار پێش شۆڕش لە ڕادیۆ و تەلێڤیزیۆن بلاو کرایەوە.

بەشێک لە سروودەی پرسەکە، کە نووسەر بە دەستی هێناوە، بەم جۆرەیە کە لە ژێرەوە ئاماژەی پێکراوە.

١- هەسپێ رەشە بێ‌خادیی، مە داغدار کر: های
دوشمەن لە مە شا، کرو، مەخار وزار کر: های
قووچان بێ خادیی کرو، مە خاکسار کر: های
های های رشید خان، سردار کل قووچان
٢- خەڕاج خەراوە، لێ‌لو، قووچان خەراوە: جان
واجەردی لە مەکەتی توچارە ناوە: های
واجەردی لە مەکەتی توچارە ناوە: جان
های های رشید خان،
سردار کل قووچان...

[١٠٨]- شازادە مۆئەیدوددەولە کوڕی حساموسسەڵتەنە و زاوای ناسرەددین شا کە بۆ حکوومەتی خوراسان داندرا. ئەمیر حوسەین‌خانی شوجاعوددەولە لەبەر ڕێزێ کە بۆ حساموسسەڵتەنە دەیگرت [چونکە لە شەڕی هەرات، هاوڕێی حساموسسەڵتەنە بوو و لە هەموو کاتدا بە تایبەتی حکوومەتی حساموسسەڵتەنە لە بەر چاو بوو.] ڕۆیشت بۆ پێشوازی لە موئەیدوددەولە و هەر لەم سەفەرە بوو کە یووسف‌خانی هەراتی، نووسەری بەحرولفەواید یارمەتی لە شوجاعوددەولە ویست و ئەمیر بۆ

هاتنە ماڵێک کە تایبەت بە من بوو بۆ دابین کردنی ڕاسپارەکان و ئەو کەسانە کە لە خواڵێخۆشبوو مابوونەوە و لەوێ مانەوە و بە بۆنەی خزمایەتی و نزیکایەتی، زانیار بم لە حاڵ و ڕێی ئەوان بوو و زۆربەی کاتەکان لە بەرەکەتی چاوپێکەوتن و نامیلکەکانیان بەهرەم وەردەگرت و هێندێ لە قسەکانی ئەوانم ڕادەگەیاندە موحەممەد ناسرخانی شوجاعوددەوڵە.

موحەممەد ناسرخانی شوجاعوددەوڵە، یەک دوو کۆڕیشی چاوپێکەوت و ئەو شتانە کە لە هەر دوو لاوە دەگوترا ئەمە بوو [بە کورتی قسەی نووسەر لەم بەشەدا ئەمەیە کە] شازادە موحەممەد جەعفەر میرزا سەرۆکی برووسکەخانەی مەشەد بە موحەممەد ناسرخانی دەڵێ: بە پێی ئەو دۆستییە و یەکیەتیە کە لە نێوان من و خواڵێخۆشبوو شوجاعوددەوڵە بوو و بۆ ئاگایاری لە مافی ئەو خواڵێخۆشبووە، من لە خزمەت ئێوەدام. یاریدەری دوکتۆرەکانیش کە بۆ سەرخۆشی لە مەشەدەوە هاتبوو ڕاڤەیەکی دا و گوتی: لە بەر ئەوە کە لەم ئاخرانەوە خواڵێخۆشبوو شوجاعوددەوڵە بە پێی گومانی خراپێ کە بە شازادە موئەبێدوددەوڵە (کوڕی حساموسسەڵتەنە کوڕی عەبباس میرزا جێگری حکوومەت) بووی دڵی ئێشا بوو و بە هیچ شتێکی نەدەزانی و شازادە هەرچی بۆ بێخەتایی خۆی هۆی دەهینایەوە، ناخۆشی لە دڵی خواڵێخۆشبوو شوجاعوددەوڵە لانەدەچوو، بۆیە (بەڵام) شازادە والی خوراسان منی بۆ سەرخۆشی لە مردنی باوکتان و پیرۆزبایی بۆ دەسپێکردنی حکوومەتەکەتان لە قووچانەوە ناردووە و بەڵێنی داوە کە «لە بەر ئەوە کە مافەکان و زەحمەتەکانی خواڵێخۆشبوو شوجاعوددەوڵە هەمیشە لە بەر چاوە و هیچ کات... لە بیرمان ناچێت و قووچانیش سنوورێکی گرینگ و بە هەر شێوە و بە هەر جۆر هاوڕێیی و ئاگاداری لەم بنەماڵە ئامادەم.»

لە هەر حاڵدا ناردراوانی والی خوراسان تێدەکۆشن ڕای موحەممەدناسرخانی

---

فێرکاریی نزامی سوارانی زەعفەرانلوو ئەوی لەگەڵ خۆی بۆ قووچان هێنا. پاش مردنی ئەمیر یووسف خانی هەراتی لە سێهەمی جەمادیولئەوەڵی ١٣١١ گەڕایەوە بۆ مەشەد و فتنە و ئاژاوەیەکی بە هەڵخرانی ڕووسەکان دامەزراند و لە کۆتاییدا لەم ڕووداوەدا کوژرا.

حەدیقەتورڕەزەوییە- ئەدیبی هێرەوی- ل ١٧٢ بە نەقڵ لە بەحرولفەوایدە، ١١ی موحەڕەمی ١٣٢٩ مانگی.

بۆ لای خۆیان جەلب کەن، و بە حکوومەت بیگەیێنن. بەڵام ئەمین نـزام نەیهێـشت موحەممەدناسرخان، ئەم کارە ئـەنجام بـدات و دەڵـێ: ئەمانـە بایـەخیان نییـە کـە لەگەڵیان کەین و بەینت بێت. من بە برووسکەیەک، والیـی خوراسـان و ئەمانـە، لـە خوراسانەوە بۆ شوێنیکی‌تر دەگوێزمەوە. موحەممەدناسرخان، هەر چەنـد دەڵـێ کـە ئەمە خیلافی ئەدەب و میوانداریيە، بە لام چارەیێ نییـە و برووسـکەیەک بـۆ تـاران دەنێرێ، کە ڕۆژی دوایی وڵامی بروسکەکە لە سەرۆک وەزیرانی ئێران دەکات، چۆن بوونی دەقی برووسکەکە دیار نییە، بەڵام دیارە کە خـیلافی پێویـستیەکانی شـازادە مۆئەیەددەولە حاکمی خوراسان بووە و لە ناچاریدا، ناردراوەکـانی بـە دڵئێـشان لـە قووچان دەگەڕێنـەوە کـە ئەمـە دەبێتـە هـۆی ناڕەحـەتی موحەممـەد ناسـرخان و ناڕاحەت بوونی زۆرتر لە پێشووی حاکم. کە نووسەر دەیگێڕێتەوە کە ئەم مەبەستەی داخی موحەممەد ناسر خان بە شازادە موعتەزدوسەڵتەنە کە کتێبی بۆ ئەو نووسیبوو و بە شیمانەیەک لە لایان دەوڵەت و دەربار، بەرپرسـی پێگەیـشتنی ئـەم مەبەسـتە بووە، قسە زیاد دەکات: «چوونکە موحەممەد ناسـر خـانی شوجاعوددەولـە حـاکمی قووچان بوو. [و لە بەرانبەر ڕەقیبەکەی، ڕەزا قولی خانی دووهەم کە بـە نـاوی خـان بابا خان بە ناوبانگ بوو کە کوڕی بوو پێروز بوو] پیرۆز بابیم کرد لە حکوومەتەکـەیان و بەو بۆنەوە کە لەگەڵ بەڕێز ئەمین نزام دەیانویست بۆ فیرووزە بڕۆن، منـیش خـۆم بۆ هاتن بۆ مەشەد ئامادە کرد. چون بڕیار ئەمە بوو کە یەک ڕۆژ پاش ڕۆیشتن ئەوان، من ڕێکەوم. بەیانی ئەو ڕۆژە کە حەزرەتەکان ڕۆیـشتن هـەر ئـەو بەیانییـە بـوو کـە هاوسـەری خوالێخۆشـبوو شوجاعوددەولـە [ش] مردبـوو و بـەم جـۆرە بـوو کـە ڕێکەوتنەکەم کەوتە دواوە. خەریکی ناشتن بوین کە کاغەزێک لە لایـەن موحەممـەد ناسرخانی شوجاعوددەولە گەیشت. دەقی ئەمە بوو کە چۆن کە دیـسان ڕوداوێکـی نوێ ڕووی‌داوە لەبـەر ئاگـاداری ڕەسمـەکمان و هێنـدی مەبەسـتی‌تـر کـە نـاکرێ بینووسین و ئێوە دەزانن؟ بە بۆنەی ئاگایاری لـە بـڕێ شـت یـەک حەوتـەی‌تـر لـە قووچاندا بن، لە بەر ئەوە کە بە پاڕانەوە نووسیبوویان لە ناچاریدا دەستم لـە ڕۆیـشتن هەڵگرت و کاتێ ئەوانی لێ‌نەبوو لەو دووسێ ڕۆژە دا، خـەریکی سەرخۆشـی و پرسـە

بووم و هەروەها لە ناویشدا ئاشکرا بوونی نەخوشی وەبام دەبیست[١٠٩] و بە تەواوی سەرکز و خەمبار بووم. چەند رۆژ پاش مردنی شوجاعوددەولە، بەڕێز ئەمین خاقان کە بۆ زیارت کردنی ئاستانی قودس رۆیشتبوون، گەڕانەوە بۆ قووچان، کە لە ڕێگای عەشق ئاوا [بۆ تاران] بگەڕێنەوە. [چونکە ڕێی تاران- مەشەد، لە سەبزەوارەوە شاهرووود لەبەر هێرش و تالانکردنەکانی، تورکەمەنەکانی ئێسترئاوا ئەمن نەبوو.] بەڵام من چونکە دوای بڵاو بوونی نەخۆشی وەبا لە ماڵەوە نەئەهاتمە دەر و لەگەڵ کەس هات و چووم نەبوو، لە بەرەکەتی لە لای ئەو بوون بێبەش بووم. چەند کەسێک کە لە گەورەکانی قووچان بوون، نەخۆشیی وەبایان گرت و مردن، زۆر زۆر ترسا بووم و چونکە شاری قووچانیش هەمووی پیش بوو و تەنانەت زستانیش بوو بەڵام هەوا وەکوو هەوەڵەکانی هاوین زۆر گەرم بووم[١١٠]، لە بڵاو بوونی ئەم نەخۆشیە زۆر دەترسام و ژیانم خراپ ڕادەبوارد. لە ئاکامدا ماندوو بووم و نەمتوانی بەرگەی بڕیارنامەی مانەوە لە قووچان بگرم. خەیاڵم کرد چ زیانێکی هەیە کە چەند ڕۆژێک بۆ ڕاو و سەیران برۆم دوو فەرسخ لەم لاتری دێهاتی بە ناوبانگی قەرەشاهوێردی. کە جگە لە دەس بە دەس کردنی رۆیشتن بۆ قووچان، بە وێنەی فەرمانی خانەوە پێش لەمە کە حەزرەتەکان لە فیرووزە بگەڕێنەوە، منیش لە کوێستان بۆ قووچان بگەڕێمەوە...» [لێرە نووسەر خەوێک دەبینێ کە بانگهیشتی هاتنە دەر لە قووچانی پێدەدات. بۆیە بڕیاری هاتنە دەرلە شەڕ دەدات.] لە هەر حاڵدا ئێوارەی ئەو رۆژە لەگەڵ تەواوی هاوڕێیانی ڕێکەوتین و بۆ هەر دێهاتێ ڕۆیشتم و تۆزێ لە دێهاتێ ناسراو بە «دەهەنە» ماینەوە بەم بۆنەوە، نزیکەی یەک سەعات لە شەو تێپەڕیبوو کە گەیشتمە ماڵ... پاش تۆزێ گەڕان بۆ بە جێ هێنانی پرسە، ڕۆیشتمە دیوی تایبەتی خۆم و ئامادەی نوێژ بووم بەڵام هێشتا نوێژم دەستپێی نەکرد بوو کە زەوی

---

١٠٩- مردنی ئەبولحەسەن خان کوڕی شوجاعوددەولە و بە شوێن ئەو مردنی شوجاعوددەولە، خۆی، و پاشان مەرگی هاوسەری، و لە هەموویان گرینگتر لە دەست چوونی فیرووزە، هاتنی وەبا و هەروەها بوومەلەرزەی کاولکەری قووچان، هەر هەموویان پشت سەری یەکتر بە فاسڵەی چەند رۆژ لە قووچاندا ڕوویدا.

١١٠- هۆی سۆزرەت بوونە کە هەواش گۆرا بوو، قووچانی کوێستانی، کە هاوینی هەر وەک زستان بوو، لەم ساڵە زستانی وەک هاوین گەرم بوو، ٢٧ی خەزەڵوەری ١٢١٢ هەتاوی.

لە ناکاو لەرزی و هەموو شتێکی دیوە کە جوولایەوە، و بە جارێ زەوی وا جوولایەوە کە حاڵەتی گێژی و بەلاجەوی هاتە ڕوو و هەموو کات لەگەڵ کەوتنە خواری تۆزی گەچ و ئاجۆر لە دیواری ماڵەکە بە فەرمانی «اَلفرار مِمّا لا یطاق» لە دیوەکە هاتمە دەرەوە، هێشتا نەگەیشتبوومە حەوشێ کە دیوەکە بە تەواوی کاول بوو، بەڵام شوکر خوا هیچ زیانێکم نەدیبوو.

درێژەی بوومەلەرزەی هەوەل دوو دەقیقە و دووهەمی سی، چل سانیە بوو. دوو ساعەت و بیست و هەشت دەقیقە لە شەوی شەممە، هەشتمی مانگی جەمادییولئەوەڵی ۱۳۱۱ تێپەڕی بوو کە ئەم بوومەلەرزەیە رووی‌دا. [شەممە شەوی ۲۷ی خەزەڵوەر ۱۲۷۲][111] لەو دێهاتە زۆربەی ماڵەکان خراپ و هەندێک ئاژەڵ و حەیوان مردن. هەر ئەو کاتە لە نێو کاغەزێک نووسیم و بۆ ڕاگەیاندنی ئەم ڕووداوە، کەسێکم بۆ قووچان نارد، بەیانی ئەو کەمە کە نارد بووم، هاتەوە و هەواڵەکانی قووچانی هێنا.

بە هەر جۆرێ بو ڕۆیشتم بۆ شوێنی ئاسایشی خۆم و بە تەواوی داخ‌دار بووم. و لە بەر ئەوە کە شەو بە بۆنەی ترس لە بوومەلەرزەکە جوولاندنەوەی زەوی کە دیسان لە هەر سەعاتدا دەهاتەوە هەر نەخەوتبووم، بە تەواوی ماندوو بوون و ژاکاوی هەر کە ئارام بوومەوە و خەوم لێکەوت لە ناکاو بوومەلەرزەیەک وەک یەکەم بوومەلەرزە هات و زەوینی بە توندی جوولاندەوە و دەنگێکی تۆقێنەر لە کێودا پێچرا و بەردە گەورەکان ڕژانە خوار. بەڵام سپاس بۆ خوا کە زیانێ بە کەس نەگەیشت. بەڵام ئەم دەنگە لە کاتی بوومەلەرزە هەوەلیەکە هاتەوە... لە نێو ڕێگا هەندێک قەلا و بقاعم دی، بە راستی سەرم سوڕما، ئەسەواری بوومەلەرزە هەر دیار نەبوو. لە خەیالمدا دەمگوت کە بوومەلەرزەی قووچانیش بەو جۆرە کە دەیانگوت نییە...[112]

وتم لەمانەوە لە قووچاندا زۆر ئەترسام و لە دوای حەوت ساعەت کتوپڕ ڕێ

---

[111]- ڕۆژشمێری یەکسەد و پێنج ساڵەی هاودەقی- نەجەف ئابادی- ل ۵۸.

[112]- لە نێو ئەو ساڵانە لە دەور و بەر قووچان بوومەلەرزەی سەختی‌تریش ڕووی‌دا و بوو بە هۆی کاولیی زۆر، بەڵام چونکە زۆربەی کەلاوەکان لە نێو دێهاتەکاندا بوو، خەلکی شار پێیان نەدەزانی. لە پەراوێزی کتێبە دەستنووسەکەی [زادولمەعاد] کە لە باوکم شێخ ئەسەدوڵلا تەوەحودی بە دیاری مابوو، سەبارەت بە بوومەلەرزەی ساڵی ۱۲۸۸ی مانگی، کە لە هیچ کوێ ناوی لێنە برا بوو، وا هاتبوو.

کەوتم، بینیت کەچی ڕووی دا؟ و چۆن شۆڕشێک ڕووی دا؟ ئەگەر قسەکانی ئێوەم گوێ بدایە ئێستا لەبەین چووبووم. جوابیان داوە:

ئەوەی کە من وتم دوو ڕۆژ لە پێش ڕۆشتنی ئێوە بوو، زۆر جاران پێش ئەو واقیعە، یەک ڕۆژ سەردانم ئەکرد، لەم ترسەگەورە هەواڵم ئەدا تۆ کەئەتزانی بۆچی ئەو هەواڵەت بە خەلکی شار نەئەدا تا لە ناو نەچن؟ وتم خۆتان چیتان کرد؟ جوابیان داوە: من بەپێ عادەت لە نیوەشەودا لە کۆخەکەی خۆم ئەهاتمە دەرەوە و خەریکی ڕێگا ڕۆشتن ئەبووم، ئەزقەزا هاتنی بوومەلەرزە لەگەڵ کاتی ڕێگاڕۆشتنی هەرشەوەی مندا ڕووی دا، ئەوەیە کە ئەم ماڵ و خانوانە هەر هەموویان وێران بوون و من بەسلامەتی دەرچووم.

دیم کە ئەم جوابە لەگەڵ قسەکانی پێشوومدا جیاوازیان هەیە، بۆیە بێدەنگ بووم و خواحافیزیان لێم کرد. کە بە شاری قووچان گەیشتم و چوومە خێوەتەکەی خۆم. هەمان موحەممەدناسرخانی شوجاعودەولەم دی کە لە بەڕێکردن گەڕاوەتەوە و چۆتە خێوەتی تایبەتی حاجی حسەین عەلی. گوتیان چەند ڕۆژێک لەوێ بمێنینەوە بو ڕاو و گەردش، لەگەڵ ئەوەشدا سەردانی ئەو شوێنە بکەن کە شاری تازەی لێ دروست ئەکرێ. ڕۆژی دوایی هاودەنگ لە قووچان ڕۆیشتن و خواحافیزیمان لەیەکتر کرد. موحەممەد ناسرخانی شوجاعودەولە و حاجیحسەینعەلیخان بۆ ئەو شوێنە دیاری کراوە (جێگای ئێستای شاری قووچان) ڕۆیشتن، ئەمنیش ڕووبە کەعبەی مەبەستم ڕێگەم گرتە بەر، سپاس بۆ خوای بەرز و بێ هاوتا گەیشتم بە خاکی پیرۆزی ژێر پێی پێشەوای هەشتم پارێزەری ئوممەت سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێ[١١٣]

کۆلۆنێل ییت سیخوڕ و فەرمان بەری شاژنی ئینگلیستان لە هیندوستان و ئەفغانستان و ئێران هەروەکوو لە ساڵی ١٨٩٣ی زاینی بۆ لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی ئێستێراتیژیکی و نێزامی قووچان هاتبووە ناوچە، ئاوا باسی بوومەلەرزەکەی شاری قووچان ئەکا:

---

١١٣-کۆتایی هەواڵ و ڕاپۆرت کوڕی کۆچ کردووی خواڵێخۆشبووی میرزا محەممەد ئیبراهیمی موجتەهێد عەسکەری ڕەزەوی بۆ شازادە موعتەزێدوسەڵتەنە.

له ١٧ی نوامبر بوومەلەرزەیێکی قورس شاری مەشهەدی هەژاند. بە هۆی ئەوەوە شاری قووچان له ٩٢مایلی مەشهەد وێران بوو.[١١٤]

بە بۆنەی کۆچ کردنی ئەمیرحسەین‌خانی شوجاعودەولەی ئیلخانی زەعفەرانلوو نووسراوە:

ئەمە چ واوەیلا و شیوەنێکە، ئەمەچ گریان و نالینێکە، هەستاوە لە ناوچەی چوارەم تا ئاسمانی حەوتەمین.

ژن و پیاو، پیرولاو، گەورە و چکۆلە، دەبینم تەواو وان له گریان و قوڕ پێوان.

وڵات خەمبارە، خەڵکی خەمبارە، ناڵەو هاوار له ئاسمانە، فرمێسک و خوێن لە داوێنە.

ناو چاوانەکان قوڕاوین، لە بێ‌دەرەتان و ناسراو و نەناسراو ئەسپەکان دەبینم کەلە چەپ و ڕاستەوە ڕەشپۆشن.

ئەو تابووتە چیە کە پۆشراوە بە پارچەی ڕەش وەکوو خۆری گیراو لە ئاسمانی چوارەمین؟

خۆر کەگیرا دەنگی مس بەرز دەبێتەوە. لەجێگەی لێ‌دان لەمس دەدەن لەسنگی خۆیان. بۆچی خەڵکی وان؟

بەڕاستی له نێو ئەم تابووتە خەوتووە ئامۆژگاری کەرێکی بەناز، پرشنگی ڕۆژ هەڵات خەوتووە؛ ئەمیری راستگۆ.

ئەوەی شانس ڕووی تێ‌کردبێ له دەوڵەتداری‌دا.
ئەوەی لەمەیداندا سوارچاکانی قارەمان دەسووتێنێ.
سەر ئەنجام تیری ئەجەل لەکەوانی هەستی هاتە دەر.
پاشای سەرکەشی ڕام کرد، گرتی و چاک هێمنی کرد.
له کوێیە شێری مەیدان.لەکوێیە چاک سواری دەشتی پیاوەتی.

لە غەمی کۆچی ئەودا ژن و پیاو، پیرولاو، لەپەژارەدان پەناگای پیرولاو، غەمخۆری پیاو و ژن له کوێیە؟

ڕۆژی ڕووناک، تاریک بوو له خەڵکی دوور ونزیک، له کوێیە ئەوەی کە ڕۆشنایی

---

١١٤- خوراسان و سیستان .وەرگێڕاوەی قودرەتوڵڵای زەعفەرانلوو.

چاوی خزم و کەس و کار بوو.

داوێنی کراسی سەبری جیهان درا، ئەوەی کە وا دامەنی جیهانی بە دەستەوە بوو لە کوێیە.

هەر کەسێک دۆستی ئەو بوو، خوێن لە چاوی ئەباریێ. ئەوەی کە وا بە شمشێری تیژی خوێنی ئەخستە دڵی دوژمن لە کوێیە؟

دەنگی شیوەن و زاری هاوەڵان لە ئاسمان تێپەڕی. ئەوەی کەوا ترس و ئێشی دەخستە دڵی دوژمنان لە کوێیە؟

سنگی ئێمە لەژێر باڵی ئێش و غەمدا ئەشکێ. ئەوەی کەوا بەخشش و کەرەمی بۆ ئێمە بوو لە کوێیە؟

دڵی ئێرانی هێناوەتە ژان، دڵی ئەفراسیاب و ڕۆستەم چی لێ هات؟ ئەم ناوداری بیژەنە لە کوێیە؟

دەستی ئەو کانیاوی بەخشندەیی و سەرچاوەی نێعمەت بوو. هاوار ئەو کانیاوی بەخشندەییە لە کوێیە، خوایە ئەو سەرچاوەی نێعمەتە لە کوێیە؟

تا ئەو بوو، گیانی ئێمە لە ئاسایشدا بوو.

بەرگری خراپەکاری بوو

ئەی ئاسمان پشتی پادشات شکاند. مەخابن درگای ڕەحم و بەزییت لە مرۆڤ بەست.

ئەی گەورەی من پاشا خەوتووە. کاتی ئیش نیە، شوێن ئیشی خۆتان بکەون. ئەمڕۆ ڕۆژی ئیش و کار نیە.

ئەگەر بۆ بەڕێ کردنی ئەو هاتوونەتە سەر سنوور. ئەو ئاهەنگی چوونی نیە.

ئەگەر بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکەی لەگەڵ خۆتان پزشکتان هێناوە، قوڕی جیهان بەسەر ئێمە، پێشەوای ئێمە نەخۆش نیە.

ئەگەر بۆ بوونی گوڵان بۆ ئێرە هاتوون، چەقڵ لە چاومانایە، کاتی چنینی گوڵ نیە.

ئەگەر ئەتانهەوێ ئەو دەستە گەوهەرینە ماچ کەن، ئەو دەستە پیرۆزە گەوهەر نیە.

ئەگەر ئارەزووی چاوپێکەوتنی سەرۆکتان لەسەردایە، کاتی چاوپێکەوتن نیە.

ئەگەر ئیش و کارتان بەوە، بەرەو مەشهەد برۆن....

ئەوەی کە وا غەمخۆر و پارێزەری ئێوە بوو ئـەی مخـابن لـە دەسـت چـوو، بـە داخەوە، بە داخەوە تازە ئەو غەمخۆر نیە. ئەو باوکە لە نێوان ڕۆیی. ڕووبکەنە ڕۆڵـەی ئەو لەگەڵ عەلی پەیمان ببەستن. ئەحمەدی هەڵبژێردراو نیە.

هەتاو لە ئاسمانی پیرۆز گەر ئاوا بوە، جێنشینی مانگی چواردەیە جێگەی هـیچ مل هەڵسووڕانێک نیە.

گەر شوجاعودەولە ڕۆیشتوە بەویستی خوا بوە.

ئەی لاوی خـۆش شـانس بـەردەوام بـێ خـۆش شانـسیت و پـیرۆز بـێ لێـت کۆڵەکەی مەقامت هەروەکوو ئاسمان قاییم و قۆڵ بێ.

ئاسمان تا گوارەی مانگی لە گوێ دایە لە بەردەرکی دەولەتی بەرزی تۆدا بێ.

لە ڕووی کینە و حەسادەتەوە گەر چاوێ بۆ تۆبڕوانێ، ئەو چاوە بێتە دەر.[115]

گەرچی باوک بە فەرمانی خودا مردووە، لەهەموو سەردەمان نـاوی چـاکی ئـەو لەتۆدا بدرەوشێتەوە.

گەر پیاو خراپان سەرنەخەنە بەردەرگای تۆ، ئەوسەرە بکەوێتـە سـەر خـاک بـە شمشێری مەرگ.

تا لە هاتوو چوودایە ئەم ئاسمانە، لەگەڵ کوراتدا شانس و دەولـەت ڕوو لـە تـۆ لەهەرچوارلاوە بەردەوام بێت.

هەرکەسێک چاوی هەڵـنایا ڕوو سـووری تـۆ وەکـوو سـێوی سـوورببینێ ئـاگر لەدەمی بەربێ و دەم و دیانی پڕ بێ لە خوێن.

تا هەموو مانگ و ڕۆژ دەدرەوشێن هەر لە زەوین تا ئاسمان ئەستێرەی شانی تـۆ لەو پەڕی سەربەرزی و شەرەفـدا بێ.

زمانی من –سەبووری– وەک شمشێری تـۆ بـۆ پارچەپارچـە کـردنی تەمـەنی دوژمنت بوڕەندە بێت.

---

١١٥– ئامازەیە بە ناوەڕۆکی تێلگرافەکەی ناسرەدین شا بۆ محەممـەد کـوڕی ئـەمیر حـسەین خان کەگوتبووی ئەگەر شوجاعودەولەی پیر ڕۆیشت با کێک نیە، چونکە شوجاعودەولەی لاومان هەیـە پێویستە هەرچی زووتر بێتە سەر سنوور و بیدەیتە دەستی ڕووسیە.

## بۆ کۆچی دوایی ئەبولحەسەن خان زافەرانلوو[116]

بە دنیاییک دڵ خۆش مەکە کە خودا لە قورئاندا سەبارەت بەو دەفەرمێ (کل من علیها فان)

بەم پیرەژنە دنیا بێحەیایە دڵ خۆش مەکە
کە پیر و جوان زۆری کوشتووە بێ تاوان

داوای وەفا لە خێلی جەفا مەکە. لەبەر ئەوەی کاروباری ئەو هەر کڵاوە و کڵاو بەسەرنان. ئاوڕ لە ناز و کرشمەی زاڵ مەدەرەوە. دەزانی ئەم نازە زۆری لە زاڵ و ڕوستەمان کوشتووە.

شەراوی مەیگێڕان هەمووی خوێنی دڵە. تۆ خوێنی دڵی خۆت مەخۆ و جامەکەی لێ وەرمەگرەوە.

نامۆ و غەریب و دوورخراوە لەزێد کوژایەوە.

لە خاکی غەریبیدا نێژرای، قوڕبەسەر دەوران. داد لە دەستی ئەو شێوە شیرینەوە وەک مانگی هیلال.

داد لە دەستی ئەو باڵا نەونەمامەوە وەک سەروی عەیار.

بەرەو ئاوات ڕۆیشت بەڵام ئاواتی مەرگی بۆ وەدەستهێنانی نان بوو، ڕۆیشت و بە دەستی نەهانی.

هاوار لەو هەموو هیوایە و لەو هەموو ئارەزوویە کە هەمووی بە دەستی مەرگ لە چرکەییێکدا لە ناوچوو. چل هەزار بنەماڵەی عەشیرەتی زەعفەرانلووی گەورە بوو و لەو هەموو کەسە، کەست لە لاوە نەبوو. ئەو دڵەی کە بۆ کۆچی دوایی ئەو نەتوێتەوە وەک مۆم ئەوە کەی دڵە! نانا ئەوە ئاسنە. جێ سەرسوڕمان نیە. کاتێ کە

---

١١٦- شاعیر وای ڕادەگەیەنێ کوژرانی ئەبولحەسەن خان بۆ ئەمیر حسەین خانی شوجاعودەولە زۆرگران بووە و بەڵام بە هۆی ئەوەی ناسرەدینشا فەرمانی کوشتنی دا و هەروەها ئەمیر حسەینخانیش زۆرپیر بوو توانای بەربەرەکانی پێ نەمابوو وادیارە بەم کارە ناسرەدین شا تۆڵەی ئامۆزاکەی کردەوە کە دە ساڵی ڕابردوو لە قووچان کوژرا بوو. دەڵێن ئەبولحەسەنخان کوڕێکی ئازا و لێهاتوو بوو و زۆر لە دڵی خەڵکدا جێی بووە و بە باشی ناویان لێ بردووە و ژنێکی لادێیی خواستووە لە ئاوایی عەلی ئاوای قووچان.

گەورەییت دەنووسم هەمووی پەنجەکانم بسووتێ.
خوزگە هەر لە سەرەتاوە نەتمناسیباى کە ئیتر وەکوو ئێستە گڕم تێ بەر نەدەبوو.
دەردەکەت بە ڕاستی بێ دەرمان بوو، ئەگینا بە هەر شێوەیەک بواى دەرمانمان دەهانی.
دەردەکەت سارێژی نەبوو ئەگینا بابت هەمیسان حەزرەتی مەسێحی دەهانی.
تۆ لە باب و بنەماڵەت بە دوور بووی، ئەگینا بابت خۆی و عەشیرەی دەکردە قوربانی ڕێگەکەت.
هیچ شتێ ناتوانێ ببێتە هۆی دڵنیاییمەوە جگە لە براکەت واتا موحەممەد ناسرخان
سەبووری[117] قەڵەمی بۆ کۆچی دوایی تۆ گرتە دەستەوە.
ئەم شێعرەشم کەلەباخی بەهەشتەوە هەڵقولاوە و دەڵێ هیوادارم ئەبولحەسەن خان بە بەهەشت شادبێت.[118]

## بەهاریەییک بۆ پێدا هەڵگوتنی موحەممەد ناسرخان شوجاعودەوڵەی ئیلخانی زافەرانلووی حاکمی قووچان

بۆ دیاری کردنی بەختەوەری و سەروەری
هەمیسان جێژنی نەورۆز واهاتەوە
خەڵاتیەکەی خۆم ئەی مانگی تابانم
ئەوەیەکە ئەمڕۆ دەبێتە هۆی ڕەونەقی دانیشتنەکانەوە
گوڵ هاتەوە ئەو گوڵەی کە دەبێتە هۆی ڕەونەقی گوڵشەنەوە
وەنەوشە وەک خەتی تۆ تازە و تەڕە
تا عومقی ڕۆح گەشێنێتەوە

---

١١٧- میرزاکازم سەبووری ساڵی ١٢٥٩ی کۆچی مانگی لەمەشهەد هاتە دنیا و بە فەرمانی ناسرەدین شا، نازناوی مەلەکوششوعەرای پێی درا و تا لە ساڵی ١٣٢٢ کۆچی دوایی کرد و لە باخی تووتی دا بە خاک سپێردرا.

١١٨- دیوانە شێعری مەلەکوششوعەرا سەبووری، چاپ تاران، ئیبن‌سینا، لاپەڕەی ٢٨١

لەتەنشتی کانیەکانەوە کەسکایی سەوز بووە
تۆ وابیر دەکەیەوە ئەوسەوزاییە، خزری پەیغەمبەرە
کەلە کەناری ئاوی حەیوانەوە دانیشتووە
ئەرێ ئەی مانگەکەم لەبەرانبەری تۆوە
بتی جوانی خوا پەرستی پەست و بێ بایەخە
شەراوی لەعلەکەت نۆشی گیانی ئێمە بە
کە شەراوی لەعلی هەیە لە نێو ئەو پیاڵەیەدا
ئەتۆ بۆی عەتری تەواو ڕەنگی مەرجان بکە
بادی سەبا سەری سونبولی شانە دەکرد
هەوایش ڕوخساری گوڵی ئاڕایشت دا
لەیەک شوێندا گوڵ و گوڵستان خۆی نواند
بۆیە بولبول لە بۆی گوڵ و گوڵستان مەست و سەرخۆشە
بۆیە لە گوڵستانە ئەوەند ئەو بولبولە دەنگی زۆلاڵە
هەمووی منداڵانی باخی کۆکردۆتەوە
ڕوویان کردووە لە گوڵستان و خۆشی ڕادەبوێرن
گوڵاڵە سوورەیەک بووەتە گوڵدەستەی هەموان
نەرگسی ئیتر ڕەنگ و ڕوخسارەیەکی بۆ نەماوەتەوە
بۆیە وەکوو هەوری نەیسان فرمێسک دادەبارێنێ
چەمەن ئەگەر لە زستاندا دەسەڵاتی لێ برا
پیر بوو و هەمیسان جوانی وەدەست هانیەوە
بۆ بۆی گوڵ بادی سەبا ڕوو لەهەر لایەک دەکا
تۆ وابیردەکەیەوە ڕەوانەی لەشی مردوو بووە
ئەو هەوایەی کەلە جەستەی شاخەکانەوە بووە
ئەگەر چرایەک دەیەوێ خۆی لە بای مردن بپارێزێ
بۆچی لەتەنشتی ماڵ و گوڵستانەوە بێت
چرای لالە کە ڕۆناک بۆتەوە
زۆرتر هانی باکەدەدا کە ڕوو لە جەماوەر بکات

چرکە لە دوای چرکە لە گولستاندا گەشە دەکات
ئەریٚ ئەی تورکی شەکرلێو تاویٚ بۆم بڕوانە
جەللادمەبە و ئەوەندلە خۆبایی مەبە
ئەی جوانترین جوانەکانی جیهان لەبۆشکەوە ڕوولەباخ بکە
کە هەموو جۆرە گولێک سەریان پێوە ناوە
وەک حووریەکانی بەهەشت کە سەردەردێنن
بۆم تێکە شەراوێکی خاوێن و خۆش
کە هەمسیان هاتەوە بەهارێکی تازەتر و خۆشتر
ئەم کۆڕەت بڕازێنەوە ئەریٚ ئەی ساقی کەوسەر
لەو ئاوەی کە وەکوو ئاگرگیان گڕتیٚئەخات
کە سوروشتی خاوی مرۆڤ چاک دەکاتەوە
شەرابێک کەلەشەوقیدا بەرق عارەقی خەجاڵەتی دەتکێنیٚ
و لەجامیدا عەقڵ و هۆشی مرۆڤ غەرق بووە
ئەگەر لەڕۆژئاوا یان ڕۆژهەڵاتەوە بیخۆنەوە
کەس نامێنیٚ کەتاکوو بۆی دەرکەویٚ
کە ئەمەیە هەتاویان خۆرە تاوە؟!
لە ئەو دەسپەروەردەی شەرابە کە لە خورما وەدەست هاتووە
کەوەک دڵی عارفان پاکە و خاوێن
ئەگەر دلۆپێکی لەسەر زەوین بڕژیٚ
ئەو خاکە تا دنیا دنیایە بۆنی عەتروخۆشی دەدات
و بەرنامەی ڕۆح و بۆی ڕەیحان بە خۆی دەگریٚ
وەها شەرابێک لەوەها ڕۆژێکدا زۆر بەجێگەیە
بە تایبەت ئەگەر نازێکی وەکوو تۆ بیخواتەوە
نە سەرخۆشی و هەستی دەهێنیٚ و نەش دەبێتە هۆی دەردەداریەوە
بۆ ئەوکەسانەی کە ئاوەها ساقیێک و شەرابێکی هەیە
خۆش بیٚ ئەم خۆشیە لە ئەوە وەک ئەمیرتوومان
ئەمیرێک لە ئەمیرە گەورەکانی ئەم جیهانە

مەگەر خوای مەزن ئەوی خەلق کردبێ
هەم دینی هەیە و هەم دنیایشی دەوێ
ئاسمانی عەزەمەت و هەتاوی کورات
شوجاعودەولەی سەرۆکی خوراسان
هەر لەسەرەتای منداڵیەوە
سێسەد نیشانەی گەورەییم لە ئەودا دەبینی
کە دەمبینی بە ئەو بەژن و باڵاوە
وام دەزانی قیامەت هاتووە
لە هێزی ئەو دوژمنی تەنگی لێ هەڵدەچنرا
غوڵامی کە خۆی پەروەردەی کردبوو
وەخۆیشی دەسەڵاتی پێی دا بوو
جاروبار بێ پەردە و جاروبار لەپەردەدا بوو
و نەخۆیشی ئیتر ئەمیری کردبوو
کاتێ کەبێ فەرمانی کرد وەها درابەعەرزا
کەپێم وانیە ڕۆژ حەشر زیندوو ببێتەوە
وەها کەسێ کە لەگەڵ گەورەی خۆیدا دوژمنایەتی بکات
دەبێ وەها تووشی گیرو گرفت ببێ.
تا ببێتە عێبرەت بۆ هەمووی جیهان
لەڕۆژیشەڕدا کە دژی دوژمن دەوەستێ
بە ئاوی تێخی، ئاگری دوژمن ڕۆشن دەبێ
ئەمیری شێرگیری، شێرجەستە
دڵی خۆی دا دەپۆشی لە ئاسن
ڕۆستەم توانای پێکدادانی ئەوی نیە
ڕۆستەم بەدیتنی شوجاعودەولە زاڵەی دەترەکێ
لەخەوڕادەپەڕێ بەلام بێ گیانە
ئەی ئەمیر تۆ ئەمیرزادەی
ئەمیری شێرکوژ و شێرگیری

بەیەک شمشێر دژ بە دووسەد کەس دەوەستی
لەدەسەڵاتداریش‌دا تۆ ڕاوێژکەر وڕاوێژکاری
بۆ نەتەوە تۆ هەم پەنا و هەم چاوەدێری
سەبووری ئەوەی کە خەریکی پێداهەڵگوتنە
و ڕاستبێژێکی ڕاستەقینەیە
ئەوەیکە گەورەیی بۆ تۆ تەرخان کردووە
ئەو ئیخلاقە بەرزەت و بۆیە سەبووری هەمووکات باست دەکات.

## موحەممەد ناسرخان شوجاعودەوڵە بنیاتنەری شاری قووچان

وەک گوتمان پاش خراپ بوونی شاری قووچان بە هۆی بۆمەلەرزەوە ناسرخان و حاجی حسەینعەلی خانی بۆ لێکۆڵینەوە لەشوێنێک لە ڕۆژهەڵاتی قووچان ڕۆیشتن تاکوو شوێنێکی باش بۆ بنیاتنانی شاری نوێ بدۆزنەوە، هەروەها لەو گوزارشتەدا هاتووە کە زۆربەی خەڵکی قووچان خێرا لەو شارە وێرانەیەدا خەریکی دروست کردنی ماڵ بوون و هەرلەوێ مانەوە. هۆی ئەوەی کە بۆچی خەڵکی قووچان پاش بۆمەلەرزەکەی ساڵی ١٣٩١کۆچی ئەو شوێنەیان بەجێ نەهێشتووە و نەهاتنە شاری تازەوە وادیارە موحەممەدناسرخانیش بۆی دەرکەوت کە خەڵک حەزدەکەن لەو شارەدا بمێننەوە.حەزی نەکرد زۆریان لێ بکات. بەڵام بەداخەوە لە نیوەی ئاخری مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٣١٢ی کۆچی بۆمەلەرزەیێکی خراپ ڕووی داو هەمیسان شارەکەی وێران کردەوە دوایین ڕۆژەکانی بەفرانباری ساڵی ١٢٧٣ی کۆچی.

خوالێخۆش بوو حاجی موحەممەدتەقی‌خانی لەم بوارەدا چەند پارچە شێعری جوانی داناوە کەلە پەرتووکێکی ١٦ لاپەڕەییدا چاپ کراوە ساڵی ١٣١٤هاتۆتە بازاڕ.

دوو ساڵی پشتێ سەریەک دوو بۆمەلەرزە لە ئێمەی دا و هەموو ژیان و ماڵ و کەل‌وپەلمان لەدەس چوو. یەکەم شەوی ٨ی جیمادیولئەوەلی ساڵی ١٣١١ی کۆچی و ٢٧ی گەلاڕێزانی ١٢٧٢

دوێنی دوو ڕۆژ پاش هاتنی مانگی ڕەجەب لە چاشتدا ڕووی دا؛ بەڵام زۆر

گران‌تر لە هی‌پاربوو. لەیەکەمین بۆمەلەرزەدا بە گوێرەیەک دەڵێن لە قووچاندا دەهەزار کەس کوژراون. بەڵام لەبەشی دوایی ئەم ڕووداوەدا کوژراوەکان ناژمێردرێن. ئەی هاوار حەمامی پاچنار بە یەکجارەڕژایە سەر خەڵکی شاردا.

بزانە لەم ڕووداوەدا شەش هەزار کەس کوژران
بە هۆی زڵم و زۆری دەورانەوە
لەلایەن خواوە تۆڵە و عەزاب هاتەسەر خەڵکی قووچاندا
زۆربەی لاوانی ئەم دەڤەرە بوون بە قوربانی
واتا لەهەشتەمی جیمادیولئەوەڵ لە کاتی نووستندا.

هەروەها ئاماژە دەکات بە ئەوەی کە ناسرەدین‌شا جگە لەوەی هیچ یارمەتێکی بێ پەناکان و لێقەوماوانی نەکرد؛ تەنانەتماڵیەی زۆرتری لە چاوی جاران نایە پایان.

تەنانەت کافریش دڵی بۆمان دەسووتا
کەچی پاشای ئێمە ماڵیەمانی زۆرتر کرد لەسەرمان
هەرچەندەی لێ پاڕاینەوە بەڵام ئەو هەر زۆری کرد و ڕەحم و بەزەی پێماندا نەهات
پاشا لەجیاتی بەزە،لێیشمان تووڕەبوو
ئەی شاریاری تووس تۆ دەردی ئێمە دەرمان بکە
هەموان بە هۆی قین و کینەوە تانەوتەشەرمان لێ دەدەن
چ لە ناو کەرستەی مۆسیقا و چ لە دەنگی گۆرانی دا
پیاوێک سەبارەت بە بوومەلەرزەکە پرسیاری کرد وگوتم
گەورە وچووک خەریکن تانەمان لێ دەدەن .

پاشان شاعێر ئاماژە دەکات بەمێژووی تەواو بوونی بنیاتی تازەی شاری قووچان:

قووچانیەکان هەموو بە ئەوپەڕی خۆشیەوە
هاوکات بە هۆی چەڵەمەی زۆرەوە تووڕەش بوون
ئەوەندە کوشتەیان دابوو نەبێتەوە
وەک بولبولی هەزار، هەزاران ناڵە و هاواریان بوو
لەبەر ئەوەی دەیانئەویست شوێنی ژیانیان بگۆڕن
سێ ساڵ لەشەڕوپێکداداندا بوون
هەرکامەیان حەزیان لەژیانی شاری تازە بوو

خێرا ڕوویان تێ کرد
شاری نۆی دووروئێمەش کەیلین
ئێمە لەقافڵەی دۆستان بەجی ماین
بەبێ ئەوەی توانای بەرگریمان ببێ لەچوونی یاران
ئێمە لە کەلاوەکاندا ماینەوە و یاران ڕۆیشتن
سەبارەت به مێژووی ئەم ڕووداوە خواناسێ گوتوویە
[باری خراب ىٚمده قووچان زلزله]

هەروەک لەبەیتی دواییدا دیارە شاری قووچانی نوێ لە ساڵی ١٣١٤ی کۆچی بنیات نراوە. ئەو کەسانەی وا حەزیان دەکرد لەوێ ژیان بەرنە سەر لە شاری وێرانی کۆنە قووچانەوە ڕوویان کردە ئەوێ. کەچی خواڵێخۆش بوو فانی ئەڵێ دەستەی لە یاران و هاووڵاتیان چوونە شاری تازەوە و کەچی ئێمە هەرماینەوە.

لەم شێعرەدا وادەردەکەوی کۆمەڵگای ئەو کاتەی قووچان دووجۆر خەڵکی بەخۆوەناسیوە واتا تاقمی هەژار کە هەر لە کۆنە قووچان مانەوە و تاقمی دەسەڵاتدار کە ڕوویان کردە شاری نوێوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی نێوانی ئەم دووشارە زۆرپێکەوە دوورنیە وا دەردەکەوی کە تۆزێ شاعێر زۆری داوەتەبەری.

سەبارەت بە بنیاتی شاریش دەبێ بڵێین زەمینەکەی هەر ملکی شوجاعودەولە بوو، موحەممەدناسرخان خۆی تا ئاکامی کارەکە وەک کاریگەرێک لەوێ حازربوو و هەموانی بۆ کاری چاکتر هان دەدا و بۆیە جیاوازی نەخستوە نێوانی کەس، وادیارە ئەوانەی کە شاری کۆنەیان بەجێ نەهیشتووە حەزیان نەکردووە نەرێت و ئەدگاری ناوچەکەیان بەجێ بهێڵن. ناسرخان لەسەر حەزی خەڵک ئەو کارەی کرد و ئەوشارەی بنیات ناوە.

سەبارەت به بنیات نانی شاری قووچانی نوێ، بەڕێز شاکری نووسیووە:

موحەممەد ناسر خان شوجاعودەولە کە بۆ بنیاتنانەوەی شاری تازە هەوڵی داوە و هەموو کاتیش سێ کەس لە مامۆستایانی ئایینی لەگەڵدا بووە وەک شێخورڕەییس، حاج شیخ عەلی ئەسغەر پاڵەوانی بە ناو بانگ و ناسراو بە شێخ عەلی ئەسغەرکەبیر و ئیمامی جومعە کەهەر کەس لە قووچانی کۆندا ساڵ و ملکێکی

وەک حەمام و کاروانسەرای بوو بێ، پارەی زەوینی نـوێ لێـی وەرنـەدەگیرا و خێـرا بەڵگەی خاکی تازەیان دەدا بە دستیەوە.

خودی ناسرخان هەموو حەوتەیەک لە ناو شاردا گەشتێکی دەخوارد و فەقیرانی دەدۆزیەوە و یارمەتیانی دەدا و هەر بۆیە خێرا توانیان قووچان دروست بکەن.[119]

ناسرخان شوجاعودەوڵە نەخشەی شاری تازەی بەپێی نەخشەی شـاری عێـشق ئاباد دەکێشا کە وەکوو شـەترەنج بـوو و بـۆ دابەزانـدنی ئـەم نەخـشەیە ئەنـدازیار و سەرتیپ عەبدورڕەزاق‌خان یارمەتی زۆریـان داوە. دەسـەڵاتی ئێـران یارمـەتی ئـەم خەڵکەی نەداوە؛ بەڵام ڕووسیەکان بۆ وەدەست هێنانی دڵی خەڵک و دەسەڵاتداری ئەوێ یارمەتی زۆریانی داوە.[120]

مسیو سمبالێنکۆ ئەندازیای کانزای ڕووس کە بە فەرمانی کوتووپاتکین هـاوڕێی تاقمێ تەبیب و پەرستار ڕەوانەی شاری قووچان بوو

## ڕاپۆرتی ئەندازیارێکی ڕووسی سەبارەت بە بۆمەلەرزەی قووچان

میسیوو سەمبالێنکو ئەندازیاری کانزای ڕووس لە ڕۆژنامەی نەودیەوڕیمادا ڕاڤەی بۆ نوسیووە و سەبارەت بەو زلزلەیە دەڵێ لەبەرواری ٥ی نوامبر لە شارێکی ئێـران بـە ناوی قووچان کەلە حەڤدەفرسەخی باشووری عێشق ئاواوەیە کەبـە تـەواوی وێـرانی وێران بوو جگە لە قووچان چەند گوندی دیکـەش یـان ناوچـەی چادرنـشینگەل کـە

---

١١٩- جوغرافیای مێژوویی قووچان کاری «ر.ع»شاکری، لاپـەڕەی ١٢٠، پـێش ڕاپـەڕینی گـەلانی ئیران شەقامێک ناونرا بوو بە موحەممەد ناسرخان پاشان گۆڕدرا.

١٢٠- دەسەڵاتی ئێران، کە لە لایەن خۆیەوە هەریارمەتی خەڵکی نەئـەدا و لێـرەدا بـڕوانین بـزانین ئێعتمادوسسەڵتەنە سەبارەت بە شوجاعودەوڵە چی دەڵێ.

یەک شەنبە ٥ی موحەڕڕەم ١٣١٣ حاکمی قووچان کە کوڕی شوجاعوسسەڵتەنەیە و ڕووسەکان زۆر بە دەستیەوە دڵگیرن و حەز بە دەسەڵاتی ئینگلیزی دەکەن.

هەروەها لە زۆربەی شوێن‌دا هۆی نەهامەتیەکانی خوراسان بە شوجاعودەوڵە دەزانی لەم سـەردەمدا نەهامەتی و فتنە و چەوساوەیی هەمووی وڵاتانی گرتووە. لە ئێران‌دا و بـە تایبـەت تـاران کـە هـەر چەند ناوچەی دەسەڵاتیشە بەڵام بە هۆی زەعفی پاشایەتی و لە ئاوی لـێڵ ماسـی گـرتنی ڕووس و ئینگلیز باش هەلێکیان بۆ ڕەخسا بوو و پاشاکانی ئێرانی هەر خەریکی ڕابواردنی ژیانی خۆشی خۆیان بوون.

لەدەوروبەری قووچاندا بوون بەتەواوی وێران بـوون. هاوکـات دەڵـێ کاتـێ هەواڵـی دڵهەژێنی ئەم کارەساتە گەیشتە گوێ کووروپاتەکینی سەرتیپی دووەمی ڕووس خێرا بە فەرمانی ناوبراو تاقمێک کارمەنەی دایرەی تەندوروستی بەکەرەستەی پێویستەوە ڕەوانەی ئەوێ کران تا دەرمانی ئەوکەسانەی بکەن کە گیانیان لـە دەسـت نـەدابوو. لەبەرواری دوزادەی نوامبر تاقمێکی پەرستار لەعێشق ئـاواوە بـەرەو قووچـان بـەڕێ کەوتین وئێمە ڕۆژی ١٤ی مانگ گەیشتینە قووچان. شەقامێکی باشی هـەبوو کەلـە نێوانی کێوەکانەوە دەگـوزەرا.[١٢١] دوومڵـەی بـەناو بانگیـشی هـەبوو کـە لـە زەریـای خەزەرەوە ٦یان ٧ هەزار مـەتر بـەرزایی بـوو.[١٢٢] لـە ڕێگـەی قووچانـەوە ئێمـە لـەو خەڵکەی کە لەوێوە دەهاتن و دەڕۆیشتن باسی زۆرمان بیست.

دەیانگوت کە زەوین لە کاتی بوومەلەرزەدا شتهایێکی سەیری دەخستە دەرەوە و هەروەها دەیانگوت زۆربەی خەڵک لە ناو شەقی زەویندا گیانیـان لـە دەسـت دا و دەیانگوت لەوێدا دەروێشێ بەناوی فەقیرموحەممەد عەلی بووە و حەفتـەیێک پـێش ئەو کارەساتە گوتبووی لەقووچاندا لەم ڕۆژانەدا بوومەلـەرزەیێک ڕووئـەدات و دەبێتـە هۆی ئاڵۆزبوون و شێوانێکی زۆرەوە لەوشارەدا.

بـە شـێوەی کـورت بـڵێین ئێمـە لـەو شـارەدا نـاخۆش و برینـدارمان کـەم وەبەرچاوکەوت و لەبەر ئەوەی زۆربەیان یـان لـەناوچووبوون یـان سـاغ و سـلامەت مابوونەوە و ئەم کەسانەش وا زیندوومابوون بەرەو گوندەکانی تـری ناوچەکـە دەربـاز بوون. حاکمی قووچـان موحەممەدناسـرخانی شوجاعودەوڵـە دەیگـوت: زۆرتـر لـە ٢٠٠کەس لە بریندارەکان لە لایەن خزمەکانی منەوە گوێزرانـەوە بـۆ شـوێنانی تـر. بەرژەوندی قووچان زۆر شێواو ئاڵۆزە، بڕێ لە گەڕەکەکانی شار ئەوەندە خـراپ بـووە کە ناتوانی بە باشی ببینی کام شوێن خانووە و کامی کۆلانە. بەشێوەی کورت بـڵێن کە شار ئیتر شار نییە و تاقمی مردووش لە دوازدە هـەزار کـەس کـەمتـر نیـە. واتـا نیوەی دانیشتوانی ئەو شارە پیاوەگـەورەکانی بـە ڕەگـەز قووچـانی دەڵـێن تـاقمی

---

١٢١- بارودۆخی ئەم ڕێگایە لـە ڕاپۆرتەکـەی هـانری ڕەنـدی ئاڵـمانیدا کـە لـە ساڵـی ١٩٠٧ی دا بۆقووچان هاتووە و هەروەها لە ڕاپۆرتەکەی لورد کەرزەن‌دا بەتێروتەسەلی باسـی کـراوە. بڕوانـە بـۆ بەرگی یەکەم.

١٢٢- بەرزایی ئەم ناوچەیە لانی زۆر ٢٥٠٠مەترە کە ناوبراو هەڵەی کردووە.

مردوو زۆرتر له ١٨ هەزار کەس بووە.

کاتێ کە شار ڕوخا لانی کەم سی هەزار پەلەوەر و چوارپا لە ناوچوون وەک، بزن و مەڕوکەرو...

لە ڕاستیدا گیانبازانی ئەم کارەساتە لە مرۆڤ و حەیواندا زۆرترە لەمەی کە نووسراوە؛لەبەر ئەوەی ئەم ئەژمارەی کە نووسراوە تەنیا تایبەتی شاری قووچان بووە و ناوێک لە ناوچەکانی دەوروبەری نەبراوە، وەک دەزانین ئەو ناوچەیە بۆ کاری کشت و کاڵ زۆر لەبارە و لەوکاتەش دا کاتی کاری کشت و کاڵ بووە و خوابزانێ چەندها کەس لەو ناو زەوینی کشت و کاڵی دا لەناوچووبێتن.

زۆرکەس هەوڵیان دا تاکوو بتوانن گیانی ئەوکەسانەی کەلە ژێر ئاوارەوە مابوونەوە ڕزگاربکەن، بەڵام بەداخەوە کەم سەرکەوتوویيان وەدەست هانی و شار لە تەرمی کەساندا بۆی کردبوو.

لەم چەند ڕۆژەدا کاروان کاروان کەسانمان دەبینی کەبەباری وشترەوە کەل و پەلیان بۆخەڵکی زیندووی شار دەهانی. لەم کارە ساتەدا هەرکەس لەبیری ئەوەدا بوو تا گیانی خۆی لە دەستدان ڕزگار بکات و وادیارە دەسەڵاتی حاکمی ئەم شارە بەرتەسک بووە، حاکمی شاری قووچان ناچار بوو بۆ هەر هەڵکەندنێکی زەوی پێنج هەزار دینار بدات. کاتێ لە قووچان بووین بیستمان کەلە مەشهەدەوە لەشکەرێک هاوڕێ فەرمانفەرمادا بۆ هەڵکەندنی زەوینەکانی دەهاتن بۆ قووچان.سەدمخابن هەمووی ئەم ناوونازناوە درۆبووە.

لەحەڤدەی نوامبردا[١٢٣] کە کاتژمێر ٣ی پاش نیوەڕۆی پیشان دەدا کە والی خوراسان هاوڕێ تاقمێکی سوار بریتی بوون لە سێسەد کەس قەززاق، دوازدە ڕۆژ پاش کارەسات بەرەو قووچان بەڕێ کەوتبوون. خەڵک دەیانگوت ئەمانە هەر ئەو کەسانەن کە بۆ کەندنی زەوین هاتبوون. بە کورتی دەبێ ئاماژە بکەین کە ئێستا خەڵک خەریکی دووبارە بنیاتنانەوەی خانووەکانن. خەڵک وردە وردە دەگەڕانەوە بۆ نێوماڵی خۆیان و هاوڕێ لەگەڵ دانیشتوانی گوندەکانی دراوسێ خەریکی کۆکردنەوەی کەلوپەلی خەڵکی لە ناوچووبوون. هەموو ڕۆژیش لە ناوچە دوورە

---

١٢٣- بوومەلەرزە لەبەرواری ٥ی نوامبری ساڵی ١٨٩٥ی زایینی بەرانبەر بە ١٥ی گەلاڕێزانی ١٢٧٤ی کۆچی هەتاوی ڕووی داوە.

دەستەکانی ئێرانەوە بارە لۆکە دەگەیشتە قووچان کە لەوێوە ڕەوانەی عێشق ئاوا دەبوون. کردنەوەی شارێکی نوێ لەجێ شارێکی ئاڕوفتەدا کە ژێری ئەو شارە پڕ بوو لەلەشی گیاندار و نیمەگیان و بێ‌گیانی مرۆڤ و گیاندارانی‌تر کە هەر ئەم خۆی دەبێتە هۆی ناخۆشی و ناکۆکی زۆرەوە، خەڵکی ئەم شارە ئاوی ناخاوێن دەخۆنەوە و هەوای ناپاک دەگاتە مەشامیان.

لەبەر ئەوەی زۆربەی کەسان دەیانئەوێ لاشەی کەسەکانیان ببەنە مەشهەدەوە و دفنی بکەن و هەموو ساڵەش خەڵکێکی زۆر بۆ زیارەت ڕوودەکەنە ئەو شارە و ئەمە خۆی دەبێتە هۆی بڵاو بوونەوەی ناخۆشیە خراپەکانەوە نەتەنیا لە ئێراندا بەڵکوو لە وڵاتانی ئورووپا و ئاسیاش دا. شاری قووچان و گوندەکانی دەوروبەری لەبەرواری پێنجی نوامبرو لە کاتژمێری ٨ی شەودا بە هۆی بوومەلەرزەوە لەرانەوە و ئەم بوومەلەرزەیە لەگەڵ بوومەلەرزەکەی عێشق ئاوا دا زۆر جیاواز بوو. بەپێی ڕاپورتی گەیشتوو لەبەرواری ٥ی نوامبر لەکاتی شەوا کە هەوای قووچان زۆر خۆش بوو و زۆربەی کەسان‌لە دووکان و بازاڕی خۆیان بوون لە ناکاو لەژێری زەوینەوە دەنگێک هات و هەموو شتێ شێوا و شار بە تەواوی کاول بوو.

با و تۆزێکی زۆر بەرز ببوەوە. هەرکەس ویستبووی هەڕابکات تێکڕا هەمووشت دەڕژا بەسەریدا و دەیکوشت. لە بڕێک لە شوێنەکاندا زەوین بە ئەندازەی ٦تا٩ مەتر شەقی بردبوو کە خودی ئەم شتانەش زۆربەی کەسانی لەناو برد هەر لە ڕۆژی ئەوەڵەوە تا ئێستا ٦٠تا٧٠جار لەرزیوەتەوە،.

کاتێ بۆ گوندەکانمان دەڕوانی دەمان‌بینی کە ماڵەکان لەتەنیشتی یەکدا بنیات نرابوونەوە و هەمیسان ڕووخابوون.

ئەو خانوانەی کەبەرەو ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژئاوایی شاری قووچان بوون زۆرتر ڕوخابوون و وێرانەکان لەجەماوەردا دەگەیشت بەپەنجا هەزارمەتری چوار سووچ و دەتوانین لەسەر ئەوەش باس بکەین کە دەبێ چلۆن لەشوێنێکدا کێوی ئاگرپژان و ئەشکەوتی گەورە نەبێ، بوومەلەرزەی وا ڕووی دابێ و وادیارە هەڵدەگەڕێتەوە بۆ کێوەکانی موحەممەدبەیگ کە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی قووچانەوەیە.[١٢٤]

---

١٢٤- گۆڤاری وەحید. ساڵی ١٣٥٧لاپەڕەی ٩٨٨.

## بیروڕای مەعسووم عەلیشا سەبارەت بە ناسرخان و بارودۆخی قووچان

مەعسوومعەلیشای نایبوسسەدر کە ساڵی ١٣١٤ی کۆچی هاوکات لەگەڵ تەواو بوونی بنیاتنانەوەی تازەی قووچاندا چاوی بە ئەویَ کەوت و هاوکات نووسیویە: خۆرئاوای ڕۆژی هەینی ٢٧ی شەعبانی ساڵی ١٣١٤ لە نێوان بەفر و شەختەی سەختی ئەو کاتەدا لەشەقامی عێشق ئاواوە لەسنووری ئێران و ڕووسەوە پەڕینەوە و گەیشتینە باژگیران. شەوێکی زۆر سەردوسەختە. هیچ نان و کەرەستەیەکمان پێی نیە. زۆرشەکەت و ماندووین، خوا کەرستەی سازاند، دەروێشێک گەیشتە لامان، بەناوی قوربانعەلیخان کە لە خزمەکانی شوجاعودەوڵە بوو، نان و کەرستەی ئاگری بۆمان ساز کرد.

شەممە ٢٨ی شەعبان لەمەشەیی ڕەجەبی موکاری چەند مەڕیان کڕی و بەڕیَ کەوتین. پاش چوار فرسەخ کە ڕۆیشتین گەیشتینە گوندیَ بەناوی دوڕبادام، لێرەوە هەتا ئیمامقولی دووفرسەخ ڕێگەیە، شەو دووکاتژمێری لیَ گوزەرا بوو گەیشتینە بەرەوە.

خەڵکی باژگیران و دوڕبادام و ئیمامقولی لە عەشیرەتی کەیکانلوون.

یەکشەممە ٢٩ی شەعبان دەبیَ شەش فرسەخ بەڕێگەدا بڕۆیین، بگەیینە نێو شاری قووچانەوە، شار و گوندێکی زۆر لە نێوانی ڕێگە دا دەبنیریَ. نیوە کاتژمێریکی مابووە خۆرئاوا گەیشتینە پێشەوە، قووچان هەر ئەو خەبووشانەکەی پێشووە و بە هۆی بوومەلەرزە و شتهاییکی ترەوە شاروێرانەیەکە مەبەست شاری کۆنە قووچانە ودەلێن خەڵکی قووچان قووچ و مەڕی زۆریان هەبووە پێیانیان گوتووە قووچ قووینلوو، قاش قووینلوو، قاچکانلوو،قاچ قوویوونلوو کەچی شارێکیان بنیات نا بە ناوی ناسری[١٢٥] کەشەقامەکانی زۆر بەرپان و خۆش بوون.

میرزا عەبدولـلاخانی کاشانی شەیبانی کوڕی میرزا تاهێر بەسیرولمەلێک بەرپرسی برووسکەخانەی قووچان ئاگاداری هاتنەکەمان بوو، گەیشتە گەڕەکی نەزەرئاباد کە گەڕەکی خۆی بوو. مانگی یەکەمی ڕەمەزانمان بینی و ناوبراو بوو بە

---

١٢٥- پالیداوە بە لای حاکمەکەیەوە بە ناوی موحەممەد ناسرخان.

خاوەنی دوومیوانی عەزیز واتا ڕەمەزانی موبارەک و مەعسوومولبوبارەک. دوشەنبە موحەممەد ناسرخان شوجاعودەولەی دەسەڵاتداری ناوچەکە بە ئەندازەی شەش کەس قەندو چایی و شەکر و پێخۆری بۆمان نارد و هەروەها قووچ عەلی[١٢٦] کەربەلایی ئیسماعیل بوو بە بەرپرسی میوانداری لە ئێمە و هاوکات گوتی بەهۆی ناخۆشیەوە حاکم خۆی تا چەن ڕۆژ ناتوانێ بێتە خزمەتی ئێوە.

لەخەبووشاندا پیاوانی گەورە و هەڵکەوتوومان زۆربووە.شەوانی ڕەمەزان بە ناوبانگە کە تاقمێک دەدەن لە دەوڵ نادری و دەڵێن لەم خاکەدا نادر گەیشت بە دەسەڵات و هەر لێرەش سەری لەلەشی جیابووەوە کە هەم سەری و هەم تەخت و تاجی تاڵان کرا. پێنجشەممەی چوارەم چوینە چاوپێکەوتنی شوجاعودەولەوە کە دووساڵی ڕابردووش لە تاران بە خزمەتیان گەیشتبووم، پیاوێکی پیاوانەیە لە زۆر شوێندا سەرکەوتوو و پێشکەوتووە؛ بەڵام جاروبارێش دەبینرێ بیرێکی دواکەوتوانەی هەیە.[١٢٧]

ناسرخان ڕێزی تایبەتی بۆ مامۆستایانی ئایینی وعارفان دادەنا و بایەخی زۆری بەڕێورەسمی مەزهەبی دەدا. لە مانگی موحەرەمدا خۆی نەوحەی خوێندووە و خۆی دەکەوتە پێشەوەی دەستەکانی پرسە و هاوکات لە ماڵی خۆشی دەستەی بووە بۆ شینگێڕی ئیمام حوسەین.

بەڕێز حاجی سلێمان خانی ڕەوشەنی بە گوێرەی حاجی فازل بەخششی و ئەویش لە زمانی باوکیەوە سەبارەت بە موحەممەد ناسرخان وای بۆم گێڕایەوە کە لە قووچاندا کەسێک هەبووە کە زۆر ئایینی بوو و بە ناوی عەلی و هەمووی جۆر جەلەسەیێکی بۆ خۆشەویستەکەی لە ماڵی خۆی دا دەگرت. لەشەوێکی ساردی زمستانی قووچاندا کە بەفرێکی زۆرباریبوو و زەوینی داپۆشیبوو، وێژەری بەسەرهاتەکە -باوکی حاجی فازڵ- سەرەتا بە هۆی سەرمای زۆرەوە زاورناکات لە درگای ماڵەکەی بێتە دەرێ و بڕوات بۆ ماڵی ئەو کابرا، بەڵام پاشان تاقەتی تاق

---

١٢٦- خوالێخۆش بوو مەجدولئیسلام لەسەر فەرنامەکەی دا بۆ کەلات سەبارەت بە قووچ عەلی کە ئەوکات حاج ئیسماعیل بوو و لەبەندیخانەی ئاسەفوددەولەدا دیل بووە لەمەشهەد باسی زۆری کردووە کە دوایی باسی لێوە دەکەین.

١٢٧- ترائق الحقایق، مەعسووم عەلیشا. ل٦٦٩٨

دەبێ و بەڕێ دەکەوێ و دەرِوات و نۆکەرەکەشی لەگەڵ خۆیدا دەبات. کاتێ دەگاتە ئەوێ چاوی بە موحەممەدناسرخان دەکەوێ کە لە پای مینبەردا دانیشتووە و شمشێرەکەشی لەسەر ئەژنۆی داناوە و گوێ دەداتە پێداهەڵگوتنەکانی عەلی و هاوکات چاوانی هەر فرمێسک دەرِێژن. ناوبراو بۆی سەیر دەبێ کە چلۆن شوجاعودەوڵە ڕیزی حوسەین زۆر بەرزترە لەوەی کە بیری لێ دەکەیەوە و شایەت بڵێ شمشێری بۆچی لەگەڵدا دەبێ. بڵێم، نەوەک لەم تاریکەشەوەدا تووشی سەگ یان گورگ ببم.

زۆربەی شەوەکان لە ماڵی شوجاعودەوڵە ڕێ و ڕەسمی ڕیزی حوسەین هەبووە و مەلاشەمس ئێسفەراینی یەکێ بووە لە ڕەوزە خوێنە بە ناو بانگەکان کە بۆ شوجاعودەوڵە ڕەوزەی خوێندووە.

بەڕێز عەلای ئەفشاری لە ڕووی نووسراوەکانی باوکیەوە خوالێخۆش بوو مودیردیوانی ئەفشار سەبارەت بە موحەممەد ناسرخان دەڵێ: ناسرخان شوجاعودەوڵە زۆر خۆش میوان بووە و جاروبار شێعریشی نووسیوە و هەرکەسیش شێعری بۆی بخوێندایە خەڵاتی دەکرد، کەچی لەجەژنەکاندا لەشارەکانی ئێرانەوە قەسیدەی زۆریان ڕەوانەی ناوبراو دەکرد.

دوو بەیت شێعری ناسرخان بۆ وێنە دەخوێنینەوە

یارباما هەنەک[128] مەکەنە

زەخم ماراپورِئەزنەمەک مەکەنە

ناسرزارا دووبوزباشەد

یەکی ئەزئین دوو بوز یەدەک مەکەنە

نووسەری بوستانوسیاحەش لە ساڵی ۱۳۱٤ی کۆچی دا سەردانی قووچانی کردووە و سەبارەت بەم شارە گووتوویە:

لەم شارەدا ۳ هەزار بنەماڵە هەیە. زۆرتر لە ۱٥ هەزار کەس کە هەموویان کورد و تاجیک و... زۆر ئازا و زیرەکن و حاکمێکی زۆر زیرەکیشیان هەیە و لەبەر

---

۱۲۸- «هەنگ» وشەیەکی کرمانجییەو بە مانای گاڵتە و شۆخییە.

ئەوەی چاویان پێ نەکەوت هیچم سەبارەت  بە ئەونەنووسی.[١٢٩]

ساڵی ١٣١٦ی کۆچی بەپێی پیلانی خەسرەوخان تاقمێک لە کوردانی زافەرانلوو دژ بە موحەممەد ناسرخان شۆڕشیان کرد و لە ئاکامدا هیچیان دەست نەکەوت.

موحەممەد ناسرخان پاش بنیات نانی شاری قووچان و تۆزێک حەسایەوە و براژنی خۆی ـ ژنی ئەبولحەسەن خان و کچی موستەشار ـ خواست.[١٣٠]هاوکات کچی ئەمیرموحەممەد خانی شادلووشی هێنا بۆ عەبدورڕەزاخانی کوڕی ئەبولحەسەن خان و حەوت شەو و حەوت ڕۆژ زەماوەن گەرم  بوو و پاشان عەبدورڕەزاخانی کرد بە  جێگری خۆی و دەسەڵاتی شیروانی دا بە دەستیەوە.

لە ساڵی ١٣١٨ی کۆچیدا عەلیخان ناوی برای قلیج ئاشەوانی خۆی نا ئەبولحەسەن خان و هەواڵ هات کە ئەبولحەسەن خان زیندووە و لە تارانەوە گەڕاوەتەوە. ناسرخانیش ئیلچی خۆی واتا موحەممەدی تاتاری نارد بۆ هەواڵ و کاتێ گەڕایەوە گوتی ڕاستە و خەریکە بەرەو قووچان دێت، ناسرخان کە چاک دەیزانی براکەی مردووە خێرا سپای ڕازاندەوە. ڕۆیشت لە نزیکی شیروانەوە پێیان گەیشت  و خێرا کەلەبچەی کرد و ڕەوانەی  قووچانی کرد و لەبەر دادگای شاردا ڕانەکانیان شەق کرد و خوێیان تێ کرد تاکەس‌تر کاری وانەکا.

لە مانگی زیقەعدەی ساڵی ١٣١٧ی کە موحەممەد ناسرخان شوجاعودەولە بە دەعوەتی مسرخانی سەرۆکی عەشیرەت بۆ دیداری ناوچە  سنوورییەکان ڕوویان کردە جریستان و قووشخانە لەتەکمەراندا لەسەر ئەسپەکەی داکەوت و سمتی شکا و لە ڕووی ناچارییەوە هەر لەوێ مایەوە و پزشکیان لە ڕووسیەوە بۆی هانی و پاشان ڕەوانەی قووچان کراو هەر بەم بۆنەوە تا مردن دەشەلیا.

موحەممەدناسرخان پیاوێکی پیاوانە بووە و زۆر حەزی لە زانیاری و فەن بووە.

---

١٢٩- بوستانولسیاحەی خەتتی، زەینولعابێدینی شیروانی. ل٢٤٥

١٣٠- ئەبولحەسەن خان سێ ژنی بووە. یەکیان تورکەمەن بووە کە جوانەمەرگ بوو، یەکیان تورک بوو کە دەڵێن کچی گوندنشینێکی هەژار بووە کەلە کاتی کار لەگەڵ باوکی پەسندی کردووە و عەبدورڕەزاخانی شوجاعودەولەی لێی بوو. ژنی سێهەمیش کچی موستەشاری وەزیری خوراسان بوو. ژنە تورکمەنەکەشی کچی نووری وێردی‌خان بووە.

لەسەردەمی ئەودا قووچان بارودۆخێکی باشی بووە. ناوبراو لە مانگی زیحەججەی ساڵی ١٣٢٠ی کۆچی مرد وتەرمەکەشی لەمەرقەدی ئیمام ڕەزادا نێژرا. خاکەلێوەی ساڵی ١٢٨٢ی هەتاوی لەسەردەمی موحەممەد ناسرخاندا شاری قووچان یەکێ لە شارە هەرە گرینگە ئابوورییەکانی ئێران بوو و ڕووسیەکانیش بۆگەیشتن بە ئامانجەکانیان تاقمێک بەکرێ‌گیراو وجاشیان لە ژێر ڕێکخراوەی گ-پ-ئۆ دا ناسراو بە گیپوو بۆ کڕینی مەویژ و کاری بازرگانی ڕەوانەی قووچان کرد کە هەواڵەکانی ناوچەکانی باکوور و ڕۆژ هەلاتی ئێران لە سمنان هەتا زاهیدان لەم شوێنەوە دەگەیشتە دەستی ڕووسیەکان.

## قەواڵەی گوندی زوباران کە موحەممەد ناسرخانی شوجاعودەوڵە بەسەرهەنگ ئەمیر قولی خانی فرۆشتووە

بەپێی شەرعی ئیسلام سەردارموحەممەد ناسرخانی شوجاعودەولەی ئەمیری قووچان، سەرۆک و دەسەلاتداری شاری قووچان خوا ڕاوەستاوی بکات. هەمووی مولکی زوباران کە چوار جفت زەوینی ئاوی دێمە دای بە سەروەر ئەمیرقولی‌خانی سەرهەنگ و ئەمیرئاخوڕ و لەبەرانبەریدا دەبێ دووهەزارو دووسەد تمەن پارە بدات بە موحەممەد ناسرخان و هەردوولا پەسندیان کرد. فرۆشیار دانی بەوەدا ناوە کە مولکەکەی فروشتووە و کڕیاریش گوتوویە وەرم‌گرتووە. ئەم نامەیەش لە نێوان هەردوولادا نووسراوە و هەردوولا واژۆیان کردووە. (١١ی شەعبانی ١٣١٦ مۆری شوجاعودەوڵە)

**حوکمی سەرهەنگی ئەمیر قولی خانی هیوەدانلوو لە لایەن ناسرەدین‌شاوە دراوە**

مۆر: الملک لله تعالی

لەم کاتەدا تاقمێک‌لە خانەکانی زافەرانلوو خۆیانیان گەیاندە ئاستانی پاشای پاشاکانی ئێران و ئەویش ڕێزی زۆری گرتن بە تایبەت ئەمیر قولی خانی زەعفەرانلوو بە هۆی توانایی ولیاقەتیەوە لەوەها ساڵێکدا نیشانی سەرهەنگی پێی درا تا زۆرتر لە خزمەتماندا بێ. دەبێ بڵێن ئەمیر کەبیر گوتوویە ناوبراو لە شانی دایە

نیشانی سەرهەنگی پێی بدرێ.

پشتی حوکمەکە لە لایەن نایبوسسەڵتەنەی ئەمیرکەبیر وسەد ئەعزەمەوە مۆرکراوە.[۱۳۱] (بەرواری حوکم زیحەججەی ۱۳۱۲ی کۆچی )

بەش کردنی ئاوی چاوکەی سووفقولی لە گوندی کۆنەئۆغاز لە لایەن بەڕێز ئەمیر حوسەین خانی شوجاعودەولەی ئیلخانی زەعفەرانلووەوە ڕووی داوە و بەم پێیە لە شەو ورۆژدا حەوت شەو و ڕۆژی مافی ئووغازی تازە بووە و سێ شەو و ڕۆژی بۆ ئۆغازی کۆنەیە. ئەم بڕیارە چەند ڕۆژپێش مردنی ئەمیر حوسەین خان لە بەرواری ۱۱ی ڕەبیعوسسانی ۱۳۱۱دا دەرچووە. هەروەها پشتی بەڵگەکە لە لایەن موحەممەد ناسرخان شوجاعودەولەوە مۆرکراوە.

دەبێ ئەوەش بڵێین لەم چەند ساڵەی ڕابردووەدا لەسەر ئەم ئاوە شەڕی زۆر کراوە.

هەروەها بەڵگەیەکیتر سەبارەت بە لەوەڕگاکانی نێوان ئۆغاز و باجگیران لە لایەن شوجاعودەولە نووسراوە

هو

لەبەر ئەوەی پێشتر بە دۆستەکانمان ڕاگەیاندبوو، دەبێ دووپاتی بکەینەوە کە زەوینە دێمەکارەکانی هەردوو ئۆغاز هەر لە کووتل و گۆگ گەدۆک و تێغەساڵەوە لەبەشی ڕۆژئاواوە و سنووری دووهەم لکاوەتە گەدووگ ساس،سەرتیغ گا و ئەورتە

---

۱۳۱- ئەم بەڵگەیە لە لایەن بەڕێز موحەممەد بلووریانی هیوەدانلووەوە گەیشتە دەستمان. ئەم حوکمە وادیارە کە کاتێ موحەممەدناسرخانی شوجاعودەولە پاش وەرگرتنی فەرمانی دەسەڵاتی قووچان بۆگەیشتن بە ناسرەدین شا چوو بۆ تاران هەر لەوێدا ئەم حوکمە بۆ ئەمیرقولی خان دەرچووە. ئەم ئەمیر قولیخانە لەو کاتەدا زۆر منداڵ بووە کەلەگەڵ دایکی لە لایەن تورکەمانەکانەوە ئەسیر کران و پاش مەرگی دایکی ئەو هەر لەبەندا مابووەوە. ئەمیر حوسەین خان لەهەڵمەتێکیدا بۆ سەرتورکەمانەکان ئەم منداڵەی لە چنگیان دەرهانی و هێنایەوە بۆ قووچان و خۆی باری هێنا وەک کوڕی خۆی. بە باش نازانرێ ناوی چی بوو.

ئەمیر قولی ناوێک بوو کە ئەمیر حوسەین خان پێی داوە و هەروەها بە هۆی سپیلکەیی و جوان چاکیەوە خەلک پێیان گوتووە قووزی خان. ئەمیر قولی خان کچێکی تورکەمانی بە ناوی خاڵی بۆی خواست. هەروەها ئەمیر قولی خۆیشی دوایی ژنێکی لە عەشیرەتی هیوەدانلوو خواست و منداڵی لێی بوو.

تەختی کە بەرەو عالیبەیگ دەڕوا تا دەگاتە گوندی سنجەربەیگ و لە باکووریشەوە لکاوەتە گەدووگی زیلانەوە تاسەر کێوی سنجەربەیگ و هەروەها لە باشوورەوە لکاوەتە ڕووباری کۆنە ئووغازەوە؟ وشەیەک ناخوێندرێتەوە کە ناوبانگی عالیبەیگ و چاهەک و کوڵ داخی هەیە و دەبێ لە نێوان عەشیرەتەکانی دووسیوکانلووی ئووغاز و کومکیانلوودا بەش بکرێ. ئێمەش ناوی بەرپرسەکە نەخوێندرایەوەبۆمان و کردمان بە بەرپرس بۆبەش کردنی پیاو ماقوڵەکانی عەشیرەتەکانی سیووکانلووی ئووغاز. قەواڵەی کۆنەی ساڵی ١٢٢٦ی کۆچییان بە ئێمە پیشان دا و گوتیان کە ئێمە بەم پێیە ئەم زەوینانەمان کڕیوە و تکایە ئیزن مەدەن غەدرمان لێی بکرێ. بۆیە ئێمەش داواکەیانمان پەسند کرد و ئیزنی غەدرمان نەدا و هەرکەس غەدریان لێی بکا چ کومیکانلووەکان و چ کەسانیتر ئێمە بەرنگاریان دەبینەوە. (١٣١٨ی کۆچی مانگی.)

ئەو کەسانەی لە خەڵکی ئۆغاز کە شکاتیان خستۆتە بەر شوجاعودەولە بریتین لە: نادرخان لەگەڵ عەلیموحەممەدخان پێنج تمەن و حەوت هەزارونیو، ئیبراهیمی کوڕی عەلیخان دووتمەن و هەشت هەزارونیو ڕەمەزان ئەمرخان دووتمەن و هەشت هەزارونیو، ئەحمەد یووسف -باوکی دایکی نوو سەر کەلە کوردەکانی کانیمشکانە- دووتمەن و هەشت هەزار و نیو، کەربەلایی عەلی ئەسغەر دووتمەن و هەشت هە زارونیو، موحەممەد وەلەدخانی کەربەلایی ئەمانوڵلا دووتمەن و هەشت هە زارونیو، موحەممەد وەلەدخان کەربەلایی سەفەر عەلی دووتمەن و هەشت هەزارونیو، قەمەر جانعەلی باوکی سوڵتەنعەلی دووتمەن و هەشت هەزارونیو، غولامڕەزا باوەگەورەی ڕەزاییەکانی شیروان دووتمەن و هەشت هەزارونیو، کەربەلایی حەزرەتقولی پێنج تمەن و حەوت هە زارونیو، عەلی زەینەڵ دووتمەن و هەشت هەزارونیو، دووست موحەممەد ٢٨/٥ڕیاڵ، مەلازەینەلعابیدین ٥٧/٥،ئادینە موحەممەد ٢٨/٥، نوورموحەممەد ٢٨/٥، باقری کوڕی حەسەین ٢٤ ، حەسەین دەرەگۆ ٥٧/٥، گیان موحەممەد ٥٧/٥، غولامحەسەن ٢٨/٥، غولام ڕەجەب ٥٧/٥، مەلاباقر ١٤/٥، حەزرەتقولی کوڕی ئاغە بالی ٢٨/٥، کەلبی ٢٨/٥،نەزەری کوڕی ئاغە ٢٨/٥، حسێنقولی ٢٨/٥، کەربەلایی یووسف ٥٧/٥، کەربەلایی خوداقولی ٢٨/٥، کوڕەکانی مەمێ ٥٧/٥، کوڕەکانی دەمر تەیمووریەکان ٢٨/٥، حاجی عەلی ٢٨/٥، بەراتی

شاولات ٥/٥٧، حەمەزەخان لەگەڵ حاجی خان ٥/٥٧، ئەمان موحەممەد ٥/٥٧، حەمەڕەزا و حەیدەر ٥/٥٧، ئەحمەد تاهێر بەرات موحەممەد باقری بانموحەممەد ٥/٢٨، ئیبراهیم سادق باوەگەورەی ئیبراهیم کەفاش ٥/٢٨، شاموحەممەد کوڕی ئاراز موحەممەد سەردار ٥/٢٨، باقری کەفاش ٥/٢٨، کوڕەکانی درگاقولی ٥/٥٧، ڕەحمانقولی ٥/٢٨، بیرو باوەگەورەی بایرامییەکان ٥/٢٨، وەلیخان و نەقدقولی ٥/ ٥٧، عەلی کوڕی میسر باوەگەورەی نووسەر ٥/ ٢٨ ،کوڕەکانی عەلی ١٤، شەعبان یووسف باوکی ئۆغازییەکان ٥/ ٢٨، شاهگولدییەکان ٤٥٦، عەیدموحەممەد ڕەحیم ٥/٢٨ ڕیاڵ.

هەروەک بینیمان لەم بەڵگەیەدا، عەشیرەتی شاهگولدییەکان بەدانی ٤٥٦ڕیاڵەوە بەشی گەورەی کێوی کەلمیان کڕیوە. ئەم عەشیرەتە لە ڕەگەزی ئوولێک ئوولێکانلوون. لەبەر ئەوە بەم ناوە ناو بانگیان دەرکردووە کە کاتێ شاتەهماسب سەفەوی دێتە قووچان و لەسەر کچێ سەردارێکی کورد لەگەڵ نادرخانی ئەفشاردا دژی یەک دەوەستن هەواڵی پێی دەدەن کەلە کێوی ئارمووتەلیدا یەکێ لە چادرنشینەکانی ئوولێکانلۆ کۆڵەکەی ڕەشماڵەکەی لە زێڕە و ئەویش بۆ وەرگرتنی زێڕ ڕووی تێی دەکات و کابرایش زیرەک دەبێ و خێرا برنجە دەکاتە سەرکۆڵەکەکاندا و پاشا کاتێ دێ و دەیبینێ پەشیمان دەبێتەوە. لەهەمان کاتدا سەر کردەی ئەو عەشیرەتە کوڕێکی دەبێ و ناوی دەنی شاهگلاوێ واتا پاشا هات و ئەم عەشیرەتە بەم بۆنەوە ئەم نازناوەیان گرتووە.

## قەواڵەی کێوی کەلەم وشیوی باسەر هەتا باخی دووڵۆ

پاش ڕێز و حورمەت لە دانیشتنێکدا هەمووی خەڵکی کۆنە ئۆغاز و ئۆغازی نوێ کۆ بوونەوە و هەروەها تاقمێک لەعەشیرەتی پاڵەوانلووش لەتەکیاندا بوون و لە ئەو پەڕی ساغی و سەلامەتی دا خوازیاری داوبسەت بوون، واتا داوبسەتی زەوینی نێوانی کێوی کەلەم کە ملکی دووعەشیرەتی سیووکانلوو و پاڵەوانلوو بووە و سنوورەکەشی لەشەقامی ساری تیکانەوە تا تیغەساڵ درێژەی هەیە.

سنوورێکی تریشی لە تێغەی باخەوە دەست پێ دەکات و سنوورێکی کەشی لە

چیلیساری تیکانەوە دەڕوێ و دەگاتەوە باخی دوولۆ کە نرخەکەشی ٦٠ تمەنە لەسەر دەمی موحەممەد حوسەین خانی کوڕی سەعادەت قولی خان. (نووسراوەی بەرواری ٢٠ی شەوالی ١٣١٨)

قەواڵەیێکیتر کە داگری کوێستانەکانی عالی بەیگە لکاوە بە کێوی کەلەمەوە و لەوێدا بە ئووغاز دەڵێ ئابقاز و بیروڕای بەڕێز جابانی لەکتێبی وڵات و خەڵکی قووچاندا ئەم ڕاستیە ئەسەلمێنێ و دەڵێ بە هۆی ئاوی زۆر و دەریای باشەوە قازی زۆری هەبووە. ئەم قەواڵەیە لە بواری بەڵگەی جیۆگرافیای ناوچەییەوە لەبەر ئەوەی ناوی کێو و شیو وچاوکەکانی نووسیوە زۆر گرینگە.

## قووچان لە ڕوانگەی هانری و ڕنەد ئاڵمانییەوە

هاوکات لەگەڵ حکوومەتی موحەممەد ناسرخان شوجاعودەولە لە قووچان هانری ڕنەد ئاڵمانی لەسەفەرنامەکەی خۆیدا لە خوراسان هەتاکوو بەختیاری لەبارەی ئەم شارە توویەتی:

لە مانگی ئووتی ١٨٩٩ی زایینی بەرامبر بە ١٢٧٨ی هەتاوی و ١٢١٧ مانگی گەڕامەوە بۆ عێشق ئاباد و لەگەڵ موسیوسزاری هاوپەیمان بووم، بەرلەهەموو ئەو منی بە قووچان و لە دوای ئەو بۆ مەشهەد برد...

دیسان بۆ قووچان گەڕامەوە. موسیو سزاری بەمنی گوت لە نزیکی شاری قووچاندا وێرانەکانی شارێکی کۆن دیارە کە پاشماوەیەکی زۆر لە سوفاڵ گڵی لە ژێر خاک دەریان دەهێنان. هەروەها لە دیدارەکانی کە لەگەڵ والی مەشهەد کردبووم فەنەکێکی باشم پێشکەشی کرد، بەم بوونەوە توانیم لە ئەو ئیزن بگرم کە لەناو ئەو وێرانەدا بگەڕم، بەبۆنەی فەرمانی یاسایی کەپێیان دابووم لەناو کۆڵانەکانی قووچان پیاسەم دەکرد و لە بازارو گەڕەکەکان وێنەم دەگرت، لە ناکاو پۆلیسێک منی کەلەبچە کرد و بەبیانووی ئەوە کە من جاسووسم بە تووڕەیی بۆلای داروغەمی برد. نووسراوەکانێ کە پێم بوو لێمیان گرت، بەڵام خۆم بە تایبەت فەرمانی ئیزنی گەڕانەکەم شاردەوە و گەرەکم بوو قسەیەکی کەنینی بکەم تالە بیریان ببەمەوە، بەڵام زانیان و ئەو فەرمانەشیان لێم وەرگرت، کە بە داروغە نیشانی بدەن، لە دوای

ئەوە به بۆنەی گوم بوونی ئەو فەرمانە داوای لێبوردنیان لێم کرد و فـەوتا و ئیتـر بـە دەسم نەگەیشت. ئیتر بە هاتنی زستان و بەفربارین کـۆ کردنـەوە لـە نـاو وێرانەکـە سەخت بوو و نەئەکرا و ئیتر فەرمانەکە بۆ من سوودی نەبوو هەر بە بـاز بـوونی ڕێگـە ڕووبە ڕووسیە ڕۆیشتم و لە دوای ئەویٚ بۆ پاریس چووم.

لە ساڵی ١٩٠٧ی زایینی جارێکی‌تر هانری ڕنە بە پێی فەرمانیٚ کە پێـی درا لـە فەرانسەوە بۆ عێشق ئاباد و لەوێش بۆ باجگیران هات کە ئەم کاتە بەرامبەر بە ساڵـی ١٣٢٠ی مانگی ساڵی کۆچی دوایی موحەممەد ناسرخان شوجاعودەولـەیە . هـانری ڕنە هیناویە کە: لە نزیکی خۆراوا بە گومریک خامی ئێران گەیشتن کـە ئـەم شـوێنە پێی ئەڵێنباجگیران بەڕاس ناوێکی شـایان بـۆ ئـەم شـوێنەیان هەڵـبژاردووە لەبـەر ئـــەوەی کـــە لێـــرا ئیرانیـــەکان لـــە ڕۆیـــشتنی دە ساڵـــی لەمەوبـــەرمان بـــۆ ئێران(١٨٩٩زایینی) لەماوەی بینینی هەرێمی خوراسان کۆمەڵێک قوماش و پەشم و کەلووپەلی دەس نەکەوتوومان سەند. ئینتزارمـان بـوو کـە لـە گومریـک پـارەیێکی زۆرمان لیٚ بسێنن بـەڵام کاتێـک بەسـنووری ئێـران و ڕووس گەیـشتین سـەرۆکی گومریکی ئیران بۆ پێشوازی ئێمە هـات.پێکـەوە چەنـد پیاڵـە چایمـان خـوارد. بـیٚ ئەوەی یەغانەکەمان پیٚ بشکێنێت و پارەیەک بگریٚ. وکوو خاسترین ڕفێـق لەگـەڵ ئێمە ماڵاوایی کرد و لە دوای ئەوا یەکێک لە کارمەندەکانی گومریک پـەیامی دا کـە من نامەویٚ زەحمەتم بۆ ئێوە ببیٚ و بارەکەکانتان بشێوێنم و تەنیا ڕجایـەکی کـە لـە ئێوەم هەیە، ئەوەیە ئەگەر بۆتان ئەکرێت ئەو کاتژمێرە دیواریە چکۆلەی کـە پێتانـە بە دیاری پێم بدەن. هەر بەو بۆنەوە بوو کە حورمەتی زۆری گرتین.

## هێندێک لە سزای قاچاخچیەکان

بـڕێک لـە کـار بەدەسـتەکانی گومریـک بەرامبـەر بـە قاچاخچیـەکان خراپ سەختیان دەگرت.یەکێک لەکار بەدەستەکان نەفەرێک لە قاچاخچیـەکانی گـرت و لە دەرەوەی گومریکخانە بزمارێکی هانی و گوێی بە دیوارێکدا کوتا، ئـەم قاچاخچیـە تورکەمەن بوو و تەواوی ڕۆژ بەم جۆرە وێستا بوو و خەڵک بۆ بینینی ئەو هاتن[١٣٢] ئەم

١٣٢- وتی ئەم کەسە: یانیٚ حەمەکوڕی سوورگوڵ لەو کوردانەیٚ بوو کە کڵاوی تورکەمـەنی لەسـەر

کەسە زۆر جار کاری خەلافی یاسایی لێی ڕوودابوو و بەسزا گەیشتبوو، بەڵام لە ئیشی خۆی کۆتایی نەدەکرد و لە فێڵەکانی دەستی هەڵنەدەگرت. بە تێکڕایی باری لەسنووری ڕووسیە بۆ ئێران یان بۆ دەرەوەی ئێران دەبرد.بەڵام بە شێوەیێکی سەیر لە کاتی خۆراوا کە وێڵیان کرد بێ ئەوەی گلەییەکی بێ یان قسەیەک بکات وەکوو فیلسووفێک ئارام و لە ئەو پەڕی ئارامی چوو. دوایی بیستم تۆبەی کردووە. ناکرێ تۆبە، وادیارە لە شوێنێکی دیکەوە دەستی پێ کردووە.

یەکەمین شەوی سەفەرمان لە خاکی ئێران بە خۆشی و کامەرانی بەڕێوە چوو. سەرۆکی پۆستخانە خانوویێکی زۆر باشی کە ڕازاوە بوو بە فەرشی پڕ قیمەت بۆ ئێمەی تەرخان کردبوو و پلاوێکی زۆر باشی بۆ ئێمە نارد و دوای خواردنی نان، هات بۆ لای ئێمە وبەگێڕانەوەی چیرۆک سەرگەرمی کردین.

.........دەڵێن ڕۆژێک ژنی حاکمی قووچان دوای هاتنەوەی لە حەمام دەرەوە لە مێردی خۆی گلەیی کرد کە ئیمڕۆ ئاوی حەمامەکە ساردتر لە ڕۆژانیتر بوو و زۆر خۆشم لێ نەچوو. حاکم وتی خەتا لەو کەسەوەیە حەمامەکە ئەگەڕێنێ. دڵنیا بە کە من سزای ئەدەم. بەزووترین کات هات بۆ دیوانخانە و لەسەرتەختەکەی دانیشت و فەڕاشەکانی نارد کە ساحیبی حەمامەکە بهێنن. لە دوای ئەوە کە خاون حەمامەکە هات، بردیان بۆ دیوانخانە. حاکم بە تووڕەیی بۆی ڕوانی و وتی:

بەوجۆرەی کە خێزانم سکاڵای کردبوو ئاوی حومام باش گرم نەبووە[١٣٣] و تۆش لە کاری خۆت کۆتاییت کردووە لەمەو دوا ئەبێ یەکێ لەم دوو ڕێگە قەبووڵ بکەی، یان لە ئیشی خۆت دەس هەڵبگری یان دووسەد تمەن پارەی تاوان بدەی.

بە بۆنەی ئەوی کە هەر ئەم حەمامە تەنیا جێگایەکە بۆ کاسبی ئەم پیاوە، مەجبوور بوو کە پارەکە بە حاکم بدات و بەئیشەکەی خۆی درێژە بدات.

**ناکۆکی ڕێ:**

لە وڵاتی ڕووسیەدا هەموو ڕێگەکان داکوتراو بوو کۆچەرەکان بە کەژاوە دەتوانن

---

دادەنا و تورکەمەنیش نەبوو.

١٣٣- ئەم چیروکە ناڕاستە بۆ ئەوەی ئیلخانی قووچان حاکم لە ماڵی خۆی حەمامی تایبەتی هەبوو و پێویستیشی بەوەی نەبوو کە هاوسەرەکەی بوخچەکەی لەژێر باڵی دابنێ و بەرەو حەمامی گشتی بڕوات و لای شووەکەی سکاڵای ئەوە بکات کە ئاوەکەی سارد بووە.

بێن وبچن،بەڵام ئەم ڕێگایانەی ئێران خراپە و تێپەڕ کردنی‌سەخت.
دوای تێپەڕین لەپێچە جۆربەجۆرەکانی لە ڕێگای قووچان- باجگیراندا بە دۆڵێک گەیشتین کە گوندێکی بە ناوی شارەک لەوێدا بوو. ئێستا کاتی وەرگرتنی بەرهەم و دەغڵ و دانە. جووتیارەکان خەریکی کوتانی خەرمانن. مانگاکان هێورهێور بەڕووی دایەرەیەک دەسووڕان و جووتیان دەکرد و تاکوو گەنم و جۆ لەکاکان جیا کەنەوە لە لای راس و چەپەوە بڕێ کات وشترێکی مردارەو بوو ئەبینرا کە لاشەکەی سەگ و چەقەڵ تێیان دابوو.

## کاروانسەرای ئیمام قولی:

ڕێگا کە لە گوندی ئیمام قولیەوە دەڕوات کە کاروانسەرایەکی گەورەی هەیە، ئەم گوندە گرنگییەکی هەیە بۆ ئەوەی کە بڕێک لە ڕێگاکان لەوێوە دەڕوات و ناوچەکانی خوراسان بەیەکەوە پێوەند دەدات. بەبۆنە ئەوەی‌کە ئوروپیەکان لەناو ئەم ناوچانە دەڕۆیشتن، منالان لەپەنای ئێمە ڕادەوستان و بە سەرنجەوە سەیرمانیان دەکردن و بە دیتنی جل‌وبەرگ و بالامان حەزیان دەکرد. لە دەمودەزگای کامێرا دەترسان و کیژانێ کە لە سەربانی ماڵەکاندا ئێمەیان دەبینی و ئەو کوڕانەش کە لە لامان وێستا بوون هەر ئەمەی کە دیبان دەمودەزگای کامێرا وەک ئەوەی کە شەیتانیان دەبیێت هاوارێکیان دەکرد و بە توندی هەڵدەهاتن.
لەچەند ساڵێکی دیکە کە ئەم ڕێگایانە داکوترا و بوون بەقیرتاو کوردەکۆچەریەکان کە لەوکاتدا بۆ ئاژەڵداری بۆ عیشق ئاوا هاتبوون بۆنووسەر قسەیان کردبوو کە بەهاری ساڵی پێشوو کە لە وڵاتی شەورەوی هاتینە دەر داکوترا و بەڵام لە ئاخری خەزان کە دیسان گەڕاینەوە بۆ عیشق‌ئاوا لە دیتنی ڕێگەی قیرتاوی سەرمان سووڕما و نەمانزانی چۆن بەدیمان هێنابوو. هەموو کەس حاڵەتی سەرسووڕمانیان گرتبوو.
ئەوانە کە ژیرن دەیان وت: ئەمانە بەردێکی گەورەن کە ڕووسەکان بەیەکەوە لکاندبوویان و بەسەریان شتێکیان ماڵی بوو کە درز بوونی بەردەکان دیار نەکەوێت لەسەرەتا زاتم نەبوو بەسەریا بڕۆم. بۆ ئەوەی کە بڕێک دەیان وت ڕووسەکان سیحریان کردوە و ڕێگەکەیان ئەفسوون کردووە.

ئەو کاتە لە ئێران ئەم شتانە نەبوو. تەنانەت لە مەشـهەدیش باسـێک لـە قیرتـاو نەبوو.

**خەتەنە کردنی منالان:**

باو وایە کە لە تەمنی ٧ساڵان‌دا کوڕان خەتەنە ئەکەن. ئـەم کـرداره بـە هـۆی شۆردنی وسڵە. بۆ ئەوەی کەتاکوو منال خەتەنـە نـەکرێت نـاتوانین بـە موسـڵمانی دابنین. ئەم کرداره وەک ڕەوشتێکی هەڵبژاردەیە و بەجێی دێت.

لە ڕۆژیکی دیاری کراو بنەماڵە کۆ دەبن و منالەکە دێنن ولە سەر ئەژنۆی باوکی دای دەنن .کاتێک کە دەلاک ئامـادە دەبـوو منالـەکەیان دەخەوانـد و بـاوکی بـۆی چیرۆکی دەوت وشیرینی بەزۆر پێی ئەدا ودەلاک تێخەکەی بە دەسـتی دەگـرت و بە جۆرێک لە سەر سکی منالەکە دادەنیشت کە ڕوومەتی ڕووبەقاچی منالـەکە بێـت و کارەکەی خۆی بەجێ دەهاورد. لەو کاتەی کـە منالـەکە ئێـشی پـێ‌ئەگەیـشت. هاواری دەکرد ؛بەڵام کردارەکە بەدی هـاتبوو. دوای کردارەکـە دەلاک خۆڵەمێـشی گەرم و پەنبەی نیوەسووتاوی لەسەری زامەکەدا دەنا و بەپەڕۆیەک دەیبەست.

**هۆزە کوردەکان:**

دانیـشتووکانی گونـدی ئیمـام قـولی زۆرتـر کـوردن. منالـەکان جلوبـەرگی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەر کـردووە. کـوڕان جلوبـەرگی بچووکیـان لەبـەردا بـوو هـەتاکوو ناوکیان دەگەیشت.

هەر بەو جۆرەی کە ئەوان خـەریکی دیـتنی ئێمـە بـوون ئیمـەیش خـەریکی بینینی ئەوان بوین...

دوای ماوەیەک برێک ژنی کورد بۆ دیتنی ئیمە هـاتن، ئـەمانیش فرەتـر جلـی سووریان لەبەر کردبوو و ڕوومەتی خۆیانیان شاردبووەوە؛ بەڵام بـێ کـاریش نـەبوون. خەریکی تەشی ڕێستنی پەشم بوون. وبە دیتنی ئێمە خەریک بوون... ژنانی کـورد قەد جلی ڕەش ناکەنە بەریان؛ بەڵکوو هەتا هەتایە لە جلی ڕەنگاوڕەنگ و تەنانەت لـە ڕەنگی سوور کەلک وەرئەگرن کە هێشتاش باوە.

## کۆچی دوایی موحەممەد ناسرخانی شوجاعودەولە ئیلخانی زەعفەرانلوو

موحەممەدناسرخان شوجاعودەولە کە لە دوای کۆچی دوایی باوکی -ئەمیر حوسیەن خانی ئیلخانی- لە سالی ١٣١١ مانگی بەسەرۆکایەتی ئیلی زەعفەرانلوو وحکوومەتی قووچان دەرهات. دوای ٩ سال لە سالی ١٣٢٠مانگی کۆچی دوایی کردوە و تەرمەکەیشی بەرامبەر ڕەوشتێکی تایبەت ڕەوانەیان کردوە بۆشاری مەشهەد و لە پالی گۆڕی باپیرە کانی لەداروتەوحیدی پیرۆز نێژرا.

موحەممەدناسرخان کە لە پاشاکانی زانا و زانست پەروەر بوو لە ماوەی کورتی سەرۆکایەتی خۆی تووشی گیروگرفتی ئابووری و سروشتی بووە کە بریتین لە بوومەلەرزەی خاپوورکەر لە سالەکانی ١٣١١و ١٣١٢ مانگی کە تەواوی شاری قووچانی کۆن کاول کرا و موحەممەدناسرخان، شاری ئێستای قووچانی لەیەک فرسەنگی رۆژهەلاتی شاری کۆن بنیات نا.

کێشەی دوایی باسی تیاچوونی فیرووزە و سەرلێشێواوی و تێکچوونی کوردەکانی جەلالی دانیشتووی فیرووزە بوو. نەک جەلالیەکان ئەیانویست مەلبەندی باپیرەکانیان بە دەستی ڕووسەکان بدەن و ئەویش جێ بهێلن و نە موحەممەد ناسرخان ئیزنی بوو کە لە گەلیان هاوکاری بکات و یارمەتیان بدات. پەیابوونی شەڕی چریکی کوردەکانی جەلالی لە دەوروبەری کوێستان و سنووری قووچان بوو بەهۆی سەر لێ‌شێواوی ناسرخانەوە. و جگە لە کاولبوون و خراویی و ئاوارەیی خەلک، ناسرەدین پاشایش نەک یارمەتیەکی خەلکی ناوچەی نەکرد؛ بەلکوو سەدهەزار تمەن پارەیش بابەتی حەقی سەرۆکی لە موحەممەد ناسرخان و سی هەزار تمەن لە ڕەمەزان خان وەزیری ئەمیرحوسەین خان داوا کرد. بە وتەی بەڕێوبەری دیوانی ئەفشار لەسەرەتای فەرمانبەری موحەممەد ناسرخان موئەیدوددەولە سەرداری خوراسان پێشکاری موحەممەد ناسرخان بەبۆنەی ناردنی ئەو بۆتاران و پێناساندن بە خزمەتی ناسرەدین شا بەشاری مەشهەد داخوازی کرد و خان بابەخان، موزەفەروسسەلتەنەی کرد بە فەرمانبەری قووچان و ڕەمەزان خانیش بوو بە جێگری فەرمانبەر و میرزا نەجەفقولیش کرا بە پێشکاری قووچان.

خەڵکی قووچان بوون بە دوو دەستەوە. بڕێک لایەنگری موحەممەد ناسـرخان. بـڕێکی‌تـر پـشتگرتووی خـان بابـەخان و ڕەمـەزان و بـڕێک لـە بـەرەلاکانیش ئاورگەشکەرن. ئەم دوو دەستەییە بوو بە هۆی ئەوەی دواى چـەن ڕۆژێ لـە شـاری قووچانی کۆن بڕێک خەڵک هاتنە دەر. کات ژمێرێک لەشەو تێپەڕی‌بوو، ئەحمـەد هات وڵامی دا کە ڕەمەزان خان و ئەمیر قولی خانیان کوشتووە وخستوویانە ناو بـیر. خان باباخان ڕای کردووە. ئێستا کەربـەلایی کـەریم و براکـەی موحەممـەد عـەلی شاریان بەدەستەوەیە.

لە زیقەعدەی ساڵی ١٣١٧ی مـانگی موحەممـەد ناسـرخان شوجاعودەولـە بـۆ سەردان ڕۆیشتن بۆ لای ڕەعیەتەکانیان. لەگەڵ بـڕێک لـە سـوارەکان لـە قووچـان هاتنە دەرەوە و لە نزیکی عەشیرەیەک کە سەرۆکیان میسرخان جریستانی میلانلـۆ بوو لەبەر کانی‌حەڵوا مەڵبەندی کوردەکانی ڕەشوانلوو بەسەرۆکایەتی کـەریم خـانی ڕەشوانلوو لە ئەسپەکەی کەوتە خوار و ڕانی شـکا. بـە جۆرێـک ناچـار بـوون لەوێـدا بمێننەوە بۆ دەرمـان کـردنی، لـە ڕووسـیە تـەبیبێکیان هـاورد و دوای ئـەو بـەرەو قووچان ڕێکەوتن.

ئەڵێن لە سەردەمی موحەممەدناسرخان ،بڕێک لە ئەرمەنیـەکان وەکـوو قاجـان بەگ و ئوورتان ئەرمەنی میۆژیان لە ڕووسیە بەخەرواری٧ تمەن دەیانکڕی و لە باتی قەنی ڕووسی ٣٣ تمەن بە خەڵک قووچان دەیانفرۆشی و دوای ئـەوەش لـە شـاری قووچان بە بازەرگانی خـەریک دەبـوون. هـەمووی ئەمانـەی کـە وتـراوە سـیخۆری ڕووسـەکان بـوون. وادیـارە ئـاخرین سـیخۆری ئەرمـەنی ڕووس لـە شـیروان دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی گەڕاوە بۆ شەورەوی.

هەروا کە زانایـانی قووچـان ڕادەگـەینن موحەممـەد ناسـرخان شوجاعودەولـە فەرمانبەرێکی خێرخواز و ئەدەب دۆس و تێگەیشتوویەکی زانستی بووە و خەڵکی لە کاتی ئەودا لە ئاسایش دا ژینیان تێپەردەکرد؛ موحەممەدناسرخان هـەم لـە هـۆنراوە حاڵی دەبـوو، هـەم هـونراوەی دەوت. لەشـەوانی هـەینی هـەتاکوو بـانگی بـەیانی ڕەوزەخوانی ئەکرد . بۆ تەکیەش دەچوو. لە ڕەسمەکانی دیکەی شوجاعودەولـەکان هە رلە سەردەمی خوالیخۆش‌بووەکان ئەمیرحوسەین خان و موحەممەدناسرخان تـا سەرەتای مەشرووتە لە کاتـێ عەبـدورڕەزا خـان شوجاعودەولـە لـە هەوەڵـی پـاییز

هەرکەس بە پێی دڵخوازی و پێویستی زستانی لەجل و بەرگ، گەنم و ئاردی بۆی حەواڵە دەکرا.[١٣٤] تەنانەت گۆشتی قوربانیشیان بۆ دەناردن و هاوکات شیرینی شەوی جەژن هەر لەیەک مەنەوە تا بیست مەن حەواڵە دەکرا و ڕەوانەی دووکانی موحەممەدئیبراهیم قەنناد یەزدی دەکرا، موحەممەد ئیبراهیم کە لەوێ قورەمابوو هاورێ لەگەڵ موحەممەد باقری برای هاتنە قووچان و ڕەمەزان خانی نایبولحکوومە پەنای دا ویارمەتیانی کرد و هەمیسان توانیان بارودۆخی ژیانیان چاک بکەن و ببنە دەوڵەمەندی ئەو دەڤەرە و ئێستاش ئیبراهیم زادەکان خاوەنی ناو و نیشانێکی بەرزن و زۆر دەوڵەمەندن[١٣٥]

لە سەردەمی دەسەڵاتی شوجاعودەوڵەکاندا شەوانە کاتێ کە شەو دەگەیشتە نیوەی خۆی و هات وچوو قەدەغە دەکرا لەم کاتەدا پاسەوانەکان دەکەوتنە ڕێگا و ئەو کەسانەی کە ناوی نهێنی شەویان نەدەزانی هەتا بەیان دەستگیر دەکران.

لەو داب و نەرێتانەی کە بۆ هاتووچووی ژنەکانی شوجاعودەوڵە دانرا بوو ئەوە بوو کە پێشخزمەتەکانی لە پێش کالسکەکانیانەوە بەرێ دەکەوتن و دەیانگوت دوور ببنەوە کوێرببن، بەچاوی خەیانەتەوە بۆ ژنەکانی گەورەمان نەڕوانن. هەروەها شەیپوورچی لە کاتی بەرێکەوتنی حاکم یان لە کاتی جەژنە ڕەسمییەکاندا پفی دەکرد بە شەیپوورەکەیدا و خەڵکی بەخەبەر دەهانی کە تاقمێک لەو شەیپوورچیانە بریتی بوون لە ١- موحەممەد ئیسماعیل چالاکی

١٣٤- لەبەر ئەوەی فەرمانبەرانی زەعفەرانلوو خزمەتکاری بەردرگای بەخێوی دەکرد و کار بەدەستەکانی دەزگای دەوڵەتی لە ئاسوودەیی بەشداری دەکردن بە هۆی ئەوە بوو کە ئەوان بیروخەیالی دزی و بەرتیلی گرتن لە خەڵکی ڕانەهێنن، تێربوونی کاربەدستەکانی هۆی تێر بوونی دەوڵەت و گەلە. کاتێک گەل نەداربوو دەوڵەتیش نەدارە و لەم ئاکامە خزمەتکاری بەردرگایش تووشی ئاڵۆزی ئەبێت و بۆ تێر کردنی بنەماڵەی خۆی بە ناچاری ڕوو بە هەر کارێک تەنانەت دزی ڕەوش و ڕەفتاریش بێت، دەبرێت. لەبەر ئەوەیە کە ڕەسوولی ئەکرەم نەداری نزدیکی کوفر ئەناسێنی.

١٣٥- خەڵکی یەزد کەبە هۆی کەش و هەوای خراپی خۆیانەوە ڕوویان کرد لە شارەکانی قووچان و شیروان و بجنۆرد ودەرەگەز و عێشق ئاوا و توانیان خەڵکی هەژاری ئەم ناوچانە چ کورد و چ تورکمان گوول بدەن و کڵاو بنێنەسەریان و لەباری ئابوورییەوە هەمووی ئەو ناوچانە بگرنە دەستەوە و خەڵکی هەژاری کورد و تورکمانیش دەبێ هەر کۆچەر بن و بە هەژاری وبێسەوادی بمێننەوە و چاوەڕوان بن بزانن یەزدییەکان ئاپارتمانیەکانیان چەند قاتی دروست دەکەن.

٢- عەبدولحوسەین ٣- حاجی موحەممەد ٤- حەسەن کەربەلایی ٥- نایب موحەممەد حەسەن‌خانی قەرەنەی ژەن ٦- یەدولڵاموزیک‌چی. موحەممەد ناسرخان پاش دەساڵ دەسەڵاتداریّتی لە مانگی زیحەحجەی ساڵی ١٣٢٠ی کۆچی مانگی لەشاری قووچان کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی ڕەوانەی مەشهەد کرا و لەتەنیشتی ئیمام ڕەزا بەخاک سپێردرا. ناوبراو کوڕی نەبووە. پاش کۆچی دوایی عەبدوڕەزاخان شوجاعودەوڵە لە مانگی سەفەری ١٣٣٧ی کۆچی دا هەمووی ئەو کەرستانەی کە بریّتی بوون لە موزیک و دەوڵ و ئالای عەشیرەتی زافەرانلوو بەخەڵاتی دراوە بە بارەگای ئیمام ڕەزا، بەڵام بە داخەوە هیچی نەماوە.

پاش ئەوەی کە هەواڵی کۆچی دوایی خوالیّخۆشبوو موحەممەد ناسرخانی شوجاعودەوڵە کەبە پێی یاسای عەشیرەتی دەبوای ئیلخانی بجنۆردیش لەم بەخاک سپێرییەدا بەشداری بکردبایا، بەڵام هێشتا نازانین دەسەڵاتدارانی حکوومەتی بۆچی لەم کارە ترسان و ئیزنیان نەدا یارموحەممەد خان سەهامودەوڵە سەردار موفەخخەم بەشداری بکات.

لەم چاخەدا دەوڵەت لەبەر ئەوەی بتوانێ دەسەڵات لەبنەماڵەی شوجاعودەوڵەکان بە هۆی لاویّتی و نەزانکاریانەوە وەربگریّتەوە موزەفەرولمەمالێکی ناردە قووچان و ئەویش لە لایەن خۆیەوە تەلگەرافێکی نارد بۆ ئەمینوسوڵتان و تەلگەرافێکیشی ڕەوانەی نەیرودەوڵەی والی خوراسان کرد[136] کە لەوێدا ئاماژەی بەئەوە کردبوو کە سالار موفەخخەم دەیەوێ بۆ پرسە و سەرەخۆشی بێت بۆ قووچان و کە ئەمەش کارێکی گرینکە بۆیە ئەمینوسوڵتان لەتەلگەرافێکدا داوای لەسەردار موفەخخەم شادلووی کرد بوو کە جیا لەوەی خۆشی بە سەرەخۆشی نایەت نابێ ڕەوانەی قووچان ببێت، هاوکات نابێ ئیزن بە هاتنی کەسیش بدات.

نەیرودەوڵەی والی خوراسان داروەستەی حکوومەتی کەلە قووچان بوون دڵنیایانی کرد بەنەهاتنی سالارموفەخخەم. لەم تەلگرافەدا بۆمان دەردەکەوێ کە تاقمی دەسەڵات لەم کاتەدا زۆر بە سەر قووچان و بجنۆرد دا زاڵ بوون، ئەوەی کە پێشتر دەسەڵاتێکی وەهایان نەبووە.

---

١٣٦- ئەترەک نامەی شاکری، ل٩٠

لەبەر ئەوەی ناوەڕۆکی تەلگرافەکەمان باس کرد خودی تەلگەرافەکەمان بە پێویست نەزانی بینووسین. (وەرگێر)

## کوردەکانی مازندەران و دەسەڵاتی جەعفەرقولی خان لە ئەستەرئاوا

تاقمێکی زۆر لە کوردەکان لە درێژایی مێژوو لە مازندەراندا نیشتە جێ کراون کە لە سەردەمی شاعەبباس بەم لاوە لەوێ نیشتە جێ کراون، لەسەردەمی نادرشا و قاجارەکاندا یان بە هۆی دوورخستنەوەی کوردەکان لەزێدی خۆیان یان بە هۆی پاراستنی سنوورەکانی باکووری ئێران بۆ ئەم ناوچانە کوردەکان دەس بەسەر کراون. لەسەرەتای دەسەڵاتدارێتی شاعەبباسەوە کە دەسەڵاتی مازندەران لە ئەستۆی فەرهادخانی فەرمانلوو بوو بە بێ شک تاقمێک لە کوردەکان لەوێ نیشتەجێ کران کە ناوچەکانی کوردکووی بوو بەمەکۆی ئەوان. مەعسووم عەلیشا لەسەفەرنامەکەی خۆیدا بۆ مازندەران سەبارەت بە کوردەکانی عەممارلووی ئەوێ ئاوای نووسیوە:

دووشەممە نۆهەمی شەعبانی ١٣١٤ی کۆچی دەبێ بڕۆین بۆ گەڵووگا. سێ فرسەخە، عەسر گەیشتینە شوێنێکی ئاوەدان. ٨٠٠بنەماڵە لە عەشیرەتی عەمرانلوو کەلە سەرەتاوە قەفقاز بوون. کوردەکانی خوراسان کە چامەشگەزک و شادلوو بوون لەسەرەتاوە لە ناوچەی قەفقاز و باکووری ئازەربایجاندا نیشتەجێ کران وئیستاش لەم شوێنەوە هەرلە کۆچدان و ٥٢ سوارەیان لە دیواندا کاردەکەن و چاوەدێری ڕێگەو بانەکانن. لە نێوان گورگان و مازندەراندا دەگەڕێن. سەرهەنگی ئەم عەشیرەتە واتا عیساخان ئامارلوو مانگی ڕابردوو کۆچی دوایی کرد. مووساخان کە گەیشتۆتە تەمەنی ١٠ساڵی و زۆر زیرەک و وریایە، عەشیرەتی ئەو ئەویان بۆ جێگری باوکی دەوێت و عەلی ئەکبەرخانی ئامۆزاشی بەکارەکانی ڕادەگات تا گەورە دەبێ.[١٣٧]

مەکەنزی یەکەمین نوێنەری ئینگلیز لە ڕەشت کە لەبەرواری دسامبری ١٨٥٨ ڕەزبەری ١٢٣٧ی کۆچی هەتاوی سەفەرەکانی خۆی بەرەو مازندەران دەست پێ کرد و لەسەفەرنامەکەی دا لە جیاوازی نێوان ڕەگەزی خەڵکی مازندەران باسی کردووە و سەبارەت بە کوردەکان گوتوویە کوردەکان لە عەشیرەتی جان بەگلوو و

---

١٣٧- تەرائق ئەلحەقائیق، مەعسووم عەلیشا، ل٦٥٨

مدانلوون[١٣٨] کەلە دەرڕەشێرو میان ڕوود و فەرەحئاوا نیشتەجێن.[١٣٩]

له لاپەڕەی ١٢١ی ئەم کتێبەی دا له کاتی چوونە دەرەوەی لە فەرەح ئاوا گوتوویە لە ١٨ی ژانوویە لە نێوان بەفروبۆراندا لەفەرەح ئاواوە بەڕێ کەوتین، نێوانی ئێمە تا ساری چوار فرسەخ بووە، ڕێگەکەمان لە لای چەپی ڕۆخانەی تەجەنەوە ڕادەبرد... لە لای ڕاستەوە گوندێکی گەورە بە ناوی حەمیدئاوا دەبینرا کە کوردەکانی جانبەگلوو لەوێ نیشتە جێ بوون.[١٤٠]

له لاپەڕەی ١١١ جگە لە پیشاندانی ئەژمارو ڕێژەی سپای نارێک و پێکی کورد و تورکی مازندەران ئەژماری سپای کورد لە هەموان زۆرترە. واتا ٥٠٠کەس لە عەشیرەتەکانی جان بەگلوو و مدانلوو. لە شەمس کەندەش دا نووسیوە کە دوو بنەماڵەی کورد لەوێ بوون، ل ١٣١ و هاوکات سەبارەت بە ٣٠٠کەس لەسەربازەکانی گەڵووگاش دەڵێ ٢٠٠کەسیان لەکەلباد و ١٠٠کەسیان لە کوردەکانی عومرانلوو( ئامارلوون). ل١٤٣.

## شەڕ و پێکدادانی فەتحعەلیخانی قاجاڕ و شەکەربەیگی کوردی جەهانبەگلوو

سەبارەت بە جەهانبەگلووەکان و شوێنی نیشتەجی بوونیان بەڵگەیەکی وامان بە دەستەوە نیە، بەڵام ئەوەی کە ئاشکرایە ئەوەیە کە جەهانبەگلووەکان عەشیرەتێکی چامەشگەزکن کە لەسەردەمی شاعەبباس دا ڕوویان کردۆتە خوراسان و وێدەچێ هەر لەوکاتەوە لە سنووری نێوان خوراسان و ماندزەراندا نیشتەجێ بووبێتن کە هۆی بەدیهاتنی دەشتە وشکەکانی جوەین و جاجەرم نێوانی جەهانبەگلووەکانی لەگەڵ عەشیرەتی چامەشگەزکی زۆر کردووتەوە. هەر بەم بۆنەوە کاتێ کە قاجاڕەکانی ئەستەرئاباد هێرشیان هێنایە سەریان لە لایان کوردەکانی خوراسانەوە یارمەتی نەدران.

---

١٣٨- واتا عەشیرەتی ماد کوردەکانی مادانلوو. تاقمێکیان لەدەرەگەزی خوراساندان و تاقمێکی تریشیان بە گوێرەی نووسەری دیاربەکرییە کە دەڵێ مادلووەکان لە کوردستانی عێراق لەدەوروبەری فورات و ئاقسوو لە تەنیشتی موردان ئاودا بوون. دیاربەکرییە ل١٨٨-ل١٨٧

١٣٩- سەفەرنامەی باکوور چارازفرانیس مەکەنزی وەرگێڕدراوی مەنسووره نزام مافی. ل١٠٧

١٤٠- هەمان سەرچاوە

لە ئاکامی دەسەڵاتی سەفەویدا کە مێژووی ئێران لەوکاتەدا لە کزترین باری ڕامیاریدا بووە و لەبەر ئەوە لەبواری نووسینەوەی مێژووە ئاوڕێک وەها نەدراوەتەوە و نووسەران و وێژەران ڕوویان کردە دنیای شێعر و ئەدەبیات. بۆیە لەم سەردەمەدا زانیاریەکی پوختمان سەبارەت بە بارودۆخی عەشیرەتەکان و مێژووی کوردەکانی خوراسان نەبووە، لە کاتێکدا کە ئەفغانەکان لە ئەسفەهاندا دەسەڵاتیان هەبووە، فەتحعەلی قاجاریش لە مازندەراندا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هێزی خۆی زۆرتر کردبوو و دوژمنەکانی خۆی لە ناودەبرد، نووسەری ڕەوزەتوسسەفا لەم بارەوە هێناویە:

...... لەو ڕۆژگارانەدا کە سەردەمی لاواز بوونی دەوڵەتی سەفەوییەی مووسەوییە بوو، شوکوربەیگ کە لە کوردەکانی جەهانبەگلوو لە ناوچەی دەرەفەندەرەسکی ئەستەر ئاوادا دەسەڵاتی هەبوو و کەسیش دژی نەدەوەستا گەورەکانی قاجاڕیش لەڕێ ناچارییەوە ببوونە فەرمانبەرداری.[141]

هەر لەم سەردەمانەدا بوو کە فەتحعەلیخان قاجاڕ کە باب و باپیرانی لە مێژەوە سەرۆکایەتی عەشیرەتی قاجاڕیان لە ئەستۆدا بووە سەری دەرهێنا و زاڵ بوو بەسەر دژەکانیدا و ئەستەرئاوایشی داگیر کرد. نووسەری ناسێخوتتەواریخ لەم بارەوە نووسیوویەتی: دانیشتوانی ئەستەرئاوا و دارودەستەی قاجاڕ کاتێ کە ئەم هێزە هەڵمەتەی فەتحعەلیخانەیان بینی هەموویان لەڕێ ناچارییەوە بوون بە فەرمانبەرداری و هەمووی ئەستەر ئاواش کەوتە ژێر دەسەڵاتی و پاشا دەکەوتە سەری تا هەمووی مازندەران بهێنێتە ژێر ڕکێفی خۆی. یەکەمین شوێنێ کە داگیری کرد فەندەرەسک بوو. لەوێوە کە شەکەربەیگ ناوێک کە لە عەشیرەتی جەهانبەلگوو بوو لەو شوێنەدا ناونیشانێکی بەرزی هەبوو. دژ بە فەتحعەلیخان وەستابوو و لەم کاتەدا تاقمێک سەربازی کۆ کردەوە و هێرشی کردەسەری کەلەبچەی کرد.[142]

سەرکەوتنی فەتحعەلیخانی قاجاڕ لەسەر کوردەکانی بەیگلوو بوو بە هۆی دەست داگرتنی بەسەر مازندەران و ناوبراو لە مازندەران ناو و نیشانێکی زۆری

---

١٤١- ڕەوزەتوسەفا- بەرگی ٩ ل ١٠
١٤٢- ناسێخوتتەواریخ قاجاڕ، ب١،ل١٣

دەرکرد بوو و بوو بە هۆی دەربازبوونی شاتەهماسبی سەفەوی لە قەزوێن و پەنای برد بە فەتحعەلی خانی قاجاڕ و لەوێشەوە ڕووی کردە خوراسان. بەڵام لە خوراساندا فەتحعەلی خان خەیاڵی لەناو بردنی کوردەکانی کردبوو و بۆیە کوردەکان نادرقولی شای ئەفشاریان‌دابەگژی دا و شاتەهماسبی سەفەوی لە مەشهەد حوکمی لە سێدارەدانی ناوبراوی دەرکرد و بۆیە سەری فەتحعەلیخان لە لاشەی جیا کرایەوە کە لە بەرگی یەکەم دا، باسیمان هێنا.

سەبارەت بە کوردەکانی جەهانبەگلووی سەردەمی دەسەڵاتی موحەممەد حوسێن خانی کوڕی فەتحعەلی خان شارەزاییێکی پوختمان نیە، لەسەردەمی ئاغا موحەممەد خانی کوڕی موحەممەد حوسێن خان کەلە شیرازەوە دەرباز بوو هەمیسان ناوی کوردەکانی جەهانبەگلوو بەسەرۆکایەتی ئەبدال خانی کوردەوە کە وێدەچێ لەبنەماڵەی شەکەرسولتان بێت کە لە لاپەڕەکانی مێژووی ئێراندا نووسراوە.

خوالێخۆشبوو بامداد جیا لە شرۆڤەی شەڕەکانی ئاغا موحەممەد خانی قاجار دژ بە براکانی ناوی کوردەکانی جەهانبەگلووی مازندەرانی نووسیوە و هاوکات باسی هێزو هەڵمەتەکانی ئەوانیشی نووسیوە و دەڵێ: ئەبداڵ خانی کوردی جەنانبەگلوو لەسەرکردە بەناوبانگەکانی کورد کاتێ کە ئاغا موحەممەدڕەزاقولیخان برای تری ئاغا موحەممەد خان لەم سەردەمدا حاکمی ئەستەرئاوا بوو و خۆی تەیار کردبوو و ڕووی کردبووە ساری و هاوڕێ لەگەڵ خان ئەبداڵ خانی کوردی جەهانبەگلوو بەرانبەری یەک بوونەوە و ناوبراوی کەلەبچە کردو پاشان دای لەسێدارە.[١٤٣]

نووسەری ناسێخوتتەواریخ لەم بارەوە زۆر دواوە وگوتوویە، کاتێ کە کەریم خانی‌زەند لە ڕۆژی سێ شەممە ١٨ی سەفەری ١١٩٣کۆچی دوایی کرد، ئاغا موحەممەد خان کە هاوڕێ دووبراکەی لە شیراز بوو، لەم باردۆخە کەڵکی وەرگرت و بەرەو تاران هەڵهات. ناوبراو پانسەد بنەماڵەی کوردی جەهانبەگلووی لەگەڵدا بوو[١٤٤]

---

١٤٢- مێژووی پیاوانی ئێران، مەهدی بامداد، ب١، ل٢٥١

١٤٤- ناسێخوتتەواریخ قاجاڕ. سپهر. ب١،ل٣٧

لێرەدا نووسەر ڕوونی نەکردووتەوە کە کوردەکانی جەهانبەگلوو وەک کوردەکانی بەچەغالی لە ڕوودەهێندا بوون یان وەک قەراچوولووەکان لە خوارو وەرامیندا دەژیان، یان لە مازندەرانەوە هاتبوون و خۆیانیان گەیاندبووە ئاغا موحەممەد خانی قاجار.

خاڵی گرینگی سەرکەوتنەکانی خانی قاجار پشتگیری کردنی خان ئەبداڵ خان بووە کە توانی ماڵیەیەکی زۆر لە مازندەران و دەوروبەری تاران کۆبکاتەوە و ڕەوانەی شیرازی بکات.

مورتزا قولیخانی برای ئاغا موحەممەد خان کاتێ خەبەری مەرگی کەریم خانی بیست لەئەستەرئاواوە هێرشی کردەسەر بابل و ئەو ناوچەیە داگیر کرد و خۆی وەک پاوشا ناساند و هاوکات برایەکی‌تریشیان بە ناوی ڕەزاقولی پشتی لە ئاغاموحەممەد خان هەڵکردو پەنای هێنایە ئەو.

ئاغا موحەممەدخان بارودۆخەکەی ئاڵۆز بینی. براکەی واتا جەعفەر خانی هاوڕێ ئەبداڵ خانی کورد نارد تا بچنە گژ برا شۆڕشگێڕەکانی و لەشەڕێکی دژواردا تێکیانی شکاند و دەرباز بوون و ئاغا موحەممەدخانی قاجار سەرکەوتوانە ڕووی کردە ساری.

پاش ماوەیەک زەکی‌خان زەند بوو بە جێگری کەریم خان و سپایەکی گەورەی بەسەرۆکایەتی عەلی‌مورادخانی زەند بۆ دەستگیر کردنی ئاغا موحەممەدخانی قاجار ڕەوانەی مازندەران کرد و هاوکات لەشەڕێکی دژواردا کەلە ئامول ڕووی دا ئامرهێزی زەند لە شەڕی دژ بە ئەبداڵ خانی کورد تێک‌شکا و بەرەو تاران دەرباز بوو.

لە سەرەتای ساڵی ١١٩٥ی کۆچیدا ڕەزاقولیخانی برای ئاغا موحەممەد خان کە لە لاریجاندا هێزێکی ڕازاندبووەوە هێرشی بردە سەر ئاغا موحەممەد خانی قاجار کە لەو کاتەدا لە بابل بوو. گەمارۆی کاروانسەراکەی دا و ئەو کاروانسەرایەی گڕ تێ بەردا. فەتحعەلی خان قاجار کە لەو کاتەدا لەبابل بوو، گەمارۆی کاروانسەراکەی دا و ئەو کاروانسەرایەی گڕ تێ‌بەردا، فەتحعەلی خان قاجار_ فەتحعەلیشای دوایی_ و براکانی و دایکی لەگەڵ ئاغا موحەممەد خانی قاجار دابوون. ئاغا موحەممەد خان شەڕێکی گەورەی خستە ڕێ و چاوەڕێ هاتنی سەرۆکی خۆی بە ناوی خان‌ئەبداڵ

خانی کورد بوو تا لە سارییەوە بێتە هانایەوە، بەڵام خانئەبداڵخان پاش وتووێژێکی زۆر لەگەڵ براکانی ئاغا موحەممەد خانی قاجار گوتبوویان ئاغا موحەممەد خان لەبەر ئەوەی کە قیڕەیە شیاوی پادشایی ئێران نیە و گەلانی ئێران وەک پادشایێک نایانئەوێ. ئەبداڵ خانیش بەم بۆنەوە خۆی خستە ناوهێزی دوژمنەکانی ئاغا موحەممەد خانەوە و لە کاتی دەسگیری و کوشتنی ئاغا موحەممەدخاندا هەوڵی زۆری داوە و ئەبداڵخان بوو بە هۆی ئەوەی تا ئاغا موحەممەد خان خۆی بداتە دەستی ڕەزاقولیخانی برایەوە و ئەویش بەرەو بەندپەی دەستبەسەریانی کرد و خۆی وەک پادشای ئێران ناساند.

لەم کاتەدا جەعفەرقولیخان برایەکیتری ئاغا موحەممەدخان دژ بە ڕەزاقولی خانی برای وەستا. ڕەزاقولیخان ئەبداڵخانی کوردی هاوڕێ ٤٠٠سەرباز نارد تا بەرەنگاریان ببنەوە. کاتێ هەردوو لەشکر بە یەک گەیشتن و شەڕ دەستی پێی کرد، بەبرسوڵتان کورد بە دەستی شێران وەها کوژرا و لەشکری ئەبداڵ خان تێکشکان و لەو ناوەدا خانئەبداڵ خان دەرباز بوو و خۆی گەیاندە ساری و هەمیسان سپایەکی تری ڕازاندەوە و چووە مەیدانی شەڕ و هەمیسان تێکشکا و پاش خۆحەشاردان لە دوکانێکی واکسی دا، دەستگیر کرا.

خان ئەبداڵ خان تونەیلێکی لەماڵی خۆیەوە بۆ دەرەوەی ساری کەند بوو و کاتێ ویستی لەوێوە دەرباز ببێ یەکێ لەژنەکانی ئەم هەواڵەی گەیاندە سپای ئاغاموحەممەدخانی قاجار و ئەوانیش خێرا کەلەبچەیان کرد و کوشتیان و ئەمە بوو بە هۆی شکستی ڕەزاقولیخانی قاجار و دەسەڵات پەیدا کردنی ئاغا موحەممەدخانی قاجار.

کوژرانی ئەبداڵ خانی کورد کە لەساڵی ١٨٧٠ی زایینی ڕووی دا، ژان گورەی فەرانسەوی سەبارەت بە ئەبداڵ خان گوتوویە: کاتێ کە ئاغا موحەممەد خانی قاجار بۆ داگیر کردنی لاریجان لە تارانەوە ڕووی کرد مازندەران. لە بابل ڕەزاقولیخانی برای کردە بەرپرسی هێرش کردن بەسەر دژ و دوژمنە بەناوەکانی موحەممەد قولیخان ڕەش و موحەممەدقولیخانی سپی و داکۆکی کرد تا ئەو دوو کەسەی بۆ کەلەبچە بکەن و بیهێننە خزمەتی. ڕەزاقولی خان ڕووی کردە لاریجان و کاتێ گەیشتە ئەو دەڤەرە، ناوبراوان دووکەسیان ناردە پێشوازییەوە تا ڕای بگەیەنن: بەو

مەرجەی حازر دەبێ خۆیان بدەنە دەستەوە کە ئیزنیان بدرێ خۆیان بگەنە خزمەتی ڕەزاقولیخان و دەردەکانیان پێی بڵێن و ڕەزاقولیخانیش ئەو بڕیارەی پەسند کرد و ئەوانیش هاتن و بە ڕەزاقولیخانیان ڕاگەیاند ئەگەر بۆ خۆت دەبی بەپادشای ئێران ئێمە یارمەتیشت دەدەین و کەرستە و ئامێری پێویستیشت بۆ بەدی دەهێنین جا ئەگەر وانەبێ لە ئاغا موحەممەدخان پێڕەوی ناکەین لەبەر ئەوەی ئاغا موحەممەدخان جگە لەوەی هەڵمەتی ماڵ و دارایيمان دەدا، هاوکات شیاوی پادشایی ئێرانی کۆنی نییە، لەبەر ئەوەی قیڕەیە، لە ئاکامدا ئەم قسانە لە ڕەزاقولیخاندا کاریگەری دانا و لەوان پرسیاری کرد کە چلۆن دەکرێ لەگەڵ ئاغا موحەممەد خاندا شەڕ بکرێ؟.

موحەممەد قولیخانی سپی گوتی: هەر ئێستا ئێمە بەهێزمانەوە دینە ژێرفەرمانی تۆ و ڕوو دەکەینە بابل و ئاغا موحەممەدخان دەگرین و کەلەبچەی دەکەین، ئەبداڵ خانی کوردیش ئەمێستا چەکدارەکانی لە لاریجاندایە و لەم کارەدا یارمەتیتان دەدا، ڕەزاقولیخان پرسی: ئەبداڵ خان کێیە؟

موحەممەد قولی خانی ڕەش گوتی: ناوبراو یەکێ لە هەڤاڵەکانی ئێمەیە لەبەر ئەوەی ئێمە زۆر لە ئاغاموحەممەدخان دەترساین، داوامان کرد تا ئەبداڵ خان یاریدەرمان بێت کە ناوبراو زۆر پیاوێکی بەتوانایە، بۆیە ئەویش هاتە یاریمانەوە و ئێستا لەوێیە.

لە ئاکامدا ناوبراوان ڕوویان کردە بابل و پێش ئەوەی کازیوە خۆی بنوێنێ، ئەبداڵ خان لەباخی وەشەندا گەمارۆی ئاغا موحەممەد خانی دا و لەم کاتەی کە ئاغا موحەممەد خان نەیدەزانی کێ و بۆچی گەمارۆی داوە یەکێ لەهاوڕێیەکانی کردەبەرپرسی ئەم لێکدانەوەی تابزانێ گەمارۆدەرەکە کێیەو کاتێ ناوبراو هاواری کرد کە ئێوە کێن و چیتان دەوێ، ئەبداڵ خانی کورد بانگی دا کە ئێمە ئاغاموحەممەد خانی قیڕەمان دەوێ تا بیبەینە خزمەتی ڕەزاقولیخان. کاتێ ئاغاموحەممەدخان ئەمەی بیست و زانی کە براکەی گەمارۆی داوە، خێرا کەسێکی ناردە لای ڕەزاقولیخان و پرسی بۆچی کاری وات کردووە و ئەویش لە وەڵامدا گوتی دنیا هەرپێنجڕۆژ بە دەستی کەسێکەوەیە و ئێستا نۆرەی من گەیشتووە.

پەیکەکە گەڕایەوە هەواڵەکەی گەیاندەوە پاشای قاجاڕ.پاشای قاجاڕ کە زانی

پێی ناکرێ لەڕێ ناچارییەوە خۆی دایە دەستەوە و ئەبداڵ خانیش کە بۆ کوشتنی ئاغا موحەممەد خانی قاجار ١٠هەزار تمەنی پێی درابوو زۆر حەزی لێی بوو هەر خێرا ئاغا کەلەبچە بکات و بیکوژێ؛ بەڵام لەو کاتەدا ڕەزا قولیخان گوتی: ئەبداڵ خان تۆ دەکەمە سەرپەرشتیاری براکەم و من دەبێ بڕۆمە دەم کاری خۆمەوە. لەم کاتەدا حاجی‌خان حەڵاڵخۆر خەڵکی بەندپێی مازندەران گوتی: قوربان ئەوە دوو کوڕم لەبارمتە دادەنێم با ئاغاموحەممەدخان لای من بێ، نەک گەزندێ بە برای خۆشەویستت بگات. ڕەزاقولی خانیش قسەکەی پەسند کرد و ئاغا موحەممەدخانی قاجاڕی بردە لای خۆی. ئەبداڵ خان هەر وازی نەهانی و پاش ماوەیەک حاجی‌خانی خەبەردار کرد کە دەیەوێ ئاغا موحەممەد خان بکوژێ، حاجی‌خانیش کە پیاوێکی فێڵ باز بوو و گوتی با بیری خۆم بکەمەوە جا پێت دەڵێم و حاجیخان ئەم ڕاستیەی بۆ ئاغاموحەممەدخان گەڕاندەوە و ئەمیش داوای کرد لە حاجی‌خان تا بزانێ بۆچی دەیەوێ ئەم کارە بکات و لەدیداری دوایی ئەبداڵ خان و حاجی‌خان دا حاجی‌خان گوتی: ئەگەر ٥٠هەزار تمەن بدەی دەیدەمە دەستەوە و ئەویش گوتی: مەگەر ئاغا کێیە کە بۆ کوشتنی ٥٠ هەزار تمەن بدەم، ئەگەر نیوەی ئەو پارەی کە گرتوومە و کەچی تا ئێستا ٢ هەزار تمەنیم وەرگرتووە و ٨ هەزاری ماوە بیدەن بەمن، دەیدەم.

ناوبراو بۆ دوورکردنەوەی ئاغا موحەممەد خان لە چنگی ئەبداڵ خان، کەوتە پیلان‌گێڕێ و هاوکات ئەبداڵ خان تووشی نەخۆشی حەسبە بوو و ماوەی ١٥ ڕۆژ نەیدەتوانی لە شوێنی خۆی بجووڵێتەوە و ئەمەش هەلێکی باش بوو تا ئاغا موحەممەد خان دووربخرێتەوە. پاش چاک بوونەوەی،ئەبداڵ خان هێرشی کردەسەر ماڵی حاجی‌خان و کەچی ئاغا موحەممەدخان بەرەو بەندپی نێردرابوو. بانگهێشتی براکانی‌تری کردبوو تا ئەبداڵ خان لەناو بەرێن و کەچی ئاغا موحەممەدخان سەرکەوت و هێزی لە ڕەزاقولیخان وەرگرتووە و هێزەکانی حاجی‌خانیش، ئەبداڵ خانیان کەلەبچە کرد و دوایی ئاغا موحەممەد خان کوشتی و حاجی‌خان بۆ هەتاهەتایە مانگانە ٢ هەزار تمەنی پێی دەدرا و دەسەڵاتی شاری بەندپێی پێی بەخشرا، ڕەزاقولیخانیش چووە ئێسفەهان و زەندییەکان یارمەتیان نەدا و چووە مەشهەد و لەوێش جێگرەکانی نادر وەڵامیان نەدایەوە و پاشان لەمەشهەد

دیقــی کــرد و مــرد. ئاغــا موحەممــەدخانیش شــەوی جێــژنی نــەورۆزی ۱۵ی ڕەبیعولئەوەڵی ۱۱۹۵ی کــۆچی تاجــێ کــە مازندەرانیــەکان دروســتیان کردبــوو لــە مازندەران نایە سەری و بووبە پاشای ئێران.

ســەبارەت بــە کوردەکــانی مازنــدەران هــەر وەک کوردەکــانی کوردکــووی و شوێنەوارەکانیتر لە دواییدا زانیاری زۆرتر وەدەست دەهێنین، بەڵام دەتوانین بڵێین جگە لەسەردەمی سەفەوییەکان لــە ڕۆژگــاری نادرشــای ئەفــشار و قاجارەکــانیش دا ڕاگوێزانی کوردەکان بۆ ئەم ناوچانە ڕووی داوە، بە تایبــەت لەســەردەمی دەســەڵاتی جەعفەرقولی خانی ئیلخانی شادلوو و یارموحەممەد خانی شادیلوو لــە ئەســتەر ئــاوا، تاقمــێ لــەم کوردانــە لــەوێ نیــشتەجێ کــران و کوردەکــانی ناوچــەی دەماوەنــد و کلاردەشت لەم دوورخراوانەن کە لە خوراسانەوە دوورخراونەتەوە بۆ ئەوێ.

مەکەنزی لە سەفەرنامەکەی خۆیدا لەساڵی ۱۸۵۸ی زایینی لە کــاتی چــوونی بۆ ئەستەرئاوا -گورگان- کە دەسەڵاتی ئەو دەڤــەرە بــە دەســتی جەعفــەرقولیخانی کوردی شادیلۆوە بووە. سەبارەت بەم کوردانە نووسیوە: لەسەردەمی شائیــسماعیلەوە تاقمێک لەم کوردانە لــە کوردســتانەوە بــۆ ئــەم ناوچانــە- ئەســتەرئاوا وخوراســان — ڕاگــوێزران. ساڵــی ۱۸۳۳ بــەڕێز فریــزر، بــۆ خــۆی جەعفــەرقولیخانی دەناســی و نووسیبووی کە ناوبراو بــەهێزترین و نــەترس‌تــرین پاڵــەوانی خوراســانە و یــەکێ لــە دوژمنەکانی تورکمانەکان کاتێ کــە فریــزر لەمەشــهەد بــوو، تــاقمێکی بەنــدکراوە و سەربڕاوەیان بۆی ڕەوانە کرد کە ئەوانەی بوون وا لە شەڕی جەعفەرقولیخانــدا تێــک شکابوون. جەعفــەر قولیخــان پــاش مــردنی بــاوکی ـنەجــەفقولی خــان‌ـ بــوو بــە هەواخوای ئاسەفوددەوڵە؛ بەڵام لەبەر ئەوەی ئاسەف تێکــشکا، نــاوبراو ماوەیــەک لــە تاران لەبەند بوو و لەژێر چاوەدێری تاقمی دەسەڵات دەژیــا و بــەڵام بــەهۆی ترســی تورکمانەکان لە ئەو ناسرەدین شا کردی بە دەسەڵاتداری ئەستەرئاوا.

ئەم وتەی فریــزەر ڕاســت نیــە لەبــەر ئــەوەی تــاقمی دەســەڵاتیش لــە هێــزی جەعفەرقولیخان دەترسان و نەیاندەوێرا دەسەڵاتی شــوێنێ بــدەن بــە دەســتیەوە و هاوکــات ئــەویش هــیچ بــاوەڕێکی بەئــەوان نــەمابوو. جارێکیــان جەعفــەرقولیخان بەسپاییەکەوە لە کورد و تورکمان ڕەوانەی تاران بوو، تا لە شەڕی باشــووری ئێــران دژ بە ئینگلیزییەکاندا بەشداری بکات بەڵام پادشای ئێران ئیزنی نەدا و گــەلانی ئێــرانی

لەشەڕی ئینگلیزییەکاندا لەخوێنی خۆیاندا گەوزابوون جەعفەرقولیخان یەکەم کەس بوو کە پێشنیاری بەسیجی گشتی دا بە پادشا. بەڵام شای قاجاڕ لەترسی ئینگلیزییەکاندا بەقسەی نەکرد و ئیزنیشی نەدا تاکوو ڕووبکاتە باشوور.

هەمانکات ڕایگەیاند جەعفەر قولیخان وەک پێشوو لە بجنۆرد دەبێ کار بکات، ناوبراو تەنیا وادەنوێنێ بەڵام هەر خەریکی شەراو خواردنەوە و دەرمانە.

مەکەنزی چەند جار لە ئەستەرئاوادا لەگەڵ جەعفەرقولیخانی ئیلخانی چاوپێکەوتنی هەبووە و لە میوانییێکدا کە نوێنەری ڕووس لە ئەستەرئاوا بەڕێی خستبوو، دەڵێن: ئیلخان و براکەی وەک ڕێ و ڕەسمی ئێرانیەکان شەرابیان دەنۆشی، واتا شەرابیان وەکوو ئاو دەخواردەوە.

پێش چوون بۆ ئەستەرئاوا، کونسوولی ئینگلیز دەڵێ: سەرەتا لەگەڵ میرزای کونسوولی ڕووس و چوار سەربازدا چاوپێکەوتنمان هەبوو و بەخێر هاتنیان پێی گوتین. پاش ماوەیەک برای ئیلخانی سوبحان قولی خان شادیلوو هاتە ڕیزی ئێمەوە و پاشماوەی ڕێگای لەگەڵمان بوو و بەباس کردن لەسەر تورکمانەکان کە بەم زوانە ڕوویان زۆرتر ببوو، گوزەرا. جەعفەر قولیخان ئیلخانی فەڕاشباشی و چەند سەروازی دامغانی لە نزدیکی دەروازی مازندەرانەوە ناردە پێشوازیمانەوە.

ڕۆژی ١٩ یەم جەعفەر قولیخان هاوڕێ دووبراکەی واتا حەیدەر قولیخان و سوبحانقولی خان هاتە چاوپێکەوتنمانەوە. جەعفەر قولیخان پیاوێکی باڵا بەرز و تووڵەکە بوو و ئێمەی بەخۆیەوە نووساند، لەبەر ئەوەی لەو تاقمە خانە کوردانە بوو کە دژ بە هێرشی تورکمانەکان بۆ پاسداری لە سنوورەکانی خوراسان وەستا.

مەکەنزی دەڵێ: هەزار سەرباز لە ژێر فەرمانی جەعفەرقولیخاندا بوون، هەروها سەبارەت بە نیشتەجێ کردنی عەشیرەتەکانی تورکمان لە لایەن جەعفەرقولیخانی ئیلخانی لە سنوورەکانی ئەترەکدا نووسیوویە: تاقمێک لە تورکمانەکانی گۆگلان و یەمووت کە سی ساڵی ڕابردوو ١٨٢٨ی زایینی پەنایان هێنابووە خاکی کیوک و بە هۆی گوشاری ئوزبەکەکان لەو ناوچەیە کۆچێندران و داوایان کرد لە ئیلخانی تا پەنایان بدات و لەهەمانکاتدا حازر بوونماڵیات بدەن. ئیلخانی زۆربەی نوێنەرەکانیانی دەناسی و سەردەمێ کە باوکی واتا نەجەفقولی خان زیندوو بوو، لەبجنۆرد دیبوویانی و ئیزنی پێیان دابوو تا لە قەڵای ڕەشدا جێگربن،

ئەم قەلایە لە نزدیکی ئەترەکەوەیە.

جگە لە کوردەکانی جەهانبەگلوو، کوردە گۆرانەکانیش لەو ناوچانە دادە بینـرێن کە لە بەشی دووەمدا ئاماژەمان پێی دا، ئاغەی گۆران کە خۆی لەو کوردانەیە گـوتی: گۆرانەکان لە نزدیکی سەوادکۆ لە گوندەکانی ورسک و سووئاوا و ئووریم نیشتەجێن.

## بیروڕای موزری فەرانسەوی سەبارەت بە کوردەکانی خوراسان و تورکمانەکانی یەمووت

موزەر لەسەفەرنامەی تورکستانی و ئێراندا لە کاتی هاتنی بۆ ناوچـەی بجنـۆرد لە ژانویەی ١٨٨٣ ڕێکەوتی بەفرانباری ١٢٦٢ی هەتاوی چەنـد باسـی سـەبارەت بـە بجنۆرد نووسیوە.

ناوبراو پاش دیداری لەگەڵ خانی خێوە و هاتنی بۆ وڵاتی ئێـران هاتـە گونـدی گەرماب.- گەرماب یەکێکە لە گوندەکان کە ئێستا وا لە وڵاتی یـەکێتی سۆڤـیەت و لەڕابردوودا مەیدانی شەڕانخێزی دوو گرۆپی کورد و تورکمان بووە-.

نووسەر لەسەر کێوەکانی نێوان گەرماب و ڕوبات زۆر شتی دیوە و دەڵێ: لەسەر ئەم کێوانەوە کە وەک، ئەهرۆمەکانی مسیر دەبینـرا. بەردگـەلێک کـۆ کرابوونـەوە و ببوونە بورج و قەلا، سەردار:- مەبەست سـەرداری تورکمـەنی ڕینـوێنی نووسـەرە- پاش بینینیان شتهایێک دەهاتەوە بیری کە لەو کاتانەی خۆی لەو شەڕانەدا بەشـدار بوو و دەیگوت لەم وڵاتانا خوێنی زۆر ڕژاوە. هـەر کەسـێک لێـرەوە ڕادەبـرێ دەبـێ بەردێک لەسەر ئەو کەڵەکەبەردە دابنێ.[١٤٥] لەژێر پای ئێمەدا ڕوبـات قـەلای کـوردان بوو کاروانەکەمان لەسەر بەفرەکانەوە گەیشتنە قەلاکە، ڕوبات لـە دەوری ٥٠٠کـەس جەماوەری هەیە کە خەریکی کاری کشت و کاڵن.

ژنـەکان هاتبوونـە سەرکەڵـەکەکان، بـەبێ ئـەوەی خۆیـان پۆشـتە بکەنـەوە دەیانڕوانی. ژنە کوردەکان لەبواری ڕواڵەتەوە لەگـەڵ ژنـە تورکمانەکانـدا جیاوازیـان هەیە... پاش دوو ساعەت لە ڕوبات چوینە دەرێ و پاش پێوانی ڕێ، دۆڵێکی گـەورە

---

١٤٥- ئەم داب ونەریتە هێشتاکوو لـەناو کوردەکـانی سنوورنـشیندا بـاوە و هـەر کاتـێ بگـەن بـەو کەڵەکانە بەردی لەسەر دادەنێن و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرزتر دەبنەوە.

هاتە بەر ڕێمان و پاشان قـەڵای کـوردی فەشـەم دەرکـەوت، خەڵـکی قەڵاکـە زۆر بەخێرهاتنیان کردین، لەوێ ئاگرێک ڕۆشن کرا کە دووکەڵی نەبوو. من بـەم بۆنـەوە زۆر گەشامەوە، دووکەڵ لەسۆمپا کەوە دەهاتە دەرێ، سەرۆکی گوند کـە هاوڕێمـان بوو گێڕایـەوە کـە: دوازدە سـاڵ پێـشتر تورکمانـەکانی‌تـر کـە شـەوانە و بەدزیـەوە گەیشتنە ئێرە و لەسەر ئەم قەڵایە چوونەبان و قەڵاکەیان ڕووت کردەوە و پیـاوانێکی زۆریان کوشت و لە جەماوەری ٤٨٠کەسی ئەم قەڵایە ٤٠کەسی مایەوە. واتـا سـاڵـی ١٢٥٠ی هەتاوی

ناوبراو بەمنی گوت: من لە پاشماوەی ئەوانەم، باب و کاڵی من لەو ڕۆژەدا لـەناو چوون و بوون بە قوربانی. کاتێ کە سپای ڕۆس خیووقی داگیر کرد، ئێمە ئومێـدمان دەکرد کە کەسانێ لە ئێمە کە دیل کرابوون بدرێنـەوە دەسـتمان. بـەڵام بەداخـەوە کەس نەگەڕایەوە و نەمانزانی کە ئاخۆ زیندوون یان مردوون. ئەوەی کە ئازاری ئێمـە دەدات تورکمانەکان ئیزن نە بە هێزی ئێران دەدەن و نە بە سپای ڕووسیە تـا بـزانن دیلەکانی ئێمە ئایا مردوون یان زیندوون، چۆن ئەو کەسانەی وا خەریکی گـەڕان بـە نـاو تورکمانەکانـدان ئیـزنی ئـەوەیان نیـە بـزانن لـەناو ماڵـی تورکمانەکانـدا چـی دەگوزەرێ.[١٤٦]

قـەڵای قێـشم ـفەشـەم وەک پاشمـاوەی خـاکی ڕوبـات لـە ژێـر فـەرمانی دەسەڵاتدارێتی خانی قووچاندا بوو کە ناوبراو کوردە ودەسەڵاتی خۆی لە نێو خـزم و کەس و کارەی دا بڵاو کردووتەوە و لەهەرماڵێک ٨ قەران مالیە لەساڵدا وەردەگـرێ دانیشتوانی ناوچە کوردییەکان بوونەتە هۆی پاسداری لە سنوورەکانەوە.

پادشای ئەو کاتەی ئێران شاعەبباس لەو سـەردەمدا بـە هـۆی شـەڕوپیلانیانەوە لەسەر مەزهەب و بیروباوەڕ لە سنووری عوسمانیەوە لە کوردەکانی‌تر جیا کردەوە و هێنایانیە ئەو ناوچەیە، پاشان لە مازندەرانەوە گوێزرانەوە بەرەو سنووری تورکـستان و بەم شێوەیە پاسداری سنوورەکانی ئێرانن.

---

١٤٦- پاش شەڕی ١٨٧٣ کە ڕووسیەکان خێوەیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، خانی خێوەیـان مەجبوور کرد تا ٢١کەس ئەسیری ڕووس و ١٥ هەزار کەس ئەسیری ئێرانی کە زۆربەیان کورد بوون ئازادیان بکەن و هاوکات ئەسیری زۆریش هەر لەبەند مانەوە کە تاقمێکی لە زۆریان کوردی خوراسان بوون. سەفەرنامەی تورکستان و ئێران. ل١٢٣

ئەم کوردانە سەرزەوینی ئێرانیان لەبێگانە دەسڕیەوە و بـە گـوێرەی خۆیـان ١٢ بەرەیان لەم وڵاتەدا خەریکی کشت و کاڵ و بەربەرەکانی دژ بە تورکمانـەکان بـوون. زۆربەی جار تورکمانەکانیان شکـست دەدا و وەک خۆیـان لەگەڵـیان دەجووڵانـەوە، ناوبراوان ئەگەر ئەسیریان لـە تورکمانـەکان دەگـرت لـە تـاران دەیانفرۆشـت و ژنـە تورکمانەکانی تەکەیان بە پارەیەکی زۆر دەفرۆشت و هەر سەری تورکمانێکیـان کـە دەهێنا تاران شای قاجار ١٠٠قەرانی پێیان دەبەخشی.

پاش ئەوەی سەری تورکمانەکانیان دەبڕی پێستیان لەسەری دەکەنەوە و کایان دەکردە ناو سەری و لەسەر دەروازەی تاران هەڵیاندەخست.

لـە کاتێکـەوە تورکمانـەکان پێـڕەوییان دەکـرد و هێرشـەکان گەیـشتە ئاکـام، کوردەکان بایەخی پێشوویان نەمایەوە و خانە کوردەکان کـە پێـشتر زۆر سـەربەخۆ بوون سەربەخۆییان کەم کرایەوە.

لە کاتێکەوە کە ڕووسیەکان ئاخاڵـیان داگـیر کـرد. پاوشـای ئێـران ئـەو هێـزە لەدەست چووەکەی خۆی هێنایەوە دەست و خانەکان کە تا ئەو کاتە سـەر بـە خـۆ بوون ئێـستا تـەنیا بوونـە والی و دەسـەڵاتدارانی ئێـران و چاوەدێریـان بـوون. کـەم بوونەوەی هێزی کوردەکان لە پاش کۆچی دوایی ئەمیر حوسەین خانـەوە ڕووی دا. کوردەکان بەم بۆنەوە لە نزدیکیان لەگەڵ ڕووسیە خوەشوەخت نەبوون و بۆیە خـانی قووچان ڕووی کردەشـەڕاو خواردنـەوە، چـون ئیتـر شـەڕێک ڕوو نـادا و کوردەکـان بێکاردەبن.

هێزی مووزر ڕۆژی دوایی لە قەڵای قیشم هاتـە دەرەوە و پـاش تێپـەڕ کـردنی قووری چای و تێپەڕ کردنی گوندەکانی پیرە و عەلی موحەمەد و کێوی تـەکبیران و تەنگەی کوردکێو لە ناوچەی قووچانەوە خـۆی گەیانـدە بجنـۆرد و پاشـان دەگەنـە قەڵایەک و خەڵکی گوندەکە پێی دەڵێن، خانی بجنۆرد هەموو ساڵـێ لەهـەر ماڵـێ دە قەران ماڵیە وەردەگرێ.

خان بە بێئاوڕدانەوە لە قانوون.( کام قانوون؟!) لەبارەی خەڵکەوە حـوکمی دەدا و بڕیارەکانی بەپێی دەنگی خۆی وقوتار بوو، دزی زۆر کـەم ڕوودەدا و ئەگـەر کـەس دزی بکردبایا چەند جار لە خزمەکانی دزدەکە زامنی دەگرت و ئەگەر هەر دووبارەی بکردبایا یان چـاوی دەردەهـانی یـان دەسـت و پـای دەبـڕی و ئەمـە پیـشاندەری

ڕاستبێژی کوردەکان بوو.

خەڵکی ئەم قەڵایە ئەوەندەی کە زانیان ئێمە خەیاڵی دوژمنایەتیمان لەگەڵیاندا نیە بە ئەو پەڕی مەحەببەتەوە هاتنە پێشوازیمانەوە و نان و شیرماڵ و هێلکەیان بۆمان دەهانی و پلاو و خورشتیان بۆمان هانی.

ڕۆژی ٢٩ی ژانویە ١٨٨٣ لە دوورەوە چاومان کەوت بە شاری بجنۆرد. بجنۆرد شوێنی نیشتەجێ بوونی یارموحەممەدخانی سەهامودەولەیە، من لەوێ چوومە ماڵی یەحیابەیگی قونسوول ڕووس کە لە موسوڵمانە تارتارەکانی ناوچەی قەفقاز بوو.[١٤٧] ژنراڵ کەمارۆف هەواڵی هاتنی منی گەیاندبووە ناوبراو. خانی بجنۆرد لەوکاتەدا هاوڕێ سوارەکانی چووبووە شوێنی کاردا. ڕوون بووە تورکەمەنەکانی یەمووتی گورگان چەند هەزار مەڕیان لەخەڵکی ناوچەکانی شاهڕوود دزیبوو. لەناوڕێدا خەریک بوون خەڵکیان ڕووت دەکردەوە و بۆیە هاتوچوو لەو شوێنەوە نەدەکرا.

بیرم کردەوە کە وا چاکە بچمە گورگان و خۆم بگەیەنمە خانی ئەوێ، لە ڕاستیدا زۆر حەزم لێی بوو لەشەڕی تورکمانەکاندا بەشداریم هەبێ و بۆیە لە بجنۆرد من ئەمەم بە نوێنەری ئێران ڕاگەیاند تا بتوانێ کارێ بکات من بەرەو گورگان بکەومە ڕێ، لە ماڵی کابرای ئێرانیەوە هاتمە دەرەوە و هاوڕێ یەحیابەیگی وەرگێڕم چوومە عەمارەتی خان و ناوبراو چاوەڕێ من بوو تا پێشوازیم لێوە بکەن. من بۆ بازاڕی شار کەوتمە ڕێ، لە دووکاندا شت و کەل و پەلی ڕووسی و ئینگلیزیم کڕی، کوردەکان جۆرەکەوشێک دەدوورێنن کە لووتەکەی هەڵدەگەڕێتەوە...

کاتێ چوومە حەوشەکەی خانەوەکەباخێکی خۆش ئەو حەوشەی ڕازاندبووەوە و کۆمەڵێک تا نیوەی ڕێ هاتنە پێشوازیمانەوە کە لەو ناوەدا دوو منداڵی نۆ ساڵان و

---

١٤٧- بەڕێز ئیبراهیم سەفایی لە لاپەڕەی ٧٤دا سەبارەت بە سنوورە نائارامەکانی ئێران دەیگوت: یەحیا خان قەفقازی لە بجنۆرد و قووچاندا بوو و چون لە لایەن ڕووسەوە بە کرێ گیرابوو تا بارودۆخی تورکمانەکان بشوێنێ و وەک فتنەوابوو. کەچی پاش ماوەیەک لە لایەن تورکمانەکانەوە دەسگیر کرا و ماڵ و داراییەکەی دزرا و پاشان یارموحەممەدخانی سەهامودەولە ڕزگاریانی کرد. ناوبراو جارێکی تر لە ساڵی ١٣٠٨هاتە گورگان و گونبەد و خەریکی هاندانی تورکمانەکان بووە. بەڵگە سیاسییەکانی قاجاڕ نووسراوەی ئیبراهیم سەفایی.

یازده سالانیان تێیدا دەبینرا کە جلوبەرگی ئێرانیان لەبەردا بوو هەر دووکیان لە کوڕەکانی یار موحەممەد خانی سەهاموددەولە بوون. نەسرولڵاخان و سلێمان خان لە هێڵی بەرەو کار بە دەستانی ئێرانی دیار بوون و کوردی زۆریان تێیدا دیار بوو. کەهەمووی جەماوەر کڵاوی فەرهەنگیان لەسەردا بوو. چوینە ناو ژوورێکی چوار سووچەوەکە دەیخوێندە ناو باخێکی خۆشدا، سێ سەندەڵی لە بەر دەم سۆپەیەکدا دانرا بوون و سەربازانی ڕووسی و ئێرانیش وەستابوون.

کاتێ چاییان بۆم هێنا تا بیخۆمەوە بەو مندالانەم ڕاگەیاند کە زۆر حەزم لێی بوو بابتان ببینم. لەناکاو یەکیان بەفەرانسەوی وڵامی دامەوە کەزۆر جێ سەرسوڕمان بوو.و پاشان زانیم کە دۆکتۆر دانامی فەرانسەوی مامۆستایان بووە...

ئەو عەمارەتەی کە بە منیان دابوو تازە سازکرابوو، ئەم عەمارەتە ناسرەدین‌شایشی میوانی کردبوو.(کاتێ کە هاوڕێ ۱۲هەزار کەس دەچوا بۆ زیارەتی مەشەد).

هەرکاتێ پادشا بەم جەماوەرەوە لە ناوچەیەکەوە بەرەو ناوچەیەکی‌تر دەڕویشت، دەتگوت بە ماوەی سالێک لەو ناوچەیەدا وشکە سالی هاتووە، بە ڕاستی ئەو ناوچەیانە ڕووت دەکردەوە. ناسرەدین شا لە هەر لایەکەوە گوزەرابوو بەزێڕ زینەتیان کردبوو، حەوزچەهایێکیان سازدابوو کە ئاوی ساردی لێوە دەهات.

سۆپەگەلێکی زۆر جوانی تێیدا ساز کرابوون و حەمامێکی زۆرخۆشیشی هەبوو کە زۆر لە حەمامەکەی دوو درزەی خانی خیووق دەچوو.

ڕۆژێکی تر هاوڕێ هاوڕێکانم ڕوومان کرد لە تاران. نوێنەری ڕووس لە ئێران قاترێکی هێنا تاکوو ئێمە بگەیەنێتە شاهڕوود، تا ئەوێ حەوت مەنزلی نێوانە، کاتێ گەیشتین بۆ کرێ قاترەکە داوای ۳۵ تمەنی دەکرد کە کرایەکەی ۷ تمەن بوو. دەیەویست پارەی زۆرمان لێی وەربگرێ.

ڕۆژی ۳۰ی مانگی ژانویە کاروانەکەی من لە بجنۆردەوە بەڕێ کەوت و لە لای باشوورەوە بەرەولای کێوەکانی ئەڵلاداغ کەوتینە ڕێ، لەقەلای سەنخاس وێستێکمان کرد. کاتێ دیمان دانیشتوان کۆ ببوونەوە دەورمان و لەبارەی ئاخرین هێرشی تورکمانەکانەوە باسیان دەکرد و دەیانگوت بنەماڵەی عەلی چاروا سەد هەزار سەر مەڕیان لێمان دزیوە.

کەمێ پێش ئێوارە خۆمان گەیاندە کۆنترین ناوچەی خوراسان واتا جاجەرم. خانی جاجەرم لەشەڕی تورکمانەکانی یەمووت نەگەڕابووە و بۆیە براکەی هاتە پێشوازیمانەوە.

ڕۆژی دوایی لە جاجەرم هاتینە دەرەوە لەسەر تەپێکەوە چاومان کەوتە گۆڕستانێ کەبەردی زۆری لەسەر بوو. موحەممەد قولی ڕێنوێنم بەمنی گوت: هەر لێرەدا هێرشمان بردەسەر تورکمانەکان. ئەگەرچی تاقمێکی زۆرمان لە ناو چوون، بەڵام کارێکمان کرد کە تەنانەت یەک کەس لەو تورکمانانە گیان بەدەرنەبەن.

ناوبراو لەم کاتەدا شانی خۆی نیشانم دا کە جێی تیربوو و هاوکات کەمەریشی جێی برینی کارتێکی لێی بوو و باسی ئەوەی دەکرد کە نۆ جار سەری تورکمانەکانم بردووە بۆ تاران کە ژنی تورکمانەکانیش هاوڕێ بووە و بردوومە لە تاران داومەتە دەستی پاشای ئێران. جاران لەڕێ ئەم کارەوە کەسبمان زۆر باش بوو، بەڵام پاش هاتنی ڕووسیەکان ڕێ کاروکەسبمان لێی بەسراوە.

سەرداری ناوبراو گوتی: تورکمانەکان لە ئەستەرئاواوە تا ڕوبات دەتوانن چل هەزار سوارە بۆ شەڕ برازێننەوە و کاتێ هێرشیان دەهێنا بەو کاردانەی کە بە دەستیانەوە بوو هەروەک قەسساب هێرشیان دەهێنا سەرمان و شەڕێکی قورس لە نێوانماندا ڕووی دەدا ......-کە دوژمن لەماڵت نائومێدبێ.[١٤٨]

بەم شێوەیە دەتوانین نێوانی کوردەکان و تورکمانەکان ببینین لە سنوورەکانی خوراساندا و هەروەها لەسەر چۆنیەتی بەسەر بردنی ژیانیاندا ئاشنا ببینەوە.

**بارودۆخی بجنۆرد لە سەردەمی یارموحەممەد خانی سەهامودەوڵەدا**

شاری بجنۆرد ناوەندی کولتوور لە پارێزگای خوراسانە کە شەقامی نێونەتەوەیی تاران مەشهەد لە نێوانیەوە تێدەپەڕێ، کوردەشادیلووەکان ئەم شارەیان بنیات ناوە.

موحەممەدحوسێنخانی سەنیعوددەوڵە لە کتێبی مەتڵەعوششەمس ١٣٠١ی کۆچی سەبارەت بەم شارە نووسیویە: شاری بجنۆرد کە لە کتێبە مێژووییەکاندا بە ناوی (بزنجرد) ناوی لێوە براوە، لە شیوێکدا بنیات نراوە کەلە باکووری ڕۆژ ئاوایەوە

١٤٨- سەفەرنامەی تورکستان و ئێران، مووزر- ل٢٢٤تا ٢٠٠بەیارمەتی موحەممەدی گوڵبون.

تا ڕۆژ هەڵات لەدەوری دوو فرسەخ و پانتاکەشی یەک فرسەخە، جەماوەرەکەی ۱۰هەزار کەس و ٥٦٠دووکانی تێیدایە و ٦مزگەوت و حەوت حەمام و یازدە گەڕەک و چواردەروازەی هەیە. بۆ کاری کشت و کاڵ لە ئاوی عەینولوتف کەلک وەردەگرن. ئەم ئاوە لە نزدیکی گوندی شاپەسندەوە دوولقی لێ دەبێتەوە، بەشێکی بەرەو باکوور دەڕوات تا دەگاتە قەڵای ئەڵلاوێردی خان و لەوێیشەوە دەچنە حەساری ڕەفێعاغا و لەوێشەوەدەڕواتە ئاسیاوەکانی قەڵای بەرد و لەوێشەوە کە ئاواییێکی کەم جەماوەرە. دەڕوات بەرەو مەلکش و قازمەو حەساری شێرعەلی بەگ، ئاوی ئەم ڕووبارە زۆرتر لە ئاوی بیژەنەوە سەرچاوەدەگرێ، بەڵام ماوەیەکی کورتە کە جۆگەلەیەکی تازە جۆماڵ کراوە کە لای خۆرئاوا و باکوور تینوویەتیان لێی دەشکێ.

بەشێکی تری ئاوەکەی عەینوللوتف لە گوندی شاپەسند بەرەو ڕۆژهەڵات دەچێ. لەتەنشتی قەڵای حەسەنعەلیخانەوە دەگوزەرێ... لەتەنیشتی قارلقەوە خۆی دەگەیەنێتەوە جولگەی جەرمخوان و ئاوی گوندەکانی مەهنان کەفی کە لە نێوان فیرووزە و بجنۆرد دایە، دابینی دەکات.

هەروەها یەکێ تر لە کانزاکانی ئاو، ئاوی سمڵقانە کە لە بنەوەی جولگەی سمڵقانەوەیە. ئەم ئاوە لە ئاکامدا دەگاتە قەڵا و لەگەڵ ڕۆخانەی ئەترەک و سەمار تێکەڵ دەبێ... یەکێتر ئاوی بازخانەیەکە لە کێوی ئاقی مەشهەدەوە دێتە دەرێ و مەزراکانی قەڵاکانی دەورو بەری کێوی ناوبراو تێراو دەکات و بەشێکشی دەگاتە مەسرەفی مەزراکانی بازخانە

سێ جۆگەلەیتر لە بنجۆرددا هەیە یەکیان تایبەتی یارموحەممەد خانی سەهامودەولەیە کە ئێستا سەرکردەی بجنۆردە و یەکی تریان تایبەتی سەفەر عەلی خانی تورکمانە و یەکی تریان هی فەیزئاوایە کە لە لای باشووری ڕۆژهەڵاتیەوە و لە داوێنی کێوی ڕەشماڵەوە سەرچاوکە دەگرێ و لە پانسەد مەتری شارەوە خۆی دەردەخا، ئەم ئاوانە خوالێخۆشبوو حەیدەرقولیخانی شادلووی ئیلخانی بجنۆرد بنیاتی ناوە.

ئەم شارە دووسەد ساڵی ڕابردوو لە لایەن قولیخانی دووەمەوە کەلە باپیرەکانی یارموحەممەدخانە بنیات نراوە کە تا ئێستا کە ئەم بنەماڵەیە خەریکی کرینی سەربەرزین، بۆ ئەم شارە،ئەم شارە کە شارێکی چوارسووچە و دوازدە قەڵای لە لای

ڕۆژهەڵاتـەوە و هـەروەها دوازدە قـەڵا لـەلای باشـوور و دوو قـەڵای لای دەروازەی شارەوە هەیە، بەڵام لە ڕۆژئاواوە قەڵایەک نابینرێ، دەوراندەوری شار پـەنجا هـەزار و حەوتسەد و دوازدە مەترە و هاوکات خەنەقێکیان لەدەوری شاردا کێشاوە.

بازاڕی شار کە پێشتر ئاماژەی پێی درا، بریتە لە شـەقامێک درێـژ کەلـە نێـوانی شارەوە دەڕوات و لە باکوورەوە بەرەو باشوور درێژەی دەبـێ، ٦مزگـەوتی بـەناوبانگ لەبجنۆرددا هەیە و بریتی لە: مزگەوتی ژوور، مزگەوتی دەروازەی قووچان، مزگەوتی نێوان بازاڕ، مزگەوتی دەروازەی گورگان و مزگەوتی ناوچەی کەلانتەر.

حەوت حەمامی هەیە کە بریتین لە: حەمامی مەڕمەڕی حکوومەتی و حـەمامی ئازادخان و حەمامی شاری نوێ و حەمامی فەڕاشباشـی و کەلانتـەر و نێـوان بـازاڕ و حەمامی حاجی ئاغا.

یازدە گەڕەکی ئەم شارە بـریتی لـە: شـاری تـازە، ناوچـەی نـاوینی، ناوچـەی دەروازەی گورگان، مزگەوت حاجی موحەممەد خـان، ناوچـەی سولـتان، سـارەبان سەرگەڕەک، دەروازە قووچان، شیخ موحەممەد تـەقی، حـاجی مەلاتـەقی، حـاجی مەلا ئیبراهیم، دەروازەی مەشهەد و گورگان و قیبلە...

عەمارەتەکانی باب و باپیرەکانی یارموحەممەد خـان زۆربـەرز دروسـت کـراون، لەم دواییانەدا یارموحەممەد خان لە سەرەتای سووچی ڕۆژئاواییەوە بەرەو بـاکوور لـە ناو باخەکـەی یـەزدانقولی خـانی بـاوکی نـاوبراو عـەمارەتێکی بـەرزی بنیـات نـا و شەقامێکی ئەستووری بەچوار خشتەوە دروست کرد. کە لە دەوری ١٥٠٠مەتر درێـژ و ١٢ مەتر پان بوو و داری زۆریشی لە کـەناردا نرابـوو، چەنـد بـاخێکیش لـە دەوری شاردا دەبینران کە تاقمێکیان بەفەرمانی جەعفەرقولیخانی ئیلخانی بنیـات نرابـوون، لەو باخانە دەتوانین ئاماژە بکەینـە سـەر بـاخی ئەمیرگوونـەخان کـە ئێـستا مـڵکی سەهامودەولەیە و یەکی تریان باخەکەی حەیدەرقولیخانی کوڕی نەجەفعەلیخـان و باخی موحەممەدڕەحیم خان و باخی ئازادخـانی بـرای حەیـدەر و هـەروەها بـاخی فەرەح ئەفزا و باخی حاجی عەبدوڵڵا.

لەباشووری شارەوە باخێکی مێوی خۆش هەیـە کـە دارگـەلێکی زۆر بڵندیـشی تێیداوە بەرچاوان دەکەوێ کە باخی سوڵتان سەید عەبباسە.

سەنیعودەولە لە درێژەدا دەڵـێ: لـە شـوێنەوارە بـە ناوبانگـەکانی ئـەم شـوێنە

دەتوانین ئاماژە بکەینە سەر بیژەن یوورت[١٤٩] کە ئێستا کە ئەم شوێنە شارۆچکەیەکی خۆشە -ئێستا وێرانەیەکە کەتەنیا قەڵای نارینی تێیداماوە-وادیارە ئەو ناوچەیە بە دەستی ئەندازیارێکی کارزان بنیات نراوە و بیژەن یوورت لە بواری عەمارەتەوە ناو بانگی زۆری هەیە و ئێستا بەم شوێنە دەگوترێ کۆنە گونبەد. ئەم بیژەنە، جیاوازە لەگەڵ بیژەنی شانامەی فیردەوسی دا.

گوندەکانی دەروبەری بجنۆرد بریتی لەعەلیئاوا بە ٥٠ بنەماڵەوە، باخچق ٤٠ بنەماڵە، لەنگەر قشلاخ بوغانلوو و خەڵکی بیدەک کە قەڵایەکە لە نێوانی باشوور و ڕۆژئاوادا، حەسارچەی ناسراو بە ئاق قەلا، کەلاتەی میرزا موحەممەد، حەساری شیرعەلی بەیگ، ئیمامزادە سوڵتان سەی عەبباس و قەڵای عەزیز- سی بنەماڵەی تێیدایە- گوندی حەمزانلوو و گوندی بازخانە کە سەد بنەماڵەی تێیدایە. گوندی ڕەشوانلوو و بورجانلوو، یەنگی قەلا، قەڵای حەسەنعەلی خان کەلە تەنشتی ڕێ بابە ئەمانەوەیە کەحەسەنعەلی خان دروستی کردووە و لەبنەماڵەی شادلوو بووە مەعسووم ئاوا، قەڵای باقرئاوا هانە داوێنی کێوی باباموسادا و گوندەکانیتری بجنۆرد کەسەر بەسەمەڵقان و ئەزمانەن بریتین لە: شائاوا، بیار، ئاشخانە، کەرەک، دەربەند قەڵای مەلا حەسەن، قەراموسەلا، نەجەف، قەڵای خان مەهمانەک، کەسمانەک گوڵزار، قازی، شاراوا، دەرکەش، کەیکانلوو، پێش قەلا، زنگلانلوو، ئەڵلاداد، خەرەکی موحەممەدئاوا، حەسەگا، چاوکەگا، ئەسفیدان، کەلانتەر، بازاڕە، سەمەندەرە، کەشک ئاوا، ئاقچە، قەڵای مامۆستایان، کەلایین، ئەخلوو، دونکەڵ، جرمخان، قارلق، میش قەڵای سەب، حەقوو، قووچ قەلا، بەندیە، غموور، ئاق تەپە، عەبدول ئاوا، قەراخاز بەندی سووررووک، نەجەف ئاوا و قەڵای قوردانلوو.

ئەم شارە لە لای باشوورەوە دەگاتە جاجەرم و باشووری ڕۆژهەڵاتیەوە لای دەستی ئەسفەراین و جوەین و جەغتا و لە باکووری ڕۆژهەڵاتیەوە دەگاتە ئەتەک ئاخاڵ و لە ڕۆژ ئاواوە دەگاتە گورگان و ئەترەک و یەمووت.

خەڵکی بجنۆرد دەڵێن لەم شوێنەدا قەڵای عەزیزو ئیمامزادەسوڵتا

---

١٤٩- بەهەلە تاقمێک دەڵێن بیژەن یوورت ناوی بجنۆردبووە کە دەبێ بڵێین بجنۆرد **بووزنجە** بووە و پاشان بووە بجنگەرد و دوایی بووەتە بجنۆرد

سەیدعەبباس بووە و بەم شارەیان گوتووە جرمقان. ئەم شارە لە کاتی هێرشی مەغوولاندا وێران کراوە و لە دڵی ئەم خاکەدا زێڕودەفری زێڕی زۆر دۆزراوەتەوە.[١٥٠]

**بیرەوەریەکانی ئەرفەعودەوڵە لە بجنۆرد، هاوڕێ یارموحەممەدخان شادلوو**

لە دوایین ساڵێ کە ئەرفەعودەوڵە هاوڕێ سلێمان خانی ئەفشار بۆ دابین کردنی سنوورەکانی ئێران و ڕووسیە لە سنووری قووچان و بنجۆردا دابوون و لەبەر ئەوەی پارەیان پێی نەبوو، پارەی ئوردوو و کۆمیسیۆنەکەی سنووری ئێران لە لایەن ئەمیرحوسێن‌خانی زافەرانلووە سەرۆکی قووچان و یارموحەممەدخانی سەهامودەوڵە ئیلخانی شادلووی حاکمی بجنۆردەوە درا. هاوکات کاتی چوونەوەشیان پێشکەشی زۆریان وەرگرت، کاتێ ئەرفەعودەوڵە پارەی پێی نەمابوو، ئەسب و قاتر و پێشکەشی کوردەکانی دەفرۆشت. ناسرەدین شا پاسنەد تمەنی دانابوو بۆ مووچەی ساڵانەی و ئەم مووچەیەش نەدەدرا چۆن ماوەیەک بوو کەسێ لە پیاوانی دەوڵەت نەمردبوو تا مووچەکەی ئەو بدرێ بە ئەرفەعودەوڵە و لەبەر ئەمە ئەرفەع تووشی فەقیری بوو.

ئەرفەع سەبارەت بە بجنۆرد نووسیویە: زمستان بۆ ماوەی مانگێک لە بجنۆرد ماینەوە، سەهامودەوڵە یارموحەممەد خان کە پیاوێکی کوردە وەک باقی جنۆردییەکان و قووچانیەکان ئەم سەرۆکە کوردانە نە وڵاتانی تری ئێرانیان دیوە نە ۆ هەندەرانیش چوون و بەم بۆنەوە شێوازێکی تایبەتیان هەیە، هەرکامە عەمارتێکی ازاوەیان هەیە، ئەم عەمارەتانە بە باغچەگەلێکی تەنک ڕازاونەتەوە. لەم شارەدا تەنیا ەقامێکی زۆر گەورە هەیە کەلەم بەر و لەو بەریەوە دەرختانێکی جوان دەبینرێن و ارکێکی ڕازاوەش ئەم شەقامە دەبڕێتەوە. خانی شادلووش هەموو کاتێ باسی ێشکەوتن دەکات و خەڵکیش هان دەدات بۆ ئەم مەبەستە من هانی ەهامودەوڵەم دا تاکوو سەردانێکی وڵاتانی دەرەوە بکات تا بۆ ئەو مەبەستەی ەپێشکەوتنەدەستکەوتی زۆرتری دەست بکەوێ.

خان چاوەدێرێکی بۆم دانابوو و کتێبێکی ئەلفوبام دا بەدەستیەوە تا وێندەواری باشی بێت، سێ کوڕی هەبوو کە یەکەمین کوڕی لە سووگلیحەرەم

١٥- مەتلەعوشەمس، ب ١، ل ١٣٥

بوو و ئەوانی تری لەو ژنەکانی تری بوون. لە مێژوودا بیستوومانەو خوێندوومانە کە ئێرانیەکان لەسەردەمی کەیخوسرەودا سێ شتیان بە منداڵانیان پیشان داوە واتا سواری، تیرهاویشتن و ڕاستبێژی. سەهاموددەولەش هەر ڕۆژێ کە کەش‌وهەوا باش بێت، هاوڕێ کوڕەکانی دەچوو بۆ نێچیر و هاوکات فێری ئەسپ سواریانی دەکرد. لەم ناوچەیەدا باوە تا کوڕ نەگاتە تەمەنی ۲۰ساڵ نابێ لە جلوبەرگی بابی بکاتە بەر و تا پرسیاریان لێی نەکرێ نابێ قسەیان بێت بەزاردا. لەسەهاموددەولەم پرسی ئەی بەشی سێهەمی ڕەسمی ئێرانیەکان واتا ڕاستبێژی بە منداڵەکانت پیشان دەدەی؟

خان زۆر کەنی و پاشان گوتی ئەوە کاری دایکیانە کەفێریان بکات.

سەهام دندانی زۆر دەیشا و ناردبووی تا لە عێشق ئاواوە دندانسازێکیان هێنابوو و ئەو شەو لەوێ میوان بوو. بەیانی بۆ هەیوانم ڕوانی چاوم کەوت بەدەندانساز کە خەریکە دندانی یەکێ لە هاوڕێکانی سەهام دەکێشێ کەهەمووی سالم بوون، خێرا چوومە پێشەوە و پرسیارم کردو دەندانساز لە وڵامدا گوتی:

ئەوە خان دندانەکانی پاکی خراپ بووبوون و باوەڕی نەبوو کەبە دندانێ کەمن دروستی دەکەم بۆی نان و پێخۆر بخوات و بۆیە ئەمری کردووە تا سەرەتا دندانی ئەم کارمەندەی بکێشم و دندانی تازەی بۆ دروست کەم جا ئەگەر باش بوو بۆ ئەویش دروست بکەم؛ بەڵام بە داخەوە دێر گەیشتم و بەشی لە زۆری دندانەکانی دەرهانی‌بوو، دەنا من خانم حاڵی دەکرد کە بەو دندانە تازانە دەتوانێ نان و پێخۆری باش بخوات.[151]

شتێکی تر کە لەو شوێنەدا جێ سەرنج بوو ئەوە بوو کە کاتێ لە بجنۆردەوە بەرەو گورگان دەچووم، سەرەتا لە سملقان دادەبەزین شام بۆ من مامر بێنن و خۆتان بە دندان تۆزێکی ببڕن، منیش بەلامەوە زۆر سەیر بوو و گوتم بچۆ سەبارەتی ئەم کارەی لێی بپرسە.

ژن لە وڵامدا گوتی: ئێمە ناخۆشێکمان هەیە و ئەمەش لە لای ئێمەوە باوە کە

---

۱۵۱- خانی کورد هیچ کارێکی بێ ئەزموون نەکردووە و هاوکات ئەمە پیشاندەری دوو شت بووە فەرمانبەرداری ژێردەستەی سەهاموددەولە لە ئەو و هەروەها ئەوەی تازە دندانی مەسنووعی هاتبووە ئێران و بۆیە ئەو کارمەندەش لایەوە جوان بووە دندانی تازەی لە دەم بنێن.

هەر کاتێ ناخۆشێکمان باش دەبێتەوە و بۆیە منیش خێرا ڕانەکەم نارد بۆی.
بەیانی هەر ئەو ژنە و مێردەکەی بەگریانەوە بە برێ پێشکەشیەوە منداڵەکەیان پێچابووە و هاتن و منداڵەکەیان نارد تا پای من ماچ بکاتەوە و منیش سەبارەتی ئەم کارەم پرسی و حازر بوان گوتیان :قوربان ئەم کوڕە پاش خواردنی ڕانی مامرەکەی کە بەڕێزت بۆیت نارد، چاک بۆتەوە، ناوبراو لە منداڵیەوە تا ئێستا لاڵ بووە و ئێستا زمانی گرتووە و لە ئێستا بە دواوە وەک خوڵامی ئێوەیە...

## بارودۆخی جاجەرم و نەردێن لەسەردەمی یارموحەممەدخانی سەهامووددەوڵە

دەڤەری حکوومەتی کوردەکانی شادیلوو لەسەردەمی ناسرەدین[١٥٢] شا تا مازندەران و سمنان درێژەی بوو بەشێوەیەک کە سالگارێکی زۆر دەسەلاتی ئەستەرئاوا بەدەستی کوردەکانەوە بووە.
ئێعتمادوسسەڵتەنە گوتوویە: جاجەرم کە لە سەرەتاوە جاگەرم بووە و بەبۆنەی گەرمی هەواکەی لەم شوێنەدا خوێ زۆری هەیە کە پێنج فرسەخ درێژەی هەیە کە خەڵکی ئەم شوێنە بە پارە دەیفرۆشنە گورگان و مازندەران و بجنۆرد و قووچان، لە نێوانی ڕێگەدا یارموحەممەد خانی سەهامووددەوڵە حاکمی ئێستای بجنۆرد ١٣٠٠ی کۆچی بەم زوانە کەناڵی ئاویان هەڵکەندووە و کشت و کاڵی ئەم ناوچەیەش بەم بۆنەوە ئێستا باشترە و کاروانچیەکانیش کەڵکی زۆری لێی وەردەگرن.[١٥٣]
سەنیعوددەوڵەش لەم بارەوە گوتوویە کەناڵەکانی فەیزئاوا لەبەشی باشووری ڕۆژ هەڵاتەوە لە کێوەکانی سیاخانەوە دێنە دەرێ و پانسەد مەتری بەشی ڕۆژهەڵاتی بجنۆردەوە دێتە دەرێ. حەیدەرقولیخانی سەهامووددەوڵەی مامۆی سەهامووددەوڵە ئاوی ئەم شارەی دابین کردووە.
هاوکات دەڵێ ئاوی قەڵای حەسنعەلی خان لە کەنار ڕێی بابا ئەماندا لەئاسەوارەکانی حەسەنعەلیخانی شادیلۆیە.[١٥٤]

---

١٥٢- ئێران دیرووز، ئەرفەعوددەولە، ل ١٥١
١٥٣- مەتلەعوششەمس ل١١٥تا ١٣٧
١٥٤- مەتلەعوششەمس ل١١٥تا١٣٧

بیش قارداش کە یەکێ لە شوێنە دڵڕفێنەکانی بجنۆرد و لە لایەن یارموحەممەدخانەوە بنیات نراوە.

یەکێکی تر لە ئاسەوارەکانی ئەمیرانی شادیلوو، گوندی جافرئاوایە کە لە سەرڕێ جاجەرمەوەیە بۆ بجنۆرد کە جەعفەرقولیخانی مامۆی سەهامووددەولە بنیاتی ناوە. ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی ئاوی ئەم گوندە لە کاتێکدا ناسرەدین شا لە وێوە تێپەڕیوە لە ڕۆخانەی شۆغان وەدەست هاتووە.

ئەرفەعوددەولە لە کاتی گەڕانەوەی و لێ بوونەوەی لە کاری دامەزراندنی سنووری ئاخاڵ، لە ڕێگەی سملقان و بجنۆردەوە بۆ جاجەرم هات و ئاوەهای گوتووە: لە سملقانەوە هاتین بۆ جاجەرم یەکێ لە خەزوورەکانی سەهامووددەولە بە ناوی کەریم خان میوانداری ئێمە و سلێمان خان بوو، لەبەر ئەوەی سەهامووددەولە ڕێزی زۆری لەمن دەگرت خەزوورەشی حورمەتی زۆری گرتم و خانوویەکی گەورەی نایە ئیختیارم ناوبراو کوڕێکی خۆی کە لە دەوری چوار پێنج ساڵیدا بوو هێنایە لام و گوتی ئێمەی کورد بە ڕواڵەت کەسان لە منداڵیەوە دەناسین. من چاک دەزانم کەبەڕێزتان سەروەری زۆر وەدەست دەهێنن و بۆیە ئەم کوڕەی خۆم کە زۆر زیرەک دیارە وەک کوڕی خۆتان بۆی بڕوانن و ناویشی عەبدولحوسێنە. منیش گوتم پەنا بە دەمت خوابکات وابێت و ڕواڵەت شناسیتان باش بێت و منیش ئەم کوڕەم وەک کوڕی خۆم خۆش دەوێ[١٥٥]

---

١٥٥- ئەرفەعوددەولە لەو کاتەدا وتەی ئەو کوردەی بەلاوە زۆر سەیر بوو، بەلام دەبینن کە ئەم وتەیە ڕاست لە ئاو دەرهات. ئەرفەع دەڵێ ٨ ساڵ پاش ئەم بیرەوەریە کاتێ کەلە ڕووسیەدا وەزیری دەرەوەی ئێران بووم، کەریم خان دادخان هاوڕێ منداڵێک هاتە لام و گوتی قوربان ئەمە کوڕەکەی خۆتە و دەبێ بۆ سوارکاری کە لای ئێمەی کورد زۆر گرینگە دەبێ ڕەوانەی مەکتەبی بکەی، منیش داوام کرد لە وەزیری دەرەوەی ڕووسیە داوام کرد تا لە ئیمپراتۆر داوا بکات ئیزنی بدەن لە قوتابخانەی سوارەنیزامی نیکوولای دابمەزرێت و کەچی ئەویش پەسندی کرد و لەوێ مایەوە و تا دوایی ئەم کوڕە کوردە لەسەردەمی پالەویدابوو بەوەزیری پادشا.

ساڵی ١٣٠٧ی کۆچی هەتاوی کاتێ کە هاتم بۆ تاران و بانگهێشت کرابووم ئەم کوڕە ناوی تەیمووتاشی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو و یەکەمین پیاوی دەسەلاتداری ئێران بوو. بە بینینم ڕێزی زۆری بۆم دانا و هیچ کاتێ پێش من لە درگاوە نەدەچووە دەرێ و لە ڕەزاشا داوای کرد تا خەلاتی پلەی یەکەمی پاشای ئێرانم پێ بدرێ. دوکتۆر غەنی دەڵێ تەیموورتاش پاش گەڕانەوەی لە ڕووسیە بوو بە نوێنەری خەڵکی خوراسان لە پارلەمانی نەتەوەیی ئێران. نووسەر دەڵێ تەیموور تاش لە خولی

نووسەری مەتلەعوششەمس سەبارەت بە نەردێن دەڵێ: ئەم شارە کە سەر بەجاجەرمە و هاوکات لەبارەی بنەماڵەی تەیموورتاشەوە دەڵێ: هەمووکات لە نەردێنەوە هێرشیان دەکردە سەر میامی و سەبزەوار و خەریکی دزدی و جەردەگەری بوون.

نەردێن لە مێژەوە لە ١٦٠ساڵی لەمەوبەرەوە گوندێکی چکۆلە بووە و عەرەبە ئەسکەندەرییەکان لەوێدا نیشتەجێ بوون، پاش ئەوەی عەلیقولیخانی تەیموورتاش بابەگەورەی ئەسفەندیارخانی نەردینی لە بنەماڵەی تەیموورتاش کە لە ژێر فەرمانی نەجەفقولیشادیلوودا بوو لە بجنووردەوە ڕووی کردە نەردێن و پاشان گوندێک بە ٨ قەڵاوە دروست کرا کە هەر قەڵایەک ٨ مەترە.

دوایی موحەممەد حوسێن خانی کوڕی عەلیقولی خان تەیموورتاش و پاش ئەویش ئەسفەندیارخانی کوڕی قەڵای نەردێنیان قەوی‌تر کردەوە و تاڕادەیەک کە ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی جەماوەرەکەی گەیشتە سێسەد بنەماڵە.

دوکتۆر قاسمی غەنی لە نووسراوەکانی خۆی دا سەبارەت بە تەیموور تاش نووسیوویە:

تەیموورتاش کوڕی کەریم دادخان بوو، ناوبراو لە خانەکانی نەردێن و نۆکەری یارموحەممەد خانی شادلوو سەردار موفەخخەم بوو و ناوبراو یارمەتی زۆری کردووە.

ژنڕاڵ سایکس، نوێنەری دوایی ئینگلیز لە خوراسان کە زمستانی ١٨٩٣لە

---

سێهەمی پارلەماندا نوێنەری خەڵکی قووچان بوو.

ساڵی ١٣٠٥ی هەتاوی کاتێ کە پاشای ئێران و تەیموورتاش بەرەو خوراسان دێن، بڕێ لە خانەکانی شادلوو وەک وەلیخان قەرامانلوو و فەرهادخان تووپکانلوو خۆیانیان گەیاندە خزمەتی موحەممەد ئیبراهیم خانی ڕەو شەنی ئیلخانی زافەرانلوو و گوتیان کاتی خۆیە پادشا دەکوژین و تەیموورتاش دەکەین بە پاشا و ئیلخانی مەنعیانی کرد، بەڵام ئەوان بە قسەیان نەکرد و بە خودی تەیموورتاشیان گوت و ئەویش کە نەیدەویست غەدر بکات لە پاشا، پەسندی نەکرد و بە پاشای گوت پاشا خێرا فەرمانی کەلەبچە کردنی ئەو دوو سەرکردە کوردەی دا کە فەرهادخان کەلەبچەکرا،بەڵام وەلیخان هەڵات.

تەیموور تاش پاش ماوەیەک بەفەرمانی پاشا بەندکرا و لە زینداندا کوژرا.

دەبێ بڵێین ئەرفەع نەیزانیوە تەیموورتاش کورد نەبوو، تەنیا بە کوردی قسەی کردووە ناوبراو لەبنەماڵەی مەغوولەکان بووە و بۆیە ناوی تەیمووریشی بۆ خۆی تەرخان کردووە بە یادی تەیمووری شەلەوە.

ڕێگەی دەریای خەزەرەوە لە تەنیشتی ڕۆخانەی ئەترەکەوە بەسەر ناوچەی سملقانەوە تێپەڕی و خۆی گەیاندە بجنۆرد و یارموحەممەدخان پێشوازی گەرمی لێوە کرد و سەبارەت بەبارودۆخی بجنۆردیش گوتوویە:

لە نزدیکی بجنۆردەوە ٦ سەربازی شادلوو لە لایەن حکوومەتەوە نێردرابوونەو پێشوازیمانەنوە و هاوڕێ ئەوان چوینە ناو شاری چکۆلەی بجنۆردەوە کە حاکمەکەی زۆر حەزی لێی بوو ببینە میوانی.

بۆ ماندوویی دەرکردن سێ ڕۆژ لەوێ ماینەوە و هەرکەس منی دەبینی ماندوونەبوونی پێم دەگوت و بۆ ئەوەی کە نەترسانە هاتووم شانازیان پێم دەکرد، چون تورکمانەکان ڕەحمیان بەکەس نەدەکرد و هەمووکەس و میوان و خەڵکی ئاساییان ڕووت دەکردەوە و دەیانکوشتن و بە تایبەت ئەگەر ژنیان لەگەڵدا بوایە و شوویان پێیان نەکردبایە. من ڕەقمە لە ئەم شێوەژینە کەسەرۆک بم و ژێر دستەیی کەسی دیکە بکەم.

لە ساڵی ١٢٦٤ی کۆچی موحەممەد پاشای قاجار مرد و ناسرەدین شا بوو بەجێنشینی و ئەمیر کەبیر گەیشت بەو قەناعەتەی کە دەبێ دوایی بهێنێن بە فتنەی سالار لە خوراسان بۆیە شازادە موراد حێساموسەڵتەنەی کوڕ عەباس میرزای نایبوسسەڵتەنەی کرد بە دەسەلاتداری خوراسان و سام خانی زافەرانلوویشی بە پلەی سەرتیپی گەیاند و بوو بە ئامرهێزی سپای ئێران لە خوراساندا. گەمارۆی مەشەد ساڵێکی خایاند.[١٥٦] یەلەنگ تووش خان جەلایری حاکمی کەلات کە بۆ یاریدەدەری سپای ئێران هاتبووە مەشهەد و یاری سام خانی دەدا لە ساڵی ١٢٦٤ی کۆچی دا کوژرا.

بارودۆخەکە بەم شێوەیە بوو: تاقمێک کەس بە ئامرهێزی سپای ئێرانیان ڕاگەیاند کە سالار دەیەوێ تاقمێک لە هێزەکانی خۆی لە شار بباتە دەرەوە بۆ گرتنی کەلات بەڕێیان بکات. تا ئەگەر شکستی خوارد خێرا خۆی بگەیەنێتەوە قەلاکەی کەلات و لەوێ بەرنگاری سپای ئێران ببێتەوە. سام خان ئیلخانی

---

١٥٦- بۆ زانیاری زۆرتر سەبارەت بە گەمارۆدان و گرتنی مەشهەد، بڕوانن بەبەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمە.

زافەرانلووی ئامرهێزی سپای ئێران فەرمانی بە یەلەنگ تووش خانی جەلایر دا تا کوو هەرچێ خێراتر بە پەلەتر لەگەڵ هێزەکەی دا وەرگەڕێتەوە بۆ کەلات و بەرنگاری سپای سالار بووەستێ و ئیزن نەدات بڕۆنە ناوی شارەوە. بەڵام کاتێ کە یەلەنگ‌تووش خان ڕووی کردە کەلات سپای مەروی کە لاینگری سالار بوون لە کەمین هاتنە دەرێ و گەمارۆیان دا و پاشان کەلەبچە کرا و هێنایانەوە بۆ مەشهەد، دایان بە دەستی بیگلەربەیگی برای سالارەوە. بە فەرمانی بیگلەربەیگی سەری یەلەنگ تووش‌خان لەجەستەی جیاکرایەوە و کردیانە سەری قەنارەوە و لەناو کووچە و کۆڵانی شاردا دەیانگەڕاند تاکوو بەم شێوە هانی سەربازان و خەڵک بدەن بۆ درێژە بە بەربەرەکانێ و هاوکات لە شۆڕشی خەڵک بەرگری بکەن.

بێهبوودخانی جەلایری کوڕ یەلەنگ‌تووش خان کە خۆی هاوڕێ باوکی لەگەمارۆی مەشهەد دا بەشدار بوون بۆ ئەوەی دەسەڵاتی کەلات وەدەست بهێننەوە و شایەت‌نامچەیەکیان کۆ کردەوە و ئامرهێزە پلەبالاکانی سپاش واژۆیان کرد و بەم ڕاڤەی خوارەوەیە:

بەڵگەی ژمارە یەک «کەلات»

هو- بۆ خزمەتی گەورەکانم ئامرهێزەپلەبالاکانی خاوەن شکۆ، دەبێ ڕای بگەیەنم لە ئەوڕۆژەوە سپای حیساموسەڵتەنە ڕەوانەی خوراسان بووە، باوکی من واتا یەلەنگ تووش خان هاوڕێ فەرەجوڵلا ئاغای ئاموزام لەمەڕ خوشنوودی ئێوەدا کاریان کردو باوکی ئەمن لە کاتی چوونی بۆ کەلات بۆ جێ بە جێ کردنی فەرمانی گەورەم لە لایەن سپای مەروەوە کە دانیشتووی مەشهەد بوون گەمارۆ درا و پاشان گرفتار بوو و کوژرا و فەرەجوڵلائاغاش لە ڕۆژی هێرش بۆ سەرشار بەتیرێک پێکایان و کوشتیان. ئەمن خۆمیش چرکەیەک بۆ خزمەتگوزاریتان کەمم دانەناوە و شەو و ڕۆژ خەریکی خزمەتگوزاری بووم. تکایە بیروڕای خۆتان لەمەڕ ئەم ڕاستیانە بە واژۆی خۆتان لەسەر ئەم بەڵگەیە دەرببڕن تا پیاوانی بەرزی دەوڵەتی ڕاستیەکەیان بۆ ڕوون ببێتەوە. (ڕێکەوتی مانگی شەواڵی ساڵی ١٢٦٤. چکۆلەی دەوڵەت بێهبوود ئاغا.)

لە لای ژووری بەڵگەوە عەبدولعەلی خانی تۆپخانە وەهای نووسیوە:

هوالعلی العزیز الجبار- ئەمن وەک شایەت، شایەتی دەدەم کە لەسەردەمی ئاسەفوددەوڵەدا باوکی سالار بە هۆی دژایەتی لەگەڵ دەوڵەت ماوەیەکی زۆر

لەبەندیخانە بوو تا ئەوەی پاش لە ناوچوونی سالار و هاتنەوەی حەمزەمیرزای مامۆی ناسرەدین شا بۆ خوراسان لەبەند دەرهێنراوە و لە ئەوپەڕی ڕاستیدا و دروستی دا خزمەتی کردووە تا ئەوەی کەبە هۆی شۆڕشی تاقمێکی مەشهەدی مەروویيەکان دەیگرن و دەیبەنە کن حاجی بیگلەربەیگی و ئەویش دەستووبرد کوشتوویەتی و فەرەجوڵلاخانیش لە ڕۆژی هێرش بۆ مەشهەد گیانی لە پێناوی دەوڵەت داناوە و بێهبوود خانیش تا ئێستا هەر خەریکی خزمەتگوزاری ڕاستەقینە بووە.

واژۆی سەرتیپ عەبدولعەلی خان

شایەتێکیتر لە لایەن یەکێ لە ئەفسەرەکانەوە بە ناوی حەمزە بە مۆری «الراجی عبده حمزه» لەتەنیشتی شایەتیەکەی سەرتیپدا وای نووسیوە:

هو- بوو بە پاشەیێکی عاشق و ڕاستبێژ هەرکەس گوتی یەلەنگ تووش خان و فەرەجوڵلا ئاغا لەڕێبازی ولاتدا ژیانیان دووڕاند، لە ڕۆژی هاتن بۆ خوراسان تا ئەمڕۆ کەس تر وەک ئەم دووکەسە ڕاستبێژمان هەرنەبووە و دەبێ هەموان لایەنگری بێهبوودخانی کوڕی یەلەنگ تووش خان بکەن تا خەڵک بزانن هەر خزمەتێ چاکەی بەشوێندایە. (لە بەرواری ١٠ی زیقەعدەی ١٢٦٤دا نووسراوە)

لە لای دەستی ڕاستی خواری بەڵگەکەوە، شایەتێیکی تری بەم شێوەیە دیارە: خوا و خەڵک دەزانن کە خوالێخۆش بوو یەلەنگ تووش خان و فەرەجوڵلا ئاغا، ماڵ و گیانی خۆی لە ڕێگەی خزمەت بە دەوڵەتەوە داوە و لەسەر دەمی دەسەڵاتدارێتی حکوومەتی ئاسەفوددەوڵە بۆ سەلماندنی دۆستی خۆی لە کەلاتەوە هاتە ولاتی مەشهەد و بۆیە موحەممەدعەلیخان برای سالار کەلاتی داگیر کرد و ئیزنی پێی نەدا تا بڕواتە ناو کەلاتەوە، دوا بە دوای ئەوەی کەلات کەوتە دەستی جەعفەرقولیخان شادلووی بجنۆردی، لەسەر هیچ بیانۆی یەلەنگ تووش خان و فەرەجوڵلا ئاغا و بێهبوود ئاغای بەند کرد تاکوو شازادە ڕوویان کردە خوراسان. لەم ماوەیەدا خوالێخۆش بوو یەلەنگ تووشخان و فەرەجوڵلائاغا بێهبوود ئاغا لە خزمەتی شازادە دا بوون هەتا ئەوەی کە فەرەجوڵلائاغا بریندار بوو و بەو شێوە گیانی خۆی لە دەست دا. یەلەنگ تووش خانیش بۆ سەرکوت کردنی دوژمن ڕووی کردە کەلات کەچی لە لایەن حاجی بیگلەربەیگییەوە گەمارۆ درا و پاشان کوژرا. بۆیە دەزانین بێهبوودخان بە تەواوی پیاوەتی خۆی نواندووە و لە کاتی گەمارۆکەشدا

هەوڵی زۆری داوە و کەمی دانەناوە و خوا ڕابەردارنیە و دەبێ بە باشی خزمەتی بکرێ.

لەتەنشتی ئەم شایەتیەوە نووسراوە لە ڕۆژی هاتنی حێساموسەڵتەنەوە بۆ خوراسان یەلەنگ تووش خان و فەرەجوڵلا ئاغا هەر پیاوەتیان هەبووە و لە ئاکامدا بۆ ڕێبازی وڵات گیانیان دا و ڕۆیشتن.

مانگی زیقەعدەی ساڵی ١٢٦٤مستەفاخانی یاوەر گەڕووس عەبدوسەفاقولی

لە تەنشتی ئەمەشدا وەها نووسراوە: ئەوەندەی بیستمان سەبارەت بە یەلەنگ تووش خان و فەرەجوڵلا خان بۆمان دەرکەوت کە جگە لە خزمەتگوزاری هیچی تریان نەکردووە و بێهبوودئاغاش لەسەرەتاوە تا ئێستا هەر پیاوەتی پیشان داوە و بەس.

١٠ی زیقەعدەی ١٣٢٤ئیمامقولیخان سەرهەنگ شیروانی و مادی خان میربەهادوران.

لە سووچی خواریەوە لە لای دەستی ڕاستەوە ئەگەر بکرێ بیخوێنمەوە وای نووسیوە: لانی کەم دوو وشەی نەخوێندرایەوە شایەتی و وتنەوەی ڕاستیەکان..... ( وشەیەک نەخوێندرایەوە) کە خوالێخۆش بوو یەلەنگتووشخان لە ڕێگەی دەوڵەت دا شەهید بوو و فەرەجوڵلاخانیش هەروەها و هەروەها بێهبوودخانیش وەها دژی دوژمن وەستاوە و پشتی قایم بووە کە باسی لێ ناکرێ.

شایەتییەکیتر کە بە خەتێکی وردتر نووسراوە و لە سووچی ڕاستی بەڵگەکەوەیە

هوالله تعالی -خوالێخۆش بوان یەلەنگ تووش خان و فەرەجوڵلا ئاغا هەر خەریکی خزمەتکردنی حێساموسەڵتەنە بوون و لەو ڕێگەدا دانەدانە گیانیان لە دەست دا. (لە بەرواری ١٢ی زیقەعدەی ١٢٦٤)

هەروەها دێڕێکی چکۆلە لە لای ڕاستەوە شایەتی عێنایەتوڵلا شایەتییەکی تری واهاتووە:

هوالله سبحانە- لە ئەو ڕۆژەوە کە گەورەی گەورەکان هاتە خوراسان ئەوکەسانەی وا بە دڵ و گیان بە خێرهێنانیان کرد و لە هاتنەکەی زۆرگەشانەوە خوالێخۆش بوان یەلەنگ تووشخان و فەرەجوڵلا ئاغای برازای بوون، هەر بۆیە گەورەمان یەلەنگ تووشخانی بە خودیی زانی و ڕەوانەی شەڕی کەلاتی کرد کە بە

داخەوە لە لایەنی شۆڕشگێڕانەوە کوژرا. کەسانێ وەک ئاغا جان بەگ و ئەسلان سولتان و عەلی ئەکبەر خان هاریکاری یەلەنگ تووش خانیان کردووە. بێهبوودخانیش لەم کاتەدا هەموو کات هاورێ و هاوسەفەری خانی خانان بووە، دەبێ بە هەمووی پیاوە دەوڵەتیەکان ڕابگەیەندرێت دەبێ بە باشترین جۆر و شێوە مافی بێهبوود خان بدرێتە دەستی خۆی کە ئەمە دەبێتە هۆی دڵگەرمی ئامرهێز و فەرمانبەرەکانیتر‌ەوە. بۆیە شایەتیم بە پێویست زانی. (مانگی زیقەعدەی ساڵی ۱۲٦٤سەم سام خان)

لە ژێرمۆرەکەی سەمسامخانەوە دێڕێک بە خەتی نەستەعلیق نووسراوە کە خاڵ لەسەر هیچ شتێک نیە.

یەلەنگ تووش خان لەڕێ سەروەری دەوڵەتدا شەهید بووە و فەرەجوڵڵا ئاغای برازاشی لە ڕێگەی دەوڵەتدا گیانی داوە، لە ڕۆژ ڕوونـاکترە و هەمووی گەورە و بچووکی خوراسانیش دەزانن و نۆکەرەکانیش بینیوویانە و زانیوویانە کە ئەو خوالێخۆش بوانە چییان کە نەکردووە بۆ سەربەرزی وڵات، لەسەر سەروەران و چاکرانی وڵاتە ڕێز و حورمەتی باشی بێهبوود خان بگرن کە لە ئەوان بە یادگار ماوەتەوە.

ئیبراهیم خەلیل خان وەبزانم جەوانشیر بێ، مۆر و واژۆی ڕەزاخان قاجار لە سووچی ڕاستی بەڵگەکەوە بەخەتێکی زۆر جوان و گەورەی نەستەعلیق شایەتێکیتر بەم شێوەیە دەخوێنینەوە:

لەڕۆژی هاتنی خانیخانەوە، یەلەنگ تووش خان و فەرەجوڵڵائاغای برای بە باشترین جۆر گیانبازیان کردووە. خەزمەتکەرانی دەوڵەت بە باشی خۆیان ئەم ڕاستیەیان بۆ ڕوونە؛ بەڵام ئێمە بۆ وە بیرخستنەوەیان گوتمان هەروەها بێهبوودخانیش کە یادگاری ئەوانە نابێ لەیاد بکرێ و دەبێ بە باشترین جۆر ڕێزی لێ بگیردرێ. (نادر قولی خان مافی و جەعفەرخانی سەرەنگ ئەفشار)

لە ژێری ئەم شایەتیەش‌دا هەمیسان هاتووەکە هو- یەلەنگ تووش خان و فەرەجوڵڵای برازای لەم ڕیبازەدا گیانیان داوە و بێهبوود خان دەبێ بە جوانترین جۆر ڕیزی لێ بگیردرێ. (مۆری فەتحوڵڵا)

ئەم شایەتنامچەیە بەم جۆرە دوایی پێ‌هات، بەڵام خوالێخۆش بوو یەلەنگ

تووش خان جەلایر لە شەڕەکانی ساڵی ١٢٥٠ی کۆچی لە هێرشی قاجارەکاندا بۆ سەر دەرەگەز و پاش وێران بوونی قووچان بە دەستی نایبوسەڵتەنە ڕووی داوە هاوڕێ و شەریک بووە و ویستوویەتی قاجارەکان و ڕەزاقولیخانی دەرەگەزی ئاشت بداتەوە کە لە لایەن خێڵی قاجارەوە دەستگیر دەکرێ .
بەڵگەی ژمارە٢ی کەلات

وەک لە شایەتنامچەکەدا دیارە بێهبوودخان جەلایر دەبێتە جێگری یەلەنگ تووش خانی باوکی. واتا دەبێ بە دەسەڵاتداری کەلات و لە ساڵی ١٢٩١ی کۆچی دا پلەی سەرهەنگی وەدەست دەهێنێ.

دەقی بڕیارەکە بەم شێوەیە:

ژمارەی ٤٦ مۆری شێروهەتاو لە لای سەرەوەی بڕیار نامەکەوەیە - هواللە تعالی شانە-

بۆ ڕێزان و هێزا بەڕێز بێهبوودخان دەسەڵاتداری کەلات!

سەروەر و گەورە و پایەبەرز ڕاڤەیەکی لە خزمەتگوزاری و گیانبازی تۆ نووسیوە بۆمان و هەروەها داوای پلەی سەرهەنگی بۆتان کردووە و بۆیە لە لایەن دەزگای شاییەوە پەسند کراو موبارەکتان بێ.

من[157] بۆ ئاگاداری ئەو پایەبەرزە ئەمەم نووسیوە و لەسەر ئیزنی خودا فەرمانەکە لەم ڕۆژانەدا دەردەچێ و بە چاپار ڕەوانەتان دەکرێ واتا ڕۆژی ١٥ی ڕەجەب دەگاتە دەستی والی خوراسان تا کوو ئەویش لەکەمترین کاتدا بیگەیەنێتە دەستی بەڕێزتان.

ڕەجەبی ١٢٩١ی کۆچی لە پشتی بەڵگەکەوە مۆری موحەممەد حسێن کراوە

بەڵگەی ژمارە ٣ کەلات:

فەرمانێکە لە لایەن ناسرەدین شاوە بۆ میرزا موحەممەدتەقی ڕوکنوددەولەی برای کە والی خوراسان بوو کە بە پێشنیاری ڕوکنوددەولەوە شمشیرێکی بە دیاری داوە بێهبوودخان

---

١٥٧- نووسەری ئەم بڕیارنامەیە نازانرێ کێیە، هەر ئەوەندە نیزامودەولە و ناسرەدین‌شا بۆ بێهبوودخان دڵیان نەسووتاندووە؛ بەڵکوو ویستوویانە بەم جۆرە لە ناوچە ژێر دەسەڵاتەکەی پارەیێکی زۆر پاڕۆبکەن.

بسم الله تعالی شانەالعزیز- بە ئاوی زێڕ لەسەر مۆرەکەی ناسرەدین شاوە
مۆری ناسرەدین شا
وازۆی ناسرەدین شا لە نێوان هێڵی یەکەم و دووهەمدا
لەبەر ئەوەی برای ڕێزدار و گەورە و هێژای حاکمی خوراسان بەڕێز ڕوکنودەولە زۆری تاریفی بێهبوودخانی داوەتەوە واتا حاکمی کەلات و لەبەر ئەوە ئێمە بەو ڕایە بووین تا خەلاتێکی باشی بۆ بەڕێ بکەین و ئەو برا بەناوبانگەمانەهان وهێز بدات. مانگی جیمادیولئەوەڵی ١٢٩٤. پشتیەوە سپاسالارمۆری کردووە.

بەڵگەی ژمارەی ٤ی کەلات: فەرمانێکە لە لایەن ناسرەدین شاوە بۆ ڕوکنوددەولەی برای سەبارەت بە حوکمی سەرتیپی بێهبوودخانی جەلایر[158] بە ناو نیشانی فەرمانی پێشووەوە بۆ برای هێژا و ڕێزدارم بەڕێز ڕوکنوددەولەی فەرمانفەرمای ناوچەی خوراسان ویستان سەبارەت بە گەورەیی و بیرو باوەڕی بێهبوودخان ئەگەر ئێوە پەسندتان کردووە ئەمنیش پەسندی دەکەم و بۆیە پلەی سەرتیپی پێی دەبەخشم و داواکارین ئێوە ئەم نیشانەی پێی ببەخشن و ئەم فەرمانە مێژووییەی ئێمەش لە ناو بەڵگە مێژووییەکاندا بنووسنەوە لە مانگی سەفەری ساڵی ١٢٩٦دا نووسراوە.

---

١٥٨- بانو گوڵ بی‌بی کچی نوورویێردی خانی جەلایری کوڕی بێهبوودخان کە ئێستا ٩٠ ساڵی تەمەنەوشوکور خەزێنەیەکە لە زانستە کوردییەکان و لەسەردەمی جوانیدا لە باشترین ئاوازخوێنە کوردەکان بووە و ئێستاش باشترین گۆرانیە کوردییەکانی لەبەر کردووە و مێژووی سەدساڵەی ئەو ناوچەیە بە تەواوی لەبەرە. سەبارەت بە بێهبوودخانی باوەگەورەی دەیگوت، بێهبوود خان ١٤ ژنی هێناوە کە دوو دانەیان ئامۆزای خۆی بوون و یەکیان لە کوردەکانی مەمیش‌خانی زەعفەرانلووی چناران بوو و یەکی تریان بە ناوی حووری خاتوون پووری عێززەتوڵلا بەگ و کچی حاجی ئیوورخانی بەگی زیدانلوو بوو کە دایە گەورەی منەو دوان تریان لە تورکمەنەکان بوون مندالانی بێهبوود خان لە کچەکەی مەمیش خانی چناران بریتی بوون لە: خوالێخۆش بوو یەلەنگ تووشخان حاکمی کەلات کە باوکی خوالێخوش بوو فەتحولمەلیک حاکمی دوایی کەلات و حسێن خان و حاجی خان و فەتح سوڵتان و ڕەفیعەخاتوونی دایکی سەولەتوسسەڵتەنەی هەزارەییە.
بانووگوڵ بی‌بی سەبارەت بە گەرمێن و کوێستان کردن دەیگوت: زستان دەچوینە گلنگاز جاروباریش ڕوومان دەکردە خێوەئاوای نادرشا. زۆرتر لەگەڵ حاجی عەلی باوای حاجی زولفەقاردا لە شوێنی بووین. لەو کاتەدا بۆ هەمەڕی دەبوا قرانێک پارەمان بایی لەوەڕ بدایا بە ڕووسیەکان. ئەو ناوچانە ئێستا خاکی ڕووسیەن. هاوینانیش دەڕۆیشتینە کێوی هەزار مزگەوت..

لە پشتی فەرمانەکەوە مۆری زۆریان کوتاوە بە تایبەت سپاسالاری گەورە، وەزیری بەرگری

بەڵگەی ژمارەی ٥ی کەلات، کە دەسەڵاتی سەربەخۆی کەلات لە لایەن ڕوکنوددەولەی برای ناسرەدین شا والی خوراسانەوە بۆ یەلەنگ تووش خانی دووەم ی کوڕی بێهبوودخان جەلایر بە خەتێکی زۆر جوانەوە لە بەرواری ١٣١٥لە لای ڕاستی بەڵگەکەوە مۆری ڕوکنوددەولە دەبینرێ.

هوالله شانە تعالی- فەرمانی بەند درا لەبەر ئەوەی ناوبراو بۆ پاراستنی سنوورەکان لە لای کەلاتەوە بووەتە هۆی ئاسوودەییمانەوە و هێزوتوانای خۆی نواندووە و پیاوەتی و مەردمداری بۆتە وێردی سەر زاری هەموان کە بۆیە هەر لە ئەمڕۆکەوە سەرەتا دەسەڵاتی ئیل و پاشان حوکمی فەرمانڕەوایی سەرانسەری کەلاتی پێی دەدرێت لەسەر گەورەکان و پیاوانی خاون شکۆ وناوداری کەلاتیشە تا یاریدەری ناوبراو بکەن ئەم فەرمانەی ئێمەش دەبێ زەوت بکرێ، مانگی جیمادیولئەوەڵی ساڵی ١٣١٥ لە پشتی بەڵگەکەوە مۆری نەجدوسەڵتەنە دەبینرێ
بەڵگەی ژمارە٦ی کەلات فەرمانێکە لە لایەن ڕوکنوددەولەی والی خوراسانەوە بۆ یەلەنگتووشخان جەلایری حاکمی کەلات سەبارەت بەوەی کە ئیزنی نیە مالیەی زۆر لە خەڵکی قەلای نوێ کەلات و ناوچەی ژێر دەسەڵاتی وەربگرێ. پیاوی متمانەداری حاکمی کەلات بەڕێز یەلەنگتووش خان لەبەر ئەوەی خەڵکی قەلای نوێ کەلات شکایەتیان کردووە. فەرمانتان پێ دەدەین ئەمساڵ وەک ساڵانی ڕابردوو سەدوشەست ودووتمەن دراو و حەڤدەخەروار کەلوپەل لە مالیات دەبێ بدرێ بە ئێمە کە هەروەها لەم ساڵەدا ئێوە دەبێ چوارسەدتمەن دراو و بیستوپێنج خەروار کەلوپەل لە خەڵک وەرگرن بۆ خۆتان. بۆیە بە پێی ئەم فەرمانەوە دەبێ غەدر لەو خەڵکە نەکرێت. (١٨ی جیمادیولئەوەڵی ١٣١٧)

لە پشتەوە نەجدوسسەڵتەنەش مۆری کردووە.

بەڵگەی ژمارە٧ی کەلات: فەرمانێکە لە لایەن شازادە نەیروددەولەی والی خوراسان بۆ موحەممەدڕەزاخانی حاکمی کەلات تا چەند کەسێک بداتە دەستی نووسینگەی ڕووسیەوە. وادیارە حاکمی ئەم کاتەی کەلات، یەلەنگ تووشخان نەبووبێ. مۆری نەیروددەولە لە لای ڕاستیەوەیە.

جێی متمانەی پاشاموحەممەدڕەزاخان حاکمی کەلات، بەپێی نامەی نێردراو لە لایەن نووسینگەی ڕووسیەوە بۆ خوراسان دەبێ ناوبراوان ڕەوانەی ئەوێ بکرێن. حوسەینعەلیئەمیرخان، کەربەلایی ڕەمەزان عەلی عەوەز کە هەموویان دانیشتووی کەلاتن و سەبارەت بە دزی چەند وشتر و دوو سەر ئەسب دەبێ ڕەوانەی دەرەگەز بکرێن و تکایە هەرچی زووتر بەڕێیان بکەن. (بەرواری ٢١ی زیقەعدەی ١٣١٩)

بەڵگەی ژمارە٨ی کەلات: لەپشتەوە مونتەخێبولمەلێک مۆری کردووە

فەرمانێکە لە لایەن شازادە نەیروددەولەی والی خوراسانەوە بۆ موحەممەدڕەزاخانی شوجاعولمەلێک هەزارەیی حاکمی کەلات، مۆری نەیروددەولە لە لای ڕاستەوەیە.

گەورە پیاوی پیاوان موحەممەدڕەزاخان شوجاعولمولک حاکمی کەلات مەلافەرەیدوون کوڕی عەلی بادکووبەیی شەست پووت گەنمی لە لای بیگلەری کوڕی نەورۆزەوەیە کە دەبێ هەموو ساڵی سەرفەرمان ٣ گەنمی پێی بداتەوە کە کاری وای نەکردووە. بۆیە بە هۆی ئەم نامەیەوە دەبێ ئێوە بەهەر شێوەیەک بووە ئەم ڕادە گەنمەی لێی وەربگرن و بیدەن بە خاوەنی و یان پارەی گەنمەکەی لێی وەربگرن و بیدەن بە خاوەنی و یان پارەی گەنمەکەی لێی وەربگرنەوە. (١٩ی ڕەجەبی ١٣٢٠)

بەڵگەی ژمارە٩ی کەلات

فەرمانێکە لە لایەن ڕوکنوددەولەوە کە هەمیسان پاش نەیروددەولە دەسەڵاتی وەدەست هانی لە خوراساندا و لەنامەیەکدا کە بۆ فەتحعەلیخانی نووسیوە.

ژمارە ١٧١٥

هو- بۆ پیاوی جێی متمانەی پاشا فەتحعەلی خان حاکمی کەلات لە لایەن کونسوولگەری ڕووسەوە بە دەسەڵاتی خوراسانیان ڕاگەیاندووە کە دەبێ ناوبراوان ڕەسوول قەرەتیکانی حەسەنخان زوو، غولامحوسەین خان کەرناوە موحەممەد باقرو وەلەد جەعفەر بەیگ دانیشتووی لاین زووتر خۆیان بگەیەننە نووسینگەی ڕووس لە دەرەگەز. (٩ شەعبانی ١٣٢٦)

بەڵگەی ژمارە١٠ی کەلات: فەرمانێکە لەسەر بەرگێکی خاوێن نووسراوە. جۆری لاپەڕەکە ڕووسیەییە لە لایەن موحەممەدعەلیشای قاجارەوە کە بە پێی ئەو

حوکمـە فەتحعـەلی خـان دەبـێ بـە فەتحولمـەلێک واژۆی موحەممەدعەلیـشا بـە پێچەوانـەی واژۆی پاشـاکانی‌تـری قاجـاڕ لـە دەسـتی ڕاسـت لـە لای خـوارووی بەڵگەکەوەیە، مۆری کراوە و لە ناو مۆرەکەدا نووسـراوە هـاتن بـۆ نێـوان دەفتـەری تایبەتی پاشایەتی لەبەرواری ٢٦ی ڕەجەبی ١٣٢٦ بە ژمارەی ٢٩٧٠وە دیارە.

موشیروسسەڵتەنەش لە پشتەوە مۆری کردووە ئەم فەرمانە زۆر جوانە بەتایبـەت نامەکانی موحەممەدعەلیشا کە وەک زێڕەکانی کەم دەست دەکەون.

لەبەر ئەوەی ئەو پەڕی ئازایەتی و دلێری فەتحعەلی‌خانمان بـۆ دەرکـەوت کـە هەموو کات بە ئەو پەڕی ڕاستی و دروستییەوە لە خزمەتماندا بووە. بۆیە ئێمەش لە وڵامـــی پیاوەتییەکانیـــدا ئـــەوا نازنـــاوی فەتحولمـــەلیکمان پێـــی داوە.

بەرواری ڕەجەبی ١٣٢٦

بەڵگەی ژمارە ١١ی کەلات:

برووسـکەیەکە لـە لایـەن قەواموسـسەڵتەنەوە بـۆ فەتحولمـەلێک لەبـەرواری ١٣٠٠/٨/٣٠ی کـــۆچی هـــەتاوی واتـــا ٥٠ ڕۆژ پـــاش کـــوژرانی موحەممـــەد تەقی‌خان‌پسیان لە قووچان

لە تارانەوە بۆ کەلات ژمارەی برووسکە ٤٥٥ بەروارەکەشـی ٣٠مـانگی عـەقرەی ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی هەتاوییـە بـۆ پیاوەگـەورەی ناوچـە فەتحولمـەلێک حـاکمی کەلات لە ناوەرۆکی ژمارەی ٢١دا سەبارەت بە سوارەنزامی کەلات و گوێ بە فەرمان بوونیان ئاگاهیێکی بـاش هەیـە. نـاوبراوان چەنـد ڕۆژێکـە بـەڕێوەن. (٣٠عـەقرەبی ١٣٣٣ئەحمەدی سەرۆکی وەزیران)

## دەسەڵاتدارانی دەرەگەز لە نادرەوە تا شۆڕشی مەشرووتە

دەرەگەزی کە لە کەلە کەلی ژبری ئاغ مەزەلە ناقێ یارێ من گوزەلە

شـاری دەرەگەزکـە ئەمڕۆکـە کەوتووتەبەشـی ڕۆژهـەڵاتی خوراسـانەوە بـەڵام بەداخەوە بە هۆی ڕێ وبانی نالەباری ئـەو ناوچەیـەچوون بـۆ ئـەوێ زۆر سـادە نیـە. دەرەگەز لەتەنیشتی کێوی ئەڵلاهووئەکبەرەوەیە کە گوند و دێهاتێکی زۆر دەورەیان داوە. هەروەها ئەتەک وئاخاڵیش لەکەرناریەوەن گرێبەندی نالەباری ئاخاڵ لە ساڵـی

١٢٣٩ادا لە کەناریەوە گوزەرا بەڵام شوکور بۆخوا هەروەک خاکی وڵاتی ئێران مایەوە و نەکەوتە ژێر چەپۆکی ڕووسیە.

مێژووی پڕ لە هەورازو نشێوی ئەو شارە وەک شیاوبێ نەنووسراوەتەوە. هەرچەندە مامۆستا قاسمی بە نووسینەوەی کتێبی (خاوەران گوهەر ناشناختە ئیران) هەنگاوێکی بەرزی لەم بوارەدا هەڵگرتەوە و لەم دواییانەشدا بەڕێز سەیدعەلیمیرنیا بە کەڵک وەرگرتن لە کتێبی ناوبراوەوە لەم بارەوە باشی نووسیوە: هەروەها لە نووسراوەکانی ئەڵلاهیارخان دەرەگەزی کە کەوتبووە دەستی میرزامەحموودی سارم توانی کتێبی (ئیلات و تەوایف دەرەگەزی) چاپ بکات. بەڵام ئەم دوو بەرهەمە ناگاتە جێگایەک و گیرو گرفتی زۆریشیان هەیە.

جەماوەری دەرەگەز لە بواری ڕەگەزەوە زۆر پرش‌وبڵاون. ئەگەر بە وردی بۆ بارودۆخەکە بڕوانین دەبێ ئەو خاڵەمان لەبەر چاوبێ کە پاش پەڕینەوەی تورکانی عوسمانی لە ڕووباری جەیحوونەوە لە ساڵی ٤٢٩ی کۆچی و پاش ئەوان و بە هۆی هێرشی تورکانی غەزەوە بۆ وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئێران، دانیشتوانی زووتری دەرەگەز لە ناوچوون و ئەگەر تاقمێکی کەمیشیان لێ مایەوە ڕەگەزی تورکیان بە خۆگرت. لە کاتی هێرشەکانی تەیمووریلەنگ بۆ خوراسان شوێن پێ تورکەکان دەبینرێ. واتە هەر لە کەلاتەوە تا دەرەگەز، کە ڕەگەزیان لە تورکانی جانیقوربانی بوون. بانەمەڕی ساڵی ١٣٦٥ی کۆچی هەتاوی بۆ لێکۆڵینەوە ڕووم کردە دەرەگەز و لەگەڵ ئەم دۆستە میهرەبانانەدا دیدارم بوو تورکەکانی دوایی کە ئێستا لە دەرەگەزدان لە پاش شۆڕشی کوموونیستی پەنایان هێناوەتە ئێران و لە دەرەگەز نیشتەجێ بوون و لە کەمترین کاتدا. بەشی ئابووری ناوچەکەیان وەدەستەوە گرت. کەچی کوردەکان و تورکەکانی جانیقوربانی بە ڕووی خۆیاندا نەیانهانیوە و باسی پارەیان بەلاوە زۆر گرینگ نەبووە. پاش تورکانی جانیقوربانی کوردەکان کۆنترین دانیشتوانی ئەم ناوچەیەن و ئەم کوردانە ساڵی ١٠٠٧ی کۆچی پاش هاتنی کوردەکان لەسەردەمی شاعەبباس بۆ خوراسان کە ئەو کاتە شاقولی سوڵتان چامەشگەزک سەرۆکیان بوو، دەسەڵاتی کوردی لە ناوچەی دەرەگەزدا دامەزراوە. وادیارە عەشیرەتی ئەفشاریش هەر لەم کوردانەن . جیا کردنەوەی مێژوو وجێوگرافیای دەرەگەز لە شارەمێژووییەکانی نسا و ئبیورد یەکێکە لە چەڵەمەکان لە پێش پای ئەوکەسانەی

وادەیانئەویَ لەم بارەوە لێکۆڵینەوەیان هەبێ.

لە کاتی دەسەڵاتگرتنی نادردا، کوردەکانی باچوانلوو، قەراچوولوو، بیچرالوو، مامیانلوو و قەراباشلوو و... بە ئەو پەڕی هێزەوە چوونە یارمەتی ناردەوە و گەیاندیان بە تەختی پاشایەتی ئێران.

پاش ئەوەی نادر بیری پاشایەتی دای لەسەری، زۆربەی کوردان بە تایبەت باباخان کە شایەت هەر بێهبوودخان بێ لە تورکانی دەرەگەز ڕێکەوتننامەی بە ناوبانگی دەشتیموغانی واژۆ کرد. چاوشلوو یان چاپشلوو بە وتەی زۆربەی مێژوونووسان تورک بوون و لە ئەفشارەکان جێ و شوێنی پایان زۆرتر وەبەر چاودێ. لە سەردەمی دەسەڵاتی سەفەوییەدا، بەدەسەڵاتگرتنی نادر، چاپشلوو لەبەرانبەر ئەفشارەوە ڕەنگی خۆی لە دەست دا. سەبارەت بە ئەفشاریش هێشتا ناتوانین بە جوانی بڵێین تورک یان کوردن لە بەر ئەوەی لە خوراساندا عەشیرەتی کوردی ئەفشەرانلوومان هەیە کە بە مانای ئەفشارە.

بێهبوودخانی چاپشلوو لە سەردەمی نادرشای ئەفشاردا لەکەسایەتییە بەناوبانگەکانی دەرەگەز بووە و بەڕێزان قاسمی و میرنیا دەڵێن حاکمانی دوایی دەرەگەز هەر لە عەشیرەتی چاوشلوون. جێگای لێکۆڵینەوەی هەیە و باش ڕوون نیە من لە ئەو بیرەدام کەحاکمانیدوایی دەرەگەز لە ئەم عەشیرەیەنین،ئەمانە لە تورکانی قارشیقووزین کە لە بەرگی یەکەمدا ئاماژەی پێی کرا لە باسی شەڕی ڕەزاقولی کوڕی نادر هاوڕێ لەگەڵ موحەممەدحسێنخان زافەرانلوو وتمان کە چوون قارشی قووزییان لە ساڵی ١١٥١ی کۆچی دا گەمارۆداوە.

وا دیارە نادر پاش گەڕانەوەی نادر لە هێند وهێرش بۆ سەرخێوە و بوخارا. لە ئاکامی ساڵی ١١٥٣ تورکە شۆڕشیەکانی قارشیقووزی کە لقێکن لە قاجاڕییەکان کەبە فەرمانی شاعەبباس بۆ پاراستنی سنوورەکان هاتبوونە ئەو ناوچەیە. بەڵام بەڕێز میرنیا دەڵێ: نادر دەسەڵاتی دەرەگەزی داوەتە دەستی بێهبوودخانیچاپشلووەوە کە لەناوچەی قارشیقووزیدا نیشتەجێ بوون و ئەڵلاهیارخان حاکمی دەرەگەز لە سەردەمی ناسرەدین شا دا گوتوویە: بنەماڵەی ئێمە لە قارشیقووزی لە نێوان بوخارا و بەلخ دا ژیاون.

بە کورتی بڵێین کە دەسەڵاتی دەرەگەز لەسەردەمی نادر بە دەستی تورکانەوە

بووه بەڵام ئەم حاکمانە لە لایەن کوردەکانەوە دانراون.

وەک دەبینین عەباسقولی‌خان ڕەزاقولیخان دەڵێ بە هۆی شۆڕشەوە لە لایەن ڕەزاقولی‌خانی کوردەوە سەرکوت دەکرێ و بۆ دەرەگەز دەرباز دەبێ.

یا ئەڵلاهیارخان دەرەگەزی لەسەردەمی ناسرەدین شادا ناتوانێ دەرەگەز ڕابگرێ و بە پێشنیاری ئەمیرحوسێن‌خان شوجاعوددەولەی ئیلخانی دەسەڵاتی لێ دەسەندرێتەوە.

پاش بێهبوود خان لوتفعەلی‌خان چاپشلوو دەسەڵات دەگرێ کە لە نێوان سالانی ١٢٠٣-١٢١٧ی کۆچی دەسەڵاتداری ئەوێ بووە و کاتی هاتنی ئاغا موحەممەدخانی‌قاجاڕ بۆ قووچان لە سالی ١٢١١ و ئەمیرگوونەخان بێهبوود خانی بردە خزمەتی پاشا، لوتفعەلی خانی کوڕی بیگلەرخان بە فەرمانی فەتحعەلیشای قاجاڕ بوو بە حاکمی ئەتەک و دەرەگەز.

بیگلەرخان چەند کوڕی هەبووە و نازانین دوایی چییان پێی هاتووە ئایا بەهادورخان کە لە بەرگی یەکەمدا باسمان کرد کوڕی بوو بێ یان برای بووە.

فەتحعەلیشا لە سالی ١٢٤٩ی کەپاش سەرکوت‌کردنی ڕەزاقولیخان هێرشی بردە خوراسان و دەرەگەز و گوندەکانی لە لایەن سپاکەیەوە تالان کران.

لەسەردەمی دەسەلاتی موحەممەدعەلیشاوە برای ڕەزاقولیخانی دەرەگەزی‌دا حاکمی دەرەگەزبووە. سام خانی زافەرانلووش لەم دەمەدا لە زیندان بووە.[١٥٩]

دەردەکەوێ کە ئەم موحەممەدخان لاینگری دەسەڵاتی موحەممەد شای قاجاڕ بوو.

لەسەردەمی حکوومەتی ئەودا کە لە سالی ١٢٥٣تا ١٢٦٢درێژەی هەبووە،

---

١٥٩- بەڕێز قاسمی کە لە زمانی چرچیلەوە دەڵێ: موحەممەدخان چاپشلووکوڕی بەهادوڕخانە و هەروەها دەڵێ موحەممەدخان بۆ بەهێزتر کردنی خۆی لەگەڵ خانەکانی کوردی خوراسان پێوەندییێکی باشی هەبووە و گەوهەرسوڵتانیشی خواست بۆ کوڕەکەی واتا لوتفعەلی‌خان کە قاسمی بنیاتی موحەممەد ئابادی ئێستەی داوەتە پالی ئەم موحەممەدخانەوە کە هەڵەیە. دەبێ بڵێین: ئەم شارە بوو بەجێگری دەستگرد. نازانم چلۆن بەڕێز قاسمی ئەم هەڵەیە کردووە.

فریزر لەسەفەرنامەکەیدا لە سالی ١٢٤٩ی کۆچی دا لەم شارەدیدەنی کردووە وادیارە ئەم شارە بە دەستی بیگلەرخان بنیات نرابێ واتا سەردەمی فەتحعەلیشا

نەورۆزخانی کوڕی شوکورسوڵتان باچوانلووی ژن برای نادرشا بووبێ کە دژ بە موحەممەدخان وەستاوە، بەڵام والی خوراسان لە شازادەکانی قاجاڕی بوو.

بە هۆی هێزی زۆری نەورۆزخانەوە گەمارۆی شار ٦ مانگ دەخایەنی و لە ئاکامدا یەزدانوێردیخان لە لایەن براکەی واتە سام خانەوە دەسەڵات دەگرێ و دەبێتە حاکمی قووچان و نەورۆزخان بەڵام هەر دەستی هەڵنەگرت و ئاوی ڕووباری دەروونگەردی بەست و شاری موحەممەدئاباد و دەرەگەز زۆر خەساریان بینی. هەرچەند حاکمی خوراسان، دەسەڵاتی نەورۆزخان بەرتەسک دەکاتەوە و دەسەڵاتی عەشیرەتی باچوانلوو دەداتە دەستی موحەممەدخانەوە و هەتا ساڵی ١٢٤٦ واتا سەردەمی ناسرەدین شا و میرزا تەقیخان ئەمیرکەبیر و هاتنەوەی سامخان بۆ خوراسان بارودۆخەکە هەر شێواو بوو.

بە ئاڵوگۆڕی ڕامیارییەوە، موحەممەد خان بێ دەست دەکرێ و سلێمانخانی برای لە ساڵی ١٢٦٢دەبێ بە دەسەڵاتداری دەرەگەز ناوبراو پیاوێکی زۆر زانا بووە و کاتێ دەزانێ توانای شەڕی دژ بە نەورۆزخانی نییە لەگەڵیا لە ڕێگەی وتووێژەوە خەریکی کار دەبێت و لە ئاکامدا دەگەن بەو قەناعەتەی تا سلێمانخان و نەورۆزخان هەر کامەیان بە ١٠سوارەوە هاوڕێ پیاوچاکان و پیرانی ناوچەکە لە نێوان باچوانلوو موحەممەدئاباد دا دیاریان کرد. لەئاکامدا سلێمانخان بە شێوەی نهێنی سەدکەسی لە سوارەماهێرەکانی خۆی تەیار کرد و شەوانە هێرشیان کردەسەریان.

ئێوارەی ڕۆژی هاتنم لە گەڵ«سەهامودەولە» گەورەیشادلوو دیدارێکم پێک هێنا.

ئەم کوردانە هەروەها کە لە بەشی ڕابردوودا ئاماژەیی پێ کرا «شاعەباس» لەم ناوچەدا نیشتەجێیانی کردووە.[١٦٠]

---

١٦٠- هەرەشەی دەکرد. لەبەر ئەوەی کە تورکمەنەکان بەزەییان بە هیچ کەسەوە نەدەهات و هەر نەناسێک چ لە ئێرانی و چ غەیر ئێرانی کە لە هەرێمی خۆیاندا دەیانبینی دەسگیر و دیلیان دەکردن و جگە لە دزەینی ئەو شتانەی کە موسافێر لە گەڵیدا بوو خراپترین ئاکار سەبارەت بە ئەو کەسە ئەنجام دەدا. زۆربەی دیلەکان لە ژێر زلمێکدا کە پێنووس لە نووسینیان شەرمی هەیە گیانیان لەدەس دەدا. بە تایبەت ئەگەر ئەم چارەڕەشانە ژن هەبوون و ڕازی بە ئێزدواج لەگەڵ ئەواندا نەدەبوون.

وتوێژەکانمان لەگەڵ هۆزی خانی (ئێلخانی) لەبارەی بوارەکانی جۆربەجۆرەوە بوو و ناو براو لە بارودۆخی ولاتانی دیکە بەتایبەت هێندووستان ئاگاداری بە کۆمەڵی هەبوو.[١٦١]

بوجنورد[١٦٢] شارێکی بچووکە زۆرتر لە دەهەزار کەس ژمارەی هەیە و بە مەشهەدەوە پێوەندی هەیە.[١٦٣]

بڕیارنامە سەبارەت بە فیرووزە، حەسار و هتد لە نێوان ئێران و ڕووسیە.

بە بڕواری ٧٤ مەی ١٨٩٣ بەرامبەر بە ٢٣ زیقەعدەی ١٣١٠.

بڕیاری نالەباری فیروزە کە لەلاین وەلاتێکی زاڵمەوە بە وەلاتێکی زەبوون داسەپێندراوە. لە حەوت بەشدا بەم تەحرە نووسراوە:

لە بەر ئەوەی کە سەرۆکی ئێران و دەسەلاتدار و خاوەنی هەموو مەڵبەندەکانی ڕووسیا دەیانەوێ کە هەندێک کێشە لە بارەی سنووری نێوان ولاتەکان ڕێک و پێک بکەن و بەم بۆنەوە یەکیەتی نێوانمان پتەو بکاتەوە. دەیسا بۆ بە دەس هێنانی ڕەزایەتیان لە کێشەکانی ناو براو بە پاراستنی سەربەخۆیی خۆیان پێی دەگەن.

---

سایکس و دیکەی ڕۆژهەلاتناسان کە هاتوونەتە نێوان هۆزەکانی تورکەمەن لە ئاکاری ئەواندا لەگەڵ دیلەکان ئاگادارییێکی بە خۆفیان داوە.

[١٦٠]- لەم بارەوعە سایکس لە لاپەڕەی ١٨ سەفەرنامەی خۆیدا هاوردویەتەوە کە: شاعەباسی سەفەری لە سەردەمی سەرۆکلەتی خۆیدا ژمارەییێکی زۆر لە کوردەکانی لە بۆجنورد و قورچان و دەگەز نیشتەجێ کرد و ئەم ئاکارە بەر چاوییە زەرەر و خەوسارێکی شیاوی بە توزبەکەکان و تورکەمەکانی دەسبڕ (هەمەوەن) دا.

[١٦١]- سەهاموددەولە هەواڵی موحەممەدخان جگە لە ئەمەی لە خۆی موسافرەتی جۆر بە جۆر دەچوو لە هەمووی تووریستانی ناو خۆ و دەرەوەی ولات کە بۆ بجنورد دەهاتن، بە باشی پەزیرایی دەکرد و لە زانیاری ئەوان قازانجی وەردەگرت.

[١٦٢]- سایکس لەبارەی شیروان دەلێ: پاش سێ چوار ڕۆژ مانەوە لە بۆجنورد کە بەرە بەرە وەرەز بووم چەن ئێسترم بە کرێ گرت و بەرەو قووچان بزاوتم.

زۆربەی گوندەکانی ئەم ناوچە چەن قەلای سەماکیان (بۆ بەرگیری کردن لە شەڕانخیزی تورکەمەنەکان) هەیە کە لە دوورەوە وەکوو کلیساکانی بەریتانیایە.

شیروان کە دووهەمین شاری ئەم ناوچە و والینشینی کۆنە تەپۆلکەییێکی دەسکردی گەورەی هەیە کە بە قسەی ڕێشاندەری ئێمە جێگای سوار کردنی تۆپەکانی ئاگرین بووە و ئەم شارە بە ڕواڵەت ئاوەدانە. [زەعفەرانلووکان کە گرینگترین ڕەگەزەکانی کوردن لەم ناوچەدا نیشتەجێن].

[١٦٣]- سەفەرنامەی جنراڵ سایکس- سەعادەتی نووری- لاپەڕەی ٢٧.

لەلایەن سەرۆکی ئێرانەوە «میرزا عەلی خان ئەمین و سوڵتان ئەسەدی ئەعزەم» و لەلایەن خاوەنی هەموو مەڵبەندەکانی ڕووسیا«کنسیە پریوەئوژن بوت زوف وەزیری بارەگای سەرۆکی ئێران، پارێزەرانی ناوبراو بەشەکانی خوارەوایان ڕێک خست و واژۆیان کرد»:

بەشی یەکەم: سەرۆکی ئێران لەلایەن خۆیەوە و هەروەها لەلایەن بەشبەری خۆی گوندی سەرحەدی فیرووزە و هەمووی ناوچەکانی لە نێوان سنوورنشینان دابەش‌کرد ( ١٨٨١زایینی) و چیای کنارە بەرەو شیوی بەبر[١٦٤] بە ڕووسیا دا.

سنووریَ کە ئەم ناوچەی بەش کردبوو بە پێی بڕیارنامەی ٩ دەسامبری ١٨٨١لە بەین دەچێت و دیکەی بەشەکانی بڕیارنامەی ١٨٨١ بە ناوەڕۆکی خۆیان دەمێننەوە.

لەجیَ ئەو زەویە کە لەبەشی ئاماژە کراودا بۆ ڕووسیە گۆزراوەتەوە. سەرۆکی هەموو مەڵبەندەکانی ڕووسیا لەلایەن خۆیەوە و لەلایەن بەشبەرەکەیەوە ناوچەکانی خوارەوە بە سەرۆکی ئێران دەدات.[١٦٥]

١- زەوینێکە لە کەناری ڕاستی ڕووباری ئەرەس و دەوری قەڵای کۆنی عەباس ئاوا و بە هۆی بەشی چوارمی پەیمان‌نامەی تورکەمەن‌چای[١٦٦] بە بەرواری ١٠ فوریەی ١٨٢٨ بە وڵاتی ڕووسیا درابوو.

٢-گوندی حەسار لەگەڵ زەوینێک ئاڵشت دەکریَ. ئەم زەوینە لە شوێنی سنووری ئێستا دەگەڵ جۆگەی حەسار[١٦٧] و شیلگان[١٦٨] دەس پیَدەکا لەکەناری

---

[١٦٤]- لە ڕاپۆرتی جەهان‌بانی [شیوی پیر] هاتووەتەوە. سنوورەکانی ئێران و شەورەوی- جەهان‌بانی- لاپەڕەی ٢٧.

[١٦٥]- چ مەزنایەتی و گەورەیێک.

[١٦٦]- پەیمان‌نامەی تورکەمەن‌چای لە زیللەت‌بارترین پەیمان‌نامەی ناحەزی کە بە هۆی لاوازی دەزگای قاجار بوو بە تووشی گەلی ئێرانەوە و بە هۆی ئەوە وڵاتی زاڵم و داگیرکەری ڕووس بەشێکی گرینگی لەخاکی ئێران کە بریتیە لە قەفقاز، ئێروان و نەخجەوان تاکوو کەناری ڕووباری ئەرەس داگیر کرد.

[١٦٧]- حەسار لە گوندەکانی سنووری دەرگەر.

[١٦٨]- شیلگان: گوندێک لە گوندەکانی بەشی لوتف‌ئاوای شارستانی دەرەگەز- ٥ کیلۆمەتری باکووری ڕۆژئاوای لوتف‌ئاوا بە حەسار- فەرهەنگی زەوی‌ناسی ئێران- بەرگی ٩ لاپەڕەی ٢٥٢.

ڕاستی جۆگەی ناو براوە دەڕوات و ڕۆژهەڵاتی گوندی حەسار دەور دەداتەوە و پاش گەیشتن بە جۆگەی ناو براو بەرەو باکوور دەڕوات و لە شوێنێکەوە دێت کە ڕووباری (زەنگانلی چای[١٦٩]) دادەبڕێ.[١٧٠]

٣- بۆ ئەوەی کە بە هۆی پێشکەش کردنی عەرزەکانی عەباسئاوا بە ئێران، ناوچەی سەرحەدی کە پەیوەندی هەیە بە ئەم شوێنەوە و لە بەشی چوارەمی پەیماننامەی توکەمەنچای تەکووزیەکان لەبەین دەچێ، دیسان لە بەرامبەر ئەوەدا بە هۆی ئەم بڕیارنامە ئەکووزیەکانی (ئەمانە) کە خەتی بلووک بەو لاوە خەتی سەرحەدی بە جۆرێکە کە لەبەشی ناو براودا باسی کراوەتەوە. دیکەی بەشەکانی پەیماننامەی تورکەمەنچای بە ناوەرۆکی خۆیان دەمێننەوە.

٤- لەلایەن وەلاتەکانەوە هەناردەدێت تا دەور و پشتی هەر دوو عەرزەکانی فیرووزە و حەسار لە ناوچەکەدا دیاری بکات و عەرزەکانی ناوبراو پێشکەش بکات یان وەریبگرێت و نیشانەکانی سەرحەدی دامەزرێنێت. هەروەها بۆ پێشکەش کردن و وەرگرتنی عەرزەکانی عەباسئاوا لەلایەن هەردوو لاوە نوێنەر هەڵدەبژێرن و هەم دیسان بۆ ئاڵۆزکردنی ڕوونووسەکانی ئەم بڕیارنامە سێ تیکەی عەرزە ناوبراوەکان دەگۆزرێتەوە و هەر دوولا مافی وەرگرتنی دەس بەجێیان هەیە.[١٧١]

٥- لە خاڵی دیاری کراوەوە لە ٩ی دسامبری ١٨٨١ بەرەو ڕۆژهەڵات کەوشەنی نێوان داگیرکراوەکانی ڕووسیە و ئێران بە تەحری ژێرەوەیە.

لە بابا دوورحەزە هێڵیسنوور، لووتکەکانی چیای «زیر کوه»وە دەکات و لەلای باکووری ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو گوندی خەیرئاوا[١٧٢] دەڕوات و نەگەیشتوو بەم گوندە لەلای چەپی شیوی درون کلیار (کووریز) دەکێشرێت و پاشان لە باکووری گوندێک کە بەرەو قەڵای میرە[١٧٣] بە کەناری ڕاستی ڕووباری دەرون کلیارەوەیە دەڕوات.

---

[١٦٩]- پێویستە زەنگانلی چای بێت، واتا ڕووباری زەنگانلوی دەرگەز.

[١٧٠]- بڕوانن بە سنوورەکانی ئێران و شەورەوی- سپەبود جەهانبانی- لاپەڕەی ٤١.

[١٧١]- لەوێدا کە بە قازانجی دوژمنی زاڵمە. بڕیارنامە دەبێ زوو جێبەجێ بکرێت.

[١٧٢]- خەیرئاوا لە گوندەکانی قووشخانە. مەڵبەندی باجگیران- لە سنووری ئێران و شەورەوی کە لە ڕاپۆرتی «مێسباحولمولک» ئاماژەی پێ کراوەتەوە.

[١٧٣]- میر خەڵاتیان قەڵایمیر گوندێک لە گوندەکانی لوتفئاوای دەرەگەز- فەرهەنگی زەویناسی-

کاتێ کە بە ئێرە گەیشت خەتی کەوشەنی لە ناوەندی کووکلان (قاقلان) کلخان و شووقەلا دەڕوات و بەرەو باکوور دەگەڕێتەوە، ڕۆژئاوا و باکووری لوتفئاوا و هەروەها گوندی کووران دەور دەداتەوە.

پاشان لەلای باشووری ڕۆژهەلات بەرەو گوندی شیلگان دەکێشرێت. گوندی چقوور عەقیل (چقوور ئاغوول) لە ڕۆژهەلاتەوە بەجێ دێلێت و باکوور و ڕۆژهەلاتی شیلگان دەور دەداتەوە لە ئێرەوە بەرەو باشوور دەڕوات و لە ناوەندی گوندەکانی شیلگان و مەکنلی (مەهنگی) تاکوو بەرزاییەکانی خووشاتەپە لەبەردەگرێت و ڕۆژهەلاتی گوندەکانی حەسار بەم جۆرە دەور دەداتەوە کە هەوەڵی کەناری ڕووباری حەسار و شیلگان دابڕ دەکات و پاشان بە کەناری چەپی ڕووباری ناوبراودا دەگا و بەرەو باشووری ڕۆژئاوا تاکوو چالێکی گەورە درێژەی هەیە.

پاش گەیشتن بە ئەم ناوچە لە لای باکوورەوە بەرەو ڕووباری (زەنگلانلی چای)[١٧٤] ڕۆیشت و نیو فەرسەنگ ژوورتر بە گوندی کەزکان[١٧٥] لە ڕووباری ناو براو دەڕوات و بەرەو باشووری ڕۆژهەلات دەگەڕێتەوە و لە شوێنێ کە باشووری هەمووی گوندەکانی ئەتەکە[١٧٦] دەڕوات و تا کۆتایی چیاکان لە شیوی تەجەن[١٧٧] درێژەی هەیە.

پاشان ئەم هێڵە لەلای ڕۆژهەلاتەوە دەگەڕێتەوە بۆ شێوی تەجەن و تۆزێک باشوورتر لە وێرانەکانی لووتکەکانی قەلای کشوو بە ڕووباری تەجەن وەسڵ دەبێت و لەوێیشەوە بەرەو زولفەقار کە هەوەڵی خالّی هەرێمی ئەفغانستانە دەڕوات.

پاش پێشکەش کردن و وەرگرتنی ناوچەکانی فیرووزە و حەسار ولاتەکان نوێنەرێک هەڵدەبژێرن کە خەتی سەرحەدی لە ناوچەکەدا و لە ڕووی سەرنجەوە

---

بەرگی ٩، لاپەڕەی ٤١٤.

١٧٤- مەبەست ڕووباری زەنگلانلۆی دەرەگەز.

١٧٥- بێناو و نیشان ماوەتەوە.

١٧٦- زەنجیرە چیاکانی سنووری ئێستای ئێران و ڕووسیا.

١٧٧- ڕووباری تەژەن لە سنووری ڕۆژهەلاتی سەرەخس لەگەڵ ڕووسیا. کە کوردەکان ئێران‌یان تیجانی پێ دەلێن.

دیاری بکات و نیشانەکان دامەزرێنێت.

٦- لە ڕۆژی گواستنەوەی ئەم بڕیارنامە بە ماوەی یەک ساڵ وڵاتەکانی ئێران و ڕووس مافیان هەیە کە خەڵکی گوندەکانی فیروززە و حەسار کە ئاڵوگۆڕیان کردووەتەوە بۆ خاکی یەکتر کۆچ بدەن و وڵاتەکان دەبن کە لەو مەڵبەندانەدا کە بە هۆی ئەم پەیمانامە ئاڵوگۆز بوونە قەڵا نەکەن و لە فیرووزە و حەسار تورکەمەن نیشتەجێ نەکەن.

٧- بڕیارێک کە لە ساڵی ١٨٨٤ سەبارەت بە دابەش کردنی خاک و ئاوە پێک‌هات. بە هۆی بڕیارنامەکە کۆ دەکرێ وجگە لە فیرووزە و حەسار کە لە نێوان دەوڵەتەکاندا ئاڵوگۆز بووەتەوە لە بەر ئەوەی کە وادیارە گۆڕینی پێویست بکات.

٨- سەرۆکی ئێران و هەروەها سەرۆکی هەموو ناوچەکانی ڕووسیا ئەم بڕیارنامە واژۆ دەکەن و ڕوونووسەکان لەتاران و بۆ ماوەی چوار مانگ لە بەرواری واژۆکەی‌دەبێ بەڕێوە بچێ.

هەروەها پارێزەرانی هەر دوولا ئەم بڕیارانە واژۆ دەکەن و بە مۆری خۆیان مۆرومۆمیان کرد.

ڕوونووسەکان لەتاران بە بەرواری ٢٧ مەی ١٨٩٣ بەرانبەر بە ٢٣ زیقەعدەی ١٣١٠.

دەسخەتی سەرۆکی ئێران- میرزا عەلی ئەسغەر خان ئەمین‌سوڵتان سەدرئەعزەم. (واژۆ بوتزۆف[178])

لە ئاکامدا بڕیارنامەی فیرووزە بە واژۆی میرزا عەلی ئەسغەر خان ئەمینوسوڵتان (سەدر ئەعزەم) و پوتزوف، باڵوێزی ڕووسیا گەیشت و بەم تەحرە ڕووسیە فیرووزەی کرد بە زەوت کراوی خۆی و بەجێ ئەوە قەڵای خاپووری «حەسار» کە بە هۆی پەیماننامەی تورکەمەن‌چای لە سەردەمی عەلی شا لە ئێرانی دزی بوو، دیسان بە مەزنایەتی تایبەتی خۆیان پێش‌کەشی ئێران‌یان کردوەوە.

موحەممەد سادق خان قاجاری ئەمیرتوومان، ناسراو بە ئەمینی نزام، بڕیارنامەی

---

[178]- کۆمەڵە پەیمان‌نامەی مێژووی ئێران- وەحیدی مازەندەرانی- بلاو کردنەوەی وەزارەتی کار و باری دەرەوە- لاپەڕەی ١٤٨.

ناو براوی واژۆ کرد کە لە ڕووداو وکارگەلی ئەمیرحوسەین‌خان شوجاعوددەولە باسی لێ کرا.

ئەمین نزام پرۆتۆکولێکی لە ۲۷ رەجەبی ۱۳۱۱ لە گوندی حەسار و دوو پرۆتۆکولی لەگەڵ نوێنەری ڕووس و سەرکەردەی ۲ ئێدوارد فوون فلووت لە ڕۆژەکانی ۲۱ و ۲۲ جەمادیئەوەڵی ۱۳۱۲ لە عەشقئاوا واژۆ کرد کە موحەممەدناسرخان شوجاعوددەولە هەروەها لەم سەفەرەدا هاوڕێیی بوو تا چۆنیەتی گواستنەوەی کوردەکان لە فیرووزەوە بۆ ناو وڵاتی ئێران پێک‌بێنێ.

موحەممەدناسرخان‌شوجاعوددەولە کوردەکانی جەلالی لە فیرووزەوە بۆ چناران لە تەنشتی مەشهەد گواستەوە و جەلالیەکان ماوەی دوو ساڵ لەم دیارە مانەوە، بەڵام دیسان نەیان‌توانی وڵاتی پێشووی خۆیان لەبیر ببەنەوە و دیسان گەڕانەوە بۆ فیروزە.

لەم بڕیارنامەدا ڕێگای داگیرکەری و پیلانگێڕی ڕووسەکان لە ڕووداوەکانی خوراسان کرایەوە کە نوێنەری ئێرانیان قەستی غەدرێکی گەورەی لەم بوارەدابوو و خەتە سنووریەکانی ڕوو بەچیاکانی دوورتر لەم بڕیارنامەدا کێشا و بەم‌جۆرە ڕووسەکان چیا بەرزەکانی کە لە بناری هەرکامێکیان‌دا سەدان کیلۆمتر زەوینی باش و دارستانی جوانی خستە نێو سنووری خۆیان و سەرچاوەی ڕووبارەکانیش بوو بە بەشێک لە دارایی ڕووسیا کە هەر کاتێک ویستیان ئاو لە گوندەکانی ئێران ببەنەوە.

جگە لەوە خۆیان لە ڕووبارەکان و کانیاوەکانی دیکە کە لە نێو هەرێمی ئێران‌دا مابوون وەکوو ڕووبارەکانی سەرەخس و لاین و کەلات و دەرگەز هاوبەش کرد کە تا ئێستاش شوێنەوارە جووت قۆشەکەی بەجێ ماوە و بە ئەمەی کە مەزرا سنووریەکانی ئێران تووشی وشکایی و کەم ئاوی دەبن، مەعموورەکانی ڕووسیا دێنە هەرێمی ئێران و لە سەرچاوەوە هەتاکوو نێو خاکی ڕووسیا بە توندی چاودێری دەکەن تاکوو ڕەزەوانەکانی ئێرانی لە ئاوی وڵاتەکەیان قازانجی زۆر نەبەن. ئاغای ڕەحیم‌زادەی سەفەوی دەڵێ:

ئێستا لە هەرێمی ئەتەک جگە لە پەراوێزێکی باریک شتێک لە دەسەڵاتی ئێران نەماوەتەوە کە سێ گوندی بەرچاوی حەسار و شیلگان و لوتف‌ئاوای هەیە. دیکەی مەڵبەندەکانی ئەتەک بە دەسی میرزا سەعیدخان ئەنساری موئتەمەنولمولک

وەزیری کاروباری دەرەوەی ناسرەدین‌شا لەساڵی ١٢٩٨ مانگی بە وەرگـرتنی دوازدە هەزار تمەن لە ڕووسەکان بە ئـەوانی دا. (ڕاپـۆرتی ١٩ موحـەررەمی ١٢٩٩ کتـێبی ڕووداوەکانی ڕۆژانەی دەرباری ناسرەدین‌شا- لاپەڕەی ٧١.)

هەروەها دەڵێن کە عەلیخان بەیگی حەساری کاڵەکێک و یەک هۆشە ترێ کـە هـەرکامێکیان لـە نێـو سـەبەتێکی گـەورە خـستبوو بـاری چواپـایێکی کـرد و بـۆ ناسرەددین شای برد. ناسرەددین‌شا کە لە گەورەیی بۆڵەکان سەری سوڕ ما و کاتـێ کە پرسیاری کرد ئەمانە بەرهەمی کوێنەن؟

عەلی خان بەیگ حەساری وەڵامی داوە کە: بەرهـەمی ئـەو شـوێنەیە کـە بـە ڕووسەکان داوتانە.

ئاغای ئەبولفەزڵی قاسمی لەزمانی نووسەرانی یوونانیـەوە هاوردوویەتیـەوە کـە: درێژایی هۆشەکانی ترێ ئەم ناوچە بە ٩٠ سـانتی مـەتر دەگەیـشتن. (نـادر شـێرە پیاوی ئەتەک- ئەبوولفەزڵ قاسمی، لاپەڕەی ١٢.)

پاش ڕووخانی حوکومەتی تەزاری ڕووس و دەسەڵات‌گرتنی شۆڕشی ئوکتوبری ١٩١٧ جارێکی دیکە کێشەی فیرووزە لێ دوانی لە سەر کرا.

لەبەر ئەوەی کە ئێران هەوەڵین دەوڵەتێک بوو کـە حوکومـەتی سۆسیالیـستی «لەنین»ی بە رەسمیەت ناسی، بەم بۆنەوە لە حەوتمی ڕەشـەمەی ١٢٩٩ بەرامبـەر بە ٢٦ فێوریەی ١٩٢١ لە نێوان دەوڵەتەکاندا بە واژۆ گەییشت کـە بـە هـۆی ئـەوەوە بـڕیاردرا کـە فـیروزە و دوورگـەی ئاشـوورادێ[179] و دیکـەی دوورگـەکانی زەریـای

---

[179]- دوورگەی ئاشوورادێ ئەمڕۆ بە وێنەی ڕابـردوو نییـە. درێـژەی دووڕێـیانی میانکەلەیـە کـە لـە شارەوە دەس پێ دەکات و بە قەراخی «شاری ڕابردوو» دەگات. هـەتا سـەردەمی ئاغـا موحەممـەد خانی قاجار، ناوێک لە ئاشوورادێ لە مێژوودا بە چاو نەدەهات.

لەم کاتەدا ڕووسەکان دەیانەوێـست ڕێبازێـک بـەرەو هێندسـتان کـە لـە زەوتی بـەریتانیادا هـەبوو بدۆزنەوە.

لە ساڵی ١١٩٥ مانگی ویونویچ سەرداری ڕووس بۆ قەراخی مازەندەران هـات و ئیـزنی دامەزرانـدنی خانووی بازەرگانی لە ئاشوورادێ و ئەستر ئاوای لە ئاغا موحەممەد خانی قاجاری وەرگرت.

بەڵام بە جێ درووس کردنی خانووی بازەرگانی بە درووس کـردنی قـەڵای نێزامـی خـەریک بـوو و هەژدە تۆپی لەوێ‌دا دامەزراند.

میرزا تەقی خان ئەمیرکەبیر کە لە دەرنانی ڕووسەکان ئا لەم بەشەی هەرێمی ئێران پـاداگری کـرد،

مازەندەران بە ئێران پێشکەش بکرێت و ڕووسیە لە هەمووی داهاتەکانی زەوتی خۆی لە ئێران چاوپۆشی بکات. بەڵام ڕووسیە بە هۆی شای قاجار لە ڕووداوەکە ئاگادار بوو و سەردانێکی قەڵاکەی کرد. شەوی دوایی ویونویچ و پلەدارەکانی ڕووسی بۆ نانی شەو (شێوان) بانگهێشت کران.

پاش‌خواردنی نان بە ئاماژەی ئەوەوە هەمووی دەرەجەدارانی ڕووس گیران و زیندانی کران.

شا بە ویونویچ فەرمانی دا کە پەیغام بەرێک بە قەڵاکەدا بنێرێت و فەرمان بدات قەڵاکە خاپوور و تۆپەکان بۆ ڕووسیە بگەڕێننەوە جگە لەم بارە هەموویان دەکوژرێن.

سەرکەردەی ڕووس لەترسی گیانی‌دا فەرمانی خانی قاجاری جێبەجێ کرد و قەڵاکەی خاپور و دەم و دەزگا نیزامی‌یەکەی بۆ ڕووسیە گەڕاندەوە.

لەم کاتەوە تاکوو شەس ساڵی دیکە بیری دەستدرێژی کردن بە ئاشووراده‌یان لە سەر دەرکرد.

تا ئەمەی کە لە ساڵی ١٢٥٤ لە سەردەمی موحەممەد شای قاجار و بەسەرهاتی کێشەی هەرات بە دەستی بەریتانیا، ڕووسەکان دەرفەتێکیان بۆ کەوت و قیات ناویک لە دەرەجەدارانی شەڕکەری تورکەمەنیان هان‌دا کە بە پیاوکوژی و تالان کردن و بە دیل‌گرتنی ئێرانیەکان خەریک بوو و بازاڕەکانی تاشکەند و بوخارا و چیوەی پڕ لە دیلانی ژن و منداڵی ئێرانی کرد.

هەروەها کەسێکی دیکە بە ناوی خەدرخان لە شەڕکەرانی تورکەمەن بەم کارە بەدفەڕە دەستی کرد و لە هیچ بێ‌وجدانییێک کۆتایی نەدەکردو ڕووسەکان کە خۆیان هۆی هاندانی ئەم ڕووداوانە بوون بە ناوی پاراستنی هێمنایەتی ناوچەکە و بەرگری کردن لە شەڕانخێزی تورکەمەنەکان لە نزیکی سنوورەکانی خۆیان، دیسانەوە ئاشووراده‌یان داگیر کردەوە.

---

گیانی خۆی لەم ڕێبازەدا لەدەس‌دا و ڕکی وەزیری ڕزگاری (ئازادی) ڕووس لەتاران لە ئەمیر کە بیر بە بۆنەی سوور بوونی ئەمیر لە بواری وەدەرنانی ڕووسەکان لە ئاشووراده‌ێ بوو. بڕوانە: قەفوزەریا- ژمارەی ٨- خەرمانانی ٦٥- لاپەڕەی ٧٥.

هەروەها بڕوانین بە: سەفەرنامەی باکوور- مەکەنزی، وەرگێڕانی مەنسوورەی ئێتتەحادیە [نێزامی ماخی]- بەشی دوایین.

ئەم کێشە سنووریانە تا ساڵی ١٣٣٣ درێژەی هەبوو تا ئەمەی کە بە هۆی پەیمان‌نامەی سیاح لاورینتف لە ١١ سەرماوەزی ١٣٣٣ و ٢ی دسامبری ١٩٥٤ کە لە تاران واژۆکرا و بڕیار درا کە فیرووزە لە دەسەڵاتی ڕووسیەدا بمێنێتەوە و لە بەرانبەر ئەوەدا بارودۆخی سفتاحی موغان بە قازانجی ئێران تەواو ببێت. بەم واتایە کە:

لە دەوروبەری سەد کیلۆمتری لە زەوینەکانی سەبارەت بە کێشەی موغان بە هەرێمی ئێران بدرێت. هەروەها بەشێک لە زەویەکانی دیمان کە بە گومان زیاتر لە ٢٠ کیلۆمترە بە ئێران پێشکەش بکرێت و پارچەی زەوینی «یەدی ئیولەر» لەنزیکی ئاستارا بە ئێران بدرێت و لە ئاکامدا سێ سووچێک بە ئەندازەی ٢٠ کیلۆمتر زەوی لە مەڵبەندی سەرەخس پێشکەش ئێران بکرێت.[١٨٠]

تیمسار جەهانبانی سەبارەت بە ئەم بڕیارنامە نەنگینە هاوردوویەتیەوە کە:

ڕووسیەی تەزاری بە بۆنەی داگیر کردنی فیرووزەوە بەوەزیری خۆی لە ئێران فەرمانی دا تا لەگەڵ ئەمینوسوڵتان سەرۆک وەزیرانی ئێران وتوویژ بکات[١٨١] و لە بەرامبەر گرتنی فیرووزەوە گوندی دوورکەوتووی حەسار لە خۆرهەڵاتی موحەممەد ئاوای دەرگەز و پارچە زەوی قەڵای عەباس‌ئاوا لە قەراخی ڕاستی ڕووباری ئەرەس لە ئازەربایجان کە بە هۆی پەیمان‌نامەکانی ١٨٢٨ و ١٨٨١ی زایینی بە زەوتی ڕووسیا دەرهاتبوو بە ئیران پێشکەش بکات.[١٨٢]

یان کوردەکانی دانیشتوی فیرووزە کە ئاغای حوجی قوربان بیچرانلوو باسی

---

[١٨٠]- سنوورەکانی ئێران و شەورەوی- سپەبود جەهانبانی- لاپەڕەی ٢٧. تیمسار جەهانبانی خۆی مەعمووری بە ڕێوبردنی ئەم بڕیارنامەدا بوو کە پازگای ڕووسەکان لە سەرەخسی وەرگرت کە لە باکووری زیارەتگایی بابا لوقمانی دایە و پازگای سنووری ئێران کە ئەولاتر لە سنوور ئاوا کرایەوە ئێستا بە ناوی پازگای جەهانبانی ناسراوە.

[١٨١]- ئاغا سەید هاشم نوێنەری دەوری هەوەڵی کۆڕی ڕاوێژەرانی نەتەوەیی لە ئاماژە بە سەر وەکو مار و دیکەی وەزیرانی فاسقی ڕابردوو دەڵێ: «ئەمانە بوون کە فیروزەیان بە دوو شوشەی کنیاک بە رووس فرۆشت...»

- ڕۆژنامەی وتوویژەکانی کۆڕ- دەورەی هەوەڵ- لاپەڕەی ٦٠.

[١٨٢]- سنوورەکانی ئێران و شەورەوی- جەهانبانی- لاپەڕەی ٢٧.

کردوەتەوە و ئاغـای دوکتـۆر شـارەزای فەرزانـە و ئاغـای بـەگ موحەممـەد تـابش هەروەها داکۆکیان کردووە.

لە بەرگی یەکەم و دووهەم گوترا کە جەلالیەکان لە سووریەوە هاتنە ئێران.

هەروەها یاقووت سەبارەت بە جەلالیەکان و خانوبەرەکەیـان هێناویەتـەوە کـە. [جەلالیەکان لە عەشیرەتەکانی کوردن] و لە مووسڵ و حەڵـەب دان و جوانـەکانیان زۆر زرەنگ و کارئامە بوون. (موعجەمولبولدان- چـاپی میـسر- بـەرگی ۲، لاپـەڕەی ٤٥).

ئێستا کە دەگەڵ بڕیارنامە و چۆنیەتی لەدەس چوونی ئاشنا بوین باشتر ئەوەیە کە باسێک لەسەر مێژووی کوردەکانی ئەوێ لەگەڵ تورکەمەنەکان بکەین.
لە بەرگی یەکەمدا لە بەشێک بە ناوی «شێرە ژنانی کوردی خەیرئاوا» گوتمان کە چۆن تورکەمەنەکان پەلاماریان کردە گوندە سنووریەکانی کوردەکان و ژنان و کیژانی ئەوانیان بە دیل گرت و زۆربەی جار بە وڵامێکی دندانشکێنەوە ڕووبەڕوو دەبوون
گوترا کە هاوکات دەگەڵ پەلامار بۆ سەر گوندی خەیرئاوا پەلامارێکیش بە فیرووزە جێبەجێ کرا بەڵام هەر دووکیان بە خۆراگرتن و ئازایەتی ژنان و مێردانی جەلالی بەزین.

## ئێستا گوێ هەڵدەخەین بۆ وتەکانی دوکتۆر شارەزای فیرووزەیی:

ڕۆژی ٦٢/٩/١١ کە ئێوە خوێندەوارانی بەڕێز لەگەڵ هەندێک لە ڕووداوەکانی فیرووزە- ئەو وڵاتە جوانە کە گەورەترین مەتەرێزی کورد و چەپەری بەرگری خوراسانە- ئاشنا دەکەین.
ئاغای دوکتۆر شارەزا لە بنچینەی هۆزی کوردی جەلالی ناسراو بە «جەلالان» کوڕی بەرات کوڕی ئەمان کوڕی قاسم کوڕی پوولاد کوڕی موحەممەدە، بە زمانی باپیریەوە ئەمانوڵڵا کە ١٢٠ ساڵ تەمەنی بوو دەڵێ:
لە دەوروبەری ساڵی ١٩٤٠ زایینی باپیرم ئەمانوڵڵا لە فیرووزەدا مرد واتا ٢٣ ساڵ پاش شۆڕشی شەورەوی، ئەو ڕۆژانە نزیک بە هەژدە ساڵ تەمەنم بوو و دەمویست بڕۆمە نێو زانستگەی پزشکی زانستگای عەشقئاوا. باوکم -ئەمان- بۆمی گێڕایەوە کە:
باوکانی ئێمە دەیانگوت ئێمە کوردی سووریاین، لەسەردەمی سەفەوییەکان‌د ئێمەیان هێناوەتە ئێرە تا لە شەرانخێزی ئۆزبەکەکان و تورکەمەنەکان وهێرشیان بـ سنوورەکانی خوراسان بەرگیری بکەین. شەڕ، شەڕی شیعە و سوننە بوو.
ئێمەیان بێدین و خوانەناس دەزانی و ڕژاندنی خوێنمان و بردنی ماڵ ناموسمان بە پێویست، بەم بۆنەوە هێرشیان دەکردە سەر خوراسان و هەمو

شتێکیان لە نێو دەبرد و لە ئاگری تووڕەیی و ڕکی خۆیان‌دا دەیان‌سووتان. هەموو جێگەیێک خاپور و کاول بوو.

لەم بارودۆخەدا ئێمە ڕۆیشتینەوە بۆ خوراسان، دوژمنمان دەرکرد و لە سنوورەکانی نیشتمان نیشتەجێ بووین و ئەرکی گرانی پاسەوانی لە نیشتمانمان لە ئەستۆ گرت کە لەم ڕێبازەدا ئازیزترین کەسان و منداڵەکانمان لەدەس دا. بەڵام مەتەرێزی سەر بە خۆیی ئێرانمان بەجێ نەهێشت هەتا خەڵکی نێو ئێران لە بێ‌خەمی و هێمنی‌دا ببن.

ئێمە هیچ کامێک پەلامارمان نەدەکرد بەڵکوو لە پەلامارەکانی ئەوان بەرگریمان دەکرد، واتا هیچ پەلامارێکی ئەوانمان بێ‌وڵام نەدەهێشت و بە خۆڕاگری شەبیخوونی توندمان لەوان دەدا کە جیا لەوەی کە ئەو شتانەی لە ئێمەیان دزی بوو دەمان‌گرتەوە لەئەوان ودیلمان دەگرت و تالانیانمان دەکرد.

فیرووزە لە نێو شیویکدایە کە دواوەی ڕوو بە چیایە. دوژمن ناتوانێ بڕواتە ئەویا مەگەر ئەوەی کە لە دوور لای شیوەکەدا یانی ڕوژئاوا و ڕۆژهەڵات بڕواتە نێو شیوەکە، لەوێش‌دا دوو قەڵای گەورەمان ساز کردبوو و کێشکمان تێدا دانابوو.

کاتێ کە کێشک‌چییەکان هاواریان دەکرد ـ ئەلەمان هات ـ دوژمن هێرشی کرد، بە ماوەی چەند خولێک ٥٠٠ سواری چەکدار و حارز بۆ شەڕ، لە فیرووزە ئەهاتنە دەرەوە و ڕێگەیان لە دوژمن دەبەست و بەم جۆرە دوژمن هیچ کاتێک نەیتوانی فیرووزە بگرێت.[١٨٣]

ڕۆژێک ژنێکی فیرووزەیی کە کوڕێکی گەنجی جوانەمەرگ بوو لەسەر مەزاری

---

[١٨٣]- ئامانجێک کە لەو سەردەمەدا بە هۆی سیاسەتی دوو قەرانی شیعە و سوننە (هەریمەکانی)لە ئێران و عوسمانی پێک هاتبوو لە هەستەکانی پاکێ خەڵک لەبارەی مەزەب قازانج‌یان وەردەگرت، بە جۆرێکە سوڵتان سەلیم رەسمەن فەرمانی دا کە هەمووی ئەو مرۆڤانەی کە لە نێو وەڵاتی عوسمانی‌دا مەزەبی شیعەیان هەیە و لە بەین ببەن و کوشتار و تالان کدینی شیعەکان زۆر ساڵ درێژەی هەبوو.

هەروەها شا ئێسمائیل بە ناوی سەرۆک و پاشای وەڵاتی شیعە کە ناوی سۆفی تەواوی هەروەها بۆ خۆی هەڵبژاردبوو، لە قاپێلکەی سەری شیبک خان ئوزبەکی سوننە مەزە شەرابی دەنۆشی و سەربازەکانی بە هۆی موبارەکی بێ‌کەم و کووڕ، گۆشت و پێستی شیبک‌خان‌یان بە ددان کەندەوە و خواردیان.

کوڕەکەی‌دا لە گۆرستانی فیرووزە ئەوەندە شیوەن و گریانی کرد کە پاش نیوەڕۆ لەسەرخۆی چوو وهەڵخلیسکابوو.

نیوەشەو هاتبووە هۆش. تا چاوی گێڕا بوو سەرانسەر گۆڕستانەکەی پڕ لە تورکەمەنەکان دی بوو کە هەندێکیان هەوساری ئەسپەکەیان بە دەس گرتبوو و هەندێکیش بە کێلی گوڕەکان بستبوویانەوە.

سەرەتا گومان دەکات، خەو دەبینێت. دەمێکی دیکە بە دەنگی پێ ئەسپەکان و هیرە هیرپیان تێ دەگەیی. ئەوەی کە دەبینێ خەو نییە.هەر لەجێیەوە دەست تێ وەر دەدات و بۆ ئەمەی کە تورکەمەنەکان نەیبینن لە لای گەورەکانەوە بە کێشەکێش بەرەو فیرووزە و بە تلاوتلەوە هەڵدێت و خۆی بە قەلا دەگەینێت و ئەوەی کە بینیوویەتی دەی‌گێڕێتەوە.

ئامادەباش دەدەن و لە کورت‌ترین کات‌دا پێنسەد سواری چەکداری درگای فیرووزە دەڕۆنە دەرەوە و بەرەو گۆڕستان هەڵتێن و تورکەمەنەکان کە بە تەمای هاتنی بەیانی هەندێکیان خەریک قسەکردن و هەندێک‌تریش لە خەودا بوون لە چوار لاوە گەمارۆ دەدرێن.

یەک کەس ناتوانێ هەڕا بکات. هێشتا خۆر دەرنەهاتبوو کە تەرمی چوارسەد تورکەمەن لە نێوان گۆڕستانەکەدا لە خاک و خوێن کێشرا و ئەو کارەساتەی کە بۆ ئێمەیان پێش‌بینی کردبوو. خۆیان گیرووده‌ی بوون.

ئەم خافڵگیرکردنەی دوژمن کە بە هۆی ئازایەتی ئەو ژنە کوردە نەسیبی گەلی فیرووزە بوو کە سەری خەم وپەژارەی جوانەمەرگی کوڕەکەی لە بیر بردەوە و گشت کات دەیگوت: مەرگی منداڵەکەم بوو بە هۆی ڕزگاری گیانی زۆرێک لە ژنان و مێردانی فیرووزە. بەم بۆنەوە قەت بۆ مەرگی کوڕە گەنجەکەی بێ‌تاقەتی نەدەکرد.

ئاغای دوکتور شارەزایی لە زمانی باپیریەوە ئەمانوڵڵای ١٢٠ ساڵە گوتی:

ئێمە بە مەبەستی شەبیخوون‌دان لەسەر ئیزغەند کە لە تەنیشتی بەزمینەوە بوو لە فیرووزە هاتینە دەرەوە.[١٨٤] بەرەبەیان گەیشتینە ئیزغەند. دەمانزانی کە پێش هەڵهاتنی خۆر، کیژانی تورکەمەن بۆ بردنی دینەوە بان کانیەکە لە دەرەوەی

---

[١٨٤]- لە زاراوەی کرمانجی‌دا بە [نێوەڕۆ] پیشین دەڵێن و فارسیەکەی «نیمروز».

قەڵاکەدا بوو. بەم بۆنەوە لەلای کانیەکە لە نێوان دارستان‌دا وەستاین.

بە ڕووناک بوونەوەی هەوا دەرگای قەڵا کرایەوە و کۆمەڵێک لە کیژان و ژنانی جوان و دڵڕفێنی تورکەمەن، مەشک بە دەس و بە گاڵتە وگەپ و خوێندنی گۆرانی و هەڵپەڕینەوە، وەکوو کەو لە شاخان‌دا بە پێکەنینەوە، دوور لە دەهۆڵی زەمانە بەرەو کانی دەهاتن، لە حاڵێکدا کە ئاڵتوون و خشڵ هاوتبووە سەر و سینەیان.

باش کە ڕوانیمان کیژێک کەوتەوە بەرچاومان کە لە هەر بارەوە لە ئەوانی دیکە باشتر بوو. وا دیار بوو کە فیز و شانازی دەکرد بە سەر ئەوانی دیکە و بە ناز وفیزێکی تایبەت بزاوتی دەکرد.

ئەومان هەڵبژارد و نیشانمان کرد. لەبەر ئەوەی کە گومانمان هەبوو کە کیژی سەرۆکی هۆزە و ڕاوێکی باشتر لە ئەومان دەس ناکەوێت.

ئەگەر ئەومان دەدزی، بە مەبەستی خۆمان دەگەیشتین.

ئێمە بیست کەس کە گەنجانی ئازا و نەترسی فیروزە بووین کە دەستمان دابوو بە ئاوا مەترسییێکەوە. لە بەرانبەری ئێمەدا یان مەرگ بوو یان شانازی، کیژەکان بە حەشارگە گەیشتین.

پەلامارمان کرد، پەلامارێکی ئەوەندە ئازا کە کیژەکان داترووسکان و ئەوەندە حەپەسابوون کە نەیان‌دەتوانی هاوار بکەن.

هەر ئەو کیژەی کە دیاریمان کردبوو ڕفاندمان و خستمانە بان ئەسپ و بەرەو فیرووزە گەڕاینەوە.

کەسێکمان دانا تاوێک کیژەکانی دیکە چاودێری بکا تاکوو ئێمە تۆزێک لە شوێنەکە دوور ببینەوە.

هێشتا پێنجسەد مەتر نەچووبووین کە گەنجەکە، کیژەکانی بەجێ هێشت و بە دوای ئێمەدا هات.

هەڵخلیسکانێکی گەورەی کردبوو کە دیتر قەرەبوو نەدەبووەوە.

ئێستا دەبوایە تازیانەمان دەدا لە ئەسپەکان تاکوو ڕاوە بە نرخەکەمان بە ساغی بە فیرووزە دەگەیاندەوە.

کیژەکانی دیکە کە وێڵ کرا بوون بەرەو قەڵا هەڵاتن و هاواری «الامان گلدی،

الامان گلدی»[١٨٥] یان سەر دا. ماوەیەکی نەخایاند کە سوارانی تورکەمەن وەک برووسکە یەک لە دوای یەک لە قەڵا هاتنە دەرەوە و بە شوێنی ئێمە کەوتن.

ئەسپەکانی ئێمە زۆر مەزبووت بوون و وەک با دەچوون. ئەسپەکانی تورکەمەن کەنێوانی خۆیان دەگەڵ ئێمەدا کەمتر دەکردەوە؛ لە ئاکامدا پێش ئەوەی کە لە سفتاح بڕوێنە دەرەوە پێمان گەیشتن. ئەوان دەیانەویست ڕاوەکە لە ئێمە بگرن و ئێمەش بۆ پێشاندانی وشیاری خۆمان بە ئازایەتی زۆرەوە بەرگریمان دەکرد. هەردەم تورکەمەنەکان زۆرتر دەبوون.

کاتەکە زۆربوو. فێڵێکی باشمان جێبەجێ کرد و ئەوەیش ئەمە بوو کە کیژەکەمان لەبان ئەسپەوە بۆ یەکتر فڕە دەدا و لە هەوادا دەمان گرتەوە.

زۆرتر لە هەزارمتر بەم فێڵە کیژەکەمان بۆ یەکتر فڕەدا هەتاکو لە سفتاحەکە هاتینە دەرەوە و چووینە ناو شیوی فیرووزە و هەستی قاپانمان دەکرد بۆ ئەوەی کە ئیتر سەرکەوتنمان قەتعی بوو.

دە کەس لە گەنجەکانمان لە سەرڕێی شیوەکەدا دانا. بەم بڕیارە کە دەوروبەری سێ کەس لە سوارانی تورکەمەن بە ناو شیوەکە ڕێگە بدەن و لە ئەوانی دیکە بەرگیری بکەن.

بەرنامەکە بە باشی جێبەجێ کرا و ٢٥ کەس سواری تورکمەن هاتبوونە نێو شیوکە، دەرگای شیوەکە بەسرا.

کیژەکەمان دا بە دوو کەس کە بیگەیێنەوە فیرووزە، هەشتی دیکەیشمان گەڕاینەوە. پێنج کەس لە دە کەسی دەرگای شیوەکە هاتنەوە بۆ لای ئێمە. بوین بە ١٣ کەس لە بەرامبەر ٢٥ کەس.

بە یەک پەلامار چوار کەسمان کوشت. دوژمن خراپ کەوتبووە نێو ڕاو. تورکەمەنەکان چارەیەک جگە لە خۆ بە دەسەوەدانیان نەبوو. هەمووی ٢١ کەسمان دەس بەسراو بەرەو فیروزە نارد و دیکەی تورکمەنەکان کە لە دەرگای شیوەکەدا بە خۆڕا زەحمەتیان دەکێشا هێرشمان کرد و ئەوانیشمان دوور کردەوە.

هێشتا نیوەڕۆ نەبوو کە ڕۆیشتینەوە ناو فیرووزە و پێشوازیان لێمان کرد.

---

[١٨٥]- الامان هات، الامان هات- هاوار و ناڵە و ئەمان ویستن لە دەس بران.

گەنجانی فیرووزە هەموویان سواری ئەسپ، خۆیان تەیار کردبوو کە بۆ یارمەتی‌دانی ئێمە بێن کە کارەکە دوایی هاتبووەوە.

گومانەکەمان دروس بوو، ئەو کیژە کە دزی‌بوومان، کیژی سەرۆکی هۆزی تورکەمەن بوو.

بەڵگی بەرەندە لە دەسماندا هەبوو و هەر شتێکمان کە دەویست پێ دەگەیشتین. بۆ ئەوەی کە ئەم ڕاوە بایەخی ئەوەی هەبوو.

پاش چەند ڕۆژ نوێنەرانی تورکەمەن بۆ بەستنی ڕێکەوتننامە و هەروەها وەرگرتنەوەی دیلەکانی خۆیان هاتنەوە بۆ فیرووزە.

بۆ ڕزگاری کیژە ناو براوەکە، دوو بەرابەری وەزنی زێومان ویست و بۆ ڕزگاری دیلەکانی دیکەیش وەکوو بارودۆخی ئەو سەردەمە داخوازی‌مان کرد.

ئەوان بە بۆنەی پاراستنی شەرافەتیان و بردنەوەی نامووسی خۆیان مەجبوور بوون هەر شتێک کە ئێمە دەڵێن قەبووڵی بکەن، بۆ ئەوەی کە خۆیان زۆر جار ئێمەیان لەم بارودۆخەدا خستبوو و ئێستایش ئێمە دەمانەویست تۆڵەی ڕابردوویان لێ بسێنینەوە.

لە ئاکامدا پاش چەند ڕۆژ هات و چوو و لێکۆڵینەوە، نوێنەران تورکەمەن بە بارەکانی زێڕ و زێو و مافوورە و خرینگە گەڕانەوە بۆ فیرووزە. ئەوەندە پارەیان هاوردبوو کە نەمان‌دەتوانی بیژمێرین .

بەم بۆنەوە هەموویمان خستە سەر یەک، تەپۆلکەیێکی گەورەی لێ دەرهات ئەوسا بە کڵاوێکی پیستی‌یەوە هەموویمان لە نێوان خۆمان‌دا دابەش کرد. واتا کڵاوی پێستی بوخارایی بۆ ئێمە حوکمی کلیلی هەبوو.

بەم تەحرە کیژی تورکەمەن و دیکەی دیلەکان ڕزگار بوون و پاشان تاکوو ماوەیێکی زۆر تورکەمەنەکان زاتیان نەدەکرد بە گوندەکانی دەوروبەری فیرووزە پەلامار بدەن و ژنان و منداڵان بە دیلی ببەن.

تورکەمەنەکان هیچ کاتێک نەیانتوانی بڕۆنە نێو فیرووزە و ئەوێ داگیر بکەن. بەڵام لە دەوارەکانی کوردەکان و گوندەکانی دەوروبەر کە دژ و قەڵایەکی پتەویان نەبوو، زوو بە زوو دیل و ماڵ و مەڕیان دەبرد.

## تووڕ دانی ئاڵای ڕووس لە لایەن جەلالیەکانەوە

دیسان چیرۆکێک لە ئاغای دوکتور شارەزا کە لە زمانی باپیریەوە گوتی:
ڕووسەکان لە دوای داگیر کردنی فیرووزە، ئاڵای خۆیان لە چیای[١٨٦] گولیل دامەزراند.

ئەم کارەی ڕووسەکان بۆ ئێمە گران بوو و ئێمە تاکوو ئەو ڕۆژە ڕووداوێکی ئاوامان نەدیبوو، هەر چەن لەم ڕێبازەدا کوژراو و قوربانی زۆرمان دابوو بەڵام ئاڵای دوژمنمان لە لووتکەی چیای گولیل نەبینیبوو.

دامەزراندنی ئەم ئاڵایە لە کوێستانی باشووری فیرووزە بە مانای جیاوازی فیرووزە و ناوچەکانی باکووری ئەم کوێستانە بوو.

پاش ئەمەی کە ڕووسەکان بە بەزم و هەرای زۆرەوە ئاڵای سنووری زەوتی خۆیان دامەزراند و گەڕانەوە بۆ سەربازخانەی فیرووزە من نەمتوانی خۆم ڕاگرم. هەرچەن کە دەمزانی بچووکترین ڕێزنەنانێک بە ئاڵاکەیان ئەبێتە هۆی لە ناو چوونی خۆم و خێزان و هۆز و ڕەگەزم.

بەم بۆنەوە سواری ئەسپ بووم و بەرەو ئاڵاکە هەڵاتم و لە عەرز دەرم هێنا و پارچەی ئاڵاکەم لەت لەت کرد و بە دەوری فێڵەکەدا پێچاندم و تووڕم دا.

ڕووسەکان کە لە هەڵپێچرانی ئاڵای خۆیان تووڕە بوون، هەر ئەو شەوە ماڵەکەمیان گەمارۆ کرد و منیان دەس بەسراو لە فیرووزە بۆ «شووقە» و لەوێش‌دا بۆ قەڵای «باقر»[١٨٧] برد. لە نێو ڕێگەدا مرۆڤێکی ساڵداتی تورک کە موسڵمان بوو و لە نەترسی من بۆ دڕاندنی ئاڵای ڕووسی لە کانگای دڵەوە حەزی کردبوو، بە من نزیک بوو و هێواش گوتی:

«امان ایلدی» دەس بەجێ لەمن دوور کەوتەوە.

من لە مانای ئەم سڕە نهێنیە تێ‌گەیشتم و گوتم تەنانەت بە گەیاندنی من بە

---

[١٨٦]- زەنجیرە کێوێک کە ئێستا سنووری نێوان دوو هەرێمە.

[١٨٧]- قەڵای باقر بە دەستی کوردەکانی زەعفەرانلوو بە ڕووی خاپورەکانی سەرەتایی پاتەختی مێژوویی پاشاکانی ئەشکانی درووس کراوەتەوە (ئاوا کرایەوە). دوایی مێژووناسانی شەورەوی و شوێنەوارە بە نرخەکان کە لەویدا دۆزراوەتەوە ئەم ڕاستەقینەی ڕوون کردەوە.

عەشق‌ئاوا یان موسکۆ هەر لە جێوە لە سێدارەدەدرێم ، باشتر ئەوەیە کە تا ئەو کاتە نەهاتووە، دەرەتانێک بدۆزمەوە. نەخشەییکم دارشت هەرچەن کە هیوای ڕزگاریم زۆر کەم بوو، دوو دڵیم بە خۆ ڕێ نەدا. لە چیاوە دەڕۆیشتین، خاڵێ کە دیاریم کردبووو زۆر بە خۆف بوو و هەروەها هەواش بە تەواوی تارک بوو بۆ گەیشتین. لە چاوترووکاندنێکدا خۆم لە نێوان ساڵداتەکاندا کێشا دەرەوە بەرەو شیوەکە ڕۆیشتم.

کەوتمە سەرگەوەنێکدا، سەرەتا وام دەزانی کە مردووم؛ بەڵام دوایی تێگەیشتم کە هیچ شتێکم پێ نەهاتووە، تەنانەت بە دڕکەکانێکیش کە بە لەشمەوە بوون نەمزانی‌بوو و هەر بەو کەلەپچەوە کە بە دەستمەوە بەسترا بوو، بە تلاوتل و کێشەکێش لە نێوان چیاو دارستان هەڵاتم ساڵداتەکان هەرچەن تەقەیان کرد ئاکامێکیان وەرنەگرت.

ئەوان بە شوێنێ کە کەوتبووم تەقەیان دەکرد و وایان زانی کە ئەگەر بەم کەوتنەم نەکوژرام بە تیری ئەوان کوژراوم لە حاڵێکدا من زۆر لە شوێنەکە دوور کەوتبوومەوە و هەر ئەو شەوە هاتم بۆ جریستان، کەلەپچەکەمیان شکاند و زامەکانمیان بەست. و پەیغامم نارد کە کوردەکان لە فیرووزە بڕۆنە دەرەوە و بەرەو ئێران بێن.

هەروەها موحەممەدناسرخان شوجاعوددەولە «مەسەر خان» حاکمی جریستانی لە ڕووداوەکە تێگەیاند.

موحەممەد ناسرخان چنارانی (نزیکی مەشهەد) بۆ نیشتەجێ کردنی هۆزی جەلالی[188] دیاری کرد. هەروەها کومبەڵەکانی[189] لە یەنگی قەڵای شیروان نیشتەجێ کرد.

کوڕانەکانی لە حوسەین‌ئاوای شیروان جێگەدا، ئەو کوڕانانەیش کە پاش هێرش سۆڤیەت بۆ ئێران کۆچیان کرد لە قولجووق شیروان نیشتەجێ بوون.

بەگانی[190] لە «قتلیس» نیشتەجێ کرد. بەگان کە هەر ئەو بەگانەن کە

---

[188]- لە دیکەی ڕەگەزەکانی هۆزی جەلالی دەتوانین لە فەرخەکان ناو بەین کە ڕەنگە، فەرخەکانی‌تریی قووچانیش لە ئەوان بن.

[189]- خوا لێ‌خۆش بوو موحەممەد [تابش] دانیشتوی شیروان لەم هۆزە بوو.

[190]- بەگان هەر ئەو هۆزەی سەرۆک ئیووزەن کە تا دوایین کەس لەگەڵ ڕووسەکان شەڕیان کرد و

سەرۆکایەتی کوردەکانی فیروزەیان بە دەستەوە بوو و هەر ئەمانە بوون کە ئەسڵەن ژێر زەوتی ڕووسیە نەچوون و شەڕیان کرد تاکوو زۆربەیان کوژران، [بڕوانن بە سەرۆک ئێوەز خان].

قوڕەکانی[١٩١] لە قتلیش نیشتەجێ کرد. بڕێک لە جەلالیەکانیشی لە چیوورمە[١٩٢] جێگەدا.

دیکەی دوو هەزار بنەماڵەی جەلالیەکان لە چناران نیشتەجێ کران.

ماوەی یەک ساڵ لە چناران ماینەوە. بەڵام کوردەکانی شیخوانلو و کەیوانلوو نەیانتوانی ئێمە ڕاگرن.

زۆربەی کاتەکان بیانوویان پێ دەگرتین و لە سەر کانی و مەزرا، کێشە و بەربەرەکارنی ڕووی دەدا. لە یەکێک لە شەڕەکاندا کەسێکی چنارانی کوژرا. دیمان ئیتر مانەوەی ئێمە لە چناران مەسلەحەت نییە. لەوێوە بزاوتین و بۆ سنوور هاتین. بە ماوەی یەک ساڵ لە دەوروبەری جریستان و بیچرانلوو ماینەوە.

تا ئەمەی کە بارودۆخەکە بۆ گەڕانەوەی ئێمە بۆ فیرووزە هێمن بووەوە و لە سنوور گوزەراین و دیسانەوە گەڕاینەوە بۆ فیرووزە.

لە ساڵی ١٩١٧ کە بە هۆی شۆڕشی کومۆنیستی ڕووسیە، بەلشویکەکان هاتنە سەرکار و هەروەها ئێمەیش لە حوکوومەتی ئێران دڵ سەردەوە بوین ناعێلاج لە فیرووزەدا ماینەوە.

بەڵام بڕێک لە بنەماڵەکانی ئێمە حوکوومەتی بەلشویکەکانیان قەبووڵ نەکرد و گەڕانەوە بۆ ئێران و بەم جۆرە دووری و جیایی بنەماڵەکان لە یەکتر دەستی پێ کرد.

برایان، خزمان و کەس و کاران، هاوڕێیان هەموویان لەیەک جیا بوونەوە. بڕێک لەم بەر سنوورەوە و بڕێکیش لەو بەر سنوورەوە بەجێ مان.[١٩٣]

---

لەگەڵ سۆڤیەت دژایەتیان کرد.

[١٩١]- دەڵێن ئەم هۆزە لەبەر ئەوەی کە زۆر بە قاپان و قوڵم بوون بە غورەکان واتا کەسانێک کە لە خۆبان و بە دەعیە ناسراون.

[١٩٢]- CHEVERMA.

[١٩٣]- کۆتایی بیرەوەریەکانی ئەمان فیرووزەیی جەلالی.

گۆرانیەکانی کرمانجی و تورکی کە لە خوارەوە دێن نیشاندەری هەستی دەروونی کوردەکانی کۆچ کراو لە فیرووزە بۆ ئێرانە.

مارکو، خەراو، وەقەواخە
ئەم جوفتوونیٚ، کرنیٚ تاغە
لە دڵی مەدا نین داغە

وەرگێڕان:

مارکوی کاول ئەشکەوتی زۆری تیٚدایە. ئێمە جووت بووین. بەڵام ئێمەیان لەیەک جیا کردەوە و تاکمانیان خست و زامیان ناوە سەر دڵی ئێمەدا.

*******

ئێستا چەند گۆرانی تورکی، هەروەها کە وترا کوردەکانی فیرووزە زۆرتر بە زمانی تورکی قسە دەکەن:

تمام داغدان بلند مارکوین داغی
جلالین جگە سی، کورت لورین باغی
ایرە گمیزدە قالدی فیروزە نین داغی
شا ون حکم اولدی فیروزە داغلای.
فیروزە[١٩٤] نین قیزلری بَللی بَللی دور
فیروزە نین قیزلری، تیر مەشال لی دور
فیروزە نین جایل لری بیش یوزایلی دور
شاە ون حکم اولدی فیروزە داغلای
خراب[١٩٥] اولسون فیروزە بیزە یور داولدی
ایکان درخت لری گلدی قدرت[١٩٦] اولدی
هرناکسینگ سوزی بیزە در داولدی

---

[١٩٤]- مارکوو ناوچەیەکی کوێستانی لە فیروزەدا و جێگای ئاژەڵداری جەلالیەکانە.

[١٩٥]- هەر شتێک چە لە گیا یان مرۆڤ یان ئاژەڵ کە سەردەمی گەنجی خۆی بە سەر ببات بە زمانی کوردی پیٚ دەڵێن: (قەرت بوویە).

[١٩٦]- خوا لیٚخوش بوو بەگ موحەممەد تابش و ئاغای دوکتور شارەزای فەرزانە کە لە کۆچ کراوەکانی جەلالی فیرووزەن، ئەم گۆرانیانەیان گێڕاوەتەوە.

شاه ون حکم اولدی فیروزه داغلای
وەرگێڕان لە تورکی:
چیای مارکو لە هەمووی چیاکان بەرزترە لە قەراخەکەیدا دەشتی جەلالیەکان و باخی کوردەکانە.
زامی فیروزە لە دڵی ئێمەدا ماوەتەوە. شاناسرەددین فەرمانیدا کە فیروزە پەخش و پەلا ببێتەوە.
کیژانی فیروزە جوان و ڕازاوەن.
گەنجانی فیروزە پێنج سەد و پەنجا سوارەن.
لەلایەن شا فەرمان درا کە فیرووزە پەخش و پەلا ببێتەوە.
کاول ببێتەوە فیرووزە کە بۆ ئێمە بوو بە نیشتمان.
خەڵفەکانێک کە نرا بوون، بوون بە درا
قسەی هەر ناپیاوێک بۆ ئێمە ژانێکی گران بوو
لەلایەن شا فەرمان درا کە فیرووزە پەخش و پەلا ببێتەوە.
*******

هەروەها ئەم دوو گۆرانیە کرمانجیە لە بیری بڕێکیاندا ماوەتەوە.
سەرێ چیان وە چیزەیە
دەنویسم ئەریزەیە
شوێنێ کەچکان فیرووزەیە
ئەشقە واتێ وە گیانە
ئاری من و تەچیایە
مەژە هەڤ کرنە سێوایە
لە لووتکەی چیاکاندا چیزە هەیە و باران دەبارێ. نامەیەک لە سۆزی دلم بۆت دەنووسم.
فیرووزە جێگای کیژانی دڵڕفێنە
ولاتی ئەشقئاوا پڕ لە گوڵ و گیایە. نێوان من و تۆ هەردە.
بە داخەوە کە ئێمەیان لەیەک جیا کردەوە.
ڕووسەکان کە ساڵی ١٨٨٠ گوگتەپەیان داگیر کرد، لە ساڵی ١٨٨٣ لە

تەنشتی شاری کۆن ، شاری نویٚ عەشق‌ئاوایان بنیات نا.
عەشق‌ئاوا لە شارەکانی بە ناوبانگی شەورەوی و ناوەندی تورکەمەنستانە.
کۆمان دەڕوات کە ئێستا دەوروبەری ٢٠ هەزار بنەماڵەی کورد هۆزەکان و ڕەگەزەکانی جەلالی، کوڕان بەگان، کو بەڵەگان، قورکان و هەندێک ڕەگەزی دیکە لەو بەری سنوور لە خاکی سۆڤیەت بە جیٚ مابنەوە کە لە دەوروبەری چوارجۆی بوخارا و بیرامعەلی و مەرو و سەرەخس و تەژن و ئەشق‌ئاوا و گوگ‌تەپە و بەندەری (قەف) کراسنوو دسک لە هێڵی سنووری ئێران‌دا پەخش و پەلان.
وا دیار بوو کە کوردەکانی فیرووزە هەروەها لە کۆماری تورکەمەنستانی شەورەوی سەرکەوتنیان لە بوارەکانی زانیاری و دیوانی ئێداری و کۆمەلایەتی و ڕامیاری و ئابووری و نیزامی بە دەس هێناوە و شیاوی دەروونی خۆیان پێشان‌دا کە ئەمە لە ئاکارەکانی گەلی کوردە کە لەویش‌دا منداڵانێکی شیاوی داوەتە دەرەوە.
هەروەها سیٚ گۆرانی خوارەوە لە مەڵک موحەممەد موشکان ئوغاری و هاوسەرەکەی زەینب دودانلو کە زۆر ساڵ لە عەشق‌ئاوا خەریکی ئاژەڵداری بوون و بیرەوەری جۆراوجۆریان لەو ناوچە هەیە.

ئەشقەواتیٚ، ملیان، ملیان دەست ئاویمە قووشە گولیان

قیمیش ناوم بێومەروویان

وا دەروەندە، وا دەروەندە خەراو، بۆ- وی دەروەند بەندە

پشتیی کورمینج گشتی قەندە

وا گاوە رسە- وا گاوە رسە ئەشقەواتی وە هەوەسە

حایلیٚ ئیشقی تەنگ نەفەسە

وەرگێڕانەوەی ئەم گۆرانی‌یانە لە کرمانجیەوە بۆ هەر زمانێکی دیکە، هەمووی ناسکی و جوانی خۆی لەدەس دەدات و مانایەکیش کە مرۆڤی کرمانج لە یەک

بەندی ئەم هەڵبەستە تێ دەگات لە یەک لاپەڕەدا مانا و لێکدانەوەی نابێتەوە، بەلام بە ناچاریەوە وەری دەگێڕین.[١٩٧]

هەروەها شاری عەشق‌ئاوا، میلان میلانە
لەو میلانەدا دەستم دەخەمە نێو پرچی یارەکەم
ئەوەندە ناسک و جوانە کە داخم دێت ماچی بکەمەوە.
ئەمە زاربێنە، ئەمە زار بێنە
وێران ببێتەوە ئەم بەندە لەم زار بێنە.
دەربەندێک کە قافچیەکانی کرمانج لە ئەوێوە رەد دەبوون.
ئێرە گاوڕەسە، ئێرە گاوڕەسە
عەشق‌ئاوا ناوچەیەکی هەست بزوێنە
لاوی ئاشق لەوێ هەناسەی لە گەروو نایەتە دەر و هەستی خۆشەویستی بە دڵبەرەکان دەبێتە هۆی لە دەست دانی گیانی.

## رووداوی دڵتەزێن و خوێنین سەردار عەوەز خان لە دژوەستان بەرامبەر بە دەستدرێژی رووسەکان

ڕووسەکان لە ساڵی ١٨٨٠ی زاینیدا لەگەڵ داگیرکردنی بەشێک لە ناوچەکانی باکووری خۆراسان ڕوو بە گۆگ تەپە کە لە ٣٠ کیلوومەتری ڕۆژئاوای ئەشق‌ئاوا دابوو ڕۆیشتنە پێشەوە. گوتراوە کە ئەمیرحوسێن‌خانی شوجاعودەلەی ئێلخانی زەعفەرانلوو و یارموحەممەدخانی سەهامدەولەی بجنووردی لەگەڵ بە دەستەوەدانی ناوچەکانی باکووری خوراسان بە ڕووسەکان رازی نەبووە و بە شوێن

---

[١٩٧]- ئەولیالی، سلولی، نسای کۆن، نسای نوێ، قەلای باقر، ناق مەیدان، گەرماب هەروەها لە ناوەندەکانی کرمانجی یەکیەتی سۆڤیەتن.
شەیخوڕەئیس قاجار کە لە ساڵی ١٣١٢ مانگی لە قووچانەوە بەرەو بوخارا دەڕۆیشت. لە سەر ڕێگەکەیدا سەردانی شاری چارجۆی کردووە بەم جۆرە لەو شارە باسی کردوەتەوە.
کاتێ کە بە چارجۆ گەیشتم دوو ڕووباری فرمێسک لە چاوانم هاتەوە خوار.
حەسرەتم خوارد بۆ حاڵی هەوالانم بۆچی دەبێ دوژمن وەها وەلاتێکی شیاو داگیر بکات.
مونتەخەب نەفیس- چاپی سەنگی- لاپەڕەی ٩٧.

بیانوێکدا دەگەڕان تاکوو پەیماننامەی داسەپێنراوی فیرووزە کە لە ڕاستیدا بەشێک لە ناوچەگەلێک بوو کە ناسرەدین‌شا بە ڕووسەکانی دابوو، تێک‌بدەن. بەڵام تاکوو مردنی ئەمیرحسێن‌خان ئەم هەلە نەڕەخسا و پێش نەهات. هەروەها هەوڵەکانی یارموحەممەدخان لە دەشتی ئارمووتەلی لە ساڵی ١٣٠٠ کە کوردەکانی دەرکرا و لە فیرووزە بۆ سکاڵا کردن لە ناسرەدین‌شا بردبوو بێ کەڵک مایەوە. پاش مردنی ئەمیرحوسەین‌خان، ناسرەدین‌شا فیرووزەی دایە دەستی موحەممەدناسرخانی شوجاعوددەوڵە (کوڕی ئەمیرحوسەین خان)‌. پاشان موحەممەدناسرخانی لەکاتێکدا لە ڕێگەی فیرووزەدا بوو ئاگاداریان کرد کە بوومەلەرزە شاری قووچانی وێران کردووە بۆیە لەوێ گەڕایەوە و ڕۆیشت بۆ شاری قووچان، لە جێگای ئەو ئەمین‌نزام ڕۆیشت بۆ فیرووزە، بەڵام پێش گەیشتنی، ڕووسەکان فیرووزەیان داگیرکردبوو و لەوێشدا جێگیر ببوون.

ناسرەددین‌شا هەوڵی دەدا بە بێ هیچ گرفت و کێشەیێ زەحمەت بخاتە سەر کوردەکانی زەعفەرانلوو و هانیان بدات کە فیرووزە بە جێ بهێڵن و ئەو شوێنانە بە بێ درووست بوونی هیچ کێشەیەک بداتە دەستی شوجاعودەوڵە. ئەرکی جێ‌بەجێ کردنی کوردەکانی فیرووزە بۆ هێنانەوەیان بۆ ناو شاری خوراسان بەئەستۆ گرت؛ بەڵام کوردەکان گوێدەری ئەو قسانە نەبوون و جێگەی نەتەوییی خۆیان بە جێ نەهێشت.[198]

---

[198]- کوردەکانی جەلالی هەروەها کە باسی دەکرێت، موحەممەد ناسرخان ڕوو بە چناران کە نزیکی شاری مەشهەدە کۆچ دا. بەڵام موردەکان دیسان گەڕانەوە بۆ فیرووزە. خوا لێ‌خۆش بوو مودیردیوان گوتوویەتی کە: لەبەر ئەوەی من نەخۆشی وەبام گرتبوو لە هاوڕێیان بە جێ مابووم و لە قووچاندا مابوومەوە، پاش حەفتەیێک هاوڕێکان گەیشتبوونە فیرووزە، ئەو ڕۆژەی کە ڕووسەکان خەڵکی فیرووزەیان بە زۆر لە وڵاتی هەزار ساڵە و (لە ڕاستیدا کوردەکان ماوەی ٤٠٠ ساڵ بوو کە لە ئەو شوێنەدا نیشتەجێ بوون) یورت‌ئاوای باپیری کۆچیان دەدان و ژن و منداڵیان چەواشە و سەرگەردان ڕوو بە چناران، کە لە دە فەرسەخی مەشهەد بوو و ڕێیان دەخستن.
ژن و منداڵ لە پەنای دڕک و داڵی چۆڵگەی فیرووزە و کێلە قەبرەکان کۆ ببونەوە هاوار و ماڵ‌ئاوا، ماڵ‌ئاوا وتنیان کارێکی دەکرد کە بەردەکانی ئەو چۆڵگەیە دەهاتنە گریان و لەحنەتیان بۆ ناسرەددین‌شا دەنارد. شەوی هەر ئەو ڕۆژە بوومەلەرزەی قووچان ڕوویدا و نزیک بە دە هەزار ژن و پیاو لەناو چوون و بریندار بوون- ئەترەک‌نامە- لاپەڕەی ٨٠.

ساڵی ١٨٨٠ زایینی کە بەرامبەر بە ١٣٠٠ کۆچی و دەس بە سەر داگرتنی گۆگ تەپە و دۆڕاندنی شەڕی کوردەکان و تورکەمەنەکان لە ڕووسەکان هەر ئەو ساڵە بوو ناسرەددین‌شا بۆ ڕاو و ڕابواردن لە ڕێگەی شاهروود و بجنووردەوە بۆ خوراسان ڕۆیشت تاکوو هەڵسوکەوتی کوردەکان بەرامبەر بە ڕووداوەکانی فیرووزە هەڵبسەنگێنێ و هەر بە ئەم هۆیە بوو کە نوێنەری ڕووس لە بجنووردا ڕۆیشت بۆ دیتنی پاشا تاکوو ڕازی بوونی تزار لە ئەو هەمووە تەخشان و پەخشان و دەست بڵاوی پاشای قاجار ڕابگەیەنێت. لە ئەم سەفەرەدا بوو کە یار موحەممەدخانی سەهامدەولەی ئێلخانی شادلوو لەگەڵ ئەمیر حسێن خانی شجاعدەولە دەیانوسیت فێڵێ بەکار بهێنن و کوردەکانی فیرووزە لە حاڵێکد ئێسکە پرتووکاوەکانی باپیرانیان بە کۆڵیانەوە بوو بنێرنە خزمەتی ناسرەدینشا، تاکوو سەرنجی پاشای بێ‌غیرەت و دەمار سستی قاجار بۆ بە دەست هێنانەوەی فیرووزە ڕابکێشێت، بۆیە گەلالایەکیان داڕشتت و هەندێک لە کوردە ئاوارەکانی فیروزە کە لە چەمەن کاڵپۆشدا بوون، بە شیوەن و ڕۆڕۆ و تابووت لە سەرشان ناردیانیە خزمەتی ناسرەدینشا، تاکوو داوای مافی خۆیان بکەن و بڵێن:

«گوندهی داد من ای شهریار
با تو رود روز شمار این شمار»

واتە گەرمافی خۆمان پێنەدرێت، ئێمە ئامادەین هەتاکوو دوائین کەس گیانمان بەخت کەین و لەگەڵت شەڕ دەکەین!

کوردەکان لە دەوری پاشادا کۆ ببوونەوە و پەیماننامەی ناشیرینی فیرووزەیان شەرمەزار دەکرد و ناڕازی بوونی خۆیان دەردەبڕی و دەیانگوت.

بەچ هۆیێک ئەم کافرە بێ‌دینانە مزگەوتەکانمانیان کردوە بە گەوری ئەسپەکانیان؟ بەچ هۆیێک گۆڕی باب و باپیرانمانیان لە ناو برد؟ بەچ هۆیێک ئێمەیان لە وڵاتی نەتەوایەتیمان ئاوارە کردووە؟

کوردەکان بە شێوەیەکی زۆر تووڕەوە قسەیان دەکرد و هۆکاری مەنتقی بۆ بێفەرهەنگی پاشا و کەسانی دەور و بەری پیشان دەدا کە ناسرەدین‌شا تاوی بیستنی نەبوو و بۆ ئەوەی کە زۆرتر حەیای نەچێت، تووڕە لە یارموحەممەدخان بوو کە بۆ ئیزنی داوە ئەوانە بێنە سەر ڕێگای، پاشان ئەمری‌کرد بە بەردەستەکانی کە بە

جنێو و لێدان جەماوەرەکە لە ئەو شوێنە دوور بخەنەوە.

هەروەها ئەمری بە یارمحەمەدخان کرد کە لە دەشتی ئارمۆتەلی زەوی و ئاویان بداتێ و لە ئەوێدا نیشتەجێیان بکات، بەڵام کوردەکان هاواریان دەکرد: ئەو بەراتە پێشکەش بە خۆت، تۆ وڵاتی ئێمەت بەخشیوە بە بێگانە و ئێستە ئارمۆتلیان پێدەبەخشی؟ بێداری لە خۆت و بەراتەکانت. کوردەکان ناڕازی و هاواریان دەکرد کە ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ فیرووزە و وڵاتی نەتەوایەتیمان لە ئەجنبیەکان دەستێنینەوە، لە ئەو کاتەدا لەگەڵ تووڕەیی و ناڕازی بوون و ڕق لە دڵ، بەرەو سنوورگەڕانەوە تاکوو شنەی هەست بزوێنی چیاکانی فیرووزە و شنەی بەربەیانی پڕ بە دڵ بۆن بکەن.

کوردەکان بە جنێودان بە پاشا و ژێردەستانی رزیوی قاجاڕ بەرەو غولامان بەڕێکەوتن و ئێسکە پرتووکاوەکانی باپیرانیان کە لە فیرووزەوە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو لە ئەوێدا بە خاکیان سپارد تاکوو لە باوەشی وڵات و دوور لە ناوچەی داگیرکراو ببن و لەژێر پێی دوژمنی داگیرکەر پێشێل نەکرێن.

کوردەکانی ئێستە خولام و قلقلی[199] کە زۆربەیان بە زمانی تورکی قسەیان دەکرد لە پاشماوەی ناڕازیە بە ناوبانگەکانن. ئەمانە لە ڕەگەزەکانی ئێلی شادلوو بوون کە فیرووزەیان بە جێهێشت، بەڵام کوردەکانی جەلالی کە لە ئێلی زەعفەرانلوو بوون بە هیچ شێوەیێک فیرووزەیان جێنەهێشتبوو و دەستیان دابووە شۆڕش و هەندێک لە شادلووەکان بە هانای ئەوانەوە چوو بوون و تورکەکانیان لە شۆڕش بەرامبەر ڕووسەکان یاریدا و ڕووداوێکی دڵتەزێن و خوێنینیان درووست کرد.

سەرۆکایەتی کوردەکان لە ئەم شەڕانەدا لە ئەستۆی موحەممەد زۆردیخان لە هۆزی بەگان بوو، ئەو بەگانەی کە جەلالی بوون و سەرۆکایەتی ئێل بە ئەستۆیان بوو. ڕووسەکان گەورەترین بەرخۆدانیان لە ناوچەی ئاخاڵ کە هەر ئەو شۆڕشەی گۆگ تەپە بوو، ڕووبەڕوو بوون. پێشمەرگەکانی کورد و تورکەمەن بە تەواوی هێز و گیانبەخت کردنەوە شەڕیان دەکرد و بە چەکگەلی ئاسایی وەک شمشێر، بەشەڕ لەگەڵ تۆپ و خومپارە و چەکی مۆدێڕنی ئەو سەردەمە شەڕیان دەکرد، شەڕێکی

---

[199] - لە سەفەرنامەی ناسرەدینشا بۆ خۆراسان ساڵی ١٢٨٤ لە ڕۆژنامەی حەکیم مۆلک لاپەڕەی٣٢٣ و لە کتێبی بەکەمی کۆچی مێژوویی کورد لاپەڕەی.

نابەرابەر لە هەر ڕوانگەیەکەوە.

خەڵکێکی بێدەسەڵات و بێکەس لە بەرانبەر دەوڵەتێکی زاڵم و ملهوڕ و خوێنڕێژ و زۆردار و دەستڕێژکەر بە هەموو هێزێکەوە. هەر چەند ئاکامی شەڕلە هەوەڵەوە دیاربوو، بە تێکشکانی هێزەکانی کورد و تورکەمەنەوە دیاری دەکرا. بەڵام ئەم شۆڕشگێڕانە مردنیان باشترلە ژیانی نەنگین دەزانی و نەیاندەویست بژین لە حاڵێکدا وڵاتەکەیان لە ژێر دەستی دوژمندا ببینن، ئەوان شەڕیان کرد و بە سەربەرزییەوە گیانیان بەخت کرد و دوژمنی خوێنخۆر بۆ ساتێ توانی گوگ‌تەپە و فیرووزە بگرێتە دەست.[٢٠٠] لە دوایین ساتەکاندا، موحەممەد دوردیخان لەگەڵ ئامۆزاکەی بە ناوی سەردار عەوەزخان و پاشماوەی هێزەکانیان کۆ کردەوە لە ئەو شوێنە خوێنینەی گۆگ‌تەپە بەرەو کێوەکان و دارستانە چڕوپڕەکانی فیرووزە پاشەکشەیان کرد، بۆ ئەوەی لە هاتنی دوژمن بۆ شارەکەیان بەرگری بکەن.

ئۆدنوان[٢٠١] لە ئەفسەرەکانی ئینگیز کە وەک هەواڵنێری دیلی‌نیوز لە سەرەتای ساڵی ١٨٨١ی زایینیدا هاتووتە ناو شاری قووچان، تاکوو ئاکامی شەڕەکان و بەرخۆدانەکانی کوردگەلی فیرووزە بەرامبەر بە دەستدرێژیەکانی رووس لە نزیکەوە ببینێت. کاتێک لە قووچان بوو، هەواڵی دۆڕاندنی کوردەکان و تورکەمەنەکان لە شەڕی گۆگتەپە شەڕگەلی پارتیزانی موحەممەد دوردیخان و سەردار عەوەزخان ناسراو بە «سەردار ئێوەز» تاکوو ساڵی ١٣١١ی کۆچی ژئوپۆلوتیکی ناوچەی فیرووزە بە گیان و دڵ بە هانای یەکترەوە ڕۆیشتن و لە بەرانبەر دوژمنی دەستدرێژکەرد پیاوانە ڕاوەستان و لە بەدەستدانی وڵاتی نەتەوایەتیان بە دوژمن، بەپێچەوانەی خواستی پاشای ئێران بەرگیریان کرد و حەیای پاشا لە بەرانبەر نێکۆلای پاشای رووس کە دەیویست بە ئاسایی فیرووزە بگرێت، ئەم وڵاتە هیچ کات لە شێرگەلی بە هۆش و ئازا چۆڵ نەبووە. کوردەکانی فیرووزە بەشەڕ و هەڵمەتگەلی پارتیزانی

---

[٢٠٠]- هاوڕێیەکی زانا بە نووسەری گووت کە ئەفسەری سەرکەوتووی رووس کە لە شۆڕشی گۆگ‌تەپەدا سەرکەوتوویان بە دەستهێنا بوو. عەلیخانۆف ناوی بوو کە لە کوردەکانی ئیروان بووە گەر وا بێت، ئەبێت بڵێین کە دار پوازی لە خۆی نەبێ، ناقلیشێ و ئەم مەتەڵە سەبارەت بەکوردەکان بۆ هەمیشە درووستە.

[٢٠١]- جوگرافیای مێژوویی خۆراسان- ئەبووقاسم تاهری. لاپەڕەی ١١٩ – ١١٦.

زیانێکی زۆریان لە دژمن دا. بە تایبەت بە داگیرکردنی بنکە ١٧ ئەفسەر و پێشمەرگەیان کوشت و دەستیان بە سەر چەک و تەقەمەنیەکاندا گرت. کە خۆیشتیان ٧ کەسیان لێکوژرا.هێرشی پارتیزانی یەک لە سەریەکی کوردەکان کە ببوو بە هۆی زیانێکی زۆر لە ڕووسەکان، ئەوان بۆ تێکۆشانێکی زۆرتر هان دەدا و هێزیکی زۆرتر ببەنە فیرووزە. کە لە ئاکامی نەحسی ئەم کارەساتە شەهید بوونی سەرداری دەمارکوژ و شۆڕشگێڕی کورد «محەمەد دوردی» خان بوو. پاش موحەممەد دوردی خان ئامۆزای واتە سەردار ئێوەز بە شەڕە چریکیەکانی لەگەڵ ئێل و خێڵی خۆی ڕوو بە ئێران پاشەکشەی کرد و ئەو شتانەی دەکرا هەڵی بگرن باری وشتری کرد و لە فیرووزە ڕۆیشتنە دەرەوە.

ڕووسەکان بە یارمەتی هۆکارگەلی سێخۆری خۆیان، بەرانبەر بە کوردەکان ڕاوەستان و پێش گەیشتن بە سنووری ئێران لە ناوچەی «دۆغری دۆڵ»[٢٠٢] کوردەکانیان گەمارۆدا، کوردەکان بە هێچ شێوەیێک نەیاندەتوانی لەگەمارۆکە دەر بچن. بەرپرسی هێزی رووس بەسەردار ئێوەزی ڕاگەیاندکە خۆی بداتە دەستەوە و بەڵام وەرگرتنی ئەم پێشنیارە مەینەتبارە بۆ سەرداری جوامێر و نیشتمانپەروەری کورد شیاو نەبوو.

لە ئاکامدا نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە شەڕ دەستی پێ کرد. تێکۆشەرانی کورد هەموو هێزێکی خۆیان لە سەرهێڵی باشووری گەمارۆکە دانابوو تاکوو بە تێکشکانی گەمارۆکە ڕوو بە ئێران پێش بڕۆن. زۆربەی هێزەکان لە هەر دوو لاوە گیانیان بەخت کرد، بەڵام ئامانجی سەرداری کورد بەجێ نەهات لە ئاکامدا سەردار بە هاوڕێکانی گوت، گیان بەخت کردن باشترە لە ژیانی نەنگین و بەدیل دانی جەستە و سپاردنی وڵات بە بێگانەکان.

وەک فێردەوسی دەڵێت:

سراسر اگر تن بە کشتن دهیم
از آن بە کە کشور بە دشمن دهیم

---

[٢٠٢]- دۆغری: دۆڵێک کە ئێستا بە شێک لە خاکی ڕووسیەیە، هەتا سەرسنوری ئێران ٢ کیلومەتر دوورە.

واتە: گەر هەموومان بکوژرێین- باشتر لە وەیەکە ولات بە دژمن بدەین.
ڕووداوی دڵتەزێنی سەردار ئێوەز وێنەیەکی تەواو لە دیاردەکانی نەتەوە و کەلتووری ئێرانیەکان و گەلایەکی زێڕین لە مێژووی سەربەرزی کوردەکانی خۆراسان لە چاوەدێری سەربەخۆیی ئێرانە.
پاش هەزاران ساڵ، جارێکی دیکە ڕووداوی گیانبەخت کردنی ئاریۆبەرزەنی قارەمانی شەڕ لە دەربەندی فارسی بەرانبەر هێزگەلی دەستدرێژی ئەسکەندەری ڕۆسی لە باکووری خۆراسان لە دەربەندی دۆغری دۆڵ، دووپات دەبێتەوە و دژمن ناتوانێ بە ئامانجی خۆی بگات. مەگەر پاش شەهید کردنی ڕۆڵە گیان بەخت کردووەکانی ئێران.
سەردار ئێوەز جارێکی دیکە وەک سارۆبیرە قارەمانی شەڕی چالدوڕان پیشانیدا کە داگیرکردنی ئێران ئەرکێکی ساکار نیە. تۆزێک پاش نیوەڕۆ وردە دوژمن ئەڵقەی گەمارۆی تەنگتر دەکرد و هێرشەکانی زۆرتر دەکرد. سەرداری کورد تێگەیشت کە ڕزگار بوون لە دەستی ئەم دوژمنە خوێنخۆرە ئەرکێکی ساکار نیە. بە ئەم بۆنەوە بۆ دوایین جار ژنان و منالان و هاورێیانی خۆی بانگەواز کرد و لە حاڵێکدا ماڵئاوییان لێدەکرد. بە بەردەوام بوون لە خەبات‌و بەرخۆدان ڕایانیدەسپارد ژنان یەکدەنگ هاواریان دەکرد سەردار ئێمە بکوژە تاکوو نەبینە دیلی دژمن سەردار لەسەر داواکاری ئەوان بۆ ساتێ هەموویانی لە گوللە بەست بەلام کاتێک ئەوان زانیان کە کەسی نەکوشتووە، ناڕازی بوونی بەرانبەر بە کاری سەردار دەربڕی و گوتیان، بۆچی لە کوشتنی ئەواندا هەستی کەسایەتی خۆی تێکەڵ دەکات و نامانکوژی؟ دەیانگوت ژیان بۆ ئێمە بێمانایە و زووتر بمانکوژە. سەردار پێیانی گوت خۆکوشتن ئیشی خەڵکی داماو وبێدەسەلاتە و ئەم ئیشە شایانی ژنان و پیاوانی شۆڕشگێڕی کورد نیە.
هەر کەسێک لە ئێوە لە باتی ئەوەی کە بە دەستی من بکوژرێت لانی کەم دەتوانێت کەسێک لە ئێوە لە دژمن بکوژێت، کە وایە دەبێت ئێوە زیندوو بمێنن تاکوو دژمن دەگۆر بنێن، ئێوە دەبێت زیندوو بمێنن و هەواڵی ئێمە بە نەتەوەی زڵ لێکراو و داهاتووەکان رابگەیەنن. بۆ بەدیهێنان و تەواو کردنی ئەم ئەرکە منالی دیک

بۆ مانەوەی بەرەی شۆڕشگێڕی کورد و چاودێر لە سنووری ئاو و خاکی ئێران بۆ کۆمەڵگا پەروەردە بکەن. ئێوە دەبێ تاکوو دوایین سات لەگەڵ دوژمندا شەڕ بکەن. دوایین گوللە بۆ کوشتنی خۆتان بهێڵنەوە ئەو کاتەی کە دڵنیا بوون دەکوژرێن. ئەو کاتە بە دوایین گوللە بە ژینی خۆتان کۆتایی بهێنن، وا باشترە لەوەی منداڵەکان لەکۆڵ بگری و ڕوو بە ئێران ڕێبکەون. هەر کەسێک گەیشتە ئەو دیوی سنوورەوە و ڕۆیشتە ناو دۆڵی کیکانلۆ و جریستانەوە، سڵاوی ئێمە بە خزم و کەس بگەیەنێت. لەئەو کاتەدا تێکڕا هەموویان هەستانەوە و هاواریان کرد (بژی سەردار هەر بمێنێت ئێران) ئەم دروشمە پیرۆزە سێ جار گوترایەوە و پاشان ژن و پیاوی تێکۆشەری کورمانج ڕوو بە سنوور ڕێکەوتن. بە ئەمری سەردار تەواوی وشتر و ئەسپەکانیان کوشت تاکوو بە ساغی نەکەوێتە دەستی دژمن و هەر چێ کەلوپەلیان پێبوو جگە لە شمشێر و چەک و ڕمو فیشەک هەموویان سووتاند تاکوو وەک غەنیمەت وەدەستی دوژمن نەکەوێت. ژنان و پیاوان هێرشیان کردە سەر دوژمن و لە هەوەڵین هەڵمەتدا زۆربەی هێزی دوژمنیان لە ناوبرد.

کاتێکی زۆری بە شەو ناما بوو کە زۆرتر لە هەفتاد کەسی جوان و تێکوشەری کورد خەڵتانی خوێن بوون. هەر وەها چەن بەرابەری ئەم ژمارەی لە دوژمن کوژران. لە ئەم کاتەدا بوو کە ئەسپی سەردار عەوەز ڕۆیشتە سەر کەنداڵێک کە کوردەکانی خوراسان پێیدەڵێن (برەکمر) بێرە کەمەر. واتە: بەشێکی گەورە لە کێو کە لە ژێریدا دیوارێکی گەورە لە بەر کەنداڵێکی سامناکەوەیە و لە ڕووبەڕوویدا دیوارێک لەبەرد کە بەرزایی لە هەر شوێنێکیدا جیاوازە بە شێوەیێک هاتوچوو بە ئاسایی ناکرێت.

ئەسپەکەی سەردار نە دەیتوانی لە لای چەپەوە بەرەو خوار بپەڕێتەوە و نە دەیتوانی لە لای ڕاستی دیوارەکەوە بەرەو سەر بڕوات. لە ڕووبەڕوویشەوە ڕێگە بەسترا بوو. لە پێشەوەش دوژمن بەدوایدا بوو. حەیوانی هۆشیار و بێزمان بۆ ساتێک ڕۆیشتە بیرەوە، ساتێکی چارەنووس و زۆر گونگ، تەنیا تیژ هۆشی و کات ناسی ئەسپەکە دەیتوانی سوارەکەی لە سەخڵەتی ڕزگار بکات. لە ئەم کاتەدا ئەسپەکە دوایین بڕیاری خۆی دا و لەگەڵ ئەمری سەردار خۆی وەک فەنەر کۆ کردەوە و بەڕی، پەڕینێکی سەر سوڕهێنەری مێژوویی. ئەو کەسانەی کە بەرەکەمەریان

دیتووه دەڵێن زۆرتر لە ۱/۵ مەتر بەرزە، ئەسپەکەی سەردار بە بێ جێگەی بەرەو دوا ڕۆیشتنی هەبێت، لە ئەو شوێنەوە، ڕووبە لووتکە باڵیدا و لە پڕ کەوتە سەر زەوی، ئەم کارەساتە بوو بە بیرەوەرێیک کە کرمانجەکان بۆ هەمیشە لە سەر زاریانە و دەڵێن «هەر دوو زەنگوویێ نەسەر دێر بردیان»[۲۰۳]

بەڵام هەوڵ و تێکۆشانی ئەسپەکەی سەردار بێ ئاکام مایەوە، کاتێک کە لە سەرەکەمەر ڕۆیشتە سەرەوە لە پڕ هێزگەلی «سالدات» رووس ڕوو بە ڕوویان هاتن و سەرداریان لە بەر دەسرێژی گوللەدا. ئەسپە نەجیب و خۆشەویستەکەی سەردار بە هۆی گوللەیێک کە لە دڵی درا بوو گیانی لە دەستدا و لە سەر زەوی کەوت. ئەسپەکە لە لێژایی کێوەکەدا غەڵتێکی دا و شریخەیەکی کێشا و وەک ئەوەی بەسەردار بڵێت: ئەی قارەمانی ئێران لێم ببورەکە نەمتوانی ئەرکی خۆم لە ڕزگار کردنت لە ئەم سەخڵەتیە بە جێبهێنم.

سەردار لە حاڵێکدا فرمێسک لە چاویدا ئەڵقەی بەستبوو، توانی خۆی لە ژێر تەرمی ئەسپە بە وەفاکەی بکێشێتە دەر و تەرمی ئەسپەکەی لە لێژایی کێوەکەدا وەک تاشە بەردێک غەڵتێکی خوارد و کەوتە بنی دۆڵەکە . سەردار لە حاڵێکدا بە هۆی زامەکانی گیانی خەڵتانی خوێن بوو، پاشان ڕۆیشتە پشت تاشە بەردێکەوە تاپڕی گرت و ڕوو بە دوژمن دەستی بە تەقە و ژمارەیێکی زۆریانی لە ناو برد، کاتێک کە گوللەکانی تەواو بوون، چەکەکەی ڕوو بە دوژمن فڕێ دا و شمشێرەکەی لە کەمەری دەرهێنا و هێرشی کردە سەر دوژمن تاکوو لە نزیکەوە هێزی شێرانەی پیاوانی کورد بە ئەو ڕێوییانە پیشان بدات. بەڵام ئەو ناپیاوانە لە حاڵی دەربازبووندا سەرداریان دەسرێژ کرد، تاکوو لەشی زامداربوو و لە پەنای تاشەبەردێکدا سەر زەوی کەوت. خوێنێک کە لە ناو چاوانی هاتبووە دەر چووبووە ناو چاوی سەردار و وردە وردە دەڵەمەی بەست و بەر ڕوانینی سەرداری گرت. سەردار ئەرەس موحەممەد (ئاراز موحەممەد) لەگەڵ چەن هاوڕێیکی شۆڕشگێری کورد کە نزیک ببوونەوە هێرشیان کردە سەر دوژمن وەک شێرێکی تووڕە نەیانهێشت کە تەرمی پیرۆزی سەردارعەوەزخان وەدەستی دوژمن بکەوێت. وردە وردە خۆر ئاوا دەبوو، دوژمن لە

---

[۲۰۳]- هەر دوو پێداڵی زینی ئەسپەکەی سەردار بچڕاو لە پڕ کەوتەسەر زەوی.

ترسی شۆڕشگێڕانی کورد کە نزیکیان ببوونەوە پاشەکشێی تاکتیکی کرد. سەردار ئەرەسی نەیدەویست دوژمن تەرمی ئامۆزاکەی دەست بکەوێت. بەکەڵک وەرگرتن لە تاریکایی شەو و لەگەڵ هاوڕێکانی جەستەی خوێنینی سەرداریان لەکۆڵ گرت و روو بە سنووری ئێران ڕێکەوتن. بەڵام بە هۆی هێرشگەلی دوژمن نەیانتوانی تەرمی سەردار بۆ ئێران بهێننەوە، بە هۆی ئەو زەبرە کە لە سەریان بوو تەرمەکەیان لە ژێر دارە مرخێکی[٢٠٤] گەورە لە قلیشی کێوێکدا شاردەوە و سەرەکەی بە ئالف و گەڵا پۆشاند و چەند ساتێک بە شێوەی ڕێزگرتن لە بەرانبەری ئەو کەڵە پیاوە ڕاوەستان و بە ڕۆحی سەرداری گەورەی کورد سۆێندیان خوارد کە دەست لە شۆڕش لەگەڵ دوژمنی خوێنخۆر هەڵنەگرن، هەتاکوو ئەوان لە وڵاتی ئێران وەدەر نەنێن یان وەک هاوڕێیانی گیانبەخت و یان ڕێگەی وڵات بە ڕواڵەتی خوێناوی لە ئەو پەڕی شانازیدا گیانیان بەخت بکەن.

تاریکی شەو هەلێکی باش بوو بۆ شۆڕشگێڕان و ژنان و منالان کە خۆیان بە سنووری ئێران نزیک کردبوو. سەر لە بەیانی ڕۆژی دواتر کە خۆرهەڵاتبوو ٢٤ کەس لە منالان و پیاوان و ژنانی کورد کە چیاکانی جریستانیان بەجێهێشتبوو لە ناوچەی بیچرانلوو بە سەروڕوویەکی خوێناویەوە و حاڵێکی پەشێو و ماندوو یەکیان گرتووە. بەڵام جێگەی سەردارعەوەز زۆرێک لە خۆشەویستان خاڵی بوو. عیساخانیشاملوو لەگەورەکانی بیچرانلوو بە ئاگادار بوون لەئەم کارەساتە و بە پێشوازی ئاراز موحەممەد و هاوڕێکانی ڕۆیشتن.

ئاراز موحەممەد ژن و منال و زامدارەکانی دایە دەست خەڵکی جریستان و بێچوانلوو بە بێ‌وەستان، لەگەڵ عیساخان و زۆرتر لە سەد کەس لە سوارەکانی بێچرانلووی جریستان، روو بە دۆڵی دوغری گەڕانەوە و هێرشیان کردە سەر رووسگەلی تزاری کە هێشتا بە شوێنی گەمارۆ دراوەکاندا دەگەران و زۆر بەی ئەو رووسانەیان کوشت. پاشان گەیشتنە شوێنی شەهید بوونی سەردار عەوەزخان بەڵام تەرمی سەرداریان نەدەیتەوە. لە بەر ئەوە کە کاتێک، خۆرهەڵاتبوو دژمن بە شوێنی خوێنی رژاویدا ڕۆیشتبوون و شوێنی تەرمەکەیان پەیدا کردبوو و دابوویانە دەستی

---

[٢٠٤]- دارای ئەو رەس یان (سرو) سەولی کێوی لە زاراوەی کرمانجیدا مرخی پێدەلێن.

بنکەی پشتیوانی هێزی خۆیان، لە ئەم کاتەدا کە هێشتاکوو ئاگری شەڕ لە هەر دوولادا هەڵکرابوو ولە بەرزایی کێوەکاندا هەوا ڕۆشن بوو. لە پڕ کوردەکانی بیچوانلوو ئاگاداری بوون کە لەسەر دارێکی مرخ لە سەر لووتکەی کێودا ئالایەکی سوور و سپی هەڵکراوە، دەنگی چەن گوللەیێک بە گوێیان گەیشت. کوردەکان تێگەشتن کە ژمارەیێک لە کوردەکان کە لە گەمارۆی رووسەکانن و بۆیە ڕوو بە ئەو شوێنە هێرشیان کردبوو و هێزی دوژمین پاشەکشێ کرد، دەنگی هاوارکردنی شێرەژنێکیان بیست کە ئەوانی بانگ دەکرد. ئەم دەنگە دەنگی تۆحفەگوڵ بوو، ئارازموحەممەد و عیساگوڕ خۆیان گەیاندە لای. چاویان بە ڕواڵەتی جوانی توحفەگوڵ شێرەژنی شۆڕشگێڕکەوت کە دوومنداڵ و زامدارێکی لە درزی کێوێکدا شاردبووەوە و چاوەدێری‌دەکردن. توحفەگوڵ بەهەڵچوونی زۆرتری شەڕ لە ڕۆژی دووهەمدا تێگەیشت بوو کە بیچرانلووگەل و جریستانیگەل لە ئەو بەری سنوورەوە بەهانایان هاتبوون، بە ئەم بۆنەوە شالێکی سوور کە لەسەری بەستبوو، لەسەری جیاکردبوو و لەسەرکێوە بەرزەکە بە دارەکەوە بەستبوو تاکوو سەرنجی هاوڕێیان بۆ لای‌خۆی ڕابکێشێت.

توحفەگوڵ کە زۆر زامدار ببوو لە دڵنگەرانی و چاو پڕلە فرمێسک هەواڵی سەردارعەوەزی پرسی بەڵام کاتێک بێدەنگی و خەمباری ئارازی دیت تێگەیشت کە هەموو شتێک تەواو بووە.

دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە لە حاڵێکدا کە توحفەگوڵ لەگەڵ ژنان و برینـدارەکان و عیساخان و شۆڕشگێڕانی دیکەی کورد ڕۆیشتنە ناو بیچرانلوو، خەڵکی ئەوێ بە پێشوازیانەوە هاتن و گشتیان یەکدەنگ هاواریان دەکرد.

تۆڵەی ئێوە لە دوژمنی خوێن‌خۆر دەستێنین. شمشاڵ ژەنەکان، شمشاڵیان لێدا و دەهۆڵ ژەنەکان دەهۆڵیان لێدا و بە ئەم شێوە شین یان چەمەری گێڕدرا و ڕۆژی سێهەم ئارازمحەمەدخان، عیساخان وتوحفەگوڵ لەگەڵ سەوارکارەکانی لە حاڵێکدا ٤٧کەسێ کەسەریان بڕی‌بوو و کە لە ئەفسەر و سەرکردەکانی ڕووس بوون بە ئەسپەکانیانەوە بەستبوو و لەسەر ڕمەکانیان دانابوو و ڕوو بە قووچان وەڕێکەوتن و لەهەموو ئاواییگەلی سەر ڕێگەکەدا بەپێشوازی جەماوەری خەڵک ڕووبەڕوو ببوونەوە. شریخەی ئەسپەکان و دەنگێک کە لە نالی ئەسپەکان بەسەر

سەنگ‌ڕێژی شاری قووچان کەسێکی تایبەتی درووست کردبوو، کە ببوو بە هۆی ئەوە کە سەرنجی خەڵکی شار بۆ دیتنی قارەمانانی کورد ڕابکێشرێت. هەر کەسێک لەکەسێکی دیکەی دەپرسی، دیسان چ دەنگ و باسێکەوە؛ بەڵام کەس نەیدەتوانی وڵام بداتەوە، ئەوان لەسەیرکردنی عیساخان[٢٠٥] و شێوەی ڕێگە ڕۆیشتنی سوارکارەکان تێگەیشتن کە هەر باسێک بێت پێوەندی بەناوچەی پڕشەڕی سەر سنوور و دەستدرێژی رووسە ملهۆڕ و دەسەڵات خوازەکانەوە هەیە.

سوارەکانی کورد بەرانبەر بە دەزگای مەحکەمەی قووچان ڕاوەستان و لە ئەسپەکانیان هاتنەخوار، موحەممەد تاسرخانی شوجاعودەوڵە بە پێشوازیانەوە هات و لە پڕ ٤٧سەری بڕاوی قۆشە وەک ٤٧تۆپ لەبەر پێی شوجاعودەولە ڕێژرا و سوارەکان یەکدەنگ هاواریان کرد:هەر بژی ئێران.[٢٠٦]

میوانەکان چەن ڕۆژێک لەقووچان مانەوە و بەسەرهاتی خۆیان بۆ موحەممەدناسرخان گێڕایەوە موحەممەدناسرخان زۆر هەوڵی دەدا کە کوردەکان بە قەناعەت بهێنێت کە دەوڵەتی قاجاڕ نەئەتوانێت لەگەڵ شەڕی ڕووسەکان بەردەوام بێت و نە بەکوردەکان ئیزن ئەدات شەڕ دەست پێبکەنەوە، لەبەر ئەوەی کە مەترسی هەبوو کە جارێکی دیکە بڕیارگەلی قۆشە و نەحسی تورکەمەنچای و گوڵستان و ئاخاڵ دوو پات ببێتەوە و خوراسان بەتەواوی لەدەست بدرێت. بەڵام قارەمانەکانی کەماڵ و ژیانیان لەسەر سنوور بوو و لەکارەساتی شەڕی ڕووسەکاندا

---

[٢٠٥]- عیساخانی شاملوو کوڕی عەیدمحەممەد کوڕی بارس‌سوڵتان خە لکی کەلاتەی بالی بیچرانلووە. وەک ئەوەکە ئاغا حۆجەی قوربانی کە ٩٠ساڵ تەمەن یەتی کەبێژەری دیرۆک و یەکێک لەکو ڕەمامەکانی عیسا خانە دەڵێت: (کەلاتە بالی) لە ڕاستیدا کەلاتەی باریەکە باری سو ڵتان درووستی کردوە و بەناوی ئەوە ناونراوە کوردەکانی بیچرانلوو وەک جەلالیەکان لە ڕاستیدا لە شامەوە بۆ ئێران کۆچیان کردووە و بە ئەم هۆیەوە بە بیچران لووکان، (شاملوو) دەڵێن، بەوتەی بێژەری ناوب ڕاو، ئەڵێت، ئەم خێڵەیە و لە یەکەمین ین کۆچەرەکانی شام بۆ خۆراسان بووە، ئەو حەوت کوڕی بووە.

١- قەیسەر کە منالەکانی لە لایین و خاکستەری کەلات دان و رەحمان قولی و عیساخانی قارەمان کە ئێستا زیندوون لە مندالەکانی ئەون.

[٢٠٦]- محەمەد رەزا کە با پیرەگەورەی خەوانینی بیچراننلوو وەک فەرەجوڵا خان و عەلی خان بە یکی بیچرانلووە.

زۆرێــک لــە ئازیزوخۆشەویــستیان لەدەســت دابــوو، نــەیانتوانی پێــشنیارەکەی شوجاعودەولە بەر چاو بگرن، بەلام ئەوان ماتڵ بوون کە شوجاعودەولە بڕیاری قوتـار و هێزبەرێبخات و لەگەڵ ئەواندا رێبکەوێت، بەلام بە ئامانجەکەیان نەگەیشتن و بە شـێوەی نـاڕازی و تـووڕەیی لـە قووچـان ڕۆیـشتنە دەرەوە و ڕوو بـە جریـستان و بیچرانلوو بەڕێکەوتن. شوجاعودەولە بەڵێنی پێدا بوون کـە لـە هـەر شـوێنێک لـە قووچاندا نیشتەجێ بن، هەموو شتێکی ئاسایشی بۆیان ساز بکـات. بـەلام ئـەوان بـە تەرمی خوێناوی سەردار عەوەزخان سوێندیان خواردبوو کە یـان دوژمـن لـەو ولاتـە دەربکەن یان لە ئەو ڕێگەدا گیانیان بەخت بکەن. بەئەم بۆنەوە ئەوان لە ئـەو ڕێگـەدا گیانیان بەخت بکەن. بە ئەم بۆنەوە ئەوان نەیاندەویست زینـدوو بمێننـەوە. قـسەی سەرزاریشیان ئەوە بوو: بکوژن یان بکوژرێن.

شوجاعودەولە بۆ ئەوە کە ڕێز لە ئازایی و فیداکاری عیساخان لە مـەڕ هاوکـاری کردن لەگەڵ ئاراز موحەممەد بگرێت قەبالەی مـیری چەنـد دێهـاتی سەرسـنووری پێی دا[۲۰۷] و گوتی لە ئەوەی کە ناتوانێتع هێزو یارمـەتی بنێـرێ بۆیـان داوای لێبـور دنیان لێدەکات، بۆ ئەوە کە ئەم کاتە کە نزیکەی سالێ ۱۳۱٤ کە بەرانبەر بوو بە تـازە درووست بو و نەوەی شاری قووچان کە لە سالی ۱۳۱۱ و ۱۳۱۲ بە هۆی کارەسـاتی زەوی لـەرزە وێـران ببـوو. تـەواوی هـەوڵ و تێکۆشـانی شـجاعدەولە لـە دروسـت کردنەوەی شار و نیشتە جێکردنی خەلک و ڕاگەشتن بە کێشەگەی کۆمەللادا بوو.

---

۲۰۷- ئاغا باوکی عەلی خان...
سۆلتان [دامەرزێنەری کە لاتەی باری] کە پشت بە پـشتی دەگەڕێتـەوە بـۆ وەلیخـان، شـەرفخان، باباخان، وەلیخان. لە وەلیخان سێ کوڕ بەناوە کـانی: قـەراخان، مووسـاخان، عـەلیخان بـەجێماوە.
عەلیخان باوکی باباخان و ئیبراهیم و حوبی قوربانە [بێژرەی دیرۆک]
لەتیف خان کە شجاع خان و مۆحیبەت خان و کازم خان لێی بە جێماوە.
هەیت موحەممەی بەگ باوکی باباعەلی و...
محەمەد جان باپیرە گەورەی جەعفەر خان و مێحراب بەگ و محەمەد ئاغای شاملوو.

## هەڵبەستەکانی کرمانجی لە ماتەمگێڕی سەردارعەوەز و شەهیدگەلی فیرووزە

هەروەها کە گوترا سەردارعەوەز لە ئیلی جەلالی، نیشتەجێ لە فیرووزە لە هۆزی بەگەکان بوو. بەگەکان لە مێژە سەرۆکایەتی ئیلی جەلالیان بەدەستەوە بوو. نەیاندەتوانی کە خۆیان ڕازی بکەن کە بڕۆنە ژێر دەسەڵاتی ڕووسی، هەر بۆیە دەستیان‌دایە شۆڕش، بەڵام هۆزەکانی دیکە لە ئەم ڕاپەڕینەدا یارمەتی سەردارییان نەدا و لە دواییدا لەگەڵ ئەم ڕەوتە زۆرتر ئاگادار دەبین. لێرەدا بڕێک لە هەڵبەستگەلێک کە لە ماتەمی سەردارعەوەزدا گوتراوە و لە هۆنەراوە و فولکلۆری کرمانجیدا جێگەی تایبەتی هەیە و بە «هەنگێ سەردار ئێوەز» بە ناو بانگە، ئاماژە دەکەین.

بڵاو بوونەوەی هەواڵی لە ناوچوونی یەکێک لە هۆزە شۆڕشگێڕەکانی کورد بە دەستی هێزی ڕووسگەلی دەستدرێژ، خەڵکی چەوساوەی خوراسان، بە تایبەت کوردگەلی تەواو ماتەمبارکرد بە شێوەیێک کە ئەو کاتە وێنەی ئەو ماتەمە نەدیترا بوو.

هەموو ژن‌وپیاو و منداڵان لە ماتەمدا بوون، ڕەشپۆشیان کردبوو.

ڕەشپۆش بوونیان تاکوو ئەو ڕۆژە لە ناو کوردەکانی خوراسان باو نەبوو، لەبەر ئەوە کە هەتا ئەو ڕۆژە هیچ کردەوەیەکی مڵۆزمانەی دوژمنیان بێ وڵام نەهێشتبوو و خوێنیان بە خوێن و دیلیان بە دیل وڵام دابوو، بەڵام لە ئەم کاتە کەش و بارودۆخ گۆڕابوو، کێشەگەل و ئاڵۆزیەکانی نێونەتەوەیی پێش‌هاتبوو کە بەرگری تۆڵە سەندنەوەی ئەوان بوو و گرنگ‌ترین هۆکار زۆر و یارمبازی و دەسەڵاتخوازی دەوڵەتی خوێنخۆر و داگیرکەر و چەوسێنەری ڕووسیەی تزاری لە لایەکەوە و بێ‌هێزی و بێدەسەڵاتی دەوڵەتی لاوازی قاجاڕی دەسەڵاتداری ئێران لە لایەکی دیکەوە ببوە هۆی ئەوەی کە سەرۆکەکانی زەعفەرانلوو و شادلوو وەک نوێنەرانی دیاری‌کراوی دەوڵەت لە خوراساندا نەیاندەتوانی شەڕ لەگەڵ دوژمنێکی دەسەڵاتخواز دا دەست‌پێ‌بکەن و ئەمە هەوەڵین جار بوو کە کوردگەل ئەم کوێرەوەریانە بە تەواوی هەست دەکرد و وەک مارێکی بریندار لە خوێنی خۆیاندا دەگەوزان.

لە ئەم حاڵەتەدا پێویست بوو ناڕازی بوونی خۆیان بە شێوەیێک دەرببڕن و بە ڕەشپۆش کردن و خوێندنەوەی هەڵبەستەکانی ماتەمگێڕی لە کۆڕ و دانیشتنەکانیاندا و لەسەر ڕێگاکانی سارا و چیاکانیاندا بوو تا بە ئەم شێوە خەڵک لە خەو هەستێنن و ئاگاداریان بکەن لە ئەو کارەساتگەلەی کە لە ناوچەکانی سەر سنوور ڕووی دەدا. ئەم تووڕەیی و ناڕەزایەتی دەربڕینە دژ بە کاربەدەستان لە ئەو ڕۆژەوە هەتاکوو ئێستا لە هەڵبەستەکانی کرمانجیەکاندا ماوەتەوە.

ئێستاش دایکەکانی کرمانجی لە کاتی خەواندنی کۆرپەکانیان، سترانگەلێک کە بە باڵای سەردار ئێوەزدا گوتراوە، دەخوێننەوە، بە ئەم شێوە ڕووداوی دڵتەزێنی مێژووی پڕ لە شانازی و سەربەرزی لەگەڵ منداڵەکەیان پێوەند دەدەن و لە ناخی ڕۆڵەکانیاندا دەمێنێتەوە، هەتاکوو گەورە دەبن و لە دایک و بابیان دەپرسن «سەردار ئێوەز» لە کوێدا کوژرا؟ بۆچی کوژرا؟ ئاخۆ ئەوان بێجگە چاودێری کردن لە سنووری خۆیان چ تاوانێکی دیکەیان هەبووە کە ئەو کارەساتەیان بە سەر هات.

بەڵێ ئازیزان، دایکانی کورد هەر لە منداڵیەوە تاکوو مردن بە ڕۆڵەکانیان وانەی ژینی سەربەرزانە و پڕ لە شانازی و ڕێزی سەربەخۆ بوون و سەر بەخۆیی لە وڵاتیاندا بەگیانبەخت کردن دەڵێنەوە و شانازی بە کەلتووری پڕ ڕووداو و حەماسەوە دەکەن و ئێستاش بە لە بەرکردنی جلوبەرگی جوان و قەشەنگی کرمانجی و بە قسە کردن بە زمانی نەتەوەیی خۆیان و بە چاودێری میراتی کەلتووری، مشتێکی قائیم لە زاری ئەو کەسانە کە کەلتوری ڕۆژئاوا دەهێننە ناو وڵات و ئەو کەسانەی کە ئەجنەبی دەپەرەستن دەدەن.

لەجل و بەرگی قەشەنگ و نەتەوەیی خۆیان ئێستاش وازیان نەهێناوە. جل و بەرگی جوان وڕەنگاوڕەنگی ژنانی کرمانج ئالاییکی چەن هەزار ساڵە و بنچاخێک بۆ مانەوەی نەتەوەی کورمانجە. هەر ژنێک کە جل و بەرگی نەتەوەیی خۆی بگۆڕێ، کەلتووری نەتەوەیی و میراتی باپیرانی خۆی بە جێ‌هێشتووە و نازانێت کە گەورەترین خەیانەتی بەرانبەر بە نەتەوە و کەلتووری کردووە. هەر پیاوێک کە ژن و منداڵەکانی بە لەبەر نەکردنی جل و بەرگی کرمانجی هان بدات، خەیانەتێکی کردووە کە هیچ کات لێ بووردنی نابێت و ئەمە کەلتووریێکە کە ڕژێمی ڕەزاشا بە کەلک وەرگرتن لە ئاتاتۆرکەوە کە مەبەستی لە ناو بردنی ئێمە بوو، دەیانویست

بەسەریاندا داسپێندرێت. بەرەی ئێستە دەبێت بە ئاگا بوون و شی کردنەوەی پیلانگەلێ کە داگیرکەری و چەوسێنەری مەبەستیەتی و دەیەوێت ببێتە هۆی لە ناوچوون و دژ وەستان بەرانبەر بە میراتی بە نرخ و سەربەرزانەیان تاکوو شکۆ و گەورەیی لە دەستداری بە دەست بهێنێتەوە...

ئێستا ستران وهەڵبەستگەلێک کە بەباڵای سەردارعەوەزدا گوتراوەو بە ئێمە گەیشتووەتەوە دەڵێن:

هەنگێ[٢٠٨] سەردار ئێوەز[٢٠٩]
سەرداران بەرەف بوون مەسلەحەت کرن
لە فەکێ ئاغوزان خێروشەرکرن
هەسب و قاتر کوشتن و دەڤە پێ کرن
دادانە تۆفانگان و سەنگەر چێ کرن
نامدار و پر ئەرمان، سەردار و ئێوزخان
سەرداریی[٢١٠] لە خاکێر، مازوور هلانیی
لنگێ خا، لەزەنگوویێ چە پێ دادانیی
سەللاتان و قەزاخان، دورە هلانیی
گو برای هە جی مەمەدو، شانسی مەنانیی
نامدار و پر ئەرمان، سەردار و ئێوزخان
سەرداران سیار بوون، دانەوەر چیە
هەر دو زەنگوو – بێ– نە، سەر دێربزدیان
گولێک‌لێ کەت ژەناڤ پێل، یک لێ کەت‌ژە بێچیان
گۆ: پسمامێ ئارازو، شەوتیم ئەز ژەتیان
نامدار و پر ئەرمان، سەردار و ئێوزخان
لە چولێ ئێتەگێ هەسپان دەرەڤێنن

---

[٢٠٨]- هەنگ = ئاهەنگ، مەقام، لەگۆرانیدا

[٢٠٩]- وەرگێراوەتەوە [عەوهز= ئەوەز] پیتی [ ئە] یان[ ئا] لە ڕێزمانی کرمانجیدا دەبێ بە [یاء]. هەر وەها کە بار دەبێتە بێر!

[٢١٠]- سەرداریی: جۆرە جل و بەرگێکی تایبەتی بوو کە سەردارگەل لەبەریان کرد.

به دەو، ڤەردەکەڤن، یاوو دەمێنن
سەرێ سەردار ئێوزخین، سانیکلای دەشینن
خانگی سەر دێرلەکو، نەتاڤیی رویابوینن[٢١١]
نامدار و پڕ ئەرمان، سەردار و ئێوزخان[٢١٢]
ئیوانۆف لە زمانی خوشکەکانی ئێوەزخانەوە هێناویە:
سەرداران بەرەف بوون و مەسلەهەت کرن[٢١٣]
لە نالێ ئاغداشلی[٢١٤] بێ خێروشەر کرن
ژە قارو قەزەوێ، هەسپان[٢١٥] پێ کرن
نامراد و پڕ ئەرمان[٢١٦]، ئەرمان برای ئەوەزخان

---

٢١١- ئاماژە بە پچڕانی پیدالی ئەسپەکەی سەردار لە کاتی پەرینەوە لە کەمەر دەکات کە دواتر لە شوێنی ئەسپەکە کە یەکێک لە سەر سوورێنەرەکانی ڕۆژگارە و ئەو ئەسپە توانیویەتی ١/٥ مەتر بەرزایی تێپەر بکات بە بێ جێگەی گەڕانەوە بۆ دواوەی هەبێت. خەڵک کۆگایێک لە بەردیان درووست کرد. کە واتە نیشانەی لە خۆ بووردوویی و گیانبەخت کردنی ئەسپەکەی سەردار بێت. ئەم کۆگابەردە هەتاکوو ساڵی١٣٢٣ی هەتاوی کە کوردەکان بۆ گەرمیان و مەڕوماڵات بەخێو کردن دەڕویشتن بۆ خاکی رووسیە هەر لە ئەویا داما بوویەوە و ساڵ بە ساڵ بەدەستی کوردەکان گەورەتر دەکوایەوە، لەبەر ئەوەی کە هەر کەسێک کە لە پەنای کۆگا بەردەکەوە دەڕۆیشت بەردێکی گەورەی لەسەر دادەنا و وبۆ شەهیدگەلی لە خوێندا گەوزاو دۆعای لێخۆش بوونیان لێدەکردو و لە ئەو کەسانەی کە ببون بە هۆی پێشهاتن ئەو کارەساتە دۆعای شەریان لێدەکرد.
لە ئەو کاتەوە کە بۆ هە میشە ڕێگای یەکیەتی سوفیەت بەسترا و دیواری ئاسنین درووست کرا ئیتر هیچ زانیارییێک لە دەستدانیە. لە کتێبی سەفەرنامەی ناسرەدینشا[ڕۆژنامەی حەکیم مەلەک]نووسراوەیێک لەسەر بەردێک کە لە لاپەڕەی٣٢٣ دا ناو براوە. کە ناوی ڕێگەیێک لە ناوچەکانی فیروزە بە ناوی[کارعەوەزبەگ] دەبینن کە گومان دەڕوا کە مەبەستی سەردار عەوەز بو و بێت کە کار بە مانای ڕێگەیێکە کە کێوسانیو جێگەی شیو ڕۆشینی مەڕو مالات بوو بێت.
٢١٢- کاتێک کەسێک بە گوللە دەپێکرێت و خوێنێکی زۆری لێدەڕوا، تینوویەتیەکی زۆر زەختەدە کاتە سەر ئەوکەسە، لێرەدا سەردار عەوەز دەڵێت کە زۆر تینوویەتی بە کوڕە مامەکەی[ئاراز] واتە بە ئاراز دەڵێت.
٢١٣- سەردار عەوەز حەوت خوشکی هەبووە کە پاش شەهید بوونی، هەر حەوت خوشکەکەی وازیان لە ماڵ و حاڵی خۆیان هێناوە و رەشیان پۆشیوەو دەستیان داوەتە هۆنراوە گوتن و هەتاکوو هەر حەوتیان لە بەر گریان چاویان کوێر بووەو. هەڵبەت هەموویان هۆنراوە بێژ بوون کە ئێوانف ئاماژەی پێکردووە.
٢١٤- ناوی دۆلێکە لە نزیکی فیروزەوە.
٢١٥- لە نووسراوە کەدا[هەسپێ] هاتوو کە مەبەست، جۆرێک ئەسپ بووە و مانای ژمارەیێکی زۆریش دەگەینێت.

******

سەردارەک نالیێ ئێوەز ژەکودابینم
سییاریێ قوشخانیێ[٢١٧] پیێ ڕابشینم
هەرچی ئولجە[٢١٨] بینن، سەر پار[٢١٩] هلینم
نامراد و پڕ ئەرمان، ئەرمان برای ئەوەزخان[٢٢٠]

******

سەرداریی لە خاکێر، پێنج تیرهلانیی
لنگی خالەزە نکوویی چە پیێدا، دانیی
لوئەوەز، برای ئەوەز بەختی تەنانیی
نامراد و پڕ ئەرمان، ئەرمان برای ئەوەزخان

******

## کوژرانی سەردار ئەرەس موحەممەد(ئاراز موحەممەد)ی جەلالی بە دەستی ڕووس لە ساڵی١٩٢٩ دا

پاش کوژرانی سەردار عەوەزخان، بە تێپەڕ بوونی چەن ساڵ دوای شەڕگەلی چریکی کوردەکانی جەلالی لەگەڵ ڕووسگەلی تزاردا لە دوو لایەنەوە ژمارەیێکی زۆر لە هێزەکان کوژران. بەڵام نە کوردەکان دەستیان لە شۆڕش دەکێشایەوە و نە

[٢١٦]- ئارمان، ئارەزوو، ئومێد. واتە: ئەی برای خۆشەویستم عەوەز، ئەی ئەو کەسەی کە هەموو ئاوات و هیواکانت لە دڵتدا مایەوەو بە دڵێکیێ پڕ لە داخ و خەمەوە لە خاک نێژرایی و بە ئامانجەکانت نەگەشتی.
[٢١٧]- قووشخانە: بە مانای هێلانەی داڵ، داڵگەلێک وێنەی سەردار عەوەزخان. دێهاتی قووشخانە لە ئەم بەری سنووری ئێران و ڕووسیە دایە و بەشێک لە ناوچەگەلی شاری قووچانە.
[٢١٨]- ئولجە: وشەیەکی تورکی بە مانای دەستهاتەکان لە شەڕدایە.
[٢١٩]- سەرپار: پار بە مانای بەشە- سەرپار بریتی لە بەشێکە کە پێش ئەوە کە دەستهاتەکانی شەڕ بەش بکرێت تایبەت بە سەرۆکی ئێڵ(خێڵ)یان سەردارەکە لە کاتی سەرکەوتوویی لە شەڕدا پیێ دەبەخشرا ئەمە بۆ ڕازی کردنیان بووە لەشەڕگەلی ئیسلامیدا وەها دەستهاتەکانیان بەش دەکرد کە لە پێشدا بەشی خواو بەشی پێغەمبەریان جیا دەکردەوە و پاشان هەرچێک دەمایەوە بە سەر پێشمەرگەکاندا دابەشدەکرا.
[٢٢٠]-Jorurnal of ... Bengal .P.١٨٧

ڕووسەکان دەستیان لە دەستدرێژی‌کردن دەکێشایەوە.
ئەم حاڵەتە بەردەوام بوو تاکوو ساڵی١٩١٧ی زایینی کە ڕاپەڕینی کومۆنیستی ڕووسیە ڕووی‌دا و بلشوویکگەل هاتنە سەر دەور و دابەش‌کردنی ملک و ماڵ دەستی‌پێ‌کرد.
هۆزگەلی بەگەکان کە لە بەجێماوانی خێڵی سەردار عەوەزخان بوون، بەڕاستی دژ بە ڕووسەکان بوون، بۆ ئەوان گرینگ دوژمن بوو؛ چ تزار بێت، چ بلشوویک لە وڵاتەکەیاندا تێبکۆشایەن، یان بە ئامانج بگەن یان گیانیان لە ئەم ڕێگەیەدا بدایە. بەڵام هۆزگەلی دیکەی خێڵی جەلالی، بە تایبەت قوورەکان و جەلالیەکان و فەرخەکان و گۆرانەکان ڕێگاییکی دیکەیان هەبوو، ئەوان دەیانگوت کاتێک لە ماوەی شۆڕش و لە دەست دانی خۆشەویست و ڕوڵەکانمان لە ئەم چەند ساڵەدا دەوڵەتی ئێران نە تەنیا بچووکترین یارمەتیان نەداین و تەنانەت کاتێک کۆچمان کرد بۆ چناران بە شێوەیێکی زۆر ناشرین ڕووبەڕوومان بوونەوە، ئیتر چ نیازێک هەیە ئەرکی دەوڵەتی داڕزاوی ئێران بەجێ‌بهێنین باشترە کە گوێدایەڵی دەوڵەتی بلشوویکی ڕووس ببین.
بەڵام سەردار ئاراز و توحفەگوڵ و موحەممەدبەگ کە لە سەرۆکەکانی هۆزی بەگەکان بوون و ملک و ماڵیان لە ئەو کاتەدا بە دەستی بلشوویکیەکانەوە بوو و بە سەر کەسگەلێکدا دابەشیان کردبوو، بەڕاستی دژایەتیان بەرانبەر بە یەکگرتن[گوێڕایەڵ بوون] لەگەڵ بلشوویەکاندا دەردەبڕی.
لە ئاکامدا لە ناو کوردگەلی فیرووزەدا دژایەتییەکی هەرە زۆر و شەڕی براکوژی درووست بوو تاکوو هۆزی بەگەکان و بڕێک لە کۆرانەکان کە دژ بە ڕووس بوون نەیاندەویست بڕۆنە ژێر ئاڵا و دەسەلاتی ڕووسەوە، جارێکی دیکە سەری خۆیان هەڵگرت و ڕۆیشتنە ناو کێو و دەشتە قاقڕەکان کە یازدە ساڵ شەڕگەلی چریکی لە ئەوێدا بەردەوام بوو. ئەوان کاتێک هێرشیان دەکردە سەر شاری فیرووزە، هە دوژمنێک لەسەر ڕێگەیاندا ببوایە دیان‌کوشت. بە ناوبانگە کە کاتێک ئاراز توحفەگوڵ و موحەممەد بەگ و حەسەن دەهاتنەوە و لەسەر شەقامە بەردینەکان ب ئەسپەکانیانەوە ڕەت دەبوون لە نالی پێی ئەسپەکان ئاگر و برووسکە دەبینرا. ئە کەسانەی کە دژ بە ئەوان بوون و هەروەها پێشمەرگەکانی ڕووس لە ترسی ئەوار

خۆیان دەشاردەوە. ئەوان٩٩ کەس لە کوردگەلی دژ بە خۆیان کوشت و بە ئەوەی کە ئەم ژمارەیە بگەیێنە١٠٠ کەس، بڕیاری کوشتنی ئاغاجان لە هۆزی قوورەکانی دەرکرد. شەوێک ڕۆیشتنە بەر مالّیان لە شاری فیرووزە و گوللەییکیان لە مێشکی خالّی کردەوە و مێشکیان لە ناو مالّەکەیدا پژاند و بە ئەم شێوە ١٠٠ کەسیان لە ناو برد. چەن ڕۆژێک پێش ئەوە بە شوێن قاسمی جەلالی باولی دوکتور شارەزا دا ببوون، بەلاّم بە هۆی ئەسپە تیژەکەی نەیانتوانیبوو بیگرن و بە جێگەی ئەو ئاغاجانیان کوشت.

موحەممەدبەگ[٢٢١] و ئاراز زۆر لێزان و لێهاتوو و چالاک بوون. وەها لەگەلّ رووسەکاندا شەڕیان کردبوو کە هەر کاتێک هێرشیان دەکردە سەر شاری فیرووزە، دەرگای مەقەڕەکەیان دەبەست و خۆیان دەشاردەوە.

ئەوان بە ئەندازێیک ڕووسییان کوشتبوو کە لە ئەژمار نەدەهات.

لە کاتی سوارکاری گەرگوللەیان بهاویشتبایە هیچ کات بە هەلّە نەدەڕۆیشت لە یەکێک لە هێرشەکانی مەقەڕی نزامی فیرووزە تەواوی ئەفسەرو پێشمەرگەکانی ڕووس کوژران، چەک و تەقەمەنییەکی زۆریان هێنایە ناو شاری ڕووسیە.

توحفەگولّ و چریکەکانی دیکە لە فیرووزەوە ڕووبە قەلاّی باقر ڕێکەوتن و داگیریان کرد. بیگلەرکوڕی ئاغاجان کە لە مردنی باوکی نارەحەت بوو و بۆ ڕووسەکان خەبەری کۆ دەکردەوە، لەگەلّ چەن کەس لە پێشمەرگەکانی ڕووس دەستگیرکرد و لە دەستدرێژی گوللەیان‌دا و لە ئەوێوە ڕوو بە ئەشق‌ئاوا ڕۆیشتن.ڕێکخراوەی «گیپۆ» خەبەری ڕۆیشتنی ئەوانی بلاّو کردبوو و هێزەکانی ڕووس لە نزیکی ئەشق ئاوا گەمارۆیانیان‌دا، بەلاّم ئەوان شێرانە شەڕیان کرد و ژمارەیێکی زۆر لە دوژمنیان کوشت و ڕێلّی گەمارۆکەیان تێکشاند و لە تاریکی شەودا خۆیان دا بە دەم ئاوەوە، پاش تێپەڕکردنی٢٤ کیلومەتر لە ناو ئاودا لە خوارەوەی شاری نەسا سەریان دەرهێنا، پاشان لە ڕێگەی کێوستانەوە گەڕانەوە بۆ فیرووزە. شۆڕشگێڕانی کورد پاش چەن شەو و ڕۆژ شەڕ کردن‌و تێکۆشان بە

---

[٢٢١]- بەگ محەمەد و حەسەن، هۆزێکی تورکەمەنیان بە تەواوەتی لە ناو برد لە بەر ئەوەکە کاتێک سەردار عەوەز ڕوو بە ئێران ڕۆیشتبوو ئەم هەوالّەیان بەڕووسەکان‌دا بوو و بوو بە هۆی ڕووداوی دلّتەزێنی دۆلّی دوغری و شەهید بوونی سەردار عەوەز.

تەواوەتی هیلاک و ماندوو بوون، بۆیە بۆ ماندوویەتی دەرکردن لە ئەشکەوتێک لە کێوی شۆغە نیشتەجێ بوون. زۆر برسیان بوو، بۆیە دووکەسیان بۆ هێنان نان‌وخواردەمەنی بۆ یەکێک لە دێهاتە تورکەمەنەکان کە نزیکی ئەوێ بوو نارد. نوێنەرەکان لە مەترسی ئەوەی کە تورکەمەنەکان ڕاپۆرتی ئەوان بە ڕووسەکان بوون باشتریان زانی کە خۆیان پیشان نەدەن، بۆیە ڕۆیشتنە ناو ماڵێک و لە تاریکی شەودا بزنێکیان هەڵگرت و هەر ئەو شەوە سەریان بڕی و کەبابیان کرد و خواردیان و لە ئەشکەوتەکەدا خەوتن.

سەر لە بەیانی ئەو ڕۆژە ساحێبی بزنەکە زانی کە بزنێکی نەماوە و بۆیە کەسێکی لێ‌زانی لەگەڵ خۆیدا بە شوێن جێگە پێی ئەو کەسانەدا کە بزنەکەیان بردبوو ڕۆیشتن و تاکوو ئەشکەوتەکەیان دۆزیەوە و شۆڕشگێڕانی کوردیان لەوێدا دیتەوە، بۆیە گەڕانەوە بۆ فیرووزە و سەرپەلی هێزی ڕووسیان ئاگادارکردوە وسەرپەلی هێزی نزامی ڕووس تەواوی هێزەکانی خۆی بەڕێ‌خست و لە کوردەکانی دژ بە ئەوان داوای‌کرد کە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە سەردارئاراز بەڕێ‌بکەون.

دوای ئەوەکە داوایان لە قاسم کرد کە ئەویش لەگەڵ ئەوانا بڕوات. بەڵام بە هۆی هەستی پاک و خاوێنی قاسمەوە کە دەیزانی هاوقەتارەکانی دەکوژرێن بەڵام سەر کردەی زاڵمی ڕووس تفەنگی لە دەست قاسم وەرگرت و دایە دەست کوڕی کوردی چڵکاوخۆر لەو کاتەدا کە دوژمن گەیشتە ئەوێ، ئاراس و دوستەکانی تازە لە خەو هەستا بوون کە گەمارۆ دران. شەڕی مان و نەمان دەست پێ کرا، لە ئاکامدا ئوون بێگی برای ئاراس کەوتە بەردەسترێژی دوژمن و تیرێکی خوارد کە تا ئاخری عومریش نەیتوانی قسە بکات. ئاراس لەو شەڕەدا بەشداری چالاکانەی‌کرد و تا تاریک بوونی هەوا شەڕیان کرد و کەچی ئارازیش تیری خوارد.

ئاراس داوای لە دۆستان کرد کە ئەو بە جێ بێڵن و خۆیان ڕزگارکەن، بەڵام ئەوان گوتیان ئێمە ناتوانین ئەم کارە بکەین.گوتی خۆم دەکوژم. ئەمجا دۆستان بەدڵێکی ماتەمین و بە چاوێکی پڕ لە ئەسرین ڕێگای چیای سەرکەیشان گرتە بەر برای خۆشەویستیان بەجێ هێشت. ڕووسەکان تا بەیانی ڕۆژی دوایی ئاراسیان گەمارۆ دابوو و ئاراسیش تا هێزی‌تێیدا بوو بە دوو دەستان خەریکی کوشتنی دوژمن بوو. بە هۆی خوێن ڕشتنی زۆر لە سەر خۆی ڕۆیی و کەوت.سەر لە بەیانی

ڕووسەکان بە پارێزەوە ڕوویان لە ئەشکەوتەکە کرد و بینیان کە ئاراس مردووە و یارانیشی نەماون. تەرمی پاک و بێ‌گەردی ئاراسیان هەڵگرت‌وگەڕانەوە بۆ گوندی فیرووزە، کاتیک خەڵکی فیروزە دیان کە شێرەکوڕی ناو هەردووچیا تەرمی بێ‌گیانی بە دەست دوژمنانەوەیە شیوەن و گریان ئاسمانی گرت و ژنان خۆیان دەڕنی و ئاراسیان دەلاواندەوە و پیاوان پرمەی گریانیان دەهات. خەلکی دەیان ئەویست شۆڕش بکەن و بۆیە سەرکردەی دوژمن هاواری ئەکرد کە ئاراس یەکێکە لەو کەسانەی کە بۆ کوژرانی کوڕانی ئێوە هەوڵی دەدا. سەرکردەی ڕۆسەکان کاتێک کە دی خۆشەویستی ئاراس تێکەڵی خوێنی ئەوان بوو، تەنیا کارێک کە توانیان بیکەن ئەوە بوو کە تەرمی ئاراسیان دوور خستەوە و خەڵکی گوندی فیروزە بەوە زۆر دڵگیر بوون کە ئەیان‌بینی تا دوێنی دوژمنان لە ترسی ئاراز مشکیان لێ قەیسەری بوو، ئەمرۆ بە سەربەرزی و بە بێ ترس تەرمی پاکیان خستۆتە ژێر پێ. کوژرانی ئاراز کۆستێکی هێندە گەورە بوو بۆ خەلکی کوردی ئەو سەردەمە. ژنەکەی ئاراز«توحفەگوڵ» لە ناو چیای سەرکەش‌دا بە تەنیا مایەوە، ئوون بیگی برای ئاراز کە لە شەڕێکی قارەمانانەدا بریندار ببوو. ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو چاکی ئەڕۆی و بۆ جارێکی‌تر کەوتە ناو جەرگەی شەڕەوە و ئاڵای بەرزی خۆڕاگرتنی نایەوە سەرشان. بەلام بە داخێکی زۆر گرانەوە ئەویش لە پەنای قەلای باقردا کەوتە بەرگو للەی دوژمن و بۆ هەتاهەتایە گیانی لە دەست‌دا. دوای کوژرانی ئوون بەیگ، ژنەکەی ئاراس لەگەڵ هێوەری کە لاوێکی١٨ ساڵە بە ناو حەسەنقولی ژیانی هاوبەشیان دەست پێ کرد. بەڵێ چالاکانەیان کردووە. کاتی خۆی کاتێک کە کوردەکان کەوتنە ژێر سەیتەرەی عوسمانیەکان شێرەژنێک بە ناوی فاتیمە ڕەش کە وەکوو ژنی ئاراس بۆ خاک و نیشتمان وەفادار بوو. بەڵێ توحفەگوڵ ئەوژنەی ئاراسە بوو کە دوای کوژرانی ئاراس ٨ ساڵ ئاڵای بەرەنگاری هەڵگرت‌و لە چیا وکوێستانەکان‌دا دەمێک ئوقرەی نەبوو و هەموو شەو و ڕۆژێک تیری کاری لە دوژمن ئەوەشاند و ڕێگای پڕ لە سەربەرزی ئاراسی ون نەکرد. باقر و چەند کەسێکیان کوشت. هەموو ئەوکەسانەی کە چلکاوخۆر و سیخۆر بوون گرتیانیان و بە سزای خۆیان گەیاندیانیان. دوای ئەوەیکە توحفەگوڵ لەگەڵ هاوڕێکانی لە شەڕێکی گەورەدا کەلوپەلێکی زۆریان گرتبوو و بە ئەمانەت لە ماڵی حاجی موحەممەد دایان‌نا. بەلام پیاوی ناپیاو حاشای لێ کرد و

وتی من ئێوه هەر ناناسم. چاوەڕوانی ئەو هەموو ناپیاوییە نەئەکرا و توخفە ڕۆیشت بۆ لای حاجی ئەحمەد کە لەگەڵیا قسە بکات ئەمانەتیەکەی بداتەوە؛ بەلام بێ ئاکام ماوە و بۆیە حاج موحەممەد لەترسی ئەوان ئەچوو بۆ مەشەد و شکایەتی بردە لای حاکمی ئەو سەردەمە کە ئەوانە بە بێ‌گوناح بیانووم پێ ئەگرن. بەگوموحەممەد بەدەستی حاجی موحەممەد لە مەشهەد کەوتە بەندیخانە. توحفەگوڵ و دۆستانی بۆ ڕزگارکردنی بەگوموحەممەد چوونە مەشهەد، بەلام بەداخەوە ئەوانیش لەلایەن ڕژیمەوە بە دیلی گیران کە موحەممەدنەبی توانی خۆی ڕزگار بکات. حاجی موحەممەد ڕوباتی، هەروەها بۆ ئەوەی بتوانێ تیخی تیژ بدا لە کۆماری کوردستان لەگەڵ سەربازانی حکوومەت چونە مەرغزار و لەوێ ڕەجەبعەلی و ئەولیاقولی دوو برای بەگوو بوون کەلەبچە کران و ڕەوانەی مەشهەد بوون. پاش بێدە سەلات بوونی ئەحمەدشا و دەسەلات‌گرتنی ڕەزاشای پالەوی زیندانیەکان ئازاد کران. توحفەگوڵ جارێکی‌تر هاتەوە بۆ لای عەلیخان، بە هۆی ئەو شکایەتەوە ئەحمەد مورغزاریش بەدیل گیرا. هەواڵێکی خۆشیش بە توحفەگوڵ گەیشت کە هاوڕێکانی کە پێشتر گیرا بوون نە تەنیا لە سێدارە نەدران بەڵکوو لە بەندیخانە ڕزگار بوون، بۆیە زوو خۆی گەیاندە مەشهەد. هاوڕێکانی تێگەیاند کە ئەحمەدبەیگ کە بەربەرەکانی لەگەڵ کۆماری کوردستان ئەکرد کەوتووتە بەر ڕقی تۆڵە و بە سزای خۆی گەیشتبوو. بەگوو لە زیندانا زۆر بە زیرەکی لەگەڵ هاوڕێکانی توانی ڕێگەچارەی هەلاتن بە دەست بێنێ و بۆیە جارێکی تر دیلی و کۆیلەتی بەجێ هێشت و چیای سەرکەشی کردەوە ئامێز و مەکۆی ئازایەتی بۆ تۆڵەکردنەوە لە ئەحمەدبەیگ. بۆیە زۆر بە کوتووپڕی چوونە مەرغزار و لەوێ لەبەر چاوی ماڵ و منالیدا ئەحمەد بەیگیان گرت و کوشتیان و پاشان‌چوونە ڕوبات، لەوێش حاج موحەممەدیان کوشت.تا وەکوو جارێکی‌تر کەسێک نەتوانێ دژی هاوڕەگەزی خۆی دەست بە خەیانەت بدات ئەمجار زانیان کە مانەوەیان لە ئێران زۆر سەختە بۆیە جارێکی‌تر ڕوویان کردە چیا وکوێستانەکانی سەغلەتی گۆیل. نزیک بە ساڵێک لەوێ مانەوە. بەگوو دوای ئەو هەموو دەربەدەری و تێکۆشانە، ئاواتی ئەوە بوو کە جارێکی‌تر بچێتەوە شوێنی لە دایک بوونی کە دوای چوونەوەیان بۆ ئەوێ کەوتنە بەر هەلمەتی چلکاو خۆرانی ڕووس و لەوێش لە شەڕێکی قارەمانانەدا خۆی ڕزگار کرد و ماوەیەکی زۆر لەو گوندە

دا خۆی حەشاردا. ڕۆژ لە ڕۆژ کوردەکان تەنگیان لێ‌هەڵئەچنرا و لە هەموو لایەکەوە لەلایان ئیران و رووسەوە ئەکەوتنە بەر دەستڕێژ.عێشق بە زێد و وەتەن تێکەڵی خوێنی بەگوو بوو بۆیە لەگەڵ کچێک بە ناوی سنەوبەر ئاشقی یەک بوون و بە برای سنەوبەری گوت کە ئەمانەوێ لە سنووری تاجیکستانەوە خۆمان بگەیەنێنە چین و پێویستمان بە پارە هەیە ئەویش لە جێگای هێنانی پارە، سەربازەکانی ڕووسی هێنا و لە کاتی سواربوونی هاوڕێکانی هەموویان حەواڵەی زیندان کرد. کوڕی ئاقاجان کە دەسەڵاتێکی زۆری لە ناو ڕژیمی ڕووس‌دا بوو و دیبووی کە باوکی چۆن بەدەستی بەگوو کوژراوە.حەزی‌کرد کە لە سێدارە بدرێ. حەسەن کە لاوێکی تازە پێگەیشتوو بوو ترسابوو بۆیە داوای لێ‌خۆشبوونی ئەکرد بەڵام بەگوو بە سەربەرزی و بە هەڵویستی جوامیرانەوە، وەستابوو دوای بەربەرەکانییەکی زۆر بەگوو و حەسەن لەسێدارە دران و هاوڕێکانیشیان هەریەک بە ١٠ ساڵ زێندان مەحکووم بوون. توحفەگوڵیش بەتەنیا مایەوە و خۆی گەیاندە عەشق‌ئاباد و لەوێ ماویەک خۆی حەشاردا و پاشان وازی لە شەڕی ناوچیاکان هێنا. لە ساڵی ١٣٠٨ی هەتاوی براکانی بەگوو سەریان لە توحفەگوڵ ئەدا. دوای شەڕی گەورەی دووهەمی جیهانی هاتوچووی نێوانی ئێران و ڕووس کۆتایی پێ هات. ئێمەش ئیستە لەو کوردە قارمانانە کە چالاکانە شەڕیان ئەکرد. بێ هەواڵ ماینەوە. وشتێکی زۆر تاڵ و ناخۆش ئەوە بوو کە ئەی‌گێڕنەوە ئاراس گوتوویەتی لە ١٧٠ کەسی بنەماڵەی ئێمە هیچ کەس نەماوە، بۆیە هەر فرمێسکی پڕ لە حەسرەتی هەڵ ئەوەراند و بیرەوەری چیاکان ببوە دەرمانی و ساتێک ئارامی نەبوو. و دیمەنێکی زۆر نامۆ ئەوە کە پاداشی ئەو هەموو شەهیدانە ناپیاوی ئێرانە کە ئەوە سەرباری هەموو دەردانە. بەگوو یەکێک لەو پیاوانەی کە دوای ٩٠ ساڵ ژیانی پڕ لە سەربەرزی لە شیروانا دوای ڕاپەڕینی گەلانی ئێران کۆچی دوای کرد. لە ساڵی١٣٥٦ هەتاوی‌دا چوینە خزمەت مەحموودبەگ تابش ناسراو بە -بەگوو- ئەویش باسی پیاوانی گەورەی ئەو سەردەمە واتا ئاراس و موحەممەد دووری‌خان و سەردارخانی بۆ کردین کە چۆن گیانیان کردبوە قەڵغان و ڕێگەی چڵکاو خۆرانی ڕۆسیان نەئەدا زۆرتر بێنە سەر خاک و وەتەن و سەلماندیان کە لە پێناو ئازادی‌دا گیان ئەدەن و باسی ئەوەی کرد کاتێک کە ڕۆسەکان هاتنە فیرووزە، باوکم نەیتوانی بیبینێ کە بێگانە لەسەر خاکی ئەم

ولاته به ئازادی بگەڕێ و ژیانی پڕ له ناسۆری و کەساسی بۆ خەلک دروست بکات. بۆیه کوتووپڕ کەوته چیا و تاقمێکی چەکداری له دەوری خۆ خڕ کردەوه و شەڕی مان و نەمانی درێژه پێدا. له ئێراندا خۆی پێ نەگیرا و گەڕایەوه بۆ فیرووزه. دوای ئەوه که ڕۆسەکان ڕۆژ له دوای ڕۆژ دڕندەتر و پێ ئەستوورتر درێژەیان به تاوانەکانیان ئەدا. ژیان بۆ ئێمه زۆر گران بوو، دایک و باوکم لەوێ گیانیان له دەست دا و تاقمێک کوژران و هەندێکی‌تریش به تاوانی یاخی بوون حەوالەی به ندیخانەکران. بۆ خۆشم لەلایەن ڕژێمی ڕۆسیەوه کەوتمه بەر ڕقی ئەوان و بۆیه لەگەل ڕژێمی ئێران ڕێکەوتم و چوومه شیروان. هەموو مال و ملکم ڕووسەکان داگیریان کرد و بەهۆی ئەوەوه که فیرووزه کەش‌و هەوایەکی خۆشی هەبوو ڕووسەکان ویستیان داگیری بکەن، فیرووزه شارێک بوو هەتا بلێی جوان و ڕازاوه ٥ کیلۆمتر درێژایی و ٢ کیلۆمترپانتایی سەوزەلانی و بەهارێ جوانی بوو، بەلام داخەکەم هەموو ئەو جوانیانه بوو به هۆی ئەوەی که بۆ هەتا هەتایه له دەست چوو، خوێنەرانی هێژا! ئێستاکه وەختی ئەوه هاتووه باسێک له شاری بجنوورد بکرێ به شێوازی حاج‌سیاح مەحەللاتی یەکێک له مامۆستایانی تێکۆشەری ئەو سەردەمه ئاشنان که به هۆی خوێندنەوەی گۆڤاری قانوون تووشی کێشه ببوو وکەوته بەندیخانەوه. حاج سیاح زۆربەی ژیانی خوێ به گەشت و گەڕان تێپەڕکردووه و چەن سالێک دوای دیتنی ئەمیرحسێن‌خان جارێکی‌تر گەڕایەوه بۆ خوراسان. ئەگێڕنەوه که دۆستی موحەممەدخان ویستوویەتی که کتێبێک سەبارەت به کوردەکانی خوراسان بنووسێت و بۆ زانیاری زۆرتر سەبارەت به کوردەکانی تورکیا بۆ ئەو سەردەمه هەر وا درێژەی بووه، حاج سیاح کاتێک ئەچێته بجنوورد سەردارخان لەوێ نابێت و ئەمەش ئەبێته کۆسپێک و چەن ساعەتێک له ڕۆژ تێپەڕ دەبێ چوینه سەرداره(ناوی گوندێکه) سەردار لەوێ بوو له دوورەوەو ئێمەی دی و به خوشحالی زۆرەوه میوانداری کردین. دوای میوانداریێکی جوان له لایەن سەردارخانەوه دەستووردرا که بۆ ڕۆیشتن ئاماده بن. کاتێک بەرەو بجنوورد ڕۆیشتین شەوێک لەوێ ماینەوه، چوینه مالی یەکێک له ڕیش سپیەکانی ئەو شاره کۆشکێکی گەوره بەلام پڕ له ئەوین و خۆشەویستی که نه دلێک بەلکوو ١٠٠ دل عاشقی ئەبوو ماوەیەکی کورت ماینەوه ئەمجا گەیشتینه شاهرووود لەوێ ویستم له ڕێگای ئەسترئابادەوه بڕۆم، بەلام

لەوەو پێش لە لایان سەردارخان و بە مەیتەرەکەی دەستووردرابوو کە بۆ هەر کوێک بچم لە خزمەتمدا بێت. دوکتور کەریمی لە ساڵی١٣١٥ هەتاوی ئەچێتە کوردستانی ئێران و کاتێک لە مەهەبادوە بەرەو نەقـەدە و شـنۆ ڕێ ئـەگۆڕێت، خـانی لاهیجـان پیاوێکی بە ساڵاچووی زۆر قسە خـۆش ئـەبێت و هەوڵـێکی بەرچاویـشیان داوە کـە خەڵکی ئەو شار وگوندانە زانیاری زیاتر وەدەست بێنن، بۆیە قوتابخانەیەک کـە سـێ تەڵـەبە و سـێ مامۆسـتای ئـەبێت لـە لایـان ئەوانـەوە سەرپەرسـتی ئـەکرێت. سولێمان‌خان دووهەمین کوڕی موحەممەدخان کە دایکی تورکمان بووە کاتێـک لـە بەهاری١٣٠٠دا ناسرەدین‌شا ئەچێتە بجنوورد ئاوا لە سولێمان‌خان یـاد ئـەکات: کـە سەهامودەولە کوڕی ئازا و بەجەرگی بە ناوەکـانی نوسرەتولـڵاخان لاوی١٠ ساڵـە و موحەممەدخان لاوی٩ ساڵە بووە کە هەردووکیان زانیارییێکی زۆریـان سـەبارەت بـە زمانی فەرانسە بووە ولە تیر وکەوان و ڕاویشدا شارەزا بوون. سلێمان‌خان لاوێکی زۆر شیرین و لەبەردڵان بـووە ولەپـەروەردە کـردنی منداڵـەکانیدا زۆر هێمنانـە و عاقڵانـە هەڵسوکەوتی بووە. زۆربەیان ئـەوە ئـەزانن کـە موحەممـەدخان یـەکێک لـە کـوڕە چکوولەکانی خۆی بە ناو عەزیزوڵڵا خـان کـە دایکـی کـورد بـووە ویـڕای ئـەوە لـە سولێمان‌خان چکوولەتر بووە بە تەمەن، گوتوویەتی کـەدوای مـردنی عەزیزولـڵاخان جێگری ئەو بێت. سولێمان‌خانیش ئەو هەسـتەی لـە لا گـران بـووە و بۆیـە لەگـەڵ هەندێک لە هاوڕێکانی ناڕەزایـەتی خـۆی دەرئەبـڕێ و داوای مـافی خـۆی ئـەکات. سولێمان‌خـان لـە سـنووری بـاکووری بجنـوورد تاقمێـک لـە سـەربازانی ئـازا دژی موحەممەدخانی خستە ناو جەرگەی شەڕەوە و لـە لایەکیـشەوە چونکـە سـەربازانی ئیلخانی خۆشەویستی تایبـەتیان بـۆ سـولێمان‌خـان بـوو لـە زۆربـەی شـەڕەکاندا پاشەکشێیان ئەکرد. چونکە وایان بیرئەکردەوە کە ڕۆژێک سـولێمان‌خـان پـشت لـە وان ئەکات. دووبارە کوڕێکی خۆی لە ئـامێز ئـەگرێ و بـە گـژ ئەوانـدا ئـەچێت. بـە تایبەت ئەوەی کە سولێمان‌خان لەگەڵ حاکمی ڕووس دیدارێکی دۆسـتانەیان بـووە و مەرجی ئەوەی داناوە کە ئەگەر سولێمان‌خان بتوانێ لـە ڕۆژهـەڵاتدا دەوڵـەتێکی کوردی دامەزرێنێ ئەوە خۆی ئەبێتە حاکمی ئەوان. ئەگەر ئـەم بـیر و بـۆ چوونـەی سولێمان‌خان سەری بگرتایە خاکی خوراسانیش ئەکەوتە قوڕگی ڕووسەکان و ئـاوای بەسەر نەئەهات. پاشای ڕۆسەکان لەگـەڵ ئـەوەدا کـە لەگـەڵ شـای ئێران نزیکـی

تایبەتیان هەبوو داوای کرد سولێمان‌خان وەکو تاکە کەسێک ببینم، بەڵام شای ئێران لەگەڵ ئەم داواکاریەدا هەرگیر نەبووە.

هەر لەو سەردەمەدا خەسرەوخان بۆ قووچان هات، بەڵام ئیتر دێر بوو و بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیٚ شار بە تەواوی گۆڕا بوو. خەسرەوخان‌لە بەرانبەر نەڕەزایەتی خەڵک و لەگەڵ تاقمێک کە لەلایەن بادلانلووەکان و لایەندارەکانیانەوە بەڕێوە ئەچوو، ڕوو بە ڕوو بوو و بە ناچار شەوانە دەرچوو بۆ مەشهەد.

تووران بی‌بی کچی وەلیخانی بادلانلوو [خوشکی تاج موحەممەدخان کە دوایی شووی کرد بە فەرەجوڵلاخانی زەعیمولمەلیکی شیروانی] کە دەربەدرە بە شوێن تاوانباری بابی دەگەڕا. بە شوێن ئەودا ڕویشت بۆ مەرو و بە شەش لوولێک کە بە دەستیەوە بوو، خەسرەوخانی لە پاڵ بارگەی پاکی ئیمام ڕەزا کوشت و جارێکی‌تر دلێری ژنی کوردی لە دڵی مێژووداسەلماند.

وتراوە: تووران بی‌بی بە دەستی خۆی خەسرەوخانی نەکوشت، بەڵام پارەی دابوو بە دانەی لە تورکە کۆچەرەکان بە ناوی سەید عەباس لە مەشهەد تاکوو ئەو خەسرەوخان لە کاتی نوێژدا بکوژێت.بەکوشتن خەسەرەوخان و وەلیخان، گۆڕەپانی کیٚبەرکیٚ بۆ عەبدوڕەزاخان باز بوو. ئەو دوای ماوەیێک بە جبەی سوور و بە فەرمانی حوکوومەتی قووچان گەورەیی بە سەریدا هات . دوای ساڵێک غوڵامڕەزا ئاسەفۆدەولە بەکرینی حکوومەتی خوراسان لە ئەمینوسۆڵتان، نوێنەری موزەففەرەدین شا کە لە باتی ڕۆکنۆدەولەی مامی شا هاتبوو بۆ خوراسان. ئاسەفۆدەوڵە سەرەتای چوونی بۆ خوراسان حکوومەتی لە عەبدوڕڕەزاخان وەرگرت و دای بە کوڕی خۆی (ئەمیرحوسەین خان) و پاشان خەریکی ستەم و جەفا بوو کە باس کردن لە سەری لە کتێبێکدا جیٚ نابێتەو.

**بەندیخانەی ترسناکی ئاسەفۆدەوڵە لە خوراسان و حاڵی بیلگەربەیکی قووچان:**

خوالێخۆش بوو مەجدولئیسلامی کرمانی لە دوورخستنەوەکەیدا بۆ خۆراسان لە ساڵی ١٣٢٤ کۆچی مانگی کەچەن ڕۆژی چێژی ئەم زیندانەی چێشتبوو، خالانی سەرنجداری لەویٚ دەرخستووە کە دەرخەری تاوانەکانی ئاسەفۆدەوڵە و

هاودەستانی و شێوازی هەڵسوکەوتی دەست نیشانەکانی ڕژێم لەگەڵ خەڵکی خوراسانە. مەجد لەگەڵ باسی سیاچاڵە و حاڵ و ڕۆژی ناشیرینی گیراوەکان و ئەشکەنجە و ئازاری ئەوان خەریک نووسینی حاڵی بیگلەربەیگی قووچانە و ئەڵێ: لە ڕووداوەکانی بەند گوایا بیگلەربەیکی قووچان حاجی ئیسماعیل‌خانمان بۆ خوێندەواران ناساندووە، بەڵام بۆ ئاگاداری دووپاتی دەکەمەوە.

ئەم کەسە خۆی نەجیب خۆش زات و ئەندامی ئەنجومەنی برادەرە. زەهیرودەولە[222] کارەکەرێکی هەیە لە جلوبەرگی کوردیدا، هەموورۆژێک زۆر جار دێ بۆ لای، چای بۆ دێنێت، جارجارێک پێنج دە تمەنێک قەرز دەکات و بۆ پێشکەشی خانی ئەهێنێ. هۆی گرفتاری ئەو ئەوەیە کە ئەم کەسە لەهۆگرەکانی شوجاعودەولەی قووچان ساڵگارێکی درێژە لە خوراسان جیا بووە و لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی شوجاعودولەیش بووە. باب و باپیری ناسراون بە سەردار تا ئەوەی کە جار و بار لە بنکەی خۆیان‌دا بە سەر قووچان و خەڵکی زەعفەرانلوو حکوومەتیان دەکرد، و لە مردنی گەورەکانیان [ئەمیرحوسەین خان و...[223]] کەم دەسەڵات بوون و لە کاتی شوجاعودەولە کە لاوێکی بێ‌ئەزموون و تریاکی بوو، کاریان خراپ بوو و ئاسەفودەولەیش چوو بۆ ئەوێ تا ئەو لە حکوومەتی قووچان لابات و بیکات بە تاوانبار و بینێرێ بۆ تاران و دوایی کوڕی خۆی ئەمیرحوسەین خانی نارد بۆ قووچان و

---

[222]- دایرەتولمەعارفی مەساحێب هێناویەکە: زەهیرودەولە عەلیخان، ناسراو بە سەفاعەلیشا لەگەڵی پیاوانی سەردەمی قاجار و کوڕی موحەممەد ناسرخانی زەهیرودەولەی قاجار، زاوای ناسرەدین شا بوو و بۆ ماوەیێک لە ولایاتی جۆراوجۆر حکوومەتی کرد. لە ساڵی ۱۳۰۳ کۆچی مانگی چووە نێو دەستەی موریدانی سەفی عەلی شا و دوای مردنی ئەو بە دەستووری ناسرەدین‌شا بوو بە جێگری ئەو و ئەنجومەنی (ئێخوەتی) درووست کرد و لەسەرەتای مەشرووتیە لە ئازادی خوازان لایەنگری دەکرد. کە وابوو لە ڕووداوی بە تۆپ بەستنی مەجلیس خەساری دیوە و ماڵەکەی خاپوور بووە [موحەممەد عەلی شالەدوا چرکەکانی حکوومەتی لەم ڕووداوە پەشیمانی خۆی دەربڕیوە و بە شوێنی‌ها و سەرەکەی زەهیرودەولەی نارد لە کرمانشان بووە] زەهیرودەولە لە تاران ژینی بە کۆتایی‌هات. کوڕی لە بەنیی ئیمامزادە قاسم و تەجریشی شمیرانە. لە بیرمان نەچێ کە: موحەممەد ناسرخانی شوجاعوددەولە و لە قووچان کە ئەویش لایەنگرو موریدی زەهێرودەولە بووە و هەر لەم سەردەمەدا بووە کە عیرفان و تەسەوف (خواناسی) لە قووچان درووست بووە.

[223]- کە وابوو ئەمیرحوسەین خان کەم دەسەڵات نەبوو و لە پیاوە بە دەسەڵاتە کانی سەردەمی ناسری بووە.

هـەرچی خۆیـان حـەزیان لـێدەکـرد لەگـەڵ مـڵکەکانی ئـەویان کـرد و کچـی شوجاعودەولە،[٢٢٤] خواڵێخۆش بوو خوشکی شوجاعودەولەی گرت و ئیتـر ئەمـە کـە باسی کچ فرۆشی قووچان بە ناو بانگە و ئەم باسی کچ فرۆشیە لەمە چاوکـە دەگـرێ کە قووچان بە سنووری تورکەمەنەکانەوە لکاوە و بە خاکی رووسیاوە لکاوە و مالـیاتی ئەم جیگا لە خەلک دەگرن، نە لـە دەرامـەدی زەویوزار و ئەوکەسـەی کـە ناتوانـێ مالیات بدات (لە یاسای سرۆشتدا لاواز لەناو دەچێ) بە ناچار کچی خـۆی دەفرۆشـی تاکوو مالێات بدات. ئاسە فودەولە، شوجاعودەولەی هەر بەم بۆنەوە بە تاوانبارناسـی و ناردی بۆ تـاران. بـەڵام کوڕەکـەی خـۆی دوو بەرابـەر لەخەڵـک بـاجی دەگـرت و چواربەرابەر ئەو کچ فرۆشی دەکـرد و ئەوەنـدە بۆخەڵـکی بێچـارە زۆری هـاورد کـە خەلک لە دەستی هاواریان بەرزبوو. ئەویش ناچارکەوت دوای وەرگرتنی حوکمەکان لە تاران و خراپەکانی زۆر کوڕەکەی خـۆی لابـرد و حکوومـەتی قووچانیـشی دا بـە «میرزا ئەبولقاسم خان» کەئەم پیاوە لە تارانەوە بۆ ناوچێ کردن چوو بوو، کە ئەو بـێ رەحمەش وەرگرتنی دووبەرابەری لە پێی خۆیگرتبوو و بەلگەی دابـوو کـە دەنگـی خەلک دەرنەیت.[٢٢٥] ویستی ئەم زۆر بوونی مالیە لە خەلکی گەورە و پووڵدار لا بـا و ئەوەندیش موزاحمی خەلکی هەژار نەبێت .پاشان گوتی: فیتنـە درووس دەکـەن و ئاسیش دەشێوێنن و خەلک ڕوو لەشۆڕش ئەکەن، ئەم نۆکەرانەیان گـرت و زۆریـان لێدان و جەریمەیکی زۆریان لێ وەرگرتن. دوای ئەوەی کە کاری خۆی تەواو کـرد، ئەوانی نارد بۆ خوراسان[٢٢٦] (مەشهەد) بۆ لای بابی و سەرۆکی گـشتی لـێوەرگـرت. ئەوانیش هەر لەم زیندانە کە گوتمان ڕاگیراون و لەهەر کامیان هـەرچیکیان هـەبوو وەریان گرت و ئازادیان کرد. تەنیا ئەم یەک کەسـە بـەو بۆنـەوە کـە لـە خوراسـان کەسێکی ناناسی، نەیتوانی کـارێ بکـات و ئـازاد بێـت، هـەر لـەو گرتووگـە مـاوە و

---

[٢٢٤]- ئەم کچە ناوی تورکان ئاغا بوو و کچی «ئەمیر ئەبولحەسەن خانی میر پەنجە» بوو. ئـەو پـەڕی چەوسانەوەی«عەبدۆڕەزاخان لێرە دادەردەکەوێ» کە دوژمـن توانیویـەتی خوشکەکەی بـۆ خـۆی داگیر بکات و هەرچی دارو نەداری ناوبراو و چەنگیز و... کە لەزەعفەرانلوو بە جـێ مـابوو بـە نـاوی دستکرد بۆ خۆیان هەلگرن.

[٢٢٥]- کەلە ئەنجاما دەنگ بەرزبوو لە تارانەوە دەنگی مەشرووتیەت هەڵهات.

[٢٢٦]- لەو سەردەمەدا بە شاری مەشهەد دەوترا خوراسان.

خان‌باشی[٢٢٧] بۆ ئەوەی کە کاری خۆی زووتر بکات، هەموو ڕۆژێک هەواڵێکی خراپی پێ ئەدا کە ئاسە فودەولە دەستووریان داوە کە تۆ ببەن بۆ سیستان، دەمێک حوکمی کوشتن و دەمێک زیندانی کردن لە کەلات و لە هەر پۆلێکدا... . ئەم داماوە ئەوەندە دەترسا و پووڵێکی ئەدا و قەرار وابوو کە خان باشی ناوجێ بکات و یەک کەس سەید لە خەڵکی خوراسان و خزمەکانی بیگلەربەیکی لە ئەمیر جێگر و ئەو بۆ ئەوەی کە خزمەتێ بە نایبوتەولیە بکات، دەمێک ئەهات بۆ لای بیگلەربەیگی و ئەیگوت: فلان زەوی لە نیشابوور بیدە بە نایبوتەولیە و ئاشتی بکەنەوە و بەڵگەیێکی پێبدە تاکوو خۆی جەریمەی حکوومەت و باجەکەی ئامیر حوسین خان [کە بە تازەیی لە حکوومەتی قوورچان لایان بردووە بە وەلیعەهدی باوکی خۆی کە ئاسەفودەوڵەیە و بەرتیلێکیش بە خان باشی و وەلیعەهدی خانیش بدە تاکوو ئەویش لەم بەندیخانە ئازادت بکات.]

بیلگەربەیگیش حازرە ئەم کارە بکات؛ بەڵام هێشتا باوەڕی نیە و لەوە دەترسێ کە ملکەکەی لەدەست بدات و حوکمی ئازادیەکەی بەدەست نەگا. بەم بۆنەی جارێ نازانێ چی بکات و بوونی ئەو ئێستا بۆ ئێمە گرنگ نیە. جارو بارێک قلیانێکمان پێ ئەدات...[٢٢٨] لە گۆڤاری خوێندنیەکاندا هاتووە کە: «ئاسەفودەولە خوراکی خەڵکی دەکڕی و پاشان بە قیمەتێکی زیاتر بە خۆیانی دەفرۆشت. گەنمی بە خەرواری دوو تمەن لە دەوڵەت یا خەڵکی دەکڕی و بە خەرواری دە یا بیست تمەن دەیفرۆشت...»[٢٢٩]

ئاسەفودەوڵە هەر کارێکی ناپەسەندی دەکرد. کاتێ کە وەک هەڵبژاردەکانی خەڵکی لە خولی یەکەمی ڕاوێژگەی مەشرووتە لەم بابەتەوە پرسیاریان لێ کرد، گوتی: ئەوانە سووکایەتیان کردووە و بەو بۆنەوە لە چێو دران.

---

[٢٢٧]- مەبەست لەخان باشی سەرۆکی گرتووگەکەس.

[٢٢٨]- سەفەری کەلات. بەرگی یەک. مەجردئیسلامی کرمانی. بە پێشەکی خەلیل پوور. لاپەڕەی ١٦٧ بۆ ئەوەی کە باسەکە درێژەی پێنەدرابێ، باس لە ئازادی زیندانیەکان نەکراوە.

[٢٢٩]- گۆڤاری خوێندنیەکان. ژمارەی ٣٠. ساڵی چوارەم.

## دەڵە دزی هێزەکانی «ئاسەفودەوڵە» لە قووچان و دەرەگەز

بەسەرهات و بیر و باوڕ و کردەوەی یەکێک لەهێزەکانی «ئاسەفودەولـە» لـە تالان کردنی خەڵک بۆ وێنە بە کورتی باسی لەسەردەکرێ. ئەم کەسە ناوی «حەسەن خانە» کە شێخ ئەحمەد مەجدولئیسلامی کرمانی لە سەفەرنامەکەی خۆی بۆ کەلات ناوی‌لێ ئەبات.

مەجدولئیسلام یەکێ لە مامۆستا بەناوبانگەکان و ڕۆژنامەنووسەکانی ئازادیخواز و بەرز بوو کە کاتێ کە بە دەستووری «ئاسەفودەولە» لەمەشەد بۆ کەلات کۆچیان پێ کرد. حەسەن خان کە سەرۆکی هێزەکانی ئەوە، مەجدولئیسلام و ڕەفێقەکانی لەڕێگەی شاری قووچانەوە نارد بۆ خاجەڕەبێع. مەجدولئیسلام لە بارەی بیرەوەریەکانی خۆی، پێش ئەوەی بگا بە خاجەڕەبیع نووسیویەتی: «لە نیوەی ڕێگەدا گەیشتن بە دێهاتێک، دەستەچینەیەک قەیمی لە بانی سەری هەڵگرتبوو و دەڕویشت ؛ یەکێ لە سوارەکان مشتێک قەیسی هەڵگرت و بۆی هێنام و گوتی پێم: فەرموون، من زوو گوتم کە نابێ و حەزم نەکرد ماڵی داگیر کراو بخۆم»

ئەو سوارە دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی: هەرچی کە لەم ڕێگادا ئەیخۆن ماڵی داگیرکراوی خەڵکە کە ئێمە بە زۆر داگیرمان کردووە.

گوتم: لە ڕێگای‌تاراندا وانەبوو و هەر شتێکمان کە دەخوارد هێزەکان دەیانکڕی!؟ جوابی دایەوە: سواری قەراوڵخانەی تاران چ حەقێکی هەیە کە لە وەلاتێکی‌تر جەژن بگرێ. بەلام ئێمە ساکنی ئێرەین و لە هەر کوێک بمانەوێ سفرە ڕێک ئەخەین.

گوتم: مەگەر خەرجی ناوڕێگەیان پێتان نەداوە؟ بە دەنگێکی بەرز پێکەنی و گوتی: جگە لەوەی کە خەرجمان پێ نادەن پارەیشمان لێ دەستێنن، بۆ ئەوەی کە کارمان پێ ئەدەن و هەرچی کە بەدەست هاتووە دەبێ بیدەین بە «ئاسەفودەولـە» وبەشێکیشی بدەین بەمونشی باشی و ئەمیرحوسەین‌خان «کوڕی ئاسەفودەولـە» و... و لەسەد تمەنەکە کە دێتە دەستمان بیست وپێنج تمەنی بە خۆمان دەگەیت. گوتم: کە وایە ڕۆیشتن بۆ شوێنێک هیچ دەسکەوتێکی بۆتان نیە؟ گوتی: هەیەتی و

دەسکەوتی ئاوەیەکە هەرکامێکمان کە لـە نێـو شـاردا بمینێتـەوە، ڕۆژێـک تمـەنێ خەرجی خۆی و ئەسپەکەیەتی. [خەرجی ئەسپێک و نەفـەرێک زیـاتر لـەدوو قـران نەبووە] گوتم: بۆچی بە ئێوە حەقی کاری زۆرتر نادەن؟ دەستی کردەوە بە پێکـەنین و گوتی: بۆچی مەگەر ئێوە لە کوێوە هاتوون؟ حەقی کاری زۆرتر چیە؟ ئێمە بەوەش ڕازین کە هیچمان پێ نەدەن و هیچیان لێ نەستێنین. گـوتم: ئـەی بـۆچی ئێـوە نۆکەریی دەکەن و دنیاتان نیە و ئاخریشتان کە دیارە بەم هەموو زڵم و زۆرە کە ئێوە لە خەڵکی دەکەن چ حاڵێکتان دەبێت. وادیارە کە ئەگەر دەست بە کارێ بەن هـەم دنیا و ئاخریشتان خۆشترە.

**وەڵامی دایەوە:** ئەمەیش خۆمان دەزانین بـەڵام ناچـار بـە نۆکـەری کـردنین. گوتم: لەم ناچاریە تێ ناگەم! گـوتی: مـن لـە خەڵـکی شاهـسەوەنم، باوکـانی مـن سەرۆکی ئێلەکە بـوون و باوکـانم لەگـەڵ باوکـانی ئاسەفودەوڵـە مـامۆزا بـوون. لـە سەردەمی ئەمیر میرزا سەرۆکایەتی ئێلەکە لە تایفەی ئێمە گـیرا و درا بـە تایفـەی ئاسەفودەوڵە. وادیارە کە مڵکی ئێمە تـەنیا وشـتر و مـەڕە و مـاوەی دووسـاڵ مـن نۆکەریم نیـا لاوە و دەسـتم کـرد بـە شـوانی کـردنی مـەڕەکان و داگـرتنی بـاری وشترەکان. ئاسەفودەوڵە زاوای خۆی کە ناوی سەردار فـیرووزە مـەجبوور کـرد کـە وشترەکانی بە تاوانی هاوردنی قاچاخ لە عێراق بـۆ تـاران بگرێـت و جنـسەکانی بـە قازانجی دەوڵەت هەڵگرێ. وشترەکانی ئێمە شەش مانگی تەواو لـە ژێـر بارەکـەی ئەواندابوون. هیچ کرێیەکیان پێ نەدایەن و چەن جووتێک لەوانە کە باشتر بـوون بـۆ خۆیان هەڵیانبژارد.من هەرچی کۆششم کرد نەمتوانی، لـە ئاکامـدا لەسـەر ناچـاری دەستم کرد بە نۆکەری کردن تاکوو بتوانم ملک و ماڵانی خۆم و خزمەکانم بپـارێزم، ئێستا پێت وایە کە ئەمە ناچاری نیە؟

چارەم چیە لە وڵاتێـک کەکـەس بەهاوارتـەوە ناگـات؟ خوزگـا زووتـر «ڕووس وئینگلیس» هێرشیان دەکردە سەر ئـەم وڵاتـە و ئێرانیـان ئـەکرد بـە ژێردەسـتەی خۆیان. بەڵکوو چارەی خەڵک ڕۆشن ببوایەتەوە.

لەم کاتەدا من زۆر خەمینم و ئاهێکی ساردم لـە دڵـەوە هەڵکێـشا. سـوارەکەی تایفەی شاهسەوەن حاڵی و خەمین بوو و گوتی: پێویست نیە بەزەتان بێ بـە ئێمـە، بەزەت بێ بەخۆتا کە بێ تاوان ئێوەیان لە ماڵ و منداڵـی خۆتـان جیـا کردووتـەوە و

ئاوایان کردووە بە ڕۆژگارانتان و ژیانی ئێوەیان تاڵ کردووە.

لەم کاتەدا حەسەن‌خان سەرۆکی قەراسۆرانەکان کە حاڵی خوا لێخۆش‌بوو «مەجدولئیسلام»ی شەیدا دی، بە سەرهاتێکی لە کارە جوانەکانی خۆی گێڕایەوە و گوتی: کە چۆن بە دەستووری ئاسەفودەولە، حاجی میرزا مەحموودخانی باشی دوور خستووە بۆ کەلات و ئەوی لەم ڕێگەدا هێناوە و بە زۆر و ئەشکەنجە توانیویەتی لە خاجەڕەبیع تا کەلات لە ماوەی پێنج ڕۆژدا، چوار سەد تمەن بۆ خۆی و سوارەکانی و ئاسەفودەولە لەو وەربگرێت و بەلام لەم سەفەرەدا شتێکی لەم تاوانبارانە دەست نەکەوتووە. مەجدولئیسلام ئەڵێت کە چلۆن ئەم قەراسوارنە لەکاتی ڕەدبوون لە دێهاتەکان شاڵ و کڵاوی سەر دەشتەوانەکانیان بە زۆر لێ ئەسەندن و لە هیچ نەدەترسان. پێش لە گەیشتن بە قەڵای خۆر بە ڕووداوێک ئەگات و ئاوای هێناوە کە دوای تێپەڕکردنی کێو و ملەکان: گەلێک خەڵکمان بینی کە تا ئەسپەکانی ئێمەیان دی، بەرەو کێوەکە ڕایان کرد. سوارەکان بە ئەسپەکانیان غاریان ئەکرد تاکوو حاڵ و ڕۆژی ئەوان ببینن، تا سوارەکان گەیشتن، پیاوەکان ڕایان کرد و چەن ژن کە منداڵ بە باوەشیانەوە بوو و نەیاندەتوانی ڕابکەن و بەجێ مابوون. ئێمەیش بە پەلە خۆمان گەیاندە لای ئەوان و لە دیتنی سوارەکان ترسابوون؛ بەلام بە دیتنی دەسماڵی دەوری سەری من تۆزێک ئەهوەن بوون، گەیشتن بە پای کێوەکە و هەرچێ زۆرمان کرد لێیان کە بێنە لامان، نەیانئەوێرا.

ئێمە لە خوارو ئەوان لە ژوورەوە گوتیان دەوڵەت لە شارەوە هاتوون لە دێکەی ئێمەدا کە ناوی [زوو]ە پیاوەکانمانیان گرت و ئەشکەنجەیان دا و ملکەکانی ئێمەیان برد، ئێمەیش هەموومان پیاو و ژن ڕامان کرد و بەم جۆرە دەڕۆین بۆ شار تاکوو لەدەستی ئەوان پەنا بۆ دەوڵەت ببەین. [بێ‌خەبەر لەمە ئەم غارەت و تالانە بە دەستووری حکوومەت بووە] حەسەن‌خان هەرچی زۆری کرد کە بگەڕێنەوە بۆ [زوو] من کارتان ڕێکوپێک ئەکەم [بۆئەوەی کە ئەم هێزانە هاوپەیمان حەسەن خان بوون و لە یەکتر باشتر تێ‌ئەگەیشتن] ئەم داماوانە بە گریان ئەم کارەیان پێ خۆش نەبوو و پاشان دەرکەوت کە ئەمانە بە جۆرێک ترساون کە حەوت فرسەخ ڕێگایان لە کێودا پێواوە و وەها ئەیانناڵاند کە دڵمان بۆیان دەسووتا.

نووسەر کاتێ کە بە قەڵای خۆر دەگات هۆی ڕووداوەکەی پرسیاردەکات.

موحەمەدڕەزاخان ئەڵێ: بە هۆی شەڕێ کە باسی ئەم بە گوێ ئەمیرحوسەین‌خان کوڕی ئاسەفودەوڵە «جێگیری باوکی» دەگات. نەزەرخانی شاهسەوەن پێنج ڕۆژە کە لەوێدا هەرکەسێکی کە توانیویەتی، گرتوویەتی و داخی کردووە و هەرچێ بەری کەوتووە بە ناوی تاوان گرتوویەتی. چەن سەرمەڕ و چەن جووت گایشی لە خەڵک وەرگرتووە و وەهایان کردووە بە خەڵکە بێچارەکە وئەو خەڵکە ڕایان کردووە بەرەو کێوەکان و شارەکان و ئەم خەڵکەیش کە دیتان هەر ئەوانە بوون.

دوای دەرچوون لە قەڵای خۆر و ڕۆیشتن بەرەو کەلات، هێزەکان وتاوانبارەکان بۆ خواردنی فەتیری مسکە چوون بۆ چادری ئیلە کوردەکەی شێخوانلوو و ئەوان پێشوازیان دەکەن و فەتیری مسکەیکی باشیان خوارد و لە میوان نەوازی کوردان سپاسیان کرد. کوێخای ئیلەکە مەلاعەلی‌خان لە جەوروستەمی ئاسەفودەوڵە و هێزەکانی وا دەڵێ کە: چەن ساڵێک لەمەوپێش لە (سەرچاوکە) کە ناسراوە بە گوڵتەپە و لەم دەوربەرایەیە و جێگای لەوەڕی مەڕەکانی ئێمەیە و ئێمە لەوێدا چادر هەڵدەدەین. لە خوالێخۆش بوو حاجی میرزاباقری‌شەفەقی کڕیوومانە و چەن ساڵێ ملکی ئێمە بووە و کشت‌وکاڵمان دەکرد. ئەمساڵ بڕێک لە مامۆزاکانی خۆمان داخوازی بوون و چوون و شکایەتیان برد بۆ شار، ئێمەیشیان بانگ کرد بۆ ئەوێ، ڕۆیشتین و بەڵگەکەمان برد و بەڵام ئەوان بەڵگەیان پێ نەبوو. یەک و دوو بەڵگەمان پێ‌بوو، بۆ هەرشوێنێک دەڕۆیشتین حەقیان بە ئێمە ئەدا. هێشتا حاجی میرزا هاشم کوڕی‌حاجی میرزا باقریش بە دروستی بەڵگەی ئێمە شایەتی‌دا، بڕێک پارەمان دا بە ئاسەفودەوڵە و لێمان وەرگرت و لە پاش سێ- چوار مانگ ئینتزار گەڕاینەوە.بە دوای ئێمەدا پارەیەکی زۆری دابوو بە ئاسەفۆدەوڵە و هەر ئەم حەسەن‌خانەی لەگەڵ پێنج سوار لە ناکاو بەرەو لای ئێمە هاورد و ئەو شوێنەیان لە دەسەلاتی ئێمەدەرهێنا و دووبارە ڕۆیشتین بۆ شار.

پارەمان دا و جوابمان گرت و شوێنەکەمان داگیر کرد. بەڵام ڕەقیبەکەمان دووبارە ڕویشت و پارەی دا و حوکمی ئێمەی پووچ کردەوە.

جارێکی‌تر ئێمەیان دەرکرد. ئێمەیش بیرمان کردەوە کە سێ بەرانبەر پووڵمان داوە بە قازی و هێزەکان ئەگەر دیسان بڕۆین هەر بەم جۆرەیە. بەم بۆنەوە بە ناچاری چاومان لێ پۆشی. ئەوەشمان کە هەتا ئیستا پێک هێنا بوو، بردیان.

حەسەن خانیش بە هەمووی ئەمانە گەواهی دا و گوتی کە ڕاستە. موحەممەدڕەزاخانیش لەسەر درووستی ئەمانە وتارێکی هێنا...[٢٣٠]»

نووسەر لە پاش باس کردنی زلم و زۆریَ کە لە حەسەن خان سەرۆکی قەراسۆرانەکان و هێزەکانی ئەوان لەڕێگادا ڕووی داوە؛ ئەڵێ کە حەسەن خان تاوانی کارەکەی خۆی و هاوڕییەکانی لە سەرۆکی کەلات گرتووە، بێ ئەوەی کەلات لەم کارەدا قازانجێکی بەرکەوتبێ جگە لەمە ئەبوا خەرجی ئەسیرکراوەکانیشی بدایات.

حەسەن‌خان دوای هاتنەوە بۆ مەشهەد، دووبارە حوکمی لە ئاسەفودەولە گرت و بۆ تالان کردنی خەلک ڕۆیشت بۆ کەلات و لە حاکمی کەلات ئەسپ و چەک ونەوکەر ئەگرێت تاکوو بە دوای تالانچیەکاندا بڕوات. خوالێخۆش بوو مەجدولئیسلام پێش لە ڕۆیشتنی حەسەن‌خان و سوارەکان لەو دەپرسێ کە :«بە ڕاستی خەیالت چیە؟ ئایا دەتەوێ لەم مەیدانەدا شەڕ بکەی و تالان‌چیەکان بگریت یا ئەوەی کە تەنیا کاتی خۆت تێپەر دەکەی؟» حەسەن‌خان ولامی دایەوە: «مەگەر ئێوە لە نێو گەوڕەکاندا نەبوون و یا نازانی کە ئەم پرسیارانە لەمن دەکەی؟» گوتم: لەوانەیە کە زۆرێک شت بێت کە من نەزانم، ئەبێ بپرسم تا بزانم. گوتی: من حوکمێکی تایبەتەم هەیە و بە پەلە حوکمێکی مۆرکراوی لە گیرفانی دەرهێنا و پیشانی دام. دەسکەوتی ئەو بەلگە ئەمە بوو: حەسەن‌خان لەسەر شانیەتی لە تەواوی خەلک بپرسێ ودەبێ هاودەستی و یاری تالانچیان بکەن یان بڕێک لە ماڵە دزیەتیەکان کە لە لایان پەیدا بێت، ئەبێ تاوان بدات و ماڵەکانیان وەربگرێتەوە. گوتم: من ئەمە نازانم چیە؟ خۆت کە بە ڕێوەبەری ئەم حوکمەی. پێم بلێ مانای چیە. لە وەلام دا زۆر پێکەنی و گوتی. ئەم حوکمە ئەڵێ کە من هەرچێ حەز بکەم دەتوانم بیکەم گوتم: ئەمە چیە ئەلێی؟ تۆ ئەمرت پێ کراوە دزەکان بگری یا هەر کەسێک کە شتێکی دزی بە لایەوە بوو پرسیاری لێ بکەی؟ تۆ چیتە بە ماڵی کەسەوە؟

دووبارە پێکەنینێکی درێژەداری کرد و گوتی: مەگەر بیرو هۆشت نەماوە یان گالتەم پێ دەکەی؟ من هەر بەم حوکمەوە دەتوانم تەواوی گەڕەکەکان کەلات و

[٢٣٠]- سەفەر نامەی کەلات. نووسراوەی مەجەد و لئیسلام- پێشەکی مەحموود خەلیل پوور لاپەڕەی ٢٠٦.

قووچانیش تـاڵان بکـەم. دووبـارە زۆرم پـێ سـەیربوو وگـوتم زۆرتـر بـۆم شـەرحی بدە.گوتی: من ئێستا بەرەوە کێوی هەزارمزگەوت کە شوێنی دزەکانە ئەگەر پێیـان نەگەم هەر لەو نزیکانە یانێ لەداوێنی کێوی هەزار مزگەوتدا کە بە هۆی سەرسـەوز بوونی لانی کەم دووسەد گەڕەک لـە تایفـەی جـەلایر و هـەزار بنەماڵـەی (کـورد) شێخوانلوو لەوێدا نیشتەجێن. لە هەر گەڕەکێک لانیکەم بەشێک لەماڵە دزراوەکـان هەیە. بۆ ئەوەی کە دزەکان ماڵی دزیـەتی لای خۆیـان دەیکـرن بـەم جـۆرە مـن تەواوی ملکەکانیان داگیر ئەکەم. بیانوویێکیترم هەیە، ئەویش کە ئێوە لە فـلان ڕۆژ یارمەتی دزەکانتان داوە و نان و قەن و چایی و مەڕتان بۆ بردوون و ئێستا ئەبێ تاوان بدەن.

گوتم: مەگەر ئەم بێچارانە بە حەز و مـەیلی خۆیـان یارمـەتی دزەکانیـان داوە؟ ئەبێ لە سەر ناچاریەوە بووبێت، ئێستا دەوڵەت بە جێگای ئەوەی کە خەسـاری داوە، کارەساتەکەی قەرەبوو بکاتەوە و تاوان بدات. وڵامی دایەوە: ڕەحمـەت لـە باوکـت! مەبەست بیانووە، ئێستا هەربیانوویێک بێت.

بـەم مەبەسـتەوە حەسـەنخـان لەگـەڵ سـوارەکانی خـۆی بـەرەو کێـوی هەزارمزگەوت ڕۆیشت و لە ڕۆژی پێنجەمدا یەکێ بە حـاکمی کـەلات بـەم جـۆرە ڕاپۆرتیدا: شەوی هەوەڵ لە فلان جێگا بووین و بەیانی ڕوو بـەکێوی هەزارمزگـەوت ڕێ کەوتین، لە هاتنی ئێمە ئاگادار بـوون و ڕایـانکرد. حەسـەنخـانیش بـە چـاکی نەیدەزانی کە بە دوایانـدا بـڕوات، هێرشـی کـردە سـەر شـوێنی حەسـانەوەکەیان و چەندانە لە ڕیش سپیەکانیان ئەسیر کرد و ئازاریاندا و چـەن کەسێکیـشی شـەلاخ دا. بەم بۆنەوە کە ئێوە لە بەرچی لەگەڵ دزەکان بەشداریتان کردووە و نان و ئاوتـان پێ داون. ئەوانیش هاواریان دەکرد کە ئێمە ناچار بووین و هەڕەشەی مـەرگیان لـێ دەکردن، دەسکەوتی نەبوو. حەسەنخـان بـانگی کـرد کـە ژنـەکان دڵـنیا بـوون و هەواڵیان دا بە پیاوەکانیان. ئەوانیش گەڕانەوە و لەگەڵ حەسەنخان دەسـتیان کـرد بە لێکۆڵینەوە و گوتیان و بیستیان و تا ئـەوەی کـە لـە ئاکامـدا بـڕیاردرا کـە تـاوان بدەن[٢٣١] و لە هەر گەڕەکێک لەو دەوروبەرەدا، پوولێکیان بە ناوی «ئەیاڵەتی کـوبرا»

---

[٢٣١]- بڕێک لە ژاندارمەکانی سەردەمی پەهلەوی کارانێکی زۆر نابارتر وبێ شەرمانەتریان لەمە هـەبوو

و کەمێکیش بۆ «سەرۆکی گەورە» و بڕێکیش بۆ «ئوردووی بە شکۆ دانرا و سەرجەم ٣٠٠ تمەن بۆ پێشکەشی ئاسەفودەولە پێک هات و سەد تمەنیش بۆ حەسەن سەرداری و هەر پێنج تمەن بۆ سوارێک دانرا»[٢٣٢]

خەڵکی ئێران بە تایبەت خوراسانیەکان لە ئاسەفودەولە میحنەتی زۆریان دیوە.[٢٣٣] حاجی غولامڕەزا شاهسەوەن لە تورکەکانی ئینانلوو، کوڕی حسەین‌خانی شەهابولمولکی چاپارباشی. ئەمیری تۆپخانەش کە لە ساڵی ١٣١٣ی کۆچی مانگی بە نازناوی ئاسەفودەولە ناسراوە. لە ساڵی ١٢٩٢ حکوومەتی کرماشانیان پێ‌داوە. لە دەورووبەری ساڵی ١٢٩٥ی کۆچی مانگی بە نازناوی میراتی شەهابولمولک چوو بۆ کرمان کە لەوێدا حکوومەت بکات. نازمولئیسلامی‌کرمانی لە سەردەمی سەرۆکایەتی ئەو لە کرمان دەنووسی: «چەن ساڵ لەمەو پێش لە کرمان کەسێک چوو بۆ لای ئاسەفودەولە... گوتی: ئاغای سەرۆک، هیچ کاتێک بایی یەک مەن ماس لە پێنج شایی لە کرمان زیاتر نەبووە، لە دەولەتی ئێوەدا (کە ماڵیات کەوتووەتە سەرشانی بازاڕیەکان) نرخی چارەکێک ڕۆن پێنج شایی. خێرا ئەمیر تووڕە بوو و حوکمی کرد کە سەری ئەو بێچارە ببڕن بۆ ئەوەی کە فزوولی کردووەو...

بە بۆنەی ئەم کارانەوە کڕین و هەڵگرتنی گەنم و پێویستیەکانی هاتنی وشکەساڵی لە کرمان، خەڵکی ناڕەزایەتی خۆیان لەو دەربڕی و دەولەت بە ناچار ئەوی لابرد. دوای ماوەیێک بە حکوومەتی مازەندەران گەیشت،بەلام لە ئەوێش لابرا.

ئاغەی سەعادەت‌نووری هێناویە کە: «ناسرەدین‌شا کوڕێکی لە زینەتوسەڵتەنە کچی حەسەن‌خانی سالار بووە بە ناوی نەسرەتودین‌میرزا سالاروسەڵتەنە کە لە ١٣

---

کە لە جێگای خۆی شایانی باس کردنە و باسی لێ دەکرێ.

[٢٣٢]- سەفەرنامەی کەلات. مەجدوئیسلام.

[٢٣٣]- ئاسەفودەولەکانی‌تر، ئەڵلاهیارخانی ئاسەفودەولەی قاجار بابی حەسەن سالار بوو کە فیتنە و شەڕی خوراسان و جیایی خستن لە نێوان ئەمیرەکانی زەعفەرانلوو و شادلوو وەرگرتنی کەڵکی سیاسی لەم سیاسەتە ناشیرینەی ئەو لە بەرگی هەوەڵی ئەم کتێبە لە چاپ دراوە. ئاسەفودەولەی دووهەم میرزا عەبدولوەهاب خانی شیرازی بوو کە لە شەوالی ١٣٠١ حکوومەتی خوراسانی گرتەدەس و دوو ساڵ و نیو حکوومەتی ئەو وەها خەڵکی خستە نێو ناخۆشی و ناڕەزایەتی کە ناگوترێتەوە ...

جەمادیوسسانی ١٣٩٩ لەدایک بووە. شا چەن مانگێک پێش لە مەرگی لە ساڵی ١٣١٣ بە بیری پێکهێنانی ژیانی دوارۆژگار بۆ کوڕەکەی کەوت و ویستی کارێکی باش بۆ کوڕەکەی پەیدا بکات و بەڵام بە بۆنەی کارە خراپەکانی جەددی دایکی سالاروسەڵتەنە (یانێ حەسەن‌خانی سالار کوڕی ئیلاهیارخانی ئاسەفودەوڵە) کە لە خوراسان ڕووی دابوو، ئەویان کرد بە سەرۆکی خوراسان و حاجی‌غولامڕەزاخانی شەهابولمەلیکی بە ژێردەستەی ئەو کرد. حاج غولامڕەزا دوای گەیشتن بەم پلەوپایە، ناسرا بە ئاسەفودەوڵە... ئاسەفودەوڵە پارەیێکی بە ڕەسمی پێشکەشی دا بە ناسرەدین‌شا، باغی‌قەیسەرییەی تەجریش کە یەکێ لە مڵکەکانی خۆیەتی دای بە میرزاعەلی‌ئەسغەرخانی ئەتابەک (سەرۆکی پایەبەرز) و ڕۆیشت بۆ خوراسان...[٢٣٤]»

ڕۆشنە کە ئەم هەموو بەرتیلە بۆ حکوومەتی خوراسان ئەدات ، چ‌کارەساتێک بە سەرخەڵک دەردەهێنی. دوای ئەمەی‌کە غولامڕەزاخانی ئاسەفودەوڵە باری خۆی لە خوراسان بەست و خەڵکی خستە نێو فەقیری و بێچارەیی، لە خوراسان گێڕایانەوە و دووبارە حکوومەتی کرمان و سیستان درا بە دەستی ئەو. لە ئاکامدا خەڵکی کرمان بە تایبەت سیرجانیەکان بەرانبەری وەستان و لە کرمان دەریان کرد.

ئاسەفودەوڵە لە تاران بوو بە وەزیر و سەرۆکی پایتەخت و بە ناوی چاودێری گەلەکان و عەشیرەکان ناسرا کە لە ئەنجامدا خەڵکی تاران بەرانبەری وەستان ولە ساڵی١٣٢٠ی کۆچی مانگی بوو بە سەرۆکی ئەیالاتی فارس، بەڵام سێ-چوار مانگ دوای ئەوە گەڕاندیانەوە بۆ تاران و ماوەیێک ئەم بەر و ئەوبەری کرد و بەرتیلی بەم و ئەودا. بۆ ئەوەی کە هەم دیسان حکوومەتی خوراسان و سیستان بگرێتەوە؛ لە ساڵی١٣٢٢ بۆ چەندەمین جار چوو بۆ خوراسان تاکوو باشتر چاری ئەو خەڵکە بکات کە ئەمیر حسەین‌خان دیارەکەیانی بە جێ هێشتبوو. ئاغەی حسەین سەعادەت نووری لە شەرحی حاڵی ئەم خراپکارە لە خوراسان و ئەوەی کە چۆن خەڵکی بە نوقرە داخ ئەکرد، ئەڵێ[٢٣٥]:

«ئاسەفودەوڵە بە یارمەتی ئەزموونەکانی پێشووی خۆی، خەڵکی خوراسان و

---

[٢٣٤]- گۆڤاری یەغما- گولانی ٤٢- نووسینی حوسەین سەعادەت نووری.

[٢٣٥]- مێژووی ئاگاداری ئێرانیەکان- نازموئیسلامی کرمانی- لاپەرەی٣٣٣- گۆڤاری یەغما- پووشپەڕی١٣٤٢- نووسینی ئاغەی سەعادەت نووری.

ماڵیات دەرەکانی خستە ژێر ئازار و ئەشکەنجە، تاکوو بتوانێ خواستەکانی دەوڵەت و مووچەی مووچەخوەرەکان بگرێت. گرتنی ئەم ڕێگایە و بەڕێوەبردنی ئەم ویستە نە تەنیا مووچەگیرەکانی ڕازی نەکرد، بەڵکوو بڕێک لەوانەی تووشی خەسارбوون، بەرانبەر ئەوەستاند»

شێخ موحەممەدنازمولئیسلامی کرمانی دەنووسێ: ئاسەفودەولە خۆی بە ئایینی لەقەڵەم ئەدا و ڕیشی نەئەتاشی و لە خواردنەوە ئەلکولیەکان دووری ئەگرت، بەڵام وانەبوو و بڕێک کاری ناپاکی ئەکرد. لە هەر جێگاییێک کە حکوومەتی بکردبایات گەنم و خەرمانی کشت و کاڵی خەڵک دەیکڕی و بە پووڵێکی کەم لەوانی ئەسەند و دوای ماوەییێک بە نرخی گران دەیفرۆشت.

هەر بەم بۆنەوە لە سەردەمی دەسەڵاتداری ئەودا لە خوراسان (مەشهەد) شۆڕش کرا... پەرە سەندنی زڵمی ئاسەفودەولە لەم کارەدا وەها بوو کە ئازادیخوازانی تارانی سەر سوور مان و دەست درێژیەکانی سەرۆکی خوراسان و کارە زاڵمانە و ناشیرینەکانی ئەو لە مەجلیسەکانی پایتەخت باسی لێ دەکرا. ئەڵێن: ڕەعیەتەکانی قووچان بە بۆنەی گوشار و زۆری هێزەکانی ئاسەفودەولە ئەوەندە زۆریان بۆ هاتبوو کە بە ناچارکچە بچووکەکانیان بە نرخی کەم بە تورکەمانەکان دەفرۆشت تاکوو بتوانن ویستەکانی سەرۆکی زاڵمیان بەدی بێنن و ماڵیاتەکانیان بدەن.

خوالێخۆش بوو مەلکوشوعەرای بەهاری خوراسانی لە قەسیدەییێک بۆ موزەفەرەدین شا لەم بارەیەوە دەنووسێ:

«ڕوو بکە خەبووشان کە ناڵەی هەزار دایک و کچ لەوێ ئەبینی کە ژن بۆ دووری شوو و شوو بۆ دووری ژنی چۆن دەناڵێن و دەگرین»[٢٣٦]

سەیەدحەسەنی تەقیزادە بڕوای ئەوەیە کە دەستدرێژیەکانی ئاسەفودەولە سەرۆکی خوراسان و هەروەها جەورەکانی سالاری موفەخخەم سەرۆکی بجنوورد و جێگای فرۆشتنی کچ لە قووچان بە تووکەمانەکان بوو کە خەڵکی ئێرانی لە بەرانبەر جەوردا هاندابوو و بوو بە هۆی شۆڕشی (مەشرووتیە)...

---

[٢٣٦]- گۆڤاریەغما- ساڵی ١٣٤٢- ژمارەی ١٨٠- لاپەڕەی ١٨٠.

لــــه دانیـــــشتنی ڕۆژی ســــێشـــەممه هەوەڵــــی زیقەعـــدەی ١٣٢٤ ئەنجومەنینەتــەوەیی، ســەید موحەممــەد تــەقی هــەراتی پــارێزەری بازاڕیــەکان، بەڵگەبێکی کــه موحەقێقودەوڵــه (مێرزاعەبدولـڵاخان) هەڵــبژاردەی تاجرەکــان لــه بارەی دەست درێژیەکانی ئاسەفودەوڵــه و فرۆشــتنی کچــەکانی قووچــان نوســیبوو خوێندیەوە. دوای میرزا ئەبولحەسەن‌خان نوێنەری فارس گوتی که ئەم بابەته دەبــێ له سەری باس بکرێ و له وەزیری ناوەخۆ دەبێ پرسیار بکرێــت. تــەقی زاده ئەڵــێ. بەم جۆره که وترا شــکێ نیــه کــه ئاسەفودەوڵــه کەســێکی زاڵــم و خراپــه و دەبــێ بێ‌دەسەڵات بکرێ.[٢٣٧] هەر لەو ماوەدا هەواڵ گەیشت که ئاسەفودەوڵه لــه دروســت بــوونی نەنجومــەنی نــوززار لەمەشــهەد بــەرگیری کــردووە. هــەر بــەم بۆنــەوە لــه کۆبوونەوەی پێنجشەممه (٢ی) زی‌حەجەی ١٣٢٤ هەم دیسان بابەتی ئاسەفودەوڵــه و خراپــەکان و دەســت درێژیــەکانی ئــەو لەســەری بــاس کــرا. موحەقێقودەوڵــه و تەقی‌زاده و سەییەدتەباتەبایی (یەکێ له سەرۆکانی مەشرووته) ویــەکێک لەنوێنــەران لابردنی حاکمی خوراسانی به بیر هێنایەوە...

وەزیری ناوخۆ له وەلامدا گوتی: به قسەی خەڵــک، دەوڵــەت ناتوانــێ پیــاوانی خۆی بانگ بکات و سزایان بدات، دەبــێ بەڵــگەیان بێــت لەوانەیــه خەڵــک بیانــەوێ بنکەی نەتەوەیی درووست بکەن و ئاژاوه ڕێک‌بخەن، سەرۆک بەری گرتبێت.

دوای چەن ڕۆژ... نوێنەرەکان هەم‌دیسان بابەتی فرۆشتنی کچەکانیان هــاوردە پێشەوە و گوتیان: دەبێ کچانێ که لەلای تورکەکان ئەسیرن بێنــەوە بــۆ قووچــان و ئاسەفیش دەبێ له پلەو پایەی خۆی بێته خوار و بۆ کاره ناشیرینەکانی تاوان بــدات و سزا بدرێت.

هەوڵی ئەندامی دەوڵەت بۆ له سەرکار مانەوەی «ئاسەفودەوڵــه» لــه خوراســان بێ‌دەسکەوت ماوە و له ئەنجامدا ناوبراو له سەرەتای ساڵــی ١٣٢٥ کــۆچی بــه هــۆی زۆرکردنی نوێنەران لابرا و گەڕایەوە بۆ تاران. هەڵــبژاردەکان بــه لابــردنی ئــەو ڕازی نەبوون و باسی فرۆشتنی کچەکانی قووچانیان گرتەبەر. هەر لەم ماوەدا تلگرافــێ لــه لایەن‌ئێرانیەکانی عێشق ئاوا گەیشته مەجلێس: «ئێمه به چاوی خۆمــان دیمــان‌کــه

---

[٢٣٧]- وت‌وویژەکانی مەجلێس- خولی هەوەڵ- لاپەڕی ٩٥.

کچە قووچانیەکان وەکوو مەڕ لە عەشقئاوا دەیانفرۆشتە تورکەمانەکان و کەسێ نەبوو کە بە هاواریان بگات.»

لە پاش خۆیندنەوەی ئەم تلگرافە مەجلیس شێوا و لە کۆبوونەوەی ١٣ی ١٣٢٥ میرزا مەحموود خانی کتیب فرۆش گوتی:

«باس دوانە؛ یەک ئەمە کە پار لە خوراسان کولەکان زەوی و زاریان خوارد و حاسلێک نەبوو. خەلک بۆ شایان نوسیبوو کە بە هاواریان بگات و پاشا گوتی: چاودێر بنێرن. عەینودەولە (سەرۆکی لە خۆڕازی) گوێ نەدا و هاوبەشەکانی زۆریان هێناوە و داوای مالیاتیان کرد و خەلکیش بە ناچار کچەکانیان فرۆشت بە تورکەمانەکان. یەکێکیتر ئەوەیە کە سالار موفەخەم بجنووردی بە وەرگرتنی پارەیێکی سالانە ئەمری پێکرا بوو کە لە هێرشی تورکەمانەکان بەرگیری بکات. ئاسەفودەولە ئەو پارەی لێیان بڕی. سالار موفەخەمیش تورکەمانەکانی هاندا و ئەوانیش هێرشیان کردە سەر قووچان و دوای کوشتن و تالان، شەش کەس لە ژن و کچیان ئەسیرکرد و بۆ فرۆش بردیان بۆ عەشق ئاوا»

لە پاش وتاری ئەو ، نوێنەران باسی ئەوەیان کرد کە ئاسەفودەولە دەبێ سزا بکرێت. دوای ماوەیێک هەمدیسان ئەنجومەن باسی ئەسیرکردنی کچەکانی هاوردە پێش و سزا کردن و تاوان دانی ئاسەفودەولەی بە بیر هێنایەوە. ڕۆژنامەی سووری ئیسرافیل وتارێکی بە شێوەی شانۆ نووسی و شێعرانێکی لە زمانی کچانی قووچان لە چاپ دا: «هەڤدە و هەژدە و نۆزدە و بیس، خوایا کێ لە بیر ئێمەس!؟»

تەقیزادە دەنووسێ: «ئەنجومەن نزیک بە یەک سال ئەم کارەی (باس لە سەر فرۆشتنی کچە قووچانیەکان) دوا گرت و تەواوی و هێزی خۆی بۆ سزادانی تاوانبارەکان بە کار هێنا. تا ئەوەی کە سالارموفەخەم چوو بۆ دیوانی دادخوازی لە وەزارەت، سەرۆک بە تەمەننای ئەو گرۆپێکی ٦ کەسی هەلبژارد. گرووپەکەی دادگای بالا کە لە نێوانیاندا تەقی و وەکیلۆتوجاری گیلان و چەن کەس لەنوێنەری بازاریەکان بوون. ئاسەفودەولە و ئەمیری ئەعزەم سەرۆکی ئەسترئاباد و سەردار موفەخەمیلاریجانی و ئەوانەیتریان بانگ کرد بۆ مەحکەمە و زۆرێک نزیک بە یەک مانگ لەسەر ئەو باسە چوون و لە ئاکامدا حوکم درا کە سالار موفەخەم پێنج سال

زیندان بکرێت.»[٢٣٨]

موحەممەد عەلی شا لەم بەسەرهاتە (کە بە زیانی دەوڵەت بوو) زۆر نارەحەت و تووڕە بوو و وای لێ هاتبوو کە حەزی نەدەکرد ئاسەفودەولە بێت بۆ دادخانە بۆ شایەتی و شەرحی ئەم بەسەرهاتە. عەبدولحوسەین میرزا فەرمانبەری وەزیری دادخوازی و بە ئیشارەی شا لە ئاسەفودەولە پشتیوانی دەکرد و کووششی ئەوە بوو کە ئەو لە تاوانەکانی پاک ببێتەوە و هەر بەم بۆنەوە تەقی زادە لە ئەنجومەن بەسەروەری دادخوازی دەنگی هەڵگرت. باسی دادگایی کردنی موفەخەم و ئاسەفودەوڵە لە ڕۆژنامەکانی حەبلولمەتین و مەجلیس بۆ ئاگاداری خەڵک لە چاپ درا.

## عەبدوڕەزاخانی شوجاعودەوڵە سەرۆکی زەعفەرانلوو

عەبدوڕەزاخان کوڕی ئەبولحەسەن خانی میرپەنجە و کوڕەزای ئەمیرحەسەنخانی شوجاعودەوڵەیە کە لە سەردەمی حکوومەتی مامۆی، موحەممەدناسرخانی شوجاعودەوڵە بە ناوی نایبولحکوومە، حکوومەتی شیروان بە دەستی بوو. دوای مردنی موحەممەد ناسر خان لە سالی ١٣٢٠ی کۆچی مانگی بە دانی بەرتیلێکی زۆر بە هێزەکانی دەوڵەت بە سەرۆکایەتی گەیشت و بە نازناوی شوجاعودەوڵە ناسرا بەڵام بۆنێکی لە دلاوەری پێوە نەبوو. ئەو تا سالی ١٣٣٨کۆچی کە لە گرتووگەی قەواموسەڵتەنە کۆچی دوایی کرد، نەخۆش و بەدحاڵ لە قووچان بوو. ئەم کارە بوو بە هۆی ئەوە کە جاربەجارێ کاربەدەستانی دەوڵەت بۆ گرتنی پارە لە ئەو، لە سەرۆکی حکوومەت لایببەن و کەسێکیتر بنێنە جیگای ئەو. تاکوو ئەو ناچار زۆر بێنێت بۆ هەژارو فەقیر و مالیاتێکی زۆریان لێ وەربگرێت بۆ ئەوەی کە ئەو بتوانێ دووبارە حکوومەت بگرێ بە دەستەوە. بە وتەی لورد کەرزەن پیاوی بە سیاسەتی ئینگلیز: جێگیرەکانی، ناسر حوسەین خان نەیانتوانی هێزی خۆیان بپارێزن و بوون بەگاڵتەجاڕی کاربەدەستانی دەوڵەت. ئەوان خەریکی کارانی ناشایست و شەراب خۆر و تریاکی بوون و سروشتی کاربەدەستی و دلاوەرییان

[٢٣٨]- مێژووی کە سرەوی- لاپەڕی ٤٨٠- بەرگی یەکەم.

لەدەست دابوو و بە دروست کردنی شوێنی خراپ و جێگای بەزم و شادی بوون بە هۆی لەدەست دانی پشتیوانی ئیلەکە لە خۆیان.

بەوتەی خوالێخۆش بوو مێهدی بامداد نووسەری کێتبی «مێژووی پیاوانی ئێران»:دەسکەوت بوو بەوەی کە سەرۆکەکانی زەعفەرانلوو کە یەکێ لە گرنگترین پیاوەکانی خوراسان و یەکێ لە سنوورەوانە چاکەکانی ئێران بوون بەڵام بە بۆنەی ئەم کارە ناشیرینانە یانێ مەشرووبخۆری و تریاک کێشان لەبەین چوون و هیچ ناوێکیان لێ نەماوە.[٢٣٩]»

خوا هەرکاتێک بیەوێ بنەماڵەیەک لەبەین ببا، هەوەڵ ئەو شتانەی کە پێوستە پێکی ئەهێنێ. ئەبولحەسەنخان دەکوژرێت، ئەمیر حوسەین خان لە ئەسپ ئەکەوێتە خوار، بوومەلەرزە قووچان خاپوور ئەکات و خەڵک لەبەین ئەبات و موحەممەدناسرخان بێمنداڵ کۆچی دوایی دەکات و ئەم جارە بۆ سەراوژێر بوونی بنەماڵەی زەعفەرانلوو کوڕێک وەکوو عەبدولڕەزاخان دەمێنێت کە لە سەردەمی ئەودا کوردەکانی خوراسان زۆر تووشی ناخۆشی و هەڕەشە بوون [بەدەستی حکوومەتی قاجار] و بنەمای کولتووری نەتەوەی خۆیانیان لە دەستدا. بە وتەی: الناس علی دین مکوهم عەبدوڕەزاخان لە ترسنۆکی و کەم کاریدا دەستکەمێکی لە موزەففەرەدینشا نەبوو، لەبڕێک شتدا وەکوو دانانی شوێنانی خراپ وەکوو ناسرەدینشا کاری دەکرد. هەر بەو شێوە، ناسرەدینشا کاتێک لە ئوروووپا هاتەوە، مانگاییێکی بۆ ئێرانیەکان هێناوە، بەڵام نە بۆ ئێرانیەکان، بەڵکوو بۆ خۆرازی کردنی خۆی، تاکوو لە ناو کەشتیەکەدا شیری تازە بخوات. عەبدوڕەزاخان کاتێک ڕۆیشت بۆ پایتەخت دڵی چووە سەر ژنێکی گۆرانی وێژ و کردی بە هاوسەری خۆی و هێنایەوە بۆ قووچان و نازناوی (سەماعحوزووری) پێدا و ئەمە هەوەڵین هۆی سەرکەوتنی خەڵکی قووچان بوو کە لە پایتەختەوە هێنابوویان.

ئێستا لەم باوکە بە هێزە و لەم ژنە بێ وێنە (سەماع حوزوور) چ کوڕێک لە دایک ئەبێت کە هۆشیاری خەڵکی قووچان و گەلەکان و عەشایری زەعفەرانلوو بێت.

---

[٢٣٩]- مێژووز پیاوانی ئێران- بامداد- بەرگی یەکەم- لاپەڕی ٣١٩.

## ئەسیر بوونی کچەکوردەکانی قووچان ودەنگدانەوەی ئەم کارە لە دنیا

وتراکە لە دوای کۆچی‌دوایی«موحەممەد ناسرخان» برازاکەی «عەبدوڕەزاخان» بە شێوەیکی لارو نەخۆش سەرۆکایەتی میراتی باوکانی خۆی گرتە دەست و خەڵکیش هەروەها کە ڕەسم بوو سەرۆکایەتی ئەویان قەبوول کردو چوونە ژێردەستی ئەو، جگە لەوەش وادیارە هیچ چارەیێکیان نەبووە. حکوومەتی میراتی«بوجنووردیش دوای یارموحەممەدخانی سەهامودەولە درایە کوڕەکەی عەزیزوڵلاخانی سالار موفەخەم(سەرۆکی خۆشەویستی دوایی). بەڵام عەزیزوڵلاخان وەکوو عەبدوڕەزاخان لێ‌نەهاتوو نەبوو، بەڵکوو هێشتا حکوومەتی خوراسانی قەبوول نەبوو. لەئاوا کاتێکدا دەوروبەری ساڵی١٣٢٢ی کۆچی مانگی بوو، غوڵامڕەزا ئاسەفودەڵە لە خراپکارەکان و تالانکەرەکانی بەئەزموون وکۆنەکار بوو، بۆ جاری دووهەم بوو بە سەرۆکی خوراسان و بە جێگای شازادە ڕوکنودەولە- سەرۆکی پێشوو -نیشت ئەو پارەیێکی زۆری بە دەوڵەت و هێزەکانی دابوو وئێستا بۆ تالانکردنی خەڵکی خوراسان هاتبوون بۆ مەشهەد و دەبوای چەن بەرابەری پارەیێک کە داویانە لە خەڵکی بگرنەوە.

ئاسەفودەولە بۆ ئەمەی کە لە عەزیزوڵلاخان حەقێک بکاتەوە، لە پێش دایارمەتییێک کە بۆ هێزەکانی بجنووردی کە بۆ پاراستنی سنوورەکان و بەرگیری لە هێرشی تورکەمانەکان دانرابوون، لە ئەوانی بڕی وکردیە گیرفانی خۆی. پاشان عەبدوڕەزاخانی شوجاعودەولەی سەرۆکی لابرد وکوڕەکەی خۆی ئەمیرحوسەین‌خانی کە لە تالان کردن و ناپیاوەتی وەکوو باوکی بوو، کردی بە سەرۆکی حکوومەتی قووچان و ئەمە هەوەڵ جار بوو لە مێژووی کوردەکاندا کە پارێزگاری خوراسان دەیتوانی سەرۆکی ئیلی زەعفەرانلوو لە سەرۆکایەتی لابات، خۆی بە سەر سەرۆکی قووچاندا بسەلمێنێ. هەروەها ژێردەستە بوونی قووچانیەکان دەستی پێ کرد. لە کاتی ڕۆیشتی ئەمیرحوسەین‌خانی ئاسەفودەولە، مەلێکو شوعەرای بەهار بەندنامەیێکی بەم جۆرە بۆی گوتووە:

١- سەرسەوزوخۆش بێ سنوورەکانی خەبووشان- هیچ دڵێک لە جەوروستەم خەمین نەبێ.

٢- ئەگەرچی خەڵکی خەبووشان زۆر هەوچی بوون- بەڵام لەمەو بەدوا دەبینی کە چەن بێدەنگن.

٣- لەمەو بەدوا دەبێ کەسێکی لایەق خەبووشان بگرێ بە دەستەوە تاکوو خەڵکی خەبووشان ئاژاوە ڕێک نەخەن.

٤- بۆ ئەوەی کە ئەمانە دەنگ هەڵنەبڕن، دەبێ هەرچی بۆ خۆیان خۆشە یان ناخۆشە، بە لایەنی ئەوانیشی بزانن.[٢٤٠]

ئەمیر حوسەین‌خانی ئاسەفودەولە لە پاش گەیشتن بە قووچان، لەوە دڵنیا بوو کە باوکی پشتی دەگرێت، هەر بەم بۆنەوە دەستی کرد بە لێدان‌و ئازاری خەڵکی. سەرۆکانی کوردی قووچانی، ئەسیر و زیندانی کرد و مڵکەکانی ئەوانی بە تاڵان دا و زۆرێک ماڵیاتی بۆ گرتن. لەگەڵ تورکان ئاغا خوشکی عەبدوڕەزاخانی شوجاعودەولە زەماوەندی کرد، ئەمە بۆ کوردەکانی خوراسان زۆر ناخۆشە کە خوشکی سەرۆکی ئیلی زەعفەرانلوو لە باوەشی دوژمن بێت.[٢٤١]

خەڵکی قووچان کە هێزی بەرانبەری لەگەڵ ئەم ناخۆشیانەیان نەبوو، چوون بۆ تلگرافخانە و داوایان کرد لە ئەمینوسوڵتان کە ئاسەفودەولە لابات و عەبدوڕەزاخانی شوجاعودەولە بکات بە جێگری ئەو، لەم ماوەدا عەبدوڕەزاخان چوو بوو بۆ بجنوورد تاکوو لە پێشەوای بجنووردی داوای یارمەتی بکات، بۆ ئەوەی کە سەرۆکەکانی شادلوو وزەعفەرانلوو جگە لە خزمایەتی نەتەوەیی، خزمایەتی بنەماڵەییشیان پێکەوە بوو. عەزیزوڵلاخانی سالاری موفەخەم ناسراو بە -پێشەوای بجنووردی- خۆی بە شوێن بیانوویێک دەگەڕا تا لە ئاسەفودەولەی خوراسان حەقێک بکاتەوە و ئەو حەقەی کە لێیان‌سەندبوو، وەری بگرێتەو. لەکۆبوونەوەی باس کردن لەگەڵ

---

[٢٤٠]- دیوانی مەلکوشوعەرای بەهار- بەرگی یەکەم- لاپەڕەی١٧- لەم چاپەدا بە هەڵە ئەمیر حوسەین خانی ئاسەفودەولە، ئەمیر حوسەین‌خانی شوجاعۆدەولە نوسراوە.

[٢٤١]- تورکان ئاغا بەم بۆنەوە کە لەم زەماوەندە منداڵێکی دەست نەکەوت، زانی کە منداڵی نابێ و بە ناچار لە ئاسەفودەولە جیا بوو و بوو بە ژنی ئایەتوڵڵا قومی[برای ئایەتوڵڵا قومی ئێستا] و بەخەرجی خۆی نەردەی دەوری ئارامگای شاعەبدولعەزیمی لە شاری ڕەی درووست کردو گۆڕێکیشی بۆ خۆی لەوێ دانا کە دەوروبەری ساڵی١٣٦٠ ی هەتاوی یانی٥-٦ ساڵ لەمەوپێش کۆچی دوایی کرد و بڕێک ماڵی میراتی بە جێ هێشتبوو بۆ منداڵەزاکانی براکەی، عەبدوڕەزاخانی شوجاعودەولە کە لەو ملکە زۆر کەڵکیان وەرگرت.

عەبدوڕەزاخان مەبەستێکی زۆر خراپی پێش گرتبوو کە دووکەڵەکەی ئەم ئاورە بە چاوی خەڵکی بێچارە بە تایبەت ژنان و منداڵان دەڕیشت. ئەوان کەڵەکێکیان چنی و بەڕێوەیان برد کە زۆرتر کارێکی منداڵانە بوو، لە ئاکامدا بوو بە هۆی خراپ بوونی ناوی بنەماڵەکەیان. بەم جۆرە سالار موفەخەم هەواڵی نارد بۆ تورکەمانەکانی یەمووت کە لە باکووری گودی کاووس نیشتەجێ بوون وگوتی کە من لەمەو بەدوا بە دزیەتی و تاڵان کردنی ئێوە هیچ کارێکم نیە و ئەگەر دەتوانن لەدەرەوەی دەورووبەری بجنووردەوە هێرش بەنە سەر قووچان و تاڵانیان بکەن. تورکەمانەکان کە ئەمەیان بە موژدەیێک لە لایەن خوداوە دەزانی، لەم هەواڵە خۆشە خۆشحاڵ بوون و دایان لە ساز و دەهۆڵ و هێزەکانیان کۆکردەوە و بە مەبەستی هێرشی شەوانە بۆ دێهاتەکانی نزیک بە سنوورەکانی قووچان ڕێکەوتن و لەگەڵ ڕەد بوون لە سنووری کێوەکانی تالۆ[TaLo] و دۆڵی(ئەلئەمان) و دەشتی(خەرتووتی وەراز) کە هەموو لە بەشەکانی بجنوورد بوون، لە شوێنی(قتلیش) چوونە دەشتی(قورووق) و بەرەو دێهاتی- جنگا- ڕێکەوتن و دەمەو بەیانی چواردەی ڕەمەزانی ساڵی١٣٢٣ کۆچی مانگی بەرانبەر ٢٠ی گەلاڕێزانی١٢٨٤ هەتاوی و١١ نوەمبری١٩٠٥ی زایینی هێرشیان کردە سەر شوێنی کوردەکانی «باشکانلوو» (باچیانلوو- باچوانلوو). دەنگی گولە و تفەنگ و ئەسیر کردن و هەراوبەزمی تورکە داگیرکەرەکان، دۆڵی تاریک و قووڵی«جنگای» دەیلەراندەوە. ژنان و منداڵان و پیرەکان کە بە هیوای سەرۆکی گەلەکانی خۆیان(سالار موفەخەم و شوجاعودەولە) خەویان لێ کەوتبوو، بە بیستنی دەنگی هەرا و بەزم و گرتن ولێدان لەخەو ڕاپەڕین، بەڵام هێشتا لەچادرەکان نەهاتبوونە دەرەوە کە چادرەکانیان بە سەریاندا ئاگردا. ژنەکان سەرسام و ترساو لە نێوان دووکان وئاوردا جلوبەرگەکەیان ئاوری گرتبوو و منداڵەکانیان بە کۆڵەوە ڕایان دەکرد، لە هەردەکەس، دووسێ کەس زیاتر نەیاندەتوانی ڕابکەن. و ئەوانیتریش بەدەستی تورکەمانەکان دەستگیر و ئەسیردەکران.

پیاوان تا هانووهوونیان کرد، بە گولەی دوژمن کوژران و لە ئاکامدا هەرچی هەبوو ونەبوو لەوهەڵمەتەدا بە تاڵان چوو و ئاوریان تێبەردا، نەگیان سالم مابوو، نە

ماڵ ، نە ناموس[٢٤٢] و دەستکەوتی ئەم چێشتە کە دەوڵەتی شاهەنشاهی ئێران لە شا و وەزیر و ئاسەفودەولە هەتا سالار موفەخەم و شوجاعودەولە بۆ خەڵکی بێچارە درووست کرابوو و دەرفەتی تۆڵەکردنەوەیان‌دا دەس تورکەمانە باوک مردووەکان. حەق‌کردنەوەی تورکەمانەکان لە ڕوودلوێک کە بە دەستووری ناسرەدین‌شا بە دەستی‌حەیدەر قولی خان و ئەمیر حوسەین‌خانی زەعفەرانلوو پێک‌هات، کە لە پەرتووکی یەکەمدا باس لە سەری‌کرا.

---

٢٤٢- لەوسەفەرەی کە لە ڕۆژی ٢١ی گوڵانی٦٦ کردم بۆ بجنوورد، هاوڕێانی ئێمە عەلی ڕەحمەتی قوردانلوو وکیان ڕەبانی دیرانلوو، هەواڵیان‌دا کە ئاغەی حاج عەباسعەلی باشکانلوو لە کوڕەکانی ئەم ئەسیرانە وا لە بجنووردا و نیشتە جێ بووە. هەر بەم بۆنەوە شەوێک چووین بۆ لایان. حاجی عەباسعەلی کە کوڕەکەی لە شەڕی ئێران و عێراقدا شەهید ببوو، زۆر ئاگایاری گرنگی پێمادان‌و گوتی: سەربنیە(سەر مەحەلە) ئاغەخان باوکی خوالێخۆش بوو، مورادخانی سەرە خسوویی بوو. یووسف و بیگلەریش برای ئاغاخان بوون. یەکێ هاوانەش قەمەر، باوکی من[حاجی عەباسعەلی٦٥ ساڵە]بوو. یەکێک‌تریشیان قەیخا عەلی لە دێهاتی ئاڵخان مەرەی تەکەمران بوو کە دوایی ڕۆیشت بۆ تاران و شکایەتی کردو بۆ ئەوەی کە چەن ساڵ لە تاران نیشتە جێ بوو، بە عەلی تارانی ناسرابوو. کاتێ تورکمانەکان هێرشیان بردە سەر چادرەکان، کوردەکان تەنیا تفەنگێک و سێ تیریان هەبوو. عەلیخان باشکانلوو بە ترێک دانەیک لە تورکمەنەکانی کوشت، تورکمانێکی‌تر عەلیخانی کوشت. حوجی خانم خوشکی عەلی خان تفەنگەکەی براکەی هەڵگرت و دای لە تورکەمانەکان.دانەی لە تورکمەنەکان تیرێکی داله پای(قاچی) حوجی خانم و ئەویش کەوت کە دوایی تا کوتایی عومری دەشەلیا. تورکەمانەکان هێریشان بردە سەر چادرەکان وژنە جوانەکەی باوکمیان بە منداڵێکەوە کە لە ئامێزی بوو ئەسیر کرد. حۆری دەسگیرانی ئاغەخان و ژن خوشکی[پەری خانم] نیتیان کە هەردووکیان کیج بوون، ئەسیر کرد، خوشکی بابم بە ناو بی‌بی خانم و زۆلەیخا خانم خوشکی یووسفیشیان کە ئەوانیش هەردووکیان گێج بوون، ئەسیر کرد.[یووسف هەر ئەوەیە کە دوایی لە لایەن باشکانلووەکان بۆ شکایەت دەڕوا بۆ تاران] حۆری و پەری کە لە مەراوەتەپە، بوونەوە، پاشان کە زەعفەرانلووەکان بە پێشەوایی وەلیخان قەرامانلوو و سەعادەت قولی خانی ئوغازی لە ساڵی١٣٠٤ی هەتاوی و هاودەستی هێزی ڕۆژهەڵاتی خوراسان لە ژێر فەرمانی ئەمیرجان و موحەممەدخان هێریشان بردە سەر تورکمەن سارا و تاوانبارە تاڵانچیەکانیان تێک‌دا، حۆری وپەریان لە ئەسیری دەرهێنا. دووژنی‌تریان کە لە تورکمەن سارا ڕایان کردبوو کە یەکێکیان خەڵکی سوێرەزا و ئەوتریان خەڵکی عەلی خان قەڵا بوو لە ئەسیری دەرهێنا. حاج عەباسعەلی لەبارەی باشکانلووەکانی ئێستاوە گوتی: لە سوێرەزاوە ٧٥ لە تۆکۆر حەوت بنەماڵە کە بنەماڵەی یووسفن، لە قەڵای جووق٢٠ بنەماڵە، لە داشلی قەڵا١٠بنەماڵە، لە سۆخسووی مورادخان کوڕی ئاغاخان٢٥ بنەماڵە کە لە سوێرەزا ڕۆیشتوون.

ئاگردانی ڕەشماڵەکان بە سەر ژن و مناڵەکان، جگە لە کارەساتی «کەربەلا» کە لە لایەن یەزیدیەکانەوە قەوما، لە مێژوودا وێنەی نەبووە. هەر چەند کە ڕووداوی کەربەلا لە ڕۆژدا قەوما و هەروەها بنەماڵەی ئیمام حوسەین «سڵاوی خودای لێ بێ» ئەو ڕووداوەیان لە پێش چاودا بوو و خۆیان بۆ ئەو کارەساتە ساز کردبوو، بەڵام بێچارە و چەوساوەکانی ئێمە لە خەودا بوون کە ئەم کارەساتەیان بە سەردا هات و لاو و پیاو و مناڵەکانیان لە خاک و خوێن کێشان و ڕەشماڵەکانیان سووزیا، دارونەداریان تالان کرا و ژن و مناڵەکانیان بە یەخسیری بران.

### هاواری لاوێکی کورد کە دەزگیرانەکەی دیلی تورکمانەکان ببوو:

گوترا کە لەو شەوە ناپیرۆزەدا، بیرێکی بەدفەڕ، لە مێشکێکی بەد یومن هەڵقولا بوو بە دەستی کەسگەلێکی نەحس و خوێنمژ لە هۆزی تورکمانەکان هێرشێکی توندیان بردە سەر ئەو کوردانەی نزیکی «جونگا» لە باکووری ئێران کە لە نێو ڕەشماڵەکانیاندا خەوتبوون.

پیاوەکانیان یا کوژران یا بریندار و یا دەرچوون و ژن و مناڵەکانیشیان دیلی زاڵمەکان بوون. ئەو زلهێزانەی کە ڕووی هەموو زوڵمکەرەکانی دونیایان سپی کرد، ئەم ڕووداوە کە بە هۆی نەزانکاری و نالایەقی عەبدوڕەزا خان کە یەکگرتوویی و پێکەوە بوونیان لە دەس درابوو، لە بیری هەموان ئاسەوارێکی خراپی بە جێ هێشتبوو، کە لەو ڕۆژەدا جگە لە نالین و هاوار هاوار و ڕو ڕو کردن و خوێندنی سترانگەلی دڵتەزێن لە پرسەی ئازیزەکانیان، هیچیان لە دەس نەدەهات.

سترانی «لێ یارێ» کە ئەمڕۆ وەک بەڵگەیەکی مێژوویی لە ئەدەبیاتی کرمانجی خوراسان خۆی ئەنوێنێ و جێگایەکی دیاریکراوی بۆ خۆی دیار کردووە، لەو ساتەوە تاکوو ئێستا لە کۆڕەکاندا دەخوێندرێتەوە و خەڵکی تێکەڵی خەم و ماتەم دەکا، لە سینگی پڕ لە داخی لاوێکی کرمانج هەڵقولاوە کە ئەویندار و دەزگیرانی ئازیزی لەم هێرشە ناپیرۆز دیلکرابوو لە بازاڕەکانی «بوخارا» و «خیێوە» فرۆشرا بوو.

بەهەمەن ئەو لاوە ئەویندارە کوردە، کە شوانی یەکێ لە ڕانەکانی «باچیانلوو» بووە دوای نیوەڕۆیەک کە بۆ بردنی تۆشە بۆ خۆی و دۆستەکانی بۆ ئوردووگاه

هاتبوو. دوای خواردنی نان و چایەکی بە پەلە، ئەو شتەی کە پێویست بوو خستیە ناو جانتایەک و لە پشتی کەرەکەیوە و سەگەکەیش بە دوای، لە نێو ڕەشماڵەکان دوور بووە. لە نێو ڕەشماڵەکاندا هەرچی بەملاو بەولا بە دوای گوڵنازی دەزگیرانی گەڕا، نەیدۆزیەوە و بە تەواوی ڕەنجا و داخدار بوو چوونکە ڕێگایەکی درێژ و پڕ هەوراز و نشێوی تێپەر کردبوو لە دۆستەکەیشی داوای کردبوو کە لە نۆبەی خۆی چاوپۆشی بکا ئیزن بەو بدا کە بۆ هاوردنی تۆشە بۆ ئوردووگا بچێت، بەڵکو بەم بۆنەوە هەر چەند دوورەوە بۆ جارێکیتر چاو لە دەزگیرانی ئازیزی بکا. بەڵام ئیمڕۆ بەهمەن هەرچی بەملاوبەولا گەڕا هیچ ئاسەوارێکی لە گوڵناز نەدۆزیەوە. شەرم و حەیای خۆی و داب و نەریتی هۆزەکەی ئەو ئیزنەی بەو نەدەدا کە لە کەسێکیتر هەواڵیێ بپرسێ.

ناچار بە دڵێکی پڕ لە کەسەرەوە و بێ هیچ دەسکەوتێ، لە حاڵێکدا هەر هەنگاوێکی هەڵدەگرت سەیری دوای دەکرد و چاوی پڕ لە فرمێسک ئەبوو. بەرەو ڕانەکە و شاخ دەڕۆیشت. ئەو کاتەی کە لە ئاخرین پێچی کەمەرەکەی ژوور ڕەشماڵەکان تێپەڕ دەبوو. بۆ دواهەمین جار سەیری نێو ڕەشماڵەکانی کرد و بەلام لە بالا وەک عەرعەری «گوڵنار» کە بە جلوبەرگی کرمانجیەوە وەکوو تاوسێکی ڕەنگاوڕەنگ بوو، هیچی نەدی و ئاخێکی هەڵکێشا و ناهومێدانە بەرەو دەربەندی قووڵ و دارستانی «جونگا» چوو کە ناکاو دەنگێکی ناسک و لە پشت درەختێکی «مرخ»ەوە ناوی هێنا کە ئەژنوانی دەستی کردە لەرزین، تەنانەت نەیتوانی هەنگاوێ بەرەو پێش بڕوا. ئەو دەنگەکەی ناسیبوەوە. دەنگ، دەنگی گوڵنار بوو، دەنگی گوڵنار وەک مغناتیسێک ئەوی بەرەو خۆی دەکێشا.

بەهمەن گەڕایەوە و هەر بە دەم گوڵنار وتنەوە، گرتیە ئامێز و بۆ چەند ساتێک دوور لە چاوی کەسانیتر، پێکە وە لە ئەوین و خۆشەویستی و دابی دڵداری دوان. جا بەهمەن هۆی هاتنی گوڵناری پرسی.

گوڵنار گوتی: بەهمەن، شەو خەوێکی ئاڵۆزم دی و بەو بۆنەوە دڵم زۆر شێواوە و شپرزە. وا دیارە ئیدی ناتبینمەوە لەو کاتەی کە لە خەو ڕاپەڕیوم، خودا خودام بوو کە کەسی بەرەو ڕەشماڵەکان بێت ئەگەر نەهاتبایی و فە رامەرزی ڕەفیقت بناردایێ، خۆم بەرەو شاخ دەهاتم و تا بتبینم و لەو پەرێشانیە کە لە دڵمایە ئاگادارم دەکردی

و یەکسەر لە گەڵتاماڵئاواییم دەکرد.

- بەهمەن نازانم بۆ بڕوام بەوە کردووە کە ئیدی ناتبینمەوە.

بەهمەن لە حاڵێکدا کە چاوی پڕ لە فرمیسک بوو دڵداری دڵبەرەکەی ئەداوە. گوتی: مانگێکی زیاتر بۆ ماوەی گۆڤەندەکەمان نەماوە. خێرا بە دوای ئـەوە مۆچـەی خۆم لە ئاغا بستێنم کەل‌وپەلی شاییەکە ساز دەکـەم و ئیـدی قـەد لـە یـەک جیـا نابینەوە.

هەتاو بەرەو ڕۆژئاوا دەڕۆیشت و هێشتا ئەوان پێکەوە دەردەدڵیان دەکرد کە لـە دوورەوە یەکێ لـە سـوارەکانی هۆزەکـەیان دەرکـەوت و ئـەوانیش بـە ناچـاری بـۆ دواهەمین جار مـاچی یـەکتریان کـرد و بـە چاوگـەلێکی پـڕ لـە داخ و فرمێـسکی خوێنیەوە، ماڵئاواییان لە یەکتر کرد.

نازانم ئەو شەوە لە کۆساردا چی بە سەر بەهمەن هات کە گوڵنار ئەو شـەوە لـە جێگە خەوەکەی جینگڵی دا وگریا و خەوی لێ نەکەوت.

هەوا لێڵ بـوو کـە شـەیهەی ئەسـپەکان و هـاواریِ سـوارەکانی سـەرنجی بـۆ کارەساتێک ڕاکێشا. زوو هەڵسا و لە تاریکیەدا بەرەو دەرەوەی ڕەشماڵەکان چوو کە لەو کاتەدا کتوپڕ لەگەڵ گرمە و ناڵەی سوارەکانی تورکمەن ڕووبەڕوو بـووە. هـاواری کرد و پیـاوانی هۆزەکـەی لـە خـەو ڕاچـڵەکاندو بـێ‌سـاتێک درەنـگ «دیـرگ»ی ڕەشماڵەکانی دەرهێنا و بە هەموو هێزیەوە خۆی خستە سەر سوارێکی تورکمەنـەوە و لە سەر زەوی پانی کردەوە و لەو کاتەدا سوارێکی‌تری تورکمـەن خـۆی‌دا بـە مـل بەهمەن و کەوتنە گیانی یەکتر.

دوای ماوەیەک، ڕەشماڵەکان ئاگر دران، پیاوەکان کوژران، ژن و کچـان وەکـوو گوڵنار دەس بەسراو و تەناف لە مەل وەکوو ئاژەڵی ڕام کـراو، دیـل کـران. و بـەرەو تورکمەن سەحرا دەیانبردن و هەرکام هێندی بەرگیریان لە خۆیـان پیـشان دەدا و بە کوتەک و قامچی سزایان ئەدان.

ڕۆژی دووهەمی ئەم کارەساتە بوو کـە هەواڵـی نـاپیرۆز و لـە هـەموان خراپتـر «یەخسیر بوونی گوڵنار» لە کوێستانەکانی باشـووری «جونگـا» گەیـشتە بەهمـەن. بەهمەن نەیدەتوانی بڕوا بکا کە گوڵنار دیلی دوژمنە. هەر بەو بۆنـەوە مـەڕەکانی لـە کوێستاندا بە جێ هێـشت و بـەرەو لای ڕەشماڵـەکان گەڕایـەوە. جگـە لـە مـشتێ

خۆڵەمێش بە جێماو هیچی‌تر نەمابوو. هەموو شتێ تالآن کرابوو و بە با چوو بوو. گوڵناری دەزگیرانی دیل کرا بوو. لە حالێکدا دەگریا لە لووتکەی چیا چووە سەر و تا سەیری دوور دوورەکانیش بکا، تا ئەو جێگای کە ئاسمان دەگەیشتە زەوی سەیری کرد بەڵام سەد داخ هیچ ئاسەوارێکی لە گوڵنار نەدی. سەد داخ کە ئاسۆیش ملی هاوپەیمانی لەگەڵیدا کەچ نەکردو گوڵناری پێ نیشان نەدا.

بەهمەن، ماندووی ماندوو بە سەر گاشەبەردێکەوە دانیشت تا توانی بە خولقێنەرەکانی ئەم کارەساتە جوێنی‌دا و تف و لەعنەتی کرد و جا لێوە ماندوو و لەرزۆکەکانی بەنەیەوە لکاند و گۆرانی فیراق کە دواتر لای کوردەکانی خوراسان بە «لێ یارێ» بە ناوبانگ بوو، لە قووڵایی گیانیەوە لێدا. نەیەکەی هاوردەوە هاوار. تەنیا هاودەسی کۆنی، ئەمجارەیش ئاه و نالەی تێکەڵ بە خوێنی لە کوێستانەوە لەو جێگایەکی کە «جلگە»ی خرنووت بجنوورد بە تورکمەن سەحرا دەلکا بە گوێچکەی گوڵنار بگەیێنێت.

نەی کە گوایە لە دەردی بەهمەن تێگەیشتبوو و زیاتر لە بەهمەن دەڵتەنگی گوڵنار بوو، هاتە هاوار و ڕۆڕۆ و سەری ئاژەڵ و دەڕەندەی چیا و دارستان سووڕ ما و کاریگەریەکی ئیجگار دڵتەزێن لە خۆی بە جێهێشت کە نیشاندەری دەردی دڵی لاوێکی ئەویندار بوو.

قامکەکانی بەهمەن لە سەر کونەکانی نەیەکەوە دەلەرزا و هاوڕێ لەگەڵ شین و ڕۆڕۆی نەی، فرمێسک لە ڕۆخساری پیاوانەی بەهمەن دەهاتە خوارەوە.

دواتر نەیەکەی خستە باوەشیو داوای لە سروەی شەوانە کرد کە پەیامی بگەیێنێتە گوڵنار و ئەوجا دەستی گوڵنار و ئەوجا دەستی خستە لای گوێ و سترانی «لێ یارێ»ی لەو کوێستانەدا سەردا.

۱) ئەمن کە ئەمڕۆ غەمگینی غەمگینم
ئەی یار، ئەی یار، ئەی یار
بە نێو ڕەشماڵان چاو دەگێڕم
ئەی گوڵنارم
نیشانێک لە تۆ نابینم
ئەی یار، ئەی یار، ئەی یار

لە «تلۆ»[٢٤٣] پێش سوارەی «الامان» دەرهات
تورکمەن لە یەمووت[٢٤٤] و سومبار[٢٤٥] هەستان
لاوانیان کوشت و ژیانیان گرت، ئەی یار
یەخسیر کران و بۆ خیرە و بوخارا[٢٤٦] بران.
لە شەقام و بازار فرۆشران.
نازانم چیان لێ کردی ئەی یارم، ئەی گوڵنارم.
٢) ئەم شەوانە، چ شەوگەلێکە ئەی یار، ئەی یار، ئەی یار
خەو بە چاوگەلمانەوە نایە. گوڵنارم
یاری وەفادار خەو بە چاویەوە نایە ئەی یار، ئەی یار، ئەی یار
مەگەر جارێکیتر بێ بخەوم
بەڵکو لە حاڵ و ئەحواڵت تێبگەم ئەی یار
خەیاڵی فیکری تۆ، گیانم ئەخوا
دیداری من و تۆ تا ڕۆژی قیامەت ما، ئەی گوڵنارم.
٣) خودایا بە دڵ لە ئاستانت دەپاڕێمەوە
ئەی یار، ئەی یار، ئەی یار.
تەنگە لە لام ئەم دەشت ودیمەنە
گوڵنارم
یارم یەخسیر کراوە
ئەی یار، ئەی یار، ئەی یار
پیاوی کرمانج زەلیل کراوە

---

[٢٤٣]- تلۆ= لەچیا بەرزەکان پۆشراو بە دارستان لە سنووری نێران تورکمەن سەحرا و خوراسانە، لە ڕۆژئاوایی بجنوورددایە، بەلام زوو دەشتەکانی ئەوپەڕی تلۆ و ناوچەی مراوە سەر بە بجنوورد بوو.

[٢٤٤]- مەبەست لە یەمووت، زەوی و زاری هۆزی تورکەمەنەکانی بەرت لە باکووری گونبەدی کاووسە.

[٢٤٥]- سومبار، یا بە بڕوای کوردەکان، هاسێمار، هەر ڕۆخانەی ئەترەکە کە لە باکووری ڕۆژئاوایی بجنوورد بە نێوە ناسراوە.

[٢٤٦]- خیرە و بوخاران، ئەمڕۆ لە شارەکانی تورکەمەنستانی سۆڤیەتە، کە لەو سەردەمەدا یەخسیر کراوەکانی ئێران بە دەس تورکمەنەکان لەوێ دەفرۆشان.

ئەی یار
کوا پیاوانێک لە سەر ئەمیر حوسەین خانی شوجاعودەوڵە
نە دیوانێک، نە جێگایەک، نە یاسایەک،
بەندی دڵ بکاتەوە ئەی یار.
خۆزگا کاژوڵەیەک بوایە، بمانیبردایێ بۆ زەوی و زارێ
دەیانفرۆشتم و بە دڵ دەگەڕام بە دوای یارێ
بەو پارەیە، گوڵناری ئازیزم. ڕزگار کردایێ.

## بە ڕێوە چوونی شانۆنامەی یەخسیری کچە قووچانیەکان لە ڕووسیا

باس دیلی کچە قووچانیەکان بە دەستی تورکمەنەکان لە نێو و دەرەوەی وڵات وەکوو ئینگلیز و فەرەنسا و هەروەها لە بڵاڤۆگەکانی مەراکێش لە ئەفریقا دەنگدانەوەیەکی بەربڵاوی هەبوو و ویژدانە خەوتووکانی دونیا دژ بە دەم و دەزگای دیکتاتۆری و نامووس فرۆشەکانی قاجار ڕاچڵەکاند، کە بەشێک لەم تراژدیایە لە شارەکانی ڕووسیا وەکو تەفلیس بەڕێوە چوو، خەڵکی ئێرانی سەبارەت بەم کارەساتە ئاگادار کرد وبوو بە هۆی سەرکەوتنی «مەشرووتە» خوازەکان و دامەزراندنی «مەشرووتیەت». ئیدوارد براون، لە مێژووی بڵاڤۆگەکانی ئێران، دێڕێکی ڕامیاری سەبارەت بە دیل‌کردنی کچە قووچانیەکان لە ڕۆژنامەی سوورئیسرافیل ڕێکەوتی ۲۰م ژۆئەنی ۱۹۰۷ زایینی (۱۳۲۵ مانگی) نووسی‌بوو، و هەروەها جگە لەوە دەڵێ: «وا دیار بووە کە ڕووداوەکە بە هاوپێمانی ئاسەفودەوڵە و حاکیمی بجنوورد[۲۴۷] کە دواتر هەر بەم بۆنەوە لۆمە کران، کرا بوو»[۲۴۸].

دیسانەوە براون ئەڵێت کە: کۆنسرتی ئێرانی، بە هاوبەشی کچەکانی قووچانی کە بە داوای تورکمەنەکان ، لە یەکێ لە کافەگەلی تەفلیس بەڕێوە چووە، کچەکان پێکەوە بە ئاهەنگەوە وا دەڵێن:

---

۲۴۷- وەرگێڕی بەڕێز موحەممەد عەبباس بە هەڵە بجنوورد بە برووجێرد و بیرجەند وەردەگەڕێنێتەوە.

۲۴۸- مێژووی بڵاڤۆگەکان و ویژەی ئێران لە سەردەمی مەشرووتیەت براون. وەرگێڕاوی موحەممەد عەبباس، لاپەڕەی ۱۱۳.

ئەی خودا، ئیدی لەیلا یاری ئێمە نیە
١) گەورەکان هەموو مەستی غروورن
«خودا کەس لە بیری ئێمە نیە»
لە ڕەحم و بەزەیی زۆر زۆر دوورن
ژێر دەس بێسەدا دوو کەڕ و کوترن
ئەی خودا کێ لە بیری ئێمەیە
حەڤدە و هەژدە و نۆزدەو بیس
ئەی خودا کێ لە بیر ئێمەس.
٢) فەڵەک، دیت کە چی بە سەر مانا هێنا
خۆمان و کەس و کارمان لە یەکتر جیا کرا
نەبینێ خۆشی کە ئەم ناخۆشیەی بە سەرمانا هانی
حەڤدە و هەژدە و نۆزدە و بیس
ئەی خودا کێ لە بیر ئێمەس
٣) ئەگەر لە ولاتی باپیران دوور ماینەوە.
گەر دوورە ئەو ڕەنجی زۆرمان دیتەوە
وا بیرمەکە لە ئەوینی ئەو دوور بوینەوە.
حەڤدە و هەژدە و نۆزدە و بیست
ئەی خودا کێ لە بیر ئێمەس.
٤) کچێکی دوانزە سالان، بە تەنیا دەخوێنێ:
نەفەس لە سینگ وا ئارام ئەڵێ
شەماڵ لە ولاتمان هاوڕێ بۆنی
چ بۆنێ، دلکێش: ئەویش لە چ ولاتێ
حەڤدە و هەژدە و نۆزدە و بیست
ئەی خودا کێ لە بیر ئێمەس.

## کاریگەری دیلکردنی کچە قووچانیەکان لە سەرکەوتنی شۆڕشی «مەشرووتیەت» لە ئێران

بابەتی دیلکردنی ژن و مناڵ و کچە قووچانیەکان کە لە هۆزی کوردە باشقانلوو (باشکانلوو- باچیانلوو)کان بوون. ڕێگەیان بۆ ڕاگەیاندنی باشتری مەشرووتە خوازەکان بە مەبەستی داسەپاندنی حکوومەتی دیکتاتۆریەت ئاوەڵا کرد.

سەرپەلەکانی مەشرووتە وەکوو خوالێخۆشبوو سەیدموحەممەد تەباتەبایی لە سەر مێمبەرەکان و کۆگاکانی شۆڕشخوازەکان، مەبەستەکانی بە جۆرێک دەگوت کە هەستی خەڵکی دەجووڵاندەوە، ئەم کارە بە جێگایێ گەیشت کە شا بە زۆر لێکراوی ئەتابەکی گەورە، میرزا عەلی ئەسغەرخانی ئەمیرسولتان لە وەزارەت دەری کا. کە ئەم تاوانە گەورە لە دەوڵەتی ئەودا ڕووی دابوو بەم بۆنەوە بارودۆخی رامیاری ئێران وەها دژ بە ئەمینوسولتانی خەیانەتکار بوو دوای دەرکرانی لە وەزارەت، نەیتوانی لە ئێرانێدا ڕاوەستی، بۆیە بە مەبەستی دەرچوون لە ئێران لە بەندەری ئەنزەلیەوە و بەرەو ئۆرووپا چوو.[٢٤٩]

---

[٢٤٩]- بە بۆنەی ئەوە کە ئەمینۆسۆڵتان بە تەواوی زوڵم و داسپاندن و نەدانی ئازادی لە کۆڕەکان و بلاڤۆگەکان لە دەوڵەتی خۆیدا گرتبوویە بەر، خەڵکی بە ناچاری بانگەوازیان بلاو کردەوە و باسی ئەویان دەکرد کە بوو بە هۆی ئەوە کە مۆزەفەرەدین شا ئەو دەر بکا و شازادە عەینۆدەولە داچۆڕاوی دیکتاتۆریەت لە جیی ئەو بخات.

فەخرولواعێزیی کاشانی غەزەلی خوارەوەی بۆ ئەمینوسۆڵتان نووسی کە خەڵکی لە شەودا بلاویان دەکرد. و لە دەرو دیواریان دەدا. تا دواتر بە دەستی پاشا گەیی و ئەمینوسۆڵتانی دەرکرد.

کوڕە ئەرمەنی ئازاری موسەڵمانەکان مەدە
تەختی گشتمان مەدە بە دەس کوفرەوە.
زوڵمی تۆ یانەی پاشا دەرووخێنێ
ئێدی بۆچی وا ئەشکەوتەکەت تاکوو ئاسمان دەبەی
ئەو کاتەی خەڵکی وانەی غەیرەتیان زانی
لەم باخەدا دڵنیا بە دەردت دەکەن
لە زۆڵمی تۆ عەیبی ژن و پیاو کەوتە دەرێ
ڕاوەستە تا تۆ لەو جێگایەی بێنمە خوارێ
کاسەلێسی ڕووسەکان بۆت کاریگەری نەبوو

خەڵکی گەیلان کە هەواڵی دیلکراوی کچە قووچانیەکانیان بیست. بڕیاریان‌دا ئەمینوسوڵتان بکوژن؛ بەڵام کەسێکی‌تریان بە هەڵە بە جێی ئەو کوشت و ئەمینوسوڵتانیش بە کەڵک وەرگرتن لەم ڕووداوە خۆی خستە ناو «کەشتی» و بەرەو وڵاتی ڕووسیا چوو. خەڵکی ڕەشت ئەوسا لە هەڵەی خۆیان تێگەیشتن کە ئەمینوسوڵتان زۆر لە بەندەر دوور بووەوە و بە سڵامەتی دەرچوو بوو.

بەڵام سەرپەلەکانی مەشرووتیەت ئەم باسەیان درێژە ئەدا و هەستی خەڵکیان ئەبزواند. برووسکەی شۆڕش ئیسلامی ئێران و سەرەوخواری حکوومەتی پەهلەوی، ئەو وتارەی پڕ لە سووکایەتیەی ڕۆژنامەی «ئیتلاعات» دژ بە ئێمام خومەینی بوو و برووسکەی شۆڕشی مەشرووتیەتیش، بابەتی دیلکردنی کچە کوردە قووچانیەکان بوو کە لە سەر ئەودا ڕاگەیاندێکی باش هەبوو و بە بەرهەم گەیشت. تا ئەو جێگای کە خواڵێخۆشبوو تەباتەبایی لە نامە ناسراوەکەی خۆی بۆ مۆزەفەرەدین شا بەم جۆرەی نووسی:

«... گەورەم! وڵات کاولە، ژێر دەس پەرێشان و نەدارە، دەس زوڵمی کاربەدەستان بە سەر ماڵ و گیان و سەری ژێر دەست درێژە، زوڵمی کار بە دەستان و خانەکان لە حەد ترازاوە، لە ماڵی ژێردەس هەرچی بە هەوەس خۆیان بوو دەیبەن، هەرچی نەفسیان بڵێت و حوکمی لە سەر بکا لە لێدان و کوشتن و بڕین وا دەکەن. ئەم ئەشکەوت و ماڵ و منداڵە لەم دەرفەتە کورتا لە کوێنەوە هاتووە. هەمووی لە خەڵکی چەوساوە و هەژارە. ئەم ماڵ و سامانە مافی ئەو هەژارانەیە کە ئێوە گەورەم لە حاڵیان ئاشنای. لە زووترین‌کاتدا بوون بە خاوەنی ماڵاتێکی زۆر. ساڵی رابردوو کچە قووچانیەکان لە بری گەنم کە «ماڵیاتیان» نەبوو، بران و بە تورکمەنەکانی عەشق ئاباد بە پارەیەکی زۆر فرۆشران. دە هەزار قووچانی بە بۆنەی زوڵم بەرەو ڕووسیا چوون. هەزاران رەعیەت بە بۆنەی زوڵمی خانەکان و کاربەدەستان پەنایان بە خاکی دەرەوە برد. ژین بە کرێکاری تێپەر دەکەن. ئەم وڵاتە ئەگەر دیسانەوە ساز نەکرێتەوە، هاکا ببێتە بەشێک لە وڵاتەکانی دەرەوە، ئەڵبەت گەورەم ئێوە کە قەد

---

ئەم کاسەلێسیە دڵنیابە ئەتۆیش ئەکوژێ.

مێژووی لە مەڕ ڕاپەڕینی ئێرانیەکان «نازمولئیسلامی کرمانی- ٣٩٧».

بەوە ڕازی نابن. کە لە مێژوودا بنووسرێت لە سەردەمی ئێوەدا. ئێران و خاکی بە با چوو. ئێسلام زایف کەوت. موسوڵمانەکان زوڵمیان لێ چوو...»[٢٥٠]

مەشرووتە خوازەکان لە ژێر کاریگەری کوتەکانی سەرپەلەکان و سکرتێرەکانی خۆیان ئۆقرەیان لە کاربەدەستانی دەوڵەت بڕیوە. دەوڵەت دەستی بە دامەزراندی حکومەتی نیزامی کرد و هاتوچووەکانی لە ژێر چاودێری خۆی داگرت. بە بۆنەی ڕۆژەکانی کۆچی دوایی حەزرەتی فاتیمەی زارا «سڵاوی خودای لە سەر بێ» کۆڕگەلی پرسە بەیانیەکان لە ماڵی ئایەتوڵڵا سەی عەبدولڵای بێهبەهانی و دوای نیوەڕوەکان لە ماڵی ئایەتوڵڵا تەباتەبایی بەڕێوە دەچوو.

دوای نێوەڕۆی ڕۆژی چواردەهەمی جەمادیولئەوەڵی ساڵی ١٣٢٤ کە خەڵکێکی زۆر هاتبوو ئایەتوڵڵا تەباتەبایی بە هۆی ویستی خەڵک بە سەر مینبەر چوو و باسێکی جوانی سەبارەت بە کێشەکانی کۆمەڵگای ئێران، پێشکەش کرد و خاڵە لاوازەکانی دەوڵەت و چەپەڵیەکانی دەزگای حکوومەتی هەڵدا و کە بەشێکی بەم جۆرە دەهێنینەوە.

«... ئەم خەڵکە بێچارەی ئێرانە هانایان لای کێ ببەن. ئێوە نازانن کە لە ناوچەکانی‌تر خان و حاکمەکان چ زوڵمێک دەکەن. ژێر دەستی بێچارەی ئێران دەبێ خۆی و بنەماڵەی نان و زوڕەت جۆ تاکوو بتوانێ «مالیات»ی دەوڵەت بداتەوە.»[٢٥١]

نە ژێر دەستێک ماوە و نە لە خەزێنەی شا شتێک ماوە بۆ ئەوەی هەموو لە ڕێی هەوەس و خۆش و عەیاشی شا و کار بە دەستان و نزیکانی شا گەیشتە ئۆرووپا خەرجی کردووە.

پاشا بە هۆی خەزێنەوە پاشایە، خەزانەیش نابێ هە روەها بچێ مەگەر بە بۆنەی ئاوەدان کردنی ولات. ولاتیش ئاوەدان نابێت تاکوو «بەرابەری» نەبێ بۆ چ باس

---

[٢٥٠]- مێژووی هەستانەوەی ئێرانیەکان- لاپەرەی ٣٣٩- ٣٧٦ چاپە کۆن و بەرگی ١ لاپەرەی ٤٠٥ چاپی نۆی.

[٢٥١]- ژێر دەستی ئێران بە تایبەت دێهاتیەکانی قووچان کە ئەمن «نووسەر» دیومە تا ساڵی ١٣٣٥ هەتاوی نان و زوڕەتیان دەخوارد. یانێ درووس ٥٠ ساڵ دوای «مەشرووتیەت» بارودۆخی خەڵکی بچووکترین جیاوازی لەگەڵ پێشووی نەبوو.

قووچانتان نەبیستووە کە ساڵی ڕابردوو بەرهەمێک نەبوو و دەبوایە هەر موسـڵمانێکی قووچانی «سەریٚ» گەنمی بە خەزانە وەکوو «ماڵیات» «بدایێ» سەریٚ گەنم. دوانزە مەنە بە کێشانەی تەورێز کە هەرمەنێکی ئەورێز ٦٤٠ مسقاڵە و هـەر مـسقاڵیش بـە کێشانەی ٢٤ دانە نۆکە)[٢٥٢]

ئەڵێن یەکێ لە کچەکانیش لە کاتی خەوتندا لە دایکەکەی جیایان کردوونـەوە، بۆیە ئەو بێچارانە زۆر ڕازی بە جیایی نەبوون.

ئێستە ئێوە بڵێن زوڵمی لەمە گەورەتر دەبینن؟

خودا خۆی بەزەیی بە ئێمەدا بێتەوە، هەرچی هـاوار دەکـەین کـەس نابیـسێ و خەڵکی نازانن کە مەبەستی ئێمە بۆ خۆمان نیە و بە خـودا وپێغەمبـەر و گـەورەکان سوێند کە ئەگەر کۆمارێک ببێ هەم بۆ دەوڵەت باشە و هەم قازانجی بـە میللـەت و ژێر دەست دەگەیێ.[٢٥٣]

دوای سەرکەوتنی مەشرووتیەت و نوێنەرەکان بۆ کۆمار چـوون، ڕۆژنامـەکان و بڵاڤۆگەکانی جیهان و خەڵکی ئێران لە یەکەمین کۆمـاری ئێـران داوایـان کـرد کـە شوێن پرۆسەی دیلکراوی کچە قووچانیەکان بکەون و کار و باریان ئەنجام بدەن. کە ئەم داواکاریە و شوێن کەوتنی کۆمار بە دوای ویستی ئەوان لە ڕۆژنامەکانـدا هـاتووە. لە بانگەوازەکەی موسوڵمانەکانی قەوقاز بۆ ڕوون کردنـەوە هـەمووەان لـە ڕێکـەوتی ٢٣ی ڕەجەبی ١٣٢٤ بۆ کۆمار ناردرا و سەبارەت بە نوێنەرەکان نووسرا بوو:

«مەگەر ڕۆژنامەکانتان نەخوێنووتەوە، حاکیمی بـێغـەیـرەتی قووچـان (ئـەمیر حسەین خان ئاسەفودەولە) بۆ گرتنی دراوی زۆر لە خەڵکی بێچارە چەند ئازاریـانی داوە و ناموسیانی فرۆشتووە و خەڵکی کە گیانیان بە قورگیان گەیشتووە، بە ناچـاری ئەرکی ولاتی خۆیان کردووە، کچەکانی خۆیان بـە تورکمەنـەکان فرۆشـتوە، بابـەتی فرۆشتنیان هێناویانە و دایانە بە حاکیم؛ بەڵکو لە زوڵمی خۆی کەم بکا.»[٢٥٤]

---

[٢٥٢]- مێژووی «هەڵسانەوە» ئێرانیەکان. لاپەڕەی ٣٣١- ٣٧٦ چاپی کۆن و بـەرگـی ١- ل ٤٥ چـاپی نۆی. «لە خەوراپەڕین».

[٢٥٣]- وتاری باسەکانی خوالێخۆشبوو ئایەتوڵلا تەباتەبایی بۆ مۆزەفەرەدیـن شـا لـە لاپـەڕەی، یـەکـی مێژووی هەڵسانەوەی ئێرانیەکان- ل ٤٤٣ تا ل ٤٥٤ چاپی سێهەم، ساڵی ١٣٦١ بخوێننەوە.

[٢٥٤]- مێژووی هەڵسانەوەی ئێرانیەکان- نازێمولئیسلامی کرمانی- ل ٣٧٠.

چونکوو نەبوویان و کەسێکیش بە دەمیانەوە نەهات، حاکیمی ئەوێ «کوڕی ئاسەفودەولە، ٣٠٠ کچی موسڵمان لە بری گەنمیماڵیاتی، هەر کچێک لە بری دوانزە مەن گەنم[٢٥٥] گۆڕایەوە و بە تورکمەنەکانی فرۆشت.»

ئاوایە کە دەبینین کە ئاسەفودەولە هەر کچێکی بە ١٧ تمەن داوە و ئەم مرۆڤ فرۆشتنەی ئەو بە نرختر لە مرۆڤ فروشتنەکەی ئەمینوسوڵتان ئەتابەک ئەعزەم بووە. بۆیە ئەمینوسوڵتان بابەتی هەر ئێرانیەک بە ٢ قەرانی بڕیبوو. وەهایە کە حاجی میرزا ئەبووتالب موجتەهێدی زەنجانی بە میرزا عەلی ئەسغەر خانی ئەمینوسوڵتان ئەتابەکی ئەعزەم ئەڵێت:

[میرزا عەلی ئەسغەر خان: ئێرانیەکانت زۆر بێ بایخ فرۆشت. ئەمن وام ژمارد بوو کە هەر ئێرانیەک ١٥ قەران بە دەرەوەکان فرۆشراوە]

ئاسەفوددەولە ئەتابەک ئەڵێت: [زۆریش پڕ بایەخ فرۆشتوومە، هەر ئێرانیەک ٢ قەران زۆرتر ناکات]. «ڕۆژنامەی ئیتلاعات ١٥ی ڕێبەندانی ١٣٥٤- ل ١٠»

ئاوایە کە ڕوون دەبێتەوە ئەتابەک ئەمینوسوڵتان وڵاتفرۆش ئێران لە سەردەمی ناسرەدین شا و موزەفەرەدین شا و موحەممەد عەلی شا چ کوێرەوەریگەلێکی بە سەر ئەم ئاو و خاکە هێناوە. دواتر ئەویش بە دەستی یەکێ لە قارەمانەکانی کۆمەڵ بە ناوی عەباس ئاقای تەورێزی کوژرا و بە ئاکامی خۆی گەیشت.

## یەکەمین نوێنەری قووچان

لە یەکەمین خولی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نەتەوەیی چوار کەس نوێنەر لە قووچان بۆ مەشهەد ناسران. کە لە نێوانی ئەواندا کەسێک بە ناوی «حاجی میرزا بابا» هەڵبژاردرا . ناوبراویان وەک خەڵاتی لە تاران بۆ نوێنەری قووچان ناساند بوو.

سەبارەت بە دیلکراوی کچە قووچانیەکان لە ئەنجومەنی نەتەوەیی خولی یەکەم ئەم باسانە کرابوو.

---

٢٥٥- بابەتی گەنم لەو سەردەمەدا خەروارێک ١٤ تمەن و ساڵی دواتر بە هۆی وشکەساڵی و شاردنەوەی ئەنبارداره‌کان، بابەتی بە هەر خەروار ٢٥ تمەن گەیشت. وتووێژەکانی کۆمار- خولی یەکەم ل ١٤٩ و ل ١٥٣.

کڕین و فرۆشتنی کچە قووچانیەکان لە عشق‌ئاباد.

حەمزەبەگ مامۆستای فێرگەی عیشق‌ئاباد ئەڵێت کە.

«ئیمڕۆ لە ڕۆژنامەی عیشق‌ئاباد نووسرا بوو کە... بە حاکیمی عیشق‌ئاوا نامە ناردرا بووکە لەگەڵ ٤٠٠، ٥٠٠ کەس هانا بۆ ئێوە دەبەین. ئەویش نامەکەی بۆ تاشکەن (تاشکەند) خزمەت بە گوبرنانووری گەورە بوو بوو تا وەڵامی بداتەوە.»

دەنگدانەوەی دیلکردنی کچە قووچانیەکان لە یەکەمین ئەنجومەنی نەتەویی ئێران

(١) فرمەکانی یانەی ئەنجومەنی نەتەویی- سێ شەممە ٧ی زیحەجە ١٣٢٤ «ئاقا سەی حەسەنی (بروجێردی- ڕەنگە موجتەهێدی گەورە و ناسراو) یەکەمین شتێ کە پێویستە ئەویە: ئەنجومەن بتوانێ حوکمەکانی خۆ بەڕێوە ببات. لە هەڵبژاردنی خوراسان کە ئاسەفودەولە ببوو بە هۆی ئەوە کە بگەڕێتە دواوە، داوامان کرد کە دەربکرێت و ئێستا کە ئەو مامۆستایانی ئایینی لە بەردار داوە [نەداوە] ئەوە کە ئەو کارەیە کردە جگە لەوە کە دەبێ دەربکرێت دەبێ سزاش بدرێت»[٢٥٦].

وەزیری ناوخۆ سەبارەت بەوەی ئاسەفودەولە لە خوراسان تاوانی کردووە، وڵامی داوە، تۆ بۆیە ئەنجومەنی نەتەوەیی دەیانەویست کۆڕێک ساز بدەن بۆ پێشگرتنی تاوانکردن، ئەوانی داوە بەر ڕێژەی دار.

لە کۆ بوونەوەی یەکشەممە ١٢ی زەیحەجەی ١٣٢٤-

پەیوەندیەکەی خوراسان خوێندراوەتەوە کە ئاسەفودەولە هەموو تاوانەکانی لە خۆ جیا زانیوە. هەروەها ئاقا سەی حەسەنی بروجێردی گوتی کە: «هەوەڵ: مافێک کە دەبێ ئەنجومەن بیدات ئەوەیە کە ئەو کچانەی کە ئاسەفودەولە فرۆشتوویانە، دەبێ بگەڕێنەوە. سەبارەت بەمە وەزارەتی دەرەوە پرسیاری لێ کرابوو و عەینودەولەیش گوتبووی، ئەمن نازانم بەری بگرم و دیسانەوە دەفرۆشرێت. ئەوڕۆ وەزیر ناوخۆ گوتی دەبێ ڕوون بکرێتەوە [کچەکانی فرۆشتووە یا نا]؟ دواى ئەوە ئەو کچانەی بە هەرچەندێ فرۆشتووە دەبێ بیانهێنێتەوە.

---

[٢٥٦]- ڕۆژنامەی کۆماری خولی یەکەم لاپەڕەی ٥٩- یەکەمین کۆماری مەشرووتیەت ئێران، ڕۆژی ١٧ی شەعبانی ١٣٢٤ هاوکات لەگەڵ ١٧ی ئۆکتۆبر ١٩٠٦ و کۆماری دووهەم ڕۆژی ٢ی زیعەقدە ١٣٢٧ هاوکات لەگەڵ ١٥ی نوامبر ١٩٠٩ زایینی دەستی پێکرد.

ئاقا سەی موحەممەد مۆجتەهید... ئەو پەیوەندیەی کە لـە قووچانـەوە کرابـوو، ئەویش سەبارەت بەم باسە بوو؟

بەرپرس: چی بڵێم. شتێ نازانم(!!!)

ئاقا سەی هاشم[٢٥٧] دەبێ سەبارەت بەم کێشە سووربین و ئیزنی ئەوە نەدەین. مافێک لە موسوڵمانەکان و نامووسیان نەفەوتێ.

حاجی موحەممەد ئیسماعیل ئاغا.

نووسرابوو کە چەند کەس بوون. ئەوان ئەمەیان کرد و کچەکانیان فرۆشـت، نـە ئاسەفودەوڵە

ئاغا سەی موحەممەد موجتەهێد: دوو کەسـیان لـە تـارانن.(مەبەسـت عـەلی بەیگ و یۆسف باشکانلوویە کە بۆ سکاڵا دەوروبەری دوو ساڵە لـە تـاران چـاوەڕێن و ئەم کێشەیانە درێژەدارە و بەدوای‌کەوتن)

ئاغاسـەی‌حەسـەن: ئەوانـەی(کچـەکانیان فرۆشـت) حـاکیم نـەبوون. حـاکیم ئاسەفودەوڵە بوو، ئەگەر ئـەوانیش ئەمـەیان کـرد بـە دەسـتووری ئـەو بـوو. ئەڵـێن ئاسەفودەوڵە دەستووری دابوو ئێمەیش بە دەستووری ئەو ئەوەمان کرد.

حاجی موحەممەد ئیسماعیل ئاغا: نابێ کـە بـە گوتـەی ئـەوان بکـەین. ئـەوان لەگەڵ ئاسەفودەوڵە ڕقیان لەیەکە دەبێ لەمە بکۆڵینەوە[٢٥٨].

گۆڤاری یەغما ژمارەی١ نەورۆزی١٣٤٢ ل٣١ وتاری سەرهەنگ جەهانگیر قـائێم موقامی. ئەڵبەت ئەو ئیماندارە بە مزگەوت نەڕۆیشتبوو. هەر لـە خـۆوە دەترسـا کـە ئاسەفودەوڵـە بکەوێتـە دیلـەوە. بۆیـە ئاسەفودەوڵـە ئەوەنـدەی دۆسـت و ئاشـنای هەبووەکە نە تەنیا لە بۆ دادگا نەبێت بەڵکوو چەند ڕۆژ دواتر بێیتە حـاکیمی ناوچـەی

---

[٢٥٧]- سەی هاشم با، نوێنەری ترشیز(کاشمەر)

[٢٥٨]- دۆستەکانی ئاسێفودەوڵە دڵسۆزیان بۆ ئەو دەکرد و پشتیان ئەگرد. هەرواکە مـیرزا تاهێرخـانی شەریبانی لە ساڵی١٣٢٥ مانگی لە نامەیەکدا کە لە تاران بـۆ مـیرزا ئیـبراهیم خـانی سـدیقومالێکی شەیبانی نووسەری کتێب«منتخب التواریخ مظفری» بۆ کاشان دەینێرێ، دەنووسێت کە: ئەمـڕۆ بـە بۆنەی کچ فرۆشی لە خوراسان پیاوە نامۆکان، ئاسێفودەوڵە کە بەردەم دادگای حـازرن ... دەترسـم ببێت بە هۆی دیل بوونی ئاسیفودەوڵە... کـورتکراوی ئـەم سزادانە لـە حـەوتـەی داهـاتوو پێتـان دەڵێین.»

فارس و بە دوای ئەوەیش ببێتە وەزیری ناوخۆی ئێران و دژ بە بەڕێوە چوونی دادگای کچەقووچانیەکان بووەستێ‌و پێش‌گیری لێ بکا. سەی حەسەن تەقی‌زادە نوێنەر و هەروا دانیشت‌و لە کۆبوونەوەی یەکشەممە١٣ی موحەڕەمی١٣٢٦بڕیاری دا.

ڕۆژنامەی وتووێژەکانی ئەنجومەن- خولی یەکەم ل ٤٥٦ .

لە وتووێژەکانی کۆ بوونەوەی ڕۆژی یەکشەممە ٤ی موحەڕەمی١٣٢٥، پەیوەیەندێک سەبارەت بە دیل‌کراوانی قووچانیەکان لە بائوومەوە بە ئەنجومەن گەیشتبوو کە سەرۆکی کۆمار سەبارەت بەمە بە نۆینەرەکانی گوت:

«... دووهەم. سەبارەت بە فرۆشتنی منالە قووچانیەکان ئەڵێن بەڵگەگەلێک لە وەزارەتی دەرەوە هەیە کە دووڕانی ئەم ڕووداوە ڕوون دەکاتەوە و کە حوکمگەلێکیش دراوە و سەبارەت بە ئەمەیش باس‌کراوە: بەڵام ئەمڕۆ وەکو پێشوو لە سەری سوور نین.[لە بیر چووەتەوە کە بە سەر ئەو ژن و منالە دیلانە و بنەماڵە چارەڕەشەکەیان هانیوە]

حاجی شێخ عەلی: ئەم دەستووریشیە لە لایەن حکوومەتەوە دراوە؟[٢٥٩]

سەرۆک: حکوومەت پارەی ئەوێت. بە ناچاری ژێردەستیش دەبێ منالی خۆی بۆ پارەی حکوومەت بفرۆشێت. پەیوەندیەکیش لەم بابەتەوە لە عیشقائاوە هاتووە.

ئاقاسەیدموحەمەدتەقی: پەیوەندیەکەی خوێندەوە کە کورتێکی بەمجۆرەیە:

گەرچی کەسێک لە شایەتی دەر سوێندی ناوێ، بەڵام ئێمە ئێرانیەکانی نیشتەجێی عیشق‌ئاباد کە پێنج هەزار کەسین بە شەرەف ئایین و ئیسلام سوێند دەخۆین و خودا بە شایەتی دەگرین کە بە چاوی خۆمان دیمان کە منال قووچانیەکانیان لە عیشق ئابادا وەک مەڕ و دیکەی ئاژەڵەکان بە تورکمەنەکان فرۆشت و کەسێکیش نەبوو بە هاواری ئەوانەوە بگات... (لەم کاتەدا نوێنەرەکان و ئەوانەی بۆ سەیرکردن هاتبوون ئەوەندە زۆر گریان کە نەیاندەتوانی بەر خۆیان بگرن).

---

[٢٥٩]- ئەڵین کەسێک لە ئێوارەوە هەتاکوو نیوەشەو باس لەیلی و مەجنوونی کرد. لە کۆتایی کەسێکیان گوتی: ئەوە بەڕاستی لەیلی پیاو بوو یاژن؟ ئێستایش دوای چەندین مانگ باس لە دیلی کچەکان و باس و وتووێژەکانی کۆمار و دەوڵەت ئەڵێت: ئەم کارە لە لایەن حکومەتەوە بوو یا«مباشرین»

حاجی موحەمەد ئیسماعیل ئاقا: ئەڵێم کە دوای ئەم گریانە، چاکترین گریان ئەوەیە کە سزای ئەو کەسانە «ئەوانەی منداڵەکانیان فرۆشتووە» دەوڵەت بیداتەوە و هەر کەسێکیش ئەم داخەی بە دڵی ئێرانیەکانەوە نا، دەبی لە سەر سزادانی سووری سوور بین و سزای بدەینەوە.

شەرەفودەولە: نامەیەکیشیان لە باتوومەوە نووسیوە سەیری بکە ن.

ئاقا میرزا مەحموود [کتێبفرۆش]: لە لێکۆلینەوەکان وا دیارە کە ئە و کەسەی کە منداڵەکانی فرۆشتووە: «سەردار موفەخەمی قووچانیە»[٢٦٠].

حاجی سەید ئەبولحوسەین: [سپاس بۆ ئەو خودایە کە منەتی بە سەرمانە]و ئەم کۆماریە پێکهێنا... ئێوەیش کە... بۆ بەرابەری و یەکسانی لێرەن.

باس لە سەر ئەم بابەتە بە یەک ڕۆژ و دوو ڕۆژ کۆتایی نایێت، چەندین ڕۆژی دەوێ، ئەم کردەوانە ٢٤ ساڵە لە خوراسان دەکرێت بە دوو جۆریشە:

یەکێک ئەوە کە حکوومەت پارەی دەوێ و ژێردەسیش نیەتی و دەبی منداڵەکانی خۆی بفرۆشێ، ئەوی تری کەسانێ هەن کە ئەمە کاریانە و فێر بوون...

ئاغا میرزا ئەبولحەسەن خان: ئەگەر وەکوو میرزا مەحموود ئەڵێت ئەو کەسە [سەردار موفەخەمی بجنووردی] لێرەیە و هۆی ئەم کارەساتە بوو. ئەبێ سزای بدرێتەوە.

حاجی شیخ عەلی: دەبێ لە وەزیری ناوخۆ بمانەوێت.

ئاقا میرزا فەرزعەلی[٢٦١]: لەو کەسانەی کە بوونەتە هۆی فرۆشتنی مناڵەکان چە ئەو حاکیم و حکوومەتیان دەبێ بیانگەڕێنینەوە و ئەو پارەیشە کە لەم ڕێگایەدا بە دەستیان هێناوە، وەریگرنەوە بە تەنیا ئەم ئیشە خۆی چاکترین سزایە. ئیتر پێویستی بە سزادان نیە. حەسەن عەلیخان: قسەیەکم هەیە. بە گشتی لەم ولاتەدا

---

٢٦٠- سەردار موفەخخەم بجنووردیە نە قووچانی و هەر ئەو سەردار موعەزەزە بووکە بە دوای ئیلخان شادلوویە.

ئێستەش بۆ خۆی کەلوپەلێکی پێکهیناوە. بە هۆی ئەم کردوە و خەلات وەرئەگرێت. حاجی ئێسماعێل ئاغا: هەر کەس هەیە دەبێ سزای بدرێتەوە. سەیدولحۆکەما: بڕوای من ئەوەیە: ئەوەی سەردار موفەخخەم گرتوویە بۆ وەرگرتنەوەی مناڵەکان کەلکی لێ وەرگرێن.

٢٦١- لە نوێنەرەکانی ئازەربایجان.

ناتوانن بڵێین ئەندامانی حکوومەت کاریگەریان هەیە. بۆیە لە سەرۆکەوە (دەوڵەت و دەوروبەرەکانی حاکیم) دەستووریکیان گرتووە بە سەر ژێر دەستی چەوساوە دایانسەپاندووە.

ئاقا میرزا فەرزعەلی: قەد وا نیە. هەزار و چەند ساڵە کە ئێمە دەگرین بۆ ئەوەی ئێمەین شمربن سەعد کە ئیمامی حوسەینی کوشتووە، لە حاڵێکدا بە دەستووری یەزید ئەم ڕووداوە قەوماوە.

حاجی سەید عەبدولحوسەین: دەتوانین بڵێین کە زۆربەی ئەم کارە یەزید نەیکردووە؟

بەحرولعۆلووم: ئەگەر حاکیم ئەم ئیشەی کردووە، ئەو تاوانبارە، گەر وانەبێت.

ئاقا میرزا مەحموود سەردارموفەخەمی قووچانی (بجنوردی) لێرەیە و لە ڕاستیدا خۆی حاکمیکی سەربەخۆ بووە و دەبێ پرسیار لەو بکرێت.

حاجی سەید ئەبولحوسەین. بەڵام حکومەتگەلی سەر بە خوراسان لە ڕاستیدا بۆ خۆیان حکوومەتیان نەبووە بەڵکوو «سەڵتەنەت»یان بووە.

ئاقا سەید موحەممەد تەقی: ئەمە دەستوورە و حاکیمی ژێردەستی حاکیمی گەورە ناتوانێ هیچ بکا. ئەگەر حاکیمی چکۆلەتر زوڵمیان لێ بکا، هانا بۆ حاکیمی گەورە دەبن. دەبێ ئەو زڵمە لە بەین ببات، لێرە بە پێچەوانەیە. وا دیارە بۆ بە هێزتر کردنی حکومەتی چکولەتر، هێز و سپای ناردووە.

حکوومەتگەلی چکۆلە هەر چەند سەربەخۆ بن، بێئیزنی حاکیمی گەورەتر ناتوانن بجووڵێتەوە.

ئاقا میرزا مەحموود. ئەمن ناڵێم حکوومەتی گەورە تاوانێکی نییە. بەڵکوو هەردوو تاوانبارن. بەڵام سەردار موفەخەم تاوانبارترە.

ئاقا سەید حوسەین: هەر کات ویستمان سەبارەت بەمە باسێک بکەین، بەڵگەیان ویست. ئەمڕۆ بەڵگەمان پێیە و ئێستا هەیە، کە فرۆشتنی مناڵەکان بە دەستی ئاسەفودەولە بووە و ئەگەر کەسانێکیتریش ئەمەیان کردووە، پارەکەی بە گیرفانی ئەو چووە. ئێمە مەبەستمان حکومەتگەلی وردترینە و ئاسەفودەولەیە. دەبێ مناڵەکان بگەڕێنینەوە. ئەو خۆی دەزانێ و ژێردەستەکانی. تەنیا وتوویژ نەبێ و دەبێ ئاکارێک دیار بێ.

ئاقامیرزا ئەبولحوسەین‌خان: لە وەزیری ناوخۆ بپرسین، کە دیاری بکا و ڕوونی بکاتەوە. هەم لە حاکیم و هەم لە ژێردەستی، گەڕانەوەی منالەکانمان بوێت و هەر کەسێکیش هۆی ئەم ڕووداوە بووە، سزا بدرێت.

ئاقاسەیدموحەممەد تەقی: من دەڵێم «لمن‌الله الراش و المریش و من بینهما».

ئاقا سەید مەهدی: بە لگەم هەیە کە ئاسەفودەولە حاکیمی خوراسان یاسایەکی داناوە و بەڵگەیش هەیە، کە لە دەوروبەری گوناباد و بجنووردو... هەر کە بمرێت، مالی زەوت دەکا...

(زۆربەیان گوتیان کە ئەمە گشتیە و تەنیا ئەو جێگایە نییە.)

ئاقا سەیدموحەممەدتەقی: ئەمرۆیش دەسکەوتێکی هەبوو و بڕیار بوو بە وەزیری ناوخۆ لە بابەتی فرۆشتنی مندالە قووچانیەکان نامەیەک بنووسرێت...

حاج سەید مۆرتەزا: دەسکەوتمان سەبارەت بە کچەکانی قووچانەوە چی بوو؟

سەرۆکی [ڕێکخراو]: هێشتا ئەم بابەتە دوایی نەهاتووە، ئاغای تەقی‌زادە بابەتێکی هەیە....

حاجی سەید مورتەزا: پێویستە لە بارەی کچەکان هەولێ بدەین کە بە ئەنجام و ئاکامێک بگەیت.

سەرۆک: کابرا [ئاسفودەولەی] حاکمە، کە ئەویش لە خوراساندا هەیە و دەبێ کە بێت.

ئەمینوتوجار: ئێمە لەگەڵ وەزیری ناوەخۆ ڕووبەڕووبین.

ئاغا سەید مەهدی: بەڕێوەبەری ئەم کارە شوجاعودەولەیە [عەبدوڕڕەزا خان] کە لە تاراندایە.

حاجی سەید محەممەد: ئەو لە کار بەرکەنار کراوە.

سەعدودەولە: لەم بابەتەوە ناتوانین لەگەڵ دەسەلاتدارانی [شارستانەکان] باس و وتووێژ بکەین، ئێمە لەگەڵ وەزیری ناوەخۆ ڕووبەڕووین.

ئاغا سەید مەهدی: کە وایە چە ئینتیزارێکتان لە ئاسفودەولە هەیە؟

سەرۆک: ئەو هۆکارەی ئەم کارەیە، پێویستە کە بێت.

ئاغاسەیدحەسەن تەقی‌زادە: لەم ماوەدا بە بۆنەی تاقیکاری و ئەزموون، لە

هەندێک مەسەلەکان زانیارتر دەبین. نابێ فریوی لێکۆڵینەوە قسەی وەزیرەکان بخۆین. هەروەها کە لە سەر مەسەلەی کەربەلا وەزیری دەرەوە، و سەبارەت بە کوڕی سپەهدار وەزیری ناوەخۆ باسیان کرد. ڕەنگە ئاسفودەوڵە تا شەش مانگی دیکە نەیتەوە. پێویستە ماوەیەک دیاری بکرێت و چاکسازی و ڕێکخستنی ئەم کارە لە وەزیری ناوەخۆ داوا بکەین.

حاجی سەید عەبدولحوسەین: ڕەنگە ئاسفودەوڵە نەیت.

ئاغا سەید حوسەین: ئەوەی کە ماوەیەکە ڕووی داوە، تەواوە هەر کارێکی لە شەش مانگی ڕابردوو کردووە بێتەوە بۆ تاران بەڵکوو ئەویش وەکوو ئەو کەسانەی بێت کە لە سەرحەدی جولفا بەڕێوە چووە.

دوو مەسەلە هەیە، یەکێکی فرۆشتنی منداڵان و ئەوتر بردنی ئەو شەستویەک نەفەرە، سەبارەت بەم کەسانە [٦١ ئەسیری باشکانلوو] سالار موفخەم [بجنووردی] لێرەدا هەیە و ڕێنموونیمان دەکا هەتا بێشەڕ و خەرجێک هەڵیانگەڕێنینەوە. بەڵام هەڵگەڕاندنی منداڵەکان [کە ئەویش بە هۆی سەختگیری و دەسەڵاتی ئاسفودەوڵە، خەڵک لە ڕێی بێ دەرەتانیەوە منالانی خۆیان لە ڕێگەی دەڕەگەز بیانبەن بۆ عێشقئاوا و بە تورکمەنەکان بیانفرۆشن هەتا بتوانن سەرانەی دەوڵەت دابین بکەن.] پێوەندی هەیە بە دەرکردنی حوکمێ لە لایەن دەوڵەتەوە چۆنکە ئەم بابەتانە ئەمڕۆ بە دەستی وەزیری ناوەخۆیە. وەزیری ناوەخۆ حوکم بدات، ئاسفودەوڵە هەر لەو شوێنەدا منداڵەکان هەڵگەڕێنێتەوە. کاتێ کە دێت بۆ ئێرە، بۆ ئەوەی کە خانەنشین و عیبرەتێ بۆ هەموان بێت بە سزای یاسایی خۆی بگەیت، ئەگەر ئەو لێرەدا بێت و کەسێکیتر بۆ لای تورکمەنەکان بڕوات هیچ قازانجێکی لە بەر نیە. وەزیری ناوەخۆ بانگ بکەن تا بەڵگەکانی وەزارەتی دەرەوە لەگەڵ خۆی بهێنێت هەتا خەیانەتی ئەو بسەلمێنین. پاشان کە لە سەر ئەم بابەتە یەقینمان پەیا کرد، بۆ هەڵگەڕاندنی ئەو چوارسەدوپەنجا منداڵە بڕیار ئەدەین. سزادان ئەکەوێتە ئەو کاتەی کە ئاسفودەوڵە لە تارانا بێت، ئەم مەسەلە هیچ پیوەندییێکی بە هەڵگەڕاندنی منداڵەکان نیە. درەنگ ئەبێت ئەگەر هەر کاتێک لە دەس دەرچێت، چ کارێ گرینگتر لەمەتان هەیە، باشتر ئەمەیە ڕێکخراوی نائاسایی دیکە لە ڕۆژی پێنجشەممە پێک بێنین...

ئەحسەنودەوڵە: سەبارەت بە کچەکان چەند ڕۆژە پێناسە نووسەکان بە هۆی

بەرپرسایەتیکەوە کە وەزیری مالیە داویەتی ئەگەر دەزانن یا نە ئایا بە ئەم شێوە ڕۆیشتوون؟

ئاغاسەیدحوسەین: هەمووی ئەمانە بە هۆی زوڵمی ئاسەفودەولەیە.

ئەحسەنودەولە [نوێنەری تەورێز]: هەر لە بەیان تا نیمەڕۆ سەدوشەست کچیان فرۆشتووە، و لە مێوانخانەی تفلیس ئەجیریان کردووە...

ئاغاسەیدحوسەین: لە سەرحەد بۆ وەزیری دەرەوە و بۆ کاردار دەنووسن کە ئاسفودەڵە تا ئەو حەدەی لە سەر خەڵک زاڵ بووە هەتا ئەوانیش کچەکانیان بۆ دابین‌کردنی سەرانە دەفرۆشن، وەڵام ئەدەن ئێمە ناتوانین لە کاری ئەو بەرگری بکەین لە دەرەوەی وڵات کارەکەر و غوڵام نافرۆشن، چی بووە کە بەم جۆرە کچە ئێرانییەکان دەفرۆشن.

سەعدودەولە: ئەم نوێخوازیە ئەو دایهێناوە.

ئاغاسەیدحوسەین: بە هەمووی ئەو حوکمە تۆمار کراوانە لە دەفتەری وەزارەتی دەرەوە، تورکمەنەکان شەستودوو ژنی دووگیانیان بردووە، لە لێکۆڵینەوەیەک ئەم مەسەلە ڕوون بکەن کە....؟

نابێ کە ڕێکخراو لە کار دەست بکێشێت. [بۆ وەڵام دانەوە] ڕۆژێک وەزیری دەرەوە و ڕۆژێکی‌تر وەزیری ناوەخۆ بانگ بکەین.

ئاغا میرزا فەزڵعەلی ئاغا: ئەگەر ئەم ڕێکخراوە لە شەودا ساز بکرێت دیسانەوە ئێمە دین.

ئاغا سەید حوسەین: سالار موفەخەم [شادلوو] بانگ بکەین.

حاجی شێخ محەممەد تەقی: «وەزیری ناوەخۆ بەرپرسایەتی هەیە...»[262]

مەسەلەی فرۆشتنی کچەکانی قووچان یەکێ لەو بابەتانە بوو کە چەند مانگ زۆربەی ماوەی ڕێکخراوی قۆناغی یەکەم و دەوڵەتی داگیر کردووە. لە کۆبوونەوەی ڕۆژی شەممە ۱۳ موحەڕڕەم ۱۳۲۵ ئاغا سەیدحوسەین برووجردی جارێکی‌تر بەم جۆرە مەسەلەکە دەخاتە سەر باس:

ئاغا سەید حوسەین: سەبارەت بە شەست و دوو ژن [باچیانلوو] کە

---

[262]- وتووێژەکانی ڕێکخراو- قۆناغی یەکەمی یاسادانان- ل ۸٤.

[تورکمەنەکان] دزیویانە و چوارسەد و پەنجا نەفەر [کچان و منداڵانی کە ئاسفودەوڵە و کوڕەکەی ئەمیر حوسەین خان دەسەڵاتداری قووچان لە ڕێگەی دەرەگەز فرۆشتوویانە] ئەسیرەکانی قووچان چی دەفەرموون؟

وەزیر ئەفخەم[263]: ئاگادار نەبووم بەڵام بە دوای ئەم ئاگادارییە وەزیری ناوەخۆ لە [موزەفەرەدین]شا داوای کرد ئاسفودەوڵە لە کار بەرکەنار بکەن، ئەو بەرکەنار بوو و بە زووی لێکۆڵینەوەیەک ئەنجام ئەبێت.

ئاغا سەید حوسەین: لێکۆڵینەوەکان کە دەبێ بکرێ ئەنجام بووە، پێویستیکی بەم کارە نیە، دەبێ ئاسفودەوڵە بە هەر جۆرێ کە دەزانێ یا بە پارە یا بە دوو موساوی [؟] هەمووی ئەو ئەسیر و شەستودوو ژنە هەڵیان بگەڕێنێتەوە پاشان بۆ ئەوەی کە عیبرەتی بۆ ئەوانی دیکە بێت دەبێ کە سزا بکرێت.

ئاغا سەید حەسەن تەقیزادە: هەڵە بووە، لە دوو مانگی ڕابردوو بەڵێنیان داوە کە تەواوی ئەسیران و ئەوانی دیکە هەڵیانگەڕێنەوە؛ بەڵام ئێستا دەڵێن کە دەبێ لێکۆڵین. بەرکەناری ئاسفودەوڵەیش بوو بە کارێک. پێویستە جگە لە بەرکەناری، ئەو بە هەر شێوەیەک کە دەبێت هەڵیانگەڕێنێتەوە پاشان سزا ببێت...

ئاغا سەید حوسەین: پێویستی بە هاتنی [ئاسفودەوڵە] بو ئێرەدا نیە، حوکمێکی دەبێت هەتا خەیانەتی ئەم سێ ساڵە [حکومەتی زاڵمانەی ئەو لە خوراسانا] بسەلمێنین. جگە لە پارەی منداڵان، سەد کروور[264] پارەی بردووە.

ئاغا میرزا مەحموود [کتێبفرۆش]: جەنابی سەرۆک! بەندە لەم بوارەدا دەقێکم ئامادە کردووە. ئیزن بفەرموون تا لە خزمەتی نوێنەرانی ڕێکخراو ڕابگەینم، ئەو ئاگادارییانە ئەمەیە:

---

[263]- جێگری وەزیری ناوەخۆ- بەڵگەی ژوورەوە. ل ۹۲.

[264]- کروور لە لایەن ئێرانییەکان بەرامبەرە لەگەڵ پێنجسەد هەزار تمەن. فەرهەنگی موعین. ب ۳، ل ۲۹۵۹ بە پێی یادداشتەکانی قەزوینی. کە وا بوو ئاسفودەوڵە لە کارێکی جگە لە دزی و دەست درێژی و غارەتی خوراسان نەبووە، بە پارەی ئەوکاتە جگە لە فرۆشتنی منداڵمان یەک ملوێن و نیم تمەنی دزیبوو. ئەم دزی و جەنایەتە بە هۆی بێ بەهایی و شایان نەبوونی ئیلخانەکانی کوردی خوراسانی هاواکاتی ئەو بووە. ئەگەر ئەمیر حوسەین خانی شوجاعودەوڵە لە قووچانا بوو ئاوا کەسێک بوێری بە خۆی نادا کە وەها کارێک بکات.

لەم بوارەدا دوو مەسەلە هەیە: مەسەلەی هەوڵ فرۆشتنی کچانی بجنووردی و قووچانیە. بابەتی گرینگ ئەمەیە کە ساڵی ڕابردوو لە سەفەحاتی خوراسان گوللەیان خوارد بوو. خەڵکی سەفەحات تووشی قاقڕوگرانی بوون، لەم بارەوە داوانامەیەکیان پێشکەش بە پاشای شەهید[موزەفەرەدینشا][٢٦٥] کرد، شای شەهید دەستووری فەرموو کە بەرپرسی مالیە بۆ لێکۆڵینەوە و ڕاستکردنەوە [لە وەرگرتنی سەرانە] بڕوات. شازادە عەینودەولە[٢٦٦] [زالم] بە هۆی خەلاتێ کە لە حکوومەتی گشتی وەری گرتبوو[٢٦٧] بایەخێکی بە نامەکە نەدا.

بە تووڕەیی بۆ ئاسفودەوڵە نووسی کە دەبێ سەرانەکەدا بێن ببێت، ئاسفودەوڵە بۆ مافی خۆی مەبلەغێکی زۆری بە سەرانەکە زیاتر کرد و بۆ حاکمی سەرەکی نارد [وەکوو کوڕەکەی ئەمیر حوسەین خان دەسەلاتداری قووچان.] دیسان حاکمانی سەرەکی لە بەری مافی خۆیان نرخی سەرانەکەیان زۆرتر کرد و بە زۆر لە خەڵکیان وەرگرت[٢٦٨]، خەڵکیش بە ناچار و بە زۆر کچەکانی خۆیان فرۆشت، کار بە دەستانی ئاسفودەوڵە خۆیان گەلێک لەو کچانیانە کڕی بوو، دیسان بیستوومە کە تاقمێک لە کچەکانیان بە ئەرمەنییەکان فرۆشتووە.

بابەتی دووهەم ئەمەیە کە ژنانی خاوەنی شوو و منداڵی وڵاتەکەمانیان لە ڕووی زانینەوە بە ئەسیر دابوو. ڕاستی ئەم کێشە ئەمەیە کە سالار موفخەم بجنووردی [قارەمانی بەڕێزی شادلووی ئیلخانی بجنوورد] ساڵەهای ساڵە بۆ هەشتسەد و

---

[٢٦٥]- موزەفەرەرین شا لە ١٤ی جەمادیوسانی ساڵی ١٣٢٤ مانگی فەرمانی مەشرووتیەتی ئێرانی ئیمزا کرد و لە شەوی چوار شەممە ٢٤ زیقەعدە ١٣٢٤ مرد. تاریخ بیداری ایرانیان- ب ١ ل ٥٥٠ و ب ٢ ل ٥٧.

[٢٦٦]- عەینودەولە دوایین کارگێڕی قۆناغی ئیستبداد و لە دژەکانی سەر سەختی مەشرووتیەت بوو.

[٢٦٧]- مەبەست لە حکوومەتی گشتی ئاسفودەولە دەسەلاتداری خوراسانە، کە عەینودەولە ئەوی لە غارەت کردنی خەڵک ئازاد هێشتبوو و پاشان بە پشتیوانی کردن لە سزادانی ئەو بەرگری کرد.

[٢٦٨]- لە کۆ بوونەوەی ٦ سەفەری ١٣٢٥ ئاغا میرزا فەزلعەلی لە نوێنەرانی تەورێز لەم بابەتە ڕایگەیاند: سەرانەیەک کە بۆ خێڵی کورد و شاسەوەن دیاری کراو مەبلەغی هەشت هەزار تمەن بوو، بەلام حوکام و بەر پرسانی حکوومەت چل هەزار تمەنیان وەرئەگرت. ئەم کارانە دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکیان لە ڕێ کۆڵ نەدان دەمرن یا دەرباز دەبن بۆ کێو و بیاوان و لە بەرامبەری دەولەتدا یاخیگەری دەکەن.

کەسری سوارەکانی خۆی لە دەوڵەت ڕۆژانە و بەش وەرئەگرێت. تەنیا خزمەتی ئەو سوارانە دەبێتە پاراستنی دەربەند کە جێگەی هات و چووی خێڵی تورکمەن بۆ بجنووردە.

دوو ساڵ پێش کە [محەمەدناسرخان زەعفەرانلوو] شوجاعودەولەی قووچانی مرد، ئاسفودەولە حکوومەتی قووچانی لە بنەماڵەی ئەوان سەند؛ یەکێکی بە هۆی ئەوەی کە کچی شوجاعودەولە[269] براژنی سالار موفەخەمی بجنووردی بوو، یەکێکیتر ئەوەی کە سالار موفخەم ئەیویست بە کاربەدەستانی دەوڵەت ڕابگەینێ کە جگە لە خێڵی ئێمە کەسێکی دیکە ناتوانێ حکوومەتی سەرحەدی خوراسان بە دەست بگرێت [ئەڵبەت کە ئەمە ڕاستییێکی مێژوویی بوو]. هەروەها ئەیویست بێ بایەخی کوڕی ئاسفودەولە بە دەوڵەت بسەلمێنێت، بە تایبەت بە هاندانی تورکمەنەکان خێڵی گوگلان بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەوان لە ڕێگەی خاکی دەربەند- کە لە خزمەتتان دا گوتم و ڕۆیشتن بۆ بجنوورد تا بچنە نێو سەرحەدی قووچان و نزیکەی شەست ودوو ژن و کچیان بە ئەسیری [برد]، نزیک بە شەست نەفەریان کوشت، و پێنج هەزار تمەنیان بە تالان برد، دیسان لە خاکی بجنوورد هەڵگەڕانەوە و ئەسیرەکانیان بە تورکمەنەکان فرۆشت و نیوەی لەو پەنجا هەزار تمەن[270] ئەموالی بە تالان چووە و نیوەی نرخی فرۆشتنی ئەسیرەکان ئەیدەن بە سالار موفەخەم. ئەم کێشە بە گوێ شازادە عەینودەولە [کارگێڕی ئەو سەردەمە] گەیشت. عەینودەولە تێگەیشت کە سالار موفەخەم زوڵمی کردووە، مرۆخانی[271] تورکمان ناسراو بە ڕەشید نزام لەگەڵ چەند سوار ڕەوانە کرد تا سالار موفەخەم وادار بکەن کە ئەسیرەکان هەڵگەڕێنێتەوە. سالار موفەخەم بەم حوکمە هیچ بەها و

---

[269]- ئێران ئاغا، کچی سەرداری بجنوورد هەر ئەم ژنە بوو کە دەبێتە خۆشکی عەبدوڕڕەزاخانی شوجاعودەولە.

[270]- لە پێشوو باسکرا کە ئەو نرخە پێنج هەزار تمەن بوو، پێم وایە پەنجا هەزار تمەن درووست بێت، بۆ ئەوەی کە لە ئاوا غارەتێکدا زۆرتر لە شەست پیاوی باچیانلوو کوژراوە و شەست و دوو ژن و کچ ئەسیر کراوە، ئەموالی زەوت کراو پتر لە پێنج هەزار تمەن بووبێت.

[271]- مەبەست لە مرۆخان، مورادخانە.

بایەخێکی نەدا، پاشان عەلی ئەکبەرخان، سەرهەنگ یافتابادی[۲۷۲] لەگەڵ چەند سوار
لە دژگەی موبارەکە بەرپرسایەتیان پێدرا، بەڵام دیسانەوە سرنجێکی نەدا هەت
ئاسفودەوڵە، موزەفەرنزامی لەگەڵ گرووپێکی تایبەتی نارد تا ئەو [سالار موفخەم] لە
بجنوورد بۆ تاران بێرنەوە، بەڵام پێش ئەوەی کە سالارموفەخەم بێتەوە بۆ تاران دە
هەزار تمەن بەراتی تجارەتی لە لایەن ڕەشیدنزامەوە بۆ عەینودەوڵە نارد هەتا لەم
مەسەلە بیر و بڕوای بگۆڕێتەوە؛ عەینودەڵە بە هەمووی ئەو دڵ ڕەقییە کە [هەیەتی
گوتی کە دەبێ بۆ خەیانەتێ کە سالار موفەخەم بە سەر دەوڵەت و خەلک کردوویە
سەری ببڕن. ئەویش دە هەزار تمەنەکەی وەرنەگرت، بە دوای ئەوەی کە سالا
موفەخەم هاتە نێو تاران[۲۷۳] لە کاتی هاتنی [محەممەد عەلی میرزای وەلی عەهد لە
تەورێز بۆ تاران] بە هۆی ڕادەی ناسیاوی لەگەڵ جەنابی وەزیر نزام، چەند مەنزڵ لە
ئوردووی کەیوان‌شکوو پێشوازی کرد بەڵکوو ئەم مەسەلە لە بەر چاوی هومایوونی
دابشاردرێتەوە، شوکر بۆ خودا ئەم مەسەلانە لە چاوی ئەنوەری ئەعلاحەزرەت بە
هەڵە داناپۆشرێت.

ئێستا کە بەندە یەکێ لە نوێنەرانی خەلکم، ئەمە ڕادەگەینم کە بەندە لەگەڵ
هەموو نوێنەرەکانی دیکە ئەسیران و نەتەوەی خۆم بە تەواوی لە جەنابی وەزیری
ناوەخۆ داوا دەکەم، و هیچ کارێکم بەم کارانە نیە، پێویستە لە نرخێ کە بۆ ئەسیران
ئەوانی دیکە گیراوە یان لە نرخی ڕۆژانەی سوارانی بجنووردی [کە ئەرکێ ئەنجا
نادەن] یان مووچەی سالار موفەخەم بیدەن هەتا ئەسیرانی ولاتەکەمان کە
نامووسی ئێمەن هەڵیان‌گەڕێنەوە و بە خاوەنەکانیان بیاندەن. ئەگەر جەنابی
وەزیری ولات حەز بەم کارە بکەن و ئاگادار بن کە ئەم کاربەدەستانە لە سەفەحات
تا چە ڕادەیەک زلم و دەست درێژی دەکەن، حکوومەتی بجنوورد و قووچان لە
لایەن دەوڵەتدا بدەن بە کەسانێک بێجگە لەم دوو بنەماڵە هەتا خەلکی سەفەحا
لە ئازادیدا بژین، پاشان ڕابگەینن هەر کەسێ ڕەفتار و هەڵسوکەوتێکی خراپ
نالەباری کەوتە بەرچاو ڕاپۆرتی بە دەوڵەت بدات. ئەو کاتەیە کە دەبینن لـ

---

[۲۷۲]- لە دەق: یافتابئابادی.

[۲۷۳]- لەم کاتەدا عەینودەوڵە لە کارگێری بەرکەنار بوو.

سەفەحاتدا چی ڕوویداوە. بە هۆی ئەوەی کـە ئەسـیرەکانیان بـۆ دەرەوەی خـاکی ئێران بردووە [بردوویانە بۆ ڕووسیە] ناتوانین بە زۆر و جەبر هەڵیانگەڕێنەوە، دەبێ ئەو پارانەی کە لە دەست دەرچوو ئەسیرەکان بکڕین.

(بۆ وتارەکانی ئاغا میرزا مـەحموود ئەنـدامانی بـەڕێزی ڕێکخـراو و بینـەرەکان کەوتنە گریان.)

سـەیدولحوکەما: خەڵـکی یـەمووت [تورکمەنـەکان] بـۆ هەڵـگەڕاندنی [ئەسیرەکان] ئامادەن، ئەگەر ئەوان نەبن ئێمە ناتوانین کارێ بکەین!

حاجی محەممەد ئیسمائیل: بڕیاردان ئەرکی ڕێکخراوە یان وەزیری ناوەخۆ؟

سەعدودەولە: کاری وەزیری ناوەخۆیە. دەبێ لە وەزیری ناوەخۆ داوا بکـەین بـۆ هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان حوکم بدات.

لەم نوێنەرانی ڕێکخراوی شۆرا لەم بارەوە باس دەکەن، هەر کەسێک سـەبارەت ـە هەڵـگەڕاندنی ئەسـیرەکان قـسەیک دەکـا، وەکـوو: «ئاغـا سـەید محەممـەد وجتەهید تەباتەبایی لە ڕێبەرانی مەشرووتیەت ئەڵێ - سالار موفەخـەم ئەڵـێ کـە اسفودەولە پارەی وەرگرتووە، ڕاست و درۆی نازانم.»

ئاغا میرزا مەحموود خانساری: درۆ ئەڵێ...

ئاغا سەید حەسەن تەقیزادە[٢٧٤]: دەبێ ئاسفودەولە بانـگ بکـەن، هەڵـگەڕاندن ەرکی دەوڵەتە.

ئاغـا سـەید حوسـەین[٢٧٥]: دوو بابـەت هەیـە: ئـەوەی کـە بـە فـرۆش چـووە اسفودەوڵـە دەبـێ کـە بیداتـەوە، ئـەوەی کـە غـارەت کـراوە دەبـێ دەوڵـەت ەڵیگەڕێنێتەوە.

ئاغا میرزا فەزڵعەلی: ئەوەی کە فرۆشیاوە ئەگەر ئاسفودەولە گیانیـشی دەرچـێ ،ەبێ کە بیداتەوە...

سەرۆک: بە کورتی دیـارکرا کـە ڕێکخـراو لـە دەوڵـەت دوو داخـوازی هەیـە: ەکێکی هەڵگەڕاندنی ئەسیران، ئەوی‌تر سزادانی کەسانێ کە تاوانبارن.

---

٢٧[٤]- نوێنەری ئازەربایجان و لە توند ڕەوانی ڕێکخراو.

٢٧[٥]- ڕەنگە مەبەست ئاغای سەید حوسەین برووجردی [موجتەهیدی بە ناوبانگ کە لە خاکـەلێـوەی ١٣٤٠ مرد] ناسراو بە مودیرولئیسلام و نوێنەری ئەسناف بێت. تاریخ بیداری ایرانیان ب ١ ل ٦٣٥.

لە وەزیری ئەفخەم داوا دەکەین ئەم دوو کارە ئەنجام بدەن...

ئاغا سەید حەسەن تەقیزادە: ڕێکخراو داخوازی هەیە، مافی بە دواچوونی ئەم مەسەلەیە هەیە. ماوەی دەوێت. گوتیان بیست ڕۆژ بەلکوو بیست مانگ بێت...

ئاغا سەید عەبدوڵلا [بێهبەهانی]: هەتا بیست ڕۆژی دیکە دەڵێن ئەسیرەکان لێرەدا نین، ماوەی زۆری دەوێت...

ئاغا سەید حوسەین: گوتم پێویستە ڕێکخراو بە هەر شێوەیەک کە دەبێ بە زۆر هەڵیانگەڕێنێتەوە.

دوکتور وەلیوڵلاخان: بە زۆر کە فەرمووتان درووستە، بەڵام ڕەوشت و خووی تورکمەنەکان غارەت و دزییە، و لەم بەینە بە جۆرێک کڕین و فرۆشتن کراوە، بە بڕوایێ ئەگەر ئەبێت بە هەر شێوەیەک بۆ تورکمەنەکان دابێن بکەن، ئەگەر ئەوەی کە گوتم ئەنجام ببێت حەتمەن هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان ڕەنگە دەبێت. ئەگەر ئەسیرەکان لە بوخارا و تەمسک [؟]دا بن پەیدا دەبن...»[٢٧٦]

لە کۆ بوونەوەی ڕۆژی یەکشەممە دووهەمی سەفەری ١٣٢٥ دەبیرولمولک تلێگرافێ کە لە لایەن حکوومەتی ئەستەرئاوا و بە بۆنەی ئەسیرانی قووچان بۆ وەزارەتی وڵات گەیشتبوو بەم شێوەیە دەیخوێنێ کە ناوەرۆکی بەم جۆرەیە؛ کە تا ئێستا کڕینی ئەسیران لە تورکمەنەکانی یەمووت چاکترین ڕێگەی بێشەڕ و خوێنڕێژی زانیوە، بۆ چوونی ڕێکخراو لەم بارەوە چیە؟

میرزا مەحموود خانساری: ... بەو جۆرە کە بۆ تەواوی کار بە دەستانی دەوڵەت و نوێنەرانی بەڕێز دەرکەوتووە؛ لەم کارە سالار موفەخەم تاوانبارە، بە پێی لێکۆڵینەوەی درووست سالارموفەخەم بجنووردی تورکمەنەکانی خێڵی یەمووتی بەم کارە هان داوە تا بچنە نێو خاکی بجنوورد و دەستووری داوە بچنە نێو سەرحەدی قووچان و دوای کوشتنی چەند نەفەر و دزینی پەنجا هەزار تمەن ئەموالیو بردنی شەست و دوو ژن بە ئەسیری، دیسانەوە بۆ خاکی بجنوورد و لەوێدا بۆ شوێنی خۆیان هەڵگەڕێنەوە. دوای فرۆشتنی ئەسیران و دزینی ئەموال، نیوەی هەمووی ئەوانەیان بە سالار موفەخەمدا، پاشان دەرکەوت کە دوو نەفەر لەو ئەسیرانە

---

[٢٧٦]- وتووێژەکانی ڕێکخراو- قۆناغی یەکەم- ل ٩٣.

خەڵـکی بجنـووردن، [سـالار موفەخـەم] ئـەو دوو نەفەریـە بـێ هـیچ شـتێک بـە خاوەنـەکانیان داوە. ئێـستا چ زیـانێکی هەیـە هـەر ئـەم نرخـە لـە سـالارموفخەم وەریبگرن و بیدەن تا ئەسیرەکان هەڵگەڕێنەوە بۆ لای خاوەنـەکانیان؟ و بـە هـۆی ئەوەی کە سالارموفخەم ئـەم مـارە ناشـیرین و نالەباریـە کـردووە. بـە پێـی یاسـای محەممەدی (د. خ) سزا بـدرێت، بـەڵام ئـەو کچانـەی کـە لـە قووچـان و دیکـەی شوێنەکان فرۆشتوویانە دەبـێ ئاسفودەولـە و [عەبـدوڕڕەزا خـان] شوجاعودەولـەی قووچـانی ئـەم ئەرکـە بـە ئـەنجام بگـەینێت، پێوەنـدیکی بـە ئەسـیرانی قووچـان نیە...»[۲۷۷].

لە باس و وتووێژەکانی ڕۆژی سێشەممە ٤ سەفەری ۱۳۲۵ وسووقودەولە[۲۷۸] بە مەسەلەی ناردنی بەرپرسی مالیە بۆ خوراسان لە کاتی موزەفەرەدینشا ئاماژەی کـرد کە جیاتی ئەوەی کە گیر و گرفتی خەڵک چارە بکەن هەموو شتێک لە ئەنجامدا بە سوودی ئاسفودەولە تەواو بووە. هەروەها کە دەیبینن:

«لە کاتی سەدارەتی عەینودەولە چەند نەفەریان نارد هـەتا لـە خەڵـکی دەوری خوراسان هەتا سیستان[۲۷۹] و هەروەها قووچان و ناوچەکانی سەر بـەو شـوێنە ماڵـیە وەرگرن، ئاکامی ماڵیەکە ئەوە بوو کە پاش لێکۆڵینەوەی وەزیری ماڵیە بوو بە هەشتا هەزار تمەن نەقد و هەشتا هەزار خەروار جۆ؛ بەڵام ئاسەفودەولە داوای کرد کە سـی هەزار تمـەن پـارە بـە ژێردەسـتانی ئـەو بـدەن، و هەشـتا هـەزار تمـەن بمێنێـت. کۆمسیۆن لەم بابەتەوە حوکمیدا کە ئەم سی هەزار تمەنە هەڵـنەگیرێ و لـە نێـوی ڕێسانکار نەنووسرێ.»

لە کۆبوونەوەی ڕۆژی پێنج شەممە ۱۳ سەفەری ۱۳۲۵ جـارێکیتـر مەسـەلەی ئەسیرانی قووچان لە لایەن سەید حەسەن تەقیزادە بەم جۆرە باس کرا:

---

۲۷۷- وتووێژەکانی ڕێکخراو- قۆناغی یەکەم- ل ۱۰۹.

۲۷۸- وسووقودەولە لەم کاتەدا نوێنەری ڕێکخراوی ئەنجومەنی نەتەوەیی بوو، بـە دوای بـەرکـەنـاری محەممەد عەلیشا بوو بە سەرۆکی لێژنەی بەرپرسایەتی وڵات، ئـەو چواردەهـەمـین وەزیـری ئێـران و هۆکاری بەستنی بڕیارنامەی شەرماوەری ۹۱۹، هەیە کە ئێرانی بە ئینگلیس فرۆشـت. فـەرهـەنگـی فارسی دوکتور موعین، ب ٦.

۲۷۹- سیستان هەتا سەرەتای پاشایەتی ڕەزا شا سەر بە شاری خوراسان بووە.

«... تا ئێستا سێ مانگە سەبارەت بە ئەسیرانی قووچان و ئاسفودەولە باس کراوە، بۆچی لە وەزیری ناوەخۆ نەیانپرسیوە کە تا ئێستا چی کردووە؟ و سێ ڕۆژە ئاسفودەولە [خوراسان] هاتووەتەوە، چییان کردووە؟ پێویستە ئەسیرەکان هەڵگەڕێنەوە. چارەی ئەم کارە چیە؟

سەرۆک: عیلاجی ئەمەیە کە لە وەزارەتیناوخۆ داوا بکەین.»

لە کۆ بوونەوەی شەممە ۱۵ سەفەری ۱۳۲۵ ڕێکخراوی شەورای میللی- ئاغا میرزا ئەبولحەسەن لە نوێنەرانی ڕێکخراو بەیانی کرد:

لە چەند ڕۆژی پێش سەبارەت بە مەسەلەی قووچان باس کرا، گریان و بەزەیییان پێدا هات، و بە وەزارەتی ناوەخۆ ڕایانگەیاند بەڵام هێشتا کاریگەر نەبووە. ئەڵێن حکوومەتی خوراسان چوار ڕۆژە ئەگەر ئاغایان هاوڕێیی دەکەن وەزیری ناوەخۆ بانگ بکەین و بپرسین لەم بابەتەوە چی کردووە؟ مەسەلەیەک کە لە ڕێکخراوی شەورای میللی لە سەری ئەدوێت دەبێ بە ئەنجامێک بگەیت. (هەر بەم بۆنە داوانامەیەک بۆ سەعدودەولە لە لایەن خەڵکی بجنوورد گەیشتووە کە لە ڕێکخراو بیخوێنن چۆنکە زۆر بوو لە دەفتەری ڕێکخراو بە کورتی دەینووسن و پاشان دەیخوێنن)

وەکیلوتوجار: دەبێ ئەمە بزانین بە ئەنجام نەگەیشتنی کارەکان لە خۆمانەوە سەرچاوە دەگرێت، تەنیا وتووێژەکان نیە کە بێئەنجامە بەلکوو هەموو مەسەلەکانی دیکە کە لە سەریان بڕیار ئەدەین هەروایە، ئەگەر قانوونی ڕشوە و ڕشوەدەر کە بە سەری حوکم درا دەیاننووسی و بە جەنابی هومایوونی ئەدرا: ئەمڕۆ بەم جۆرە مەنسەب فرۆشی و حکوومەت فرۆشی ڕووی نادا...

ئاغا میرزا ئەبولحەسەن خان: ئەوەی کە سەبارەت بە ئەسیرانی قووچان و ئاسفودەولە گوتم لە ڕۆژنامەی «تایمس ئینگلیس»[۲۸۰] خوێندم کە هەموو باسەکانی ڕێکخراوی نووسیوە، هەروەها مەسەلەی فرۆشتنی کچەکان لە تفلیس [بە ئەرمەنییەکان] و چوار سەد و وردەی کە بە بۆنەی فرۆشتنی کچەکان بە تورکمەنەکانیان داوە، هەروەها قسەیەکیان بە زمانی جەنابی سەرۆکی مەزن

---

[۲۸۰]- تایمز لەندەن لە ڕۆژنامەکانی بە ناوبانگی جیهان.

نووسیوە کە حەقیقەتی نیە و ئـەوەش ئەمەیـە: حاکمـانی شـارەکان داوای پـارە لـە خەڵک دەکەن، خەڵکیش بۆ دانی پارە دەبێ مندالانی خۆیان بفرۆشن.

ئەم بابەتە گرینگە کە لە وەها ڕۆژنامەیەکی بە ناوبانگی تەواوی دونیا چاپ بـووە، ئەگەر ئێمە وەڵامێ نەدەین و کـارێ نەکـەین دەکەوینـە بـەر تیروتانـە و ڕەخنـەی هەموو خەڵکی دونیا. ئەڵبەت دەبێ وەزیری ناوەخۆ بانگ کەین و بە جـەغتی زۆرتـر لە پێشوو داوا بکەین کە لەو بارەوە چی کردووە...»

هەر لە ئەم کۆبوونەوەدا سەرۆکی بازرگانەکان ئەڵێ کە دوێنـێ خوراسـانییەکان داوایان کردووە لە مەشـهەد بچـم بـۆ تلێگرافخانـە، خەڵـکی مەشـهەد «تلێگرافیـان کردووە کە ئاسفودەولە کالایەکی هەیە و ڕوخسەتی گرتووە کە بۆ دەرەوە بینێـرێ و هەر ئەم مەسەلە بوەتە هۆی ترسینی خەڵک و گرانی کالا...»[٢٨١]. لـە کۆبوونـەوەی ڕۆژێ سـێ شـەممە ١٨ سـەفەری ١٣٢٥ دیـسان بابـەتی هەڵـگەڕاندنی ئەسـیرانی قووچان باسی کرا.

«ئاغا میرزا ئەبولحەسەن خان: ئەو ڕۆژەی کـە وەزیرەکـان بـۆ وڵام دان و ڕوون کردنی پرسیارەکان ئامادە دەبن، هەتا پرسیارەکان دوایی نەیت خەریکی باسـێکیتـر نابین. پێرێ لە ڕێکخراو لـە بـارەی ئەسـیرانی قووچـان و ئاسفودەولـە بـاس کـرا و بڕیاریاندا لە جەنابی وەزیری ناوەخۆ داوا بکەن کە ئەم مەسـەلە ڕوون بکـات و بـڵێ لەم بارەوە چییان کردووە؟ ئێستا ئەمانەوێ بزانین چییان کردووە تا هەر بەو جـۆرە کـە هەواڵـی ئەسـیرەکان و فرۆشـتنی کچـەکان لـە ڕۆژنامەکانـدا بـڵاو بووەتـەوە، دادپەروەری ئەعلاحەزرەت هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان بە چاپ بگات.

وەزیری ناوەخۆ: هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان شتانێکی زۆری پێویـستە. بـەڵام لـە

---

[٢٨١]- ئاسفودەولە وەکوو دیکەی دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمە کاتێ دەچێتە خوراسان هەموو سالـێک گەنم و جۆی کە هۆکاری سەرەکی ڕزقی خەڵک بـووە. بـە زۆر و بـە نرخێکـی زۆر هـەرزان لـەوانی ئەکڕی و کەڵەکەی ئەکرد. تاریخی بیداری ایرانیان- چاپی سێهەم ب ١، ل ٣٩٧.
بە دوای ئەمەی کە گەنمی سەرانسەری خوراسان لە ئەنباری ئەو کۆ ئەکرا، پاشان هـەر ئـەوەیـە بـە نرخی دڵخوازی خۆی و بە مەرجێکی سەخت دەیفرۆشتە خەڵـکی قاقڕلێ دراو و هـەر بـەم بۆنـەوە پارەیەکی زۆر حەرامی ئەدزی. لەم تلێگرافە مەبەست لە کالا هەر ئەو گەنمـەیـە کـە ئـەیویـست بـۆ وڵاتەکانی شەورەوی و هیندووستان بینێرێ و بە کوشتنی خەڵکی خوراسان لە برسـییەتی، ئـاخرین خەنجەری خۆی بوەشێنێت.

بارەی ئاسفودەولە چەند جار لەگەڵیا قسەیان کرد، دەڵێ: کۆمسیۆنێ لە وەزیرەکان و ئەوانی دیکە لە دەرباریگەل لە عەدلیە پێکبێنن ئەگەر بەڵگەیان هێنا کە ئەم کارانە بە دەستی من ڕووی داوە لە هەموو کارەکان بەرکەنارم بکەن و بۆ هەرچی بڵێن ئامادەم.[٢٨٢]

ئاغا میرزا ئەبولحەسەن خان: بەڵام سەبارەت بە ئاسفودەولە ئایا جەنابتان لە بیرتان نیە کە ئەو ڕۆژە لەم بابەتەوە لە ڕێکخراو وتوویژ کرا و فەرمووتان ئاسفودەولە تاوانبارە و بەم بۆنەوە بەرکەنار بووە؟ و هەروەها نەبیولمولک لە ڕێکخراو ڕایانگەیاند هەندێک بەڵگە لە وەزارەتی دەرەوە هەیە کە ڕاستی ئەم مەسەلە ئەسەلمێنێ و هەروەها لە بارەی هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان فەرمووتان کەل‌وپەلی پێویستە، درووستە بەڵام ئەو کەسەی کە تاوانبارە بە کام سزای تاوانی خۆی گەیشتووە؟

وەزیری ناوەخۆ: ڕێکخراوێکمان لە وەزیرەکان پێک هێنا، بە دوای وتوویژ و ڕاوێژکاری ڕاپۆرتەکەیان نووسی و بە دەست و خەتی هومایوونی ئیمزا کرا و دەبێ جێ بەجێ ببێت.

ئاغا میرزا مەحموود [کتێبفرۆش]: حەزرەتی وا وەزیری دادگا[٢٨٣] فەرموویان دەبێ بە دوای مەسەلەکە بچن. سەرەتای وتاری بەندە سەبارەت بە ئەسیرانی قووچانە، پێم وایە لە سی و پێنج ڕۆژی ڕابردوو و هەر لەم ڕێکخراوە گوتم کە سالار موفەخەم ئەم کاریە کردووە بە تایبەت بە هۆی دوژمەنایەتی بە بۆنەی بەرکەناری شوجاعودەولە لە حکوومەتی قووچان، تورکمەنەکانی بانگ کرد و کارەکەرەکەی خۆی بۆ تاقی کردنی ناوچەکە لە ناوچەی قووچان نارد کە هەفت نەفەر ئەکوژن و شەست ودوو نەفەر ئەسیر ئەکەن و ئەموالێکیش بە غارەت دەبەن. جەنابی وەزیری

---

[٢٨٢]- ئەڵبەت ئاسفودەولە بێجگە لە یەک جار نەبێت بۆ دادگاه نەهات، چۆنکە وەزیرەکان و دەربارییەکان و تاقمێک لە وەکیلانی ڕێکخراو نان خوەری سفرەی نەعمەتێ بوون کە ئەو لە خوراسان هێنا بووی یا لە پێشەوە هەنارد بووی. ئەمەی کە وەزیری ناوەخۆ ئەڵێ وتوویژ بووە، ئەم جۆر وتوویژانە لە ماڵی ئاسفودەولە بووە نە لە پای مێزی موحاکمە.

[٢٨٣]- بە پێی بەرنامەیەک، ئەندامانی گرووپی نوێ وەزیران لە کۆبوونەوەی ڕۆژی ٦ سەفەری ١٣٢٥ بە ڕێکخراوی شەورای میللی ڕاگەیاندرا، شازادەی فەرماندەی ئیمە قاجار بۆ وەزارەتی دادگا و وەزیر ئەفخەم کە هەتا ئەوکاتە جێگری وەزارەتی ناوەخۆ بوو، بە مەقامی وەزارەتی ناوەخۆ دیاری کران.

ناوەخۆ [ئەو سەردەمە] خۆیان گوتیان لەم بابەتە کاریٚ دەکەن. ڕۆژێکی‌تر وەزیر ئەفخەم جێگری وەزارەتی ناوەخۆ[٢٨٤] و بە نانوسەڵتەنە فەرمانبەری ئاسفودەولە لە ڕێکخراو بوون، هەر ئەم بابەتە ڕایگەیاند کە بە نانوسەڵتەنە هەمووی ئەوانەی بە ڕاست زانی و گوتی ڕەنگە مەحموود [ئاماژە بە خۆی] خۆی لەوێدا بووە و دیسان ماوەیەک لەمەو پێش ئەمیری مەزن تلێگرافێکی نارد کە سالارموفەخەم ئەم کاریە کردووە، کە وابوو ئەڵێم ئەم کەسە بە یاسای ئیسلام دەبیٚ چ سزایەک بدرێت؟ وەزیری عەدلیە وەلامی‌دا هەر ئەو شتەی کە پیاوانی گەورەی دین دابێنی بکەن. پاشان ڕاپۆرتی وەزارەتی وڵات سەبارەت بە هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان کە بە دەست و خەتی هومایوونی ئیمزا کراوە، خوێنرا کە ئەنجام و کورتەی ئەو ڕاپۆرتە نزیک بەم بابەتەیە:

تەواوی وەزیرەکان بەم جۆرە بڕیاریان‌دا کە بۆ هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان حکوومەتی ئەو سەردەمەی قووچان و بجنوورد سی و پێنج هەزار تمەن بدەن، بەم جۆرە کە «حکوومەتی قووچان پانزە هەزار تمەن[٢٨٥] و حکوومەتی بجنوورد بیست هەزار تمەن، و ئەم سی و پێنج هەزار تمەنە بۆ ئەمینی لە ئەستەرئاوا [گورگان] ئەنێردرێت کە بە دەستی ئەمیری مەزن بۆ لەشکەرکێشی خەرج بکرێت و هەروەها دەست و خەتی هومایوونی بەو شێوەیە کە نووسراوە ئەنجام ببێت. (لەم کاتە باس و وتووێژێکی زۆر دەستی پێکرد).

ئاغای سەعدودەولە[٢٨٦] ڕایگەیاند کە لە کام دادگا دەسەڵاتداری قووچان و بجنوورد و خوراسانیان دادگایی کردووە هەتا ئێمە بزانین هەر ئەمە سزای ئەوانە؟ وەزیری عەدلیە گوتیان ئەمە سزایەکی زۆرە. ئاغای حاجی سەید نەسروڵڵا گوتیان

---

[٢٨٤]- بە پێی بەرنامەیەک، ئەندامانی گرووپی نویٚ وەزیران لە کۆبوونەوەی ڕۆژی ٦ سەفەری ١٣٢٥ بە ڕێکخراوی ئەنجومەنی نەتەوەیی ڕاگەیاندرا، شازادەی فەرماندەی ئێمە بۆ وەزارەتی دادگا و وەزیر ئەفخەم کە هەتا ئەوکاتە جێگری وەزارەتی ناوەخۆ بوو، بە مەقامی وەزارەتی ناوەخۆ دیاری کران.

[٢٨٥]- مەبەست لە حکوومەتی ئەو سەردەمەی قووچان، ئەمیر حوسەین خان کوڕی ئاسفودەولەیە نەک عەبدوڕڕەزا خانی شوجاعودەولەی زەعفەرانلوو.

[٢٨٦]- میرزا جەواد خان سەعدودەولە لە شۆڕشییەکان مەشروتیەت بوو کە بۆ یەزد دوور خراوە، دوای سەرکەوتنی شۆڕش مەشرووتیەت بوو بە نوێنەری ڕێکخراو. تاریخ بیداری ایرانیان، ب ١، ل ٦٣٣.

ئەم کارە ئێستا بۆ هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکانە، دیسان کۆمەڵێک گوتیان ئەو تاوانبارە و هۆکاری سەرەکی ئاسفودەوڵەیە. بە هۆی ئەوەی کە وتووێژەکان وردە وردە زۆرتر بوو، ئەندامانی ڕێکخراو بۆ ئەوەی کە ماندوویەتی لە لەشیان دەرچێت بۆ ژوورێکی تر ڕۆیشتن...»[٢٨٧].

هەروەها کە دەیبینن نە تەنیا وەزیرەکان بەڵکوو محەممەدعەلیشا کە لە سەرەتا دژی مەشرووتە بووە، لە سەر بڕیاری سەرەوە حوکمیدا. هەر بەم بۆنە سەعدودەوڵە بە بێ بەهایی و بێهوودەیی ئەم بڕیارە کە لە ڕاستیدا حوکمێکی زاڵمانە بوو، نارەزایەتی خۆی نیشان ئەدات. بە باشی ئاشکرا بوو کە محەممەدعەلیشا و سالارموفەخەم بجنووردی و وەزیری عەدلیە و وەزیری ناوەخۆ و ئاسفودەوڵە هەموویان سەلک و قنچک سیروپیازێکن و بە هیچ جۆرێک بە حکوومەتی مەشرووتە و جێگیر بوونی ڕێکخراو ڕازی نەبوون. کە وایە هەموویان لایەنگری یەک بوون.

محەممەدعەلیشا بۆ ئەوەی کە سالار موفەخەم لە بەدبەختی بەدەربێنێت و یارمەتی بدات، سووکە غەرامەیەکی بۆی دەرئەبڕێ؛ بەڵام نوێنەزانی قۆناغی یەکەم بە ئەوەی کە تووشی ترس وگیر وگرفت بوون هەوڵیان ئەدا بە هەر شێوەیەک کە دەبێت مەسەلەی ئەسیرەکانی قووچان چارەسەری بکەن و پاشماوەی هێز و دەسەڵاتی زاڵمان و ستەمکارەکان کۆتایی بێنن. لە ڕاستیدا مەسەلەی ئەسیرانی قووچان بوو بە کێشەیەک و داخی سیاسی ڕۆژە کە لە نێوان دوو هێزی دژ بە یەک ڕووی دابوو؛ یەکێ هێزی زۆر و دەسەڵات، ئەویتر هێزی یاسا و پاراستنی مەشرووتە. بە باشی ئاشکرا بوو کە ئەگەر هەر کامێکیان سەر ئەکەوت، ئەویەک لە ناو ئەچوا.

لە کۆ بوونەوەی شەممە٢٩ سەفەری١٣٢٥ لە لایەن چەند نوێنەر ئەم پرسیارانە باس کرا:

«...سەبارەت بە ئامادە بوونی ئاسفودەوڵە بۆ چارەسەری و هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان چی دەفەرموون؟ وەڵامیاندا کە بە وەزارەتی وڵات ڕاپانگەیاندووە کە

---

[٢٨٧]- باسەکانی ڕێکخراو- قۆناغی یەکەم، ل ١٢٥.

لەم بابەتە وریایی و هەڕەشەیەک بکرێت. یەکێ نوێنەرەکان گوتیان لە چەند ڕۆژی ڕابردوو باس کرا و بڕیاریان‌دا کە ئاسفودەوڵە لەگەڵ وەزارەتی عەدلیە و چەند کەس لە لایەن ئەوان لە ژوورێکی جیاوازدا ئامادە بن تا بەرنامەکان ڕوون بێتەوە.

یەکێکیتر ئەمەیە کە ئاسفودەوڵە لە ڕێکخراو بۆچوونی خۆی بەم جۆرە دەرئەبڕێ کە پێوەندیکی بە من نیە، ئەگەر پاشایەتی ئێران بە مەشرووتە گۆڕاوە، من لە ستەمی خۆم دەست هەڵناگرم...

ئاغا میرزا سەید محەممەد موجتەهید [تەباتەبایی]: بەڵام ئاسفودەوڵە چەند بۆ من پەیامی ناردووە کە من ئامادەم لە هەر شوێنێک کە بڵێن لەوێدا بم، و ئەوەی کە لەلایەن بەندە ڕووی داوە بە ئەستۆی دەگرم [و ئەو شتەی کە نەتوانن بیسەلمێنن دەستم خوش بێت!] ئەمە نیشان ئەدات کە ئەو پیاوێکی عاقڵە و نابێ ئاوا قسەیەکی کردبێ، ئەڵبەت ئەگەر وایە پێویستە سزا بکرێت...

سەردار موفەخەم لاریجانی کە لە پێشدا دەسەڵاتداری ئەستەئاوا بوو لە مەسەلەی ئەسیرەکان بە باشی ئاگادار بوو، کە وایە ڕێگەی هەڵگەڕاندنی ئەوان بە دەستی ئەو ئاسانە[٢٨٨]. چا ئەوەیە وەزارەتی ناوەخۆ لەگەڵ ئەودا بۆ ئامادە بوون لە ڕێکخراو بانگ بکەن کە لەم بابەتە باس بکرێت، ڕەنگە بێجگە لە پارەدان ڕێگە چارەیەکی دیکە ببێت.

ئاغا سەید عەبدوڵڵا موجتەهید [بێهبەهانی کە تازە هاتووە نێو ڕێکخراو، پرسیاری کرد] - لە بارەی ئاسفودەوڵە و خەڵکی زوڵم لێ کراوی خوراسان [کوردەکانی باشکانلوو] بەڵێنیان دابوو کە ئەو لێرە یان لە دیوانخانە یا شوێنێکی دیکە ئامادە بێت و وتەی خۆی ڕوون کاتەوە، چی بوو؟ وەڵامیان‌دا کە پێش لە هاتنی ئاغا لە سەرەتای بابەتەکانی ڕێکخراو ئەم مەسەلە باس کرا. بڕیاریان‌دا کە لە وەزارەتی ناوەخۆ بپرسن کە تا ئێستا چی کردووە؟ یەکێ لە نوێنەران ڕایگەیاند نزیک

---

[٢٨٨]- تەنیا ڕێگەی هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان، بوونی پیاوێکی با غیرەت و دلێر وەکوو جافر قولی خانی شادلوو ئیلخانی بجنوورد و حاکمی پێشووی ئەستەرئاوا بوو. بڕوانە بە بەرگی دووهەم، ل ٣٥٢ و ٣٦٦. ئێمە کوردەکانی خوراسان پەندێک لە پێشینییانمان هەیە کە ماناکەی ئەمەیە:

بە بِسْم‌الله، بِسم‌الله گوتن گوراز لە بێشە نایتە دەرەوە. واتا هێرش و زۆری پێویستە، لەگەڵ هەر شتێک و هەر کەسێک دەبێ وەکوو خۆی ڕەفتار بکرێت.

به پەنجا ڕۆژە کە ئەم مەسەلە باس کراوە و زوو بە زوو بە وەزارەتی وڵات پەیامیان ناردووە، وەڵامیان‌دا کە بە دوای مەسەلەکە ئەچن. ئەگەر بەم جۆرە بێت بە چە ئەنجامێک ئەگەیت؟

ئاغاسەیدعەبدوڵلا گوتیان: ئەم جار حەتمەن بینووسن کە ئەگەر ئاسەفودەولە بۆ ڕێکخراوی داهاتوو نەیت، ئەو کاتە لە ئەعلاحەزرەت داوا ئەکەین بە حوکمێک ئەو بەرکەنار بکات...

تاقمێک گوتیان دەبێ مەسەلەکە هەر لەم ڕێکخراوە حەل و فەسڵ بوێت. پاشان ماوەیەک دیاری بکرێت هەتا وەزارەتی ناوەخۆ بە هەر شێوەیەک کە دەزانێ کارێ ئەنجام بدات. گوتیان تا ڕۆژی پێنجشەممە. وترا تا ڕۆژی پێنجشەممە ماوە کەمە...»

**وتووێژەکانی ڕۆژی سێ‌شەممە ٩ ڕەبیعولئەوەڵ ١٣٢٥:**

یەکێ لە نوێنەرەکان ڕایگەیاند کە ئەمانەوێ سەبارەت بە گرینگترین بابەتەکانی باس بکەین. ئێستا سێ مانگە وەزارەتی وڵات هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکانی قووچانمان داوا کردووە، چی‌یان کردووە؟ و چ کارێکیان ئەنجام داوە؟ و چەند جار بەڵێنیان‌دا، بە کام ئەنجام گەیشت؟ ئایا ئەم کێشە گرینگ نیە؟ وەڵامیان‌دا کە هەر کاتێک لە بارەی هەڵگەڕاندن باس ئەبێت، باسی ئاسفودەولە دەکەوێتە بەر بیر، و بەم جۆرە ئەڵێن کە ئایا پێویستە ئەو بێت یا نە؟ و لە ئاکامدا بابەتەکە تایبەت بە ئەو دەبێت و مەبەستی سەرەکی لە ناو ئەچێت. پێویستە بە هەر شێوەیەک کە دەبێ حەتمەن داوا بکەین کە ئەسیرەکان هەڵگەڕنەوە. گوتیان هەتا وەزارەتی وڵات نەبێ ئەم کارە بێ‌سەرنجامە. ڕۆژی پێنجشەممە کە وەزیری مالیە دێنەوە یا نە باشتر ڕۆژی شەممەیە. پاشان باس لە سەری سازگاری و یەکێ بوونی وەزیرەکان کریا[٢٨٩] ...»

**وتارەکانی ڕۆژی شەممە ١٣ ڕەبیعولئەوەڵ ١٣٢٥:** یەکێ لە نوێنەران مەسەلەی ئەسیرەکانی قووچانی باس کرد و گوتی شەش نەفەر لە ئەسیرە قووچانییەکان هەڵگەڕانەوە، دەبێ هەر بەم بۆنە لە وەزارەتی وڵات ڕێز بگرین و سپاس‌گوزاری کەین.

---

[٢٨٩]- وتارەکانی ڕێکخراو- قۆناغی یەکەم ل ١٤٧.

ئاغـای دوکتـور وەلیولـلاخان[٢٩٠] - لـەم کاتـە ڕاپانگەیانـد کـە نـەوابی مـەزن ئەمیرخانی سەردار لە ئەستەرئاوا دووکاری گرینگیان کردووە. لە دوو مـانگی ڕابـردوو لە (چاتلی) کە سەرحەدە یـەک نەفـەر تلێگرافچـی و یـەک نەفـەر گـومرکچی کـە تورکمەنەکان ئەسیریان کـردووە، لـە سـەودا لـە گـەڵ نەوکـەر شەخـسی بـە دوای تورکمەنەکان ڕۆیشتوون و بێ ئەمەی کە کەسێ بکوژرێت یا خوێن لە لووت کەسـێ بێت ئەو دوو نەفەریانە هاوردەوە، بێجگە لەمە لە دوو حەفتەی ڕابردوو حەوت ژن لـە ئەسیرانی قووچانیان هەڵگەڕانەوە، دوو نەفەر لەو ژنانـە لـە خوراسـان و دوو نەفـەری دیکە لە دەوری ئەستەرئاوا و یەکێ لە قـەزوین و یـەکێـتـر لـە سـاوجبلاغ مـوکری (مەهاباد)...

یەکێ لە نوێنەران بەیانی کرد ماوەیەک لەمەو پێش گوتم و ئێستاش ئەڵێم کـە هەتا دوو مانگ و چل ڕۆژ دوای جەژنی خێڵی یەمووت لەو شوێنە کـە ئێستا هـەن دەڕۆن، کە وابوو بە ڕۆیشتنی ئـەوان هەڵـگەڕاندنی ئەسـیرەکان تـۆزێ سـەخت‌تـر ئەبێت[٢٩١]. و ڕاپۆرتێ کە لە وەزارەتی وڵات گەیشت بوو بە هۆی نووسراوەی جـەنابی حوجەتولئیسلام ئاغا حاجی میرزا حەسەن سەبزەواری[٢٩٢] ئـەم ڕاسـتیە دەرکـەوتووە کە سالارموفەخەم ئەم کاریە کردووە و ئێستا دەبێ ئەو بانگ کەین.

یەکێ‌تر لەنوێنەران بەم جۆرە بۆچـوونی خـۆی دەربـڕی: ئـەو بابەتانـە کـە بـۆ وەزارەتی وڵات نووسـراوە کاتـێ کـە بـە دوای دەچـین ئـەبینن کـە ئـەوان مانـای

---

[٢٩٠]- لە نوێنەرانی قۆناغی یەکەمی تاران- تاریخ بیداری ایرانیان ب ١، ل ٦٣٥.

[٢٩١]- خێڵی یەمووت لە نێوان ناوچەی کۆسیتانی شاخەکانی بالـخان لـە وڵاتی شـەورەوی ئـەمڕۆ و ناوچەی گەرمسێری لێواری ڕووباری گورگان و ناوچەی چات لە هاتو چوودا بوون: ڕستانەکان و دوو مانگی هەوەڵی بەهار لە خاکی ئێران و هاوین هەتا سەرەتای پاییز لە نێوان شاخەکانی بالخان تێپـەڕ ئەکرد.

[٢٩٢]- بە هۆی ئەوەی کە کاربەدەستانی دەوڵـەت لـە خوراسـان و پیـاوە ئایینیـەکـانی قووچـان لـە دەسەلاتدارانی ئەو سەردەمە دەترسیان سرنجێکیان بـە شـکات و سـکالای کـوردەکـانی باشـکانلوو سەبارەت بە ئەسیرەکان نادا. ئەوان ڕۆیشتن بۆ سەبزەوار و لە لایەن ئایەتولّلا حاجی میرزا حـەسـەن سەبزەواری موجتەهیدی بە ناوبانگ شـکاتیان کـرد و ئـەویـش تلێگـراف و شـکاتێکی زۆری دژ بـە ئاسفودەوڵە سالار موفخەمی بۆ ڕێکخراوی شەورای میللی و دەوڵەتی ئەو سەردەمە نارد، کە وایـە بـە هۆی کارەکانی ئەو بوو کە مەسەلەی ئەسیرەکان بە شێوەیەکی قورس لە ناوەند خـراوەتـە ڕوو و بـە دوایە چوون.

بەرپرسایەتی نازانن یا ئەمەی کە ئەزانن و خۆیان بە نەزان پیشان ئـەدەن. سـەبارەت بـە ئاسفودولـە نزیـک بـە دوو مانگـە باسـێکی زۆر کـراوە بـەڵام چ هـەنگاوێکیان هەڵگرتووە؟

دەبیرولمولک: هـەموو دادگـاییـەکان کـە بـە دەسـتی وەزارەتی وڵات نیـە، دادگاییکە ئێستا نیمانە ئەگەر بە دەستی عەدلیەش ئیدی پێوەنـدیکی بـە وەزارەتی وڵات نیە، ئەرکی ئێمە بەرکناری حکوومـەت بـوو کـە ئـەو کارەمـان کـرد [کـە لـە جێگەی یەکێکی دیکە دایمەزرێنین]، ئەم مەسەلە لە سێ ساڵ ڕابردوو خراوەتە ڕوو، ئەو کاتە بەرپرس نەبوو ئێستا کە ئێمە بەرپرسی ئـەم کارانـەین مەسـەلەکە بـە ئێـرە گەیشتووە.

یەکێ لە نوێنەرانی ڕەشت گـوتی: دەبـێ ئاغایـان بـزانن کـە بـۆ هەڵـگەڕاندنی ئەسیرەکان نابێ کە ئەنجومـەن دەسـتی تـێ وەر بـدات، ئـەم ئەرکـە لـە ئەسـتۆی وەزارەتی ناوخۆیە.

دەبیرولمولک: کارێکی سەخت و گرینگ نیە، ئەمیری گەورە پـارەی دەوێ یـا ئەمەی کە لە ئەو دوو نەفـەرە [ئاسفودەولـە و سـالار موفەخـەم] پـارە وەربگـرن یـا وەزارەتی وڵات بە هەر شێوەیەک کە دەبێ پارە وەربگرێت.

یـەکێ لـە نوێنـەران بـەم جـۆرە وڵامـی دا: چـۆن دەبـێ کـە ڕازی بـین بـۆ هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان پارە بدەین، سبەی تورکمەنەکان [بە هێز و بـوێری زۆرتـر] دیسان دێنەوە [ژن و منالی خەڵک ئەسیر دەکەن] کە وایـە چـی بـە سـەر هێـز و غیرەتی ئێوە هاتووە؟

یەکێتر ڕایگەیاند کە ئەم فەرمایشاتە درووستە، کاتێ کە یەکێ لە خەڵـکی ئـەم خاکە تاوانبارە پێویستە سزا بکرێت. بەڵام لێرەدا بیروڕایەکی سیاسی دەخرێتـە ڕوو و ئەمڕۆ ئەستەرئاوا لەگەڵ دەوڵەتی هاوسێ [ڕووس] هاوسنوورە[۲۹۳]. بـاش ئەمەیـە کـە ئەمڕۆ بە هەر شێوەیەک کە دەبێ بێ زۆر هەڵیانگەڕێننەوە، ئەو شتەی کە ئێوە ئەڵـێن

[۲۹۳]- تورکمەنەکانی پێش لە شۆڕشی ڕووسیە و دەسەڵات پێدا کردنی ڕژیمی شەورەوی ئـەگـەر لـە لایەن دەوڵەتی ڕووسیە دەکەفتنە ژێر چاوەدێری بۆ ناو خاکی ئێران دەرباز دەبوون و ئەگەر لە لایەن ئێرانەوە دەکەفتنە ژێر چاوەدێری دەچوونەوە بۆ ڕووسیە و خۆیان سەر بە ئەو وڵاتە دەزانی، بەم هۆیە دەوڵەت نەیەتوانی ئەوان سزا بدات.

بۆ دوایی دابێن بکرێت. دیسان هەر ئەو نوێنەرە بەیانی کرد هیچ کاتێک ئاوا شتێک نەبووە، لە کاتی خواڵێخۆش بوو ئەمیرخان[٢٩٤] سەرداری پێشوو وەها کارەساتێک ڕووی داوە، ڕوکنودەولە[٢٩٥] خۆی بە زۆر تورکمەنەکانی سزادا.

لەشکەری خوراسان سێ هەزار تمەن وەردەگرێ و کۆمەڵێک بە یەک نەفەر دەفرۆشێ.[٢٩٦] ویستی ئێمە ئەمەیە کە هەوەڵ تاوانبارەکان سزا بکەن، و دووهەم ئەسیرەکان هەڵگەڕنەوە.

بە بڕوای من ئەگەر بۆ وەرگرتنی ئەسیرەکان پێنج هەزار نەفەریش بکوژرێت چاکتر لەوەیە کە بە پارە وەریان بگرین.[٢٩٧]

یەکێتر بەیانی کرد کە ئەم باس و وتووێژانە ئەرکی ئێمە نیە، ئەرکی ئێمە دیاریکردنی یاسا و بەرپرسی بە چاکە بوون لە لیژنەی وەزیرانە، هەر کاتێ وەها لیژنەیەک پێک بێنن کارەکان بە درووستی ڕێک دەبێت. بۆ ئەم مەسەلە دوو مانگە ماوەیەکی زۆرمان لە دەست داوە؛ بەڵام لە هیچ شوێنێکدا باو نیە کە ڕێکخراو بەم شێوە بەڕێوە بچێت. ئەم کارانە دەبێ لە کاتێک ئەنجام بێت کە لە درێژی ساڵدا یەکدوو جار ڕووی بدات. ئەو ساتە ڕێکخراو هەوڵێک ئەدات بەم جۆرە کە لە وەزارەتی وڵات یا دیکەی وەزارەتخانەکان هەڕەشە بکات، ئەگەر وڵامیاندا کە زۆر باشە ئەگەر نە پێویستە ئەو وەزارەتە بە هۆی ئەوەی کە کارێکی نەکردووە ڕێکخراو ڕازی بکات یا ئەمە کە کەنارەگیری بکات. ئێستا لە لایەن جێگیری وەزارەتی ناوەخۆ هەڕەشە کراوە لە وەزیری ناوەخۆ. ئاسفودەولە و هۆکار [کە سالار موفخەم] هەردوویان لە تاران دەبن کە وایە بۆچی ڕێکخراو لە کاری خۆیان ڕازی ناکەن، ئەرکی ئێوە ئەمەیە کە ئەم بابەتە ڕوون بکەن.

یەکێ لە نوێنەرانی ئازەربایجان گوتی کە وەزیرەکان جگە لە نافەرمانی کارێکی دیکە ئەنجام نادەن، ئەوان بوون بە هۆی ئەوەی کە ئێمە پشت بە ئەعلاحەزرەت شاهەنشا بکەین و هەروەها ئەعلاحەزرەتیش پشت بە ئێمە بکەن، دەڵێن

---

[٢٩٤]- ئەمیر خانی سەردار دەسەلاتداری ئوستور ئاوا.

[٢٩٥]- ڕوکنودەولە برای ناسرەددینشا.

[٢٩٦]- کڕین و فرۆشتنی پۆستەکان باو بوو.

[٢٩٧]- ئەڵبەت بە سرنجدان بە ڕەفتار و ڕۆحیەی ئەو، ئەمە چاکترین ڕێگەیەک بووە کە نیشانی داوە.

ئەعلاحەزرەت شاهەنشا ڕۆخسەت نادەن[٢٩٨] [بە دوای کاری بەرکەناری و سزادانی ئاسفودەوڵە و سالار موفەخەم کەوین] کە وایە بۆچی کەنارەگیری ناکەن؟[٢٩٩]...

یەکێ لە وەکیلانی ئازەربایجان بیروبۆچوونی خۆی بەم جۆرە ڕاگەیاند - ... بەڵام پێم وایە خەتایەکمان هەیە و ئەویش لە بیر چوونەوەی. مەسەلەیەک دەخرێتە ڕوو، پاش تێپەڕبوونی سێ مانگ دەبێتە قەیران. مەسەلەی هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان لە هەموو ڕۆژنامەکانی دونیا نووسراوە، و پێویستە ئێمە لێکۆڵین و بە بیرورای من پێش لە هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان، تاوانبارەکان سزا بدرێن. ئەو ڕۆژە وترا کە تاوانبارەکان لە دادگا یا لە کۆمسیوونەکە ئامادە بکەن بەڵام هیچیان نەکرد و نایکەنیش.

لەم کاتەدا ئاغای ئازەربایجان سەید عەبدوڵلا موجتەهید [بێهبەهانی] فەرموویان ویستی ئێوە ئەمەیە کە ئەوان بێن و کارێک وابکەن، ئەڵبەت کە نایەن.

دیسان نوێنەری ئازەربایجان لە درێژەی باسەکان وتی من ئەڵێم و بڕوام ئەمەیە هەر کارێ کە بە هەر وەزارەتخانەیەک ئەدرێت پێویستە بۆ ئەنجامی ئەو کارە ماوەیەک دیاری بکرێت و لە ئاکامدا ئەگەر کارێکیان نەکرد ئەو وەزیرە بەرکەنار بێت، و هەروەها بۆ هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان ماوەیەک دیاری بکرێت، وەڵام درا هەوڵ لێکۆڵینەوە و پاشان سزادان و هەڵگەڕانەوە.[٣٠٠]

---

[٢٩٨]- ئەمەی کە محەممەد عەلیشا لایەنداری زوڵم و دژ بە ڕێکخراو، یاسا و کورت کردنی دەستی ستەمکاران لە سەر خەڵکی بێ‌پەنا بووە جێگەی گومان نییە، و هەر بەم هۆیە ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو ڕێکخراو لەیەک دوور ئەکەوتن و بە یەکتر بەدگومان دەبوون. خوالی خۆش بوو یەحیا دەوڵەت ئابادی لە کتێبی بە ناوبانگی «حیات یحیی» بە چاکی بەم بابەتە ئاماژەی کردووە.

[٢٩٩]- ڕستەی دوایی دوو ڕوویەی هەیە. واتا بە جۆرێ لێلی و دوو مانای هەیە؛ یەکێ ئەمەی کە محەممەد عەلیشا کە دژ بە مەشرووتە بۆچی لە پاشایەتی مەشرووتەکە ئەرکی پاراستنی یاسا دادپەروەریە بەرکەناری ناکات، و مانای دیکەی ئەمەیە وەزیرەکان کە ئامانجێ جگە لە ژێر کا دەرچوون و پەرێشان کردنی خەڵکیان نیە بۆچی لە کار و باری خۆیان کەنارەگیری ناکەن هەتا کەسێکی چاکتر لەوان بێتە سەرکار و بە مافی خەڵک سرنج بدات.

[٣٠٠]- ئەم وەڵامە، بیرورای لایەندارانی ئاسفودەوڵە و سالار موفخەم و محەممەد عەلیشا بوو هەتا ئەو کاتەی کە بە ڕواڵەتدا بە کارێ لێکۆڵینەوە درێژە بدەن تا شکاتدارەکان کە هەر کوردەکانی باچیانلو بوون و لە تاراندا بە نەداری و پەرێشانحاڵی ژیانیان دەبردە سەر، ماندوو بن و بێنەوە بۆ خوراسان ئەم بابەتە دوایی بێت و یا بە کوودەتا و ڕووخاندنی مەشرووتە دیسانەوە ئاسفودەوڵەکان خەریک

ئاغاسەیدعەبدوڵـڵا موجتەهیـد: لیژنـەی وەزیرەکـان لێـرەدا بەرپرسـایەتیان وەرگرت، چیتان کرد [؟]

یەکێ لە وەکیلەکان ڕایگەیاند: چەند جار گوتم کاغەز و قەڵـەم بـە کـار نایـت، ئەمەی کە ڕێکخراو یاساکان دەرئەبڕێ و دەیان نووسێ درووستە؛ بەڵام ئـەو کاغـەزە کەسێکی دەوێ کە جێ بە جێیان بکات. کاغەز بـە تـەنیا کـارێ ناکـات. ئەمـڕۆ بـە ئاشکرایی دەڵێم کە لیژنەی بەڕێوەبەرایەتی لەگەڵ ئەنجومەن یەکێ نین. لـە وڵاتی ڕووسیە وەزیر و سەرۆکی وەزیران هەیە، نزیک بە پانزە ڕۆژە لە «دووما»[٣٠١] دووجـار چوونە سەر وتوویژ و باس کردن.

یەکێ دیکە ڕایگەیاند: ئێستا ماوەیەک بۆ هەڵگەڕاندنی ئەسـیرەکان و سـزادانی تاوانبارەکان دیاری بکەن.

سەرۆکی [ئەنجومەن] وڵامی دا: کورتەی بابەت ئەوەیە کە وترا، ئێمـە نـاتوانین لە وردەکاریەکاندا دەستی تێ وەر بدەین، پێویستە [بە دەوڵەت] مۆڵەت بدەین و بـۆ گەیشتن بە ئاکامێک ماوەیەک دیاری بکەین؛ بۆ لێکۆڵینەوە و سزادان دوو حەفتـە و بۆ هەڵگەڕاندنی ئەسیران ماوەیەکی زۆرتر پێویستە و پێم وایە کە باشتر ئەمەیـە ئـەم دوو مەسەلە لە یەک جیا کەینەوە.

یەکێ لەنوێنەران بەیانی کرد: هەتا بیست ڕۆژی دیکە تورکمەنەکان دەڕۆن کـە وایە بۆ هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان تووشی کێشە و گیروگرفت دەبین.[٣٠٢]

یەکێ لە وەکـیلانی ئەسـتەرئاوا [گورگـان] وتی: ئەگـەر زووتـر کـارێ بکرێـت

---

هێرش و شەڕ و مرۆڤ فرۆشی بن.

[٣٠١]- ڕێکخراوی نوێنەرانیگەڵ لە وڵاتی ڕووسیە. فەرهەنگی موعین ب ٢، ل ١٥٨٢.

[٣٠٢]- تورکمانی یەمووت کە شوێنی هەمیشەیی ئەوان قەدپاڵی کێوەکانی باڵخان لە وڵاتی شـەورەوی بوو، بۆ گەرمسێر لە کۆتایی پاییز تا سەرەتای بەهـار ئـەهاتنـە دەوەر و لێـواری ڕووبـاری گورگـان و گونبەدی قابووس، بە دوای کۆچ کردن بۆ سەردسێر کە هەر کێوەکانی باڵخان لـە ئـەوپـەڕی دۆڵـی چەندەر بوو ئەگەڕانەوە، بەم هۆیە لە ڕێگەی لەشکەرکێشی توانای گەیشتن بە ئەوانیان نەبوو چۆنکـە ڕووسیەی تێزار بە سوپای ئێران ئیزنی نادا. تورکمەنەکان بە خەیاڵی ئاسوودە ئەسیرەکانیان دەبرد و لە بازارەکانی عێشقئاوا و بوخارا و جارێکیش لە ناوچەکانی ئوورووپایی ڕووسیە دەیانفرۆشـت. کـە وا بوو باشترین ڕێگە ئەمە بوو کە پێش لە کۆچ کردنی وەرزی بەهارانەی تورکمەنەکان، بە هەر جۆرێک کە دەبێ ئەسیرەکان ئازاد بکەن.

چاکترە. بە دوای قسەی یەکێ لە نوێنەرانی ئازەربایجان بەیانیکرد بەم هەموو هەوڵ و تێکۆشانە ئەسیرەکان ناسراون کە چ کەسانێکن [؟] ئایا بە ناو ونیشان هەڵیان ئەگەڕێننەوە یا بە جێگەی ئەسیرەکان، سوالکەرانی خوراسانمان بۆ ئەهێنن. ئایا ناوی ئەو کەسانە بە تەواوی هەیە (وەڵام درا بە تەواوی هەمانە).

دیسان بەیانی کرد؛ بەرنامە و سەر ئەنجامی ئەسیرانی ئێرە ئەبێ بە چی؟ لەو شوێنەدا [لە ئەسارەت] نانی جۆ ئەدەن؛ بەڵام لێرەدا ئەویشە نادەن.[٣٠٣]

دەبیرولمولک: ئێستا دوو بیر و ڕا هەیە، یەکێ هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان بە زۆر و ئەمە [بە هۆی نەبوونی سپا] ئێستا نابێت، پێویستە وەزارەتی شەڕ سوپایەک ئامادە بکات کە ئەمە ماوەیەکی دەوێت و کاتیش لە دەست ئەچێ. یەکێکی پارەدان، و بە ناچار دەبێ کە ئەم جارە بەم شێوە [پارەدان و کڕینی ئەسیرەکان ] ببێت.[٣٠٤]

نوێنەرێک وڵامی دا: [ئێمە ئەم گیر و گرفتانە] نازانین، ویستی ئێمە هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکانە بە هەر شێوەیەک کە وەزارەتی ناوەخۆ بە چاکەی دەزانێ.

لەم کاتە سەرۆکی [ڕێکخراو] ڕایگەیاند: ئەگەر وابێت کە پارە بدەن پێویستە هەر ئەوانەی کە هۆکاری ئەم بابەتەن لەگەڵ بەرپرسی دەوڵەتی بڕۆن و ئەوان هەڵگەڕێنەوە نە ئەمەی کە دەوڵەت خۆی پارە بدات.

دەبیرولمولک: ئەمە بە دوای لێکۆڵینەوە درووستە.

نوێنەرێک وڵامی دا: لێکۆڵینەوە ئەنجام بووە، و بە پێی بەڵگەکان دەرکەوتووە کە [ئاسفودەوڵە و سالار موفەخەم] تاوانبارن. یەکێکی دیکە لە نوێنەرانی ئازەربایجان گوتی ڕۆیشتنی ئەوان ئێستا نابێت، دەبێ لێکۆڵین و [ئەو دوو نەفەرە سزا بکرێن و ڕەنگە سزای ئەوان زندانی کردن بە ماوەیەکی زۆر بێت.

نوێنەرێکی دیکە لە ئازەربایجان بەم جۆرە بەیانی کرد: تا ئێستا دە جا

---

[٣٠٣]- مەبەست تاقمێک لە ئەسیرەکانە کە بە دوای کڕینیان ئازاد بوون و چوون بۆ تاران و لەو شوێنە دەربەدەرو سەر لێشێواو بوون، نە کەسێ لایەنداریان بوو و نە نان و خوراکێ پێیان ئەدرا. بەم مانایە کە ژیانێکی تاڵتر لە ئەسارەت لە لایەن تورکمەنەکانیان تێپەڕ ئەکرد.

[٣٠٤]- کڕینی ئەسیرەکان لە دەستی تورکمەنەکان خۆی ئەوا بە هۆی هاندانی تورکمەنەکان بۆ ئەسیر کردنی ژن و منالی خەلک. بێگومان پێویست بوو ئەسیرەکان بە زۆر ئازاد بوان نە بەزێڕ؛ بەڵام لە ئاڕاستەوە کە دەوڵەتی فاسدی قاجار سپلە و داماو بوو، هێز و دەسەلاتێ لە کار نەبوو.

سەبارەت بە هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان باس کراوە، و لە ڕاستیدا سەرم لە باوەڕ و ئیمانی خۆمان سوور ماوە، تورکمەنەکان ژنەکانیان بردووە و باسێکی زۆریش کراوە؛ بەڵام بە چە ئەنجامێک گەیشتووین. بابەتەکە جۆرێکی دیکە باس دەکەم، ئەوان خۆشکانی ئێمەن ئەگەر بە ڕاستی ئیماندارین نابێ بخەوین. من نازانم بۆچی غیرەتمان نەماوە؟! بۆچی هەستی ئیسلامیمان کەمڕەنگ بووە؟! (لەم کاتە لە سەر دیاری کردنی ماوە بۆ هەڵگەڕاندنی ئەسیرەکان و سزادانی هۆکاران باس کرا).

سەرۆک: گوتم لەم بوارەدا شتێک بنووسن ئێستا دەینووسن و ئەیخوێنەوە پاشان بڕیار بدەن. بابەتێ کە نووسیویان خوێندیانەوە؛ نزیک بەم ناوەڕۆکە کەسانێ کە گومان ئەبێت کە تاوانبارن پێویستە لە دادگا بۆ دادگایی کردن ئامادە بن، بە دوای ڕاستی ئەو گومانە و سەلماندن و لێکۆڵینەوە سزا بکرێن و ئەم لێکۆڵینەوە و سزادانە لە ماوەی ژێرەوە تا ١٥ ڕۆژی دیکە زۆرتر نەبێت. دووهەم وەزارەتی ناوەخۆ بە شێوەیەکی درووست ئەسیرەکان هەڵگەڕێنێتەوە و هەتا ٤٠ ڕۆژی دیکە ئەم کارە ئەنجام بدات و هیچ جۆرێک عوزرێ قەبووڵ ناکرێت. پاشان ویستیان کە ڕایەک وەربگرن، هەموونوێنەرەکان گوتیان کە بەم کارە پێویستی نیە هەمووماﻥ بەم شێوەیە کە نووسراوە هاوڕێ و هاوبیرین...»[٣٠٥]

پاشان ڕایانگەیاند: بۆ ئەسیرەکان و کوردەکانی باشکانلوو کە لە بواری مافی خۆیان ئاگادار نین چەند نەفەر نوێنەر بۆ ڕوون کردنی مافی ئەوان دیاری بکرێت.

لە وتوویژەکانی ڕۆژی پێنجشەممە ٢٥ ڕەبیعولئەوەڵ ١٣٢٥ ، جارێکیتر مەسەلەی سزادانی بە زووی ئاسفودەولە لە لایەن ئاغا سەید حەسەن تەقی زادە نوێنەری تەوریز و ئاغا حاجی موحتەشەموسەڵتەنە باس کرا.

ڕۆژی شەممە ٢٧ ڕەبیعولئەوەڵ موحتەشەموسەڵتەنە ڕایگەیاند کە ئەمڕۆ ڕاپۆرتی تلێگرافێ لە ئەستەرئاوا گەیشتووە کە ٢٢ نەفەر لە ئەسیرەکان بە دەستی تورکمەنەکانی خێڵی دێوەچی ئەسیر کراون و سەرۆکی ئەوان مەفاخێرولمولکە. لە بواری سرنج نەدان بە مەسەلەی ئاسەفودەولە چەند جار نوێنەرانی ئازەربایجان بە

[٣٠٥]- ڕۆژنامەی ڕەسمی وڵاتی شاهەنشاهی ئێران. بە ڕێوەبەر سەید محەممەد هاشمی. باسەکانی قۆناغی یەکەمی یاسادانان، ل ١٥٣.

تایبەت سەیدحەسەن تەقی‌زادە لە باسەکانی ڕێکخراو هاواریان دەکرد کە بۆچی سزای ئاسفودەوڵە نادەن. ئاغای تەقی‌زادە لە کۆ بوونەوەی شەممە ٢ ی جەمادیوسانی ١٣٢٥ بەیانی کرد:

«ئەڵێن ئاسفودەوڵە نایەت و لەم شارەدا نیە؛ پێم وایە ئەگەر نەیت چاکترە و بێ ئابڕوویی ئێمە کەمتر. بە هۆی دەرکردنی فەرمانی مەشرووتیەت لە پارەکەوە، هاکا کاری سزادان لە نێو بچێت، هەروەها کە دەیبینن بە دوای چەند جار دادگایی و سەلماندی تاوان ئێستا دەڵێن [ئاسفودەوڵە] یاوی کردووە و دەبێ زەمانەتی لێ وەربگرن و ئەو ئازاد بکەن؛ بەڵام وەکوو ڕۆژ ڕووناکە کە ئەو تورکمەنەکانی بۆ ئەسیرکردنی موسوڵمانەکان بانگ کردووە. دەڵێن: سێ هەزار تمەن لەگەڵ زەمانێکدا بدات و ئازاد بوێت بەڵام ماوەیەک پێش [پێش لە پێکهاتنی دادگا] چل هەزار تمەنی ئەدا. بە پێی حوکمێک بڕیاریان‌دا کە ئەو سزای لەشی بکرێت [قامچی لێ بدەن] ئێستا دیار نیە سەبارەت بە ئەو [بە لایەنداری محەممەد عەلیشا] چی ئەبێت- بە ئەمەی کە هێشتا حوکمی [سزادانی] ئەو ئاشکرا نەخوێندراوەتەوە- و بە پێی ئایین و عەقڵ سزادانی ئەو پێویستە و دەبێ بە دوای کارەکان بچن، ئێستا ئەیانەوێت بەم شێوە ئەو ئازاد بکەن.

ئاغا میرزا موحسێن: سبەینێ ئەگەر لە دادگا[٣٠٦] بە ئاکامێک گەیشتن پێویستە داوا بکەین کە سزای بدەن.

حاجی سەیدنەسروڵڵا: بیر ناکەم کە ئەگەر لەم بابەتەوە سزایێک نەکرێت- ئەویش لە کاتێکدا کە سزادان پێویستە- خەتایەک گرینگتر لە ئێراندا پەیدا بوێت - ڕێکخراو دەبێ کە لەم بوارەدا سەختگیری بکات.

ئاغا سەیدحەسەن تەقی‌زادە: [ئاسفودەوڵە] گرووپێکی لەگەڵ خۆی هاوڕێ کردووە، و سەردارەکان [کەسانێ وەکوو خۆی و سالارموفەخەم و سپەهدار تونێکابونی و ڕەحیم خانی چەلبیانلوو ئازەربایجانی] لە سەر ئەم ڕا پێکەوە هاودەنگن کە ئێزن بە سزادانی ئەو نادەن. ئەگەر بە هەر ئەم شێوە بڕۆینە پێش هیچ کەسێ

---

[٣٠٦]- وەزیری دادگا شازادەی فەرمانەدەی ئێمە قاجار بوو کە حەزی ناکرد تاوانبارەکان بە سەختترین سزای خۆیان بگەین چۆنکە محەممەد عەلیشا ئاوا شتێکی ئەویست.

لەم وڵاتە سزا ناکرێت...»[٣٠٧]

لەم پێوەندییە بڕیاریان‌دا کە شازادەی فەرماندەی ئێمە وەزیری دادگا ڕۆژی سێ‌شەممە بێن بۆ ڕێکخراو و وڵام بدەن.

## باسەکانی ڕۆژی یەکشەممە سێهەمی جەمادیوسانی ١٣٢٥

ئاغا میرزا مەحموود خانساری: ... تاکوو ئێستا بۆ سالار موفەخەم چ سزایەک دیاری کراوە [؟].

وەزیری دادگا: یەکەم دەبێ بزانن کە مەسەلەی ئەسیر کردن بە دەستی تورکمەنەکان لەو ناوچەدا یەکەم جار نیە کە ڕووی داوە... ئەم مەسەلە لە کاتی سەرداره گەورەکان باو بووە؛ لە شوێنێکدا کە ڕۆیشتن تاقمێکیان ئەسیر کردووە و لە کاتی هاتنەوە خەریکی غارەت و دزی بوونە، و ئەم کارە تا ئێستا باو بووە و بە هۆی ئەوە سزایش ناکران؛ بەڵام ئەمێستا لە ژێر سێبەری مەشرووتیەت ئەنجام دەبێت، هەموو وتار و باسەکان بە ئاشکرایی خراوەتە ڕوو و هیچ کەسێکیش مەسەلەیەکی نیە.

نهێنیانە لەگەڵ ئەندامانی دیوانخانە و لەگەڵ وەکیلەکان لە سەر سزادانی ئەو ڕاوێژمان کرد و ئەم ڕاستییە بۆ هەموومان ڕوون بوو کە سالار [موفەخەم] تاوانبارە، بە دوای سەلماندنی خەتاکەی خێرا ئەومان زندانی کرد و هەرچی ئەوان سوور بوون کە دمبێ بدەم ڕازی بەم کارە نەبووین، ئێمە ئەم دادگاییمانە هەر بەم شێوە پاراست و لەم دادگاییە سەردارانی [دیکەیش] بوون کە تا ئەو کاتە وەها شتێکیان بە چاو نەدیبوو...»

ئاغاسەیدحەسەن‌تەقی‌زادە: لەمەی کە ڕواڵەتی کاری دادگا ڕێکوپێکە و ناتوانین ڕەخنەی لێ بگرین، قسەیەک نیە؛ بەڵام گرینگتر لە هەر شتێک ئاکامی کارەکە ئەویش سزادانە و ئەم بابەتە بە گشتی لەم وڵاتە لە نێو چووە. بەندە ئەو ڕۆژە گوتم ئەگەر وابێت کە سەرداری گرفتار و تووشی یاسا بێت و دیکەی سەردارەکان

---

[٣٠٧]– وتووێژەکانی ڕێکخراو. قۆناغی یەکەم، ل ٢١١.

نائارامی درووست کەن، بەندەیش گرفتار دەبم. گەورەکان کۆ ئەبن[۳۰۸] و نائارامی درووست ئەکەن ئەو کاتە یاسا لە نێو دەچێ، گرینگ سزادانە...»[۳۰۹]

## باسەکانی شەممە ۹ جیمادیوسانی

حاجی سەید عەبدولحوسەین شەهشەهانی [نوێنەری مەشهەد]: لە خوراسان و قووچان و دیکەی ناوچەکان داوای چارەیان کردووە کە حکوومەت بە ناوی وەزارەتی دارایی دەڵێ هەر ئەونەی کە لە ساڵی ڕابردوو جیاوازی عەمەڵتان ئەدا ئیمساڵیش دەبێ کە بیدەن و بە هۆی ئەمە نزیکە قووچان تێک بچێ، پێویستە بزانین ئایا گرتنی جیاوازی عەمەڵ تا ئەندازەیەک هەیا یا نە؟! ئەگەر وایە دیار بکرێت.

ئاقا میرزا سەید عەلی نەقی: لە سەر ئەمە چەند ڕۆژ باس کرا و لە ڕۆژنامەیش نووسرا کە جیاوازی عەمەڵی کوێخاکان و زاوتەکان وەرنەگرن بەلام لە دەسەلاتدارانی گشتی وەریبگرن.

سەرۆک: پێویستە ئەم بابەتە بە وەزارەتی دارایی ڕابگەینن.

ئێحتشامولئەتیبا: لە ترشیزی خوراسان دەڵێن بە هۆی ئەوەی کە کاری دارایی لێرەدا چاک بووە، ئێمە جیاواز نادەین، ساڵی ڕابردوو ئاسفودەولە بە زلم و زۆر وەریگرت، بەلام ئیمساڵ ژێر باری زلم ناچین...»[۳۱۰]

ڕێکخستنی یەکەمین دادگای مێژوویی ئێران بۆ پشتیوانی و پاڵپشتی لە ئەسیرانی کوردی خوراسان بە دوای کوشتار و غارەتی خێڵی کوردی باشکانلووی قووچان لە باکووری شیروان بە دەستی تورکمەنەکان، چەند نەفەر لە پیاوانی خێڵی کورد ڕزگار بوون و لە قووچان و مەشهەد و تاران شکاتیان کرد و هەر شتێک کە بۆیان ماوەتەوە بە ئەم کارە فرۆشتیان هەتا بتوانن لە ژێر سێبەری یاسای نوێ و جوانی مەشرووتیەت، مافی لە دەست چووی خۆیان لە زاڵمەکان وەربگرن.

---

[۳۰۸]- ئاماژە دەکات بە نائارامی گەورەکان لە فێرگەی گەورەکان کە خوالێ خۆش بوو دەوڵەت ئابادی لە کتێبی «حیات یحیی» بەوە ئاماژەی کردووە کە هۆکاری سەرەکی ئەم نائارامییە لە چ شوێنێکدا بووە.

[۳۰۹]- باسەکانی ڕێکخراو، ل ۲۱۳ و ۲۱۵.

[۳۱۰]- باسەکانی ڕێکخراو، ل ۲۱۳ و ۲۱۵.

سەرئەنجام لە یەکەمین ڕۆژانی مەشرووتیەت: ڕێکخستنی یەکەمین ئەنجومەنی ئێران لە سەردەمی محەممەد عەلیشای قاجار- دادگایەک لە نوێنەرانی ڕێکخراو و پیاوانی ئەو سەردەمە بۆ حەل و فەسڵی شکاتی کوردەکانی باچیانلوو پێک هات و زۆربەی ماوەی ئەنجومەن لە قۆناغی هەوەڵ تایبەت بەم کارە درا. لەگەڵ ئەمەشدا کە ئەم دادگا نەیتوانی بەو جۆرە کە شایانە مافی ئەوان بە ئەنجام بگەینێت؛ بەڵام دەرکردنی بڕیار دژ بە زاڵمان وەکوو ئاسەفودەولە و سالار موفەخەم، زەربەیەکی قورس بوو لە سەر پەیکەری زاڵمەکان، و خەڵک بەم بڕوایە گەیشتن کە لەمەودوا شتێک بە ناوی یاسا لایەنداریگەلی هەژار و بێ‌سەوادە. چۆن کە ئەم دادگایە یەکەمین دادگای ڕەسمی لە مێژووی ئێران بوو[٣١١]، بوو بە هۆی هەرا و هۆریایەکی زۆر لە ڕۆژنامەکانی نێو و دەرەوەی وڵات بە تایبەت «ڕۆژنامەی وەتەن» بە کاریکاتۆرێکی سرنج ڕاکێش ئەم جەنایەتە و ئەو شتەی کە لە دادگا ڕووی ئەدا ئاشکرای کرد.

ئاغای حەسەن ئێعزامولوزەرا لە کتێبی «خاطرات من» بە تەواوی قۆناخەکانی پرس و جۆی ئەم پەروەندە ئاماژەی کردووە، کە بە دواچوونی ئەو پەروەندە تا ڕۆژی چوار شەممە ٢١ جەمادیولئەوەڵ ١٣٢٦ مانگی درێژەی بوو. بەم جۆرە کە لە ژێرەوە دەیبینن:

یەکێ لە گیروگرفتەکانی ئە نجومەن مەسەلەی کۆ بوونەوەی خەڵکی قووچان لە بەردەم ئەنجومەن‌بوو.

چوون سەرەتای کاری مەجلیس بوو تا رادەیەک لە هێرشەکانی زاڵمەکان ئاسوودە بوون. بۆ ئەوەی کە بە تەواوی پارێزگاکان و ناوچەکان بگات کە مەجلیس

---

[٣١١]- «ڕۆژنامەی موحاکمات» لە ژمارەی دووهەمی خۆی کە ڕۆژی سێ شەممە ١٣ جەمادیولئەوەڵ ١٣٢٥ بلاو کرا، ڕایگەیاند کە ئەمە یەکەمین دادگای یاسایی وڵاتی ئێرانە کە «بە هەموو خەڵک مژدە ئەدەین کە سوپاس بۆ خوا ئەمە یەکەمین ڕێکخراوی دادگایی یاسایی بوو کە لە ئێراندا پێک‌هات، و پێویستەگەلی مەزن ئەم ڕۆژە پیرۆزە بە جەژنێکی میللی بزانن و هەموو ساڵێک هەشتەمی جەمادیولئەوەڵ بە یادی ئەو ڕۆژە پیرۆزە جەژنی میللی بگرن... چۆن کە کەمترین دەرئەنجامی دادگایی یاسایی ئەمەیە کە زوڵم و مەزڵووم لە یەک جیا ئەبن، و وشەی حەق ڕووناک ئەبێت و هیچ کەسێک بوێری بە خۆی نادا کە ستەم بکات...»

ئاگاداری هەیە بە سەر هەمووی فەرمانبەران و پارێزگاران ، هەروەها بە هۆی ئەو کارە دەسەڵاتداری خۆی بسەلمێنێ چوو بۆ ژوری موحاکمە و بەو زوڵمەی کە لە خەڵکی قووچان چوو ڕاگەیشت کە ئەمنیش بۆ خۆم لە ڕۆژانی موحاکمە لەوێ بووم.

لـــە وەزارەتی عەدڵــیە شـــەش نەفـــەر - فەرمانــڕەوا و وەزیــری عەدڵـــیە، عەداڵەتوسەڵتەنە لەگەل یەک نەفەر جێگر[٣١٢] حاج موتیحوسەڵـتەنە، مومتازودەولــە، ئقتدارودەولەی عەلیئابادی، میرزا حەسـەن خـانی ، (سـکرتێری تـەواوی عەدلیـە) لەنوێنەرانیش تەقیزادە، وەکیلوتوجار[٣١٣]، حاج میرزا مەحموود[٣١٤]، حاج مـیرزا بابـای قووچان و ئاقاسەیدمەهدی.

لە وەزارەتی ناوەخۆ: موحتەشەموسەڵتەنە.

لە وەزارەتیدبیر تایبەتی و کاربەدەستی قووچان و کاربەدەستی بجنوورد.

وەزارەتی عەدڵیە چوار کەس، ڕۆژنامەنووسەکان سێ کەس.

وەکیلوتوجار گوتی: ئەو موحاکمە ئەوپەڕی گرینگیە، داگریناموسـی نەتەوەیـە وئەم کابرایەش سێهەمین کەسی ئێرانە تکایە دانیشتوان ڕێگای فەرموون و خۆڕاگرن و لە ڕێگای عەقل نەچنە دەرێ. وڵامەکانتان بەرامبـەر بـە پرسـیارەکان بـن. حـاج میرزا باقر ئاشتیانی ڕاوەستاوە کە کاتێکی کەم لە لایـەن شوجاعودەولـەوە سـەرۆکی دەوروبەری فارووج بوو. دوایی خوشکی حاج ئەڵلاقولی هێنا و کاری باغـداری کـرد. خۆی مێعمـار بـوو، خـانووی سـەرابی قووچـان لـە کارەکـانی ئـەوە. ئـەم بەڵـگەیە

---

[٣١٢]- عەداڵەتوسەڵتەنە سەرۆکی یەکێ لە مجالیس لێکۆڵینەوەی عەدڵیە دەگەل جێگری دووم خۆی بە نێوی ئیقتدارودەولەی عەلی ئابادی و مابەقی دانیشتوکان بریتی بوون لە:
موحتەشەموسەڵتەنە جێگری وەزارەتی ناوەخۆ. سالار مەنسوور و مومتازودەولـە سـەرۆکـی خانـەی وەرگێرانی وەزارەتی عەدڵیە دەبیری تایبـەتی جێگـری نووسـینەکـانی دەوڵـەتی رووس لـە لایـەن وەزارەتی دەرەوە کە بە بەڵگەکانی ئەو کارە لە وەزارەتی دەرەوە گیراون. موتیعوسەڵـتەنـە بـەرپـرس تایبەتی مەحەممەد عەلی شا.

[٣١٣]- وەکیلوتوجار ڕاسپاردەی ڕەشت.

[٣١٤]- حاج میرزا مەحموودی خانساری، دادگا ڕۆژی هـەشـتومی جـۆزەردان، لـە وەزارەتی عـەدڵـیە پێکهات کە مودیری ڕۆژنامەکانی موحاکمات و حەبلولمەتین تەشریفیان هەبوو.
گۆڤاری خوێندنەوە، ژمارەی ٤٢ ڕێبەندانی ١٣٥١ وتاری محـەممـەد تـەقـی دامغـانی وەکیلـی داد. لاپەڕەی ٢٤.

کوڕەکەی کاک حاج محەممەدی دادفەڕ ناردوویەتی کە دەست خۆشی لێدەکەم.
لە سەر دیل کراوەکانی قووچان وتووێژ بکەین.
شێوەی لێ پرسینەوە:
وەزیر: بڕۆن چەند نەفەر لە قووچانیەکان بێنن
دوو نەفەر لە قوچانیەکان حازر بوون دانیشتن
وەزیر: فارسی دەزانن؟
قووچانیەکان: بەڵێ.
وەزیر: نێوتان چییە و خەڵکی کوێن؟
قووچانیەکان: خەڵکی تەکمەرانین. (باکووری ڕۆژئاوای شیروان) یەکیان عەلی بەیگ و ئەوی‌دیان یووسف.
وەزیر: خزمایەتیتان پێکەوە هەیە؟
قووچانی: بەڵێ خاڵوزاین
وەزیر: چەند ڕۆژە لە تارانن؟
قوچانی: یەک ساڵ‌ونیو
وەزیر: بۆچی هاتوون؟
قووچانی: بۆ وەرگرتنی دیل‌کراوەکانی قوچان کە تورکمەنەکان بردوویانن.
وەزیر: کوتەیەک لە هاتنی تورکمەنەکان و بردنی دیل کراوەکان بێ کەم و زۆر بڵێن.
یووسف: ئێمە لە تاول‌دا دەژین، ماڵەکەش لە بن تاوڵدایە، (ڕۆژی ١٤ ڕەمەزانی ١٣٢٣ کاتێ ویژی بەیانی) دین کە دەنگە دەنگێک پەیدا بۆ لە تاول هاتینە دەرێ. دین کە پێنسەد کەس سوار لە تورکمانەکان و بجنووردەکان بوون کە دەوری ئێمەیان گرتبوو.
لەو سوارانە ١٥ کەسیان بجنووردی، ئەوانی‌تر سەرۆکی تورکەمان بوون. لە بجنووردیەکان دەتوانین ئاماژە بکەینە سەر: کەی خوا خودداد قەدمیشی. من لەوم پرسی ئەو سوارانە دەچنە کوێ، بە گوتنی ئەو وشەیە بە تفەنگەکەی گوللەیەکی هاویشتە من، بەڵام وێم نەکەوت. یەکیشیان هاویشتە برازاکەم وەویش نەکەوت. بەڵام بابم و خوشکەزاکەمیان کوشتن. ماڵی هەموویان برد و هەرچی بوو بردیان

چواردانه تاوڵیان ئاگردا و ٦٢ کەسیان بە ویل بردن. لە ماڵی ئێمە پێنج، لە ماڵی کوڕە مامەکەم دوو کەس و ئەوبەدیل گراوانە ژن و کچ و کوڕ بوون.

وەزیر: چەندە ماڵیان تالان کردووە؟

یووسف: ئەو کەسەیکە کوشتیان و ماڵ و منداڵەکەیان بە دیل برد چۆن دەزانێت کە چەندە لە ماڵەکەیان بردوە، ئەوەیکە دیارە لە دەوروبەری ٤٤ هەزار تمەنە، ١٢ کوژراو و چوار کەس بریندار.

وەکیلوتوجار: ماڵی ئێوە دەگەڵ بجنورد مابەینێکی هەیە یا نە؟

یووسف: وەسڵن

وەکیل: حاکمی قووچان لە ئەو کاتا کێ بوو؟

یووسف: ئەمیر حوسێن خان کوری ئاسەفودەوڵە کە ئەو کاتە حاکمی قووچان بوو.

وەزیر: حاکمی بجنوورد کێ بوو؟

یووسف: سالار موفەخخەم عەزیزوڵلا خان شادیلوو.

وەزیر: دەیناسی؟

یووسف: بەڵێ، هەر ئەو کەسەیە کە لێرە دانیشتووە.

وەزیر: دوا هاتنی ئەو کارەی بۆ کێ گێڕاوە؟

یووسف: بە حکوومەتی قوچان کوڕی ئاسەفودەوڵە.

وەزیر: چ کاتێک؟

یووسف: دوای‌یەک ڕۆژ چووین بۆ قووچان و بە حاکمی قووچانان گوت.

وەزیر: لە شوێنی کارەساتەکە تا ماڵی حاکمی قووچان چەندەی نێوان هەیە؟

یووسف: دوو مەنزل، یەکیان شیروان، یەکی دیکەیشان قووچان.

وەزیر: چەند فەرسەخە؟

یووسف: شازدە فەرسەخ.

وەزیر: بە حاکمی بجنووردتان و ڕاگەیاند؟

یووسف: چ قازانجێکی هەبوو کە حاکمی بجنوورد خۆی ئاگاداری لە ڕووداوەکەی پیشێ هەبوو، بەو سوارانەی کە ماڵی ئێمەیان برد نان و ئاوی دەدا.

وەزیر: تا بجنوورد چەندە ڕێگایە؟

یووسف: ده فەرسەخ.

وەزیر: ئاخۆ ئەوانەی کە لە دەست تورکمانەکان هەڵاتن، هیچ کامیان خەبەریان بۆ حاکمی بجنوورد نەبرد.

یووسف: ئەو پەنجا شێست کەسی سوار هەبوو.

وەزیر: باشە چ تورکمەنێک بوون کە هێرشیان هێناسە ئێوە؟

یووسف: یەمووت (یەکێ لە عەشیرەتەکانی گرینگی تورکمەن)

وەزیر: تا ئەوێ چەندە ڕێگا هەیە؟

یووسف: تا دەگەی بە ئینچە پێنج دێهات، خەبەرم لەولای‌تر نییە.

وەزیر: پێشتر تورکمەنەکان دەست درێژیان دەکە سەر ئێوە؟

یووسف: بەڵێ، پێش ئەوەیکە رووس دەست بە سەر تورکمەنەکان دابگرێت، زوڵمیان دەکرد. دوای ئەو ئەسلەن ئەو کارە نەهاتەوە پێش. مەگەر یەک جار لە سەردەمی شای شەهید (لە زەمانی ناسرەدین شا کە ئەمیر حوسێن خانی شوجاعودەولە ئەوانی لە بەین برد).

وەزیر: کوڕی ئاسفودەولە کاری نەکرد؟

یووسف: نە

وەزیر: حکوومەتی بجنوورد چۆن؟

یووسف: نە

وەزیر: باشە، لەکێهە شوێنەی هاتنە ژۆرێ؟ لە چ دێهاتێ رەد بوون؟

یووسف: شەش دێ، (٤٥ فەرسەخ) لە بجنووردوە هاتنە نێوی ئەو دێهاتانەی کە لێی راهاتن ئەوەیە؟ موقە،ئینجە، ئەمەند، فەرتوت، راز، قەدیمش و رازیان [ئیزمان]. لە قەدیمش هاتنە نێو ئیزمان[۳۱۵] کە بەشێکە لە خاکی قوچان.

[قەدیشی یا قەتلیش در انتها دۆڵی قۆشخانە لە باکووری رۆژئاوای دەشتی تەکمەرانە، تورکەمەنەکان دوای ئەوەیکە لە جوجلگەی قرق دێن بۆ ئیزمان. لە ئیزمان تا جەنگاه زۆرتر لە دە کیلۆمتر نێوانی نییە و ئەو دوو ئاوایە در منتهی‌الیە

[۳۱۵]- لە ناودەق ئەلزیان هاتوە کە هەڵەیە. لە ئیزمان ئێستاش پیرێژنەک هەیە کە ئەو رووداوەی وە بیرە.

خاک قوچانن. هێرش دێنن بۆ سەر چادرنشینان که همواره در ان مسیر ییلاق و قشلاق می‌کنند و شبیخون زده‌اند.]

لەوێرا بۆ سەرێ و چادر کە نێوی چەنگال [جەنگا دروستترە کە دێهاتەکی چووکە لە نێوان دۆڵی قۆشمانە و لە باکووری دەشتی تەکمە رانە] هاتوە، ئێزمان دەگەڵ جەنگا نیوانەکیان پێکەوە نییە.

وەزیر: باشە، پیشێ خەبەریان هەبوو [خەبەرو هەبوو].

یووسف: ئەسڵەن.

وەزیر: یەموت دەگەڵ ئێوە دوژمنایەتی هەبوو؟

یووسف: چە دێهات نێوانوو هەبوو دەگەڵ ئەوان. ئێمە یەکتر ناناسین. چ دوژمنایەتیان دەگەڵ ئیمە هەبوو.

وەزیر: چۆن رێگای حەرەکەتی ئەوانو زانی کە لەو دێهاتانە بووە.

یووسف: دوو کەس لە دیلەکان گەرانەوە، یەکیان هەڵاتە رووسیە و لەوێ راهاتەوە ماڵێ خۆی ئەویدیش هەڵاتە کن حاجی سەبزعەلی خانی بجنوردی، کە ئەو هاتوو ناردیەوە بۆ مالی خۆی.

وەزیر: ئەو دوو کەسانە لە کوێن؟

یووسف: لە ولایەت.

وەزیر: ژنن یا پیاون؟

یووسف: یەکیان ژن بۆ، کە مندالی سێ ساڵەی خۆی وێل کردوە و بۆ ئێرە ئەویدیش کچە. [ئازایی ئەوەیکە لە دۆرەی کرمانجەکان کە لە بەندیخانەی تورکمەنەکان هەڵاتوە، و بە چ دەردەسەریک گەیشتونەتە سنوری خۆیان بە راستی قابل تمجید است].

وەزیر: لە بجنووردیەکان کە ١٥ کەس بوون و تورکمەنەکانیان یاری دەدا کەس دەناسی؟

یووسف: بەڵێ، یەکیان، کەی خواد حوسێن... یەکی دیکەشیان کەی خوا دا قەدمیشی و غولام حوسێن گووگلان قەدمیشی.

وەزیر: زانیو کە چ کەسێک نان و ئاویان پێ ئەدات.

یووسف: دێهاتەکانی پێش رێی بجنورد؟

وەزیر: لە ناو ڕێگادا کەسانێ هەبوون کە تفەنگیان پێ هەبێ؟

یووسف: بەڵێ.

وەزیر: باشە، ئەوان نەهاتن کە پێشیان بگرن؟

یووسف: بۆچی، دوو نەفەر لە تفەنگچیەکانی ئەسغەر وەکیل[٣١٦] هەویستیان کە پێشیان بگرن بەڵام کەی خوا خوداد و مەلا مورتەزا قولی و عەلی و حەسەن و غولام حوسین کە هەموویان قەدمیشی بجنوردین، هاتن ئەو دوو نەفەرەیان گرتن دەست بەستەدا و لە ماڵێدا بە ستیاننووە تا نەتوانی پێشی کەس بگرن.

وەزیر: مالی ئێوە تاقەدمیش چەندەی نێوان هەیە؟

یووسف: دوو فەرسەخ.

وەزیر: دوژمنایەتیو پێکەوە هەیە؟

یووسف: نە، پێکەوە معامله هەیە، دەگەل کەی خوا خودادا ڕەفیقین.

وەزیر: پێکەوە بەشەر هاتوون.

یووسف: ئەوانە هەموو بە دەستوری حکوومەت بووە و هەر ئەو نەفەرەی کە هەویستیان پێشگیری بکەن، معلون سالار مهم شد یەکیان هەشتاد تومان و ئەویدیکەشیان سی و پێنج تومان جریمە کردن.

وەزیر: ایا لە مهلە ئێوە تفەنگچی هەبوون؟

یووسف: نە.

وەزیر: ئەسلەن لە قوچان سەواری دەوڵەتی هەیە؟

یووسف: بەڵێ، پێنسەد نەفەر.

وەزیر: نێزێک بوون؟

یووسف: بەڵێ.

وەزیر: هەموویان؟

یووسف: نە، سەد و پەنجاە کەسیان.

وەزیر: باشە ئەوان یاریدەری ئێوان‌دا.

---

[٣١٦]- قەتلیشیەکان لە کوردەکانی جەلالین. کە بە تورکیو و کوردی قسە دەکەن، چوون لە ناوچەی جوغرافیایی شادلوو بوون. ژێر نەزەری عەشیرەتی شادلوو کاریان دەکرد.

یووسف: بەڵێ، کەریم خان رشوانلوو و دەگەل سەد سواری هات، بەڵام کاتێک کە گەیشتەوێ ئەوان ڕۆیشتبوون.

وەزیر:باشە، ئەو کەریم خانە لە لایەن خۆی هاتبوو و یا حاکم نارد بووی.

یووسف: نە، حکوومەت لەوێ نەبوو، بۆ خۆی هاتبوو، بەڵام قازانجێکی نەبوو. [تا هاتنی ئەوان و تورکمەنەکان زۆر دوور ببونەوە.]

وەکیلوتوجار: باشە ئێوە چوون تەلەفونو کرد قازانجی هەبوو؟

یووسف: نە، بە کوری ئاسفدەوڵە گوت، گوتی کە بۆ باوکم دەنووسم و بە طغرە گڕانید، تا ئەوەیکە نائومێد بووین (دڵسارد بووین). بۆ سەبزەوار هاتین، توسط حاجی میرزا موجتەهیدی سەبزەواری بۆ ئاسفدەوڵە تەلەفون کرد.

وڵامی داوە حەوت نەفەرت ناردوون بەڵام لە هاتنی ئەو مامورانە قازانجێکن وە دەست نەکەوت.

وەکیلوتوجار: دوایە چ بۆ؟

یووسف: بە طغرە گڕشت. [لێرەدا دوو کەس قووچانی یووسف و عەلی بەیگ را مرخڵ کرد] ڕۆیشتن.

وەزیری عەدلیە بە ئاسفدەوڵەی گوت: ئێوە بڵێن لە کاتێکدا ئەو کارەساتە هاتە پێش کە بە قسەی قوچانیەکان رۆژی «الامان» بوو لە کوێ بووت.

ئاسفدەوڵە: لە مەشهەد.

وەزیر: چ کارێکو دەکرد؟

ئاسف: حاکم بووم.

وەزیر: چ کاتێک لەو کارەساتە ئاگادار بوون؟

ئاسف: هەر وەک کە گوتیان دوای سێ ڕۆژ توسط تەلەفونی شیروان.

وەزیر: با سمت حکومتی کە داشتید، چ کارێکت لەو کارەساتە دڵتە زێنە کرد؟

ئاسف: زۆر زوو تەلەفونم کرد بۆ حاکمی بجنوورد و دوایە بۆ تارانیش تەلەفونم کرد.

وەزیر: لە تاران چ وڵامێک هاتەوە؟

ئاسف: وڵام هاتەوە مامور دەنێرین، رەشید نزامیان مامور کرد ناردیان.

وەزیر: وڵامی تۆمار کراون هەیە؟

ئاسف: بەڵێ.

وەزیر: مگر شما در بجنوورد تحکمی نداشتید؟

ئاسف: بۆچی بەشێک لە خوراسان ژێردەستی من بوو.

وەزیر:

ئاسف:پەس بۆچی بە تارانوو راگەیاند دەبۆ هەر ئەو کاتی بۆ حکومەتی بجنوورد و تەلەفون کردایە کە پێشی بگرن؟

ئێمە راپۆرتەکەمان بێ کەم و زۆری بە دەوڵەت رادەگەیاندف دەوڵەت وای پێ چاک بوو کە مامور بنێرێت جگە لەوەی حکام سرحد لە لایەن دۆلەتەوە دیاری دەکرێن.

وەزیر: لە بارەی ئەو کارەساتە چ دەستورێکتدا بە قووچان؟

ئاسف: دەستوزمدا بەڵام سوار کارەکانی قووچان ناتوانی کارێ بکەن؟

لێرەدا وەزیر روو دەکاتە وەکیلی قووچان حاج میرزا بابا لێی دەپرسی: ئێوە کە وەکیلی قوچانن لەوێ بوون چ ئاگاداریەکت هەیە؟

حاج میرزا بابا: این مساله وەکِ رۆژێ روونە کە سالار موفخەم یاریدەری تورکمەنەکانی کردوە و رێی پێ داون کە لە مولکی وی رەدبن و خەڵکی قووچانی فریو داوە.

وەزیر بە ئاسفدۆلە دەڵێت: سند و دلیل بر طبق ادعای خود و بیتقلیری خود دارید.

ئاسف: لە کابینەی وزارت ژورەوهو دەرەوە تەواو تەلەفەنوکان و وڵامەکانیان زەبەت کراوە.

موحتەشەمسەلتەنە: ئەوەیکە لە کابینەن هەیە، نوسینەکانی دورەی مەشیرودەولە بووە، بەڵام بەو پەیوەندکیان بە دورەی عینەدەولە نییە.

وەزید: سالار موفخەم وڵامی تەلەفونەکەی ئێوەی داوە؟

ئاسف: وە بیرم ناتەوە... پێم وابێ دەیکوت لە رێ بجنوورد نەبووە یا ئەگەر بووە وە دووی کەوتووین رۆیشتوون.

وەزیر بە سالار موفخەم دەڵێت: باشە، ئاگاداری ئێوە لە بارەی چییە؟

سالار: دیلکراوەکان تورکمەن چای (ئوشتربان) کە لە دەرونیگی چای نیشتە

جێن کە مولکی ئێسترئابادە و لە وێرا هاتوون.

وەزیر: لە ئێسترئابادەوە چۆن و لە کیهە ڕێگایە هاتوون بۆ قووچان؟

سالار: عەشیرەتی دوەچی لە وینگی چای ماڵیان هەیە کە مولکی ئێسترئابادە، و لە وێرا هاتوون کە ناجێی دزی کردنەکە بسیت فەرسەخ ڕێگایە.

وەزیر: تاقەدمیش چەندە ڕێگایە؟

سالار: تەقریبەن ١٢ فەرسەخ بەڵام جێگای تورکمەن تاکو مولکی بجنووردیەکان نێوانەکی نییە.

وەزیر: ئەو کاتی لە کوێ بووی؟

سالار: لە ئسفراین بووم.

وەزیر: لە وینگی چای چوون بۆ کوێ؟

سالار: چوونە کێوی تەلو[٣١٧] و لە وێرا بۆجێکی ناشارەزا چوون.

وەزیر: باشە، لەو ماڵانە غەزان کە کوێ دەهێنا؟

سالار: ڕەسمی تورکەمەن ئاوایە کە دوو کاتژمێر ماوە بە ئێوارە سواری ئەسبەکان دەبوون و شەوانە دەچوون بۆلای دوژمن بەیانی زوو خۆیان دەگاندە جێ دزیەو دزیان دەکرد و زوو دەگەرانەوە.

وەزیر: کە کیهە ڕێگایە دەچوون بۆ نێو قوچان؟

سالار: لە نێو روبارەوە کە تا جێگای دیلەکان چل فەرسەخ ڕێیە و ٧٦ دێهاتی هەیە.

وەزیر: چۆن بوو لەو دێهاتانە دزیان نەکرد [لە ٧٦ دێهاتی بجنورد گوزەراون ئەوەلین دێهاتی قوچانیان دزی کرد.]

سالار: لەوێدا بە شەو ڕۆیشتن [وەڵامەکەت منداڵانەیە].

وەزیر: بۆ گەرانەوە بە کوێدا ڕۆیشتن.

سالار: هەر لەوی جقی کە هاتبوون.

وەزیر: بۆچی خەڵکی دێهاتەکان پێشیان نەگرتن؟

---

[٣١٧]- کێوی تەلوکە دۆلی «الامان» در دامنە شمالی. سنووری مابەینی جەرگەلان و مراوەتەپەیە. کێویکی بڵیند و پڕ لە سەرسەوزی، ئەو زەمانی سنووری بەینی پارێزگای خوراسان و مازەندەران وڵاتی روسیە دەبێت.

موحتەشەمسەلتەنە: لە سەر خەڵک نینە کە پێشیان بگـرن، دەبـێ سـوارەکانی دۆلەتی پێشیان گرتبان.

وەزیری عەدلیە: ئێمە در سر حدات حکومت کـردەایم. ئاگاداریـەکن هەیـە، دە حالێکدا ئێوە دەڵێن چۆن دەبێت پەنجاه هەزار تومان کە دزی کراوە، لەو دێهاتـەی رەد بن و خەڵکی دێهاتەکەی هیچیان لێ نەستێنن؟

سالار: ئاگادار نییم، من لێکۆڵینەوە کم کردوە، جگە لە دیل هیچیان نەبردوە.

وەزیر: چون دەبێت ژن و مندالان ببەن بەلام اموال را نبرند.

سالار: چت پێ بڵێم، نازانم.

موحتەشەمسەلتەنە: ئەگەر کاتی رۆیشتنی تورکمەن کەم بوبێ، مـال نبردەانـد. چونکە بردنی چەند هەزار مانگ و مەڕ لە دەیان پـازدە کـاتژمێر زەحمـەتێکی زۆری هەیە. ئەگەر کاتی رۆیـشتنەکان زۆر ببێـت و چەنـد شـەورۆژ ببێـت مـال و حـشم بردەاند.

وەزیر: نە ئیوانییە. ما کە در سر حدات حکومت کردەایم دەزانین چ خەبەرە بـە ئاسانی دەبێت چەند هەزار مانگا و مەڕ ببەن، عەشیرەتەکە و دوویان دەکەون، دوایـە ئەوان هەڵدێن بەلام عەشیرەتەکە ناتوانێت خۆی بگێنیت بە ئەوان.

(لێرە دەنگی هاویستنی تۆپ وەختی نیوەرو اعلام کرد.)

وەزیر: ئاسفدەولە تەلەفونی بۆ ئێوە کرد یا نە؟

سالار: بەلێ، دوای سێ ڕۆژ تەلەفونی کرد، ئەو کاتی تورکمـەن گەیـشتبوونەوە ماڵێ خۆیان.

وەکیلوتوجار: وەختێک کە تورکمەن لە ملکـی ئێـوە رەد بـوو و بـۆچی ولامـی ئاسفدەولە نەداوە کە بە من رەبتی نییە.

سالار: بۆچی ئەمن لە ئاسفدەولە هەر ئەو ولامەم داوە؟

وەکیلوتوجار بە ئاسفدەولە دەڵێت: لە سەر حکوومەتی ئێـوە بـووە کـە مـامور ناردبایە و ئەو لێکۆڵینەوەی کە لازمە کردباو.

ئاسف: پێم گوتن کە حەوت مامورم ناردوون.

وەزیر بە ئاسفدەولە دەڵێت: مامورین ئێوە چ لێکۆڵینەوەکیان کردوە.

ئاسف: [دوای برەک هەلە چون لە قسە کردن دەلێ] لە بیرم چووتەوە.

وەزیر: کاری بەو گەورە یە لە بیر ناچیتەوە، کورتەیەکی بڵێ؟

ئاسف: خولاسەکەی ئەوەیە کە لە ملکی سالار رەد بوون، چونکە سالار بۆ خۆی دەڵێت، کە لە مولکی رووس نەبوون چونکە قوچان دەگەل یەموت نێوانیان نییە. یە لە مولکی روس هاتوون یا لە ئێران، چون لە رووسەوە نەهاتوون پەس لە بجنووردەوە بوون.

دەبیری تایبەتی: بەڵێ ئەگەر لە مولکی رووس بایە، حەتمەن وەزارەتی دەرەوان ئاگادار دەکردەوە.

سالار: ئەو کارانە شتێکی تازە نین، هەموو کاتێک روی داون.

وەزیر: بەلی، ئەو کارانە هەموو کاتێک لە ئێران روی داون و شتێکی تازە نین بەڵام خەڵکی ئێمە تازە لە خەوێ هەڵدەستن.

کورە کۆتایی پێهات.

میـــان ســرخس اســت بـــاورد و تـــوس
ز بـــــاور برخاســــت اوای کـــــرس
ز یکـــــــسو بیابـــــــان بی‌اب و نم
تـــــلات از دگـــــر ســـوو راه چـــوم
پــــس انگـــه بیامــد ســپهدار تـــوس
بـــــه راه تـــــلاوت انـــدر اورد کـــوس

مەبەستی نووسەر لە نووسینی مێژووی باورد و کەلات و سەرەخس لە بەشە لـ مێژوو نییە، بەڵام مێژووی تەواوی ئەو ناچەیەم لە مجموعەی جداگانە خڕ کردۆتـەوە هیوادارم رۆژێ توانایی منالی ئیجازەم پێ بدات چاپی کەم.

مەبەست لێرەدا مختـلر اشـارەای بـە ژیـان و مێـژووی عەشـیرەتەکانی کـور ناوچەکانی کەلات و ئەبیورد.

کەلات و سەرخس ئەبیورد و نسا (مابەینی دەرەگەزی ئەلحان و عیشق ئابـادی شۆرەوی) لە رۆژگاری باستان لە ناوچەی مەرزی ئێران و توران هاتۆتە ئـەژمار. زۆر هەبووە کە سپاهیان ایران لە رووباری. جیحوون گـوزەراون و ئـەو ناوچەیانـە کـە لـ ئیسفەهان مەرکەزی ئەو رۆژی ئیران دوو بووە، اشغال کردەانـد. شـەڕانی خوێنـاوی

زۆر بۆ وەرگرتنەوەی ئەو لە لایەن ئێرانیەکان، بین ئێـران و تـووس (تورکـستانیهـا) هاتۆتە پێش، بە ناوبانگترینی ئەو شەرانە شـەری یـاردەرۆخ لـە نیزێـک شـەهدروود (روباری تەژەن سەرەخس) بووە. هەروەها کەلات بە هنگام پادشاهی کیخسرو، هاتـە ژێر دەستی تورانیەکان. ئەفراسیاب پادشای تـوران زەوی، نـەوەی کچـی خـۆی بـە نێوی فرود کە برای کیخەسرو کـوری سـیاوەش بـۆ. بـە سـەرۆکایەتی حکوومـەتی کەلاتی دانا.

کیخەسرو، بە توسی سپهبد ایرانی بو وەرگرتنی ئەو ناوچەیـە دەسـتوری‌دا، کـە هێرشێکی زۆر گەورە دەست پێ بکات. در قمن بە توس سفارش نمود کە لە ڕێگای کەلاتِ و تەروات، مەبادا کە مەبەینی ئەو و براکەی فرود شەر پـێش بێـت و براکـەی بکوژرێت از بدو حادێـە تـوس ڕێگـای چـەرم و کـەلاتی هـەلبژارد، چونکـە ڕێگـای سەرەخسی دوو روبێ ئاو بۆ.

همانگـــە بیامـــد ســـپهدار تـــوس
بـــە راه کـــلات انـــدر اورد کـــوس

لە ئاکامدا هەر بەو جۆرەی کە کیخسرۆ خەبەری دابۆ. براکەی فرود بە دەسـتی تووس کوژرا، و کوتیانـە چونکـە تـوس لـە خەجالـەتیان و شـەرمەزاریە رووی نـەبۆ بگەرێتەوە بۆ کن کیخەسرو، دوایە لە خوراسان نیشتە جێ بۆ، و شاری تـوس زادگـاه بعدی فردوسی[٣١٨] سازی کرد و بە نێوی باو بۆ، کیخەسرۆ دوای کوژرانی براکـەی لـە ئەرق ئەستوری خۆی بە تووسی نودەز دەڵێت:

بـە گفـتم کـە سـوی تـلات و چـوم
مـــرو گـــر نـــشاند بـــر ســـردرم
کـە انجـا فـرود اسـت بـا مـادر اسـت
کـوی کـی نـژاد اسـت و گنـداور اسـت
بگفـــتم مـــرو ســـوی راه چـــرم؟
بـــرفتی و دادی دل مـــن بـــە غـــم

---

[٣١٨]- وەرگرتن لە شاهنامەی مامۆستای قسەو عالیمی ناودار ئەبۆلقاسم فێردوسی تووسی.

له سه‌ده‌ی چواره‌می کـۆچی تورانیـه‌کان (تورکـان غه‌زنـه‌وی و سـلجوقیان و غۆزان) به ته‌رتیبی مێژوو له رووباری جیحون گوزه‌راون و.
به هۆی نه‌بوونی عدم فرماندهی واحد ایرانیان،تورانیه‌کان ناوچه‌کانی سـه‌ره‌خس و ئه‌بیورد و که‌لات و دره‌گه‌ز و ته‌واوی خوراسان و دوایه ئیرانیـان هێنـا ژێرده‌سـتی خۆیان. له سالی ٦١٧ مـانگی مه‌غولـه‌کان و بـه دوای ئـه‌وان‌دا تیمـوری لـه‌نگ بـه‌و ناوچه‌یانه و ته‌واوی ئێران مسلط شدند.
از دوره‌ی تیمور به بعد، جێ شوێنی تورکانی جانی قوربانی کـه له‌وانه‌یـه دوای تیمـور مه‌زهـه‌بی شـیعه‌یان بـۆ خـۆ هـه‌لبژاردبێ لـه کـه‌لات و ئـه‌بیورد ده‌بیـنن، حکوومه‌تی که‌لات سالیانه‌کی زۆره که له ده‌ست عه‌شیره‌تی جانی قوربانی بووه.
که ئه‌لحان برایانی جانی قوربان لـه ده‌ره‌گـه زدا نیـشته جـێن. کـه کـۆنترین عه‌شیره‌تی به جێ ماو و ئه‌سیلی تورک له‌و ناوچه‌یه‌ن.
بـاقی تورکـه‌کانی ده‌ره‌گـه‌ز لـه کۆچکراوه‌کـانی روسـیه‌ن کـه دوای شۆرشـی شۆره‌وی بوونه په‌نابه‌ری ئێران که زۆرتری ئه‌وان کۆچه‌رانی ئازه‌ربایجـان بـۆ عیـشق ئاباد بوون. و له‌وێدا به کار تجارت و بازرگانی اشتغال داشتند.
به همین علت اگاهی در اقتلاد داشته که دوای ئه‌وه‌یکـه چـوون بـۆ ده‌ره‌گـه‌ز، ئیقته‌سادی ئه‌وێیان گرته ده‌ستوور دست بومیان اعم از کرد و ترک را از بـازار درگـز کوتاه نمودند. له مێژووی تورکه‌کانی جـانی قوربـانی ناوچـه‌ی کـه‌لات و ده‌ره‌گـه‌ز بگوزه‌رێین. نۆبه‌ت به تورکانی جه‌لاد و ئه‌فشار و چاو شلو ده‌گات.
به ئیحتمالی زۆر جه‌لایره‌کان و ئه‌فـشاره‌کان و چاوشـلوکان لـه زه‌مـانی شـاه عه‌بباس، وه‌ختی جێبه‌جێ کردنی کورده‌کان بۆ خوراسان، تو ئـه‌و ناوچه‌یـه انتقـال یافته‌اند. به‌لام ئه‌و ئه‌همییه‌تی سیاسی و نیزامی کورده‌کـان لـه خوراسـانیێیان نـه‌بۆ. ئه‌همییه‌تی جه‌لایره‌کان و ئه‌فشاره‌کان زۆرتر لـه ناوچـه‌کانی ئازه‌ربایجـان و عیـراق عه‌ره‌ب بووه.
جه‌لایره‌کان له وه‌سـه‌تی سـه‌ده‌ی هه‌شـتووم تـا سـه‌رده‌ی نۆهـه‌م سلسله‌ی جلایریان یا ئال جه‌لایر لـه عێـراق پێکیـان هێنـا. پـێم وایـه، جـه‌ماوه‌ری هـه‌ر دوو عه‌شیره‌تی ناوبراو به ته‌نێ له هه‌زار ماڵ له کاتی جێبه‌جێ کردنیان نه‌شته سـه‌رێ و

بەرامبەری ٤٥ هەزار ماڵـی کـوردی گـوێزراوە دەسـەڵاتێکیان نـەبووە و تورکـەکان لەگـەڵ عەشـیرەتی کـورد شـیخوانلوو، سـووفیانلوو ،زیـدانلوو بـاچلوانلوو،قرا باشـلوو ترسـانلوو[٣١٩] لـە ناوچـەی کـەلات و دەرەگـەز و ئـەبیورد ئاگـاداری وپاراسـتنی سنوورەکانی ئێرانیان لە سەر شان بووە. لەو بەڵگانەی کە لە لاپـەڕەکانی ٤٨٢ و ٤٨٣ و ٤٨٦ بەشی دووەمدا چاپ کراوە، وادیارە کە دەسـەڵاتداری چـاک لـەو ناوچەیـە بـە کوردەکانی شیخوانلوو بووە. زولفەقار شیخوانلوو کوڕی مستەفا شیخوانلوو لە زەمـانی شاعەبباس لەو ناوچەیە لە دەسەڵاتدارترین کەسان بوو.

بەردی قەبرەکەی ئێستاکە لە لووتکەی کێوی هەزارمزگەوتی ئولونگ‌شاهی دایە.

حاکمی ئەبیورد لە زەمانی هاتنی نادر، بابا عەلی بەیگ کۆسە ئەحمەدلوو بـووە، کە لە وانەیە لە عەشیرەتی ئەفشار بێت.

نادر لە سەرەتای لاوی خۆی گەیشتە خزمەت بابا عەلی بـەیگ وئازایەتیـەکانی ئەوەندە بوو تا ئەو جێگـای کـە کچـی بابـا عـەلی بـەیگی هێنـا . لاوازی دەوڵـەتی شاسوڵتان حوسـین سـەفەوی بـە چـاوی خـۆی دی. لەناوەنـدی ئێـران و کـار بـە دەستانی دەوڵەت ناهومێد بوو.

پاش گەڕانەوە بۆ خوراسـان دەسـتی کردبـەچالاکی نوانـدن بۆگرتنـە دەسـتی دەسەڵات.

لە زەمانی نادر دەسەڵاتداری دەرەگەز لە دەست کوردەکانی باچوانلوو، قرباشلوو و مامیانلووە بووە. شوکرسولتان باچوانلوو لەو کەسانەیە کە بە یەکگردنی کوردەکـانی دەرەگەز یاریدەری نادر دەدەن. دوای ئەو کوردەکانی کەلات و لاین بۆ لایەنگری لە نادر هەڵدەسنەوە لەو کاتەیە کە تەهماسبقولی‌خـان جـەلایر لـە ناوچـەی کـەلات هەڵدەستێتەوە و بە هێزە کورد و ئەفشار و جەلایر کەلات و لاین و ئەبیوردیەکان بـۆ پشتگیری لە نادر هەڵدەسنەوە.

تەهماسبقلی خان‌جەلایرتائاخرهەرلاینگری نادربوو و وەکـو بـرا و کـوڕی خـۆی ڕێزی لە نادر دەگرت.

---

[٣١٩]- مابەقی تۆرسانلووها لە دەوروبەری چناران و داش و بولاغ و مەقسود ئاباد قوچـان نیشتە جێ بوون.

ئازایەتی تەهماسبقولیخان جەلایر لە بەرگی یەکەمدا نوسراوە و گوتمان: ئەو کاتێک دەچێت بۆ سیستان تابەرگری بکات لە دژایەتی عەلی قولی میرزای برازای نادردژ بە نادر. بە دەستی عەلی قولی میرزا دەکوژرێت و مەرگی ئەو بۆ نادرزۆرگران بوو.

پاشماوەی ئەو عەشیرەتە ئازایە لە حاڵی ڕۆیشتن بۆ مەشهەدن. ئەمن نازانم لەو بابەتەیەوە ناڕاحەت بم یا خۆشحاڵ. چونکە لە لایەکەوە لەشوێنێکیباش دەژین ولەلایەکیترەوە ناوچەکانی کەلات و لاین لەوان خالی دەبێت و لەویٚ نامێنن.

جەلایرەکان دوو ڕەگەن، لە لایەکەوە دایکیان کوردە بە هۆی ئەوەوە کوردی زمانی ئەوەلی ئەوانە، هێندیکشیان ئەسڵەن تورکی نازانن. تەنیا عەشیرەتێک کە کوردان ژن بە ژنەیان دەگەل کردوون هەر ئەو جەلایرانەن کە چەندین سەدە دەگەڵ کوردەکان چ لە عێراق عەرەب و چ لە ئازەربایجان و چ لە خوراسان تێکەڵاویان هەبوو.

بە هەر حال حکوومەتی کەلات دوای کوژرانی تەهماسبقولیخان جە لایر و نادر شا، لە دەست جە لایرەکان ماوەتەوە و حکوومەتی لاین لە دەورەی نادرشا بە شاهوێردیخان کوردی سووفیانلوو بووە، چوونکە شیخوانلوکانی فەرمانبەری شاهوێردیخان شیخوانلوو کەمتر لە نادر فەرمانیاندەبرد. هەر کاتێک کە دەرفەتیان دەبوو دژ بە نادر ڕادەوەستان.

لە دەورەی شاڕوخ، حکوومەتی کەلات بە یووسفعەلیخان جەلایر بووە و یەکیٚ لە ژنەکانی شاهرۆخ لە عەشیرەتی جەلایر بووە زۆرترین زێڕەکانی نادر لە زەمانی شاهرۆخ وە دەست ئەو یووسفعەلیخانە کەوت.

لە زەمانی فەتعەلی شا (۱۲۲۹ مانگی) حکوومەتی کەلات بە سەیدموحەممەدخانی جەلایر برای یەلەنگتووشخانیجەلایر بووە. یەلەنگتووشخان لەو سەردەمەدا گویٚ بە فەرمانی دەوڵەتی ئێران نەبوو. لە شای خارەزم فەرمانیدەبرد.[۳۲۰]

لە شای خارەزم نازناوی (سەرۆکی گشتی سنوورەکان)ی وەرگرتبوو.

---

[۳۲۰]- کۆچی مێژویی کورد بۆ خوراسان بەشی یەکەم لاپەرەی ۲۱۹.

لە سەردەمی موحەممەدشای قاجار، حکوومەتی کەلات بە دەست یەلەنگ‌تووش‌خانی‌جەلایر بووە. کە بە پێی ئەو بەڵگانەی کە هەن لەو کاتە بە دواوە حکوومەتی کەلات وەدەست منداڵەکانی یەلەنگ‌تووش‌خان دەبێت.[٣٢١]

و لاینیش بە دەست کوردەکانی سوفیانلوو لە منداڵەکانی شاهوێردی‌خان. ئاقا لۆرسووفیان وپاشان نووروێردی‌خان جەلایر خوشکەزای ئاقا لۆرسووفیان‌لەلایەن‌بوون.[٣٢٢]

بەڵگەیەک لە کوردەکانی شیخواتلوو سوفیانلوو ئەبیورد و کەلات و لاین

لەبەرئەوەی‌کە لەساڵی پێشوو زۆرتری بەڵگەکانی کوردەکانی خوراسان بە هۆی تێکچوونی دەسەڵاتدارەکان و ڕژیمەکان و شۆڕشەکان لە ناوچوون. دووبارە لە گۆشە و کەناری ئەو سنوورە گەورەیە بەڵگەی جوان پەیدا دەبێت.

ئێمە دەبێت لە خەڵکی کەلات و لاین بە بۆنەی چاک ڕاگرتنی هێندێ بەڵگەی بە نرخ و بایەخداری‌خۆیان دەست خۆشیان لێ‌بکەین.

بەڵگەهایەک لە کوردەکانی شێخوانلووی ناوچەی ئبیورد و کەلات هەیە کە بۆ سەردەمی سەڵتەنەتی سەفەویە دەگەڕێنەوە. بەڵگەیەکی هەبۆ لە ولدان زولفەقاری شیخوانلوو کە پێش ساڵی ١٨٠٨ مانگی کۆچی دوایی کردوە و هاوچەرخی شاعەبباس بوو. لەوانەیە ئەو کاتێ کە کوردەکان دەگەنەخوراسان لاو بووبێ.

بەڵگەیەکی‌تری ساڵی ١٠٩٢ و بەڵگەیەکی‌تریشی مستەفا شیخوانلوو هی ساڵی ١١٣٤ مانگی بوو ،واتا ئاخری دەورەی سەفەویە و سەردەمی لاویەتی نادر.

خوالێخۆشبوو ڕەحمان بەگ شیخوانلوو لە گەورە پیاوانی لاین کە چەند ساڵ پێش کۆچی دوایی کرد لە ئەولادی ئەو مستەفا شیخوانلوویە بووە.[٣٢٣]

---

[٣٢١]- کۆچی مێژووی کورد بۆ خوراسان ب ١، ل ٥- ٢٧٦.

[٣٢٢]- ڕێزی زۆرم هەیە بۆ موهەندیس عەبدوڵڵا جەلایر کە بەڵگەکانی بنەماڵەکەی بە ناوبانگی خۆی بۆ روون بونەوەی چاکتری مێژووی ئێران لە ئیختیاری نوسەری داناوە.

[٣٢٣]- پێم وایە خوالێخۆشبوو ئاقا سوفیان ئەوەلین کەسێکە کە بە توند و تیژی زۆر حکوومەتی ئیسلامی بەپێی باری دینی لە لایەن بەڕێوە بچێ.

توند و تیژیەکانی شەرعی ئەو بوو بە هۆی ئەوەی کە خەڵک وردە وردە لەوێ دوور بنەوە و بە خوشکەزاکەی نووروێردی خان جەلایر کە پیاوێکی ژیکەڵە بوو و خۆشەویست بۆ بێنەلای، کە لە بەشەکانی دوایی لەوبارەیەوە دەدوێم.

پێش ئەوەی‌کە کوردەکان بچن بۆ خوراسان هێندی لە عەرەبەکان لە باشوری ڕۆژهەڵات بە جێ مابوون لە ناوچەی ئەبیورد ژیاون، کە دەتوانین بڵێین ئەعرابی ئەسکەندەری لەوان بوون. کوردەکان دوای ئەوەی‌کە بچن بۆ ئبیورد و کەلات زەمینەکانی ئەوانیان کڕیوە و وادیارە عەرەبەکان لەوێ کۆچیان کردووە، چوونکە ئەلحان جێ شوێنی ئەعرابی ئەسکەندەری لە ناوچەی بەینی گورگان و ڕۆژئاوای بجنوورد دەبینین کە لە کتێبی «ناسینی خەڵکی خوراسان» جێ و شوێنی ئەوانمان ناو بردووە.

ئەوە بەڵگەیەکتر لەو بابەتەیە کە پاشماوەی زەمینەکانی ئەعراب ئەسکەندەری ئێسمی‌خان و بەدرخان -کوڕەکانی خوالێخۆشبوو نەقد عەلی ئاقا شیخوانلوو وکوڕی زولفەقار شیخوانلوو- لە سالی ١١٤١ مانگی کڕیویانە (ئەو کاتە تەواوی ئەو زەمینانە و ئبیورد لە ژێر دەستی ڕووسەکانە کە ساڵی ١٢٩٩ مانگی لە ئێران جیایان کرد).

**بەڵگەی ژمارە ١:**

لەو بەڵگەیەدا هاتووە کە «... معالي پناه محمد فاضل و مرحوم مير سبحان- عرب اسكندري همگي و تمامي ملك مزرعه شورابه‌ي سلطان محمود مشهور به شورابه‌ي كوچك ميانه‌ي شورابه‌ي بزرگ و چشمه جنجال است.» حدي آن با قدري در بند [احتمالا به قوري در بند] است و از يكطرف شورابه‌ي بزرگ است كه ملك متعلق و موروثي است به رفعت و عزت نشان اسعي خان آقا و بدر خان آقا ولدان مرحوم نقد علي آقا شيخوانلوو مبلغ پنج تومان عراقي بدون وجه [؟] مقطعي همه ساله كه مقدار بيست [و] پنج من غله‌ي ساده و مبلغ پانصد [يك كلمه خوانده نشد] نقد كه قيمت وقت بيع بوده... و... كل آنچه كه متعلق به شورابه دارد و آبي‌زار و ديمه‌زار و كل ما يتعلق بها من القليل و الكثيره آنچه از آن دانند و بدان نيست دهند همگي داخل بيع و تعلق به مشتري مشاراليه [و لو ان نقد علي] دارد...»

نوسراوی مانگی پووشپەڕی ١١٤١- مۆرەکانی موحەممەد فازل فرۆشیار و خوداوێردی ئاقا وەکیلی ئەسکەندەری و عەلی ویردی مادلوو (لە کوردەکانی مادیالو

مادانلوو، یا مادوانلو کە هەڵەکەشی مایلوانلوە.)

مەلا عەلی ئاقا عەرەب ئەسکەندەری پارێزەرە و مۆری عەلی مەحەممەد و خوداوێردی و بەڕێز ئەسکەندەری و ئیمزای ئەڵڵا قولی خەراباشلوو (کوردەکانی قەراباشلوو ئێستا لە دەرەگەزن) و مۆری هوئەللا عەلی ئەکبەر و مۆری فەتحەلی بەگ ئەسکەندەری.

**بەڵگەی ژمارە ٢:**

کورتە باسێکە لە مستەفا شیخوانلوو بۆ نادرشای ئەفشار بەو ناوەڕۆکە:

هو عرضه داشت کمترین بندگان مصطفي شيخوانلو بەزرهوەي وكلاء نواب مستطاب عالي كه ديمەزار از قرا آقاج از بيست سال پيش در تصرف من بوده، اكنون محمد نام اسكندري رفته به خدمت بيگلر بيگي مشهد مقدس و به خلاف به عرض وي رسانده كه ملك مزبور متعلق به اوست و حكمي گرفته و آورده و محصولات آنجا را برده و تهديد كرده است كه اگر آنجا بروم مبلغ پنج تومان هم بايد وجه التزام و داده باشم و وقتي من اين موضوع را شنيده آنجا رفته ام، نادر محمد نام فرار كرده است و اكنون وظيفەي من چيست؟

نادرشاش فەرمانێکیداوە و مێژووی ئەو نادیارە خەڵکی ئەو ناوچەیە نادریان بە خۆیی دەزانی چکوولەترین گلەی خۆیان بە خودی نادر دەگوت و نادر بە تەواوی ئەو گیروگرفتانەی کە هەی بوو؛ خۆی بە تەواوی بەوئەو گلەییانە ڕادەگەیشت.

**فەرمانەکەی‌نادر:**

بسم الله الرحمن الرحيم

**مۆری نادر:** «مظهر لطف الهي نادر است

خوا طغري: اعوذ بالله تعالي- فرمان همايون شد، آنكه حاكم و عمال الكاي ابيورد جماعت عارض صوفيانلوو را به خلاف حكم ولآب بعلت ملازم [چند كلمه خوانده نشد] و كخ و زغال و چريك و غيره. به همين جهت مزاحمت نرسانيده گذرانده كه مرفه الحال و فارغ بال بر امر ايليت و مزويت خود اشتغال ورزند. قدغن نمايند و بر عهده شناسند. تحريراً في ١٥ شهر ربيع الاول سنه ١١٥٣.

**بەڵگەی ژمارە ٤:**

فەرمانێکە لە لایەن نادرشا بۆ شاهویردی بەیگ سۆفیانلوو

«بسم الله

نگین است و این رفته
بود چون از جا
بنام نادر ایران قرار
داد خدا»

و طغراي سر نامه چنين است: «اعوذ بالله تعالي. فرمان همايون شد.»

آنکه عمده الاعيان شاهويردي بيگ داروغەي شتر خان، چون از مضموم رقم اشرف مطلع گردد نظر علي بيگ شاهسون (تکلو) را که در شتر خان داروغه بوده، به زودي روانەي درگاه معلي نمايد، که او را ميخواهم روانه نمايم و داروغەي ديگري را که حواله کرديم نفرستند. بزودي نظر علي مزبوررا روانه نماييد و در عهده شناسيد. ٢٩ شوال سنه ١١٥٤)

بەڵگەکە وا دیارە بە خەتی خودی نادرشایە کە مۆرێکی لێداوە کە تێی دا هاتووە کە «ضرورت نيست، همين نظر علي بيگ شاهسون» [يك كلمه ناخوانا] بفرستيد بزودي روانه نماييد و راهي كنيد.»

بەڵگەی ژمارە ٥- نوسراوەیەکە لە بێهبوود خان سۆفیانلوو بۆ دەرگای نادرشای ناردووە و دوو پارچە زەوینی دێمەکار کە نادر شا بە باوکی بهبوودخان بە نێوی عەلی گوڵ (باوکی کە مرد کەسێک بە نێوی عەلی قەنبەر هاتووە دەڵێت زەویەکەی نادەم بە تۆ...

داوام هەیە کە بۆ خاتری خواو و دوازدە ئیمام دەستوور بدەن مافمنەخورێ)

چون بەشی سەرەوەی بەڵگەکە دڕاوە، مێژووی بەڵگەکە نازانرێت.

پاشماوەی بەڵگەکانی سەردەمی نادرشا کە مەربووت دەبن بە کوردەکانی لاین و کەلات لە چاپیدووەمی بەشی یەکەمدا دێت. بەڵگەکانی جەلایرەکانی کەلات و لاین کە لە منداڵەکانی تەهماسبقولیخان جەلایر -سەرداری بە ناوبانگی نادر- نیشان دەدات کە لە کاتی شۆڕشی سالار لە خوراسان دووبارە گەورە پیاوەکان و

ئەمیران جەلایر لە ناوچەی کەلات دەسەڵاتداربوون و حکوومەتیان هەبووە.
ئاژاوەی‌سالار ئینگلیزی هەڵیگرساند.[٣٢٤]

ئاشکرا نییە کە ئەو نەزەرعەلی بەیگی شاهسەوەن چە هەڵەیەکی کردووە کە ئاوا زوو دەرکراوە و بانگیان کردووە[٣٢٥] و ڕوانەی ئەوێ دەکا، کە لە وێدا پەنا بگرن. ڕۆژی دواتر کە نەورۆزخان بۆ وتوویژ لەگەڵ دە کەس لە ڕیش سپیان و پاڵپێوە دراوانی خۆیدا دێتە سەری شوێنی بڕیارەکە. یەک جارە سوارەکانی سلێمان‌خان دێنە دەرەوە ودەڕژنە سەریدا و بەم جۆرە چووپانڵووەکان گەمارۆ و کەلەپچە دەکرێن و بە دەستووری سلێمان‌خان زوو سەری نەورۆزخان لە جەستەی جیا دەکەنەوە و بە ڕاپەڕینی کوردەکان لە دەڕەگەز کۆتایی ئەدەن و لە ئەم کاتەوە ناوچەی باچووپانلۆ و دەروونگەر و نۆخەندان ئەخرێتە سەر ناوچەی دەسەڵاتداری سلێمان‌خان، وا دیارە کە ئەم کارە لە لایەنی ئێلخانی زەعفەرانلوویشەوە داکۆکی لە سەر دەکرێ. چۆن لە پاشان لە ماوەی گەمارۆی مەشهەددا هەر ئەم سلێمان‌خانە لە کنی سام خانی ئێلخانی زەعفەرانلۆدا وەکوو پەرەستشکارێکی دەبینین. لە پاشان شوێنی کوژرانی ناپیاوانەی نەورۆزخان لە نزیکی موحەممەدئاوا بە کەلاتەی نەورۆزخان ناوبانگ دەر دەکا. سلێمان خانیش هەتا ساڵی ١٢٧٠ کە کۆتایی تەمەنیە دەسەڵاتداری دەڕەگەز بووە. لە پاش کۆچی دوایی سلێمان‌خان ئەڵلاهیارخانی کوڕی دەکاتە دەسەڵاتداری دەڕەگەز، بەڵام بە هۆی ئەوە کە حەرەمسەرای بوو و ماوەی زۆری تەمەنی خۆیی لە مەشهەددا تێپەڕ دەکرد نەیتوانی سنوورەکانی دەرەگەز بپارێزێ و لە سەردەمی ئەودا ئۆزبەکەکان و تورکەمانەکان هێرش دێنن بۆ دەڕەگەز و ژنان و منداڵان دەبەن

[٣٢٤]- زۆر سوپاس بۆ بەرێزان و خۆشەویستانی لاین بە تایبەتی حاج ئەسەد سەفایی و موحسین غەفوری و حاج ئەمین و میرزا شیخوانلوو و نادر عالەمی و حاج سولەیمان ترسانلوو حاج میرزا بەگ زەعفەرانلوو و منداڵەکانی نورویردی خانی جەلایر و حاج میرزا زولفەقاری جە لایر و حاج یەحیا و مەرحووم گەزج بەحش و بانوو گول بی‌بی جەلایر کە بە بەڵگەو ئیتلاعاتی مێژووی و فەرهەنگی خۆیان بۆ سەریان یاری داوە.

[٣٢٥]- بەڵگەی ژمارە ٥- نوسراوەیەکە لە بهبوود خان سوفیانلوو بۆ دەرگای نادرشا بۆ دوو پارچەزەوی دێمەکار کە نادرشا بە باوکی بهبوود خان بە نێوی عەلی گول (لویەتێ و پارەکە باوکی کە مرد کەسێک بە نێوی عەلی قەنبەر هاتووە ئێدەعای دەکات و دەڵێت زەویەکە نادەم بە تۆ...)
داوام هەیە کە بۆ خاتری خواو و دوازدە ئیمام دەستوور: دەن کە مانم نەخورێ.

به دیلی، و باخەکان وێران دەکرێت و ڕۆژگار بـە سـەری دەرەگەزییەکانـدا ئەوەنـد
دژوار دەبێ کـە زۆریـان هەڵـدێن بـۆ قووچـان و مەشـهەد. تورکەمانـەکان لـە ئـە
سەردەمەدا جەنایەتگەلێک لە دەرەگەزدا ئـەنجام ئـەدەن و ئەوەنـدە لـە هەمبـەری
دیلـەکان بـە تایبـەت ژنـانی دیلـی کـە هـەتا ئاکـامی مـەرگ دیلـی خوازیارییـ
نامرۆڤایەتییەکانیان نابن، ناپیاوی دەکەن که وەکوو ئەم نامرۆڤایەتییانە لـە کـردەوەی
ئاغە موحەممـەدخانی قاجـاڕ لەگـەڵ لوتفعـەلی خـانی زەنـددا دەبیـنین، تەنانـەت
ناجۆرتر و خراپتر لە ئەوە کە پێنووس لە نووسینی شەرمی هەبە، ئاغـەی هووشـەنگی
بێهبوودی لە هاوڕێیانی نووسەر کە لە منـدالانی ئەڵـلاهیارخانە، بـە وتـەی بـاپیرانی
خۆی چیرۆکی ژنێکی بۆم گێڕاوە کـە توانیبـووی لـە پـاش چەنـد سالـی دیلـی لـ
دەستی تورکەمانەکان هەڵێت و خۆی بگەیەنێتـە دەرەگـەز و چارەڕەشـی خـۆی
هاوولاتییانی دیکەیی بۆ ئەڵلاهیارخان بگێڕێتەوە. دەڵێن ئەڵلاهیارخان ئەوەندە گریـ
و کە بێ هۆش داکەوتبوو. ڕەزا قولیخانی هدایەت لە سەفەرنامەی خۆیدا ڕاڤەی ئـە
چارەڕەشـی و ڕۆژڕەشـی هاوولاتییـانی ئێمەیـە هێناوەتـە ڕوو. کـە لـە ڕووبـەرگی
دووهەمدا ئاماژەی پێ کرا. لە ئاکامدا نەبوونی کارزانی ئەڵلاهیار خـان بووەتـە هـۆی
تێبینی پێدرانی لـە لایـەنی ناسـرەدین شـای قاجـاڕەوە و شـای قاجـاڕ بـە ئـەمیـ
حوسـەینخـانی شـوجاعودەولـەی ئێلخـانی زەعفـەرانلوو و حەیـدەر قـولیخـانی
سەهامودەولەی شادیلوو دەستوور ئەدا کە گوندەکان و شـارە وێرانەکـەی دەرەگـە
دیسان ساز کەنەوە و بە جێدانی هۆزو تیرەی زۆرتـری کـورد لەوێـدا، دەرەگـەز لـ
هەمبەری هێرشی تورکەمانەکان بپارێزن. کە ناوەرۆکی دەستووری ناسـرەدین شـا
لە ڕووبەرگی دووهەم و لە لاپەڕەکانی ٤١٧ بە پاشدا هێنـاوە و لێـرەدا پێویـستی بـ
دیسان نووسینەوە نیە. لە گولانی ئەمساڵدا ١٣٦٥ کە لە دەرەگەزدا بـووم، شـارەوانی
چالاکی ئەوێ دەستی کردووە بە پەرەپێدانی بازاڕی شار. شـەقامی بناغـەیی شـاری
خراپ دەکرد، کە شوێنی ماڵە سەرەتاییەکانی شار بە چاکی دیار بوو و ئـەو قامێـش
بەرزانەی کە لە سەردەمی ئەمیرحوسـەینخـانی ئێلخانیـدا بـە سـەری سـەرووەرانی
ماڵەکاندا نراوە، هەروا خۆ ڕاگر و سـەخت و تەنانـەت بـەخمی سـەوز مـابووەوە. لـ
ڕابردوودا لە دەرەگەز قامێشی زۆر بوو کە لـە پـەنای ئـەم قامێـشانەدا تورکەمانـەکار
هێرشیان ئەهێنا بۆ خەڵکی. بە دەستووری ئەمیرحوسەینخان ئەم قامێشانە ئاگر در

و جێگای هەمووی کرا بە باخ . لە ئاکامدا ئەڵڵاهیارخان لە پاش چەند ساڵ دەسەڵاتداری لە مەشهەددا نیشتەجێ بوو. ئەڵڵاهیار خان ١٢٠ ساڵ تەمەنی کرد و ٣٠ ژنیشی بوو کە مندالانی زۆرێکی لێ بە جێ‌ما. ئەڵڵاهیار خان بە کەڵک وەرگرتن لە جۆرێک مەعجوون هەتا کۆتایی تەمەنیشی لە بەجێهێنانی ئەرکی ئایینی خۆی لە هەمبەری ژنەکانیدا ئالۆز نەبوو کە تەنانەت لە ئاکامی تەمەنیشیدا خاوەنی منداڵی کۆرپە بووە. هەروەها لە سەفەرەکانی ناسرەدین‌شا بۆ خوراسان هەموو کاتێ لە دەستەی ئەو کەسایەتییانە بووە کە لەگەڵ حاکمی خوراساندا دەچوون بۆ پێشوازی شا، کە لە ڕاڤەی سەفەرنامەی ناسرەدین شا بۆ بجنوورد ئاماژەی پێ کراوە. ئەڵڵاهیارخان پێش لە ساڵی ١٣٠٠ دەسەڵاتدار نەبووە، ئێستا ئاغەی قاسمی لە پەڕتووکی خاوەران دەسەڵاتی ئەوی هەتا ١٣٠٣ کۆچی مانگی نووسیوە.

مەجدەدەولەیش لە نامیلکەی مەجدیەی خۆیدا کە ئەمیر حوسەین خانی سەهامەدەولەی یەک لایەنە تاوانبار کردووە، ئاگاداری لە بارودۆخی دەرەگەز لە سەردەمی ئەڵڵاهیارخان و خراپییەکانی دەرەگەز نەبووە. لە پاش پەراوێز کردنی ئەڵڵاهیار خان بە پێشنیاری ئەمیر حوسەین خانی شوجاعەدەولە، موحەممەد عەلی خانی برای ئەڵڵاهیار خان بووەتە دەسەڵاتداری دەرەگەز. ناسرەدین شا لە سەفەرنامەی ساڵی ١٣٠٠ی خۆیدا کە لە بجنووردەوە دەچوو بۆ قووچان دەڵێ لە ڕۆژی یەکەمی شەواڵ لە شوێنێک بە ناو چەمەن لەیلی. «چەند سواری دەرەگەزی و موحەممە د عەلی خانی دەسەڵاتداری دەرەگەز لەگەڵ دوو برایدا بە ناوەکانی قەراخان و ساری خان.... کە لە دەرەگەزەوە هاتوون گەیشتنە خزمەت. پێمان وت کە ئەمە موحەممەدعەلی‌خانی برای ئەڵڵاهیارخانە و ئەمانیش کوڕەکانی سلێمان‌خانی دەرەگەزین.» لە ئێشە بەرچاوەکانی ئەڵڵاهیارخان میوانداری لە ئەمیرعەبدوڕڕەحمان‌خانی پاوشای ئەفغانستان بوو کە لە کاتی هاتن بۆ دەرەگەز ئەنجامی‌دا؛ لەم پێوەندییەدا دوو بەڵگە هەیە و نەوتراو نەمێنێ کە ئینگلیزییەکان لە هەمبەری ڕووسەکانەو لە ئەمیرعەبدوڕڕەحمان‌خان پشتیوانییان کردووە و دیسان گەیاندوویانەتە دەسەڵاتی ئەفغانستان. ئەم بەڵگەیە بێژەری ئەم مەبەستەیە کە لە پاش ئەمەی کە ئەمیر عەبدوڕڕەحمان‌خان دیسان گەیشتەوە دەسەڵاتی

ئەفغانستان، بە هۆی مەحەبەت و میواندارییەکان ئەڵلاهیارخان و بە پێی پێشنیاری سەرپەل و سەرۆکی چەکداری هەرات کە ناوی فەرامەرزخان بووە و بە گومانم خۆیشی لە هەلاتووەکانی هاوڕێی پاوشا بووە، ساڵێ ۱۵ هەزار قران مووچەی بۆ ئەڵلاهیارخان تەرخان داوە و لە پاش کۆچی دوایی پاوشای ناوبراویش، دیسان بە هۆی داخوازی ئەڵلاهیارخان کە لەم سەردەمەدا نیشتەجێ مەشهەد بووە، جارێکی دیکە فەرامەرزخان لە ئەمیر حەبیبەڵلا خانی کوڕی عەبدوڕڕەحمان‌خان کە تازە گەیشتووە بە پاشایەتی داوا دەکات کە مووچە تەرخان دراو دیسان بدات بە ئەڵلاهیارخان کە تەنانەت لە پاشان منداڵەکانی ئەڵلاهیارخان ئەم مووچەیان وەردەگرت.

پایەبەرز و دلێری هاوڕێی فەرامەرزخانی سەرپەل لە کاتی چەکداری لە جندرمەخانە [؟] دارەلحکوومەی هەرات بێتە بیر.

نامەی ڕێکەوتی ۲۳ی ڕەجەبولموڕەجەبی هێنراوی ئێوەم بە دەست گەیشت و خوێندمەوە، نووسیوتانە، لەو کاتەی کە بەڕێز پاوشای گەورە و پایەبەرز لە کاتی هەلاتن لە ڕێگای سیستانەوە لە مەشهەددا نیشتەجێ بوونە و لەوێیەوە چوونە بۆ تاران و تەشریفیان بردووە بۆ دەرەگەز و لەوێدا نیشتەجێ بوون‌و لەو کاتەدا حاکمی دەرەگەز ئەڵلاهیارخانی بە ناوبانگ لە خەڵکی قووچان بووە، ناوبراو هەرچەند نەناسراو بوو بە ماوەی یەک مانگ میوانداری کردووە و پێداویستییەکانی خەڵکی هاوڕێی بەڕێزی دابین کردووە، جگە لەویش بە پاوشای پلەبەرز پێشنیاری ڕۆیشتن بۆ ئەرەگەنجی داوە، بەڕێز ئەڵلاهیارخانی، کۆچەرییە تورکەمەنەکان هەزار ئەسپ و وشتریان پێ بوو و کۆچیان دەکرد، ڕایانی‌وەستاندووە و دەستووری داوە هەتا کاتێ میوانی من نەگا بە ئەرەگەنج کۆچەری ئێوە ناتوانێ کۆچ بکات و لە دەرەگەز بچێتە دەر. هەروەها نزیک بە هەزار سواری تورکەمان پاوشای بەڕێز و هاوڕێیانی هەلاتووی دیکەیان هەتا ئەرەگەنج هاوڕێیی کرد و پاوشای پایەبەرز بە تورکەمانەکانی وتووە کە ئیستا دەتوانن ڕاگەڕێنەوە. لەوێیەوە کە پاوشای پایەبەرز دەرۆیشتن بۆ بوخارا و لە سەمەرقەندا نیشتەجێ بوون. لە ئاکامدا کاتێ کە فەرمانبەر (فەرامەرز خانی سەرپەل) ئەو کاتە بوومە دەسەلاتداری هەرات و ڕۆیشتمە خزمەتیان، ڕاڤەی خزمەتکاری ئەڵلاهیارخانم بۆ پاوشای خوالێخۆشبوو گێڕاوە و داوام لێیان کرد کە

دەستوور بدەن کە بۆ گیان‌فیدا ئەڵلاهیارخان مەبلەغی یازدە یان بیست هەزار قەران یان هەر چەندێ کە خۆیان پێیان خۆشە تەرخان بکەن. گیان فیدا نووسیم کە پازدە هەزار قەران کە بریتە لە: حەوت و نیـو هـەزار ڕووپیـەی کـابولی تـەرخان بکرێـت. دەستووریان‌دا کە من هەموو ساڵێ ئەم مەبلەغە لە نووسـینگە وەرگـرم و بنێـرم بـۆ ئەڵلاهیارخان لە مەشهەد، بە جۆرێک کە کەسێک ئاگادار نەبێت. ئەگـەر پاشمـاوەی دیکەی کەل و پەلەکەیم کۆ کردەوە، بیرەم بە دوو کەس کە ئاگایـان لـە بـارودۆخی نەبێت. ناوبراویش مۆری خۆی لا ببات. هەروەها ناوبراو ئێستا کە لـە کـۆچی دوایـی پاوشای گەورەوە بە دەسەڵات گەیشتنی ئێـوە ئاگـادار بوونـە نامەیـەکیان بـە هـۆی سەرخۆشی و داوای بەردەوام بوونی یارمەتی خۆیان بـۆ ئێـوەی پایەبـەرز نووسـیوە و سپاسنامەیەکیـشیان بـۆ گیـان فیـدا بـە هـۆی گەیانـدنی ئـەم نامەیـە نووسـیوە. فەرمانبـەریش ئـەو سپاسـنامەیەم لـە ژێـری نامـەی نـاردراو بـۆ ئێـوەم نووسـیوە و ناردوومەتە پێشگاتان. لە خودام داوایە کە وەڵامی ئەرێنی بە ئـەم نامەیـە بدەنـەوە و منیش ئەم مەبلەغە بۆ ئەڵلاهیارخان بنێرم.

ئەمیر حەبیبەڵلا خان پاوشای ئەفغانستانیش لە پەراوێزی نامەی فەرامـەرزخانی سەرپەلی هەراتدا بۆیی نووسیوە. «بـارودۆخی ئامـاژە پێکـراوی ئێـوەم بـە ئاگـاداری گەیـشت. بـۆ ئـەوەی خزمـەتی بـاوکی بـەڕێزی کـردووە و لـە زمـانی موبـارەکی خۆیانیشەوە چەند جار تاریفی ئەڵلاهیار خانم بیستبوو، هـەر بـەو جـۆرە کـە بـاوکی بەڕێزم بڕوای بووە، منیش هەمـە و ئـەو یارمەتییـەی کـە تـا ئێـستا وەریـان‌گرتـووە لەمەوپاشیش بۆیی بنێرن.»

لە دەستووری ئاماژە پێ کراو ڕوونوویس گـیراوە بـۆ ئەڵـلاهیار خـان هێنـدراوە. جۆری نووسینەکەی جوان نیە. مۆری فەرامەرز خان لـە پـشتی ئـەم نووسـراوە بـەم جۆرە دێتە بەر چاو.

مەرەکەبیشی سوور بووە. لە پاش لابـردنی ئەڵـلاهیار خـان لـە دەسـەڵاتداری دەڕەگەز کە بە گومانم دەستی براکەیشی موحەممەدعەلی‌خان لە پـەراوێز کردنیـدا دیـارە، بـە پێـی پێـشنیاری ئێلخانـە کوردەکـانی زەعفـەرانلوو و شـادلۆ یانـێ ئەمیرحوسەین‌خانی شوجاعەدەولە و حەیدەر قولی‌خانی‌سەهامەدەولە، موحەممـەد عەلی خان بە جێگای براکەی گەیشتە دەسەڵاتی دەڕەگـەز. موحەممەدعـەلی‌خـان

که نازناوەکانی میرپەنجە و بیگلەربەگی و مەنسوورەلمولکی بوو و لە ساڵی ١٢٨١ هەتا ساڵی ١٣٢٨ی کۆچی مانگی بە ماوەی ٤٨ ساڵ دەسەڵاتی ئەم ناوچەیە لە خوراسانی بە دەستەو بوو. مەنسوورەلمولک جارێکیش بە دەستی براکەیشی قەرەخان لە دەرەگەز دەرکراوە و قەرەخان خۆی دەسەڵاتی گرتووەتە دەستەوە، بەڵام حوکمی دەسەڵاتداری قەرەخان لە لابەنی حاکمی خوراسانەوە دەرنەبڕاوە، و حوکمی دەسەڵاتداری بە ناوی برای دیکەیانەوە -سەید عەلی خان- دەربڕا.

دەستوورێکە لە لایەنی ناسرەدین شاوە سەبارەت بە زۆر کردنی مووچەی موحەممەدعەلیخانی سەرتیپی دەرەگەزی. بۆ ئەوەی کە بە پێی نووسین لە تێنووسەکەدا مەبلەغی سێسەد تمەن لە پاش تەرخان درانی باو لە دەستوورنامەی خوراساندا بە ناوی موعتەمدوسوڵتان موحەممەد عەلی خانی سەرتیپی دەرەگەزی تەرخان دراوە. دەستووری ئێمەی بەرێز رانەگەیندرا بوو هەتا داوای ڕاگەیاندنی دەستوورتان کرد، لە ڕێکەوتی (ساڵی ماردا) دەستووری خۆمانمان ڕاگەیاند و بۆ خوراسانمان نارد کە مەبلەغی ئاماژە پێکراو هەموو ساڵێک بە ئێوە بدرێت و بڕژرێتە سەری حەسێبی خوراسان. هەروەها دەستوورێکە لە لایەنی ناسرەدین شاوە بۆ موحەممەد عەلی خانی مەنسوورەلمولکی دەرەگەزی بە ڕاڤەی ژێرەوە:

بە ناوی خودای گەورە و خۆشەویست- مۆری ناسرەدین شا ئەوەی کە موحەممەد عەلی خانی [مەنسوورەلمولکی- دیکە] بیگلەربەگی دەسەڵاتداری دەرەگەز داوای کردووە کە مەبلەغی پێنجسەد تمەن بۆ ئەرکی دەسەڵاتداری دەرەگەز کە هەموو ساڵێ دەگەیشتە دەستی لەگەڵ مووچەی دیکەیدا بۆی تەرخان بدرێت. بە هۆی بەڵێنیدان بە داخوازی تکاکار مەبلەغی شەشسەدوپێنج تمەن بە مووچەی زۆرکرا. کە لە پاش لە سەرگەڕانی بارودۆخی باوی دەوڵەتی [داهانی دەوڵەتی و...] کە لە پاشان هەموو ساڵێ وەریبگرێت و خەریکی خزمەتکاری بێت.

نامەیەک لە لایەنی حاکمی خوراسانەو بۆ وەزیر دەربڕاوە پشتی نامەکەش پڕە لە مۆری جۆر بە جۆری خەزنەداری و... دەستوورێکی دیکەیش هەر وەکوو ئەم خەتە و لە ڕێکەوتی ١٣١١ کۆچی مانگیدا لە لایەنی ناسرەدین شاوە بە پێی داخوازی موحەممەدعەلیخانی دەرەگەزی دەربڕاو کە لەو نامەیەدا کوڕەکەی غوڵام حوسەینخان بە پلەی سەرتیپی دەرەگەز هەڵبژێدراوە و پێنج سەدتمەن مووچە

شی بۆ بڕیار کراوە. موزەفەرەدین شای قاجار لەساڵی ١٣١٨ کۆچی مانگیدا کە بە داخوازی موحەممەدعەلیخانی مەنسوورەلمولک کە بۆ کوڕی دیکەی حوشمەتوڵلاخان پلەی سەرتیپی و خەڵات دەربڕاوە، کە پەراوێزی دەستوورەکە وێنەی گوڵە و هەموویشی ڕازاوەیە. ناوەڕۆکی دەستوورەکە ئەمەیە کە بە پێی خزمەتکاری خزمەتکارانی شادۆست، تێکۆشانەکانیان کە گیان فیدایی زۆریان کردووە، دەگەن بە پلەی بەرز و پلە و شانازییەکانیان دەبەینە سەرەو. دەبێت ئێوەیش ئەرک و خزمەتکارییەکانی دەسەڵاتدارانی پێشووی ئەو ناوچەیە لە بەر چاو بگرن و وەکوو ئاغەکانی خوالێخۆشبوو سلێمانخان و بیگلەرخان و ئەڵڵاهیارخان کە لە دەسەڵاتدارانی پێشووی دەرەگەز بوون و هەروەها کە دیارە لەبواری خزمەتکاری بە دەوڵەت زۆر تێکۆشەر بوون، ئێستاش هەر وەکوو جاران پاراستنی سنوورەکانی ئەو ناوچەیە بۆ ئەم دەوڵەتەیش زۆر گرینگە، لە کۆتاییشدا ئێستا کە ئێوە - موحەممەد عەلی خانی مەنسوورەلمولکی میر پەنجە- دەسەڵاتداری هەنووکەی دەرەگەز کە تازە گەیشتوونەتە دەسەڵات، دەبێ لە پاراستنی هێمنایەتی ئەو ناوچەیە و سنوورەکانیدا زۆر تێبکۆشن و لە کارزانی خۆتان بە چاکی کەڵک وەرگرن. کوڕەکەیشتان حوشمەتوڵلاخانی سەرتیپ لە بۆ خزمەتکاری ئامادەیە، ئەبێتە دەسەڵاتداری دەرەگەز و هیواداریین کە ببێتە هۆی خزمەتکاری و گیان فیدایی. هەروەها کە نیشانەی کارایی و کارزانیی لێیدا دیاردە. لەمەو پاش بە یەکێک لە نەوکەرەکانی خۆمانی دەزانین و بە پێشکەش کردنی سەرداریێکی کەشمیری شانازی دەکەین. کە بە شانازییەوە بیخاتە سەری شانی خۆی و لە پاشان لە بواری ئەنجامدانی ئەرکی دیوانی و حکوومەتی و پاراستنی سنوورەکاندا سەرکەوتوو بێت. ئەوەیش ڕادەگەیندرێ کە هەمووی خزمەتکارانی پارێزگای ئێوە لە دەستەی نەوکەرانی خۆمان دەزانین.

لە پەراوێزی ڕاستەوە نووسراوە (بە پێی دەستووری موبارەکە). لە پاش پەراوێز کردنی قەرەخان براکەی سەید عەلی خان کە پیاوێکی نووسەر و زانا و ڕووناکبیر بوو و هۆنراوی چاکیشی دەهۆنی. وتوویانە کە مامۆستای مەلەکولشوعەرای بەهاریش بووە. ئەم هۆنراوەی سەید عەلی خان زۆر بە ناوبانگە.

سەید عەلی خان لە دووری بیسەرانی خۆی کە زۆریان هۆنراودۆست و

زانادۆست بوون و نیشتەجێی مەشهەدیش بوونە، ئاڵۆز بووە. بە گومانم ئەم مەبەستە
لە گەڕانەوەی لە دەرەگەز بۆ مەشهەد هۆکارێکی زۆر گرینگ بووە. سەید عەلی
خان بە وەرگرتنی ئیزن لە دەسەلاتداری خوراسان، دەسەلاتداری دەرەگەزی با
مەسعوود خانی کوڕیدا و خۆی گەڕاوە بۆ مەشهەد. دەسەلاتداری سەیدعەلیخان ل
پاش دامەزراندنی مەشرووتە لە ئێراندا بووە. بە سەرکارهاتنی جەجووخانی
زەعفەرانلوو لە دەرەگەزدا و پشتیوانی کردنی خەڵکی دەرەگەز لە جەجووخان
یەکێک لەو هۆکارانە بوو کە سەید عەلی خانی خستە ئەو بیرە کە بێ ئەوەی لە
هەمبەری لایەنگری لە مەشرووتە هەستاون و جەجووخانیان بە ڕێبەری خۆیان
هەڵبژاردووە. بەڵام فەرمانبەرەکانی ڕووس و موحەممەدعەلیشا دەکۆشن کە دیسان
مەسعوودخان بگەینن بە دەسەلاتداری دەرەگەز. ڕاڤەی شەڕەکانی نێوانی مەسعوو
خان و جەجووخان لە ڕاڤەی باردۆخی جەجووخاندا دەخوێننەوە.

### **باردۆخی دەرەگەز لە سەردەمی مەشرووتەدا:**

«نووسراوی یەکێک لە چالاکەکان- بۆ خزمەتی جەنابی بەڕێوەبەری (ڕۆژنامەی
هەتاو)» ڕادەگەیندرێ. ئێستا کە حکوومەتی مەشرووتە هاتووەتە سەری کار و ئیزنی
وتنی بە ئێمە داوە، لە سالانی ڕابردووە هەر چیم لە دڵدایە جارێکی دیکە
دەیڵێمەوە و من کەسێکی بوێژ و دۆعاویژی دەوڵەت و گەلم و گەشتیارم و بە
ماوەی بیست ساڵێکە کە هەر ساڵێ دووجار لە ڕێگای دەرەگەز و قووچانەوە دەڕۆ
بۆ ڕووسیا و هەموو ساڵێک ماوەی یەک مانگ یان کەمتر یان زۆرتر لە
موحەممەدئاوا و لوتفاوای دەرەگەزدا ڕادەوەستم، و بە چاکی لە باردۆخی ئەوێ
ئاگادارم. لە سەردەمی دەسەلاتداری شازادە ڕۆکنودەولە کە لە ڕێگای بجنوورد
قووچانەو ڕۆیشتم بۆ ڕووسیە. دەسەلاتدارێتی دەرەگەز لە ئەستۆی
(مەنسوورەلمولک) بوو. تاقمێک لە ژێر دەستەکان کە لە زوڵم و زۆر وێژییەکانیە
بە تەنگ هاتوون. هاتوون بۆ قووچان و لە کنی شازادەی خوالیخۆشبوو سکالایا
کرد و خوازیاری لابردنی بوون، شازادەیش لە دەسەلاتداری دەرەگەز دووری گرت
برا بووچکەکەی بە ناوی قەرەخانی گەیاندە دەسەلاتداری دەرەگەز. لە ماوەی چە

مانگدا کە قەرەخان دەسەڵاتداری دەرەگەز بوو ژێردەستەکان لە هەر بوارێکەوە ڕزگار بوون. باش دەسەڵاتداری دەکرد و ئەو کاتە خەڵکی دەرەگەز بەم جۆرە تووشیاری تریاک نەهاتبوون و هەندێ کەسی بەتوانا لە نێوانیاندا پەیدا دەبوو. بەڵام دەسەڵاتداری دەرەگەزیان دا بە براێکی دیکەی مەنسوورەلمولک. ناوبراویش شێوەی براگەورەکەیی درێژەدا، هەتا توانی لە زوڵم و زۆروێژی بە ژێر دەست کۆتایی نەکرد. لە دوو ساڵدا ژێردەستی هەژار تووشیاری دەسەڵاتداری دوو دەسەڵاتداری زاڵم بوون. یەکێ تریاکی ویەکێ پیر. هەر دوو دەسەڵاتدارە زاڵمەکە لەم ساڵەدا ڕۆژگاری ژێردەستەکانیان ڕەش کرد. نزیک بە چل و سێ هەزار تمەن لە خەڵکی دەرەگەز کە هەر ساڵێ داهاتی لە نۆ هەزار تمەن زۆرتر نەبوو داهاتیان وەرگرت. ژێر دەستی هەژار دیسان هاتنە داخوازی. تاقمێ نزیک بە هەزار کەس هاتن بۆ مەشهەد و پەنایان هێنا بە بارگای حەزرەتی ڕەزا و بە نامە و بە تەلەفوون، بارودۆخی هەژاری خۆیانیان ڕاگەیاندە تاران. لە ئاکامدا بە تێکۆشانی ئاغەی حاجی میرزا حەبیبەڵلای موجتەهید -خودا تەمەنی درێژ بکات- دەسەڵاتداری دەرەگەزیان لابرد، دیسان مێشی بێ خاوەنیان بە دەستی گورگە هەوەڵییەکەوەدا. مەنسوورەلمولک دیسان بوو بە دەسەڵاتدار. لە ئەم دوو ساڵە خەڵکی ئەو گەرەکەی کە لەم دوو ساڵەدا سەدوشەست وچوار کچ و ژنیان فرۆشتووە بە تورکەمەنەکان. ئەم ئسانەم ئەبیست بەڵام باوڕم نەدەکرد. تاکوو ڕۆژی دوازدەهەمی موحەڕەمی ئەمساڵ ڕۆیشتم بۆ ئیدارەی گومرک کە یەکێک لە کوڕەکانی خانی دەسەڵاتداریش لەوێدا وو. سەرۆکی تەلەفوونخانە و تاقمێک لە ڕیش سپیان لە کنی میرزا ئیبراییم خانی سەرۆک گومرکدا بووین، من بە ناوبراوم وت ئاخر ئێوە نوێنەری دەوڵەتن و غیرەتی اموسیتان هەیە، بۆچی بەرگری لەم کارانەوە ناکەن و دەوڵەت ئاگادار ناکەن؟ لە ەڵامدا وتی: ژێردەستی هەژار چی بکا لە هەمووی وڵاتاندا داهات دان حەسێبیکی ەیە. مەگەر لێرەدا داهات شەش هەزار تمەن نیە. بەڵام لە دوو ساڵی پێشەوە حاکمی خوراسان ئەوەندەی سەخت دەگرێت. دوازدە هەزار تمەنی جیاواز و دوو ەزار تمەنی پێشکەشی والی و هەزار تمەنیش پێشکەشی وەزارەت. کە بە گومانم ەم حکوومەتە خۆی و دانیشتووەکانیشی ئەوەندە خەرجیان هەیە و داهاتیان دەوێ. ێردەستی هەژاریش هێزی داوژاری ئەم داهاتەیان نیە و بە زۆری چێو وەری‌دەگرن،

ئەو کاتە ژێردەستی هەژاریش دەبێ کچەکانیان بفرۆشن و گیرفانی زاڵمە زۆر ویژەکان پڕ بکەن. ڕیش سپیەکانیش سوێندیان خوارد کە هەموو ساڵێک لە ئێمە بە بیست و دوو ناو پارە وەردەگرن کە هیچ کامیشی پێوەندی لەگەڵ داهاتدا نیە. پارەی حاکم، پارەی بەگ، پارەی هەورێشم، پارەی بێگاری، پارەی سوار، پارەی مریشک (مریشکانە)، پارەی یەساوڵ، پارەی میرزا، پارەی پارێزەری ژێردەستەکان، پارەی نوێنەری مەشهەد و پارەی مزگێنی و... .دەبێ ئەم پارانە بدەین یان لە ژێری چێوی یەساوڵدا گیان بدەین. سەرۆکی گومرک تێنووسێکی پیشان‌دا کە ناوی هەمووی ئەو کچانە و باوکانیان و ناوی قەڵاکانیان و ناوی ئەو قەڵاگەلە کە بۆ ئەوێ براون، نووسراوە. لەم کاتەدا پیاوەکانی گومرک پیرەمێردێک لەگەڵ کچێکی عازەو کە لیباسی تازەی لە بەر بوو سواری ئەسپ بوون هێنایان. پرسیاریان لێی کرد، ئەم کچە دەبەیت بۆ کوێ؟ وتی دەیبەم بۆ میوانی لە فلان قەلا لە دەرەوەیە [ڕووسیا]. ئەو پیرەمێردە خۆی خەڵکی قەلامیر بوو. سەرۆکی گومرک پێی وت کە ڕاست بڵێ کە بۆ کوێیت دەبرد؟ بەلام نەیوت. بە چێو چەند چێویان لێی‌دا، وتی ئەمە کچی منە کە فرۆشتوومە بە سەدوپەنجا تمەن. قەرزداری خانم. لە بەرەتی جەریمەو داهات و ئیستەرەم داوای دەکات. کە ئێستا کچەکەم فرۆشتووە کە پارەکەی بدەم بە خان. لە پاشان بەڵگەی لێ‌وەرگیرا کە کچەکەی نەفرۆشێت. لە پاش بارودۆخی بە شێوەی دەرەگەز بە تایبەت سەبارەت بە کچ فرۆشی لەو ناوچەیەدا کە دەنگی گەیشتە ڕۆژنامەکانی وڵات. والی خوراسان مەجبوور بوو کە دەسەڵاتی ئەوێ لە بنەماڵەکانی پێشوو کە لە تورکە قارشییە قۆزییەکان بوون وەرگرێتەوە و بیدات بە یەکێک لە شازادەکانی قاجار بە ناوی جەلالوسولتان. ناوبراو لە ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی دووهەمی جەمادیولئەوەڵی ساڵی ١٣٢٥دا گەیشتە شاری دەرەگەز و لە مەکۆی گەورەکانی شار و خێڵەکان و هۆزەکاندا ڕایگەیاند، کە لەمەو پاش کچ فرۆشی تاوانە. ئێستا ئەم دەستوورانە بەڕێوەچوون یان نەخودا خۆی چاک دەزانێت. دەبێت ببینین کە جەجووخان لە ڕاپەڕینی خۆی لەگەڵ ئەم چارەڕەشییانەدا چی دەکات.

## تاڵان کرانی کۆچەرییەکان و گوندییەکانی خوراسان لە لایەنی حاکم و پیاوانی دەوڵەتەوە

هەمووی گوندییەکانی ئێران بە تایبەت کۆچەرییەکان هەموو کاتێ تووشیاری تالان بوون. ئەم تالانچییانە خۆیشیان بە هۆی زوڵم و زۆری حاکمەکان و پیاوەکانی دەوڵەتەوە یاخی بوونە و ئیشیان بووەتە تالان کردن، یان ڕاستەوخۆ لە لایەنی هەندێک لە حاکمانی ناوچەکانەوە بۆ تالان کردن دائەسپێردران و بیانوویان ئەدا بە دەستی پیاوانی دەوڵەتەوە کە هۆزەکان و خێڵەکان و گوندەکان تالانێ کەن. لە پاش کۆچی دوایی ناسرەدین شا. بە تایبەت لە سەردەمی مەشرووتەدا، پێکهێنانی دەستەی دزی چەکدار لە لایەنی حاکمان و پیاوانی دەوڵەتییەوە باشترین ژێدەری داهات بوو. پارێزگارەکان و فەرماندارەکان و پیاوانی دەوڵەتی و خانەکان هەر کامیان چەند دەستەی دزیان بوو کە خەڵکیان تالان دەکرد کە تا پێش لە سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامیش باو بوو.

مەجدولئیسلام لە سەفەرنامەی کەلان لە ساڵی ١٣٢٣ی کۆچی مانگیدا کە یەک ساڵ پێش لە مەشرووتەیە، سەبارەت بە مەبەستی ئەو دزانەی کە وا مەنسوورەلمولک حاکمی خوراسان بۆ تالان کردن ڕازاندوویانیەوە و بە دەستی حەسەنخان یەکێک لە پۆلیسەکانی ئاسەفودەوڵە حاکمی خوراسنە و کەلەپچە دەکرێن و بیانووی باشێک ئەدەنە دەستیەوە تاکوو کۆچەرییەکان تالان بکات، بەم جۆرە دەگێڕێتەوە: چەند ڕۆژ لەمەو پێش لە گەڕەکی خێرانلۆدا چەند کەس دز کە ئەم گەڕەکەیان تووشی ترس و تالان کردووە، بە تایبەت ڕێگای قووچان و دەرەگەز و خاکستەر کە لە بەر دزی و ئاشۆی ئەم دزانە هێمنایەتی نەماوە. حەسەن خان سەرۆکی پارێزەرانی ئاسەفودەوڵە کەلەپچەیانی کردووە، بەم جۆرە دەیانناسێنێ.

«شاهرەزا» برای میراخوڕی مەنسوورلمولک دەسەلاتداری دەرەگەز. «ئیمان قولی» کە لە نەوکەرانی مەنسوورەلمولک بووە... مەجدەلئیسلام دەڵێت: کە حەسەنخان خۆی کە لە لایەنی ئاسفودەوڵە سەرۆکی دزەکانی دەوڵەت بوو. دائەسپێردرێ کە لە حاکمی کەلاتیش یارمەتی وەرگرێت و بچێت بۆ شەڕ لەگەڵ

پاشماوەی دزەکان. پێش ڕێکەوتن من بە جۆرێک کە کەس ئاگادار نەبێت لەگەڵ حەسەنخاندا کە لە پێشەو ئاشنایەتیم بوو قسەم کرد و پرسیارم لێی کرد، خەیاڵی ڕاستەقینەت چییە؟ شەڕ دەکەیت و دزەکان کەلەپچە دەکەیت یان کات لە سەر دەگەڕێنیت؟

وەڵامی داوە: مەگەر ئێوە تا ئێستا لە نێوانی گەورەکاندا نەبوون و یاسا نازانیکە ئاوەها لە من پرسیار دەکەیت؟

وتم شایەت هەزار مەبەستت هەبێت کە من نەزانم، دەبێ بپرسم هەتا بزانم.

وتی: من یەک حوکمی مەحرەمانەیشم هەیە، و زوو حوکمێکی نیو لاپەڕەیی و مۆرکراو بە مۆری حاکمی[ئاسەفەدەولە دەسەلاتداری خوراسان] لە بەخەڵ دەرهێنا و پیشانیدا، مەبەستی ناوەڕۆکی حوکمی موبارەکی نیولاپەڕەی بێئەوە بوو کە حەسەنخان دەتوانێ لە نێوانی ناوچەی هەمووی هۆزەکان و گەڕەکەکاندا بگەڕێت، هەر هۆزێ یان دانیشتووەکانی هەرگەڕەکێک کە لەگەڵ دزەکاندا هاریکاری و هاوڕێی بکات، یان هەندێ لەو ماڵە دزراوانە لە کنیدا پەیدا بێت، ئەشکەنجە و تاوانیار بکات و ئەو ماڵە دزراوەیان لێ وەربگرێتەوە. وتم: من لە ناوەڕۆکی ئەم حوکمە تێنەگەیشتم، تۆ کە خۆت بەرپرسی ئەم حوکمەیت، مەبەستەکابی بۆم بگێڕەوە. لەوەڵامدا کەنینێکی زۆری کرد و وتی، مەبەستی ئەم حوکمە ئەوەیە کە من هەرچێ لە هەر کەسێک کە بمبوێت وەرگرم.

وتم: چ مەبەستێکی قۆڕ.! تۆ بەرپرسی کە دز کەلەپچە بکەیت یان هەر کەسێ کە ماڵی دزیی لە کندایە تاوانبار بکەیت؟ چ پێوەندییەکی لەگەڵ ماڵی هەرکەسدا هەیە؟ دیسان کەنینێکی زۆر درێژتر لە جاری یەکەمی کرد و وتی: بە ڕاستی لە کەلاتدا هەوەست نەماوە یان گاڵتەم پێدەکەی؟ من بە هۆی ئەو حوکمە دەتوانم هەمووی گەڕەکەکان و هۆزەکانی کەلات و تەنانەت قووچانیش تاڵان کەم. دیسان خوازیاری ڕاڤەی زۆرتر بووم، بەم جۆرە وڵامی داوە کە: من ئێستا چووم بۆ کێوی هەزارمزگەوت کە جێگای ڕاوەستانی دزەکانە، ئەگەر دەستم پێیان گەیشت و بە ئاسایەتی توانیم کەلەپچەیان بکەم، ماڵی دزراوی زۆرێک کە لە ساڵانی پێشەوە لە خەڵکیان دزیوە ئەکەوێتە دەستم، ئەگەریش دەستم پێیان نەگەیشت، لەو ناوچەیە دا یانێ داوێنی کێوی هەزارمزگەوت کە بە هۆی دەرەتانی بوون، بە گومانم کە

دووسەد تیرە لە هۆزی جەلایر و هەزار بنەماڵەی شێخوانلۆیشی لێیدا نیشتەجێیە و دەبێ کەمێک لەو ماڵە دزراوانەی لێدا پەیدابێت، بۆ ئەوەی کە دزەکان ماڵی پارچە فرۆشی و خرۆپڕ بەخێو ناکەن و لە پاش دزین زوو ڕوانەی نێوانی ئەو هۆزانەی دەکەن و بە ئەوانی دەفرۆشن، ئەوانیش یان لە بەر ترس یان لە خۆڕایی دەیکڕن، بەم جۆرە چ یەک دانە دەسماڵیان چ یەک دانە ئاونەوات بێت، من هەمووی داهاتیان لێ وەردەگرم. دەیانتوانی کە ماڵی دزراویی نەکڕن، بیانوویەکی دیکەمیش هەیە. ئەو بیانوویە ئەوەیە کە ئێوە ئەو ڕۆژە لەگەڵ دزەکاندا هاریکاریتان بووە و نان و قەن و چایی و کاوڕتان بۆیان بردووە.

ئێستا بە هۆی ئەم تاوان و گوناحە ئەوەندە بدەن. وتم. خودای گەورە، مەگەر ئەم هەژارانە بە خۆڕایی لەگەڵ ئەم دزانە هاریکارییان کردووە یان کەلوپەلیان پێیان داوە؟ لە بەر ترسی گیانیان داویانە، ئیستا بە جێگای ئەوە کە دەسەلاتی ناوچە خەساریان پاسا بکاتەوە، دەبێ دووجار تاوان بدەن؟ وەلامی داوە. خودا لە بابت خۆش بێت، ئامانج بیانوویە، هەرچێک کە ئەبێت ببێت. بەڵێ، حەسەن خان لەگەڵ دە سواری کەلاتی وسێ سواری شاهسەوەن کە لەگەڵی خۆیدا لە مەشەدەوە هێنای و لەگەڵ دووکەسی دزدا کە لە سەری یەک نەبوون بە شازدە کەسێکە وە، ڕۆشتن بەرەو کێوی هەزارمزگەوت، چوار شەو و ڕۆژمان بە تەمای گەڕانەوەی حەسەنخان یان گەیشتنی هەواڵێکیان لە گۆڕەپانی شەڕدا لە سەر گەڕا. میرزا ناوێک کە برای قازی و لە دەستە سوارە کەلاتیەکان و پێشکاری تایبەتی دەسەلات بوو ڕاگەڕاوە و ڕاڤەی سەفەری چوار ڕۆژی خۆی و هاوڕێیەکانی بەم جۆرە گێڕاوە: دزەکان کە لە هاتنی ئێمە ئاگادار بوون، هەلاتوون، حەسەن خانیش بە پاش ڕۆیشتنیان بە بەرژەوەندیمان نەزانی، بۆ ئەوەی کە خۆی ئاگاداریانی کردووە کە هەڵێن. حەسەنخان وتی. دەبێ ئەو ماڵە دزراوانەیان بردبێتە نێوانی ئەو هۆزانە و گەڕەکەکانی دەوروپشت، هێرشمان برد بۆ سەری ئەو شوێنانە و چەند کەس لەڕیش سپییەکانیانمان کەلەپچە و ئەشکەنجە کرد و چەند کەسیشیترلێیان پرسرا، ئێوە بۆچی لەگەڵ دەزکاندا هاریکاریتان کردووە و نان و ئاوتان پێیان داوە؟ ئەوهەژارانە هەرچێ هاوارو دادیان کرد کە ئێمە لەکەلوپەل دان بە دزەکان خۆ ڕازی نەبووین، هەڕەشەی کوشتنیان لێمان دەکرد، حەسەن ئەشکەنجەیانی کرد هەتا

ژنەکان کۆ بوونەوە و دەستیان کرد بە گریان و شیوەن و نزیک بوو کە ببێتە تێ‌گیران. حەسەنخان تۆزێ ئەهوەنەوە بوو و ئیزنی‌دا کە ئەو پیاوانەیان کە لە ترسی حەسەن‌خان و هێزی دەوڵەتی پەنایان بردووە بە کوێستانەکان وەگەڕێنەوە و بەڵێنی کۆتایی دان بەم کارەساتە بدەن. ژنەکان بە دڵنیایی ڕۆیشتن و پیاوانی خۆیانیان ئاگادار کرد کە ڕاگەڕێنەوە، ئەوانیش ڕاگەڕانەوە و لەگەڵ حەسەن‌خاندا خەریکی وتوویژ بوون و وتیان و بیستیان هەتا لە ئاکامدا بڕیار درا لە سەری تاوان دان و لە هەر گەڕەکێک کە لەو ناوچەیەدا بوو پارەیەک بە ناوی «وڵاتی گەورە» و پارەیەکیش بۆ «دەسەڵاتداری گەورە» و پارەیەکیش بۆ «ئۆردۆی کەیوان شکۆ وەرگرا »و سێسەدتمەن بۆ پێشکەشی دەسەڵاتداری بەڕێز [ئاسەفودەولە] وەرگیرا و سەد تمەنیش بۆ حەسەن‌خان سەرپەلی بەرکەوتوو، بۆ هەر سوارێکیش پێنج تمەن وەرگیرا و ئامادە بووین و ڕۆیشتین، بەندییەکانمان ئازاد کرد، حەسەن‌خانیش لەگەڵ سوارەکاندا لەوێیەوە ڕۆیشتین بۆ «ینگ قەڵا» لە نێوان ڕێگادا بڕکەیەک وشتر لە وشتر لەوان [؟] [یەک وشەا نەخوێندرایەوە] کە یەکێک لە گوندەکانی ناوچەی جۆڵاییە لەوێدا دەلەوەڕان، لە نێوانیاندا دوو سێ جووت وشتری خۆش ئەندام بوون، حەسەن‌خان لە پاش ئەوەی کە پێیاندا دەیڕوانی بە ئێمەی وت: ئەم وشترانە زۆر بە کەڵکی دەسەڵاتداری گەورە [ئاسەفەدەولە] دێن. ئەگەر لە نێوانی بڕکەی وشترەکانی حاکمدا دەیان‌بیست وشتری چاکی ئاوەها پەیدا بێت. ئەگەر ئێمەیش ئەم وشترانە بۆ پێشکەشی ببەین، ئەکەوینە بەر چاوی تایبەتی دەسەڵاتداری گەورە. منیش لە وڵامیدا وتم: بۆچی ئێمە ئەم وشترانە کە نازانین خاوەنیان کێیە ڕاگەڕێنینەوە و بیانبەینەوە بۆ شار؟ حەسەن‌خانیش وتی: چی باشترە لەوەیە کە وشترەکانی چاکن و خودایش هەرشتێکی چاکیشی بۆ دەسەڵاتداری گەورە خولقاندووە. هێشتا کۆتایی بە قسەکانی نەهاتبوو کە ڕۆیشت بۆ لای وشترەکان و سوارەکانیش لە پاشی ڕۆیشتن و چوار تەنیشتی وشترەکانمان گەمارۆ کرد و بردیانمان بۆ «نیک قەڵا» نزیک بە هەزار هەنگاو کە ڕۆیشتین دەنگی گریانی ژنێک بیسرا، کە بە پێی پەتی هەڵدەهات و ئەگریا. حەسەن خان بەو خیاڵەوە کەشایەت ئەم ئافرەتە لە دەستی کەسێک سکاڵای هەبێت و مەبەستێکی ببێت کە بە کەڵک بێت. هەوساری ئەسپەکەی کێشا، هەتا ئەو ئافرەتە بگاتە پێشەوە، بەڵام ئەو ئافرەتە

هەژارە نەیدەتوانی هیچ شتێک بڵێ، ئەسرینی دەباراند و حەسەن‌خانیش بە ئەهوەنی لە گەڵیدا قسەی دەکرد و دڵخۆشی دەکرد و ئەیوت: «خۆشکە نەگری. هەر ئیشێکت کە ببێت من ئەنجامی ئەدەم. بە سەری دەسەلاتداری گەورە سوێند هەتا ئیشی تۆ ڕێک نەخەم، لێرە ناڕۆم. خودای گەورە ئاوەها دەسەلاتدارێکی گەورەی بۆ ستاندنەوەی مافی مافخۆراون ناردووە، دەسەلاتدارێکی عادڵی وەکوو ئەوی بۆ ئێوە خەڵکی خوراسان ناردووە، چۆن ئێوە لە پەنای بارگای موبارەکی ئیمامی خوالێخۆشبوو دان و لە هەمووی شیعەکان سەر ترن. خودای گەورە بە بارگای ئیمامی هەشتەم لوتفی کردووە و ئاوەها دەسەلاتدارێکی عادڵ و مێهرەبان و مرۆڤ دۆستی بۆ ئێوە ناردووە کە لە هەمووی کاتی ژیانیدا تەنانەت تکێک شەرابی نەخواردووە، لە هەر حەوتەیەکدا دووجار دەڕوات بۆ بارگای موبارەکی ئیمام. جگە لە نەوکەری من لە هۆزی شاهسەوەن و پێشکاری دەسەلاتداری بەڕێزم. خواپەرستی هۆزی بەڕێزی شاهسەوەن بۆ هیچ کەسێک داپۆشراو نیە، شایەت لە نێوانی هەمووی ئەم هۆزەدا کە لە سەرانسەری خاکی ئێراندا زۆرتر لە یەک کورۆرن، دەکەس زۆرویێژ وزاڵم پەیدا بێت و...، مەبەستەکەت بڵێ. ئەگەر ئەو کەسەی کە لە تۆ زڵمی کردووە، لە ئاسمانی چورەمیشدا بێت لە دەستی منەوە گیان بە دەرنابات. ئافرەتی هەژار کەم کەم بە قسەکانی حەسەن‌خان هیواداربوو و ڕاڤەی مافخوراوی خۆی بەم شێوە گێڕاوە.

وتی: من خەڵکی سیجم، مێردەکەمیش سێ ساڵە مردووە و دوو منداڵی بووچکیشم هەیە. داهاتیشم هەر ئەم چەند و شترەیە، بۆ ئەوەی کە من ناتوانم وشترەوانی تایبەتیم هەبێت. بەم بۆنەوە خۆم لە هاویندا کە کاتی لەوەڕاندنی وشترە، منداڵەکانم ئەسپێرمە خۆشکەکەم و خۆم وشترەکانم دێنم بۆ ئەم بیاوانانە و ئەیانلەوەڕێنم، ئەمساڵیش کوێخای ئێرە زۆر زڵمی لێم کرد و داوای پارەی لێم کرد و منیش شتێکم نەبوو کە پێی بدەم. ئەو خودا نەناسە، وشترێک لە وشترەکانمی بە زۆر وەرگرت، بەڵام دیسان دڵ خۆش بووم کە پاشماوەی وشترانی هەتیوەکانم هیچێکیان نیە، ئیستایش سوارەکانی ئێوە لەسەری نەزانی بردوویانە و من لەم دنیایە جگە لەم وشترانە هیچ شتێکم نیە و دەبێ دوو منداڵی هەتیوم بە داهاتی ئەم وشترانە بە خێوە بکەم. ئەمرۆ ڕۆژێکە و ڕۆژی پەنجاهەزار ساڵیش رۆژێ، لە کنی

دایه گەورەم فاتمەی زارا یەقەت دەگرم کۆم. قسەی ئافرەتەکە لێرەدا کۆتایی هات، حەسەن خان ڕووی کرد لێ و وتی: چ ژنێکی قسە زۆر و نەوس درێژ! دوو سەعات بە هەروا ئێمەی ڕاوەستاند، ڕووی کردە ئافرەتەکە و وتی: من بە حوکمی دەسەڵاتداری گەورە دەسەڵاتم هەیە، کە ئەم وشترانە ببەم و دەیبەم بۆ شاری خوراسان [مەشەد]، تۆیش ئەگەر قسەیەکت هەیە، وەرە و لە شاردا سکاڵا بکە، شایەت دەسەڵاتداری گەورە تەرخەمێکیان بە تۆ کرد، بەڵام چۆن شێعەیت، با کەسێک نەزانێت ئامۆژگاری تۆ دەکەم، کەقەت بە شار نەیت و ناوێکیش لە وشترەکانت مەبە. «وشترت دیوە نەتدیوە» ئەگینا گیانی منداڵەکانت لە مەترسیدایە و دەترسم کە ئەوانیش لە سەری دابنێیت. ئەمەی وت و لە ئەسپەکەیدا و کەوتە ڕێ، ئێمەیش لە پاشی کەوتینەڕێ. ئافرەتەکە هەرچێ هەڵات بە ئێمە نەگەیشت. بەلام هەتا دوو فرسەخی ڕێگا، دەنگی گریانیمان ئەبیست. بەڵی بەم جۆرە گەیشتینە ینگ قەلا، لەوێیشدا حەسەن خان ڕۆیشت بۆکنی کوێخاو هەرچێ کەلوپەلمان پێویست بوو، وەرمان گرت و بەیانی کە لە خەو هەستاین، نان و چاییمان خوارد و هەوساری ئەسپەکانمان گرتە دەستەوە، کە سوار ببین، حەسەن خان بە کوێخای وت: لە مانگی پێشوودا کە ئێمە لەم ڕێگا تاوانبارمان دەبرد بۆ کەلات. تۆ لە کاری میوانداری ئێمە دا زۆر کۆتاییت کرد و ئەمانویست کە ئەشکەنجە و تاوانت لێ وەرگرین، بەلام مەلاکان بۆت پاڕانەوە و بەرگریان کرد. ئیستا بابت دەسووتێنم. زوو تەرکەکەی ڕاکێشاو و لە سەروکەپۆلی کوێخایدا. سوارە شاهسەوەنەکانیش لاساییان کردەوە و کەوتنە گیانی کوێخا. منیش خۆمم کێشا سەری کوێخا و بەرگریم لەم کارە کرد و بە تکا و پاڕانەوەی من ڕازی بوون کە لە ئەشکەنجە کردنی کوێخا چاوپۆشی کەن، بەلام قەت لە ستاندنی تاوان نەگەڕان و لە پاش نیو سەعات پاڕانەوە بڕیارمان کرد:

نەوییەکی تەوزینی و چادر شەوێکی هەورێشمی و یەک تمەنی و چوار جووت گۆرەوێ خمی خوریی وەرگرت و ئەو کاتە لە قەلا ڕۆیشتنە دەرەوە. لێرە دا حەسەن بە ئێمەی وت: ئێوە دەتوانن ڕاگەڕێنەوە بۆ کەلات، بەلام من لەڕێگای میراوا [چناران] دەڕۆمەوە بۆ شار. بە هەر کام لە ئێمە سێ تمەنیدا. لەو پێنج تمەنەی کە لە کوردەکانی شێخوانلۆ و جەلایرگرتبووی دووتمەنی بۆ خۆی هەڵگرت و ئێمەیش

هەرچیٚ چانەمان دا بە کەڵک نەبوو. ئەو ڕۆیشتەوە بۆ شار و ئێمەیش ڕاگەڕاینەوە بـۆ کەلات. هاوڕێیەکان هـەرکامیان ڕۆیـشتنەوە بـۆ ناوچـە و گونـدی خۆیـان. منـیش گەڕامەوە بۆ خزمەتتان کە ڕاڤەی ئەم سەفەرە [کەلەپچە کردنی دزەکان] بگێڕمـەوە. لە بیستنی ئەم هەواڵانە دەسەڵاتدار ئاڵۆز بـوو و وتی بـۆچی ئـەم هـەموو زڵـمە لـە خەڵک کراوە، بەڵام لەڕاستەقینەدا بارودۆخی لەوە ناخۆشی بوو کە بەشی ئەو کە لەم کارەدا جەوری کێشاوە بدات. هێشتا حاکم خەریکی ئاخ وناڵە بوو کە دەنگـی ناڵـە و گریانی دڵتەزێنێک بیسرا، هەموو ڕوومان کرد بۆ ئەو لایەنە و ئافرەتێکمان بـینی کـە بە پێی پیادە و پەتی کە خوێن لە پێی هاتبووە دەر و چێوێکیش بە دەستیەوە بـوو و وەکوو ژنانی منداڵ مردوو دەگریا و هەتا گەیشتە نزیکـی حـاکم بـیٚ هـۆش کەوتـە سەری زەوییەکە. هەوەڵ پێی ماچ کرد. لە پاشان داوێنی گرت و بە جۆرێک دەگریا و شیوەنی دەکرد کە ئێمە و هەموو ئـەو کەسـانەی کـە لەوێـدا بـوون بـۆی بووینـە گریانەوە، بە تایبەت بارودۆخی نووسـەر [مەجدولئیـسلام] زۆر پەرێـشان بـوو و مـن ویستم کە لە بارودۆخی پرسیار بکەم، میرزا وڵامی داوە کە ئەمە هەر ئـەو ئافرەتـەی خاوەن وشترەکانە کە ئەم ڕێگا دوورەی لـە زۆرتـر لـە هەشـت فرسـەخەوە بـە پـیٚ هەڵاتووە هەتا گەیشتووەتە ئێوە. پێویست نیە کە بارودۆخی خۆیمـان ڕاڤـەکەن کـە تووشیاری چ حاڵێک بـووین. هـەر خـاوەن هەسـتێک چـاک دەزانـیٚ کـە لـە ئـاوا بارودۆخێکدا بـەرد ئەبێتـە ئـاو و بەڵـکوو بـەردودڕکیش کـەباب دەبـن. بـە ڕاسـتی مردنمان پیٚ خۆش بوو و ئافرەتەکەمان بەم جۆرە دڵ خۆش کرد، کە ئێمە و جەنابی حاکم نامەیـەک دەنووسـین بـۆ خزمـەتی دەسـەڵاتداری گـەورەی خوراسـان کـە بیٚگومان وشترەکانتان پیٚ ئەدەنەوە. دەرکەوت کـە ئـەم ئافرەتـە جگـە لـە خـەم و پەژارەی وشترەکانی بۆ منداڵە هەتیوەکانی ئەترسیٚ و لـە قـسەکانی حەسـەنخـان کەوتووەتە شکەوە کە نـەکوا بەڕاسـتی ئـەم دوومنداڵـە هـەتیوەی تووشـیاری قـارو دوژمنایەتی دەسەڵاتداری گەورەبن. بەڵیٚ بـە هـەر جۆرێـک کـە بـوو ئـەهوەنیمان کردەوە وخانی دەسەڵاتدار هێنـای بـۆ ئەنـدەروون و وتی نامەیـەک سـەبارەت بـە بارودۆخی ئەم ئافرەتە بنووسن بۆ خزمـەتی جـەنابی جەلیلەلمولـکی بیگلـەر بـەگی خوراسان. ئێمەیش نامەیەکمان بۆ خزمەتی دەسەڵاتداری گەورە نووسی و پاڕاینـەوە کە وشترەکانی ئەم ئافرەتە بدەنەوە.

## جەجوو لە درگەزدا

سراسر اگر تن به کشتن دهیم
از ان به که کشور به دشمن دهیم
چو ایران نباشد تن من مباد
بدین بوم و بر زنده یکتن باد

شانامە بەم شێوە کار دەکاتە سەر جەجوو و ئامادەی دەکات بۆ شۆڕش و
نافەرمانی لەبەرانبەر ناحەقی و قەڵاچۆیەک کە لەلایەن بیانییەکانەوە دەکرێت و بۆ
بەرەنگار بوونەوەیان لاوانی ناوچەکەی بە دەوری خۆیدا کۆ دەکاتەوە. ئەوان بە نێوی
ئێران سوێندیان خوارد یان نە یاران نێو ببەن یان لەم ڕێگەدا شەهید بین تە
دەستتۆردانی بیانی لە دیاری کردنی چارەنووسی ئێران بە چاونەبینن
دەستپێکردنیان بێگانەپەرەست و چەوسێنەرانی گرتەوە، یەکەمین کەس
کەلانتەری لوتفئاباد بوو کە لە مەیدانی شاردا بێحورمەتی بە ژنێک کردبوو
دەستپێکردنی ڕاپەڕین و شۆڕشەکەی جەجوو وەکوو شۆڕشی ئەبوومۆسلێم
خوراسانی و نادرشا وابوو. ئەو لە کەپکانی قارەمانپەروەر کە زێدی نادرشابوو، لە
دایک بوو بوو. سارم دەیگوت، کاتێک جەجوو دەگەڵ سوارەکانی بە نیازی گرتنی
باجگیران لە دەرگەزەوە کەوتنە ڕێ من و چەند لاوێکی هاوتەمەنم چووینە پێشەوە
و جڵەوی ئەسپەکەیم گرت و خوازیاری ئەوە بووین کە چەکمان بداپێ و لەگەڵ
خۆی بمانبات، ئەو لە ئەسپەکەی هاتە خوار و بە نەوازشەوە گوتی کە ئێوە هێشتا کە
منداڵن بەڵام بەڵێنی دا کە لە داهاتوودا بۆ هەر کوێ بڕوات بمانبا بە مەرجێ کە
ئێستا خەریکی ڕاهێنانی چەکداری بین و شارەکە بە چاکی بپارێزین. جەجوو
لایەنگری پێداگری مەشرووتەی ئێران بوو، ڕزگاری دەستکورت چەوساوەکانی لە
جێبەجێ کردنی یاساکانی مەشرووتە دەزانی. بە توندی بەرگری لە بنەماکانی
مەشرووتە و مەشرووتەخوازان دەکرد. ڕۆژە سەرەتاییەکانی گیرسانی بیری
مەشرووتە لە دەرگەز و مەشهەد یارمەتی کومیتەکانی شۆڕشی ئەدا و بەم بۆنەشەوە

هێرشی بردە سەر مەشهەد و شازادە نەیرودەوڵە کە حاکمێکی چەوسێنەر بوو و ئازادیخوازەکانی ئەشکەنجە و ئازار ئەدا دەستبەردار و زیندانی کرد تا ئەوەیکە دەرباری قاجار لە ڕێگەی شوجاعودەوڵەوە موحەممەد ئیبراهیم خان ڕەوشەنی زەعفەرانلووی حاکمی شیروانی ڕەوانەی نەیشابوور کرد و ئەو توانی ڕەزامەندی جەجووخان لەسەر ئازادکردنی شازادەی قاجار بە دەستبێنێ. شەڕی نێوان جەجوو و مەسعوودخان دەرگەزی ژمارەیەکی زۆری کوژراوی لێکەوتەوە، جەجوو کە هەستی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری گەیشتبووە ئەوپەڕی خۆی و بێلیاقەتی و ناتوانی عەبدوڕەزاخانی شوجاعودەوڵەی سەرۆکی عەشیرەتی زەعفەرانلووی بە هۆکاری هەموو نەهامەتییەکانی ناوچەکە دەزانی.

لە کاتی چوونی بۆ شاری قووچان لە سەردەری ماڵی شوجاعودەوڵە وەستا و هاواری هەڵێنا: ئەی خوێڕیلەی شیرەییە دەست لەو قلیانە بەردە و وەرە دەرێ تا بتکەمە نادرێکی دی و بە هەڵچووییەوە ڕووی شوجاعودەوڵە و دەیگوت: تۆ هێزی چەکداری و قودرەتی جەنگی کوردانت لە ناو برد و ئەوانت خارو زەبوون و ناتوان کرد تۆ یەکێتی کوردانت لە نێو برد.

عەبدوڕەزا شوجاعودەوڵە لە جەجوو دەترسا، هەراسی ئەوەی بوو کە گەر بە جۆرێکی شیاو لەگەڵیدا هەڵسووکەوت نەکات و چاوپۆشی لە ناڕەزایی دەربڕینەکانی نەکات ئەگەری ئەوە هەیە عەشیرەتی زەعفەرانلوو لە داری ئەودا ڕاپەڕێنێ.

بەم بۆنەش بوو لە کاتێک جەجوو بەرەو دەرگەز کەوتە ڕێ و لە نزیکی شوورک لە باکووری قووچان لەشکرەکەی بەز کردبوو، شوجاعودەوڵە خۆی چوو بۆ دیتنی. شوجاعودەوڵە لە دڵەوە هاودەنگ بوو دەگەڵ جەجوودا و پشتگری لێدەکرد، بەڵام ئازایەتی و بوێری بەرەنگار بوونەوەی ڕاستەوخۆی لەگەڵ ڕووسەکاندا نەبوو، شایەت بەرژەوەندی خۆی و خەڵکەکەی لەوەدا نەدەبینی. بۆ ئەوەیکە لەو سەردەمەدا ڕێکخراوی هەواڵگری سۆڤییەت ناسراو بە «گ. پ. ئۆ»[٣٢٦] گیپۆ لە باکووری ئێراندا

---

[٣٢٦]- بیرەوەرییەکانی ئاقابکۆف وەرگێڕدراوی ئەبوو تورابی- ل ١١٨ بەو جۆرە کە دەڵێت ئەم ڕێکخراوە دوایی بە نێوی «کا گ بە» نێوی گۆڕا، ئاقابکۆف لەبابەتی چۆنیەتی هەواڵگری ڕووس و ئینگلیز لە قووچان دەڵێت: هەواڵگری ڕووسەکان لە قووچان میشێل گانیف بوو کە بەرپرسی نوێنەرایەتی سەندیکای نەوتی سۆڤییەت بوو و بە ساڵان لەو شارەدا ژیابوو و زانیاریگەلێکی زۆری لە

بەتایبەت لە قووچان زۆر چالاک بوو و گومانی لەسەر هەرکەس بوایە لە نێوی دەبرد یان دووری دەخستەوە بۆ سیبری.

لە ئاکامدا ئەم ڕێکخراوە هەوالگرییە کە ئاگاداری پشتگری شوجاعودەولە لە جەجوو بوو لە کاتی شەودا ڕژانە سەر ماڵی شوجاعودەولە و دەستبەسەریان کرد و دەستبەجێ دووریان خستەوە بۆ تاران.[٣٢٧] ئاغای حاج سلێمان ڕەوشەنی لە زمانی باوکیەوە موحەممەد ئیبراهیم خانی ڕەوشەنی کە ڕاسپاردەی شوجاعودەولە بۆ ئازاد کردنی نەیرودەولە دەستی جەجوو بوو و بۆ ئەم مەبەستە ڕۆیبوو بۆ نەیشابوور، دەیگوت: نەیرۆدەولە والی خوراسان بوو و لە دژبەرانی مەشرووتە و بەم هۆیە پشتگری دەکرد لە موحەممەدعەلی قورووش‌ئابادی.

شازادە نەیرودەولە لە نەیشابوور خاوەنی باخ و ملکێکی فراوان بوو، سەردەمانێک حاکمی ئەوێ بوو، لە بنەمادا نەیشابوور کاپۆی ئەو بوو، لە دوای لابرانی لە ئیالەتی خوراسان لە کاتی چوون بۆ نەیشابوور و سەردانی ملکەکانی لە یەکێک لە جووتیاران توورە بووبوو لە مەیدانی شاردا کێشا بوویە دار و لەتی کردبوو تا ئاوی چاو لە نەیشابووریەکان نەستێنێ. بۆ ئەمەش نەیشابووریەکان داوای کۆمەکیان لە جەجووخان کرد، هەر لەو کاتەی کە نەیرودەولە لە نەیشابوور بوو هەڵیکوتایە سەری و هەر لەو مەیدانەدا بەستی بە دارێکەوە و داری بە دەستی نەیشابووریەکان‌دا تا تۆڵەی خۆیان لێبکەنەوە ئەوانیش ئەوەندە دارکاریان کرد تا لە هۆش خۆی چوو و لە دواییدا خستیە زیندانەوە. نەیشابووریەکان لەم کارە بوێرانەی جەجوو زۆر کەیف خۆش بوون و دروشمی بژی جەجوویان دەوتەوە. هەواڵی دەستگیرکردنی نەیرودەولە لە هەموو شوێنێک گەڕا و چاوی هەموو چەوساوەکان و زوڵم لێکراوان بڕایە جەجوو.

بڵاو بوونەوەی ئەم هەواڵە دەنگدانەوەیەکی خراپی لە تاران‌دا بوو و ئابڕووی بۆ

---

هەرێمەکەی ژێر کۆنترۆڵی دەگەیاندە ئێمە بە تایبەت لەسەر بارودۆخی کوردەکانی قووچان بۆ ئێمە زۆر سەرنج ڕاکێش بوون. گانیف چالاکییەکانی ئەندامێکی نەهێنی بریتانیا بە نێوی ئارامائیس کە کاروباری هەوالگری سنوورەکانی سۆڤییەتی لە قووچانەوە بەڕێوە دەبرد چاودێری دەکرد. بۆ هەرێمی بجنووردیش یەکێک لە پەنابەرانی ڕووس بە نێوی کرۆبلۆفمان ناردبوو...

[٣٢٧]- تەواو بوونی وتەی ڕەحیمیان.

دەزگای سەڵتەنەت نەهێشتبوو، بەم بۆنەوە دەوڵەت ئازادکردنی نەیرودەوڵەی خستە ئەستۆی شوجاعودەوڵە، ئەویش کە دەیزانی تەنیا کەسێک کە جەجوو بە قسەی دەکات باوکم «موحەممەد ئیبراهیم خان» حاکمی ئەو سەردەمەی شیروانە، پەیکێکی نارد بۆ شیروان و ئەوی بانگێشتی قووچان کرد و مەسەلەکەی بۆ باس کرد، باوکم ڕۆیشت بۆ نەیشابوور و خوازیاری ئازادی شازادە بوو کە توانی ئازادی بکات. سەردەمانێک دوای ئەم ڕووداوە جەجوو لە ڕێگای قووچانەوە چوو بۆ دەرگەز، بەڵام چونکە دڵی خۆشێکی لە شوجاعودەوڵە نەبوو نەچووە نێو شار و لە نێوان شورک و زۆر باران لە ڕێگای دەرگەز- قووچان حەسایەوە و شوجاعودەوڵە بە سواری نایتوونەکەی چوو بۆ دیداری، ئەویش بۆ ڕێزگرتن لە شوجاعودەوڵە چووە پێشوازیەوە، بەڵام لەو دیدارەدا بە هۆی ناتەوانی و لاوازی حوکمڕانی لۆمەی لێکرد. چۆن لەو کاتەدا برای جەجووخان لە لایەن ڕووسەکانەوە بەند کرابوو و جەجوو بۆ ڕزگار کردنی ڕێ دەرەگەزی گرتە بەر و بە ئازاد کردنی براکەی ڕاستەوخۆ چووە شەڕی ڕووسەکانەوە.

لەم پێوەندییەدا حاج تاهێر تەمەن ٨٠ ساڵ، لە کوردەکانی بادلانلووی دانیشتوویی ئیدەلی[٣٢٨] لە ساڵی ١٣٦٠ بە نووسەری گوت لە دایکی جەجوو لە کوردەکانی بادلانلووە.

عەبباسقولی بادلانلوو خەڵکی ئیدەلوو کە خزمەتگوزاری جەجوو بە منی گوت کە ڕووسەکان لە دەرگەز مووساخان برای جەجووخانیان دەستگیر کردبوو، شەوێک بانگمی کرد و گوتی ئەمشەو دەبێ مووساخان ئازاد بکەین دوایی بە پێ پلانێک کە داڕشت من چوومە بەر کەلانتەری دەرگەز و لە حاڵێکدا کە خەنجەرێکم کردبووە ژێر پشتوێنەکەم کتوپڕ پاسەوانی بەر کەلانتەریەکەم گرت و گەرویم بە دەستێک گووشی و خەنجەرەکەم نا سەر دڵی و گوتم گەر دەنگت پێوە بێت دڵت دەدڕم،

٣٢٨- «ئیدەلی» یان «ئیدەلوو» لە تایفەی ئەفشارن، هەرچەند لەم گوندە ئەمڕۆژ بە زۆری «کوردەکانی بادلانلوو جێگیرن، بەڵام پێشتر ئەم گوندە جێگای تیرەی ئیدەلی ئەفشار بووە، نووسەری، عالەم ئارای عەبباس لە ساڵی ١٠٣٧ مانگی کە ساڵی مردنی شاعەباسە وێڕای بەیانی سەرگوزەشتەی حاکم و ئەمیرانی وڵات ئەڵێ لەم ساڵە جەمشید سوڵتان گورجی میراویماف ئیدلوو ئەفشار و حاکمی ئەبیوردی خوراسانە.»

بێ‌دەنگ بە. بردمە پشت دیوار و لەوێ ڕام‌گرت، جەجوو ڕۆیشتە نێو کەلانتەری و لە حالێک دا کە باقی سەربازەکان خەوتبوون، قفڵی بەندیخانەکەی شکاند و منیش کە نگابانەکەم چەک کردبوو و دەست و دەمیم بەستبوو، دوای ئازاد کردنی بەندییەکان و دوور بوونەوەیان ئازادیم کرد و خۆم گەیاندە جەجوو.

جەجوو لە کاتی شەواندا هێرشی دەبردە سەر پاسگا و پایگاکانی ڕووس لە هەرێمە سنوورییەکان و ئەفسەر و سەربازی ڕووسی دەکوشت و چەک و تەقەمەنیەکانیانی لە نێو سوارانی خۆی دابەش دەکرد و بە ڕۆژیش لە کێوەکانی دەرگەز سەنگەری دەگرت. ڕووسەکان خوازیاری دەستگیرکردنی جەجوو بوون لە لایەنی دەوڵەتی ئەحمەدشاوە بەڵام دەوڵەت ڕایگەیاندبوو کە توانای ئەو کارەی نیە. دوای ئەم ڕووداوانە ڕووسەکان هەموو هێزی خۆیان دەخستە گەڕ و بە شوێنی جەجوو دەگەڕان حەوت شەو و ڕۆژ لە کێوەکانی هەزار مەسجد و الله اکبر لەگەڵ ڕووسەکان شەڕیان کرد و ژمارەیەکی زۆر سەربازی ڕووس کوژرا. ڕۆژێک ڕایانگەیاند کە لەشکەری ڕووس نزیک بوەتەوە ئەو کات ئێمە لە کێوەکانی زەنگالانلوو جێگیر بووبووین، جەجوو لەشکەری ڕووس کە نزیکەی ٥٠٠ کەس بوون و خەریکی هاتنە پێشەوە بوون بە دووربینی و فەرمانی ئامادەباش‌دا و ئێمە کە ژمارەمان ١٣٠ بوو، بووین بە سێ بەشەوە و دەوری دۆڵەکەمان گرت، دوای کاتژمێرێک ڕووسەکان گەیشتنە دۆڵی زەنگالانلوو و بە فەرمانی جەجوو هەموویان کەوتنە ژێر ڕەگباری ئێمە و ڕێگەی هەڵاتنیان نەبوو و یەک بە یەک دەکوژران. کاتژمێرێک بەر لە ئاوابوونی خۆر شەڕ کۆتایی هات، لە حاڵێکدا کە هەموو ڕووسەکان کوژرا بوون. چەک و تەقەمەنییەکی زۆر لەوانە چەند قەبزە تۆپ و موسەلسەل و ژمارەیەکی زۆر ئەسپ گیرمان کەوت، کە چەند ئەسپێکی بە گوندییەکان داو باقیمان لەگەڵ خۆمان برد، ڕووسەکان دووبارە هێزی نوێیان هێنایە دەرگەز و ناوچەی زەنگلانلوو تا ئێمە لە ناو بەرن شەڕ چل ڕۆژی خایاند کە بووە هۆی کوژرانی هەزاران سەربازی ڕووس و زۆرێک لە هاوڕێیانی ئێمەش کوژران یان بریندار بوون.

نەبوونی دەرمان بۆ چارەسەری برینی بریندارەکان گرفتی هەرە گەورەی ئێمە بوو، ئەمەش بۆ جەجوو زۆر سەخت و ناخۆش بوو کە دەیبینی برینگەلێک کە بە کەمترین دەرمان چارەسەر دەبن بە هۆی نەبوونی دەرمان و کەرەستەی پێویستی

پزشکی، چک دەکەن و بریندارەکان دەمرن. بەم بۆنە جەجوو فەرمانی چوون بۆ قووچانی لە ڕێگەی دەرگەزەوە داو دوای دەمێک مانەوە لە کێوەکانی کەپکان و ڕەشقی ڕووسەکان دووبارە بە دواماندا هاتن و ئێمەش ڕوومان کردە قووچان. لە حاڵێکدا کە قووچان لە دەستی هێزەکانی ڕووسدا بوو، چەند بریندارێکمان بۆ چارەسەری بە شێوەیەکی نهێنی هەناردە نێو شار و بەرەو کێوی شاهینجان ڕۆیشتین. لەم کاتەدا ڕووسەکان فەرمانیان بە سەرۆک عەشیرە و حاکمانی شارەکانی باکووری خوراسان دابوو کە کوژراو یان بریندارەکانی سەر بە هێزی جەجوو بدەنە دەستی ئەوان. خەڵاتێکی گەورەشیان بۆ ئەم مەبەستە دیاری کردبوو (عەبباسقولی دوای کوژرانی جەجوو بە زیندووی مایەوە و ڕووی کردە کەلات نادری و خزمەتی خواڵێخۆشبوو فەتحولمەلێکی کرد) ئاغای مەلا غولامعەلی تەمەن ۸۵ ساڵان خەڵکی ڕۆشقی[۳۲۹] لە بەرواری ۲۲ ڕەشەمەی ٦٥ ئاوەها باسی شەڕی جەجووی کرد:

جەجوو سێ ساڵ پێش قەحتی هات بۆ ڕۆشقی. سەربازانی ڕووس بە مەبەستی گرتنی جەجوو هاتنە ڕۆشقی، لەو کاتەدا جەجوو لە ماڵی کوێخا بوو و دوو نگابانی لە دوڵەکەدا دانابوو، کاتی هاتنی ڕووسەکان نگابانی یەکەم پێیانی نەزانیبوو بەڵام قولوو کورد پاسەوانی دووهەم بە دیتنیان هاواری کرد کە سەرباز ڕووسەکان هاتن. خەڵکی هەموویان بەرەو کێوەکان هەڵاتن.

جەجوو چووە لووتکەی کێوی کەتەزار و ڕووسەکانی گولەباران کرد و شەڕ شەو و ڕۆژێک درێژەی کێشا و شەوی دوایی جەجوو بەرەو بووغمیچ پاشگەز بووەوە، جەجوو خاوەنی دوو برا و ۲۵ خزمەتکاری بوو، دوای پاشەکشی جەجوو ڕووسەکان قەڵاکەیان گرت و ناخۆشێک کە نەیتوانیبوو هەڵبێت و هەروەها ژنێکی پیر بە نێوی نارلییان کوشت، شێتێکی مەدان‌ناو کە پێش ئەم ڕووداوانە دەیگوت سەربازانی ڕووس دێنە ڕۆشقی و کاولی دەکەن و مەدالیش دەمرێت، بە دەستی ڕووسەکان هەر بەو شێوە کە دەیگوت کوژرا. دوای سێ ڕۆژ کوشتن و بردن ڕووسەکان

---

۳۲۹- ڕۆشقی کە برێ کەس بە هەڵە «ڕشخاری» پێدەڵێن گوند ناوچەی میانکووهی کەپکانە. خەڵکی ڕۆشقی و دەربەند و حەسار و ئەنژەک (عەلی‌ئابادی ئێستا] لە گوندە فارس زمانەکانی میانکووهن، باقی گوندەکان کرمانجن.

ڕۆشقیان بە جێ هێشت و خەڵکی ڕوویان کردەوە گوند و کوژراوەکانیان ناشت
جەجوو چەندین ساڵ بە هێزی خۆی حوکمی دەرگەز و قووچانی کرد.[٣٣٠]

لە ڕۆژەکانی کۆتایی ڕەشەمەی ١٣٥٩ دوای چاپ و بڵاو بوونەوەی بەرگی
یەکەمی کتێبی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان، بەیانییەک کەسێکی هێژا هات
بۆ شوێنی کارم لە کتێبخانەی دوکتۆر شەریعەتی مەشهەد و وێڕای پیرۆزبایی لە
نووسەر بۆ سەرکەوتن لە نووسین ئەم کتێبەدا گوتی دوێنێ کتێبەکەم کڕیوە و ت
ئێستا کە کاتژمێر نۆی بەیانیە نەنووستووم و خوێندوومەتەوە و دوای تەواو کردن
خوێندن و خواردنی پیاڵەیەکی چای هاتووم تا سپاس و پێزانینی خۆم بۆ ماندو
بوونتان لە کۆکردنەوە و نووسینی ئەم بەرهەمە ئاراستە بکەم. سپاسی ئەم دربڕینە
کرد و خوازیاری خۆناساندنی بووم. گوتی من... کارمەندی خانەنشین بووی خەڵک
مایدانلووم[٣٣١] بابم باسێکی زۆری جەجووخان و خەدوی سەرداری کوردی ب
کردووم. لەسەر جەجووخان گوتی کاتێک کە جەجوو لە شاجەهانەوە لەگە
سوادانیدا هات بۆ مایوان پێش ئەوەیکە بێتە نێو گوند ئیزنی لە بابم وەرگرت ک
شەو لەوێ بمێننەوە. بابم و گەورەپیاوانی مایوان نزیک فرسەخێک لە دەرەوە
گوند چوونە پێشوازی جەجووخان و سوارەکانی جەجووخان نزیک ١٠٠ سواری ب
کە هەموویان ئازا و لێهاتوو بوون و قەتارەفیشەک لەسەر شانیان بوو و سوار
ئەسپگەلێکی بە هێز و جوان بوو بوون.

خەڵکی گوند میوانداریتیان لێیان کرد. جەجوو شەوی لەماڵی ئێمەدا بر
سەر. بابم دەیگوت ئامۆژگاری جەجووم کرد کە دەستبەرداری شەڕ لەگەڵ ڕووس
بێت و شوێنێکی ئەمن بدۆزێتەوە و گیانی خۆی و سوارەکانی ڕزگار بکات لە وڵام
جەجوو گوتبووی کە من و سوارەکانم سوێندمان خواردووە کە دەست لە چەک
تێکۆشان بەر نەدەین تا ئەو کاتەی کە بریتانیا و ڕووس لە وڵاتی ئێران وەدەر نەن
یان هەموومان دەمرین یان ئەم وڵاتە لە دەستی نەیاران و داگیرکەران ڕزگ
دەکەین. ئەم سوارانە کە دەیانبینی هیچ کەسێکیان هیوای بە زیندوومان نەماو

---

[٣٣٠]- ئەم دیمانەیە لەلایەن دۆستی ئازیز و زانام دوکتۆر نەوغانی لە ماڵی خۆیان لە مەشهەد لەگ
ئاغای مەلا غولامعەلی ئەنجامدراوە کە سپاسی ماندووبوونی دەکەم.

[٣٣١]- مایوانلوو گۆڕای ما دوانلووە.

نایانەویت زیندووم بمێنن. خاکەکەیان لە ژێر چەکمەی بێگانەدا ببینن. کە وایە ڕێگای شەهید بوونیان گرتۆتە بەر و مردنی بە شکۆیان لە بەرانبەری ژیانی نەنگین و پەست هەڵبژاردووە. بابم دەیگوت گەرچی جەجوو خۆی ماندوو بوو بەلام پێش خەوتن چووە نێو گوند و سەردانی سوارەکانی کرد تا کەم و کوڕییەکیان نەبێت، ئەو سوارەکانی زۆرتر لە گیانی خۆی خۆش دەویست. بەیانی ڕۆژی دوایی لە حالێکدا کە سپاسگوزاری میوانداری میوانەکانی دەکرد، ئەوێ بە جێ هێشت. چەند ڕۆژی دوایی هەواڵی کوژرانی بە دەستی ڕووسەکان خەڵکی گوندی داخدار و ئازیەتبار کرد. مەلا ڕەمەزانی متامی نودسەر کە تەمەنی ۱۰۳ ساڵ بوو گوتی : جەجوو اوەری زوڵم لێکراو و چەوساوەکان بوو، سەرەتا ئەنباری چەوسێنەران و حاکمەکانی ە نێو دەبرد و لە هەمار کردنی گەنم بەرگری دەکرد و گەنمەکەی لە نێو هەژار و ،ەستکورتاندا دابەش دەکرد. گەر ئەم کارەی نەکردبایە زۆرێک لە خەڵک لە برسا ،ەمردن. لە دواییدا لە بێدەنگییێکی خەمهێنەردا هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی ەم شیعرانە ئەو سەردەمە لە سەر زاران بوو.[۳۳۲]

خانێ خانان جەجووخانە
خەراو دەکە ئاکارمانە
دەدە فەغێر بێچارانە
خانێ خانان جەجوو خانە
پشتیوانی بێچارانە
وە زۆرێ خابۆیە خانە
وا سەرداره جەجووخانە
توفانگ لە ئارێ پیلانە
ئار بەردە دەسەلاتانە

ئاغای ئیسمائیل بەگی میرزایی لە کوردانی زیدانلووی دەرگەز کوڕی میرزابەگی ،ڕی کورد ئیسمائیل کولەمێژە بنەماڵەیەکی وڵاتپارێزی ناوچەی دەرگەز و کەلات

---

[۳]- مانای شیعری کوردی کە پێویست ناکات وەری بگێڕینی.

و لـه نـەیارانی سەرسـەختی داگیرکـەران بـوو بـوون. هـەر بـەم بۆنەشـەوەکاتێک ڕووسەکان لە خەرمانانی ساڵی ١٣٢٠ ئێرانیـان داگیرکـرد ئـازاردران و قـەدەم یـار و کوڕی جەجووخان بەندکران.

لە دیدارێکدا لە زستانی ١٣٦١ لە مەشهەد لە ماڵی پاڵەوان ئەحمـەدی وەفـادار، کاتێک کە نێوی جەجووی بیست بـە جۆرێـک شـادمان و کـەیفخـۆش بـوو کـە واتدەزانی ونبووی لە مێژەی خۆی دۆزیوەتەوە. ئـەو مـەرگانێکی توانـا و لێهـاتووی لاین و دەرگەز بوو و بە هەشتا ساڵ تەمەن لەشساغ و توانا بوو[٣٣٣]. ئەو ئەم شـیعرانە کە لەو سەردەمەدا بۆ جەجووخان و براکانی وترا بوون بە سترانێکی جوان وتەوە:

جـــەجووخانوو هەڵـــۆخان،دەلیر هـــەر دووبرانـــە
مینـــا دوو نەڕەشـــێران پێـــشی سەڵـــێت تـــاڤ دانـــە
وە زۆرێ خـــــاهلگرتن ژە ســـــەلاتان تووپخانـــــە
ئافـــەرینکـــو دەلـــیرن خـــادێ پـــشت وپـــەنای وان

بە هەناسەیەکی ساردەوە دووبارە دەنگی هەڵێنایەوە.

مووســـا خـــانوو تـــو ســـیار وی
ســـــەلات هاتیـــــە دەوی داوی
ژ وان تـــا تـــان ئەرخـــەین نـــاوی
جـــەجوو خانـــەک پەیـــدا نـــاوی

هەر جۆرێک بووبێت جەجوو لە نێو خەڵکەکەیدا سەریهەڵدا بوو، جێ لـە دڵـی خەڵـک و خۆشەویـستی لـە هەسـت و نەسـتی خوراسـانیەکان ڕیـشەی کوتـابوو، هەرکەس زوڵم و ناحەقێکی لە چەوسێنەرانی سەردەم بدیبایە هانای بۆ ئەو سەردارە دەبرد. ئەوەی برسی یان لە ژێـر نەهامـەتی و قەرزاریـدا بووبایـە ڕووی لـە جـەجوو دەکرد. ئەو پشت و پـەنای خەڵـکی ناوچەکـە بـوو و هـەموو خەڵـک پـشتیان پـێ

---

[٣٣٣]- بە داخەوە ئاغای ئیسمائیل بەگ لە ساڵی ١٣٦٤ لە وەرزی زسـتاندا بـە هـۆی ڕووداوێـک کـە مەرگی کچ و منداڵانی کچەکەی لێ کەوتبووەوە تووشیاری حاڵەتێکی سەخت و قـەیرانی بـوو و لـە پەژارە و ماتەمینی ئەو ئازیزانە گیانی لە دەستدا.

بەستبوو و دۆعابێژی ئەو بوون لە شەڕیدا دەگەڵ ڕووسەکاندا تاکوو سەربەرز کەوتووبێت و گەورەیی و شەرافەتی لە دەستچووی ئێران زیندوو بکاتەوە. بەڵام بە شەهید بوونی سەرداری گەورەی خاوەران بە دەستی سپای پرچەک و بێشوماری ڕووس ئەو هەموو ئاوات و هیوایە جێ خۆی بە بێهیوایی و نەتەوەیەکی خەڵتانی ماتەمین و ئازایەتیدا.

ئاغای ئەبولفەزلی قاسمی لە کتێبی بە نرخی خۆی «خاوران گوهر ناشناختەی ایران» [ڕۆژهەڵات گەوهەری ناسراوی ڕۆژهەڵات] لەسەر جەجوو وتوویەتی؛ ئەو سێبەری ڕۆمی نادرشا بوو و خاوەن سەرێکی پڕ شوور و بیرێکی دژ بە لەشگرانی و ناتوانی و سەرشۆڕی بوو.«جەجوو لە ئەتەکەوە هەموو گوندەکانی داگیر کرد.

قاسمی دەڵێت: جەجووش وەکوو دیکەی سەردارانی گەورەی خوراسان لەوانە ئەبوموسلیم و نادرشا بوو بە قوربانی بیری سادە و خۆش باوەڕی خۆ و متمانەی بە هەمووکەس دەکرد و نهێنی خۆی بەلای هەموو کەسەوە ئاشکرا دەکرد. بێخەبەر لەوەیکە:

ای بسا ابلیس آدم رو که هست
پس به هر دستي نبايد داد دست

لە هۆنراوەیەکدا کە خەڵکی ناوچە هۆنیویانەتەوە و ئێستاش لە سەر زارانە ئاماژە بەوە کراوە کە:

جەجوو متمانەی بە هەموو کەسێک دەکرد غافڵ لەوەی کە لە نێوان هاوڕێکانیدا کەسانێکی فێڵباز و خۆفرۆش وەکوو... بوونیان هەبوو.

هۆنراوەی تورکی دەرگەزی لەم بابەتە ئاوایە.

جەجووخان چو رگِن هر ناکسه ویردی
بیلمدی کنجی تک، رجب تک تولکی لە واردی
وفالی غیرت لی، شیر دور جەجووخان
درگزدن توران فیل دور جە جەجووخان

پاشان دەڵێت: خەڵکی دەرگەز لە دەوری جەجوو کۆبوونەوە بە جۆرڕێک کە دەتگوت هەموو هیوا و ئاواتەکانیان لە سەرکەوتنی سەرداری خاوەران دەبینی بەم خاترەش ئەویان کرد بە سەرۆکی خۆیان.

مەنسوورولمەلیک خان مەورووسی دەرەگەز و حاکم ناوچەکە هەبوونی جەجووی بە دەردیسەرێک دادەنا و شەڕێکی دەگەڵ جەجوو داگیرساند بەلام بە خەستی شکستی هێنا و هێزەکەی لە نێو چوو و خۆیشی بە دیلی کەوتە دەستی جەجوو

دوا بە دوای ئەم ڕووداوانە والی خوراسان کە ترسێکی زۆر دایگرتبوو مەسعوودخانی بە هێزێکی زۆرتر و تەیارتر هەنارد بۆ شەڕ دەگەڵ جەجوودا. ئەگەرچی هێزەکانی جەجوو چەکی باشیان نەبوو زەرەر و زیانێکی گەورەیان لە سپای مەسعوودخان‌دا، بەلام لە بەرانبەری تۆپخانە و چەک و تەقەمەنی بە هێزی مەسعوودخان ناچار بەرەو ئەتەک پاشگەز بوونەوە. ڕووسەکان کە بیرێکی تالیان لە جەجوو بوو، گەمارۆیان دا و دوایی دەستگیریان کرد و سەرەتا لە مەرو و دوایی لە عێشق‌ئاباد زیندانیان کرد. بە وتەی ئاغای قاسمی «گەوهەرناسانی بیانی ئەویان ناسی و زانیان کە لە بوێری و جوهێری‌داوە، کوو پالەوانەکانی ئەشکانی لە شەڕەکاندا لە وێنەی نیە، یەکێک لە گرفتە گەورەکانی ئەو سەردەمەی ڕووس و ئێران بوونی چەتە و قاچاقچی سنووری دوو وڵات بوو، هەر دوو وڵات ڕێککەوتن لە سەردانی بەرپرسیارێتی دابین‌کردنی ئاسایش سەرحەد بە دەستی ئەو و بەم جۆرە بووە سەرداری گەورەی هەر دوو ئەتگ (باکوور و باشوور)ی ڕووسیە و ئێران، ئەو ڕۆژانە ئاژاوەنانەوەی چەتەکان (لەوانە موحەممەد قوڕش‌ئابادی) لە دەوروبەری مەشهەد ئاسایش ئەم هەرێمانەی تێکدابوو. جەجوو بوو بە بەرپرسی دابین کردنی ئاسایش ئەم ناوچەیە لە خوراسان و بە باشی ئەم کارەی بەڕێوە برد، بەلام هەڵسووکەوتی زاڵمانە و نامرۆڤانەی حاکمانی ئەو سەردەمە ڕۆحی ئازاد و هەستیاری جەجووی بریندار کرد و لە نەیشابوورەوە گەڕایەوە دەرگەز و دوایی ئەتەک، بەلام کاتێک دیمەنی فەرمانبەرێکی حوکمی بینی کە لەبەر چاوی خەڵکەوە ئازاری ژنێک ئەدات، دەماری جوولا و دووبارە بە بیری خۆیدا چووەوە تا لە ئازاری خەڵکی هەژار و دەستکوت بگات.

دووبارە زاڵبووە سەر ئەتەگ و دەرگەز، ئەم جارە بیری ئەو زۆر بەرزتر و گرنگتر بوو، دەستەی حاکم و دەسەڵاتی لەرزۆکی ناوەندی و پیاوانی سەردەمی ناسیبوو و بە تەواوەتی لە دام و دەزگای حوکمی قاجار نائومێد بووبوو. بەم بۆنەشەوە ڕەحمی بە چە خراپکاری ئێرانی و ڕووسی نەدەکرد و ئەوانی بە کەسانێکی گەندەڵ و خیانەتکار و نیشتمانفرۆش دەزانی و متمانەی پێیان نەبوو. مەبەستی ئەو سەرۆکایەتیکردنی مرۆڤە زوڵم لێکراو دەستکورتەکان بوو تا بتوانێ کۆشکەکانی زوڵم و گەندەڵی تێکبدات. دانداوە ترسەنۆک و کارگێڕانی جنایەتکار کە بەرژەوەندی خۆیان لە مەترسیدا دەبینی منشاریان بۆ حوکوومەتی قاجار هێنا تا ئەم سەردارە شۆڕشگێڕ و بە ورەیە وەکوو زۆرێک لە لاوانی پاکدڵی ئەم وڵاتە لە ناو بەرێت، تا چارەنووسی ئەویش وەکوو چارەنووسی قائیم مەقام و ئەمیرکەبیرەکان بێت. ڕاپۆرتی تێلێگرافی کونسولخانەی مەشهەد و باڵیۆزخانەی تاران بە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی بریتانیا و هینانە ئارای باس جەجوویان بە وتەی بریتانییەکان[٣٣٤] (جەجوو ناوی سەردەستەی یاخیبووەکان) گرنگی کەسایەتی ئەو بە باشی پێشانئەدات. بریتانیاییەکان کە لەم کاتانەدا سەری مار بە دەستی دوژمن دەکوتن، ئەمجارەش هێزە نەیارەکانی تێزاری ڕەوانەی ڕاوەدوونانی جەجوو کرد. مردنی یارە وەفادارەکانی جەجوو لە هەزار مەسجد ئەوی تووشی نائومێدی کرد. جەجوو کە خۆی لەگەمارۆی دوژمەندا دەبینی بەرەو قووچان پاشەکشەی کرد و ڕووسەکانیش هەنگاو بە هەنگاو بە دوایدا ڕۆیشتن. ئەم جارەش چارەنووس وا نووسرا بوو کە خوێنی یەکێکی تر لە ڕۆڵە ئازا و جوامێرەکانی نیشتمان لەم وڵاتە نفرین لێکراوە برژێت. هەر بەو جۆرەی کە خوێنی نادر و کولۆنێل ڕژا.

لە قووچان وەلیخان قەهرەمانلوو مێوانداری و سەوداگەر و نەریتشکێنی عەشیرەتی لە سەر سەرداری ئێمە مامەڵەی کرد و ئەوی فرۆشت. سەربازانی ئێزار گەمارۆی جەجووخانیان دا. چارەنووسی خەم بزوێنی ڕۆڵەی بێکەس و تەنیای ئەتەک لە بەرانبەری هێزە بێشمار و سەرکەوتووەکانی پەیمانەکانی تورکمانچای و گولستان دیار بوو. لە ڕاپۆرتی ناوەندی فەرمانداری ئاخاڵ داکۆکی کراوە لە سەر

---

[٣٣٤]- کتێبی ئاو- ڕووداوەکانی ٢٤ ژانویە تا ٢٣ فێوریە، ١٩١١ ک.

ئەوەی کە لاشەی جەجوو بنێردرێت بۆ ڕووسییە، ئەو سەردەمانە کە مەودای شارەکان زۆر دوور بوو، زگی سەرداری هاوەرانیان دڕی و پڕیان کرد لە یەخ و بەفر و لەشی بێگیانیان ناوە نێو سندووقێکی پڕ لە یەخ و بردیان بۆ ڕووسیە تا پسپۆڕانی زانا پەی بە میکانیسمی و دڵی ئەم خولقێنراوە ببەن هۆکار و بلیمەتی و توانای نەتەوەیی و لەشکەری ئەو بۆیان ڕوون بێتەوە.[٣٣٥]

بەم جۆرە دڵی خوێنین و پڕ لە ئاواتی جەجوو لە کۆشکی ئیمپراتۆری تیزاری ڕووسی لە دەستی ئەفسەر و دەرباریەکانی ڕووس دەگەڕا و پیرۆزباییان لە یەکتر دەکرد. بەخشییە خۆ جێیەکانی دەرەگەزیش لە شینی جەجوو سەرداری خاوەران هۆنراوەگەلێکی زۆریان هۆنیوەتەوە و لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا دەیانخوێند کە وێنەیەکی لە لایەنی ئاغای میرنیا لە کتێبەکەیدا هاتووە، کە بە زمانی خۆشک و برایانی تورکی دەرگەزی وتراوە.

جەجووخان خانی خانان
وێنەی لە دەرگەز نابیرنێت
ئاوات لە دڵی مایەوە
جێ داخ بوو مەرگی تۆ جەجوو خان
چی دیکە دایک لە وێنەی تۆی نابێ
مخابن کە دەوڵەتی گەندەڵی قاجاڕ قەدری تۆی نەزانی
نامەرد هیچکات چاوی بە جواهیر هەڵنایەت و توانای تەحەمولی نییە
جێ داخ بوو مەرگی تۆ جەجوو خان
هەموو دەرگەزت گرت
هیچ سەردارێکی ئازا وەک تۆ بوونی نیە.
شیری دایکت حەڵاڵت بێ
جێ داخ بوو مەرگی تۆ جەجووخان
نە یارانت پاش لە ناو برد
ڕووسەکانت پەخش و پەرێشان کرد.

---

[٣٣٥]- خاوەران گەوهەری نەناسراوی ئێران- ئەبولفەزلی قاسمی، ل ٣٩٨.

لە پێناو نیشتمان و ئامانجەکان گیانت بەخت کرد
جێ داخ بوو مەرگی تۆ جەجووخان
دەوروبەرتیان سەربازانی ڕووس گەمارۆدا
ئەو ڕۆژە بەختت بەسترابوو
حاکمانی ناوچە تۆیان هەرزان فرۆشت
جێ داخ بوو مەرگی تۆ جەجووخان
ئەسپەکەت کەوتە نێو زەڵکاوەکان
گولە ڕانتی لەتکرد
قەد و باڵای ئازات لە خوێندا خەڵتا
جێ داخ بوو مەرگی تۆ جەجووخان
جەجوو خان بە ئاوات نەگەیشت
کراسە کەتانیەکەی بوو بە کفنی
دایک ڕەشپۆشی تۆ بوو
جێ داخ بوو مەرگی تۆ جەجووخان

## چۆنیەتی کوژرانی جەجووخان بە دەستی داگیرکەرانی ڕووس

تا ئێرە بۆمان ڕوون بووەوە کە لە ڕاستیدا هەردوو هێزی داگیرکەر و ئمپریالیستی ڕووس و بریتانیا خوراسانیان داگیر کردووە و بە ڕاستی هەست و ڕەفتاری جەجووخان و پیاوانی دەرگەزی و لاینی و قووچانی لە بەرانبەر داگیرکەریان گەیشتوون، ئەمەش بۆیان دەرکەوتووە کە ئەگەر ئەم جووڵە لە سەرەتادا نەوەستێنن و سەرکوتی نەکەن و لە نێوی نەبەن بڵێسەی ئاگری هەموو شوێنەکانی ئێران دەگرێتەوە و ژیان و دەسەڵاتی ئەم داگیرکەریەکیان گرت و ئەوەیان بە باش زانی کە مەسعوودخان کوڕی تازە پێگەیشتووی مەنسوورولمەلێکی دوڕاو لە حوکمی دەرەگەز دابنین و بە هێز لەشکەرێک کە بەئەویان دابوو، ڕەوانەی دەرەگەزیان کرد. بەڵام بوێری خێرا چوون بۆ دەرگەزی نەوو، بەم هۆیەش دەمێک لە قووچان مایەوە و بۆ بە هێزکردنی جێگە و پێگەی سیاسی خۆی لە ناو چەکدا،

خۆشکی عەبدوڕەزاخان شوجاعودەوڵەی ئیلخانی زەعفەرانلووی هێنا تا لـەم ڕێگـەوە پشتگیری کوردان بە لای خۆ بەرێ، دوای ئەم کارە بە تۆپخانە و هێزێکی
نەیار و فەرمانداری ئەفسەرانی ڕووس بەرەو دەرگەز کەوتە ڕێ و شەڕی لەگـەڵ جەجوودا هەڵگیرساند و لە کۆتایدا بە سەر کەوتوویی چـووە نێـو شـاری دەرەگـەز. جەجوو لە ڕووی ناچارییەوە بەرەو ئەتەک کە لە دەسـتی ڕووسـەکاندا بـوو پاشـگەر بووەوە و دوای چەند ڕۆژ شەڕ و پێکدادانی لەگەڵ ڕووسەکاندا لـە ئەنجامـدا گـەمارۆ درا و دەستگیر کرا. سەرەتا بۆ دوور بـوونی لـە ناوچەکـە ڕایـانگوێزا بـۆ بەندیخانـەی مەرو، دوای ئەوەی کە شۆڕشی خەڵکی دەرەگەز کۆتایی هـات بـۆ دادگـایی کـردن ڕایانگواست بۆ بەندیخانەی عیشقئاباد.

شەوێک بە یارمەتی مووساخان توانیان پەنجەرەی ئاسنینی بەندیخانـە لـەجێ دەربهێنن و بە سواری ئەسپ بەرەو دەرەگەز هەڵ بـێن. دەڵـێن ئێرانیـەکی خـاوەن کاروانسەرا دەرفەت و ئیمکانی هەڵاتنی بۆیان دابین کردووە. هەر جۆرێـک بووبێـت جەجوو توانی لە زیندان ڕزگاری بێت. کاتێک زیندانەوان ئاگاداری هەڵاتنی جـەجوو ومووساخان بوون، ئەوان چەندین فرسەخ لەو شـارە دوور کەوتبوونـەوە. جـەجوو بـۆ فریودانی ڕووسەکان لە دوورترین ڕێگەوە کەوتە ڕێ، بەڵام بە پێچەوانەوە سـەربازانی ڕووس بوونە دوو دەستەی جیا و دەستەیەکیان لـە ڕێگـەی دەرونگـەر کـە ڕێگـەی ئاسایی بوو کەوتنە ڕێ و دەستەیەکی دیکە لە ڕێگەی کەهتر کە دەگەیشتە حەسـار کە ڕێگەی هەڵاتنی جەجوو بوو.

لەو دەمەی بەیانیە کە جەجوو خۆی ڕزگار دەکـرد و لـەو دێـوی ئەتەکـەوە لـە پێدەشت و ماهوورەکـان بـە دوایـەوە بـوون. شاهـسیار هاوسـەری جـوانی جـەجوو خەوێکی ئاڵۆزی دی، هەموو لەشی کەوتە لەرزە و پەرێشان لە خەو هەستا، دەمێک لە پێخەفەکەیدا ڕاوەستا و جوان بیری کردەوە و بە هێواش گـوتی: جـەجووم بـینی بـەرەو ئێمـە دەهـات لـەو دێـوی ئەتەکـەوە بلێـسەکانی ئـاگر بـە دوی جـەجوودا دەڕۆیشتن و دەیانەویست دەوری بدەن و ئـەویش بـە هـاوار یارمـەتی دەخواسـت. ئەرێ جەجوو گرفتار بووە و یارمەتی دەوێ. ئەو گرفتـاری نەیارانـە. دەبـێ یارمـەتی بدەین ئەم خەوەم ڕاستە. شاهسیار هەڵساوە و لـە پەنجـەرەی ژوورەکـەوە ئاسـۆی ڕۆژهەڵاتی خاوەرانی بینی کە ڕۆشنایی و نوور جێگەی ڕەنگی ڕەش و تاریکی شـەو

دەگرتەوە. بە پەلە جلولەرگی شەڕی لە بەر کرد و هاتە دەر، لەسەر بانەوە بانگی براکانی جەجووی کرد. هەڵۆخان، هەڵۆخان، مەحموودخان، مەحموودخان. هەڵۆخان بە بیستنی هاواری شاهسیار هەستا و گوتی چە ڕووی‌داوە؟

ولامی دایەوە، بەرەو ئەتەک بکەوە ڕێ، جەجوو تووشی گرفت هاتووە. ئەمەی گوت و ئەسپی ئامادە کرد و بە تفەنگێکی پێنج تیر، لەسەر شان وچەکێکیش لەسەر کەڵبەی زین و قەتارەفیشەک لەسەر شان بەرەو ئەتەک کەوتە ڕێ، دوای تیپەڕاندنی سنووری هەلاتنی ڕۆژ، دەستەیەکی سواری بینی کە لە دوای دووکەس دیکە ئەسپەکانیان دەئاژۆن، ئەو دوو کەسە جەجوو و مووساخان بوون کە شەڕ بەرەو پێش دێن، تیری جەجوو تەواو بووە و ڕووسەکان نزیکی دەبنەوە.

شاهسیار دوای کەمێک بیر کردنەوە گەیشتن لە دۆخەکە بە غارنانی ئەسپەوە چەکەکەی گرت بەرەو یەکێک لە ڕووسەکان و بە تەقەی سەربازی ڕووس لە ئەسپەکەی کەوتە خوار، بە بزەیەک لەسەر لێو ڕوو لە **جەجوو ئاوەهای گوت:**

جەجو خانو، بوین هاتِم
وەسەر دوشمەن ڕاداکەتم
تو مەویژە کۆ بێ غێرەتِم
خانێ خانان جەجو خانو

**جەجوو ولامی دایەوە:**

شاهسیار شیرەژنو
نووریٚ هەردو چاڤێ مِنو
تو رندکیشتی دادێ مِنو
قوروانەتە جەجو خانو

جەجوو لە حاڵێکدا کە ستایشی شاهسیاری دەکرد هاواری کرد کە چەکەکەی پێ‌بدات. ئەویش هەریەکەو چەکێکی پێیان دا و ئەوانیش تەقەیان لە سەربازانی ڕووس کرد. هەر لەو ئان و ساتەدا مەحموودخان و هەڵۆخان لەگەڵ حەساردا گەیشتن و لە ئەنگی ڕووسدا شەڕێکی دی دەستی پێکرد. چەند سەربازێک کە

نزیک بوو بوون کوژران و باقی سەربازان بەرەو عیشق‌ئاباد هەڵاتن و جەجوو لەگەڵ شاهسیار بە پێشوازی و شادی و قوربانی کردن لەلایەن خەڵکەوە ڕۆیشتنە نێو قەڵا و خەڵکی حەسار بە ئاهەنگ گێڕان و هەڵپەڕکێ شادی خوشحاڵی خۆیان دەربڕی، دوای چەند ڕۆژێک هەواڵی هەڵاتنی جەجوو لە زیندانی ڕووسەکان لە هەموو خوراسان بڵاو بووەوە و یارانی ئەو لە هەموو شوێنەکانی وڵات بە سواری ئەسپ بەرەو دەرگەز کەوتنە ڕێ و چوونە ڕێزی هێزی ئەو سەرداره. ئەبووتالیب بەگی بیچەوی (بیچوانلوو) یەکێک لەو کەسانە بوو. ئەو لە شەڕەکانی بوخارا کە چەند ساڵ پێش لە نێوان موسڵمان و ئەرمەنیەکاندا ڕووی دابوو هۆکاری سەرەکی سەرکەوتن موسڵمانان بووبوو. ئەبووتالب لە نەترسی و هێز و لێهاتوویی وەکوو جەجوو وابوو. ترس لە لای‌ئەودا شتێکی نامۆ بوو. جەجوو پێشوازییەکی گەرمی لە جەجوو و یارانی کرد.

لە باکوورەوە ڕووسەکان و مەسعوودخانیش لە باشوورەوە بەرەو شوێنی جەجوو کەوتنە ڕێ. جەجووش لەگەڵ ئەبووتالب و سوارانی بۆ بەرەنگار بوونەوەی داگیرکەر و نەیاران کەوتنە ڕێ.

شەڕگەلێکی فراوان لە نێوان ئەواندا ڕوویدا کە گرینگ‌ترینیان شەڕی زۆنگلانلوو بوو کە ماوەی چل ڕۆژ بەردەوام بوو، هەزار سەربازی ڕووس و مەسعوودخان لەو شەڕەدا کوژران و چەند کەسێکیش لە یارانی جەجووخان گیانیان لە دەستدا و بریندار بوون.

جەجووخان ئەو سەربازەی کە ڕەشاشەی پێ‌بوو کوشت و بەو ڕەشاشەیە زۆرێک لە سەربازانی کوشت، تۆپخانەی دوژمەنیش بە دەستی هەڵۆخان و ئەبووتالب گیرا و لە دژی خودی ڕووسەکان بە کاریان هێنا و قەبزەیەک لە تۆپەکانیان لە دواییدا لەگەڵ خۆیان برد، بەڵام لەکاتی چوونیان بۆ هەزارمەسجد بە هۆی دژوار بوونی بردن و جێبەجێ کردنی لە کێوەکانی زەنگلانلووەوە خستیانە نێو دۆڵێکەوە و لە نێویان برد. لە خاکەلێوەی ١٣٦٥ کە چووبووم بۆ میان‌کوە لە گوندی خادمانلوو[٣٣٦]

[٣٣٦]- خەڵکی خادمانلوو دەیانگوت: بنچینی خەڵکی گوندەکانی سیاب و کەپکان و خادمانلوو لە کوردەکانی شادلووی بجنووردن کە لە سەردەمی نادرشا بۆ ئێرە ڕاگوێزراون، و لە لەوەڕگەو مەزراکان و کێوەکان هەر ئەوانەن کە زۆرتر لە ناوچەی بجنووردان. گوندی خادمانلوو ١١٥ بنەماڵەی تێدایە

لە داوێنی کێوی الله اکبر قسەی قوربان موحەممەد باوکی دەگێڕایەوە کە: جەجوو لە هەر هێرشێکیدا بۆ سەر ئەتەکی ڕووس تا ۲۰۰ یان ۳۰۰ سەربازی ڕووسی نەکوشتبایە ناگەڕایەوە بۆ دەرەگەز، بە کرمانجی دەیگوت: «لە سەرێ دوشمەن دەکرە تووفان».

لە ڕووی ناچاری و بۆ سارێژ کردنی برینی بریندارەکان و حەسانەوەی سوارەکانی بەرەو قووچان کەوتە ڕێ. هەڵۆخان برای بچووکتری جەجوو کە لە شەڕی زەنگلانلوو بە گرانی بریندار بووبوو، گیانی لە دەست دا. جەجوو لە حاڵێکدا بەرەو قووچان کەوتە ڕێ کە لە لایەنی والی خوراسانەوە لە ژێر گوشاری ژنراڵ ڕێدکۆ فەرماندەی سپای ڕووس فەرمانی دەستگیر کردنی دەرکرا بوو و بە سەرۆک هۆز و حاکمانی کوردی قووچان و شیروان و بجنوورد و ئەسفەراین ڕاگەینرابوو، هەروەها خەلاتێک بۆ سەر جەجوو دیاری کرابوو.

عەبدوڕەزاخان شوجاعودەوڵە ئیلخانی، زەعفەرانلووش لەلایەن ڕووسەکانەوە دەستگیر و ڕەوانەی تاران کرابوو.

جەجوو بۆ گرتنی یارمەتی لە وەلیخانی قەرامانلوو و فەرهادخانی تۆپکانلوو لە ڕۆژهەلاتی قووچانەوە تێپەڕی و ڕووی کردە کێوی شاهیجان (شاه جەهان، شایجان)

بە پێچەوانەی فەرمانی والی خوراسان و حاکمی سەربازی ڕووس لە بابەتی دەستگیرکردنی جەجوو، فەرهادخان یارمەتی ئەوی‌دا، بەلام موحەممەد ئیبراهیم ڕەوشەنی و فەرەجوڵلاخانی شیروانی (زەیعەلمەلەکی دوایی) لە شەڕی دەستگیر کردنی جەجووخان یارمەتی ڕووسیان دا. لەسەر ئەوەی کە جەجوو بە دەست ڕووس یان کورد کوژراوە کێشە بوو، بەلام لە ڕووی گوللەوە ڕوون بوەتەوە کە جەجوو بە گوللەی چەکی سێ تیری کوردان کوژراوە. هەموو کات بەم شێوە بووە:

---

کە دەبنە ٥ تیرەوە و تیرەیەکیان هیوەدانلووە کە ۲۲ بنەماڵەن و سەر بە گەورەی ئیلی زەعفەرانلووە. ئەوانی‌تر هەموویان خادمانلوو و شادلوون، ئەڵبەت بە پێ وتەی ئاغای ئاڵڤا نەزەری سەخی کە ناسراو بە دادستانی خادمانلوون و باقی ناسراوەکانی خادمانلوو.

من از بیگانگان هرگز ننالم
که هرچه کرد با من آشنا کرد

«گلەیی و گازندەم هیچ کات لە بیانی نەبووە، بۆ ئەوەی هەرچی پێم کراوە لەلایەنی ئاشناوە بوو.

کاتێک تیر ڕانی جەجووی بریندار کرد بە هەناسەیەکی ساردەوە چاوێکی لە برینەکەی کرد و گوتی بە دەستی کێوە بنالێم، هەرچی بە سەرمان دێت لەلایەنی خۆمانەوەیە. وەلیخانی قەرامانلوو چەند ڕۆژ میوانداری جەجووی کرد، بەلام هێشتا کە ڕوون نەبووەتەوە کە ئایا ئەو فەرمانی دەستگیر کردنی جەجووی پێ گوتبێت و مەسەلەکەی بۆ ڕوون کردبێتەوە یان نا؟ هەر جۆرێک بووبێت چەند ڕۆژی دوایی سەربازانی ڕووس لە شاهیجان بینران. پاسەوانەکانی جەجوو ئەمەیان بە جەجوو ڕاگەیاند و ئەویش فەرمانی چوون لەوێدا بەلام وەلیخان قەرامانلوو پێش پێیانی گرت و گوتی ئێوە میوانی ئێمەن، لێرە بمێننەوە، من لێتان پشتگیری دەکەم، ناهێلم دەستگیرتان بکەن.

بەلام جەجوو سپاسی خانەخوێی ئەوی کرد و بڕیاری ڕۆیشتنی دا. ئەگەری ئەوە هەیە کە لەوە بە گومان بووبێت، ڕووسەکان بە بانگێشتی ئەو هاتبێتن بۆ ئەوێ. بەلام ئێستا کە بەم ڕووداوانە دەچینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لە ئەخلاق و ئاکاری میوانداری و غەیرەتی کوردی وەلیخانی قەرامانلوو بە دوورە کە ئاوەها کارێکی کردبێت و بووبێتە هۆی خراپ بوونی ناوی خۆی و عەشیرەتەکەی.

دوای مالئاوایی، جەجوو خان بەرەو بام کەوتە ڕێ ئەو نەیدەزانی کە لە پشتەوەش کوردەکانی شیروان و ڕووسەکان گەمارۆیان داوە. لە کاتی ئاوابوونی خۆر جەجوو دووبارە گەمارۆ درا، بە ڕووی ناچارییەوە هێرشی بردە سەر و گەمارۆی شکاند و بەرەو بام کەوتە ڕێ، لەو کاتەدا تەپەیەک کەوتە نێوان جەجوو و یارانی، ئەسپی جەجوو کەوتە زەلکاوێک و لەم کاتەدا گولەیەک ڕانی ڕاستی جەجووی پێکا و لە سکی ئەسپەکەیشی درا و جەجوو لە تاریکی شەودا بە جێ هێشتنی ئەسپی، خۆی گەیاندە کەناری زەلکاوەکە و بە دەستماڵێک برینەکەی بەستەوە و

ڕووسەکانی گولەباران کرد، داگیرکەرانی ڕووسیش ئەویان بەست بە گوللەوە، ئەگەرچی جەجوو هەر ئەو شەوە کوژرا بەڵام ڕووسەکان تا بەیانی ڕۆژی دوایی لە نزیک بوونەوە بە لاشەی ترسیان بوو. ئەو بستە خاکە کە جەجووی لەسەر کوژرا لە نزیکی بێش‌ئاوا کە لە گوندەکانی بام‌دایە و نزیک یەک فرسەخی بامە هێشتاکەش بە نێوی زەوینی جەجوو ناسراوە.

تەرمی جەجوو لە لایەن ڕووسەکانەوە برا بۆ قووچان و سکیان هەڵدڕی و پڕیان لە بەفر و یەخ کرد و هەناردیان بۆ مۆسکۆ. بۆ خەڵکی هەژار و دەست‌کورتی هەرێمە سنوورییەکان مەرگی ئەو کارەساتێکی هەرە گەورە بوو. ژن و پیاو و منداڵ ئازیەتبار و ڕەشپۆش مەرگی ئەو قارەمانە بوون. زۆربەی ئەو منداڵانەی کە لەوساڵەدا لە دایک بوون، ناوی جەجوویان لێ‌نرا، هەرچەند کە هیچ کام لەوان نەبووە جەجوو. نازانم ژنانی کورمانج منداڵێکی وایان نەبوو یان بارودۆخی زەمانە پێویستی بە کەسانێکی ئاوەها نەبوو. هەر جۆرێک بووبێت ئیدی جەجووخانێک نەهات، بەڵام ئەمڕۆژە لە هەرێمەکانی قووچان و باجگیران و شیروان و بجنوورد جەجۆ ناو زۆر بەر چاو دەکەوێت کە یادێکە لەو قارەمانە، هیوادارم ئەم ناوە هەروا بەرز ڕابگرین. ئیوانۆف ڕۆژهەڵاتناسی ڕووس کە کەمێک دوای کوشتنی جەجوو بەردەوام بوو لە سەر مرۆڤناسی خوراسان و نووسراوەکانی لە گۆڤاری ئینگلیسی زمان لە بەنگال لە ساڵی ۱۹۲۷ چاپ کراوە. ئەم هۆنراوانەی کە لەسەر جەجوو لە زاری خەڵکی خوراسان بیستووە، تۆماری کردووە و لێرە چاپ کراوە.

**مەرگی جەجووخان:**

هەسپی جەجوو هین جانی‌یە
خەوەر هات نامەرد چوویە
خورجینی وی ترمانی یە
گولە لێکەت لی داوێ دا
جەجوو وە خالە گاوی دا
وە خورجینێ وخورجینێ

خـــــوێنیچوویەســــــەرچەکمێدا
دەسمـــــاڵ دایـــە ســــەر برینــــێ
چەکمــــە کـــــشاند زەنــــاوخوێنی
بوویــە شــەرقە شــەرقێ پــەنج تیرانــۆ
جــــــەجوو خانۆجــــــەجۆخانۆ
هەســــپی جـــەجوو ملــــواریی یــــە
نـــــاوژێ بــــرێ مووســــــا خـــــانۆ
خــەوەر هــات کــۆ (ئــەو) مریــی یــە
گولـــە لێکـــەت ویـــی کـــاریی یـــە
جـــەجوو خـــانو جـــەجوو خـــانۆ
وەرگــــــەریا جوولگــــــێ خوپـــــانو
بــــرێنی تــــە پــــڕ وە ژانــــۆ
هەســـپێ جـــەجێ هـــین جـــانی یـــە
جلـــی ســـەر ویـــی ترمـــانی یـــە
تفـــانگی ویـــسی ئـــەلمانی یـــە
هەســـپێ جـــەجێ هـــین قچکـــە
نـــاڵ و میخــــان چکــــە چکـــە
ژنی جـــــەجی مـــــا، کەچکـــــە

خاتووگوڵ بی‌بی جه لایر کچی خوالێخۆشبوو نووری ویردی خـانی جـەلایر لـە گەورەکانی لاین کە ئێستا ڕەشـەمەی ساڵـی ١٣٦٥ هەزاروسـی سـەدو شەسـت و پێنجە، نزیکـی ٩٤ سـاڵ تەمەنیـە و لـە کـاتی کـوژرانی جـەجوو خانـەوە ٧٥ سـاڵ دەگوزەرێت، چیرۆکێکی لە جەجوو بەم شێوە گێڕاوە: چادرەکانی ئێمـە لـە نزیکـی قاوزاردا (ئاوڕێژێکی بوو کە لە نزیکی گونـدی خەرکـەت دایـە) بـوو. خوالێخۆشـبوو حاجیعەلی- مامی ئاغـەی حـاجی زولفـەقاری جـەلایری- دراوێـسێی ئێمـە بـوو. هەواڵیان هێنا، کە جەجوو لە کانی مورادە و (کانی موراد لە پشتی زیارەتگەی هـەزار مزگەوت دایە) ڕێکەوتووە و دێت بۆ لای چادرەکانی ئێوە. هێشتا تازە نـاوی جـەجوو

کەوتبووە سەری زمانەکان و هەتا ئەو کاتەیش نەهاتبووە لاین و کەلات. بابم - نووری ویردی خان -لەگەڵ حاجی عەلی خاندا هەتا بەیان چەکیان لە شانەوە بوو لە دەوری چادرەکاندا کێشکیان دا. کە نەوەک لە سوارانی جەجوو خەسارێک ببینن، بۆ ئەوەی کە جەجوویان بە چاکی نەدەناسی. جەجوو ڕۆیشتووە چادرەکەی سوڵتانی کوڕی موحەممەد عەلی سۆفیانلۆ. کاتێک هەواڵی مەرگی جەجوو گەیشتە لاین، ئەم سترانەیش لە ناوی خەڵکدا بڵاو بووەوە:

## جەجوو لە وێژەی کرمانجیدا

ژەنیاران و هونەرمەندان و پارێزەرانی مۆسیقا و فەرهەنگی کرمانجیٚ، بریتی لە خۆینەران و ژەنیارەکان یادی مەرگی جەجوو ئەو سەرپەلە بە ناوبانگی ڕۆژهەلاتیان لە هۆنراو و شیوەنە بە سۆزەکانی خۆیاندا لە زەماوەند و پرسەکاندا خوێندووەتەوە و دەم و بەدەم دەیانگێڕاوە و هەتا ئەمڕۆ لە دەستی تالانی دەوران پاراستوویانە

جەجوو خانو تو سیار وی<br>
سەلات هاتیە دەوی دوای<br>
تەلیٚ تەکو پەیدا ناوی<br>
خانیٚ خانان جەجوو خانو<br>
خانیٚ خانان جەجوو خانو<br>
دوشمن ژە تە هەراسانو<br>
جەجوخان چوو زەنگلانە<br>
وە دوو کەتن سەلاتانە<br>
هەرقدی ٣ دانە وەر گولانە<br>
خانیٚ خانان جەجو خانو<br>
خانیٚ خانان جەجوو خانو<br>
دوشمەن ژەتە هەراسانو<br>
جەجی ٤ گرت سەریٚ چێیانە<br>
ویی ئار بەردا سەلاتانە

خانـــێ خانـــان جـــەجوو خـــانو
خانـــێ خانـــان جـــەجوو خـــانو
دوشمـــــن ژەتـــە هەراســـانوو
چەنـــد شەڤـــارو، وێـــی کرنجـــە
مەیـــدان لـــە دوشمـــەن کـــر تەنگـــە
ســـەلات مانـــە مـــاتو مەنگـــە

ژەنیار و هونەرمەند و ئەوانەی کە مۆسیقا و فەرهەنگی کرمانجیان پاراستووە بیرەوەری مەرگی جەجوو سەرداری بە ناوبانگی خاوەرانیان بە شیعر و شینـنامەی بە سۆز لە ئاهەنگ و زەماوەند و بە سەر ئازیەتی خوێندۆتەوە و سینە بە سینە گوتوویانە تا ئەمڕۆژ کە لە ناوچوون و گۆڕان و دزین پارستوویانە و گەیاندوویانەتە دەستی ئێمە، وێڕای سپاس و پێزانینی خۆمان لەوەی کە فەرهەنگ و وێژەی کرمانجیان پاراستووە ئاماژەیەک بە چەند کەسێکیان دەکەین: ئاغای شوعاری دەرگەزی مامۆستای خانەنشین بوو کە خاوەن زەوقێکی زۆرە و دانیشتووی مەشهەدە، ئاماژەی‌بە کەسێک بە ناوی ئیشان ئاغا دا لە دەرگەز لە تا ساڵی ٣١٥ هەتاوی مابوو و لە تورکانی دەرگەز بوو و تاری قەفقازی دەژەند (تاری قەفقازی ٢ تا ١٣ سیمی هەیە) و ژەنیارێکی لێهاتوو بوو بەڵام گۆرانی نەدەگوت مەگەر لە دانیشتنی تایبەت و بە هۆیەکەوە کەیفخۆش بوایە و بهاتبایە سەر شەوق دو قەتعەی بە زمانی تورکی دەخوێند کە زۆرتر بە شێوەی (مخمس) بوو. یەکیان بە ئازیەتی کلونێل موحەممەد تەقیخانپسیان کە ئاخری هەر بەشێک ئەمە دووبار دەبووەوە: حیف سندن لکنل مەد تقیخان. قەتعەی دیکە لە لاواندنەوەی جەجووخان بوو کە درێژتر بوو لە ئاخری هەر بەشێک ئاوا دووبارە دەبووەوە: شودو جەجووخان، شودور جەجووخان واتا ئاوەها بوو جەجووخان، ئاوەها بوو جەجووخان لە کاتی خوێندندا فرمێسکی دەڕژاند. حسێن کوێری دایەرەژەن یەکێکی دیکە بو کە بۆ پێشبڕکێ دایەرەژەنی دەڕۆیشت بۆ عیشقئاباد و قەفقاز، ئەویش تورک بوو باباعەلی کەمانچەژەن نموونەیەکیتر بوو کە عاشقی کورد بوو. ئەم کەسانە ئەو سترا و گۆرانیانە کە لە سەر جەجوو وترابوون لە ئاهەنگ و کۆڕوکۆ بوونەوەکا

دەخوێندەوە. گۆرانی جەجوو وەکوو گۆرانی سەردار ئێوە جێگەیەکی تایبەتی لە ویژەی کرمانجدا بۆ خۆی تەرخان کردووە کە بەخشییەکانی ناوچەکە بە تار و کەمانچە و قوشمە لە کۆڕ و ئاهەنگەکان بۆ دنەدانی خەڵک و بەرز ڕاگرتنی ئەو گیانبازانە لە ڕەدیفی ئاهەنگە کرمانجیەکاندا دەیانخوێند.

ریتە سەر هەڤ مینا لەتان
خویی وەری کەت لە ئاواتان
خانێ خانان جەجوو خانو
خویی مێرو جەجوو خانو
ئوروس زەتە هەراسانو
لە زنگلان بوو بەهارە
زەمین ژەخوین لالە زارە
دوشمەن بوویە تارو مارە
خانێ خانان جەجو خانو
خانێ خانان جەجو خانو
دوشمن ژەتە هەراسانو
جەجو چوو جلاس شاێچانی
سەلات وەدو ژە قووچانی
دورە گرتن لە مەیوانی
خانێ خانان جەجو خانو
خانێ خانان جەجو خانو
دوشمەن ژەنە هەراسانو
سەجو وەر کەت ٣٣٧ژە سەرخەدێ
سەلات چوونە رەد وەرەدی
خوێنی ویی بەردانە هەردێ
خانێ خانان جەجو خانو

---

٣٣٧ - ڤەرگەت

هەسـپێ جـەجێ ملـواریی‌یـه
لـه باتلاغـێ گـیر کریەیـه
گولـه لێکەتیـه مریەیـه
خانـێ خانـان جـەجو خـانو
خانـێ خانـان جـەجو خـانو
لـه دڵـی تـه مـا رەمـانۆ
خـەره چـووچین و ماچینـێ
جـەجۆخان کـەت ژه سـەر زینـێ
خـوێنی ویـی سـوییر کـر زینـێ
خانـێ خانـان جـەجو خـانو
لـه دلـێ تـه مـا ئـەرمانو
خـەوەر چـووچین و مـاچێنی
جـەجوخان کـەت ژه سـەر زێـنی
چەکمـه کـشاند ژه نـاف خوینـێ
دەسمـال دایـه برینـێ
خانـێ خانـان جـەجو خـانو
جـەجو خـانی دەرەگـەزیی
گولـه لێکـەت بـەدەن لـەرزیی
خویینـێ سـوییر وه سـەردا بـەزیی
خانـێ خانـان جـەجو خـانو
سـەردار جـانو جـەجو خـانو
لـه دلـێ تـه مـا ئـەرمانو
وەلیخانـێ قـەرەمانی
وه دوشمـەن را، کـر تـەوانی
مالـک[٣٣٨] لـه کۆرمانجـان دانی

---

[٣٣٨] - مالک:ماڵی چکۆله.

خانــــێ خانـــان جـــەجو خــــانو
خانــــێ خانـــان جـــەجو خــــانو
لـــە دڵـــی تـــە مـــا ئـــەرمانو
شـــەونەوارە لەتەکـــەت کـــاریوو
بـــێ کـــەس جـــانو، جـــەجو خـــان
ئـــــەبوو تـــــالۆی بیچـــــەریی
چـــــیوە دڵـــــووە چیگـــــەریی

جـــەجوو خـــان کـــەت کوداتـــەریی؟
خانــــێ خانـــان، جـــەجو خــــانو
جـــە ســـپێ جـــەجێ یـــاڵ قزلـــە
گولـــــە لێکـــــەت ژە سەردڵـــــە
و خـــوین‌دا مـــا زیـــن و جلـــە
ســـەردار جـــانو جـــەجو خـــانو
ئیـی شـەڤ دوشمـەن راهـەت راکـەت
هـەر دوورلـە کورمانجـان نەکـەوت
بەیـــداخ و بـــەختی مەراکـــەت
بـــێ کـــەس جـــانو جـــەجو خـــانو
بـــێ کـــەس جـــانو ســـەردار جـــانو
لـــە دلـــێ تـــە مـــا ئـــەرمانو
ئیـــی شـــەڤ کورمـــانج داغـــدارە
جـــەنازێ تـــە بـــوو هـــاوارە
تـــە روو لـــە مـــەکر ئێـــقارە
خـــانی خانـــان جـــەجو خـــانو
خانـــێ خانـــان جـــەجو خـــانو
ئیـی شـەڤ لـە دوشمـەن میـڤانو
مـــەیتێ تـــە بـــرن شـــەروە شـــەر

گەرانـــدن لـــە چولـــو کەمـــەر
لـــە مـــسکو وەر خەســـتن جیگـــەر
خانـــێ خانـــان جـــەجو خـــانو
قـــەریو جـــانو ســـەردار جـــانو
لـــە دلـــێ تـــە مـــا ئـــەرمانۆ
ژەنویـــان تـــەزە بـــوو داغـــێ مـــە
ئێـــوز[٣٣٩] بـــا تـــا ســـوراخێ خـــانو
جـــەنازێ تـــە بەیـــداغی مـــە
خانـــێ خانـــان جـــەجو خـــانو
خانـــێ خانـــان جـــەجو خـــانو
دوشمـــــەن ژەتـــــە هەراســـــانو
لاوێ تـــە نـــاڤ قـــەدەم یـــارە
هـــین خوزانـــە نـــێ یـــە کـــارە
کەتیـــــــە ڕش و داغـــــــدارە
چـــاڤ ڕەش جـــانو جـــەجو خـــانو

## گوللەباران کردنی کوڕی جەجووخان بە دەستی ڕووسەکان لە خەرمانانی ١٣٢٠

کوژرانی سەرداری خاوەران بە دەستی ڕووسە تیزاریـەکان و بـێڕێزییـەک کـە کردیانە لەش ئەو و دڵ و جەرگیان لـە کۆشـکی چەوسێنەرانی ڕووس دەست بـە دەست کرد، بووە هۆی خەمباری و بێزار بوونی زۆرتری خەڵک لە هێزەکانی ڕووس. ئەو بڕیاریاندا بۆ تۆڵەسەندنەوە و بەرپەرچدانەوەی تونـد. بـە جۆرێـک کـە دوای ئـەو ڕووداوە ساڵەکانی دی کوردەکان دەچوون بۆ سـەر سـنوور و بـە بینـینی سـەرباز و ئەفسەرانی ڕووس ئەوانیان دەکوشت.

لە سنوورەکانی بیچوانلوو و باژگیران و دەرەگەز ئەم تۆڵەسەندنە بەردەوام بـوو.

---

٣٣٩- مەبەست سەردارئێوەزی قارەمانە

چەکی کوردان زۆرتر برنۆ و پێنج تیر بوو.[٣٤٠] بەم جۆرە ژمارەیەکی زۆر لە ڕووسەکان لە هەرێمی سنووری لە تۆڵەسەندنەوەی خوێنی جەجوو کوژران. کوردەکانی بیچرانلوو بە تایبەت ئەبووتالب بەگ کە هاوخەباتی جەجوو بوو لەم کارە تا ئاستی زێدەڕەوی پێش‌چوو و دۆخێک هاتە پێشەوە کە لە سەردەمی ڕەزاشادا دەترسان لەوەی کە سەردانی هێڵی سنووری بکەن. کاتێک ئەفسەرێکی پایەبەرزی ڕووس خەریکی سەردان بوو لە لایەن کوردێکی بیچرانلوو لە نێوی ئۆتومۆبیلەکەیدا پێکرا و سەری لێک هەڵوەشایەوە. شۆفێری ئۆتومبیلەکە لە ترسی گیانی خۆیدا نەیتوانی ئۆتومبیلەکە ڕابگرێت و کەوتە نێو دۆڵەوە و ئاگری تێبەر بوو. دوای کوژرانی ڕووسەکان بە دەستی کوردەکانەوە چەک و فیشەک و تەقەمەنیەکانیان ئەهێنا بۆ نێو عەشیرەت.

بە ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕووسەکان لەگەڵ ئاوەها گرفتێکی ڕوو لە زیاد بوودا، هەوڵیان‌دا کە سەر مار بە دەستی مارگیر پان بکەنەوە. بۆ ئەم مەبەستەش پلانێک داڕێژرا و وتووێژ لەگەڵ فەرەجوڵڵاخان بیچوانلوو ئەنجام‌درا و سەرپشکی گەلێک درا بەو عەشیرەتە و وەکوو دەوڵەتێکی خودموختار لەگەڵیان هەڵسووکەوت دەکرا. بازرگانیش بە شێوەی ڕشت بوو و قەن و چای و نەوت و دەفری چینی و چەرخی دروومان و گرامافۆن و سەماوەری سەردەی نیکۆلای دەدرا بە سەرحەدیەکان و کشمیش و ئارد و گەنم و شتگەلێک‌تریان لێیان دەکڕی. کوردانیش تا زستانی ١٣٢٣ دەچوون بۆ ڕووسیە و لە نزیک عیشق‌ئاباد جێگیر دەبوون و مەڕ و ماڵاتەکانیان دەبرد بۆ لەوەڕگەکانی ئەوێ و بازرگانیشیان دەکرد. بە جۆرێک کە چەرخی شیر کە هێشتا کە لە شوێنەکانی دیکەی ئێران بە نەناسراوی مابووەوە لەم

[٣٤٠]- لە بابەتی جل‌وبەرگی جەجوو و سوارەکانی، ئاغای نادری عالەمی لاینی لە سەرزاری باوکی حەیدەرقولی مەرکان کە تەمەنی ١٢٠ ساڵ دەیگوت: جەجوو جبەیەکی سووری لەبەر کرد. بڕێ کات جامانەی کوردی بە سەر دەبەستەوە و بڕێ کاس کولاوی پێسینی ڕەشی وەکوو شەپورمە زۆر کات چەکمەی لە پێ دەکرد و جارجاریش چاروخ و پاتاوە. پاڵتاوەکەی چۆخە بوو. سوارەکانیشی وەکوو خۆی بوون. ئەسپی جەجوو کە هاتبوو بۆ کێرناوەلاین سپی بوو، چەکیشیان مازوور و پێنج تیری ڕووسی بوو. دوو قەتاری فیشەک و حەمایلێکی چەرمی عێراقیشیان بوو.

ڕێگەوە لە ڕووسیە دەیان‌هاورد بۆ خوراسان.[٣٤١]

بەردەوام بوونی خودموختاری بیچرانلـوو، ڕەزاشـا و دەوڵـەتی ناوەنـدی خـستە هەراسەوە کـە دەرئەنجامەکـەی دەسـتگیر کـردن و بەنـدکردنی عـەلیخان بـەگی بیچرانلـوو و فەرەجولـڵاخان بـوو. دوای شـەش سـاڵ زینـدان لـە کـاتی ئازادیـدا فەرەجوڵڵاخان دوور خرایەوە بۆ گوڵپایەگانلە باشووری ئێران کـە ئـەم بەنـد و دوور خستنەوە تا خەرمانانی ١٣٢٠ و داگـیر کـردنی ئێـران لەلایـەن ڕووس و بریتانیـاوە بەردەوام بوو کە لـە بـەرگی پێنجەمـدا ئاماژەیـان پـێ‌دەکرێـت. بـۆ خـوێن خـۆیی جەجووخان لە ناوچەی کەلات و دەگەز کوردەکان خەسارێکی زۆریان لە سـەربازانی ڕووس‌دا بە تایبەت قەدەمیار کوڕی جەجووخان ڕۆژانە دەڕۆیشت بـۆ سـەر سـنوور و بۆسەی بۆ سەربازانی ڕووس دادەنا و ئەوانی دەکوشـت و چـەک و گوللـەکانیانی بـە نرخێکی کەم بە خەڵک دەفرۆشت و لەم ڕێگاوە بژێوی ژیای خۆی دابین دەکرد کـە هەم بووە کاری و هەم تۆڵەی خوێنی باوکی دەکردەوە. سـەرئەنجام دوای چەنـدین ساڵ بریندار بوونی ڕووس شەوی پێنجـەمی خـەرمانانی ١٣٢٠ دووبـارە ئـەو هێـزە داگیرکەرانە هێرشیان کردە سەر هەموو سنوورەکانی بـاکوور و بـاکووری ڕۆژهـەڵات بە ژێر پێ نانی بێ‌لایەنی ئێران لە شەڕی دووهەمی جیهـانی وڵاتیـان داگـیر کـرد. یەکەمین هێزی چەکدار کە هەرێمی دەرگەز هاتە نێـوی وڵات ڕاسـپێردرابوون کـە کوڕی جەجووخان دەستبەسەر بکەن. ئاغای بانکری باجگیرانی کە لە کـوردە پیـاو چاکانی کومکیلانلوو و لە شارەزایانی مێژووی ئێران و جیهـان و دانیـشتووی شـاری مەشهەد کە لە ساڵی ١٣٦٥ کۆچی دوایی کرد. دەیگوت کە دەستگیر کردنی کوڕی جەجووی بینیوە. لە شەوی پێنجەمی خەرمانان کاتێک ڕووسەکان هاتنە نێو شـاری دەگەز بەر لە هەر کارێک کوڕی جەجوویان دەستگیر کرد و دووریـان خـستەوە بـۆ ڕووسیە کە لەوێدا بە دەستی چەکمەپۆشانی ستالین بە بێ‌دادگایی کردن گولـەباران کرا. بە گوتەی نزامی گەنجەوی:

---

[٣٤١]- چۆنیەتی کوشتاری ١٢٠ سەربازی ڕووس لە (کۆڕی لـووچی) لـە زنجـیرە کێـوی گولیـل بـە دەستی نەفەر [خوالێخۆشبوو فەرەجوڵڵاخان، ڕوستەم ئاغا، جەبار قـولی شـا حوسـەین و ئـەبووتالب بەگ] لە ساڵی ١٣١١ ی هەتاوی لە سەر ئەم بابەتە لە بەرگی پێنجەم باسێکی تێر و تەسەل کراوە.

ز روسی نجوید کسی مردمی
که جز صورتی نیستشان آدمی

کەس لە ڕووس مرۆڤایەتی نەبینیوە، بە غەیر لە ڕوخساریان هیچ نیشانێکی ئینسانیان پێوە نیە.

ئەو خوالێخۆشبووە دەیگوت قۆڵبەستکردنی قەدەم یار لە کاتی شەودا و لە گوندی سنووری حەسار ئەنجامدرا. قەدەمیار بە بیستنی هێرشی ڕووسەکان خۆی لە ژێر دڕووەگەلێک کە بۆ دڕووخانە کۆ کرابوو خۆی شاردەوە، سەرباز و ئەفسەرانی ڕووس هەرچی گەڕان نەیاندۆزیەوەو تەنانەت بە شەنیش دڕووەکانیان لێکدا و لەشی بریندار بوو بەڵام دەنگی دەرنەهات، بەم جۆرە وایانزانی کە گوزارشەکە درۆبووە. دەیانەویست بڕۆن بەڵام پاسەوانی سنوورەکە کە بە پرۆژۆکتۆر خۆشاردنەوەی قەدەمیاری بینیبوو لەسەر ڕای خۆ وەستا و تەئکیدی کرد کە ئەو لە ژێر دڕووەکان خۆی شاردۆتەوە. ئەمجارە ئاگر بەر ئەدەن لە دڕووەکان و لە ئەنجامدا قەدەمیار بە سەر و ڕوخساری سووتاویەوە دەهێننە دەر و بە بێ چارە پزشکی و پانسمان و بە پێچەوانەی بنەماکانی ئەخلاقی و مرۆڤایەتی بە دەست و پای بەستراو و بە جیپی ڕووسی و چەند پاسەوانێک دەیبەن بۆ ڕووسیە و ئەم ڕۆلە بەرەو قارەمانی خاوەران بە بێدادگایی کردن گولەباران دەکەن و تۆڵەی خۆیان لێدەکەنەوە. لعنت‌الله علی المتجاوزین

## فەرمانێک لە لایەن عەبدوڕەزاخان شوجاعودەوڵە بۆ موحەممەد ئیبراهیم خان حاکمی شیروان بۆ تەیارکردنی سپا و ڕۆیشتنیان بۆ ئەستەرئاباد.

لەم فەرمانە وا دەردەکەوێت کە تورکمانەکان لەو سەردەمە هێرش و کوشتار و تالانکردنیان لە ناوچەی گورگان و ڕەشت گەیاندبووە ئەوپەڕی خۆی کە دەوڵەت ناچار بوو جارێکی دی وەکوو سەردەمی ئەمیرحوسەین خان لە کاتی حوکمڕانی

سپاسالاری[٣٤٢]، لە هێزی کوردان بۆ سەرکوتکردنی سەر بزێوی ئەوان کەڵک وەربگرن. بەشێک لەم سەنەدە بە قەڵەمی خودی عەبدوڕەزاخان شوجاعودەوڵەیە.

ئارم: شێروخۆر

ئیالەتی خوراسان و سیستان. ولایەتی قووچان- ژمارەی ٦٥٥ بەروار ٧ ڕەزبەر[٣٤٣]

بە پێی فەرمانی دەوڵەتی پایەبەرز بڕیار دراوە کە سوارانی زەعفەرانلوو بە شێوەیەکی تەواو پڕچەک بکرێن و بە ئابووڕەمەنی‌یەک مانگە بەرەو ئەستەرئاباد بە ڕێ بکرێن. بۆ ئاگاداریتان فەرمان ئەدەین کە هەموو سواران و شەمخاڵچیانی باشوور ولات[٣٤٤] بنێرن و هەر سوارێک ئەسپ یان یەراقی بە کەڵک نایەت دابین بکرێت، وەکوو پێشوو نیە کە کەسێک لە ئەنجامی کاردایان لە بابەتی ئەسپ و چەک و باقی پێداویستیەکان کەمتەرخەمیان کردبایە و سستیان بنواندبایە دەبەخشران.[٣٤٥]

ئەمجارە هەرکەس درەنگ بجوولێ یان ئەسپ و چەکی خراپ و ناتەواو بێت بە توندی سزا دەدرێت هەرکەس تفەنگەکەی تاپڕ بێ[٣٤٦] یان ئەسپ و ئەسبابی خۆی بێ مووچەو بەراتی زۆرتری پێ ئەدرێت و خەلات دەکرێت. ئەڵبەت لە زۆرترین کاتدا هەموو سوار و شەمخاڵچیەکان[٣٤٧] بە شێوەیەکی تەواو پڕچەک دەکەین.

هەروەها گوێ نادەین کەسێک پاساو بهێنێت کە ئەم بۆ گرتنیماڵیات

---

[٣٤٢]- مەبەست میرزا حسێن‌خان سپاسالار بنیاتنەری مزگەوتی گەورەی سپاسالاری تاران. لە ساڵی ١٢٧٨ بۆ سەرکوتکردنی تورکمانگەلێ یەمووت بۆ ئەستەرئاباد سپای هێنا کە ئەمیرحسێن خان شوجاعودەولە و حەیدەرقولی خان سەهامودەولە بە فەرمانداری کوردان زەعفەرانلوو و شادلوو لە خوراسان ڕاسپێردران کە لە ئەسترئابادا تەولی ببن. کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان بەرگی ٢ لاپەڕەی ٤١١ نووسراوی نووسەر و بیرەوەریەکان و سەندەکانی حسێنقولی‌خان نیزاموسەڵتەنە مافی بەشی یەکەم بە هەولی مەنسوورە ئیتحادیە نیزام مانی، ل ٢٩٨.

[٣٤٣]- بەرواری ساڵ نەنووسراوە.

[٣٤٤]- قووچان دەبووە سێ بەشەوە باکووری ولات، نێوانی ولات، باشووری ولات.

[٣٤٥]- هەر ئەم کەمتەرخەمی و گوێ پێنەدانە لە سپاردا بوو کە بووە هۆی سستی و لاوازی و لە نێوچوونی شوجاعودەولە.

[٣٤٦]- جۆرێک تفەنگی بارووتی.

[٣٤٧]- شەمخاڵ جۆرێک تفەنگی سەرپڕی درێژە کە لە برنۆ درێژترە و لە سەردەمی سەفەری بەتایبەت لە سپای ئێران بە کار ئەبرا.

ڕۆیشتووە یان ئەو شوێن ڕاسپاردەیی. گەر کەسێک ئاوەها بێت بە شێوەیەکی توند سزا ئەدرێت لە سەرۆک خێڵەکان یەکسەد تمەن جەریمە دەسێندرێت و ئەوەی کە ئالەقاشی[٣٤٨] چە لە سەردەمی خوالێخۆشبوو ئەمیر شوجاعودەولە و موحەممەدناسرخان شوجاعودەولە گرتووە یا هەر ئێستا گرتوویەتی لەگەڵ خۆیان بیهێنن، ئەگەر ناتەواو بێت بە شێوەیەکی توند سزا ئەدرێن. (شوجاعودەولە- مۆر)

هەروەها لە پەراوێزی لای چەپی بەڵگە لە نێوان ڕستەکانی ئەوەڵ و دووەم شوجاعودەولە بە خەتی خۆی زیادی کردووە کە:

حاکمی شیروان:

فەرمان ئەدەین سوارانی زەعفەرانلوو و شادلوو بە فەرمانداری سەردار سەعید[٣٤٩] بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئاژاوەگێڕانی یەمووت بە ڕێ بکەون. ئەڵبەت خۆتان سان ببینن و گەر کەمیەک بوو، دابینی بکەن و هەر سوارێک پیر بووە لابنرێت. هەر ئەسپێکیش خراپ بوو وەلا بنرێت و بگۆڕدرێت تا ١٥ی شەواڵ بە بێ یەک کەس کەمی بیان نێرن، بە جۆرێک نەبێت کە لە بەرانبەر هێزگەلێک کە لە باتی شوێنەکانە دێن، کەم بهێنن. (مۆری شوجاعودەولە[٣٥٠])

## فەرمانێک لە عەبلوڕەزاخان شوجاعودەولە بۆ وەلیخان قارەمانلوو

وەلیخان قەهرەمانلوو ئیبلەگی کرمانجی قەرەمانلوو، یەکێک لە ئازاترین و تواناترین سەرۆکەکانی کوردی خوراسانە، ئەو کوڕی ئیراهیم بەگی قارەمانلووە، باوکی لەلایەن وەلیخانی ئەمیر بادلانلوو باوکی تاج موحەممەدخان لە گەرماب سەربڕا. وەلیخان قارەمانلوو لە دابین کردنی ئاسایش خوراسان لە ئاژاوە گێڕان و چەتەگەری تورکمانەکان ڕۆڵێکی بەرچاو و چالاکی بوو کە لە داهاتوودا لەگەڵ کەسایەتی و تایبەتمەندی ئەخلاقی و ژیانی زۆرتر ئاشنا دەبین. بۆ ئەوەی کە وا

---

[٣٤٨]- الاتیش ابەری زین، چەرمی بوو کە گولێکی یان زێڕی لەسەری بوو بە کوردی «الەقاش» پێدەڵێن بە وتورکی الاقیش.

[٣٤٩]- سەردار سەعید، نەناسراو.

[٣٥٠]- پشتی بەڵگە کە سێ مۆری «نووسینگەی لەشکەری قووچان و دەرگەز» ژمارە ٢٣٤ و مۆری «موشیردیوان» و مۆری «عەبدولعەلی» لێیە.

دانراوە کە سەنەدەکان بە پێ کاتی دەرچوون پۆلبەندی بکرێن، بەم بۆنەش چەند سەنەدێک لەو کەسایەتیە لەم بەرگەدا دەهێنین.

دەستنووسێکە لە عەبدوڕەزاخان شوجاعودەولـە سەرۆکی ئیلی زەعفەرانلوو حاکمی قووچان بۆ وەلیخان، کە ئیفتیخار و زاکرین کە بە وتەی عەبدوڕەزاخان نزولی و ئاژاوەگێڕی کرد و هەناردی بۆ لای تا بەندی بکات.

٣٠ ڕەبیعولئەوەڵ ١٣٣٦ (١٢٩٦) مۆری موعتەمیدسولتان وەلیخان سەرۆکی تایفەی قەهرەمانلوو، ئیفتیخاروزاکرین کە وەک کەسێکی بێئەخلاق ناسراوە چەند ڕۆژێکە لە نێو شاردا فزوولی و ئاژاوەگێڕی و نامەبازی دەکات، بە پێپێویست سزا دراوە و ئەدەب کراوە، ئێستاش بە دوو سوار هەناردوومە بۆ لای ئێوە تا بەندی بکەن. ئاگادار بن کە هەڵنەیت و لەگەڵ کەس پێوەندی نەبێت.[٣٥١]

## فەرمانی وەلیخان- ژمارە ٨٩

عەشیرەتی قەرامانلوو نیشتەجێ کێوی شاهیجانە کە لە باشووری ڕۆژئاوای قووچاندایە لە نێوان فارووج و ئەسفەراین و لەم گوندانەن: ئاق چشمە، قەرە چشمە، چورگخانە، زاوقرامانلوو، گەرماب، زینکانلوو، ئارمۆدئاقاجی، مێرتکانلوو، قەرخ قووڵ، قەلعە حەسەن، (قەلعە حەسەنیەکان شرانلوون)، هەشت مەرخ، قەرە جەقە، کواکی، سوگتلی، ڕیزە کەلاتەشامیر، دالنجان کوردیە، باخ مەحەلە (کە کورد و تورکن)، قەرەگول، پەرکارە ژمارەیەکیشیان کۆچیان کردووە گوندی وەرک. ژیانی ٣٠٠ بنەماڵەی قەرامانلوو و شێوەی ڕەوەندیە.

---

[٣٥١]- لە بەرگەکانی یەکەم و دووهەمدا ناومان برد لە سەرۆکە ناودارەکانی کوردانی قەرامانلوو کە لە سەردەمی سەفەویدا خزمەتگەلێکی بەرچاویان عەبدوڕەزا زەعفەرانلوو کرد و گەیشتنە پلەی فەرمانداری گشتی سپای ئێران، کە گرینگترینیان، بیرام بەیک قەرەمانلوو والی خوراسان کە لە داو و سەڵتەنەی بەلخدا بوو و لە شەڕ دەگەڵ ئوزبەکان بە هۆی ئازایەتی و نەترسی لە ڕادە بە دەر کوژرا و کوشتنی بووە هۆی شکست هێنانی سپای ئێران. فەرهادخان و زولفەقارخانیش لە ئەمیرانی قەرامانلوو بوون کە گرتنی خوراسان لە سەردەمی شاعەبباس بە هۆی هێز و کۆشش ئەوان بوو. بۆ ئەوەی کە شوێنی ئەسڵی عەشیرەتەکە لە خاکی باکووری کوردستادا و لە ناوچەی قەوامان، بەم بۆنەوە ناسراوە بە قەرامانلوو واتا دانیشتوانی قەرامان، وەلیخان ئەم ناوەی بە قەهرەمانلوو گۆڕا. هەر ئەو جۆرەی کە تاج موحەممەدخان سەرۆکی هۆزی بادلوو (بادلان) ناوی هۆزەکەی گۆڕا بە بەهادوورانلوو.

## فەرمانێکی تر پێوەندیدار بە وەلیخان قەرامانلوو

ئارم: دەوڵەتی عالیەی ئێران- شێروخۆر
حاکمی گشتی ئیالەتی خوراسان و سیستان
ژمارە ٩٧١٣ بە رواری ١٦ بەفرانباری ١٢٩٩

بەو هۆیەی کە لیاقەت و لێهاتوویی و خزمەتگوزاری وەلیخان قەهرەمانلوو لامان سەلماوە لەم فەرمانە بە شانازییەوە ناوی بەهادۆر دیوانی[٣٥٢] پێئەدەین و هیوادارین ئەم مەرحەمەتی دەوڵەتە ببێتە هۆی خزمەتگوزاری و گیانفیدای زۆرتری ئەو بۆ دەوڵەت. (ئیمزا و مۆری حاکمی گشتی ئیالەتی خوراسان و سیستان)

## بەڵگەلێک لە فەرهادخان تۆپکانلوو و ڕۆڵی ئەو لە مێژووی قووچان

لە بەرگی دووهەمی کتێب، لەزاری ئاغای حەسەن سادقی چەکنی شتگەلێک لەسەر فەرهادخان ئیلبەگی توپکانلوو ئاماژەی پێکرا کە گوایە فەرهادخان مالیاتی توپکانلووی دەسەند و هیچی بە دەوڵەتی ڕەزاشا نەئەدا. لەم پێوەندیە ئاغای سوهراب فەرهادی توپکانلوو بە نامەیەک کە سەنەدێکیش پێوەست بوو گوتوویانە: ڕاستە فەرهادخان لەگەڵ دەوڵەتدا ناسازگار بوو و چەندین جار تا ساڵی ١٣١٥ شەڕی لەگەڵ سەربازانی ڕژیمدا کردووە. بەڵام بە پێ ئەم سەنەدە خەراجی داوە بە دەوڵەت.

لەم سەنەدە کە دەیبینن ئارمی شێروخۆر کە نیشانی دەوڵەتی ئێرانە لەسەر نیە و بە دوو زمانی فارسی و ئینگلیزی نووسراوە.

دەوڵەتی عالیەی ئێران- مۆری خەزێنەداری گشتی- پشکێندرا- ١٣٠٥

---

[٣٥٢]- بەهادۆر واتا بوێر و ئازا و نەترس، دیوان واتا دەوڵەت، بەهادۆر دیوان واتا شیری دەوڵەت، بەهادۆردەولە مانای شوجاعودەولە دەگەیێت.

ئەسڵی ئەم سەنەدە لەمەزرێنگەی ئەسناد و ئاماری شاری قووچان بوو ئەندازەی بەرگەی ئەسڵی ٢١× ٣٥ سانتیمەترە کە ساڵی ١٣٥٦ بە یارمەتی دوکتور بەزین‌نژاد کۆپییەکم لێ گرت، ناوبراو ئەو کات لە بێهداری قووچاندا بوو و مەزرینگەی ئەسناد لەوێ بوو.

والی و حاکمی گشتی خوراسان و سیستان میرزا ئەحمەدخان قەواموسەڵتەنە.

ڕەسیدی نەقدی فەرمی ژمارە ٥٣٠٢٣ وەزارەتی مالیە- مەزرێنگەی مالیە- (توپکانلوو)

ئیالەتی خوراسان- ولایەتی قووچان- ناحیەی فاروج

قەرزی فەرهادخان و مندالەکانی- (سال) ١٣٠٩- جۆری مالیات، گەلە.

ڕاقە:

لە بابەتی خەراجی ١٣٠٩ هەشتسەد سەر مەڕ بە بایی: ٤٤٠ قەران

لە بابەتی خەراجی ١٣٠٩ بیست نەفەر وشتر بە بایی: ١١٠ قەران

کۆی گشتی: ٥٥٠ قەران. لەگەل ١١ قەران (معارف)

کۆی گشتی: ٥٦١ قەران

بەرواری ٦ پووشپەڕی ١٣٠٩ گەواهی ڕاستی لە سەریان ئەدەم بە کۆی گشتی ٥٦١ قەران. (ئیمزا سەرۆکی مالیەی فارووج)

ئەمنیش وەکوو نووسەر لە سەر ڕای سادقی و سوهراب فەرهادیم، بۆ ئەوەی کە دەتوانین بلێین کە هەم خەراجی داوە، هەم نەیداوە لە سەنەدی ئاماژە پێکراو، ژمارەی مەڕەکانی ٨٠٠ سەر وتراوە لە حالێکدا کە ژمارەی ڕاستەقینە کەمتر لە ١٠٠٠٠ سەر نەبووە، وشتریش نزیک ٣٠٠ نەفەر بووە و ژمارەی ئەسپ و قاتر و ولاخ ئاماژەی پێنەکراوە لە حالێکدا کە فەرهادخان نزیک ٦٠٠ سواری ئامادەی شەڕی بووە .کەوایە دەتوانین بلێین کە لە دانی خەراجدا فەرهادخان فێلی کردووە وەکوو باقی خەراجدەران. تەنانەت لە لای عەبدوڕەزاخان شوجاعودەولە بەم جۆرە ڕەفتاری دەکرد و کاتێک کە سوارەکانی عەشیرەتەکان بۆسان و ڕێژە لە قووچاند دەڕۆیشتنە moوزەی ئیلخانی زەعفەرانلوو. فەرهادخان تەنیا ٣٠ تا ٤٠ سواری لەگەڵ خۆی دەبرد و هەزار پاساوی دەهێنایەوە کە توانا و هێزیان هەر ئەمەیە باقی‌یان پێلاویان نیە یان چەک و تەقەمەنی، بۆ ئەوەیکە خۆی و عەشیرەتەکەی بچووکتر پێشان‌بدات و خەراج نەداتە شوجاعودەولە بەلگەیەکیتر کە ئاغای فەرهادی بۆمانی ناردووە کە ئەو خەراجەی کە فەرهادخان بۆ ملکی حسێن‌ئابادی نەیشابوور لە ی گەلاوێژی ١٣٠٩ بە بایی ٢٤٠ قەران مالیات و ٥ قەران «معارف» کە سەرجەم دەبێتە ٢٤٥ قەران و دیارە ئەمەش لەبەرانبەر سامانی فەرهادخان هیچ نیە.

بینەوە سەر تایبەتمەندیەکان و ڕەفتاری فەرهادخان توپکانلوو. توویان واتا توویەکان کە ناسراون بە تووپکانلوو. بەڵام خودی کرمانجی خوراسان بە تووپان یان تووپی بانگیان دەکەن و دەڵێن فەرهادخان تووپی.

عەشیرەتی تووپکانلوو یەکێک لە گەورەترین عەشیرەتەکانی کورمانجی خوراسانە کە لە هەموو خوراساندا بڵاو بوونەتەوە، زۆرێک لە ڕەوەندەکانی ئەمڕۆژیش تووپکانلوون لە ڕووبەری قەڵەمڕەوی ئەوان پارێزگای خوراسان تێدەپەڕێ، بەشێکیان لە هەرێمەکانی باشووری ڕۆژئاوای سەندەوار دەپەڕنەوە و لە زستان لە ڕێگەی داوەزەن دەگەنە سەحرای باشووری شاهرووود و دامغان، تاقمێکیان لەگەڵ ڕەوەندەکان لە سنوورەکانی ڕۆژئاوای خوراسان دەگوزەرن بە پارێزگای مازەندەران تا پاسگای چات دەڕۆنە پێشەوە. دەستەیەکی دی بەرەو خۆرهەڵاتی خوراسان بە لای سەرەخس دەڕۆن و دەگەنە نزیکی چەکوو لە واقدەربەند کە زۆر نزیکە بە سنووری رووسییەوە. ئەوانەش کە نیشتەجێ بوون لە شارەکانی قووچان، سەبزەوار، نەیشابوور و مەشهەد و شیروان و دەرگەز و بجنوورد و ئەسفەراین بڵاو بوونەتەوە. بەڵام زۆرترینیان لە ناحیەیەک لە باکووری خۆرهەڵاتی سەبزەوار و باکووری ڕۆژئاوای نەیشابوور و باشووری ڕۆژئاوای قووچان دان لەوەرگەی هاوینەیان هەر لەم ناوچە و لە کێوەکانی کلیدرو موحەممەد بەیگە. کەلمیشیەکانیش لە باکووری خۆرهەڵاتی سەبزەوار لە دەوروبەری توپلکانلووی کە نیشتەجێ گوندەکانی سەبرئاوا و سووزەن دێ و کەلاتەشۆر و ڕەحمەت ئاوان. هەر بۆ ئەمەش نووسەر تووشیاری هەڵە بوو و ئەوانی لقێک لە توپکانلوو ناساندووە.

کتێبی دەبەرگی کلیدری مەحموود دەوڵەتئابادی لەسەر ئەم کوردانەی کەلمیشیە کە پاڵەوانی چیرۆک گوڵ موحەممەدە کە لە دەوروبەری ساڵی ۱۳۳۸ هەتاوی لە شەڕێکی دەگەڵ سەربازانی ڕژیمدا کوژرا. باسی ڕاپەڕینی گوڵ موحەممەد لە بەرگی پێنجەم دەهێنم، تەنها ئەمە ئەڵێم کە چۆن ئاغای دەوڵەتئابادی لەسەر ناوی برایانی کەلمیشی لە هەڵەدا بووە و لە بەرگی دەیەمی کلیدر نووسیبوویان سەبرخان شوانی کەلمیشی لە حاڵێکدا کە ناخۆش بووبوو بە دەستی جەهان بەلووچ و ژاندارمەکانەوە کوژرا.

بەڵام لە هاوینی ئەمساڵ (۱۳٦٥) ئاگادار بوومەوە کە سەبرخان زیندووە، بە

گرفتێکی زۆرەوە بۆ دیتنی حاجی سەبرخان ڕۆیشتم بۆ سەبرئاوا کە لەلایەن خـۆی و عەشیرەت و بنەماڵەکەیەوە لـە بـاکووری ڕێگـای شـەمەندەفەری تـاران- مەشـهەد بنیات نرا بوو. خۆشحاڵی خۆمم بۆ دیتنی ئەو دەبڕی، ئەویش ئاماژەی بە هەڵـەکەی دەوڵەتئابـادی لـە کلیـدر کـرد کـە ئـەو و براکـەیی پێکـەوە بەهەڵـە گرتبـوو. لـە توێژینەوەکان ڕوون بووەتەوە کە کەلمیـشیەکان، توپکـانلوو نـین و لـە عەشـیرەتی میلانلوون کە نیـشتەجێ بوونـەو و دەسـتەیەکی تـر هێـشتا کـە دەوەنـدن و قـسە کردنیان لەگەڵ کرمانجی خوراسـان جیاوازیـان نیـە. دووبـارە لـە باسـەکەمان دوور کەوتینەوە، بڕۆینە سەر بابەتی سەرەکی «فەرهادخان یەکێک لە حاکمانی ئازا و بوێر و دوورەنواڕی خوراسان بوو. خالی لاوازی زۆر کەم و ئاکار و هەڵسووکەوتێکی باشی لەگەڵ خەڵـکدا بـووە و دژی شـیوعی وتوودەییـەکان. هـەر بـەم بۆنـەش کاتێـک توودەییەکان ئاژاوەیەکیان لە دەرگەز نایەوە خەڵک هانایان بۆ ئەو بـرد و ئـەویش بـە هەناردنی سوارەکانی ئاژاوە گێڕەکانی سەرکوت کرد و دۆخەکەی هێور کردەوە. ئەو لایەنگری مەشرووتە بـووە و ڕەسمێکیـشی لەگـەڵ سـەتارخان سـەرداری میللـی و باقرخان سالاری میللی هەیە. ئەم ڕەسمە ئێـستا لـە دەرەوەی ولاتدایـە و لەلایـەن نەوەکانی فەرهادخان لە نێو بوخچەیەکدا دۆزراوەتـەوە کـە لـە پـشتی ڕەسمەکـەدا نووسراوە: ئیلبەگی خـان فـەرهادخانی توپکـانلوو، ئـەو جـۆرە کـە لـە ڕەسمەکـەدا دەردەکەوێ فەرهادخان بە ڕواڵەتێکی بـە شـکۆ و جـوان و بـە ڕیـشێکی ڕەش کـە هەیبەتی زۆرتر کردووە لە نێواندا لە سەر کورسی دانیشتووە و چەکێکی بـڵندی لـە سەری ڕانیدایە. لەلای ڕاستەوە سەتارخان و لەلای چەپیشەوە باقرخان بـە چەکـەوە دەبینرێن. ئەو سێ کەسەی کە چەک بە دەست لە پشتەوە وەستاون ڕوون بووتـەوە کە خزمەتکاری فەرهادخان بوونە.

**ناوەکان ئەمانەن:**

١. پەیغمبەر قولی کرکانلوو کـە پاڵـەوانی بـەناوبانی فـەرهادخان بـووە و تـەنیا کەسێک بووە کە توانیویەتی پـشتی موحەممـەدباقر پاڵـەوانی خاخیـانلوو پاڵـەوانی ناوداری قووچان لە خاک بدات. لـەم کێبەرکێـەدا کاتێـک ئـەم پاڵـەوانە تـەنگ بـە موحەممەد باقر پاڵەوان هەڵدەچنێ کە حاڵێکدا کـە موحەممـەدباقر بـە دەسـتێکی درەختێکی گرتبـوو تـا پەیغەمبـەر قـولی لـە زەوی نەیبـڕێ، بـەڵام ئـەو توانبـووی

موحەممەدباقر لە زەوی ببڕێ و درەختەکەش کە موحەممەدباقر ناوقەدی بەرنەدابوو شکابوو، هەروەها لە تیرئەندازی کەسێکی لیهاتوو بووە.

۲. موحەممەدڕەحیم خزمەتکاری فەرهادخان ناسراو بە ڕکوو. ۳. ئیراهیم توپکانبوو ناسراو بە ئیدو.

دوو کەسی دیکە بە نەناسراوی ماونەتەوە، بە بڕوای نووسەر کەسێ دەستی ڕاست کە کڵاوێکی تورکمەنی لەسەرە، وێدەچێ کە لە کوردەکانی خوراسان بووبێ کە ئەو کاتە بە کارهێنانی ئەم کڵاوانە لە نێو کورداندا باو بووە.

ڕوون نیە ئەم ڕەسمە لە کوێ گیراوە، منداڵەکانی فەرهادخان ئەڵێن سەتارخان و باقرخان پێش ئاشکراکردنی شۆڕشەکەیان سەردانی کەربەلایان کردبوو و نامەگەلێکیان بۆ مەلاکانی ئێران و سەرۆک هۆزەکان هێنابوو تا ئەوانیش هان بدات بۆ هەنگاونان و شۆڕشی مەشرووتە و دەستپێکردنی ئەم بزاوە. بۆ ئەم مەبەستەش دوو سەردار سەردانی قووچانیان کردبوو بۆ ئەوەی کە ڕای ئەوان بۆ لای بیری مەشرووتە ڕابکێشن و چۆن لە عەبدوڕەزاخان شوجاعودەولە دڵنیا نەبوون بۆ یارمەتیدانیان.

لە کێوی موحەممەدبەگ لە باشووری ڕۆژهەلاتی قووچان چەند ڕۆژ میوانی فەرهادخان بوون و ئەم ڕەسمەش وێدەچی لە نەیشابوور یان سەبزەوار گیراوە. هەر جۆرێک بێت فەرهادخان بەڵێن ئەدات لە خوراسانەوە بەرەو پایتەخت بکەونە ڕێ و گەمارۆی شار بدەن و موحەممەدعەلی شا لە تەختی شاهی بێننە خوار. بەلام ئەم کارە ئەنجام نەگیرا، دەڵێن فەرهادخان دوای ڕۆیشتنی سەردارانی میللی ئەم بابەتە دەگەڵ مەلاکانی قووچان باسدەکات و خوازیاری فتوای ئەوان دەبێ. بۆ ئەم کارە بەلام لەبەر پشتگری مەلاکانی قووچان لە شێخ فەزلوڵلا، فەرهادخانیان لە ئەنجامدانی کارێکی وا وشیار کردەوە و دژایەتی ئەم کارەیان کرد. سەرداری میللی سەتارخان هێرشی بردە سەر تاران و مەشرووتەی ڕاگەیاند و کوردانی خوراسان دووبارە لەم کاروانە بە جێ مان.

بەڵام بە باوەڕی نووسەر هیچ شک و گومانێک لە مەشرووتەخوازی فەرهادخان نیە. هەروەهاش کە پێشتر وترا یارمەتی جەجووخانیش داوە. بەشداری نەکردنی کوردانی قووچان لە شەڕ دەگەڵ کولونێل موحەممەدتەقی خان پێسیان کە بووە

هۆی کوژرانی ناوبراو یەکێکیتر لە دوورەنواریەکانی فەرهادخان پێشان ئەدات، کە لە بەڵگە و سەنەدەوە لە بەرگی چوارەمدا ئاماژەی پێکراوە.

لە کاتی ڕوودانی شەڕەکە فەرهادخان و سوارەکانی لە دوورەوە دەیانڕوانیە مەیدانی شەڕ و فەرهادخان ئەم شەڕەی بە خراپەیەک دەزانی کە دۆڕانی هەر لایەنێکی بە زەرەر و زیان بۆ ئێران دەزانی و دەیگوت کە بریتانیاییەکان بۆ ئەوەی کە هێزی نەتەوەیی ئێران لاواز بکەن و دەستنیشانکراوەکانی خۆیان بهێننە سەر حوکم ئەم شەڕەیان داگیرساندووە.

فەرهادخان دوای کوژرانی کولونێل پێسیان گەڕایەوە نەیشابوور و نەڕۆیشت بۆ قووچان. ئەو هیچ کات دانی بە حوکوومەتی ڕەزاشا نەنا و گوێ ڕایەڵی ئەو نەبوو لە ساڵی ١٣٠٥ لە ڕەزاخان سەردانی قووچانی کردبوو، فەرهادخان و وەلیخان قەهرەمانلوو ویستیان دەستگیری بکەن و لە سێدارەی بدەن کە بە ئاشکرابوونی ئەم نهێنیە فەرمانی دەستگیری ئەوان دەرچوو، وەلیخان توانی خۆی ڕزگار بکات و هەڵبێ، بەڵام فەرهادخان دەستگیر کرا و ڕەوانەی بجنوورد کرا تا لە سێدارەی بدەن بەڵام بە خواستی ئیبراهیم خان ڕەوشەنی ئیلخانی زەعفەرانلوو و دیکەی حاکمانی ڕەزاخان ئەوی بەخشی.

دوایی وەلیخان دەستگیر کرا و هەموو سامانی بە غارەت برا و خۆیشی لە زینداندا کوژرا کە لە بەرگەکانی داهاتوو بە تێر و تەسەلی باسدەکرێت. لە فەرهادخان ڕۆڵەگەلێکی ئازا و بوێر وەکوو عەلی موحەممەدخان و ڕەزاخان مانەوە کە لە مێژووی قووچاندا شوێن پێیان دیارە. ڕەسمی فەرهادخان توپکانلوو چەک بە دەست دەبینین، توپکانلووەکان کەسانێکی ئازا و بوێر و جوان پۆشتە بووبوون و میوانداری و ڕەفتاری باشیان بە ناوبانگ بووە.

## بەڵگەگەلێک لە کوردە ڕەشوانلۆوەکان

کوردە ڕەشوانلۆوەکان یەکێک لە هۆزە گەورەکانی زەعفەرانلۆ کە ناوەندیار گوندی حەڵواچاکەو ناوەندی دێهستانی قووشخانە لە باکووری شیروانە. هەر بە جۆرە کە لە بەرگی دووهەمدا شی‌کرایەوە. ڕەشوانلۆوەکانی قەزوێنیش هەر لە

خوراسانەو چوونە ئەوێ. نزیک بەسێ سەد بنەماڵە لە ڕەشوانلۆوەکان کە لەباکووری مەشەد دەژین کە نێوانیان لەگەڵ ڕەشوانلۆوەکانی قووشخانە لە نزیکەی ٢٠٠ کیلۆمەتر ڕێگایە و تەواو لەیەک جیاوە بوونەوە. ئەم چەند گوندەم هەتا ئەو جێگایە کە ناسیوە بریتین لە:

١- ئەمریە ١٧٠ بنەماڵە. ٢- تولغور ١٠٠ بنەماڵە. ٣- دەرمیاوان ٨٠ بنەماڵە. ٤- گەوارشک بنەماڵەی ئاغەی مەحموودی قەشەنگ قارەمانی زۆرانی نەتەوەیی ئێران برای نەمر پاڵەوان غۆلامڕەزای قەشەنگ کە لە پاڵەوانە بە ناوبانگەکانی خوراسان بوو لە هۆزی ڕەشوانلۆوە. ئاغەی مەحموودی قەشەنگ هەنووکە سەرۆکی کۆڕی زۆرانی خوراسانە، بەڵام ڕەشوانلۆوەکانی قووشخانە لە هێڵی سنووری ئێران و ڕووسدا لە شاری قووچاندان و ناوەندیان دێهستانی حەڵواچاوکەیە کە لە ١٦ گوندی ژێرەوە دانیشتەجێن:

١- شەناقی. ٢- سێودی (سێولدی) کە هەر ئەو سوێدانلۆوانە. ٣- حەڵواچاوکە. ٤- زاو (زاب). ٥- تەفتازان (زێدی تەفتازانی زانای بەناوبانگی سەردەمی تەیمووری شەل). ٦- کاکێلی. ٧- ئێزمان. ٨- سنجەقی ژوور. ٩- سەنجەقی خوار. ١٠- قەڵای عەلی موحەممەد. ١١- باخ. ١٢- جێنگە. ١٣- بەرسەلان. ١٤- قولەک. ١٥- حەسار. ١٦- بەرزە لاوا لە ١٥ کیلۆمەتری ڕۆژهەڵاتی شیروان لە تەنیشتی ڕێگای قووچان- شیروان.

هۆز و خێڵەکانی ڕەشوانلۆ هەتا ئەو جێگایە کە بە پێی ئەو بەڵگانەی ئەندازیار کەریمزادەی ڕەشوانلۆ ناساون و چاودێری کراون، بریتین لە: ١- ڕەشوانلۆ. ٢- بەرسەلانلۆ (بەرزانلۆ) ٣- سوێدانلۆ (سێولدی) دانیشتووی جێنگە و پیرشەهید و... ٤- تاریخچی دانیشتووی حەڵواچاوکەل- چۆبیانلۆر یا چۆلانلۆ دانیشتووی یێنگی ـەلاو حەڵواچاوکە و جێنگە. ٦- یادنلۆ. ٧- زاوپێری. ٨- نەمنالو لە قەڵای ـەورۆزی. ئێلەبەگییەکانی ڕەشوانلۆ لە سەردەمی قاجاردا بریتی بوون لە ئەمانەی ژێرەوە:١- میسرخان. ٢- ئەڵلاهیارخانی کوڕی میسرخان کە بە پێی ئەم بەڵگانە لە ساڵی ١٢٨٠دا زیندوو بووە و پێش لە شەواڵی ١٢٨٣ کۆچی دوایی کردووە. ٣- ـەهار قولیخانی کوڕی ئەڵلاهیارخان کە لە ساڵی ١٢٨٢دا سەرۆکی ڕەشوانلۆوەکان ـووە. ٤- ئیسماعیلخانی کوڕی قەهارقولیخان کە شەڕ لەگەڵ تورکەمانەکانی بە

ناوبانگە. ٥- کەریم خانی زاوتی قووشخانە و کوڕی ئیسماعیل‌خان کە لە هێرشی شەوانەی تورکەمانەکاندا لە ساڵی ۱۳۲۳ی کۆچی مانگیدا کە ناومان لێ هێنا لە جێنگەدا ڕۆیشتووەتە چادری باشکانلۆوەکانەوە بۆ بە دواگەڕانی تورکەمانەکان و بێ دەسکەوت گەڕاوە. کەریم خان بە پێی ئەم بەڵگانە هەتا مانگی شەعبانی ۱۳۳٦ زیندوو بووە. لە کەریم‌خان چوار کوڕبە ناوەکانی فەرەجولڵاخان، عەزیزولڵاخان، ئەمینەڵلاخان و ڕۆشن‌خان بەجێ‌مان. ئەندازیار کەریم‌زادە کە ئەم بەڵگانەی بە نووسەر داوە، کوڕی خوالێخۆشبوو عەزیزولڵاخانە، کوردەکانی ڕەشوانلۆش کە شەڕەکەیان لەگەڵ نادرشای ئەفشاردا لە قووشخانە بە ناوبانگە . لە بەرگی۱و۲دا ئاماژەی پێ کرا. موحەممەد کازم دانەری کتێبی -عالەمی نادری- ژمارەی ڕەشوانلۆوەکانی لەو کاتەدا بە دوو هەزار بنەماڵە نووسیوە و ئێستا بنچاخێک کە کەریم‌خان ئاخرین سەرۆکی ڕەشوانلۆ بە پێی ئەو تیکە زەوییەی لە حوسێنقولی‌خان تاریخچی دانیشتووی حەڵواچاوکە کڕیوە، لە ئەم بنچاخە دەستدەکەوێت. لە کوردەکانی فیرووزە لەپاش داگیربوونی فیرووزە بە دەستی ڕووسییەکان لە قووشخانەدا نیشتەجێ بوون، هەندێکیش لە قوتلیشدا و هەندێکیش لە یێنگی قەلادا (تازە قەڵا). ئەم پارچە زەوییە ئاوییەیان لە زەوییەکانی یێنگی‌قەل وەلیخانی فیرووزەیی کڕیبووی کە سنوورەکەی بەم جۆرە بووە: لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ ملکی چۆلانلۆوەکاندا هاوسنوورە و لە لای باشووریشەوە لەگەڵ مەمەرعام (شاڕێدا) هاوسنوورە و لە باکووریشەوە لەگەڵ زەویەکەی ڕۆستەم فیرووزەییدا کە دەبێ لە ساڵی ۱۳۳۰ی کۆچی هەتاویدا بە نرخی ۲۹ تمەنی سەردەمی ئەحمەدشا کڕا بێت. مێژووی بنچاخەکە بەم جۆرەیە: سییەمی مانگی سەفەری ۱۳۳۰ه بە دەستنووسی مەلاموحەممەدئیبراییم نووسراوە. یەکێک لەو مۆرە جوانانەی پەراوێزی بنچاخەکە مۆرێکە کە بە نیشانەوە دیاری کراوە و لێیدا بە فارسی و ڕووسی نووسراوە. ناوەرۆکی فارسییەکەی بە دەست نووسی قوربان دوکتور نووسراوە و ئاماژە دەکات کە قوشخانەییەکان نزیکی سنوور بوونەوە.

## بەڵگەگەلێک لە کوردەکانی زەنگەنەی خوراسان

دوا بە دوای چاپی نووسراوەکانی بەرگی دووهەم لەسەر برایانی کوردی زەنگەنەی خوراسان و بەڵگەی دەسکردی شاعەبباس سەفەوی لەسەر گوتەی ئیمام زەینەلعابدین کە گوایە منداڵانی سەلمان زەنگەنەوە وەکوو خاکسپێرانی لاشەی شەهیدانی کەربەلا ناو براوە و بەم بۆنەش لەسەردەمی سەفەوییەوە بە دوا لە دانی خەراج و بێگاری کە کارگەلێکی ئاسایی بووبوون مەعاف کرابوون، برایانی زەنگەنە کوپی بەڵگەگەلێکیان هێنا کە بە پێ ئەم بەڵگانە زەنگەنەییەکان نە تەنیا بە خاک سپێرانی شەهیدان کەربەلا بووگن بەڵکوو لە عەشیرەتی عەرەبی بەنی ئەسەد ناو براون و خەراجیشیان بەخشراوە، ئەڵبەت دابین کردن و بوونی ئەم سەنەدانە لە دەستی ئەم برایانە کە هەر ڕۆژ و لە شوێنێکی ئەم وڵاتە بۆ شوێنێکی دیکە دوور دەخرانەوە و مافی کۆمەڵایەتی ئەوان لەلایەن شاکانی جەباری ئەو سەردەمە پامال ئەکراوە کە ئەوان دوای هاتن بۆ هەریمێکی نەناسراو بۆ ئەوەی کە پارێزراو بن لە هەر ئەگەر و سەرکوتێک لە داهاتوودا دەبێت چارەیەک بدۆزنەوە و کارێک بکەن تا لە دەستی ئاسیفودەوڵە و ڕوکنودوڵە و نەیرودەوڵە و لە باقی چەوسێنەران ڕزگاریان ببێ، بەڵام نەیرودەوڵە دەیخواست تاڵانیان بکات و بۆ ئەم مەبەستەش فەرمانی دا کە حاکمی خافِ وردە وردە پارەیان لێ وەربگرێت.

بەڵام زەنگەنەییەکان زوو هەوڵیاندا و چارەسەریان دۆزیەوە. بۆ ئەم مەبەستەش لە بەرانبەری خواستی حاکمی خاف شایەتنامەیەکی قورس و قایمیان هینایەوە کە بووە هۆی پاشەکشەی حاکمانی خاف و شازادە نەیرودەوڵە والی خوراسان لە بەرانبەریاندا. ئەمەش دەقی شایەتنامەکە کە لەلایەن برایانی زەنگەنەوە نووسراوە و دروستکراوە:

شاراوە نیە لە عالمان و مەلاکانی پایەبەرز بۆ شایەتی و پرسیاردانی ئەوان و هەموو ئیمانداران و پاکانی وڵاتی قەرایی لەسەر ئەمەیکە هەرکەس دەزانێت و زانیاری تەواوی هەیە کە ئێمە لە خەوا نین و ئاقایانی زەنگەنەین و تا ئێستاش دیوانی هومایوونی خوازیاری دانی خەرجی و بێگاری کردنی ئێمە نەبوونە و هەموو حوکوومەتێکیش دۆخی دیکەی ڕەچاو کردووە، بەڵام ئێستا حوکوومەتی جەلیلەی خاف فەرمانی بە بێگاری کردن و خەراجی دانی ئێمەی ناو براوانی ژێرەوە داوە:

عالیجا ئاغا موحەممەد ئاغا موحەممەد، عالیجا ئاغا حەسەن، عالیجا ئاغا غولام حسێن و عالیجا ئاغا موراد، عالیجا ئاغا موحەممەد، عالیجایان و ئاقایانیش لەسەر ئایەی: «شهدائکم بالله» شەهادەت و گەواهی خۆیان لە سەر ئەم ڕاستیە بە مۆری خۆیان نیشان بدەن کە ببێتە بەڵگەیەک و ئەم ڕاستیە نیشان بدات.

نووسراو لە مانگی جمادیالثانی ١٣١٩ (نزیک ٩٠ ساڵ پێش) ئەسڵی کە ٣٥× ٢١ سانتیمەترە.

بەم جۆرە عالمان و سەیی و گەورەکانی ناوچە دەور تا دەوری بەڵگەی شایەتیەکەیان مۆر و پەسەند کرد کە ئاغایان زەنگەنە لە هەر ڕوویەکەوە دەبێ ڕێزیان لێبگرێت و هیچ دەوڵەتێک تا ئێستا بێگاری بەوان نەکردووە و خەراجی نەسەندووە لێیان. زەنگەنەییەکان شایەتنامەکەیان لەگەڵ نامەیەکی ئاوەڵا هەنارد بۆ والی خوراسان و سیستان- شازادە نەیرودەوڵە- و ئەم فەرمانەیان لەوان گرت:

بەڕێز حاکم موحەممەدخان بیگلەربەیگی خەوافین لە نامەیەکدا کە خەوانین و ئاغای عەشیرەتی جەلیلەی بەنی ئەسەد و زەنگەنەیی دانیشتووی خوانی باکوور بۆمانیان ناردووە لە مێژە بە هۆی ئەوەیکە باب و باپیرانیان گیانیاندا و خزمەتگوزاری بنەماڵەی ئیمامان و پاکان بوونە و هەموو کات لە بڕێک ئیش و تەکلیفی حوکوومەت مەعاف بوون و هەموو ئەرکێک لە سەریان بەخشراوە و گوایە لەلایەن حاکمی بالاخان بێگاریان پێ کراوە و خەرجیان لێ سەندراوە، بۆ ئەوەی کە بە بێشایەتنامەی عالمان و پیاوانی ئایین کە داکۆکیان لە ئاسوودەیی ئەمان کردووە؛ کەوایە بەم فەرمانە پێتان ڕادەگەینین کە بە حاکمی بالاخاف ڕابگەینن کە ناوبراوان هەموو کات لە ئاسوودەیدا بن و بیگاریان پێ نەکرێت و باج و خەراج نەدەن تا بەردەوام بن لە خزمەتگوزاری دین و پیاوانی دین.

١٢ جمادیولئاخر ١٣١٩ مۆری نەبردووە و لەبەر نووسراوەی «هوالمعز- نیرالدولە- ١٣١٨» لە لای ڕاستی حوکمەکەدا بەرچاو دەکەوێ، ئەسڵی کە بە قەوارەی ٣٥×٢١.

پاش دەرچوونی فەرمانی والی خوراسان، برایانی زەنگەنە کە دەیانویست کەرەکەیان پشت قورستر بێت حوکمێکی دیکەیان گرت کە دیار نیە مەرجەعی دەرکەری ئەم حوکمە توربەتی حەیدەریە یان حاکمی خەوانین.

**حوکمەکە ئاوا نووسراوە:**

هو- بە بێشایەتی و پەسەندکردن و بەڵگەی جێ باوەڕی شەرعی و ئەحکامی شیاوی لەبەر چاوگرتنی ئاغایان زەنگەنە کە لە سلسلەی بەنی ئەسەدن و ڕەچاوکردنی دۆخی ئەوان هەموو کات مەبەست و خواستی سەرۆکەکانی دەوڵەت بووە و دەبێ بەم بۆنە عالیجا مەجدەت لەگەڵ ئاغای موحەممەدحسێن موباشێر و باقی خزم و کەسانی ناو براون کە لە بنەماڵەی بەنی ئەسەدن وەکوو پێشوو لە دانی خەراج و بێگاری و هەر ئەرکێکی دی مەعاف بن و کەسێکیش نابێت لە سەر ئەم بابەتانە لەگەڵیان بدوێت، بەرواری مانگی ربیعولئەوەڵ ساڵی ١٣٢١.

هەر بەو جۆرە کە وتراوە «سیاسەت دایک و باوکی نیە و بە وتەی شاعیر بە هەر شێوەیەک بێت دەبێ جێ خۆت لە دڵی دۆست بکەیتەوە تا لە بێگاری و دانی سەرباز و خەراج... مەعاف بکریت. بەڵام کار بەدەستانی سەردەمی پەهلەوی گوێڕایەڵی ئەم قسانە نەبوون و برایانی زەنگەنەیش وەکوو باقی خەڵک دەچەوسانەوە و تەنانەت حوکمی ئەسڵی زەنگەنەیەکانیان دزی، سەرلەشکەر سەر دادوەر فەرماندەی پێشووی لەشکەری خوراسان بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی و جوگرافیای سەردانی ناوچەکەی کردبوو و لەسەر زەنگەنەییەکان گوتبووی: لە سنووری ئەفغانستان ژمارەیەک گوندی کوردنشین بوونیان هەیە کە یەکێکیان ٣٠٠ بنەماڵەی تێدایە کە کوردەکانی زەنگەنەن.»[٣٥٣]

بەم جۆرە دوای ساڵەها ناسنامەی عەرەبی زەنگەنەیەکان کە شاعەبباس دەریکرد بوو بە تاڵ کرایەوە و ناسنامەی ڕاستەقینەی ئەوان دراوە پێیان. لە هەر حاڵدا یا دەبێ زەنگەنەیی بن یان بەنی ئەسەد[٣٥٤].

---

[٣٥٣]- ئاغای سەردادوەر لە ئەفسەرانی توێژەر بوو کە بەرهەمگەلێکی بەرچاوی لە دوای خۆی بە جێ هێشت لە ١٣٣٤ تا ١٣٣٩ بۆ ماوەی پێنج ساڵ فەرماندەی لەشکەری خوراسان بوو.

[٣٥٤]- مێژووی لەشکەری و سیاسی سەردەمی نادرشا ئەفشار، سەرلەشکەر ئەبوو توراب سەردادوەر. ل ٨٥.

## نامە گەیشتووەکان سەبارەت بە بەرگی دووهەم:

١- قووچان: ٦٤/٦/١٢: یەکەمین نامەیەک کە گەیشتە دەستم و فرمێسکی شایی لە چاوانمەوە خستە ڕێ و زۆرتر لە ڕابردوو منی لەو بوارەدا هان دا. نامەی جوان و دڵنشینی خاتوو سورنای هاوسەری شەهید عەلی ڕەجایی حەمزەکانلۆ لە قووچانەوە بوو. ئەم نامە بە سۆزە هەمووی ئەو پاداشتەی کە چاوەڕێ بووم ئاڕاستەی منی کرد. بۆ ئەوەی کە نووسراوەکانم بوو بە هۆی ئەوەی کە دڵێکی خەمین بۆ چەند ساتێک خۆش بێت. ئێستا ناوەرۆکی نامەکە: پەڕتوکەکەی ئێوەم لە قووچاندا بینی و کڕیم، بەڵام لە پاش دیتنی وێنەی هاوسەرم سەرلەک عەلی ڕەجایی حەمزەکانلۆ فرمێسکی شایی لە چاوانمەوە کەوتە ڕێ. باوڕم نەدەکرد کە لەدنیای ئەمڕۆدا کە هیچ تەرخەمێک بە بایەخە مرۆڤایەتییەکان نادرێت. کەسێک بە هۆی قەدرزانی لە هاوسەرەکەی من و هەمووی ئەو کوردهەجەرگانە کە لە گومناویدا ژیان و لە خۆیان و گیانیان گوزەران. دەبێ ئاماژە بکەم کە شووەکەم کە لە ڕێگای خزمەت بە خەڵکدا گیانی خۆی فیدا کرد، بەڵام ئەرتەش خزمەتە بایخدارەکانی لە بەرچاو نەگرت و ئەوی لە دەستەی شەهیدەکان لە ئەژمار نەدا. کە ئەم کارە گەورەترین خەساری دا لە من و منداڵەکانمی ناهومێد کرد. بە هەر جۆرێک نووسینی ئەم مەبەستە هیچ شتێک نیە، جگە لە قەدرزانی لە تێکۆشانە بایخدارەکانی ئێوە، هیوای من بە ئەوەیە کە هێشتا مرۆڤێکی هێژا هەیە کە بە بایخە مرۆڤایەتییەکان دەزانێ و قەدرزانییان لێ دەکا. تەنیا مەبەستێک کە ویستم لە کۆتایی قسەکانمدا لە خزمەتتاندا دوو پاتی کەمەوە. ئەمەیە کە هەر خزمەتێک کە بتوانین چ لە بواری ماڵییەوە و چ لە بواری بیرەوەرییەوە، من و هەر دوو کوڕەکەم بە گیان و دڵ ئامادەین کە ئەنجامی بدەین. ئێوە بە خودا ئەسپێرم و هیوای لەش ساقی و سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم. (هاوسەری سەرلەک عەلی ڕەجایی حەمزەکانلۆ -سورنا)

بۆ ئاگاداری زۆرتری خۆشکی بەڕێزمان خاتوو سورنا دەبێ بڵێم کە سەبارەت بە ئەم گرفتە لەگەڵ بەرپرسیارانی مافی ئەرتەشدا باسم کرد. وڵامیان ئەمە بوو کە ئەرتەش شەهیدەکانی خۆی دابەش دەکات بە سێ دەستەوە:

١- مردن بە هۆی خزمەتێک کە پەڕەی ناردراوییان هەبێت.
٢- مردن لە کاتی هەڵمەتی ڕاهێنانیدا، وەکوو مانۆڕەکان.
٣- مردن لە گۆڕەپان و هەڵمەتی شەڕیدا.

هەروەها هیوادارم کە ئێوە لەم مەبەستە ناڕەحەت نەبن، بۆ ئەوەی کە یاسا مرۆڤایەتییەکان تەواو نین و یاسای ئەرتەشیش ناتوانێت بێ گرفت بێت و بە یاری خودا لە داهاتوودا ئەم گرفتانە ڕێک و پێک دەبن. ئەمەیشە بزانن کە هەمووی خەڵکی ناوچەی قووچان بە چاوی شەهیدەوە بە هاوسەری بەڕێزتاندا دەڕوانن و هەموو کاتێک لە بیرەوەری ڕێز دەگرن.

**٢- مەشەد:** پارچە هۆنراوێکی پڕ لە مەحەبەتی ئاغەی میرنیا بە ناوبانگ بە «میر» کە بە دەستنووسی زۆر جوانی خۆیەوە نووسیوی و گەشەی پێمدا.

**٣- مەشەد:** ئاغەی بەلالی قیامی خوێندکاری کۆلیجی ئەدەبیاتی مەشەد لە بەشی تازەکانی پەڕتووکی خوراساندا لە حەدیسی نووردا کە لەگەڵ ڕۆژنامەی خوراسانی ٦٤/٧/٩دا بڵاو کرایەوە، لە بواری ناساندنی پەڕتووکەکەدا ئاوەها هێناویانە:

پەڕتووکەکە چاوخشانێکی کردووە بە سەر باردۆخی پانی و درێژی خێڵ و هۆزە کوردەکانی دانیشتووی خوراساندا و بە چاوخشانی تاقەتدارانە و لێکۆڵینەوەییانە خۆی تێکۆشانی لە پیشان‌دانی کەلێنە نادیار و بێ وەڵامەکانی ئەم ئازایانە هەیە. تەوەحودی کە خۆیشی لە نێوانی کوردەکانی خوراسانەوە هەستاوە و بە بەڵگە و بنچاخە مێژوییەکان و وتوویژ لەگەڵ شایەتە زیندووەکانی ڕووداوەکاندا توانیویەتیکارێکی مەزن بکات. سەدان پەڕتووک، ڕۆژنامە و بەڵگە و ژێدەر لەگەڵ پێڕستی ناوی هۆزەکانی ناوچە و کەسایەتییەکاندا کە لە بەشی دوایی پەڕتووەکەدا ڕێک و پێک کراوە پیشانگەیەکی دیکەیە لە کاری قووڵی تەوەحودی. لە لاپەڕەی ١٤١ پەڕتووکەکەدا دەخوێنین :بە پێچەوانەی ئەو شتەی کە بیردەکرێتەوە کە کوردەکان ستەمیان لێ کراوە و لە کووچە و کۆڵانی خۆیانەوە هەڵوەدای خوراسان بوون. دەبێ بوترێ کە کوردەکان کەسێک نەبوون کە ستەمیان لێ بکرێت. کۆڵەر لە بەشی دوایی پەڕتووکەکەدا لە هەمووی خۆشکان و برایانی هۆگر و بە تایبەت کرمانج داوای کردووە کە بە هاوکاری زۆرتر کۆڵەر لە بڵاو

کردنەوەی بەرگەکانی سێهەم و چوارەمی پەڕتووکەکەدا یارمەتی بدەن.

**٤- مەهاباد:** نامەی پڕ لە مەحەبەتی جەنابی ئاغەی موەفەقی، بەڕێوە بەری پەڕتووک فرۆشی و چاپخانەی موەفەقی مەهاباد بوو، کە بە بۆنەی خوو ڕەوشتی جوان و فەرهەنگ دۆستی خۆی گەشەی بە نووسەر داوە و ڕێنوێنی نووسەری کردووە و داکۆکییان کردووە کە هەرچێ زووتر دەست بکەمە چاپی نوێی بەرگی یەکەمی پەڕتووکەکە لە ئێران و ئورووپادا زۆر پێویستە و داخوازی دەکرێت.

**٥- لە قووچانەوە نامەی** دڵ بزوێنی مامۆستای هێژام جەنابی ئاغەی حوسێنی حاجیزادەی سیوکانلۆم وەرگرت کە لە ڕێنوێنی و مەحەبەتیان سپاس دەکەم و وتە ڕاستەقینانەکانی ئەوان لە ڕێگایەکدا کە لە ماوەی ژیانمدا پێواومە زۆر کاریگەر بووە.

**٦- لە کرماشانەوە هاوڕێی** شارەزاوزانامان ئاغەی ئەحمەدی شەریفی وەکوو ڕابردوو بە مەحەبەت و گەورەیی و لە گەشەپێدانی منی هەژاردا فەرموویانە: کەلیم گیان. دڵنیا بن کە ئەم دوو بەرگە لە پەڕتووکەکەی ئێوە لە مێژووی گەلی کورددا، قەت فەرامۆش نابێت و هەر کۆڵەرێک کە بیەوێت بەشێک لە کێشەکانی کوردستان بخاتە بەر لێکۆڵینەوە، پێداویستی بە پەڕتووکی ئێوە ئەکەوێت و لە ئێوە بە خۆش ناوییەوە یاد دەکات. کەلیم گیان!بەرگی دووهەمی پەڕتووکی جوان و بایخداری کۆچی مێژووی کورد بۆ خوراسانم بە چاکی دەور کردەوە، بە ڕاستی بە دوور لەو گەورەکردنەوە، بێ بڵێم: پەڕتووکێکی زۆر بایخدارە، تێکۆشانی پیاوانەی ئێوەم لەم بوارەدا کە هەنگاوتان هەڵێناوەتەوە و بۆ کوردەکانی خوراسان پێناسە و مێژووتان کۆ کردووەتەوە، جێگای سپاسە.... ئێستا بە پێویستم زانی ئاماژە بکەمە چەند تێبینی :

١- لە لاپەڕەی چوار هێڵی سێهەمدا فەرمووتانە کە کورد یەکەمین دەسەڵاتی ڕێک و پێکی ئەو ڕۆژەی جیهانی بە ناوی ماد پێکهێنا. لە خزمەتتاندا بڵێم. هەتا ئەو جێگایە کە من ئاگام هەیە کوردەکان تەنانەت پێش لە پێکهێنانی دەوڵەتی مادیش، دەسەڵاتهایەکی ئوستوورەیی وەکوو پێشدادیان و کیانیان و لە هەموو گرینگتر مەهابهادیشیان پێکهێناوە و دەبێت کوردەکان لە یەکەمین بەیداخدارانی تاکەپەرەستی بزانرێن، بۆ ئەوەی کە زەرتوشتی بەڕێز کورد بوو کە بەیداخی تاکەپەرەستی بەرز کردەوە و مرۆڤی لە پەرەستنی بت و ئاژەڵەکان دوور کردووە و بۆ لایەنی خودای تاکە ڕێنمایی کردووە.

بۆ زانیاری زۆرتر سەبارەت بە دەسەڵاتی مەهابهادیان بچن پەڕتووکی (مێژووی ئێران) دانراوی سەرجان مەلکوم و پەڕتووکی دوڕەنەجیفە و ڕەخنەنامەیەک کە خوالێخۆشبوو دوکتور موعین سەبارەت بە مەهاباد و مەهابادیان کە لە وشەنامەی بورهانی قاتعدا هێناویە ، ئەگەرچی بە بۆنەی هەندێ هۆ پێی لە ئینساف ناوتەدەر. لە لاپەڕەی ١٤ هێڵی هەشتدا سەبارەت بە بەزاندنی هێزەکانی خەلیفەی عەبباسی بە دەستی جەعفەری فەرەهجەس لە کێوی داسنددا، دەبێ بڵێم کە جەعفەر سەرپەلی کورد لە هۆزی گەورەی هەزانی (هەزانلۆ یان حەمزەکانلۆ) بوو کە سوپای عەبباسی لە کێوی داسندا لە پارێزگای مووسڵ لە ناوچەی سونجار بەزاند. لە لاپەڕەی ٢٦ هێڵی ئاخردا- سەبارەت بە ژێرنووسی کۆچاندنی کوردەکان بۆ خوراسان، دەبێ بڵێم کە هیچ یەک لە خێڵ و هۆزە کوردەکانی دانیشتووی خوراسان بە دەستووری شازاڵمەکانی ئێران دوور کراونەتەوە و لەیانە و نیشتمانی خۆیانەوە کۆچێندران کە باسەکەی سەرێکی درێژی هەیە.

لە لاپەڕەی ٥١- سەبارەت بە وشەی شقاق دەبێ بڵێم کە بە داخەوە هیچ کام لە فەرهەنگ نووسانی ئێران و تەنانەت نووسەری خاترەی مومتەحێنەدەولە کە خۆیشی کوردێکی شکاک بووە ئاماژەی بە بناغەی مەبەستەکە نەکردووە و شایەتیش زانییە، یان نەیانویستووە مەبەستی ڕاستەقینە بە زمان بێنن و بناغەی بنچینەی شکاکی گۆڕاوە و بنچینەسازی بۆی کردووە، ئەوەی کە ڕاستەقینەیە ئەمەیە کە هۆزی شکاک کوردە و سەرەتا زۆربەیان شافعی مەزهەب بوون و لە پاشان بوونەتە پەیڕەوی مەزهەبی شێعە و لە پاشان تەعەسوباتی مەزهەبی جێگای تەعەسوباتی نەتەوەیی گرتووە... وشەی شقاق هەر ئەو شکاکەیە و بۆ ئەوەی کە ئەو بەشەی لە شکاکەکان کە سەرەتا بە گۆڕینی کات بوونەتە شێعە و لە پاشان بوونەتە تورک زمان، پیتی «کێ» کە بێژەی بۆ تورکەکان سەختە گۆڕدراوتە «قێ» و شکاک بووەتە شقاق و ئێستایش هەر کەسێک بە ڕەشوان (ڕەشوانلۆ) جگە لەوەی نووسیتانە، هەنووکە چەند تیرە لەم هۆزە لە دەور و پشتی شاری هەولێر دەژین و هۆنەری بە ناوبانگی شەهید و هاوڕێی جوانەمەرگم ئەحمەدی ڕەشوانی لەم هۆزە و دانیشتووی شاری هەولێر بوو. لە لاپەڕەی ١٨٨دا لە ژێرنووسی دووهەمدا نووسیتانە:
م- کنداڵ کۆلەری فەرانسەوی...

سەبارەت بە کندال دەبێ لە خزمەتتاندا بڵێم کە کندال فەرانسەوی نین، بەڵکوو کوردێکی دانیشتووی فەرانسەن و ناوی بناغەییشیان موحەممەد کندال نەزانە و لە کاربە دەستانی گەورەی ئاکادمی وزە وپیشەسازی فەرانسەن کە ئێستا سەرپەرشتی کۆڕی زانیاری کورد لە فەرانسەیشی لە سەر شانە و گۆڤاری جوانی کوردی: هیوا و مزگین و چەند گۆڤاری دیکەیش بە زمانەکانی فەرانسەوی و ئینگلیزی و ئاڵمانی و عەرەبی و فارسی سەبارەت بە دەورکردنەوەی کوردناسی لە ژێری بڕوایاندا بڵاو دەکرێتەوە. ئەوان لە هاوڕیان و ئاشناکانن و پەڕتووکەکانی ئێوەم پێشکەشیان کردووە. لە لاپەڕەی ٢٢٨دا- لە کوردیدا وشەی خێڵمان هەیە کە هاومانای وشەی مەغۆلی ئێلە. لاپەڕەی ٢٥٠- گێل: ناوێکە کە نراوتە سەری یەکێک لە هۆزە کوردەکان لە شەڕی ڕۆسەمی فەرۆخزاد لە قادیسیەدا، یارمەتی ڕۆسەمی فەرۆخزادیان داوە و دژ بە عەرەبەکان بەربەرەکانییەکی قارەمانانەیان کرد. خوالێخۆشبوو حەبیبەڵلای نەوبەخت لە شانامەی نەوبەختدا لەو هۆزە بە چاکی ناوی بردووە.

لە لاپەڕەی ٢٨٤دا- سەبارەت بە کوردەکانی لاین و چیرۆکی خەمباری تەختی کوژران هۆنراوێکی زۆر جوان هەیە، بەڵام شەلا بناغەی کوردییەکەیتانیش دەنووسی، تاکوو ئەم هۆنراوەمان بە زمانی زکماکی خۆمان دەخوێندەوە و زۆرتر کەڵکمان دەبرد. لە لاپەڕەی ٣١٨دا ژێرنووس: یادێکتان کردووە لە ئیحسانی نووری پاشا، سەبارەت بە ئیحسانی نووری پاشا بڵێم: کە ئیحسانی نووری پاشا سەرپەلی ئەرتەشی تورکیا بوو کە لە سالانی ١٩٣٠ی زایینیدا شەڕەکانی ئازادی کوردستانی لە کێوستانەکانی ئاراراتدا ڕێبەری کرد و چەند ساڵ لەگەڵ ئەرتەشی فاشیستی پان تورکیستی کەمال ئاتاتورکدا شەڕی کرد و لە ئاکامدا لە زستانێکی زۆر سەرد پەنای هێنا بە ئێران. ئیحسان نووری پاشا بە ڕاستی نەبەزان بەڵکوو ئەویش وەکوو مەلا موستەفای بارزانی بوو بە فیدای حیلەی ڕەزاخانی ستەمکار و کەمال ئاتاتورکی فاشیست، ئیحسان نووری پاشا لە سالانی ١٣٥٠ی هەتاوی بە پاش لە تاراندا کۆچی دوایی کرد یان باشترە کە بڵێین لە ناکاو موتۆرێک هاتە ڕوویا و کردیە ژێرەوە. دەبێ لەبەرچاو بگیررێ کە ئەمرۆ نزیک بە ١٢ میلیۆن برا و خۆشکی کوردی ئێمە لە تورکیا لەگەڵ خراپترین شێوەی ئەشکنجە و ئازاری دەسەلاتی ڕەگەزپەرەستدا

ڕووبەڕوون. بەندیخانەکانی تورکیا پڕە لە خۆشک و برایانی کوردی ئێمە. کوردەکانی تورکیا کرمانجن.

لە لاپەڕەی ۳۲۰دا منیش بڕوای خوالیخۆشبوو شێخ مەردووخی کوردستانی سەبارەت بە کاکەییەکان بە ڕاست دەزانم. هەمووی ئەمانە هۆزێکن و جگە لەوەی کە خوالیخۆشبوو شێخ مەردووخ ئاماژەیان کردووە، دەبێ زۆر بکرێ کە یەکێک لەم هۆزە هەنووکە لە دەوروپشتی کرماشاندا نیشتەجێن و کاکەییەکان بیر و باوەڕ و ئایینی تایبەت بە خۆیانیان هەیە کە بە وتەی خوالیخۆشبوو پرۆفیسۆر تەوفێق وەهبی: دینی کاکەییەکان لە دینە مێژووییەکانی کوردە و تایبەتی هەیە بە سەردەمی میترائیسمی کورد. خوالیخۆشبوو پرۆفیسۆر ژنراڵ تەوفێق وەهبی (سەرپەلی ئەرتەشی تورکیا) و وەزیری دەوڵەتی پاشایەتی عێراق. ڕامیار و کۆڵەر و مێژوونووسی گەورەی کورد بوو کە لەساڵەکانی ۱۹۸۰ی زایینی بە پاش لە لەندەندا کۆچی دوایی کرد. خوالیخۆشبوو تەوفێق وەهبی دانراوی بایخداری زۆری سەبارەت بە کورد و کوردستان بە زمانەکانی: کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی هەیە و پەڕتووکێکی جوان لە ئەوان بە ناوی دینی زووینەی کورد لە کنی مندا هەیە و من شانازی هاوڕێیی و قوتابیگەریم بووە.

لاپەڕەی ۳۲۱- لە ئەم لاپەڕە و لاپەڕەکانی دواتردا مەبەستهایەکی زۆر بە کەڵکترتان سەبارەت بە کوردە جابانەکان (جاپان) هێناوەتە ڕوو. لە ئەم بارەیەوە مامۆستا ڕۆژبەیانی و مامۆستا هەژار و خوالێخۆشبوو دوکتور موستەفا جەوادیش چەند نامیلکەیان نووسیوە و ئەو شتەی کە ئێستا لە بیرم دایە. ئەمەیە کە: جابان یان جاپان ئەلکوردی لە هاوڕیانی پێغەمبەر و لە حەدیس نووسانی بە ناوبانگی سەدەی یەکەمی کۆچییە و مەیموونەلکوردی ئیبنیجابانی کوڕیشی کە بە ئەبووبەسیر بە ناوبانگ بووە لە هاوڕیان و حەدیس نووسانی بە ناوبانگە. لە لاپەڕەی ۵۱۰دا- نامەی ئاغەی موحەممەدی فەتحی زۆر لە سەری من کاریگەر بوو بە تایبەت لە ئاکامی نامەکەیانەوە فەرموویانە: زمانی کوردی لە ناوچەی ئێمەدا (ئازەربایجانی ڕۆژاوا) ئەوەندە لێبڕاوە کە تەنیا پیرەژنە قەدیمییەکان بە ناوی زمانی شاغی (شقاقی) قسەی پێ دەکەن. کەلیم گیان، لە زمانی منەوە بە ئامۆزای خۆشەویستمان فەتحی بڵێ: خۆشەویستەکەم لێبڕاوی زمانی کوردی لە ناوچەی

ئێوەدا هەتا ڕادەیەک تاوانی خۆتانە. ئەمە ئێوە خۆتان بوون کە لە بیرتان بردەوە ولە لایەکی دیکەوە، سیاسەتی ڕەگەز پەرەستانەی ڕژیمی شا هۆکاری بناغەیی لێبڕاوی زمانی کوردی لە ناوچەی ئێوەدا بوو، بەڵام فەتحی گیان دەبێ بزانی کە زمانی کوردی دیکە لێبڕاو نیە. هەنووکە ڕۆژانە، حەوتانە و مانگانە دەیان گۆڤار و ڕۆژنامە و ساڵنامە و هەزاربەرگ پەڕتووک بەم زمانە چاپ و بڵاو دەبێتەوە. هەنووکە لە ئورووپادا چەند ئەنستیتووی گەورەی کورد و کوردناسی دامەزراوە. لە ئورووپادا هەتا ئەو جێگایە کە من ئاگام هەیە، ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی: هیوا، مزگین، پرشنگ، پیشەنگ، کۆمار، خەبات، چوارچرا، ڕۆژی کوردستان، هەلوێست، بەربانگ، مامۆستای کورد، هیلان، ڕێبازی نوێ و دەیان گۆڤار و ڕۆژنامەی دیکە بە زمانی کوردی بڵاو دەبنەوە و ئێستایش لە کوردستانی عێراق و ئێرانیشدا ئاشکرا چەند ڕۆژنامە بە زمانی کوردی بڵاو دەبنەوە و لە کوردستانی تورکیا و سووریایشدا بە دزییەوە ڕۆژنامە کوردییەکان بڵاو دەبنەوە. لە ئێرەواندا کوردەکان زۆرتر لە چل ساڵە حەوتەنامە ڕێیای نوێ بڵاو دەکەنەوە.

کەلیم گیان، ئاواڵی هێژام، بێ ڕیا دەڵێم. دەستت خۆش بێت کە گەلی کورد خزمەتی بایخدار ئێوە قەت لە بیر ناباتەوە و مێژووی گەلی کورد بە ئێوە و تێکۆشانە بایخدارەکانتان لە بواری ناساندنی مێژووی کوردەکانی خوراساندا شانازی دەکات، لە ڕخنە ڕاستەقینە و سازێنەرەکان پێشوازی بکەن و لە ئێرا دەبێ جێگاکان دڵ سەردەوە نەبن. بە تێکۆشانەکانتان درێژە بدەن. بێگومان ڕۆژگارێک کە خواڵێخۆشبوو ئەمیر شەڕەف خانی بدلیسی پەڕتووکی بایخداری شەرەفنامەی سەبارەت بە مێژووی گەلی کورد دەنووسی، لەگەڵ خیاڵی خراپی هەندێ کەسد ڕووبەڕوو بووە. تەوەحودی گیان: سڵاوم بە بنەماڵەی بەڕێزتان و خۆشکان و برایانی خۆشەویستی کوردی کرمانجی خوراسان ڕابگەینە. بە سپاسەوە. (کرماشان- ئەحمەدی شەریفی. ڕێکەوتی ٦٥/٤/٢)

بەو هیوایە کە برامان ئەحمەدی شەریفی و هەمووی خۆشکان و برا کوردەکانی ئێمە لە سەرانسەری جیهاندا سڵاوی گەرمی ئێمەیش لە مەڵبەندی بەربڵاو و قارەمان پەروەری خوراسانەوە کە وەکوو باسک و شمشێر و سپەری ئیسلام و ئێران بوێرن.

ئێستا چاو دەکەین لە نامەی خۆشەویستانی دیکە.

٧- لاین: لە لایەنی نەوکەلاتە و ئاغەی حاجی زولفەقاری جەلایر کە لە ڕۆشنبیران و خێرخوازانی ئەو ناوچەیەن بە زاراوەی کرمانجی نامەیان نووسیوە. (جەلایر ڕێکەوتی ٦٤/٦/١٥)

٨- تاران: زانا و نووسەری تێکۆشەر و زانیاری بە ناوبانگی کورد ئاغەی مامۆستا سدیقی سەفیزادەی بۆرەکەیی لە نامەی ڕێکەوتی ٦٤/٧/١٣ی خۆیدا ئاوا نووسیویانە:

سەبارەت بە کوردناسی بە داخەوە تاکوو ئێستا لە وڵاتی ئێمەدا کارێکی زۆر نەکراوە و هیوادارم کە لە داهاتوودا ڕووناکبیران و نووسەران و کۆڵەرانی کوردی بکەونە ئەو بیرە و لەم بوارەدا پێنووس هەڵگرن و فەرهەنگ و زمان و مێژووی ئەم گەلە بنچینەدارە ئێرانییە بە خەڵکی ئێران و جیهان بناسێنن. ئاغەی تەوەحودی کارێک کە ئێوە ئەنجامتان داوە و ئەیدەن زۆر لە شان و بایخدارە و بایخی گرانی لە داهاتووی نزیکدا دەردەکەوێت. هەتا ئەو جێگایە کە من ئاگام هەیە هەتا ئێستا کەسێک دەستی نەداوتە ئەم کارە و کاری ئێوە کەلێنێکی گرینگی لە مێژووی کوردەکانی ڕوونِ کردووتەوە و هیوادارم کە لە داهاتوودا بتوانن ژیاننامەی هۆنەران و نووسەرانی کوردی خوراسان کۆ بکەنەوە و لەگەڵ هۆنراوە و ئاسەوارەکانیاندا بیگەیننە دەستی خەڵک. ئەگەرچی تاکوو ئێستا زانیارانێک وەکوو بدلیسی و بایزیدی و ئامێدی و خالیدی و هەندێکی دیکە مێژوویان بۆ کورد نووسیوە، بەڵام کاری ئێوە ئەبێتە هەنگاوێکی زۆر گەورە لە ڕێگای پەرەپێدانی مێژووی کورددا. بە تایبەت کە ئێوە لە کوردەکانی خوراسانن و زۆرتر ئاشنایەتیتان لەگەڵ مێژووی ئەو ناوچەیەدا هەیە و کارەکەتان زۆر گرینگە.ئێشی دڵەکان زۆرن. هیوادارم ساڵانێکی درێژ تەندوروست و کامەران بمێنن و لە زیندوو کردنەوەی مێژوو و زمان و فەرهەنگی کوردەکانی خوراساندا تێبکۆشن. (هاوڕێی ئێوە سدیقی سەفیزادەی بۆرەکەیی.)

٩- تاران: سەروەری زانا و هێژامان مامۆستا تەوەکولی (برای خوالیخۆشبوو تەوەکولی هۆنەری شەهیدی بانەیی بە ناوبانگ بە کرمانج) کە خۆی وەکوو ناسرخەسرەوی کوردن و بە هەمووی ناوچە کوردنیشنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا

گەڕاون و لە نزیکە وە لەگەڵ هەموویاندا چاوپێکەوتن و وتوویژی کردووە و لەم بوارەدا تۆشەی زۆریکیان لە جانتادا هەیە، ئاوا بۆ منی هەژاری نووسیوە: هاوڕێی زانیار و هێژام کاک کەلیمولڵای تەوەحودی- سلاوتان لێ بێ. بەرگی دووهەمی شاکاری مێژوویی ئێوەم بە ناوی (کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان) بە دەست گەیشت، لیکۆڵینەوەی زانیارانەی ئێوە لە بواری ڕوونبوونەوەی بەشێک لە جوگرافیا و مێژووی کوردستان کە پێوەندی هەیە بە کوردەکانی خوراسان، جێگای ڕێزی هەمووی کۆڵەران و مێژوو نووسان بە تایبەت گەلی کوردە. دەستتان خۆش بێت. منی هەژاریش بە نۆبەی خۆم لە ئەم کارەگەورەی ئێوە ڕێز دەگرم و نازانم بە چ زمانێک سپاسی خۆم پێشکەشی ئێوە بکەم. لە بەرگی یەکەمدا ئاماژەتان بە کاریگەری مەرگی ڕۆڵەی جوانەمەرگتان لە سەری خۆتان کردووە، بەلام چ خەمێک بە جێگای ئەوە بە نووسینی مێژوو و جوگرافیای بایخدارتان دەڵێی هەزار ڕۆڵەتان بۆ خزمەت بە ئاو و خاکی نیشتمان پێشکەشی ئێران و گەلی هێژای کورد کردووە. شایەت هەر ئەو مەرگی ڕۆڵەتانە بووەتە هۆی بزواندنی زۆرترتان لە کاریتاندا. تاکوو بە خولقاندنی ئاسەواری بایخدارت مندال یان مندالانێکت پێشکەشی کۆمەڵگا کردووە کە بایخی بەرانبەر هەزار ڕۆڵەیە.لە بەرگی یەکەمی پەڕتووکەکەدا کاروانی هۆنراوی نوێی کوردیم لە کاکەیفەلاحەوە خوێندەوە کە عەبدوڵلا گۆران هۆنەری نوێخوازی کورد، ڕۆژێک فایەق بێکەس هۆنەری تێکۆشەری کورد دەباتەوە بۆ ماڵ. لەوێدا بێکەس بە گۆران دەڵێ: بە ڕاستی کاک عەبدوڵلا بەم زوویە هۆنراوی نوێتان نەهۆنیوەتەوە؟ گۆران لە وەلامدا دەڵێ: چۆن پارچەیەکم لە ئازیەتی هیوای کوڕمدا هۆنیوەتەوە. لە پاشان ئەم پارچە هۆنراوە بۆ بێکەس دەخوێنێتەوە. بێکەس خوایشت دەکات کە دیسان هۆنراوەکە بخوێنێتەوە، لە پاشان بێکەس پەکەر بوو. گۆران وتی: بۆچی پەکەری؟ مەگەر هۆنراوەکەت بە دڵ نەبوو. بێکەس وتی: چۆن. زۆر پاراو وجوان بوو، بەلام ئەمەوێ شتێک بڵێم کە هیوادارم نەگاتە گوێی هاوژینەکەتان. بە ناموسم سوێند. خۆشم دێ هەر چوار ڕۆڵەکەت بمرن هەتا تۆ بە بۆنەی مەرگی هەرکامیان، شاکارێکی دیکە لە ئەدەبیاتی کوردیدا بخولقێنی . بەلام کاک تەوەحودی، من خۆم بە پێچەوانەی بڕوای خوالێخۆشبوو فایەق بێکەس. هیوای هەبوونی مندالانێکی نەبەزم بۆتان هەیە کە ئەوانیش بتوانن ڕێگای بابیان باشتر

درێژە بدەن و خۆتانیش بە ئاسوودەییەوە بە خولقاندنی ئاسەواری نوێ و جۆربەجۆر و منداڵانی فەرهەنگی زۆرترێک بۆ کورد و کوردستان بخولقێنی. کە ئەمڕۆ زۆرتر لە هەر کاتێک پێداویستیمان بە منداڵانی فەرهەنگیتان هەیە. براکەم کەلیم! مەبەستێک کە زۆرتر لە هەر شتێکی دیکە دڵمی بریندار کرد، بە داخەوە لە شەڕی ئێران و عێراقدا هەندێک لە برا کوردەکانی خوراسان لە شەڕەکانی کوردستاندا خوێنی پاکیان ڕژاوەتە زەوی. خودا بەعس و لایەنگرانی بەعس ڕووڕەش بکات کە براکوژی لە کوردستاندا خستووەتە ڕێ. بە یارمەتی خودا لە داهاتوودا بینەری ڕۆژێک بین کە دوژمنکاری و براکوژی لە نێوان بچێت و ئاشتی و خۆشی و هێمنایەتی و ڕۆژ باشی لە کوردستان و ئەو ناوچانەی دیکەی ئێرانی خۆشەویست و ئیسلامیدا جێگر بێت. لە کۆتاییدا دووبەرگ پەڕتووکی بێ بایەخی خۆم بە ناوەکانی جوگرافیا و مێژووی بانەی کوردستان و چوار پێشەوای سونی و کۆمەڵ وەکوو لاپەڕەیەکی سەوز پێشکەش کردووە، هیوادارم کە پەسەند بکرێت، لە خودای گەورەم داوایە کە ئاسوودەیی خەیاڵ بە تۆ بدات هەتا پێنووسی سێحرخولقێنت لە کاری لێکۆڵینەوەیی‌دا قەت ڕانەوەستێ و بڵێسەی دەروونت کە ڕۆشنایی‌پێدەری کەلێنە تاریکەکانی مێژووی کوردستانە قەت نەکوژێتەوە. (هۆگری ئێوە موحەممەد ڕەئووفی تەوەکولی بانەیی)

١٠- **ئیسفەهان ٦٤/٧/٢٨**: برامان ئاغەی مەجیدی یەزدانی خوێندکاری ساڵی دوایی ڕشتەی مێژووی کۆلیجی ئەدبیات و زانیارییە مرۆڤییەکانی ئیسفەهانیش بە نامە پڕ لە مەحەبەتەکەیان سپاسمیان کرد و گەشەیان پێمدا و بە بۆنەی ئەوەی کە ئاکامنامەی خوێندکاری خۆیانیان لە پێوەندی لەگەڵ مێژووی بجنۆردا هەڵبژاردووە، بە ڕێنوێنی ئاغەی دوکتور پاپلی مامۆستای زانکۆی مەشەد لە من داخوازی یارمەتیان کردووە کە بە گیان و دڵ هەر شتێک کە لە ڕادەی یەکەمدا پێویست بوو لە خزمەتیاندا ئاماژەم پێی کرد.

١١- **ئۆغاز ٦٤/٨/١**: ئاغەی قادر قولی قوبادی ئێڵبەگی سیوکانلۆ (سیوەک یان سیبەک) کە خۆی و بابی و براکانی موحەممەد حوسێن‌خان و سەعادەت قولی‌خانی دووهەم- لە بواری پێکهێنانی ئازایەتییە خوێندکارییەکان و سازکردنی فێرگەی ئۆغازدا مافێکی گەورەیان لە ئەستۆی من و هەمووی خەڵکی ناوچەی

ئوغازەوە هەیە، لە نامەیەکی پڕ لە مەحەبەتدا فەرموویانە. کەلیم گیان. هەروەها کە چەند جاریش بە پێگەیشتنی لە تێکۆشانەکانی ئێوە ڕێزمان گرتووە، ئێوە دیسان کوردەکانتان زیندوو کردووەتەوە. لە پاشان ئەوان بە تایبەتمەندی ناونرانی دوو هۆزی گەورەی کوردی زەعفەرانلۆ یان (زاخۆرانلۆ) و شادیلۆ ئاماژەیان کردووە. لە زمانی باپیر و دایە گەورەکانەوە هێناویەتە ڕووکە لە ئەو قسانەدا لە منداڵی دەیانگێڕاوە بۆمان. کاتێک کە ڕێوی کەڵەباب گۆل ئەدات و ئەیگرێت و گەماڵەکانی گوند لە پاشی دەڕۆن. کەڵەباب بە ڕێوییەکە دەڵێ: بڵێ من شاییم، نەزاخۆزی. هەتا گەماڵەکان دەستت لێ هەڵگرن و... کاتێک لە هاوهۆزییەکانی ئێمە ڕۆیشتن بۆ ناوچەی بجنۆرد و لە گوندێکدا دەبوونە میوان، ئەوان میوانی خۆیانیان بە یەکترین دەناساند و ئەیانوت: ئەممیوانمانە زاخۆرییە و زاخۆرییەکانیش لە هەمبەردا ئەیانوت: میوانی ئێمە شاییە. یانی شادیلۆوە. بەڵام سەبارەت بە هۆزی بێچرانلۆ هەر بەو جۆرە کە ئاماژەتان کردووە. ئەوان پەلێک لەکیکانلۆن و بە ناوبانگن بە بێچەر ئەوانەیش کە بە ناوبانگن بە شاملۆ. منداڵی ئەو سێبرانە کە پێشتر بە سەرۆکایەتی حەسەنی ناوی لە سووریاوە هاتن و گەیشتنە بێچرانلۆوەکان و لە قەڵاحەسەند نیشتەجێن و من ئەمەم لە خوالێخۆشبوو عەلیخانی بێچرانلۆ و خوالیخۆشبوو فەرەجوڵڵاخانی بێچرانلۆ بیستووە. دوو برا لەو سێ برایە لە نزیکی تاراندا نیشتەجێ بوون کە خوالیخۆشبوو سەرلەک عەلی عەسکەرخانی شاملۆ لە پێش چاوی خۆمەوە بە خوالیخۆشبوو فەرەجوڵڵاخانی بێچرانلۆی وت: من لە تیرەی مندالانی یەکێک لەو دوو برامە. دەسەڵاتداری قووچان (ئێلخانی زەعفەرانلۆ) کە لە یەکیەتی هۆزی کیکانلۆ یانی دوو پەلی (بێچرانلۆ و سیوکانلۆ) پەکەر بوو، حەسەن ناوی ئاماژە پێ کراوی دژ بە میناخانی بێوارەلۆی سەرۆکی هۆزی جریستان هەڵخڕاند. بۆ ئەوەی کە ئەوان وەڵامی دەسەڵاتی قووچانیان نەئەداوە، بەم هۆیەوە حەسەن ناوی بە بۆنەی هاوکاری لەگەڵ ئێلخانی زەعفەرانلۆ و سەرکوت کردنی میناخان بە ناوی- خان- بە ناوبانگ بوو و کیکانلۆ دابەش بوو بە دوو خێڵەوە و لە یەکیەتی بەرگری کرا حەسەنخان لەو کاتەوە بە پاش بووە ئێلبەگی بێچرانلۆ. ئەگەر دەرفەتتان دەسە کەوت حەتمەن لەم بوارەدا لە بەساڵا چووەکانی بێوارەلۆ ئاغەکان: کەلاییەحیاخان و کەلایی شەهبازخان و عەلیئەکبەری کوڕی شاڕوخ پرسیار بکەن، کە زانیار

باشترێکیان هەیە. سەرکەوتووبن. قادر قولی قوبادی.

١٢- **مەهاباد ٦٤/٩/١١:** برای زانامان ئاغەی مەحموودی شکاک نژاد بە پێشکەش کردنی دوو بەرگ پەڕتووک سەبارەت بە مەهاباد لە بەرهەمی زانیارە بەناوبانگەکانی ئەو ناچەیە یانێ ئاغەکان: قادری فەتاحی قازی و سەید موحەممەدی سەمەدی نووسیویانە: کەلیم گیان! سلاوێک بە گەرمی دڵی مرۆڤانێک وەکوو ئاغەی بەڕێز تەوەحودی کە لە ئەو لای کێو و دەشت و بیاوان و وشکەڵانەکانەوە دەگات وەکوو هەتاوی جیهانگەڕ گەرمی و خۆشی و هێز ئەدات بە ژیانی سەردی کێوستان نشینانی کورد. من شانازی دەکەم کە دەنگی برایێکی گەورە لە سەدان کیلۆمتر ئەولاتر وەکوو گەرمی فریشتەی ئاسمانی و نازنامەی دایکان و فرمێسکی چاوی باوکانی ڕۆڵە نەدیو بە پێس و گۆشت و ئێسقانی خۆم هەست دەکەم، چی بڵێم کە دەسکەوتی دەور کردنەوە لە کۆڵەرایەتی و نووسراوەکانی ئێوەی بەڕێزدا منی خستە ئەو بیرە کە بە ڕێکەوتن و تێکۆشانی بەردەوامم کەلێنێک لە ژیانی کۆچەرییەکانی پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژاوا بێنمە سەری کاغەز کە بە یارمەتی خودا بەم زوویە لە ژمارەی چوارەمی گۆڤاری سروەدا بە زاراوەی موکری لە چاپ ئەدرێت.

١٣- **مەهاباد:** ٢٥٩٧/٩/١٦ کوردی و ڕێکەوت لەگەڵ ١٣٦٤/٩/١٦ی کۆچی هەتاوی- مامۆستای بەڕێز و هۆنەر و زانا و نووسەری کورد مامۆستا عوبەیدوڵڵای ئەیووبیان دامەزرێنەر و سەرنووسەری گۆڤاری سوورانەی ئازادیش ئاوا منیان شەرمەزار کردووە.

بڵاو بوونەوەی ئەم دووبەرگ پەڕتووکەی ئێوە یەکێک لە ئاواتە دێرینەکانی من، یانێ گردۆڵەیەک زانیاری ڕاستەقینە و وەک خۆ لە باردۆخی کوردەکانی خوراسانی ە دێ هێنا، بەڵام بۆ ئەوەی کە ئەم کاری ئێوە گەورە و سەرچاوەی گۆڕانکاری و سەرەتای کۆڵەرایەتی درێژێکە بۆ چینی لاو و داهاتووەکان.- نووسەر -کە خۆم زیک بە پەنجا ساڵە ئەرکی هەرە گرینگ و فیداکاری لە ڕێگای ئەم گەلەم ەرشانە. بایخی ئێوە و کاری گرینگتان بە چاکی دەزانم و لە گرفتەکانی کاری ئێوە یدەگام... کارێک کە ئێوە دەستتان پێ کردووە. کارێکی گەورە و جێگای تەرخەم ڕێزە و من لە قووڵایی دڵەوە کوردانە بە ئێوە دەڵێم، ئافەرین، هەزار ئافەرین.

١٤- **ئیلام ٦٤/١٠/١٤:** ئاغەی گرووپیان حەسەنی نیازی لە هێزی ٨٤ی

خورڕەم ئاوا لە برا کرمانجەکانی گوندی بەهمەن جانی ژوور نزیکی ڕادەکان لە گۆڕەپانی شەڕەو نووسیویانە: بە ناوی خودای گەورە.

لە خزمەتی جەنابی مامۆستای هێژا و زانیار ئاغەی کەلیموڵلای تەوەحودی بە کورتی دەڵێم کە بەرگی یەکەم و دووهەمی پەڕتووکی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسانم خوێندەوە و بۆ ئەوەی کە لە سەر هەمووی خەڵکی کرمانجەکە بە هەر جۆرێک لە تێکۆشانە بێ کۆتاییەکانی ئێوە سپاس بکەن، بەم بۆنەیە و بە ئەرکی خۆمم زانی لە هەمبەر ئێوە و کاری بایخدارتاندا ڕێزی خۆم دەرم. مەبەستەکانی ژێرنووسی لاپەڕەکانی ٥٣٨ و ٥٣٩ وەها منی ژێرەوڕوو کرد کە ڕۆح و گیانم کەوتە لەرزینەوە و دیکە نەمتوانی درێژە بدەمە خوێندن، بێدرەنگ نووسینی ئەم نامەمە دەست پێ کرد و لە هەوەڵێن دەرفەتدا دێمە خزمەتتان. بەرگی یەکەمی پەڕتووکی ئێوە لە گۆڕەپانی شەڕدا لە نێوانی هاوکارەکاندا دەست بە دەست دەبێت. یەکێک ئێوەی بینی لە خۆشیدا دەستی کردە گریان و پەڕتووکەکەی نا سەری چاوانیەوە. وەکوو کەسێک کە لە پاش چەند ساڵ گوم بووی خۆی پەیدا کردبێ.

ئەو کاتە بێ شۆخی وتی: حەسەن گیان ئەم پەڕتووکە پیشانی هەموو بدە کە خەڵک بزانن کوردەکانی خوراسان هەموو کاتێ لە هێڵی یەکەمی شەڕ و لە پێناوی ڕۆژگار و شەڕدا لە کنی هاووڵاتیانی خۆیاندا بەشدارییان بووە و هەیە و لە گەورەیی و ڕێزی نەتەوەی مەڵبەندی خۆشەویستی ئێران بەرگری دەکەن. هاوڕێیەکی دیکە لە کوردەکانی ئیلام و دانیشتووی شاری ئەیوان زۆر داکۆکی و خوایشتنی کرد کە بەرگی یەکەمی بۆ ببەم، بەڵام من لە مەشهەد و تارانەوە هەتا ئێرە لە هەر کوێدا گەڕام پەڕتووکەکەم دەست نەکەوت. هەمووی پەرتووک فرۆشییەکان وتیان: کۆتایی پێ هاتووە و من بە دەستی خالی و پەکەرییەوە ڕاگەڕامەوە بۆ کنی هاوڕێیەکەم. بەم بۆنەیەوە خوایشت دەکەم ئەگەر ئەبێت دیسان لە چاپی بدەن...

١٥- تاران: برای خوێندکارمان ئاغەی موحەممەد عەلی حوجەتی بە ناوبانگ بە شەروین بورهان کە خەڵکی مەڵبەندی قارەمان پەروەری قووچانە و لە کۆلیجی زانیارییە کۆمەڵایەتییەکانی تاراندا خەریکی خوێندەوارییە لە نامەی پڕ لە مەحەبەتی خۆیاندا بۆ ئەم ئەویندارە دێوانەیە ئاوایان نووسیوە: بە ناوی خودای ئەوینداران و دێوانەکان. لە خزمەتی پیرۆزی کۆڵەری تێکۆشەر جەنابی ئاغەی کەلیموڵلای

ئەوەحودی: سلاو بێ سەروتار و پەراوێز. لە پاش ئاواتی لەش ساقی و سەر کەوتن بۆ ئێوە قسە لە پەڕتووکی بێ وێنەی ئێوە سەبارەت بە کوردەکانی خوراسان دەست پێ دەکەم، بەڵام دەبێ لە ئەو هەموو تێکۆشانەی ئێوە بۆ نووسینی دووبەرگ پەڕتووک کە داگری سەرانسەری مێژووی کوردەکانی خوراسانە سپاس بکەم و لە ئێوە ڕێز بگرم کە لە ئەم بوارەدا باشترین خەڵاتت پێشکەشی کۆڵەران کردووە. ڕۆژانی جێژنی نەورۆزی ساڵی ٦٥ خەریکی خوێندن لە بواری جۆربەجۆر بۆ کۆمەڵناسی شاری و کۆمەڵناسی گوندی بووم. ئەو بەرهەمی کۆڵەری کە دەبێ پیشانی مامۆستاکانی بدەم. لە بەشە جۆربەجۆرەکانی زۆر پەڕتووک کەڵکم وەرگرت کە پەڕووکی ئێوە زۆر بە کەڵک بوو. ئێوە مەڵبەندی جوگرافیایی کوردەکان خوراسانتان لە جێگاییێکیدا بە ئازەربایجان زانیوە کە پێم وایە پێویستی بە ڕاڤەی زۆرترە، بەڵام نازانم هەڵە چاپییەکان لە پەڕتووکەکەدا هەیە یان نە؟ ئێوە وشەی ئەسپەچیرتان بە جێگای ئەسفەجیر بە هەڵە گرتووە، بۆ ئەوەی کە لە قووچاندا شوێنێک بە ناوی ئەسپەچیر نیە. باشە کەلیمی قووچانی خۆشەویست. هاوشاری بەڕێز، بۆ ئەوەی کە بۆ وانەی خەڵکناسی ئێران لە بواری خێڵەکان و هۆزەکان، سەبارەت بە کۆچەرییەکانی قووچان لێکۆڵینەوە دەکەم هەتا بناغە و ڕەگەزیان بێنمە ڕوو. بەم بۆنەیەو بە بەرژەوەندیم زانی کە لە ئێوەی بەڕێز داخوازی ڕێنوێنی بکەم، بەڵام ئەگەریش ببێت دەڕۆم بە دوای ئاغەی عەتارودی کە لەگەڵ (موحەممەد حوسێنی حوجەتی- پەرێشانی) برامدا هاوڕێیە. پێم وایە کە ئێوە لە پەڕتووکەکانتاندا چەند ئاسەوارتان لە ئاغەی عەتارودی هێناوەتە ڕوو و لە لایەنێکیشەوە بیستوومە کە ئێوە لەگەڵ شێخ حەسەنی برامدا هاوپوول بوونە، چاکە کە لە پاش ناسینی سەرسەری هیوادارم کە بیرەوەرییەکی خراپت لەو سەردەمە نەبێت و من ڕێنوێنی بکەن. هاوڕێیەکانم کە هاتوونە کنتان ئێوەیان بە پیاوێکی خێرخواز و زانیار و ئەدەب دۆست بینیبوو. کە لە نێوانی گەورە پیاوانی قووچانیدا ئاوا تایبەتمەندییەک لە ئێوە جوان و پێویستە. (ڕێزگری ئێوە شەروین بورهان- ١٣٦٥/١/١٤)

نامەی ڕێکخراوەی پەرەپێدانی فەرهەنگی ئێران، بە بەڕێوەبەرایەتی ئاغەی دوکتور تەوەسوتی: بە ناوی خودای گەورە. جەنابی ئاغەی کەلیموڵلای تەوەحودی

(ئۆغازی) وپاش پێشکەش کردنی سڵاو و ڕێز ڕادەگەیندرێ. بە ئاگادار بوون لە بڵاو بوونەوەی بەرگی دووهەمی پەڕتووکی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان تکایە کە بۆ تێکەیشتن لە بڕواکانی ئێوە کە ناساندنی پەڕتووکی ناوبراو بنێرن بۆ پەڕتووکخانەی ئەم ڕێکخراوەیە و هەروەها لە بەرگی یەکەمی مێژوودا لە ئاکامی پەڕتووکەکەدا بە پێڕستی ژێدەر و سەرچاوەکان کە لە ڕاهێڵی هەر پەڕتووکێک ئاماژە نەکراوە کە هیوادارین لە بەرگی دووهەمدا ئاماژە کراوێتە مەبەستی ئاماژە پێ کراو. بە ئاواتی سەرکەوتنی زۆرتری ئێوەی بەڕێز لە ڕێگای گەیشتن بە ئامانجی دیاری کراوتان.
(بەڕێوەبەری گشتی ڕێکخراوە، دوکتور تەوەسوتی.)

**١٧- ئاشخانە (بجنۆرد):** برای بەڕێزمان ئاغەی جەمشیدی ڕەشیدی لە کوردە دۆدانلۆوەکانی دانیشتووی تورک و خەتابی شێروانن و جارێکیان لە فێرگەی کشت وکاڵی ئاشخانەدا خەریکی خوێندەوارین، لە نامەیەکی پڕ لە مەحەبەتدا لە کاری منی هەژار ڕێزیان گرتووە کە منیش بە نۆرەی خۆم لە هەمووی ئەم برایانە و خوێنەرانی بەڕێز سپاس دەکەم. ٦٤/٩/١٦

**١٨- مەهاباد:** لە مەهابادەوە ئەو مەڵبەندەی ئەدەب و هونەر و کوردایەتی و میوانداری و لە زێدی زەڕتوشت پێغەمبەری گەورەی ئاریایی، جارێکی دیکە نامەیەکی پڕ لە شوور و خۆشیم لە نووسەری لاو و تێکۆشەر یانێ برای بەڕێزودڵۆڤان ئاغەی سەید موحەممەدی سەمەدی و برای زۆر خۆشەویستیان کاک عەبدوڵڵا بوو کە فەرموویان: کارەکەتان زۆر بایخدار و گرینگە. بۆ ئەوەی کە خەریکیت ناسنامە و پێناسەی گەلەکەمان بە چاکی و جوانی کۆ دەکەیتەوە و لە لاپەڕەکانی ناوەڕۆکی بەڵگە مێژووییەکاندا زیندووی دەکەیتەوە. گەلی ئێمە گەورەترین خەسارەکانی تەنیا بەم بۆنەیەوە دیوە کە ئاگای گشتی و ڕاستەقینەی لە ڕابردووی شانازانەی خۆی نەبووە. ڕژێمە سەرکوتکەرەکان و شا زاڵمەکان نەیانهێشتووە کە ببیێت. بەم هۆیە و لە خۆی بێگانە بووە و ئەمە ژانێکی زۆر ناسۆرە. ئەم کاری ئێوە وەکوو کاری ئەو پزیشکە سەر دەرچووەیە کە خەریکە ئەم ژانە ناسۆرە بنچینەیی تیمار دەکات. و لە ڕێگای ڕاستەقینە و باویەوە خەریکی تیماری ئەبێت. دیسان دووپات دەکەمەوە. کەکاری ئێوە زۆر گرینگ و چارەساز و داهاتوو سازە و هیوادارم لەم بوارەدا سەرکەوتوو و پیرۆز بیت.

لە نەورۆزی ساڵی ٦٣دا کە ڕۆیشتوومە شاری سنە. لەو هاوڕیانە کە لە گەڵیاندا چاوپێکەوتنم بوو. یەکێکیان ئاغەی عەبدولموئمنی مەردووخ تاکە کوڕی خوالیخۆشبوو شێخ مەردووخ بوو. پارچە هۆنراوێک لە خوالیخۆشبووشێخ مەردووخ کە ئاڕاستەی منیان کرد ئەو بەڕێزە ئەم پارچە هۆنراوەیان پێنج مانگ پێش لە کۆچی دواییان لە کاتی ناخۆشیدا هۆنیوەتەوە. من ئەم پارچە هۆنراوە جوانەم چاپ کرد و وێنەیەکی پێشکەشی ئێوە دەکەم. بە سپاس لە برامان ئاغەی سەمەدی بە بۆنەی ڕێزگرتن لە بیرەوەری زانای کۆچ کردوومان شێخ مەردووخی کوردستانی و هۆنراوەکەی ئەو خوالیخۆشبوویە وەک خۆی چاپ دەبێت.

١٩- سەقز ٦٤/١٠/١٨: برای زانیار و نووسەری لاوی تێکۆشەرمان ئاغەی عومەری فاڕۆقی لە مەڵبەندی سەقز. ئەو شارە فەرهەنگی و هونەرییە بنچینەدارەی کورد و لە ڕێزی پارێزەرانی کەلەپوری فەرهەنگی کورد، بۆ من ئاوا نووسیویانە: بە پێشکەش کردنی سڵاوە گەرمەکان لە داوێنی بەرز و پڕ لە بەفری کێوستانەکانی کوردستان، ئەم گیانە چوارپارچە و خوێناوییە. لەش ساقی و بەختەوەری ئێوەم لە خودای گەورە داوایە، بەڵام سەبارەت بە کاری ئێوە دەبێ بڵێم. کارێکی زۆر گرینگتان دەست پێ کردووە و بوونەتە زمانی بوێژی گەلێک کە لە نیشتمان و مەڵبەند و گەل و خزم و خێڵ و هۆزی خۆیان براونە و بە پاراستنی بنچینەی فەرهەنگی و نەتەوەیی و ڕەگەزییەکانی خۆیان لە خوراسانی گەورەدا نیشتەجێ بوونە. بە ڕاستی ئێوە بە ئەم کارەتان مافێکی گەورەتان لە ئەستۆی مێژوو و فەرهەنگی کورد و کوردستانەوە هەیە. بە تایبەت برا و خۆشکە کرمانجەکانی ئێمە لە خوراساندا دەبێ زۆرتر لە هەموو ڕێزی خزمەتی بایخداری ئێوە بگرن. هەروەها سەبارەت بە مەبەستەکانی لاپەڕەی ٣٢٢ی بەرگی دووهەمی پەڕتووکی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان بە ئاگاداریتان بگەینم کە: چاپان خێڵێک لە هۆزی تیلەکۆی نێوانی سەقز و دیواندەرەن و لە دوو گوندی چاپانی ژوور و چاپانی خواردا نیشتەجێن، دەبێ جابانەکانی ئێوە لە خوراساندا لەم هۆزە بن. برای خۆشەویست وشەی چاپان دروستە، بەڵام بۆ ئەوەی کە عەرەبی نووسەکان لە پیتەکانی:چ و پ کەڵکیان وەرنەگرتووە، گۆڕاویانەتە پیتەکانی: ج و ب بەم بۆنەیەوە بووەتە جابان.

٢٠- زانکۆی ئیسفەهان: جەنابی ئاغەی دوکتور سیرووسی شەفەقی مامۆستای

زانکو ئیسفەهان بە دەربڕینی مەحەبەت فەرموویانە: تێکۆشانێکی زۆرتان لەم بوارەدا کردووە و بە ئەوین و هۆگرایەتییەوە کارتان کردووە. پەڕتووکەکەم بە دیکەی هاوکارانی گرووپی جوگرافیا پیشاندا. هەتا ئاشنایەتی پەیدا بکەن. هەموویان هەستی خۆشی خۆیانیان دەربڕی. من بە بۆنەی ئەم سەرکەوتنە پیرۆزباییتان لێ دەکەم.

٢١- تاران ٢٥٩٧/٩/٢٥ی کوردی ڕێکەوت لەگەڵ ١٣٦٤/٩/٢٥ی کۆچی هەتاوی:

چەند ساڵ بوو کە بۆ لێکۆڵینەوە و خزمەت بە فەرهەنگ و ئەدەب و مێژوو و هونەری کوردی کرمانج. لە لاپەڕەی پەڕتووکە فارسی و عەرەبیەکاندا دەگەڕام و گوم بووی خۆمم ئەویست. لەو زانستەی کە مامۆستای هێژای کرمانجی خۆم ئاغەی کەلیموڵلای تەوەحودی بووەی ئاگام نەبوو کە بە ڕاستی ڕووبەرگی یەکەم و دووهەمی پەڕتووکی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسانی ئێوە ئالای گەلی کوردە. شەلاپەرتووکی و شەنامەی کرمانجی ئێوەم ئەبینی. بە ڕاستی تۆ وەکوو فریشتەی ئاسمانی هاوار و بانگەوازت بۆ ناسینی کورد ئەم نەجیبزادە بنچینەدارە ئاریاییە کردووە. ئافەرینت لێ بێ- هەزار ئافەرین لە تێکۆشانی پیاوانە و زانیارانەت. گەلی کورد دەبێ ئەم پەڕتووکەی ئێوە بایخدارتر لە تەلا بکرن و بە جێگای چاوڕۆشنی و خەلاتی بایخدار پێشکەشی هاوڕیانی خۆیانیان بکەن. هەتا هەموو لە فەرهەنگ و بنچینەی ڕەگەزی و مێژووی و هونەری خۆمان سەردەر بێنین و خۆمان بناسین. جەنابی ئاغەی دوکتور ساڵحی ئیبرایمی بە ناوبانگ بە «شەپۆل» کە لە زانیارانی بە ناوبانگی کورد و نووسەرێکی پڕ شوور و چالاکەنامەی پڕ لە مەحەبەتی سەرەویان نووسیوە. لە دەربڕینی هەست و بڕوای ڕاستەقینانەیان سپاس دەکەم. لەوەی کە یەکەمین کۆڕی گەورەی فەرهەنگی کورد کە لە سێهەم هەتا پێنجەمی ڕەزبەری ساڵی ١٣٦٥دا لە مەهاباددا بە ڕێوە چوە بووە هۆی ئەوەی کە لە مەهاباددا لە نزیکەوە بگەیمە خزمەتی ئەوان و خۆیشەویستان و زانیارانی دیکەی کورد و ڕێزی خۆم دەربرم، زۆر شانازم.

٢٢- **مەهاباد** ٦٤/١٠/٢٨: برای بەڕێز و هۆگر و زانیارمان ئاغەی ئەحمەدی بەحری کە لە مامۆستایانی تێکۆشەری شاری مەهابادن و لەگەڵی نامەکانیدا

ئاشنایەتیمان هەیە. فەرموویانە: ڕووبەرگی دووهەمی پەڕتووکی کۆچی مێژووی کورد بۆ خوراسانم چەند جار دەور کردەوە و ئەو شتەی کە بە هیوای بووم لەو پەڕتووکەدا پەیدام کرد. لە هەمبەری ئەم هەموو تێکۆشانە کە لە نووسینی ئەم پەڕتووکەدا کردووتانە. نازانم بە چ زمانێک سپاس بکەم. پێم وایە باشتر ئەوەبێ کە بە زمانی سک ماکی خۆمان بڵێم:

لە ژمارەی دووهەمی گۆڤاری سروەدا مەبەستێک لە ئێوە چاپ بوو . ئەم مەبەستە شانازمی کرد بۆ ئەوەی کە زانیم ئێوە لە گەڵی نووسەرانی کوردستاندا پێوەندیتان هەیە. لە ئەم چەند ڕۆژەدا خودا کچێکی پێم داوە، منیش بە بۆنەی دەست بە کار بوونی گۆڤاری سروە بە زمانی کوردی کە کارێکی زۆر گرینگە ناویم ناوتە سروە.

٢٣- **بجنۆرد قوردانلۆ (گردانلۆ)** ٦٤/١١/١٩: برای لاو و تێکۆشەر و ماندوو نەبوومان ئاغەی عەلی ڕەحمەتی لە شاری قارەمان پەروەری بجنۆردەوە، لە نامەیەکی ناوەرۆکدار و پڕ لە هەستدا کەلێنێک لە مێژوو و جوگرافیای گوندی قارەمان پەروەری قوردانلۆ زێدی خۆیان و خوالیخۆشبوو عەلی پاڵەوانی ڕۆحانییان ناردووە بۆم و وێنەیەکی کێشراویان لە ئاکامین هێرشی شەوانەی تورکەمانە تالانچییەکان بۆ ئەم گوندە کێشاوە کە بە یارمەتی خودا لە ڕووبەرگەکانی داهاتوودا لە چاپ ئەدرێت. گوندی قوردانلۆ لە پێنج خێڵ پێکهاتووە و نزیکەی چوار سەد بنەماڵەی لێدا دەژین. کە هەموویان کوردن و کوردی سەربەست. هەروەها وتووێژێکیان بووە لەگەڵی یەکێک لە برا ڕەزمەرە کرمانجەکانی ئێمەدا کە خەڵکی گوندی‌داشلی قەڵای بجنۆردن، لە بارەیانە و هێناویانە: قوربان موحەممەدی عابیدی لە دەستەی گرووڤی موحەممەد ڕسوولەڵڵای هێزی نەسرە و ٣٤ ساڵ تەمەنیە. کە لە چاکترین ڕەزمەرانی بەسیجی ئێرانە و لە هەڵمەتی وەلفەجری هەشتدا بەشداری بووە و بیرەوەرییەکانی بەم شێوە گێڕاوە. لە هەڵمەتی وەلفەجری هەشتدا کە لە فاودا ڕوویدا. ئێمە مندالانی بجنۆردی هەموومان ئامادە بووین. لە سەعاتی هەشتی شەودا سەرەتا بە مەلەوانەکان دەستووردرا کە بە ڕۆیشتن بە ناوی ڕوخانەی ئەروەند و هەمووی ئەو گۆڕەپانە مینانەوتەڵە تەقینەوەییە دڕکرارانە کە عێراقییەکان لە ناوی ڕۆخانەی ئەروەنددا سازیان کردووبتەقێننەوە. ئەم هەڵمەتە هەتا سەعاتی ١٠ی شەو

بە شێوەی سەر کەوتنانە ئەنجام درا. خودا یارمەتیمانی دا و بارانێکی زۆر توند دەستی پێ کرد ئێمە بە مەلە گەیشتینە ئەو لایەنی ئەروەندرۆ و نارنجەکەکانمان فڕێ دا نیوانێ نیشتگەکانی دوژمن کە زۆر بێ‌خیاڵ بوون و هەموویانمان ناردە توون. سەنگەر بە سەنگەر ڕۆیشتینە پێشەو دوژمن وەها گیج و سەریان سووڕ ماو کە نەیاندەزانی دەنگی ئەم گوللانە چیە؟ بۆ ئەوەی کە ئەوان قەت گومانیان نەدەکرد. کە ئێرانییەکان لە هەمووی ئەو ڕێگرە تەقینەوەییانە گەڕابێن و خۆیانیان گەیاند بێتە ئەوێ. لە پاش سێ سەعات شەڕی خوێنین لە سەعاتی یەکی شەودا هەمووی ئەو ئامانجە لە پێش دیاری کراوانەمان بە دەست هێنا و درێژەمان‌دا بە پێشکێشی و لە سەعاتی ٨ی بەیاندا گەیشتینە شاری فاو و ئەوێمان گەمارۆ کرد. گرووپی ئێمە کە زۆربەیان لە کوردەکانی بجنۆرد بوون. لە سەعاتی ١٢ی نیوەڕۆدا بوو کە سەتەلایتە ئەمریکاییەکان هەواڵی هاتنی هێزەکانی ئێران بۆ شاری فاویان بە ئاگای سەددام گەیاندوو کە دوژمن بە ٨٠٠ دەزگا تانک و هەزاران کەس لە هێزەکانی خۆی بەربەرەکانییەکی زۆر سەختیان دەست پێ کرد. کە بوو بە هۆی کوژرانی زۆربەی هاوڕیانی ئێمە و ئەو پاشماوەیشمان پاشەکێشیمان کرد، بەڵام من و ٢١ کەسی دیکە لە لاوە بجنۆردییەکان سەخت خۆڕاگریمان کرد و لە چەند دەقێقەدا ٣٠ دەزگا تانکی دوژمنامان لە کار خست و سەدان کەسمان لێیان کوشت و بە هاواری ئەڵلاهوئەکبەر دامانە ناوی دڵی دوژمندا و دیسان ١٥ دەزگا تانکمان لە نێوان برد. لە ئاوا ساتێکی گرینگدا بوو کە تۆپخانەی بە هێزی ئەرتەش و سوپای پاریزەرانی شۆڕشی ئیسلامی ئێران دەنگیان بەرزەو بوو و وەڵامی هاواری ئەڵلاهوئەکبەری ئێمەیان داوە. بۆ ئەوەی کە من لە هێزەکەدا لە ئارپیچی وەشاندا پلەی یەکەمم بوو. تانکەکانی دوژمنم لە پاش یەک لە پاش یەک هەڵمەت ئەدا و لە نێوان ئەبرد. پیرەمێردێک کە لە کنمدا بوو و لەم بوارەدا منی یارمەتی ئەدا. دوو ڕۆژ پاشتر هەواڵ گەیشت کە هێزەکانی ئیسفەهان توانیویانە. بگەینە ئامانجی خۆیان. من و چەند کەسی دیکە کە هەموویان لە کوردەکانی بجنۆرد بوون بە شێوەی خۆخوازانە ڕۆیشتن بۆ یارمەتی‌دانی ئیسفەهانییەکان و لەو شەڕیشەدا بەوەیشەو کە تەرکەشم خوارد و گوێکم کەندراوە. قەت ژانم هەست نەکرد و بە ئارپیچی بە لایەکم بە سەری عێراقییەکاندا هێنا. کە دەنگی هەلات، هەڵاتیان گەیشتە ئاسمان.

لە پاش ئەم سەر کەوتنە جارێکی دیکەیش لە هەڵمەتی کەربەلای پێنج لە ناوچەی بە سرەدا بەشداریم کرد و هەر بە ئەو بەلامانە بە سەری عێراقییەکاندا هێنا کە پێشتر هێناومان. ئێستایش کە هەڵمەتی کەربەلای پێنج کۆتایی پێ هاتووە. بۆ مورەخەسی هاتوومەتەوە بۆ بجنۆرد. دەبێ ئاماژە بکەم کە برامان قوربان موحەممەد دیسان زوو رۆیشتە و بۆ گۆڕەپانی شەڕ و ئێستا لە گۆڕەپانی شەڕدا کەوتووەتە گیانی عێراقییە هێرشکەرەکان. ٦٤/١١/٣- بجنۆرد- بە هیوای سەرکەوتنی پشمەرگەکانی ئیسلام بە سەری کفری سەددامی و تالانچیانی جیهانیدا.

٢٤- تاران: دامەزراوی نەیشاپوور: دامەزراوی کۆلەرایەتی فەرهەنگی ئێران- ٦٤/١٢/٣- برای زانیارمان ئاغەی دوکتور فەریدوونی جونێدی نەیشاپووری دامەزرێنەری دامەزراوی نەیشاپوور کە زمانی زەرتوشتی لە دەم و خۆشەویستی ئێرانی لە دڵ و شووری فردەوسی لە سەردایە، فەرموویانە: برای بەڕێز و هێژا، دەلگی بەرزی کوردە کرمانجەکان، سلاوتان لێ بێ. ئەمڕۆ دوازدەهەمی ڕەشەمە پەڕتووکی بایخداری کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسانم گەیشتە دەست و بێدرەنگ وەکوو تینوویەک کە ڕۆژان و شەوانێکی زۆر لە بیاوان و کێوستانەکاندا گەڕاوە و گەیشتبێتە کانییێکی فێنک، پەڕتووکەکەم کردەوە و لە پاش خوێندنی سەروتارەکەی و کەڵک لێ وەرگرتنی، چاوێکم خشاند بە سەری هەمووی بەشەکانیدا. هەندێ بەشیم زوو خوێندەوە. وەکوو ئەو مەبەستانەی کە سەبارەت بە هۆزی کوردی زەنگە و فتوای دورست کراو و هۆنراوی پڕ لە هەستی شێر عەلی شوانی کورد و دوو پارچە هۆنراوی جوانی ئێران و کرمانج و بەشی دواییینیم بە فرمێسک لە چاواندا خوێندەوە و لە ئەم کانییە ڕۆشن و خاوێنە تینووییم شکا. من لە هەستی بێ‌ڕیا بە ئێران کە لە سەرانسەری ئەم پەڕتووکەدا شەپۆل ئەدا. شاناز بووم، هەر کام لە وێنەکانی پەڕتووکەکەم کە ئەبینی ئەمناسی و ئەو ڕووالەتانەم چەند جار لە سەری کێوی حەیدەری و جولگەی مارووسکی نەیشاپوور و لە هەندێ ناوچەی سەرولایەتی خوراساندا بینیوە. لەگەڵیاندا قسەم کردووە و لە مەحەبەت و ساکار ژینیان خۆشم هاتووە. هیچ وێنە و هیچ مەبەستێک سەبارەت بە کوردەکانی خوراسان بۆم نەناس نیە. هەموویانم ئەوێ بە گیان و دڵ و لە گەڵی هەمووی ئەوانەدا سەردەمی پڕ لە ئاواتی منداڵی و تازە لاویم لە سەر گەڕاندووە. هەمووی ئەمانەم لە چاولێکردنی پەلە

ئاسای خۆمدا بینی و ئێستا دەبێ پەڕتووکەکە ببەمە و بۆ ماڵ تاکوو بە دەرفەتی تەواوەو ڕستە بە ڕستەی بخوێنمەوە. سلاو ئاراستەی ئێوە و هەمووی شێرە پیاوانی کوردی خوراسان و هەمووی ژنانی شێر دڵ مەرام و هەمووی کچان و کوڕان و هەمووی پیرەمێردان و پیرەژنان و هەمووی ڕەشە چادرەکان و گەڕەکەکان (بینەکان) و هەمووی ئاژەڵەکان و ئاژەڵداران و ئەسپ و ئەسپ سورانی کوردی خوراسان دەکەم. فەرەیدوونی جونێدی- تاران ٦٤/١٢/١٣ منیش وەکوو یەکێک لە ڕۆڵە کوردە بووچککەکانی خوراسان و لە لایەنی ئەو پاشماوانەی هۆزی کاویانە و سلاوی خۆم ئاراستەی یدوننی برامان و قارەی ئاژەڵەکان و سیرەی ئەسپەکان و دەنگی هەورە تریشقەی کێوستانە جوان و سەر سەوز و بەرزەکانی ئالاداخ و شایجان و بینالۆد و هەزار مزگەوت و گولێل و کیمساریان دەکەم و لە خودای گەورەم داوایە کە پێنووسەکەیان لە ڕێگای پەرەپێدانی ئەدەبیاتی ئێران زووینەدا، بزوێندراوتر لە ڕابردوو بە کاری خۆی درێژە بدات. تەوەحودی- ٦٥/٢/١٥.

٢٥- کەرەج ٦٤/١٢/١٦: لەو نامە جوانانە کە قەت ناتوانم کورتیان سانسۆری بکەم، نامەی پڕ لە مەحەبەتی مامۆستا ڕەشیدی کێخەسرەوییە. کە بە بلاو کردنەوەی پەڕتووکی سەردەمی بێ هەواڵی سەبارەت بە ئاسەواری مێژوویی زۆر بایخداری زێویە مافێکی گەورەیان لە ئەستۆی گەلی تالان کراوی ئێرانە و هەیە. فەرموویانە: جەنابی ئاغەی کەلیموللای تەوەحودی، نزیک بە یەک مانگ لەمەو پێش لە ڕێگای دەور کردنەوەی پەڕتووکی کۆچی مێژووی کورد بۆ خوراسان. لەگەڵ ناو و تێکۆشانی بێ کۆتایی و بایخدارەکانی ئێوەدا ئاشناوەو بووم. بە ڕاستی دەستت خۆش بێت. بە ڕاستی هۆی شانازی گەل و ڕەگەزی ئێرانیت. بۆ ئەوەی کە بایخی کاری ئێوە نێتە خوارەوە، بە خۆم ئیزن نادەم کە بە سپاسی وشک و پەتی هەستە بێ کوتاییەکانی خۆم، بە وتنی ئەو شتانەی کە ناتوانم بێنمیە سەری کاغەز دەرببرم، بەلام من ئەو کاتە زۆر داخم هات کە مامۆستا فەرەیدوونی جونێدی. لە وتوویژ لەگەڵ ئێوە لە تاراندا کە لە یەکەمی ڕەشەمەی ساڵی ٦٤ زۆر تاریفی کرد و زۆری کرد کە لە دیتنی ئاغەی تەوەحودی و تێگەیشتن لە هەستە خاوێنەکان یەک گەز بالام کرد. ئەگەر ئاغەی جونێدی بە ئەو بالا دوو گەزییە لە خۆ جوانەیان کە دیکە جێگا و شوێنێک بۆ درێژ بوونیان نیە. وەها کەڵکێکیان بردبێت. وەی لە منی

باڵا بووچک کە لە ئەم کەڵکە بێبەش بووم و لە کاتێکدا بەوە دەزانم. کە ئەمە مافی من بووە کە ئێوە ببینم و نەمدیوە. لە ئاغەی ئیرەجی ئەفشار زۆر گلەییم کرد و وتم: ئێوە کە میوانداری وەها میوانێکی خۆشەویست بوونە، بۆچی منیشتان ئاگادار نەکرد؟ بەڵام میوانداری بەرچاو تاریکی ئێوە کە لە بەخشداریەتیدا دەستی حاتەمی لە پشتەو بەستووە. بۆ بێ تاوان پیشاندانی خۆی چەند هۆی هێناوە. بە هەر جۆرێک، هەر چەند کە ئێمە یەکترینمان لە نزیکەو نەدیوە، بەڵام لە ڕووی ئاسەواری تێگەیشتم. کە هەردوومان بە گووردێک گڕمان گردووە و ئاگری دەروونمان لە ئەوینێکی سووتێنەر گڕی گرتووە... (کەرەج- عەزیمیە- هۆگری ئێوە- ڕەشیدی کێخەسرەوی)

**٢٦- قووچان: ٦٤/١٢/٢٠**- نامەی دیکە نامەی پڕ لە شوور و هەستی ئاغەی شێر عەلی تارانیزدە بوو. کە چەند مانگی پاشتریش شانازی چاوپێکەوتن و ئاشنایەتییان بوو بە بەشم و لە ڕۆیشتن بۆ مەهاباد و بەشداری لە کۆڕی فەرهەنگی کوردیشدا منی هەزاریان هاوڕێیی کرد. هەروەها لەگەڵ ئنامەی ناوەرۆکداری خۆیاندا چەند پارچە هۆنراوی جوانیان بە کرمانجی و فارسی و تورکی بۆم ناردووە. کە زۆر سپاسیان دەکەم و بە یاری خودا ئەم هۆنراوانە لە پەڕتووکی و تەویژانی کورددا لە چاپ ئەدرێت.

**٢٧- دەڕەگەز ٦٥/٢/٣١**: برای خۆش بیرمان ئاغەی حاجی موحەممەد مەهدی مورادینیایش وەهایان نووسیوە: کەلیم گیان ڕووبەرگەکانی یەکەم و دووهەمی پەڕتووکی کۆچی مێژووی کورد بۆ خوراسان کە دەسکەوتی چەند ساڵ لێکۆڵینەوەو گەڕان لە بەڵگەو بنچاخە مێژووی و فەرهەنگییەکاندایە و بە پێنووسی سێحر خولقێنی ئێوە زیندووە و بووە، بە هۆگرایەتی زۆرە و خوێندەو و لە بیرهێنان و هێنایە بەرچاوی دیمەنی پێشمەرگایەتی و گیانبەختکاری باپیرانمان لە ڕێگای سەربەخۆیی و پاراستنی نیشتمانی خۆشەویستمان ئێراندا، خۆمم لە ئەو پەڕی شانازیدا بینی.

بەڵام ئەم کارە بە کەڵک و لە شانەی ئێوەی بەڕێز ڕاگەڕانەوەیەک بێت بۆ شانازی خۆمانی کرمانج. سەرکەوتنی زۆرتری ئیوە داوایە. موڕادینیا.

**٢٨- زانکۆی شیراز**: ئاغەی دوکتور جەمشیدی سداقەت کیش مامۆستای

زانکۆی شیرازیش له مێژووی ٦٥/٥/١٦دا فەرموویانە: لە گۆڤاری پەڕتووک ناسی مێژووی ژمارەی چوارەمدا کە بۆ بەشی مێژووی کۆلیجی ئەدەبیات و زانیارییە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی شیرازی بلاو دەکەمەوە ئاماژەم بە ڕووبەرگی دووهەمی پەڕتووکی ئێوە کردووە. دلّم ویستی ئەم مەبەستە بە ئاگاداری ئێوە بگەیەنم. هەروەها نامیلکەیەک بە ناوی خێلەکان و هۆزەکانی ئێران کە لە سالّی ١٢٨٨ کۆچی هەتاوی و ڕێکەوتی سالّی ١٩٠٩ی زایینی کە لە ژێدەرە ڕامیارییەکانی بالّوێزی ئینگلیز لە تاراندا گیراوە بۆ ناوەندی کۆمەلّناسی زانکۆی شیرازم وەگێڕاوەتەوە لە هەمووی هۆزەکانی خوراسانیش ناوی بردووە. ئەم نامیلکە بۆ کاری ئێوە بە کلّکە.

هیوادارم لە ڕێگای نووسیندا دیسان سەرکەوتوو و پیرۆز بیت. ئەگەر کارێک لە دەستم بێت بۆ خزمەتکاری ئامادەم. دوکتور جەمشیدی سداقەت کیش.

٢٩- سوئێد ٦٥/٦/٢٥: برامان ئاغەی مەهدی قەراچورلۆ بە ناردنی کارت پوستالّێکی زۆر جوان لە ئەو لایەنی مەلّبەندە دوورەکانەو وەها منیان دلّداری داوە: کەلیم گیان. پێوەندی ئاشنایەتی من لەگەلّ ئێوەدا بە بۆنەی پەڕتووکێک بە ناوی کۆچی مێژووی کورد بۆ خوراسان بوو، دەبی ڕاستەقینانە بلّێم کە هەرچێ زۆرتر لاپەڕەی نووسراوەکانتان ئەدەمە لاوە، ئەکەومە ئەو بیرە کە چلۆن لەگەلّی ئێوە خۆتاندا پێوەندی بگرم؟ ئاشنایەتی لەگەلّی پەڕتووکی ئێوەدا، هەستی شانازی بە کرمانج بوونی لە دەروونمدا زیندووتر کردەوە، بینچینەیەک کە بە نەبوونی تەرفەم و ئاگاداری خۆمان و بەرەی پێش لە خۆمان کە هەر ئەو باپیرانەمان بن، لە نێوان ئەچوو و ئەگۆڕدرا. کە ئەمە هەر ئەو شتەیە کە ڕامیاری تالانچییەکان بۆ بە دەست هێنانی تێکۆشاون. ئێستا بە هەمووی هەستمەو بەو کەسانە کە وەها بنچینەیەکیان بۆ ئێمە کرمانجەکانی خوراسان ساز کردووە و ئەو کەسانەی کە ئەم بنچینانە ئەپارێزن هەستی شانازی دەکەم. بە داخەوە لەوەی کە لە ماوەی ئەو دوو مانگەی کە لە ئێراندا بووم و هەر چەند کە چەند جاریش هاتمە مەشەد، تەنیا بەو بۆنەیە کە هێشتا پەڕتووکەکەتانم نەبینیو و ئاگاییکم لە ئێوە نەبوو، نەمتوانی بگەیمە خزمەتتان. بە بۆنەی لە دەستدانی ئەبولفەزلی خۆشەویست سلاو سەرخۆشی ئاڕاستەی بنەمالّەی بەڕێزی تەوەحودی دەکەم. قەراچورلۆ.

**٣٠- شنۆ ٦٥/٨/١٣:** کوڕی مامان ئاغەی عەبدوڵڵای بەلەدی لە مەڵبەندی قارەمان پەروەری شنۆوە و بە دەستنووسی جوانیان وەهایان نووسیوە: لە خزمەتی مامۆستای بەڕێز و هێژا جەنابی ئاغەی تەوەحودی- بە سڵاوی زۆرەوە. لەش ساقی بەختەوەری ئێوەم لە خودای گەورە داوایە. دەبێ لە نامەی نەناسراوێک زۆر خۆشحاڵ نەبن، بەڵام بەوە نازانم کە زۆریش نەناسراو بم. بۆ ئەوەی کە هەردوومان لە یەک ڕەگەزو بنچینەین. من لە کۆڕی فەرهەنگی کورد لە مەهاباددا کە لە مێژووی ٦٥/٥/٣دا کە ماوەیەکی لەمەو پێش بە ڕێوە چوو لەگەڵی ئێوەدا ئاشنا بوومەوە. بە ڕاستی کوردستان بە هەبوونی مامۆستایانێک وەکوو ئێوە شانازی دەکات. باوڕتان بێت ئەو کاتە کە ئێوە لە کۆڕەکەدا قسەتان ئەکرد و بە زاراوەی جوانی کوردی باکوور سەرەنجی هەمووی دانشتوان لە هۆڵی کۆڕەکەتان بۆ لایەنی خۆتان ڕاکێشاو و هەمووی چاو و بیرەکانتان بۆ لایەنی خۆتان ڕاکێشاو. شانازی من بە ئەو هەموو زانیاری و ئاگاداریتانە زۆرتر دەبوو و لەوەی کە کوردستانی خۆشەویستمان مامۆستایانێکی وەکوو ئێوەی هەیە بە خۆمدا دەنازم و زۆر شانازم. دەبوا باشتر ئەوە بوو کە زووتر خۆمم لە خزمەتتاندا دەناساند. منی هەژار عەبدوڵڵای بەلەدی نەوەی ئەمین شنۆیی هۆنەری گەورەی کوردستانم، بەڵام بە داخەوە کە باپیرم هۆنەرێکی نەناسراوە، هەر چەند هۆنراوەکانی جوان و بە دڵەونیشن.

**٣١- جەرگەلان:** برای مامۆستامان ئاغەی ڕەزای یەزدانی هێزانلۆ (پێیان دەڵێم بۆ ئاگاداری زۆرتر لە باردۆخی کوردە هێزانلۆوەکان چاوێک بڕوانن بە سەفەرنامەی ئەولیای چەبیدا) کە هەشت ساڵەوانە دەڵێ بە مندالانی گوندی و لە دۆڵی جەرگەلانی بجنۆردە و لە گوندی تورکەمان نشینی دۆڵە منداڵ لە نزیکەی سنووری ئێران و ڕووس. لەو جێگایەو کە من لە ساڵانی ١٣٣٩ هەتا ١٣٤٢ بیرەوەرییکی جوانم هەیە و لە ئەو دەرەتانە زستانییانەدا خەریکی کاری کۆچەرایەتی و ئاژەڵداری بووم و لەگەڵی خێڵ و هۆزی خۆمدا زۆر خووم گرتوو، دوو نامەی پڕ لە هەست و جوانیان بۆم نووسیوە، کە وەها تەڵچن دەکرێت:

بە وتەی یەکێک لە هاوڕیانم کە ڕۆیشتووە تورکیا، ئەیوت لە چاوپێکەوتن ەگەڵی یەکێک لە کوردە کرمانجەکانی تورکیا و وتووێژ بە زاراوەی کرمانجی ەگەڵیدا، خۆشەویستی و ڕێزێکی تایبەتی پەیدا کردوو و کوردەکانی تورکیا

پێشوازی زۆریان لێی کردوو. ئەیوت ئەو کوردانە سەبارەت بە خزم و هاو هۆزییەکانی خۆیان پرسیاریان کردوو. ئەیوت ئەو کوردانە لە دیتنی من ئەوەندە خۆشحاڵ بوون، کە وەکوو ئەوەی کە گوم کراوی سەد ساڵەی خۆیانیان دۆزیوەوە. شەڵا دەبوا کە هەر کوردێک کە لە هەر کوێدایە ئەیتوانی سەفەر بکات و لە باردۆخی خێڵ و هۆز و خزمەکانی خۆی ئاگادار بێت. هیوادارم کە ڕۆژێک بگەیین بە ئەم هیوامانە و ڕۆژێک هەمووی خەڵکی ئێمە دەست بننە ناوی دەستی یەکترین و هاودەنگ بڵێن:

براکەم کەلیم، کاتێک لە کۆچ و کاروانی ماڵ لە کۆڵانی کورد لە کێو و دەشتەکانەو دەگەڕێت و من هەموو ساڵێ لە ئەم مەڵبەندە گەرمیانەدا بینەریم، دەبینم کە ئەک ستوانانە لە ڕێگای کۆچ کردندا دەخوێنن.

فرمێسک لە چاوانمەوە دێتە خوارەوە و ئەو شتانە کە ئێوە لە مێژوودا نووسیوتانە بۆم زیندوو نەبێتەوە کە ئەم ماڵ لەکۆڵانەی ڕابردوو بە چ سەختییەکە و لە ئەم مەڵبەندە پڕ لە بەڵادا توانیویانە خۆیان بپارێزن. ئەم نامەیە هەڵوەدایی و فەریو و دوورەو بوونی ئەم ماڵ لە کۆڵانە لە خێڵ و هۆزەکەیان پیشان ئەدات، بەڵام ئەم شتانە بۆ کرمانج گرینگایەتی نیە. چۆن پۆلای ئاو دیوەیە و وەکوو کێوی شایجان بەردەوامە. هەر چەند کە ئەگەر کێویش بوو، ماوەی ئەم پێنج سەد ساڵەدا بەو ڕۆژ ڕەشیانەی کە لە سەری گەڕاوە، ئاو دەبوو، بەڵام دەبینین کە ئەمە کوردە کە بەردەوام شاناز ماوەتەوە و ئەمڕۆیش دەستە دەستە و هێز هێز دەچێت بۆ گۆڕەپانی شەڕ، هەتا زیندوو بوون و دلێری خۆی لە دڵی مێژوودا بنووسێت، بەڵام نازانم بۆچی لە ئەم سەردەم و ئەم کاتەدا کوردەکان لە دام و دەزگای پێوەندی گشتی بە تایبەت ڕادوێ و تەلەفزیوون بێبەشن. بە تایبەت تەلەفزیوون؟ لە کاتێکدا کە بەرنامەی تورکەکانی لە تەلەفزیوونەو بڵاو دەکەنەوە، بەڵام بووچکترین تەرخەمێک بە فەرهەنگی کرمانجی ئێمە ناکرێت.

٣٢- بجنۆرد ٦٥/٨/١٥: برامان ئاغەی کیانی ڕەبانی لە هۆنەران هونەرمەندانی بجنۆردی، نووسییانە: کەلیم گیان

٣٣- تاران: ٦٥/٧/٦: زانیار و مێژوو نووس و نووسەری بە ناوبانگ ئاغەی ئەبولفەزلی قاسمیش، کە بە یارمەتی خودا تازە لە بەندیخانە ئازاد بوونە، بەو بۆنەیەی کە ڕووبەرگی یەکەمی کۆچی مێژووی کورد بۆ خوراسانم بۆیان ناردووە بەندیخانەی

ئوین و هیواداری خۆمم دەربریو کە لە یارمەتی خودای گەورە ناهومێد نەبن، کە بەم زوویە ئازاد دەبن. بە یاری خودا ئاواتەکەم هاتە دی و ئازاد بوو، کە لە سەری گەورەییە و وەها بۆمیان نووسیوە. نووسەر و کۆڵەری بەڕێز جەنابی ئاغەی کەلیمولّلای تەوەحودی!

دروست لە کاتێکدا کە لە سەختترین رۆژەکانی ژیانمدا لەگەڵی مردندا چەند هەنگاو زۆرتر جیاوازیم نەبوو، لە سلوولی تاکە کەسی بەندیخانەی ئویندا لەگەڵی دژواری و ناخۆشی بە بۆنەی سەختییەکان بەربەرەکانیم دەکرد. لە ناکا ڕووبەرگی یەکەمی پەڕتووکی ئێوەیان بۆم هێنا. بە چاو پۆستین لەوەی کە پەڕتووکی ئێوە بەرهەمێکی گەورە بوو، کە ماوەیەک من و لە پاش منیش کەسایەکی دیکەی سەرگەرم کرد و لە زانیارییە نوێ و بایخدارەکان سەبارەت بە مێژووی خوراسان تێگەیاند، بەڵام ئازایەتی و دلێری ئێوە لەو ڕۆژانەدا، خۆی گەورەیی و کەسایەتی و هێزی رۆحی ئێوەی پیشان‌دا. لەو ڕۆژانەدا کە لایەنگرییان دەربڕینی ئاشنایەتی لەگەڵی مندا کاری هەر کەسێک نەبوو. ئێوە دلێرانە پیشانتان‌دا. کە لەگەڵی بەندیێکی تاوانبار بەلە سێدارەدران ئاشنایەتیتان هەیە. بە وتەی پاوشای خودا پەرەستەکان. گەورەیی پیاوان لە کاتی مەترسییەکاندا دەرەکەوێت. دلێری ئێوە هەستمی براوتەوە کە بێدرەنگ وەڵامێکم بۆتان نووسیوە و ناردم، وەها باوە، کە نابێ نامەی بەندییەکان بە دەستی کەس و کارەکەیان بگات، ئێستا نازانم کە ئەو نامەیە گەیشتووە یان نە؟ نەیانهێڵا کە پەڕتووکەکە کە ئێوە لە بەندیخانە بێنمە دەرەو. لە کاتی گواستنەوەم بۆ بەندیخانەی کۆمیتە لەگەڵی خۆمدا بردم و لەوێدا بە جێ ما. بەندی کراوانی پاشتر هەواڵیان بۆم هێنا، کە پەڕتووکەکە لەو سلوولەدایە و هەر کەسێک کە ئەچێتە ئەو دیوە، لەم بەرهەمە بایخدارە کەڵک وەردەگرێت. ڕووبەرگی دووهەمی پەڕتووکی ئێوەیش گەیشتە دەستم. خەڵکی خوراسان بە تایبەت خەڵکی ناوچە کوردنشینەکان، دەبێ هەتا ئاکامی جیهان ڕێزگری ئەم تێکۆشانەی ئێوە بن. بە ڕاستی (بەرەی دلێری خەڵکی نیشتمانی ئێمە و سنوور پارێزانی دلێری ناوچەی خوراساندا بە جوانی ناساند. هەموو کاتێ یەکێک لە هیواکانی من ئەوە بوو کە کەسێ حازر ببێت و ئەم خزمەتکارییە بگرێتە ئەستۆ. نازانم چەنێ شانازم کە هیوا و ئاواتی من جردەی بەرهەمی لە بەر کراوە و ئەم کارە بە شێوازی جوان ئەنجام بوو.

هەموو کاتێ زانیاران و نووسەرانی خوراسانی دانیشتووی تاران بە چاکی لە ئێوە ناو دەبەن. بە تایبەت لە کنی هاوڕێ و وەرگێڕی گەورە ئاغەی قودرەتوڵڵای ڕۆشنی زەعفەرانلۆدا هەموو کاتێ لە گەورەیی و بەڕێزی ئێوە قسە دەکرێت. خودا سەرکەوتنی زۆرترتان پێ بدات. بۆ ئەوەیش کە لە پەڕتووکی من نادر شێرە مێردی ئەترەکیش کەڵکتان وەرگرتووە، زۆر سپاس دەکەم، بەڵام دەبێ لە پەڕتووکی ڕۆژهەڵاتەکان زێڕی نەناسراوی ئێران زۆرتر کەڵک وەرگریت. لەش ساقی و بەختەوەری و سەرکەوتنی ئێوەم داوایە. (تاران- ئەبولفەزلی قاسمی)

بە سپاس لە دەربڕینی مەحەبەت و بڕوای جوانی زانیاری گەورە مامۆستا قاسمی، هیوادارم دیکە قەت بە دوای کار و باری ڕامیاریدانە ڕۆن و ڕامیار و کار و باری جیهان، بە ڕامیاران و جیهان دۆستان بسپێرن و وەکوو ڕابردوو پێنووس بگرنە دەستەو و بەرهەم بخولقێنن. چەند مەبەستێک لە پەڕتووکی ڕۆژهەڵاتەکان بەرهەمی بایخداری ئەوان کە دەبوا کەڵکی لێ وەردەگیرا. لەگەڵی ڕووبەرگی سێهەمدا پێوەندی بوو، کەڵکم لێی وەرگرت. بۆ ئەوەی کە پەڕتووکی ڕۆژهەڵاتەکان هۆگری زۆرە و لە بازاڕدا پەیدا نابێت. هیوادارم تێکۆشن و چاوێکی پێدا بخشنن دیسان لە چاپی بدەن.

٣٤- تاران: ئاغەی موحەممەدی میر بلووکیش کە لە ڕۆڵەکانی خوراسانە و لە دوو لایەنە و لە بەرەی منداڵانی گەورەکانی ئەو ناوچەیە، یانێ مەمیش خانی کوردی زەعفەرانلۆ و عومادەلمولکی تەبەسییە. لەگەڵی دەربڕینی دڵداریدا چەند بەڵگەی جوانیشیان ڕوو کردووە. کە لەگەڵی مەمیش خانی زەعفەرانلۆ دەسەڵاتداری چناران و منداڵەکانیدا پێوەندی هەیە. کە لە چاپدانی دیسانەوەی ڕووبەرگی یەکەمدا لەو بەڵگانە کەڵک وەردەگیرێت. نووسیویانە: لە ڕێگای دوورەوە دەستت دەگۆشم و گۆناکانت ماچ دەکەم و لەوەی کە ڕاقەی ڕووداوەکان و ئازایەتی باپیرانمان بە تایبەت مەمیش خان و موحەممەد حوسێن خانی زەعفەرانلۆت لە بواری پاراستنی سنوور و نیشتمانەکەماندا هێناوتە سەری کاغەز، زۆر سپاس دەکەم. ئێوە بە دانرانی پەڕتووکە بایخدارە مێژووییەکانی خۆتان، مافێکی گەورەتان لە ئەستۆی بەرڕەکانی ئێستایی و داهاتووەو هەیە. بۆ ئەوەی کە ئەوانت لەگەڵ

ئەفشاری لە پاش وەرگرتنەوەی بەشێک لە مەڵبەندەکانی ئێران لـە دەسـتی پاوشـا هێرشگەرەکانی عوسمانی لە نزیکای سنووری ئەمڕۆیی ئێران و تورکیا، چەنـد هـەزار بنەماڵەی لە کوردەکانی زەعفـەرانلۆی لـە ناوچـەکانی نێـوانی مەشـەد و چنـاران و قووچان و شێروانە و بۆ بەرەوانی لـە ناوچـە وەرگیراوەکـان کـۆچ داوتـە ڕۆژهـەلاتی تورکیای ئەمڕۆیی، بەڵام ئەم دوورەو کراوانە دیسان لە ئەو لایەنی سنوور و لـە وڵاتی تورکیادان. لە سەردەمی قاجارەکاندا لە ژێری دەسەڵاتی ئێران دەرچووە و ئێستا ئەم برا و ئامۆزا کوردانەی ئێمە لەوێدا دەژین و خەریکی کاری کشت و کاڵ و باخـداری و ئاژەڵدارین. لە یەکێک لە مسافرەتەکانمدا بۆ وڵاتی تورکیا لەگەڵیاندا ئاشنا بوومـەوەو لەگەڵی یەکێک لە پیرەمێردە کرمانجەکانی ئەوێدا بە ناوی موحەممـەد عـەلی کـە نزیکەی ١٣٠ ساڵ تەمەنی بوو، قسەم کرد، ئەوان وتیان کە نادر شای ئەفشار ئێمەی لە ناوچەی نێوانی چناران و قووچانەو کۆچ داوەتە ئێرە کە پێشی هێرشی پاوشـاکانی عوسمانی بۆ خاکی ئێران بگرین. ئێمە هەتا چەند ساڵی لەمـەو پـێش بـە نووسـینی نامەیان ڕۆیشان بۆ ئەوێ لە باردۆخێ هاوهۆزی و خزمـەکانی خۆمـان لـە خوراسـاندا ئاگادار دەبووین و لەگەڵی زانیارانی گەورەی کورددا وەکوو، ئاغەی ئەمیر تـەوەکولی کامبۆزیای زەعفـەرانلۆ و حـاجی ڕەزا خـانی مـیر بلـووکی دەسـەڵاتداری چنارانـدا پێوەندی و نامە نووسینمان بـووە. بـرای بـەڕێز و زانیـارم، کـەلیم گیـان، ئەمویـست پێشنیارێکی دیکەیش بدەم و لەوەی کـە قـسەم کێـشایە درێـژا، دەبێ بمبـووزی. پێویستە ئێوەی بەڕێز سەردانێکی ناوچەکانی کەلانی نادری و لاین و دەرەگەز بکەن و ئاسەوای مێژوویی کەلات بە جوانی بخەیتە پێشی دەور کردنـەوە و لێکۆڵـینەوە و ە ناوچەی لاین و خاکستەردا لەگەڵی بـە جێمـاوانی هـۆزە بـەڕێزەکانی، جـەلایر و شێخانلۆ و سۆفیانلۆ و زەیدانلۆ و تورسانلۆ و...دا لە نزیکە و ئاشناوەو ببیـت و زانیـاری ەربلاوێک لە پیرەمێردانی هۆزەکان سەبارەت بـە ڕووداوەکـانی ئاکـامی سـەردەمی خەمباری قاجـاڕ لـە ناوچـەدا بـە دەسـت بێنیـت و لـە ڕووداوە خـەمبار و شـانازی هێنەرەکان کە لە سەریان گەڕاوە. مەبەسـتێکی زۆر لـە پەڕتووکـەکانی داهاتووتانـدا ێننە ڕوو. لاین مەڵبەندێکە کە دەبێ بـە ڕاسـتی لـە بـەر چـاو بگیرێـت. گەلالـە اوەدانییەکان بە تایبەت لە لاینی خوێدا کە بووەتە هۆی پێکەوتنی کـشت و کـاڵ و اخداری و ئاژەڵداری بە تێکۆشانی ...

تەرخەمە. لە شارۆچکەی نویێ کە لە سالی ١٣٣٩ای کۆچی هەتاویدا بە پێی پێشنیار و ڕێنوێنی ئاغەی حاجی زولفەقاری جەلایر و گەورەکانی دیکەی هۆز وەکوو ئاغەکان: ئەلڵاوردی ئەرجومەندی سۆفیانلۆ و حاجی موحەممەدی سەفاییان و حاجی ڕەجەبی تەوەکولی و حاجی یەحیای سەفاییان و حاجی ئەسەدی سەفاییان و لە گەورەکانی شێخوانلۆیش وەکوو: حاجی ڕەحمان بەگ و نادری عالەمی و ئێرانپوورەکان و حاجی حەسەنی پەناهی بابان و لە گەورەکانی زەیدانلۆیش وەکوو: خوالیخۆشبوو ئیسماییل بەگ و حاجی میرزا بەگ و حاجی غولام عەلی لەبەرەی مندالانی ئیسماییلی کورد و حەبیبەلڵای بەگزادە دێهداری ئەو سەردەمەی لاین‌ساز کراوە. وێنە و وێنەی وەکخۆ بگرن و بیناسێنن. ئەم شارۆچکەیە تەنیا بە یارمەتی خەلکی ئەوێ سازراوە و ئێستا خاونی هەمووی ئاسایەتییە کۆمەلایەتی و خزمەتکارییەکان وەکوو: فێرگەی سەرەتایی و فێرگەی بالاو هەتا نەخۆشخانە و پۆستخانە و تەلەفوونخانە و هەموو شتێکی دیکەیە و تەنیا کەم و کوڕێ ئەوێ قیرتاو نەبوونیە. کە هیوادارین ئەم کێشەیشە بەم زوویە چارەسەر ببێت. برایانی گوندی دیکەیشمان لە ناوچەکانی دیکەی ولاتدادەتوانن دەست بننە ناوی دەستی یەکترین و بە هاوکاری گشتی لە بواری چوونە سەرەوەی ڕادەی پێشکەوتنی باردۆخی ژیانی خۆیاندا تێبکۆشن. (موحەممەدی میربلووکی)

**٣٥- مەشەد ٦٤/٩/١٥:** هۆنەری ڕووناکبیر و نوێ خوازی کرمانج، ئاغەی موختاری زەراعەت پێشەی بێچرانلۆیش بەم جۆرە منیان شەرمەزار کردووە. برانگی کەلیمولڵای تەوەحودی ئۆغازی!

برای خۆشەویست، ئێوە بە هەوڵ و تێکۆشانی شەو و ڕۆژی خۆتان لە بواری زیندوو کردنەوەی کەلەپووری فەرهەنگی هۆزی ئاریایی بنچینەدار و زۆر مێژوویی، دەبێ بە ڕادەی تەمەنی مێژوو، یانێ لە بواری زیندوو کردنەوەی مێژووی گەلی مندا، هەمووی تێکۆشانی خۆتانتان، بە کار هێناوە. کەوتمە سەری ئەو بیرە، کە لە تێکۆشانی ئێوە سپاس بکەم و بلێم، کارێک کە ئێوە دەستتان پێی کردووە. لە مێژووی کورددا زۆر گرینگ و جێگای گرینگایەتییە. کە تاکوو ئێستا وەها کارێک نەکراوە. هیوادارم خودا یارمەتیت بدا، کە ئەم بەر پرسایەتییە گرینگە بە ڕێوە ببەیت و ماف بگەینیت بە خاوەن ماف و بایخی بەرزی کاری فەرهەنگی خۆتان لە دلی

مێژووداا بنووسن. من لە کەند و کۆسپی زۆر و ماندوو بوونی ئێوە لە ئەم بوارەدا لە دوور و نزیکە و تێدەگەیم. بەم بۆنەیە و بە جێگای ڕخنە گرتن لە کارەکەتان. کە کاری هیچ نووسەرێک بێڕخنە نیە. ئەوەم بە چاک دەزانم. کە ڕابگەیێنم وەکوو هاوڕێ و یاریدەرێک ئامادەی هاوکاری لەگەڵی ئێوەم و من لە هەمووی کرمانجەکانی خوراسان داوا دەکەم. کە بە یارمەتیدانی ماڵی و بیرەوەری خۆیان ئێوە یارمەتی بدەن و بە پێکهێنانی دامەزراویان کۆڕێکی فەرهەنگی، قورسی کێشی ماڵی لە سەری شانی ئێوە هەڵگرن، هەتا ئێوە بتوانن بە خیاڵی ئاسوودە و درێژە بدەن بە کار و لێکۆڵینەوەی خۆتان لە ڕێگای زیندوو کردنەوە و پەرەپێدانی فەرهەنگ و هونەری کرمانجیدا. (داواکاری سەرکەوتنی ئێوە- موختاری زەراعەت پیشەی پێچرانلۆ.)

**٣٦- قووچان ٦٥/١٩/٢٢:** برای ئازا و بە هەستمان ئاغەی حەسەنی حەمیدی ئۆدکانلۆ لە نامەیەکدا بە دەربڕینی مەحەبەتەو فەرموویانە: برای خۆشەویست، ئێوە بە سەر بردنی کاتی بایخداری خۆتان مێژوو و فەرهەنگی کوردەکانی خوراسانتان کە نزیک بوو بۆ هەمیشە لە نێوان بچێت، دیسان ژیاندەوە و زیندووت کردەوە. زمانی بێ هێز و پێنووسم ناتوانتر لەوەیە کە بتوانم لە گەورەیی کاری ئێوە و شتێک بڵێم، بەڵام لە وەڵامی داخوازی ئێوەدا دەڵێم. کە لە ڕووبەرگی دووهەم لاپەڕەی ٨١دا نووسیوتانە. لە ناوچەی چگنەدا گوندێک بە ناوی زیک هەیە کە خەڵکەکەی بە زمانی تورکی قسە دەکەن. منیش بە ئاگاداریتان دەگەینم. کە لە نزیکی داخیانیشدا گوندێک بە ناوی زیک هەیە. کە هەندێ کەسیش پێی دەڵێن زایک و هەمووی خەڵکەکەی کرمانجن و بە زاراوەی کرمانجی قسە دەکەن، بەڵام بە داخەوە کە لە چەند ساڵی لەمەوپێشدا میرزاکان بە هەڵە بە زادەک نووسیویانە، بەڵام سەبارەت بە هۆزی ئۆدوکانلۆیش، بەو بۆنەیەو کە خۆمیش ئۆدکانلۆییم بڵێم، کە گوندەکانی ئۆدکانلۆییەکان بریتین لە: شێر خان بە ١٠٠ بنەماڵە و پیرە بە ٣٥ بنەماڵە و پەسکەن بە ٣٠ بنەماڵە و چەند بنەماڵەیەکیش لە گوندی جەرتوودە بە ناوبانگ بە کەرتیدا نیشتەجێن. لە وەڵامی برای ئۆدکانلۆییمدا دەڵێم: کە سەبارەت بە ئۆدکانی دوو وێنەی دیکەیش لە خوراسان و ئەفغانستدا هەیە. کە یەکێک لە هۆزەکانی خوراسان کە هەندێکیشی لە ئەفغانستاندا نیشتەجێن و بە ناوی هۆدکانی و هۆدکانلۆ

بە ناو بانگن و فارس زمانیش، بەڵام لـە چـاوی ڕوواڵـەتە و زۆر وەکـوو کوردەکـانن.
هەندێ لە مێژوو نووسەکانیش بە ئەفغانی نووسـیویانیانە: دەبـێ لـەم بـوارەدا زۆرتـر بکۆڵدرێتەوە کە ئەوانیش لە کوردەکانی ئەفغانستانن کە بـە گـەڕینی کـات بوونەتـە فارس زمان و لەگەڵی ئۆدکانییەکانی ئێوەدا، بنچینەیـەکیان هەیـە یـان نـە؟ بـەڵام سەبارەت بە گوندی زایک یان زادەک کە ئاماژەتان پێی کردووە، بەوە دەزانم کە ئەم گوندە هەر ئەو زازیکی ڕابردووی خوراسان بێت، کەسێش لە کۆچی کوردەکانیش بـۆ خوراسان بووە و یاقووتی حەمەوی ئاماژەی پـێ کـردووە و وتوویـە: و هـەمووەمانیش دەزانین کە ئوستویان ئوستوا کە لە باشوور ڕۆژاوای قووچانە و دەگـەڕێت و ناوچـەی ئێوەیش ئەگرێتە بەر، لە ڕابردوودا سەر بە نەیشاپوور بووە.

**٣٧- ئاغەی ئەحمەدی شاملۆیش نووسیویانە:** بە ناوی خودا- پێشکەش بە برای کۆڵەری هێژام کاکە تەوەحودی- بە وتەی یەکێ لە پیتۆڵەکان، ئەمـڕۆ دەسـکەوتی دوێنێیەو بناغەی بەیانییە. بە داخەوە هەتا چەنـد سالـی لەمـەو پـێش کوردەکـانی خوراسان نەیاندەزانی کێن؟ و لە کوێیەو هاتوونە؟ بۆچی هەموویان لـە سـنوورەکانی ڕۆژهەلاتی خوراسان و لە داوێنی کێوە بەرزەکاندا نیـشتەجێن و زنجیرەیـەکیان لـە کەلاتەو هەتا دڵی تورکەمان سـەحرا پێکهێنـاوە؟ ئەگـەر کـەڕانی کـات ئـەوانی لـە دیکەی شارەکاندا بلاو کردووەتەوە و کەم تەرخەمی بەرەی ئەمڕۆ بووەتـە هـۆی لـە بیر چوونەوەی زمان و ئەدەبیاتیان، بـەڵام هـەر چەنـد جـار دەکەونـە بـیری زێـد و جێژوانی خۆیان و بە کورد بوون شانازی دەکەن. (بە پێچەوانەی هەندێ کـەس کـە نە تەنیا کورد بوون بەڵکوو تەنانەت قسە کردن بـە ئـەم زمانـە مێژووییـە بـە شـەرم دەزانن). دەبێ هەموو بزانین کە ئێمە جگەرگۆشەی کوردستان و شـانازی زینـدووی ئێرانین. کوردستان مەڵبەندی ئازادی و دلێری و شارسـانیەتە. لاوانی دلێـر و ئـازای کوردستان کە لە سەرانسەری ئەم نیشتمانە بـەربلاوەدا بـۆ پاراسـتنی لـە هەمبـەری هێرشی گەلەخۆ ڕووەکاندا بە خوێنەو نێژراون.

مانای ئازادی و ئازایەتی و دلێـری و ڕاسـتی و پیـاوەتی و گیانبـەختکارییان بـە خەڵکی جیهان فێر کردووە. هەر چەند لە ژێری دەسـەڵاتی عوسمـانی و عـەرەب و ڕووسی و ...دا نیشتەجێن، بەڵام ئێمەی کورد لە خاکی ئێراندا خولقێنـدراوین و هـەر چەند کە سەدان ساڵە لێککراوینەتەوە. دیسان ڕادەگەڕینـەوە بـۆ ئـەم خاکـە. ئەمـە

سەر و تارێک بوو. بۆ سپاس لە تێکوشانی دڵسۆزانەی مامۆستا کەلیموڵڵای تەوەحودی کە لە ئەم ماوەیە لە ئەم سەردەمە لە هەموو شتێکی خۆیان کەڵکیان وەرگرتووە. هەتا بنچینەی داری جوان و سەرسەوزی هۆزی کوردی کرمانجی خوراسان. تەنانەت بە لە دەستدانی جگەرگۆشەیەکە و زیندوو بکاتەوە و لە نێوان چوونی لە هەمبەری تالانی ڕۆژگاردا بەرگری بکات. نە تەنیا هۆگران و خوێندکارانی داخوازەر بەڵکوو کوڵەران و خەڵکی بینەری ئەم هۆزە وەکوو: خاونانی بەرهەمە بیرەورییەکان و خاونانی دەست مایەماڵییە زۆرەکان کەمتر بەڵکوو قەت لەم بوارەدا دەستیان نەداوەتە لێکۆڵینەوەیەکەو. ئەگەر لە خۆڕایش کۆڵەرێک وەکوو ئەو پەیدا نەدەبوو. زمان و ئەدەبیات و مێژووی ئێمە کە لە دەست گەیشتی هەموو دوور و زانیاری خەڵکیش لێی زۆر کورت و کەم بوو لەم سەردەمەدا. کە تەنیا پارەو ئابوور گرینگە زیندوو بپارێزێت چیمان بە سەر ئەهات. تاکوو بە هەوڵ و تێکۆشان و خۆڕاگری ئاغەی تەوەحودی ئەم مەبەستە چارەسەر بوو و درایەک لە مێژووی پێناسەی ئەم گەلە کرایەوە. سەرە تا هەندێ کەس بە پەلەو وایان دەزانی. کە ئێوە بێ لە بەر چاو گرتنی ئەو هەموو تێکۆشانەتان. تەنیا ئەوەتان بە ئەرکی خۆتان زانیوە. کە ژیاننامە خانەکان بەو شێوەیەو کە ئەمڕۆ خەڵک پێیدا دەڕوانن بێننە ڕوو، بەڵام لە چاپدانی ڕووبەرگی دووهەم هێڵی هەڵەیی کێشا بە سەری هەمووی ئەو بڕوایانەدا. من ئێوەم تەنیا جارێک بۆ ماوەی دوو کاتژمێر لە پەڕتووکخانەی دوکتور شەریعتی مەشەددا. کە بەرپرسایەتیتان لە ئەستۆیە بینیوە. ئەو کاتە بۆم دەرکەوت کە تۆ بە هەمووی ئەو گرفتانە و خەریکی چ هەوڵ و تێکۆشانێکی و لە بواری دانانی دیکە ناوەرۆکان و کێشەو مەبەستەکانی تایبەت بە کۆچی مێژوویی گەلی کورد بۆ خوراسان زۆر تێدەکۆشی. کە دەسکەوتەکەت بە شێوەی چەند ڕووبەرگ پەڕتووکی بایخدار و جوان و گردۆڵ دەرهاتووە و هەنووکە دوو ڕووبەرگ لەو پەڕتووکانەت لە نێوانی خەڵکی ڕاپەڕەری ئێمە دایە. دەست مایەت لەم ڕێگای پڕ لە کەند و کۆسپەدا تەنیا ئەوین بە گەل و بنچینە و خۆڕاگری و ڕاستییە. نە دەست مایەی پارەیی و شانازی بە ناوبانگەکان، ئێوە بە زیندوو کردنەوەی بنچینەکان، پەلە زەلامەکانی ئەم دارە بە ساڵا چووەتان پێکەوە پێوەندێکی لە پسانەن هاتوو داوە. بەختەوەرانە ئەو کەسانەی کە لە ئامانجی ئێوە ئاگادارن، نە تەنیا ئاغەی کەلیموڵڵای تەوەحودی لە کۆڵەرانی

گەلی کورد بەڵکوو لە کۆڵەرانی گەورەی ئەم وڵاتە لە ئەژمار ئـەدەن و لـە هاوکـاری کردن لەگەڵی ئێوەدا کۆتایی ناکەن. بۆ ئەوەی کە تەنیا بە خزمـەت کـردن بـە ئـەم مەڵبەندە و شانازی بە ڕەگەزی سەربەرزی ئاریـایی خۆمـان. کـە هـەمووی ئێمـەی کوردیش ئەگرێتە بەر. هەوڵ و تێکۆشانێکی جێگـای ڕێـز و سپاسـتان دەسـت پـێ کردووە. لە پاشان برای خۆشەویستم ئەحمەدی شاملۆ لە ژێر نووسی نامەکەیانـدا بـە دەست نووسی بووچکە و فەرموویانە: برای خۆشەویـست. مـن ئـەم وتـارەم کـە بـە ڕاستی لە قووڵای دڵمە و هاتە دەر. لە پـاش چاوپێکـەوتنی ڕێکـەوتی ٦٥/٥/١٦ لـە پەڕتووکخانەی دوکتور شەریعەتی مەشەددا. بە ئاماژە کردن بە هـەوڵ و تێکۆشـانی ئێوە و بۆ چەند گۆڤار و ڕۆژنامەم نارد، بەڵام بـە داخـەوە هـەتا ئـەم کاتـە. لـە هـیچ کامیاندا چاپ نەبووە و داخوازینامەیشیان بۆم نەناردووە. بە داخـەوە دەبـێ خاونـانی نووسینەکان ئەوەندە گیر و دەبن کـە تـەنیا دەبـێ لـە یـەک شـتە و قـسە بکـرێ. (مەشەد. ڕەزا شار- ئەحمەدی شاملۆ)

برای بەڕێزم. کاک ئەحمەدی شـاملۆ بـە سـڵاوی هەمبەرانـەو دەڵـێم: ئەگـەر نووسینەکان نامەکەی من وتۆیان چاپ دەکرد. ئەبووە هۆی سـەر سـووڕمان، بـەڵام پەکەر نەبن بەختەوەرانە ئێمە پێویستمان بە بانگەواز نیە. بۆ ئەوەی کە زێڕ ناسـەکان زێڕی چاک دەناسن.

به وتەی باو: عەتر ئەو عەترەیە کە بۆنی لە خۆیە
نەکوو عەتر فرۆش بگۆیە

لە ڕابردوودا کە بۆ ڕۆنەگیاییـە جـۆر بـە جۆرەکـان لـە ڕادوێ و تەلەفـەزیوون و نووسینەکاندا بانگەوازیان دەکرد. تاکوو بەم شێوە بە کڕیارەکان بڵێن. قەت بیستووتە کە بۆ ڕۆنی ئاژەڤی بانگەواز بکرێت. بۆ ئەوەی کە پێویـست نـەبوو و خەڵـک خۆیـان جیاوازی نێوانی ڕۆنی ئاژەڵی و ڕۆنی گیاییان دەزانی. دەیسا سپاسی خودا دەکـەین کە کای ئێمە نەیکێشاوەتە ئەوێ. کە بانگـەوازمان بوێـت و ئەمـە لـە بەخـشەرایەتی خودا و تێکۆشانی داخوازی زانست و داخوازانی با فەرهەنگی ئێمەیە.

٣٨- تـاران: یەکـەمی بـەفرانباری ساڵـی ٦٥ی کـۆچی هـەتاوی- ئاغـەی قودرەتوڵڵای ڕۆشنی زەعفەرانلۆ، نووسەر و وەرگێـڕی بـە ناوبـانگیش لـە نامەیەکـدا فەرموویانە: کەلیم ئەی کوردی دڵێنەری خوراسانی- لە دەورت گەڕێم. بـە سـڵاو و

ڕێزە و هیوادارم هاوسەر و منداڵەکانت خۆش بن. و تارێکی زۆر جوانم سەبارەت بە ژیاننامەی ئەمیر حوسێن خانی شۆجاعەدەولیە، لە پەڕتووکی بۆلجێر وەرگێڕاوە و ناردم بۆت. بەیانیش نامەکەت بۆ پۆست دەکەم. ئەکارهبایش بێت، لە بناغەی وتارەکەیش وێنەت بۆ دەگرم. بۆ ئەوەی کە پەڕتووکەکە هی خۆم نیە و هی جەنابی ئاغەی عەلی وسووق کوڕی خوالیخۆشبوو وسووقەدەولەی برای قەوامەسەڵتەنەیە و چەند ڕۆژی لەمەوپێش ئەم پەڕتووکەی بە ئامانەت بە دەستی جەنابی ئاغەی دوکتور ئیرەجی ئەفشار ناردووەنۆم. کە ڕاڤەی ژیاننامەی ئەمیر حوسێن خان بخوێنمەوە و بۆ ئەوەی کە مەبەستێکی زۆر جوان بوو. وەریمگێڕاوە و بۆ ئەوەی کە ئێوەم لە هەر کەسێکی دیکە بە سەرتر زانی بەم هۆیەو ناردم بۆت هەتا کەڵکی لێ وەرگری. لە ئەم پەڕتووکەدا ڕاڤەی ژیانی ئەم چەند کەسایەتییەی ژێرەوی لێدا هاتووە.

١- ئەمێردۆست موحەممەد خانی ئەفغان
٢- مەلا سوات
٣- شێر عەلی
٤- سەرپەل کۆفمەن
٥- یاقۆ «یەعقووب» بەگ
٦- خوداداد خان
٧- موحەممەد خانی خێوەیی
٨- عێزەت کۆترباز
٩- عەبدوڕڕەحمانی بارکزایی
١٠- خودایار خان
١١- عەبدوڕڕەحمانی ئەفتاوەچی
١٢- موزەفەرەدین
١٣- سەرپەل کۆلپاوێسکی
١٤- سەرپەل تەچرنیف
١٥- نووری وردی خانی (تورکەمان ئاخاڵ)
١٦- ئەمیر حوسێن خانی شوجاعەدەولە

١٧- یەعقووب «یاقۆ» خانی کاشفەری، بەڵام ئەو کەسانەی کە ناویان لێوە براوە، هەروەها کە لە ناوی پەڕتووکەکە دەرەکەوێت. تایبەتیان هەیە بە ئاسیای ناوەندی. کە لە ڕابردوودا لە ژێری دەسەڵاتی ئێراندا بووە و هەر کام لە قارەمانەکانی ئەم پەڕتووکە ژیاننامەیەکی جوان و تایبەتیان هەیە، بەڵام نووسەری ئینگلیزی ئەم پەڕتووکەی بە پێی بڕوا و خوازیاری و ڕامیاری وڵاتی خۆی نووسیوە. بە هەر جۆرێک پەڕتووکێکی زۆر جوانە. (ڕێزگری ئێوە- ڕۆشنی زەعفەرانلۆ)

**٣٩- لاین ٦٥/١٠/١٢:** برای خۆشەویستمان ئاغەی فەرەجوڵڵای جەلایری لەبەرەی منداڵانی نووری وردی خانی جەلایر لەگەڵ نامەی پڕ لە مەحەبەتی خۆیاندا چەند پارچە هۆنراو سەبارەت بە ئازایەتی برا بەسیجیەکانمان لە شەڕی ئێران و عێراق بە زاراوەی کرمانجی هۆنیوەتەوە و ناردوویانە. ئاغەی جەلایری چەند مەتەڵی کرمانجیشیان ناردوو کە لە جێگای خۆیدا لە چاپ ئەدرێت.

**٤٠- مەشەد ٦٥/١٠/١٤:** برای هونەرمەندما مامۆستا عەبدوڵڵای بەگزادەیش کە لە پلاندانەران هێڵەران و وێنەرانی بە ناوبانگ و سەرکەوتووی ئێرانن. منیان شەرمەزار کرد و تابلۆیەکی جوان لە کاری خۆیشانیان هێنا تێنووسگەی کارەکەم و پێشکەشیان کرد، کە لە ئەم هەموو تەرخەم و هەستە جوانەیان سپاس دەکەم. نامە جوانەکەیشیان لە جێگای خۆیدا لە چاپ ئەدرێت، ئاغەی بەگزادە لە بناغەدا خەڵکی گوندی یێنگی قەڵای قۆشخانە لە دێهستانی ناوەندی قووچانە. خەڵکی یێنگی قەڵا لە کوردە جەلالییە فیرووزەکانن کە لە پاش ئەوەی کە ڕووسیەکان فیرووزەیان داگیر کرد، هەندێ لەو کوردانە کۆچێندران بۆ ناو خاکی ئێران و گونی یێنگی قەڵایان «تازەقەڵا» ئاوەدان کردەوە. زۆر جار خۆشکان و برایانی کرمانج ئێمە، بە جۆرێک من شەرمەزاری مەحەبەتی خۆیان دەکەن. کە من وەکوو بەفر لە هەمبەری تیشکی گەرمادەرو تینداریاندا، دەبمە ئاو و لە ڕێگای بە ئاکام گیاندنی ئەم کارە گرینگەدا کە گرتوومەتە ئەستۆ زۆرتر لە ڕابردوو ڕاستەقینتر دەبم و دڵنیام کە ئەگەر ئەم گەشە پێدانانە نەبوو، قەت توانایی درێژەدان بە کارەکەمم نەبوو. وەکوو وێنە دەیگێڕمەوە، لە یەکێک لە ڕۆژە هێنییە سەردەکانی زستاندا، کە دەبوا خەریکی نووسین دەبووم. بە هۆی نەبوونی نەوت و مەودای سووتەمەنی ئەنگوستانی دەستم یخیان کردوو و توانایی نووسینم نەبوو و بیرم لە ئاکامی کارەکەم دەکردەوە. کە لە

ناکا زەنگی درگای ماڵ هاواری لێ هەستا، درگاکەم کردەوەو کەسێک کە لەگەڵیدا ڕووبەڕوو بووم و لە پاشان لەگەڵیدا ئاشنا بوومەوە، ئاغەی ئەندازیار کۆنە دڵ بوو. کە پووتێکی پڕ لە نەوتی ناوە ناوی ماشێنەکەی و لەو سەرمای زستانەدا، پرسیان، پرسیان خۆیی گەیاندووە ماڵی ئێمە. خودا دەزانێ کە ئەم مەحەبەتی ئاغەی کۆنە دڵە چ تینیکی بە منداو چ کاریگەرییێکی لە سەر منەو بوو. چلۆن منی گرڕدا. کە هەمووی ئەو ڕۆژە هەتا سەعاتی ١١ی شەو لە گەرمای نەوت و مەبەتەکەیاندا خەریکی نووسین بووم و قەت هەستی ماندووییم نەکرد. یان ڕۆژێک کە ڕۆیشتووم بۆ قووچان، خۆشکمان خاتوو شانازی بێرمی کانیمشکانی هاوژینی ئاغەی حاجیزادە کە لە کەم و کۆڕی ماڵی منی هەژار لە بواری لە چاپدانی پەڕتووکەکەدا ئاگادار بوو. بینی کە ئەنگوستیلەی خۆیی لەم ئەنگوست و گۆشەوارەکانی لە گوێ دەرهێنا و پێشکەشی منی کرد و وتی: ڕوو ڕەشم کە زۆرتر ناتوانم یارمەتی تۆ بدەم. من سەرم سووڕ ماو و بە ئەم بەخشەرایەتی و لە خۆگەرینی ژنانی کورددا ئەمڕوانی. جوانە گولانی پەلکە شۆڕ لە پێشی چاومەو ڕێژە ڕۆیشتن. کە لەگەڵی خۆمدا وتم: هەتا ئەم شێرە ژنانە زیندوون، کرمانج زیندووە و هەستی من لە هەمبەری هەوڵ و تێکۆشانی ئەمانەدا هیچە. لە بەخشەرایەتییان سپاسی کرد و وتم: خۆشکەکەم، هێشتا کاری من بە ئەو ڕادە لە گرینگایەتی خۆی نەگەیشتووە. کە زێڕەکانی ئێوە وەرگرم، هێشتا برایانێکی دیکە هەن، کە دەتوانن بە ئاسایەتی یارمەتی ماڵیم بدەن، ئەگەر کار کێشایە جێگای باریک. ئەو کاتە ئەم پێشکەشییانەی ئێوە وەردەگرم. هەروەها برای گرووپبانمان ئاغەی غەفاری پەسەندیدەی باجگیرانی کیکانلۆیش کە بەردەوام لە گۆڕەپانی شەڕی ئێران و عێراقدان، لە گۆڕەپانی شەڕەو تەلەفوونیان کردوو وتیان: پەڕتووکەکەی ئێوە لە گۆڕەپانی شەڕدا بە ئێمە هێزەکانی ئەرتەش هێز و دڵداری ئەدات. کە پەیسەر دوژمن سەرکوت دەکەین. بەم بۆنەیە و سی هەزار تمەن پارەم کە بۆ کرینی یا نە پاشەکەوت کردوو. بۆ ئەوەی کە بەم تۆزە پارە و یانە ناکرێی، بەم بۆنەیە و بە هۆی یارمەتی پۆستم کرد بۆتان. یان ئاغەی قووچانی نژاد کە ماوەیەکە لەگەڵیاندا ئاشناوەو بوومە. مەبلەغی بیست هەزار تمەنی بناوی قەرزولحەسەنە ناردوو بۆم. ئەمانە هەمووی بەخشەرایەتی و مەحەبەتی خودای گەورەیە. کە بووەتە بەشی من و دڵی خوداپەرەستان و خێر خوازان لە هەنای منی

هەزار دڵۆڤانتر دەکات. کە گرێ لە گرفتی کارەکەم دەکەنەوە و گەشە بە منی هەزار ئەدەن کە درێژ بدەم بە هەوڵ و تێکۆشان. مامۆستای فێرکەیەک بە چوار هەزار تمەن حقووق لە مانگدا، پێنج هەزار و شوانێک بە شەش هەزار تمەن حقووقەو لە ساڵدا پازدە هەزار تمەن یارمەتییان داوە. ئەم مەحەبەتانە سەرچاوەی کەڵک و هێز دەرن. کە گەشە بە من ئەدەن بۆ هەوڵ و تێکۆشان. خودا بنچینەی داری ئەم هۆزە بپارێزێو ژمێری خوداپەرەستان و خێرخوازان زۆر بکات و سەرکەوتوویان پێ بدات.

**٤١- یاسووج ٦٥/١٠/١٥:** برای کوردمان ئاغەی عەبدوڵلای مێعماریش فەرموویانە: مامۆستای هێژا، سڵاوێک بە بایخی مێژووی پڕ لە کەڵێن و قوژبنی گەلەکەمان و گەورەیی کوردستانی خوێناویمان پێشکەشتان دەکەم و لە ڕێگای دوور و لە قووڵایی دڵەو دەستتان بە گەرمی دەگوشم و هیوادارمن لەسێبەری خودای گەورەدا پێنووسی بە هێز و تیندارتان، لە ڕابردوو بە هێزتر بێت و لە نووسین ڕانەوەستێ. من لە ئێوە پیرۆزبایی دەەم. کە وەها بەرهەمێکتان خولقاندووە. لە دیتنی پەڕتووکەکەی ئێوە وەها شایی و خۆشیم لە دەرووندا کەوتەڕێ. کە سەرم لە پێ ئەناسی و بە وتەی باو لە پێسی خۆمدا جێگام نەبووەو. بۆ ئەوەی کە ماوەیەکی زۆرە بە دوای وەها بەرهەمێکدا دەگەڕام. زوو بە خۆشی زۆرەو خوێندمەو و هەر لاپەڕەیم شیرینتر و جوانتر لەو لاپەڕانی پێشوو ئەبینی، بەڵام بە داخەوە کە ڕووبەرگی یەکەمیم نیە. بەم بۆنەیە و بە پێی فیشی ٦٢٤ مورخی ٦٥/١٠/١٤- پارەی ئەو پەڕتووکەم پێشکەشتان کردووە. لێتان داوا دەکەم کە بە هەر جۆرێک بووە ڕووبەرگێکم بۆ پەیدا بکەن و بینێرن. هەروەها من خەڵکی بانەم، ئەموێ کە بزانم خەڵکی بانە لە کام هۆزی کوردن. (ڕێزگری ئێوە- عەبدوڵلای مێعماری)

لە وەڵامی ئەم برای خۆشەوستمانەدا دەڵێم: ماوەیەکی زۆرە کە ڕووبەرگی یەکەم زۆر کەم بە دەست دەکەوێت. بەم بۆنەیە و لە هەمووی خوێنەرانی پەڕتووکەلانم داوا دەکەم کە بمبوورن و هیوادارم بە مزوویە لە چاپدانی دیسانەوەی ڕووبەرگی یەکەم دەست پێ بکرێت، بەڵام سەبارەت بە هۆزی بانە و ئەو مەڵبەندەی سار و بیرەپەروەرە لێکۆڵینەوە و زانیارییێکی زۆرم نیە و سەبارەت بە ئەم مەبەستە دەتوانن لە مامۆستا تەوەکولی بانەیی کە دانیشتووی تارانن و پەڕتووکی بایخداری

جوگرافیای مێژووی بانەیان نووسیوە. بپرسن بۆ ڕووناکی ئەم مەبەستە دەبێ بنچاخ و بەڵگە مێژووییەکانی نێوانی خەڵکی ئەو ناوچەیە کۆ بکرێتەوە و بخرێتە پێشی چاودێری و لێکۆڵینەوە. هەتا دەرکەوێت کە کوردە بە ناوبانگەکانی بانە سەر بە کام هۆزن. خوێندنەوەی پەڕتووکە بایخدارەکانی: کورد و کوردستانی ئەمینی زەکی بەگ و مێژووی کورد و کوردستانی خوالیخۆشبوو و شێخ مەردووخی کوردستانی و شەرەفنامەی بدلیسی و مێژووی بنچینەی ڕەگەزی کوردی خوالیخۆشبوو ڕەشیدی یاسمی. دەتوانن لەم بوارەدا ڕێنوێنیتان بکەن. (سەرکەوتوو بن)

٤٢- تاران ٦٥/١٠/١٦: برای کوردمان ئاغەی عەلی زولفەقاری لە کوردە کرمانجە خوراسانییەکانی دانیشتووی تارانیش بە دەربڕینی مەحەبەتەو فەرموویانە: مامۆستای بەڕێز لە سەری خۆمم زانی. لە ئێوەی بەڕێز بە بۆنەی ئەم هەموو تێکۆشانەی کە لە بواری ژیاندنەوەی مێژوو و فەرهەنگی کورددا کردووتانە سپاس بکەم. ئێوە گەلێکی ڕاپەڕە و نیشتمان پەروەرتان کە نزیک بوو لە بیرەو بچێت، بە ئەم کارە بایخدارتانە دیسان زیندووتان کردەوەو...

٤٣- تاران (کەرەج) ٦٥/١٠/١٧: خۆشکی بەڕێزی پەنابەری کوردی عێراقیمان، خاتوو ناز نازەی لاجانیش لە نامەی جوانی خۆیاندا لە پاش دەربڕینی مەحەبەتی زۆر فەرموویانە: کاک کەلیم، نووسەری دڵێنەر، ڕووبەرگی دووهەمی پەڕتووکەکەی ئێوەم خوێندەوە و زۆر کەڵکم لێی وەرگرت و زۆر خۆشم هات. ڕێز و سپاسی خۆمم وەکوو کوردێک دەربڕیوە، هیوادارم هەموو کاتێ لە ڕێگای ئەنجامدانی ئەم ئەرکە گرینگ و بە کلکەدا بۆ گەلەکەمان سەرکەوتوو و پیرۆز بن. بە ڕاستی خزمەتێکی گەورەت بە کۆمەڵگای خوێندکاران و فەرهەنگ دۆستان و بە تایبەت بە گەلی زوڵم لێ چوو و ڕەنجاوی کورد کردووە. من خوێندکاری ڕشتەی مێژووی زانکۆی شەهید بەهەشتی نازانم و ئامانجم لێکۆڵینەوە لە بواری مێژووی کورددایە. بەم بۆنەیەو هەر پەڕتووکێک کە سەبارەت بە کورد و کوردستان نووسراوێت، کۆ دەکەمەوە، بەڵام بە داخەوە ڕووبەرگی یەکەمی پەڕتووکەکەتانم دەست نەکەوت. بەم بۆنەیەو ویستم پرسیار بکەم، کە هێشتا ڕووبەرگی زیادەتان هەیە کە فییەکەیتان بۆ بنێرم؟ چۆنکا زۆر پێویستمە، داوا دەکەم کە من لە ئەم ژێدەرە گرینگە بێبەش نەکەن. لێرەیشدا بۆ هەر خزمەتێک کە لە دەستمان بێت، ڕادەگەینم کە ئەمە خۆی ئەرکی هەمووی

خوێندکاران و زانست دۆستان و ڕووناکبیرانه، کـه خزمـەتی گـەلی خۆیـان بکـەن. منیش وەکوو بە ڕێوە بردنی ئەرکی خۆم لە بەرانبەری گـەلی کـورددا چەنـد پارچـە هۆنراوم بە بۆنەی کۆچی دوایی ڕێبەری کورد مەلا موستەفای بـارزانی (ئـەو هەڵـۆی کێوستان) کە زووتر هۆنیمەتەوە. بە هـۆی یادگـاری دەنێـرم بۆتـان، هیـوادارام کـە خۆشتان لێی بێت. لە قووڵایی دڵە و سپاس دەکەم. (نارنازەی لاجانی)

لە وڵامی ئەم خۆشکە بەڕێزمانەدا دەڵێم: کـە خوالیخۆشـبوو مـەلا موسـتەفای بارزانی وەکوو ئیحسانی نووری پاشا، ئەو هەڵۆوەی ئـاڕاراتی خۆشەویـستی هـەمووی ئازایان و ئـازادبیرانی جیهـان بـە تایبـەت سـۆمای چـاوی هـەمووی کوردەکـانی و کرمانجەکانی خوراسان بوونە و هەن. و لە بیر ناچنەوە، منی نووسـەریش سـەبارەت بـە ئـەو قارەمانـەی دووهەمیـد کـورد «سـەلاحەدینی ئـەیووبی» لێکۆڵـینەوەیەکم کردووە. خوالیخۆشـبوو بـارزانی لەگەڵـی گـەوزەی کوردەکـانی خوراسـاندا وەکـوو خوالیخۆشبووەکان: عەلی خـان بـەگ و فەرەجوڵـلا بـەگی بێچرانلـۆ و سـەرۆکانی دیکەی کرمانجیشدا پێوەندییان بوو. ئێستا بە بۆنەی ڕێز گرتن لە ئەو گـەورە پیـاو و زیندوو ڕاگرتنی بیدەوەری ئەو سەرپەلە بە ناوبانگەی کورد، کە لە کاتی لە دایکبـوون هەتا ساتی مەرگ خەریکی بەربەرەکانی لەگەڵی ستەمکارانی جیهانی و ژیاندنەوەی ناو و فەرهەنگی گەلی کورد بوو، هۆنراوی ناردراوی ئێوە لە چاپ ئەدرێت. بـە بۆنـەی ئاگاداری زۆرترتان دەڵێم: کە کۆ بوونەوەی هەشتەمین ساڵهاتی ڕێز گرتن لە کۆچی دوایی خوالیخۆشـبوو و مـەلا موسـتەفای بـارزانی و چلـەی کـۆچی دوایـی ڕۆڵـەی نەمریان خوالیخۆشبوو و مەلا ئیدریسی بـارزانی کـە لـە ڕۆژی ٦٥/١٢/٢١دا کـە لـە مزگەوتی جەعفەری لە شەقامە بانووی مەشەددا «دەروازەی قووچان» کە بە هەوڵـی برا کوردە عێراقییەکان بە ڕێوە چوو و منیش شانازی بەشداریم بوو، هۆنراوی جـوان و هەست بزوێنی ئێوەمدا بە برامان کـاک ئەمجـەد عەبدوڵـلا کـە پـێم وایـە لەگەڵـی خۆتانیشدا پێوەندی خزمایەتییان هەیە. کە بە شـێوازێکی جـوان بیخوێنێتـەوە و لـە بەرزە بڵێ مزگەوتەکەیشەو بلاو کرایـەوە و زۆر کاریگـەر بـوو و هـەمووی بەشداران ڕێزیان لێی گرت و لە زەوقی ئەدەبی ئێوە ئافەرینیان کرد. ئێـستا کـە ئـەم هـۆنراوە جوانە ئەبێتە ڕازێنەری ڕووبـەرگی سـێهەمی پـەڕتووکی کـۆچی مێـژووی کـورد بـۆ خوراسـان، هیـوادارم، لـە بـواری ژیاندنـەوەی فەرهـەنگ و زمـانی گـەلی کـورد

بیرهێنەری زوڵم لێ چوویان لە دەستی ستەمکارە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژاواییەکان و نەوکەرە جەنایەتکارەکانیان لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کە پێکەوە خەریکی لە نێوان بردن و پاکتاوی ڕەگەزی ئەم گەلە ڕاپەڕەرو ئازایەن هەنگاوێکی کاریگەر بێت. (کەرەج، نازنازەی لاجانی)

**٤٤- قووچان ٦٥/١٠/٢٣:** خاتوو لەیلای ئەسغەر زادەیش وەهایان نووسیوە: بە ناوی خودای گەورە- مامۆستای بەڕێز بە پێویست دەزانم. کە وەکوو کوردێک لە تێکۆشانە بێ کۆتاییەکانی ئێوە سپاس بکەم. من لە خوێنەرانی پەڕتووکە مێژووییەکان بە تایبەت لە خوێنەرانی هۆگری پەڕتووکەکانی ئێوەم. چۆنکا ئێوە کارێکی زۆر گەورەتان ئەنجام داوە. کە من ناتوانم گرینگایەتی کارەکەی ئێوە بێنمە سەری کاغەز. تەنیا ئەمە دەڵێم کە ئێوە کارێکتان کرد کە ئێمە بە کورد بوونی خۆمان هەستی شانازی و سەربەستی دەکەین. لە کاتێکدا لە ڕابردوودا هەندێ کەس بە هۆی نەبوونی ئاگاداری لە مێژووی شانازی هێنەری خۆیان، شەرمیان لێ ئەهات. کە بڵێن ئێمە کوردین. چۆنکا لە سەردەمی دەسەڵاتی پیسی پاڵەویدا دژ بە ئێمە زۆر سەم پیشێنیان کردوو، بەڵام لە ئێوەدا وا دەکەم، کە ساکارتر بنووسن و مەبەستەکان شی کەنەوە. هەتا هەمووی خەڵکی ئێمە کە زۆربەیان خوێندەواری زانکۆییان نیە. لە خوێندنەوەی پەڕتووکەکەتان نیبگەیین. چۆنکا خۆتانیش لە لاپەڕەی ٥٣٨ ڕووبەرگی دووهەمدا ئاماژەتان بە ئەم مەبەستە کردووە و داواتان کردووە. کە دەبێ هەمووی ئێمە لە بواری زۆرتر بە خوێندەوار کردنی خەڵکی بێ بەش لە خوێندەواریدا تێکۆشین و بۆ خوێندنەوەی پەڕتووکەکەی ئێوە گەشەیان پێ بدەین.

**٤٥- کەرەج:** شارۆچکەی فەردیس: برای بەڕێزمان ئاغەی ئیرەجی ئیسحاقی پیریش فەرموویانە: برای بەڕێزم کاک کەلیموڵڵای تەوەحودی سڵاوتان لێ بێ. لە پاش دەربڕینی سڵاو و سپاس و ڕێزگیران لە تێکۆشانی بەردەوامی شەو و ڕۆژیتان، هیوادارم، ئەو هەنگاوە کە ئێوە هەڵتانهێناوتەوە. ببێتە هۆی ئەوەی کە برایانی دیکەی کوردیش هەوڵ و تێکۆشانێکی بەرچاو دەست پێ بکەن و سەبارەت بە ژیاندنەوەی فەرهەنگی بنچینەداری گەلی کورد بیر بکەنەوە و لە چوار چێوی دەسەڵاتی ئیسلامیدا، هەنگاوێکی چالاکانە و بایخدار هەڵێتەوە.

٤٦- **کەرەج:** شارۆچکەی فەردیس: ٦٥/١٠/٢٦- خۆشکی بە ڕێزمان خاتوو ئەقدەسی شەجێعی زادەکیش وەها مەحەبەتی خۆیانیان دەربڕیوە: لە مامۆستای بەڕێز و نووسەری زانیاری پەڕتووکەکانی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان زۆر سپاس دەکەم. منیش وەکوو هەزاران کەسی ئێرانی دیکە شانازی ئاشنایەتی لەگەڵی ئێوەم، تەنیا لە ڕێگای خوێندنەوەی پەڕتووکەکانتان بە دەست هێناوە. بڕوام وایە. کە لە بواری مێژوو و کۆمەڵناسی ڕەگەزەکانی ئێرانیدا کاریگەرترین و بە کەڵکترین لێکۆڵینەوەتان ئەنجام داوە. دیسان ئەدەبیاتی کوردتان زیندوو کردووەتەوە. منیش بە پێی ئەوەی کە هۆگرایەتی زۆرێکم بە پەڕتووکە مێژووییەکان هەیە. لە پەڕتووکە بایخدارەکانی ئێوە زۆر کەڵکم وەرگرت و بە بۆنەی ئەم زێدەر زانیارانە کە بۆ هاووڵاتییان و خۆشکان و برایانی کوردی خۆتان بە دیتان هێناوە. لە لایەنی خۆم و بنەماڵەکەمەو لە ئێوە سپاس دەکەم و ڕێز دەگرم. (سەرکەوتوو بن)

٤٧- **سوئێد سوتۆکهۆلم:** برای خۆشەویست و دڵۆڤانمان ئاغەی فەرهادی شاکلی، بە ڕێوەبەری گۆڤاری جوان و کورد زمانی [مامۆستای کورد]، کە ژمارەی سێی ئەو گۆڤارەیشیان ناردووە بۆم، هەر دوو ڕووبەرگی پەڕتووکی کۆچی مێژووی کورد بۆ خوراسانیان خوێندووەتەوە و بە پێی نامەیەک منیان شەرمەزار کردووە. کە بە زمانی کوردی نووسیویانە و ڕاستەخۆ وەکوو خۆی دەیبینن. هەروەها منیش چەند وێنەی فەرهەنگی و هونەری و مەتەڵی کرمانجی خوراسانیشم پێشکەشیان کرد. کە ئەگەر ببێت لە گۆڤاری جوانی مامۆستای کورددا لە چاپی بدەن.

٤٨- **مامۆستای زانا و بەڕێز ئاغەی دوکتور ئیرەجی ئەفشاری یەزدیش** بە بڕوای مەحەبەت و بەخشەرایەتییە و لە گۆڤاری داهاتووساڵی دوازدەهەم پووشپەڕو خەرمانانی ساڵی ١٣٦٥ ژمارەی ٦ هەتا ٤دا لە پاش ئاماژە بە پێناسەکانی ڕووبەرگی دووهەمی پەڕتووکی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان لە بواری ناساندنید فەرموویانە. «ڕووبەرگی دووهەمی پەڕتووکەکە وەکوو ڕووبەرگی یەکەمی داگری زانیاری بە کەڵکی ناوچەیی و بەڵگە و بنچاخی تازەیە و تێکۆشانی ئاغەی تەوەحودی لە چاوی ئەوەو کە توانیویەتی زێدەر جۆربەجۆرەکان ببینێت و بەڵگا بڵاوەکان کۆ کاتەوە جێگای ڕێزە».

٤٩- **برای زانا و زانیارمان ئاغەی موحەممەدی چاپانیش** کە لەگەڵی بەرهەم

فەرهەنگییەکانیاندا ئاشنایەتیمان هەیە. بە پێی نامەیەک هۆنراوێکی جوانیان لە خوالیخۆشبوو ئەسەدوڵڵای هەڵاتەر ربابی خوالیخۆشبوو نەسرەتی کێوستانی هۆنەری بەرزەناو کە لە ڕووبەرگی دووهەم لە لاپەڕەی ٢١٧دا ئاماژەم پێی کرد. کە بە دوو زمانی کوردی و فارسی هۆنیویانەتەوە ناردوویانە بۆم.

کە لە چاپ ئەدرێت و لە تێکۆشانیان سپاس دەکەم. هەروەها ئاماژە دەکرێت کە بۆ ئەوەی کە ئەسەدوڵلا لە کاتی ڕێگا ڕۆیشتندا، هەموو کاتێ هەڵاتووە و مرۆڤێکی چالاک و هەڵاتەر بوو، بە ناوبانگ بووە بە ئەسەدوڵڵای هەڵاتەر و خەڵکی داشی بڵاغی قووچان بووە، بەڵام بۆ ئەوەی کە خوالیخۆشبوو ئەسەدوڵڵای هەڵاتەر مرۆڤێکی شۆخ و لە سەر خۆ و قسە خۆش بووە، بۆ شۆخی ئەم هۆنراوەی هۆنیوەتەوە، چونکا کاری کەناندنی دەور و بەرییەکانی بووە، بەڵام دەبێ بوترێ کە کوردەکان هەموویان لە سەری دین و مەزهەبی خۆیان زۆر ئاگادار و موتەعەسبن بە وتەی ئاغەی عەزیمی بلووریان و دیکەی کەسان، خوالیخۆشبوو و ئەسەدوڵڵای هەڵاتەر زۆر شۆخ و قسە خۆش بوو و ڕادەی خوێندەواریشی زۆر لە سەرەو نەبوو و کار بە دەستی ئیدارەی داهاتی قووچان بوو. لە ئێواراندا سواری ئەسپەکەی دەبوو و کڵاوەکەیی لار دەنا سەری و لە شەقامەکانی قووچاندا ئەسپەکەیی هەڵەهێنا و دەستی ئەنا پشتی گوێیە و [هەی لی لۆ گەدە] و دیکەی گۆرانییەکانی کوردی دەخوێند.

٥٠- تاران: برای بەڕێزمان ئاغەی دوکتور بێهرۆزی ڕووستایان. کە بە داخەوە نەمتوانی چاوم پێیان بکەوێت و خۆیان زەحمەتیان کێشا و هاتوونە تێنووسگەی کارەکەم. بە پێی نامەیەک لە پاش دەربڕینی مەحەبەت و بەخشەرایەنی فەرموویان. ئاغەی قودرەتوڵڵای ڕۆشنی زەعفەرانلۆ وەرگێڕی بەرزەناو ئاگادارمانی کرد. کە ئێوە سەبارەت بە مێژووی قووچان لێکۆڵینەوە دەکەن. چۆنکا بابم چەند بەڵگەی لە دەست دایە. کە لەگەڵی سەردەمی ناسرەدین شای قاجار و بوومەلەرزەی قووچاندا پێوەندییان هەیە. بە پێی ئەو بەڵگانە خوالیخۆشبوو میرزا ئەحمەد خانی سەرپەلی ئەندازیار بوونەتە بەر پرسی وێنەکێشان و دیسان ساز کردنەوەی شاری قووچانی هەنووکە. ئەگەر پێویست بێت بە هۆی زۆرتر ڕووناک بوونەوەی مێژووی قووچان دەتوانین ئەو بەڵگانەتان بۆ بنێرین. (١٣٦٦/١/١١- دوکتور بێهروزی ڕوستایان)

ئاشکرایە کە منی نووسەریش لە ئەم پێشنیارە بایخدارە شانازم و بۆ وەرگرتنی ئەو بەڵگانەی ئاماژەی پێ کراو و ئامادەم، هیوادارم کە ئاغەی ڕووستایان لە ئەم بوارەدا یارمەتیم بدەن.

٥١- بەندەرعەبباس ١٣٦٦/٢/٩: برای زانیار و نووسەرمان ئاغەی ڕەحمانیانی حەقیقیش لاپەڕەیەک لە هۆنراوە جوانەکانی خۆیانیان کە بە ناوی «چاوشی» بە چاپ گەیشتوو. ناردووە بۆم و منیان شەرمەزاری بەخشەرایەتی خۆیاڕن کردووە و لە هۆنراوە جوانەکەیان زۆر کەڵکم وەرگرت و هیوادارام زۆرتر لە ڕابردوو سەرکەوتوو و بەختەوەر بن.

٥٢- توربەت حەیدەریە: نامەیەکە لە برای کوردی عێراقیمان ئاغەی عوسمەتی هاشمی دانیشتووی شاری توربەت حەیدەریەی خوراسان، کە لە پاش دەربڕینی مەحەبەت و بەخشەرایەتی خۆیان بە منی هەژار نووسییانە. هیوادارم خودای گەور لە بواری خزمەت بە فەرهەنگ و گەلی زلم لێ چووی کوردا یارمەتیتان بدات. لە ڕێگای دوورەو بە هۆی سپاس لە کارەکەتان دەستتان دەگۆشم و بە هۆی ئاگاداری زۆرترتان دەڵێم کە منیش یەکێک لەو هەزاران یان بەڵکوو چەند میلیۆن کوردەما کە نیشتمانی خۆشەویستمان کوردستانە و هەڵوەدا بوومە و لە شاری توربەت حەیدەریەدا دەژیم، بەڵام چوار پێنج بنەماڵەین. چەند ڕۆژ لەمەو پێش پەڕتووکێک بە ناوی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسانم «ڕووبەرگی دووهەمیم» بینی، لە پاش چاو لێ کرنێکی سەر سەری بە خۆشییەو کڕیم و بردمەو بۆ ماڵ. بۆنی ئاشنایەتی کۆنە و زووینەی گەل و هۆزەکەمانی لێوە ئەهات. کە ڕۆژگارێک یان بەڵکوو چەن سەدەی پێشتر لە ئێمە هاتوونەتە ئەم مەڵبەندە و لە نیشتمانی خۆیانەو هەڵوە بوونە. خوێندنەوەی ئەم پەڕتووکە فرمێسکی شایی لە چاوانمەو خستەڕێ. چۆنک قەت لە سەری ئەو بیرە نەبووم. کە لە مەڵبەندی خوراسانیشدا هاوزمانان و ها هۆزیانی ئێمە نیشتەجێ بن و وەها پەڕتووکێک بەم گەورەییە و سەبارەت ب مێژووی سەربەستانەیان نووسراوێت. زوو پێنووسم هەڵگرت ئاشنایەتی لەگەڵ ئێوەم لە ڕێگای نامە نووسینەو دەست پێ کرد، هیوادارم نامەکە بگاتە دەستتان. ب من و هەرد کوردێکی دیکە جێگای شانازی و بەختەوەرییە. کە گەلەکەمان دەتوان کەسایێکی ڕاپەڕەر و تێکۆشەری وەکوو ئێوەی بەڕێزی ببێت. کە بەر پرسایەت

گرینگی پاراستن و ژیاندنەوەی کەلەپوری فەرهەنگی و مێژووی سەربەستانی گەلی کورد بە پیشاندانی کەلێنێک لە ئازایەتی و دلێری ئەم گەلە ڕاپەڕەرە کە چەند ساڵە لە ژێری دەسەڵاتی ستمکارانی جیهانی و نەوکەرەکانیاندا هاوار و داد دەکەن بە گەلانی جیهان بناسێنێت. بەم بۆنەیە و بە خۆمدا دەنازم. کە وەها برایێکی وەکوو ئێوەم هەیە و لە تێکۆشانە بایخدارەکانتان زۆر سپاس دەکەم، بەڵاو بە داخەوە ڕووبەرگی یەکەمی پەڕتووکەکەتانم لە هیچ کوێکدا دەست نەکەوت. لێتان داوا دەکەم کە ڕێنوێنیم بکەن کە لە کوێدا بیکڕم. ( توربەت حەیدەریە- فرۆشگای سپیان- عوسمەتی هاشمی- ١٣٦٦/٣/٢.)

**٥٣- تەورێز ٦٦/٣/١٧:** نامەیەکە لە برای زانیار و نووسەرمان جەنابی ئاغەی فەیزیزادە. کە بەم شێوەیە. برای نووسەری بەڕێزم جەنابی ئاغەی تەوەحودی لە پاش پێشکەش کردنی سلاو و ڕێزی خۆم لە بەرانبەری ئێوەی نووسەری بەرزە دەست و چالاکدا ڕادەگەینم. کە دوێنێ لە خزمەتی مامۆستا قادری فەتاحی قازیدا بووم. کە بە چاکی لە ئێوە و ناوبرا. ویستم بە ئەم چەند دێڕە و ڕێز و سپاسی خۆمتان پێ ڕاگەینم. هاوڕێی هەردوومان جەنابی ئاغەی ئەحمەدی قازی بە تایبەتمەندییە و هەموو کاتێ لە جوانی نووسراوەکانتان و ڕووناکبیری و بەردەوامی لێکۆڵینەوەکانتان باسی بۆم کردووە. ئەگەر بمەوێت بە بڕوای جەنابی ئاغەی دوکتور بیرجەندیش سەبارەت بە ئێوە ئاماژە بکەم. ئەو کاتە دەرەکەوێت کە هەر چەند پێکەوە دوورین، بەڵام لە دڵەو پێکەوە نزیکین و لە باردۆخی یەکترین ئاگادارین. تازەیی توانیومە پەڕتووکێک بە ناوی «چێرۆکی عارفانەی شێخ سەنعان» چاپ و بڵاو بکەمەوە کە بەرهەمی ١٢ ساڵ لێکۆڵینەوەیە و بۆ بە ئاکام گەیاندنی لە دیوانی هۆنراوەکانی کوردی و فارسی و تورکی کەلکم وەرگرتووە و لەگەڵی بوێژەکانیشدا پێوەندیم ڕاگرتووە و گێڕاوە جۆربەجۆرەکانم لێیدا هێناوتە ڕوو کە زاراوەکانی سۆرانی و هەورامی و بادینانی دەگرێتە بەر. لە زاراوەی بادینانیش هۆنراوەی شێوازی فەقی تەیرانم هێناوەتە ڕوو. پەڕتووکەکە دەبێ لە خوراساندا بە دەست نەکەوێت، بەڵام لە تاراندا لە پەڕتووکفرۆشی تەهووریدا بە دەست ئەکەوێت. ئەگەر ڕێگاتان کەوتە تاران دەتوانن لەوێدا بیکڕن. لە کوتاییدا داخوازی ناساندنی پەڕتووکی ئاماژە پێ کراوم بە داخوازانی زانست هەیە. (هۆگری ئێوە- تەهای فەیزیزادە)

**٥٤- مەشـەد ٦٤/٣/٢٣:** بـڕای هۆنـەر و ڕووناکبیرمـان ئاغـەی غوڵامـڕەزای موحەممەدی کیکانلۆ کە لە مامۆستایانی چالاک و لە کار وەستاوەن، لەگەڵی نامـەی پڕ لە مەحەبەتی خۆیاندا پارچە هۆنراوێکی جوانیان بـە زاراوەی کرمـانجی سـەبارەت بـە خـوو و ڕەوشـتی چاکـەی کوردەکـان لـە هـەمووی سـەردەمەکانی مێـژوودا هۆنیوەتەوە و ناردوویانە کە بە سپاس لە تێکۆشانیان لە بواری ژیاندنەوەی فەرهـەنگی کرمانجیدا. لە چاپ ئەدرێت.

**٥٥- کاشان:** برای کـوردی بارزانیمـان ئاغـەی موحەممـەد عەبدولجـەبار. کـە ماوەی ١٢ ساڵە لە کاتی تێلگرانەکانی پـێش لـە بـڕیار نامـەی پیـبی سالـی ١٩٧٥ زایینی ئەلجەزایر پەناڕی هێناوە ئێران و ئێستا لـە شـەریکەی قالـی‌کـری ڕاوەنـدی کاشاندا ئیش دەکات، لە نامـەی ڕێکـەوتی ٦٦/٣/٢٦ جـەنابی ئاغـەی تـەوەحودی-هیوادارم سڵاوی گەرم و لە قووڵایی دڵم کە بۆنی خۆشتر لە بـۆنی چەپکـە گـوڵانی نێرگیزی کێوستانە بەرزەکانی نیشتمانەکەمانە و دڵڕفێنتر لە دەنگی کەوەکانی ئـازوا (؟) و ڕۆشنتر لە ئاوی شەتاوی کێوستانانی خوێناوی و ڕەنگینی کوردسـتانە بـوێرن. مامۆستای بەڕێز، ڕووبەرگی دووهەمی پەڕتووکی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسـانی ئێوەم لە یەکێک لە پەڕتووکفرۆشییەکانی شاری کاشاندا بینی. سەرەتا باوڕم نـەکرد. کـە ڕاسـتەقینە بێـت. بـەوەم زانی کـە چـاوانم بـە پـێش چەنـد سـاڵ دووری لـە کوردستانی خۆشەویست تووشی هەڵەیکی گەورە بـوو و بـە هەڵـە دەبینـێ، بـەڵام ماوەیەکی پاشتر لە پاش ولینی چاوانم و هەڵگرتنی پەڕتووکەکە لە سەری قەفەسەو بە لاوەدانی لاپەڕەکانی زانیم کە نە ڕاستە قینەیە. ئەم پەڕتووکە، پەڕتووکی کوردانە. ئەو کوردانەی کە چەند ساڵ و چەند سەدی بێشتر لە من، ئەم چارە ڕەشـییەیان بـە سەردا هاتووە و لە شار و مەڵبەند و نیشتمانی خۆیانـە و هەڵـوەداو دوور کرانەتـەوە. ساتێک بیرم لە ڕابردووی مێژوو کردەوە و بینیم کـە ئـەم ئـاوارەیی و هەڵـوەدایی و ڕەنج و چارەڕەشییانە ڕاگەینەری کەلەپوورێکە کە لە باپیرانمانە و بە ئێمە گەیـشتووە و لە ئەم جیهانە گەورە و بەربڵاوەدا ئێمە چارەنوسێک جگـە لـە وەمانـە نـەبووە. زۆر ڕاوەستانم بە چاک نـەزانی و فی پەڕتووکەکـەم دا و هـەڵاتم بـۆ مـاڵ و دانیـشتم و هەموویم خوێندەوە و لە مێژووی سەربەستانە و پڕ لە کەلێن و قـوژبنی کوردەکـانی ئەو ناوچەیە و پێنووسی چالاک و موعجزە خولقێنی ئێوە ئافەرینم کرد. هیوادارم کـە

ئەم کارە گەورەی ئێوە ببێتە هۆی ڕێنوێنی گەل و زانیارانی کورد. کە لەم ڕێگایە و ئەو ڕەنج و کەند و کۆسپانەی لە سەر گەڕاوی خۆیان بگێڕنەوە و هاواری مافخوراوی خۆیان بگەیننە گوێی گەلانی جیهان. کە دینا بزانێ ئێمە چیمان لە سەر گەڕاوە و زۆرتر لە ئەمە زڵممان لێ نەکەن و بۆ پاکتاوی ڕەگەزی و نەتەوەیی ئێمە تێنەکۆشن و لە کارە نامرۆڤییەکانی سەدامییەکانی هەر سەردەمێک بەرگری بکەن. کە چەند ساڵە منداڵان و ژنان و ئاژەڵەکانی ئێمە بە بۆمبە کیمیاییەکان لە نێوان ئەبەن. مامۆستا و برای خۆشەویستم، دەبێ بزانیت. کە گەلی کورد بایخی تێکۆشانە بایخدارەکانی ئێوە لە بیرەو نابات، ئێوە مافێکی گەورەتان لە ئەستۆی ئەم گەلە زڵم لێ چوویەو هەیە. هیوادارم خودا پاداشتی چاکەتان پێ بدات.

بە سپاس لە برای بەڕێزمان ئاغەی موحەممەد عەبدولجەبار. لە خودای گەورە داوا دەکەین کە لە هەر کوێکدا کە هەن خۆیان و بنەماڵەکەیان و هەمووی خۆشکان و برایانی هەڵوەدای کوردی عێراقیمان لەش ساق بەختەوەر بن و بتوانن وەکوو ڕابردوو بە ڕەوشتی پێشمەرگایەتی خۆیان موشتێکی بە هێز بدەنە ناو دەمی سەددام و لایەنگرانیدا و دیسان هێمنایەتی و خۆشی و ئاسایش بۆ کوردستانی خۆشەویستی عێراق ڕاگەڕێننەو. ئەمە ئاواتی ئێمە هەمووی کوردەکانی خوراسان و ڕووناکبیرانی جیهانە. هۆنراوی ناردراویکاک موحەممەد عەبدولجەباریش لە پەڕتووکی وتەوێژانی کورددا لە چاپ ئەدرێت. هەروەها ئاماژە بکەم کە ئەمە ئاکامین نامەیەک بوو کە لە چاپ درا. لەمەوپاش ئەو نامانەی کە لە پێوەندی لەگەڵی ڕووبەرگی دووهەمدا بگەینە دەستم. بە یاری خودا لە ڕووبەرگی چوارەمدا لە چاپ ئەدرێن و لە هەمووی خۆشکان و برایانی خۆشەویست و بە هەستم کە لە سەرانسەری ئێران جیهانە و بە نامە پڕ شوور و بە هەستەکانی خۆیان منیان شەرمەزاری بەخشەرایەتی خۆیان کردووە، لە قووڵایی دڵە و سپاس دەکەم و هەروەها زۆر دەکەم کە گەشە پ یدانەکانی ئێوە خۆشەویستان منی لە بواری بەڕێوە بردنی ئەرکی لە سەر شانم زۆرتر لە ڕابردوو ڕاستەقینتر دەکاڕت و قورسی ئەرکی گرینگی بەرپرسایەتی فەرهەنگی لە سەر شانی من سووک دەکاتەوە. ئەو نامانە کە ناردووتانە، وەکوو ئەو نامانە بە کەمتر نووسەرێک لە وڵاتی ئێراندا پێشکەش کراوە و ئەمە خۆی دەربڕەری مەحەبەت و بەخشەرایەتی و چوونە سەرەوەی ڕادەی بیرەوەری و فەرهەنگی ئێوەی

خۆشەویستان و لایەنگری لە تێکۆشانەکانی منی هەژارە. لە هەر کوێکدا کـە هـەن هەر بژین و بەختـەوەری و بـەردەوام بـن. بـە هیـوای لێکپرسـین وتـوویژ لەگەڵـی یەکترین. لە ڕووبەرگی چوارەمـدا. خوداتـان لەگـەڵ- تـەوەحودی- ١٣٦٦/٤/٥ لـە کۆتایی ئەم مەبەستەدا. جارێکی دیکە لە هەموو خۆشـکان و برایـان بـە تایبـەت لـە ئاغەکانی: موقیمی و حەبیبەڵلای بەگزادە و یەساوڵی بەدرانلۆ داوا دەکـەم. کـە ئـەو بەڵگانەیان کە لە دەست دایە بۆمی بنێرن.

## هەواڵە فەرهەنگییەکان

بیری دامەزراندنی ناوەندێکی بۆ پاراسـتن و پەرەپێـدانی فەرهـەنگ و هونـەر و ئەدەبیاتی پارا و جوانی کرمانجی خوراسان لە ڕابردووەو ئاواتی بەرزی مـنی نووسـەر بووە. کە لە کاتێ خوێندەواری لە زانکۆڵ مەشـەددا هـەتا ڕادەیـەک سـەرەتای ئـەم کارە ڕێکخراو، بەڵام بە پێی چەند هۆکـار لەگـەڵ گرفتـدا بەرانبـەر بـوو و لـە پـاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران کە مزگێنی بە دی هاتنی هیوا و ئاواتەکان بوو. داخوازی بڵاو بوونەوەی ڕۆژنامەیەکی فەرهەنگی کرمانجی خراپشتی گـوێ. کـە لـە ئاکامـدا بـە هـەوڵ و تێکۆشـانی هەنـدێ لـە برایـانی هاوڕێمـان وەکـوو ئاغـەکان: جەمشیدی حاجی قوربانی و حەسەنی سەحرایی و سەفایی لایـنی و خوالیخۆشـبوو عەلی ڕۆحانی (پاڵەوانی بەرزەناو بناغەی شەریکەی هاوکارییەتی هاواری فەرهـەنگی کرمانجی دانرا. مەبلەغێکیش بـەم ۆنەیـە و تـەرخان درا کـە کـارە فەرهەنگییـەکان دەست پێ بکرێن. لەم کاتەدا بوو کە ڕووداوی تەقینەوەی بۆمب لە ناوەندی حێـزبی کۆماری ئیسلامی لە تاران و شەهید بـوونی شـەهید بەهەشـتی و هاوڕێیـەکانی لـە ڕۆژی حەوتـەمی پووشـپەڕی ساڵـی ١٣٦٠ کـۆچی هەتاویـدا ڕووی‌دا و ئێمـە بەرزەوەندیمان لەوەدا بینی. کە جارێکان لە دێژەدانی کارە کە دەست ڕاگـرین و لـە پاشان تیا چوونی خوالیخۆشبوو عەلی ڕۆحانی لە ڕووداوی هەڵوێرانی ماشێندا کە لـە هۆگرانی فەرهەنگی کرمـانجی بـوو هاتـە سـەر دیکـەی گرفتـەکانی کارەکـەمان و هەروەها بیری دامەزراندنی کۆڕی فەرهەنگی کرمانجی هەموو کاتێ لە سەری مـنی نووسەردا بوو هەتا ئاگـادار بـووم کـە ناوەنـدی پەرەپێـدانی فەرهـەنگ و ئـەدەبیاتی

کوردی سەلاحەدینی ئەیووبی لەشاری ورمێ لە پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژاوادا. کاری خۆیی دەست پێ کردووە و برای زانیارمان کاک ئەحمەدی شەریفی یەکەمین ژمارەی گۆڤاری سروەی بۆم نارد. لە وەرگرتنی زۆر خۆشم هات و درگای پێوەندی و نامە نووسینم لەگەڵی ناوەندی ناوبراودا کرایەوە. لە ئاکامدا بە پێی نامەی ژمارەی ٨٤٦ی ڕێکەوتی ١٢- ٦٥/٦/٨ کە وێنەکەی دەبینن. لە لایەنی ناوەندی ناوبراوە و لە من بۆ بەشداری و ڕاگەیاندنی بیر و باوەڕ و داخوازی کوردەکانی خوراسان لە یەکەمین کۆڕی فەرهەنگی ئەدەبی کوردی کە لە ڕێکەوتی ٣ هەتا ٥ی ڕەزبەری ساڵی ١٣٦٥ی کۆچی هەتاوی کە لە شاری قارەمان پەروەری مەهاباددا بە ڕێوە دەچێت داخوازی کرا. دەبێ ئاماژە بکەم. کە ئەم ناوەندە بە هەوڵ و تێکۆشانی خوالیخۆشبوو مامۆستا هێمن هۆنەری بەرزەناوی کورد و دیکەی فەرهەنگ دۆستان و تەرخەم و لێگەڕینی کار بە دەستانی دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی ئێران دامەزرا. لە ئەم کۆڕە مێژووییەدا لە بواری پەرەپێدان و پێشکەوتی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردی لە سەری زۆر کێشە و باس کراو بڕوا ڕاگەیندرا و پەیامی مێژووی برامان ئەندازیار مووسەوی سەرۆک وەزیری کاتی ئێران و لە پاشان قسە جوان و ناوەرۆکدارەکانی برامان ئاغەی ئەنساری جێگری ڕامیاری پارێزکاری ئازەربایجانی ڕۆژاوا گەشەپێدەری کۆڕەکە بوو. کە ڕێرۆیشتی دیاری دەکرد. لە مەبەستە گرینگەکانی ئەم کۆڕە بەشێک لە قسەکانی من بوو. کە لە تایبەتی نامەی سروەی ڕێکەوتییەکی گولانی ساڵی ١٣٦٦ی کۆچی هەتاویدا لە چاپ درا و بڵاو کرایەوە. لەو شانازییانەی زۆر گرینگ کە لەم کۆڕە گەورەیەدا بوو بە بەشی من ئەوە بوو کە بەشدارانی ئەو کۆڕە بە متمانە منیان بۆ نوێنەرایەتی فەرهەنگی کوردا خوراساندا هەڵبژارد و لە پاش ئەوەیش نامەی ژمارەی ٩٦٠- ١٢ی ڕێکەوتی ١٣٦٥/٧/١٣ کۆچی هەتاوی ناوەندی پەرەپێدانی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردی سەلاحەدینی ئەیووبی لەم پێوەندییەدا دەربرا. کە وێنەکەی دەبینن. ئەو بەرپرسایەتییە گرینگە کە ئەو کۆڕە خستوویە سەری شانم و هەموو کاتێ گرینگایەتییم هەست دەکرد و لەگەڵی هەندێ لە هۆگرانی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردی لە خوراساندا هەندێ جار سەبارەت بە باردۆخ و ڕێرۆیشتی کۆڕە کە باسم دەکرد. کە هەموویان هیوادار بوون کە ئێمەیش ڕۆژێک لە خوراساندا وەها ناوەندێکی فەرهەنگیمان ببێت و بە پەیامی

مێژووی برامان ئاغەی ئەندازیار مووسەوی سەرۆک وەزیری کۆماری ئیسلامی ئێران وەڵامی ئەرێنی بوەینەوە و ڕێڕۆیشتی ناوەندی پەرەپێدانی سەلاحەدینی ئەیووبی بە بەربلاوییێکی زۆرترە و درێژە بدەین. بەم بۆنەیە و ڕێسانامەی کۆڕی فەرهەنگی ئەدەبی کوردی کرمانجی خوراسان پێکهات و پێشکەشی ئیدارەی گشتی ڕۆشنبیری خوراسان کرا. کە لەوێیەو ناردرا بۆ وەزارەتی ڕۆشنبیری خوراسان بە پێی نامەی ژمارەی ٢٨٠٣٨- ٣/١٤ ڕێکەوتی ٦٥/١١/٢٦ کۆچی هەتاوی بە ئێمە ڕاگەیندرا. کە شوێنی دامەزراندنی کۆڕەکە دیاری بکەین و بۆ هەڵگرتنی هەنگاوی پاشتر بە ئیدارەی گشتی ڕۆشنبیری خوراسان ڕایبگەینین. مەبەستەکە لە قۆناغی و بڕوا دەربڕاندایە و هیواداریـن بە یارمەتی خودا بە مرزوویە بە پیشاندانی تەرخەم و بەخشەرایەتی بەرپرسانی کار و بار بگەیینە دەسکەوتێکی جوان و لە بواری پەرەپێدانی فەرهەنگ و هونەر و ئەدەبیاتی جوانی کرمانجی خوراساندا دلە چوار چێوی یاساکانی ڕژێمی کۆماری ئیسلامی ئێراندا هەنگاوی چالاکانە و لە شان هەڵێنینەوە. لەو کارانەی دیکەی فەرهەنگی و ئەدەبی کە لە لایەنی دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی ئێرانەو بۆ ئەنجامدانی وەڵامی ئەرێنی درایەوە و ئێستایش درێژەی هەیە، بڵاو کردنەوەی حەوتەنامەی تێکۆشان (جەهاد) بە زمانی کوردییە و ژمارەی ١٢٠ای ساڵی پێنجەمی ڕۆژی دووشەمەی ١٢ ڕەمەزانی ساڵی ١٤٠٧ی کۆچی مانگی ڕێکەوت لەگەڵ ٢١ی گولانی ١٣٦٦ کۆچی هەتاوی کە ئاکامین ژمارەیە. گەیشتە دەستم. ئەمەیشە حەوتەنامەیەکی هەواڵی و ڕامیاری و فەرهەنگییە. ئەم حەوتەنامە لە تاراندا بڵاو دەبێتەوە. نووسینەیەکی دیکە کە لە تاراندا بڵاو دەکرێتەوە. گۆڤارێکی کوردییە بە ناوی گۆڤاری ئامانج. کە هەر دوومانگ جارێک بڵاو دەکرێتەوە و ژمارەی ١٤ی ساڵی دووهەمی ڕێبەندان و ڕەشەمەی ساڵی ١٣٦٥ کۆچی هەتاوی گەیشتووەتە دەستم. گۆڤاریشە فەرهەنگییە و تایبەتنامەیەکی زۆر جوانیشی بۆ منداڵان هەیە. هەروەها ئاماژە بکەم کە لە بڕیارنامەی کۆتایی کۆڕی فەرهەنگی، ئەدەبی کوردنیشنەکانی ئێراندا هەر لە فێرگەی سەرەتاییە و هەتا زانکۆ زمانی کوردی بە منداڵانی کورد فێر بکرێت و بۆ ئەم کاریشە دەبێ ژێدەر و ئەو پەڕتووکانەی پێویستی بە زمانی کوردی دابنرێت و لە چاپدرێت. گۆڤاری کوردی سروە کە بە زاراوەی سۆرانی موکری لە شاری ورمێ. لە پارێزگای ئازەربایجانی

ڕۆژاوادا. لە لایەنی ناوەندی پەرەپیدانی سەلاحەدینی ئەیووبییــە بــڵاو دەکرێتــەوە و زۆر چالاکە. لەو نووسینە کوردییــانەی دەرەوەی وڵاتــیش کــە ئاکــام لێیــان هەیــە. گۆڤاری مامۆستای کوردە کە لــە وڵاتی ســووئێددا بــڵاو دەکرێتــەوە. نووســینەیەکی دیکــەیش ڕۆژنامــەی گــەل یــان ئەلــشەعبە. کــە لــە لایــەنی حیــزبی دیمــوکراتی کوردستانی عێراقە و لە وڵاتی سووریادا بە زمانی عەرەبی بــڵاو دەبێتــەوە و ژمــارەی ١٩ی ساڵی چوارەمی کە لە ئاکامین ڕۆژەکانی تەشــرینەل ئەوەڵــی ساڵــی ١٩٨٥ی زایینیدا دەرچووە. گەیشتووەتە دەستم. کە لە لایەنی میر عەبدوڕڕەحمانی کــورد و تارێکی جوان سەبارەت بە کوردەکانی پاکستانی لێــدا بــە چــاپ گەیــشتووە. ئــەم وتارە لە ئینگلیزییەو بۆ عەرەبی وەرگێڕدراوەتە و لە ڕۆژنامەی گەلدا لــە چــاپ دراوە. کە وێنەکەی دەبینین. هەروەها لــە برامــان ئاغــەی ئــەکرەم ئــەنوەرمیرزا پەنابــەری کوردی عێراقی کە لە ئیــدارەی پــەروەردە و بارهێنــانی خوراســاندا ئــیش دەکــات و ئەرکی وەرگێڕانی ئەم وتارەی بۆ سەری زمــانی فارســی گرتووەتــە ئەســتۆ. ســپاس دەکەین لە بەشێک لە ئەم وتــارەدا هــاتوو کــە کوردەکــانی پاکــستان لــە پارێزگــای بەلووچستان لە ســنوورەکانی ڕۆژهــەڵاتی ئێرانــدا لــە دەشــتی بۆڵانــدا نیــشتەجێن. دەشتی بۆڵان لە پاوی جوگرافیاییــەو گرینگایــەتی زۆرە، چۆنکــا لــە ســەری ڕێگــای توجارەتی نێوانی وڵاتەکانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســت و ولــتی هێندۆســتاندایە. شارە کوردنشینەکانی ئەم ناوچەیە بریتین لە: خۆزدار، چاڵەوان و ســارەوان و خــاران و هەروەها تاقمێکی دیکەیش لە کوردەکــانی پاکــستان لــە ناوچــەی ســێندی ئــەم وڵاتەدا. لە شاری دێرغازی خان و لە ناوچەی پەنجابیشدا لە شاری مەزەرای ڕۆجانــدا نیشتەجێن. هەندێ لە مێژوو ناسان لە ســەری ئــەم بڕوایــەن کــە ئــەم کوردانــە لــە سەردەمی ئەنەوشێروانی پاوشای ساسانیدا کۆچێندانەتە ئەم ناوچــە و فردەوســی لــە پەڕتووکی شانامەی خۆیدا چەند جار ناویکێیان هێناوەتە ڕوو وەکوو وێنە دەفەرمێت.

نشستند در آن دشت
بسیار کوچ
زاوغان ولاچيني و کُرد و
بلوچ

لە پارچە هۆنراوەی سەرەودا مەبەست لە دەشت هــەر ئــەو دەشــتی بۆڵانەیــە و

شەڕی ڕۆسەم لەگەڵی کۆک کۆهزاددا لەوێدا ڕووی‌داوە و بە پێی ژیانی برایانە و تەنیشتانەی کوردەکان و بەلووچەکان لەم ناوچەیەدا. زمانیان لە گەڕینی سەدە و سەردەمەکاندا پێکەوە تێکەڵ بووە. هەروەها کە دیمەس و مالسۆراتی دوو ڕۆژ هەڵات ناسی ئینگلیزی و نووسەرانی پەڕتووکی مێژووی بەلووچستان گومانیان کردووەو بەوەیان زانییە. کە ئەم دوو گەلە ئێرانییە بنچینەیەکی بناغەییان هەیە. لە پەڕتووکی بە ناوبانگی بەلووچ و بەلووچستان دانراوی میرگوڵ خان کە بەرهەمی بیرۆکەی فردەوسی و نووسەرانی ناوبراوە. ئاماژە کراوە کە کۆچی کوردەکانی پاکستان لە ڕۆژاوای ئێرانە و بۆ ڕۆژهەڵاتی ئێران لە سەردەمی ئەنەوشێروانی ساسانیدا ڕووی داوە و ئێستا هەندێ لەم کوردانە لە ناوچەی سیستان و بەلووچستانی ئێراندا نیشتەجێن و هەندێکی دیکەیشیان لە ناوچەی بەلووچستانی پاکستان و لە ناوچەکانی کوەیتە و کەلات و خۆزدار و تەنیشتی ڕۆخانەی گەرمەلافاودا نیشتەجێن و هەروەها برامان ئاغەی زەراعەت پێشە سەبارەت بە بەشداری کردنی من لە کۆڕێ فەرهەنگی، ئەدەبی مەهاباددا. هۆنراوێکی جوانیان هۆناوەتەوە و ناردوویانە. کە زۆر سپاسیان دەکەم و هۆنراوەکەیان لە چاپ ئەدەم:

من بسیت، کەلیم هانیی یەخەوەرەک خەش
ویی گیان‌دا، خەیکێ هەزار مالان نەخەش
گوت. راوەن، وەری کەڤن، مینا سیاوەش
گاشارەت وەن ژەخیی ئارا بی‌حیلە و عەش
ویی مزگین‌دا، برێ نەوە همت کوردستانێ
ژەوان شێرە مێرێ وە غیرەت کوردستانی
ئەز پێ راهەقالم تا وەلاتێ ماک کوردستانێ
وە بژانگان دەمالم گشتی خاکی ئێران
کورد و کورمانج دوو برا، ئەوا ناژە دێ باقەک
سامن رایر ئازیزن، ئەوانا هەر دووچاقەک
دەس وەهەڤ دەنی ئیرو، وەبراتی ژەنویان
تابێوە گرتن دیسار کورد و کورمانج وەناقەک

لێرەدا بە ئاگاداریتان دەگەینم کە برای هونەرمەندمان ئاغەی سەیید عەبدوڵڵای بەگزادە کە لە کوردە جەلالییەکانی شێروانە و لە دەستەی بە ناو بانگترین و پلە بەرزترین پلاندانەران و هێلەرانی ئێران لە ئەژمار ئەدرێن. وێنەیەکی جوانیان کێشاوە بۆ کۆڕی فەرهەنگیف ئەدەبی کرمانجی خوراسان کە دەیبینن لە ئەم وێنەیەدا کێشەکانی ئایینی و فەرهەنگی و هونەری وەکوو: مۆسیقا و عێرفان و سەر نەبوون بە ڕۆژهەلات و ڕۆژاوا و هەندێکی دیکە لە خاڵە گرینگ و جوانە فەرهەنگییەکانی لێیدا هاتووەتە ڕوو. لە کۆتاییدا لە هەمووی هاوولاتییانی خۆشەویست بە تایبەت لە خۆشکان و برایانی کوردمان داوا دەکەین. ئەگەر پێشنیاریان ڕخنەیەکیان بۆ ڕوو کردن هەیە. ئێمە لە بڕوا و بەخشەرایەتی خۆیاندا بەشدار بکەن و لەم بوارەدا یار و یارمەتیدەرمان بن.

## کوشنی

کوشنی هەر ئەوەیە کە لە فارسیدا پێی دەڵێن کوشتی. بەم جیاوازییە و کەوشە کرمانجییەکەی بنچینەدارتر و مێژوویترە. کوشنی یان گوشنی لە گوشن و گوشن بە مانای دۆخین وەرگیراوە. هەندێ کەس لە سەری ئەم بڕوایەن کە ئەم وشەی گوشنییە لەگەڵی دۆخینەکەی زەڕتوشتی بەڕێزدا پێوەندی هەیە، بەلام دەبێ ئەمەیش لەبەرچاو بگرین. پێش لەوەی کە پەیڕەوانی زەڕتوشتی بەڕێز دۆخین بۆ بەیداخ و پیشانەی دینەکەی زەڕتوشت هەڵبژێرن. گوشن کە هەر ئەو دۆخینەیە بوو و پاڵەوانەکانی پێش لە مێژوو وەکوو: سامی نەریمان و زاڵ و ڕۆسەم و گەشتاسب و... دۆخین یان گوشنیان بەستووەتەوە و زەڕتوشتی بەڕێز لە سەردەمی ژیانی گەشتاسبدا هات و دینی خۆیی ئاشکرا کرد. بەم بۆنەیەو گوشن مێژینەیەکی مێژوویتری هەیە و دەبێ لە کاتی داهێنانی جردەدا. کە لەو کاتەدا لە پێسی ئاژەڵەکان چاک دەکرا. داهاتووە مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە بە پێسی ڕێسراوی ئاژەڵەکان کە لە پاشان بە گوشن ناونرا. کەمەری خۆیانیان دەبەست. بەم بۆنەیەو مێژینەی گوشنی یان کوشنی زۆر مێژوویتر لە سەردەمی زەڕتوشتە. بەو بۆنەیەو کە پاڵەوانەکان بۆ بەرز کردنەوەی هەمبەرەکانیان لە زەوین دەستیان بردووە بۆ

گوشن «کەمەری» یەکترین. هەروەها کە لە زۆرانی کرمانجی ئەمڕۆیشدا باوە. بەم بۆنەیەو ناویان ناوتە گوشنی یان کوشنی. بێژەی وشە فارسییەکەی کوشتییە. بەوە دەزانرێ کە لە بنچینەی کوشتن وەریان گرتبێت یانێ ئەو کەسەی کە هەمبەرەکەیی خاکی دەکرد. باو بوو کە پەراسوویی دەقەڵشاند و دەییکوشت. بە هەر جۆرێک کوردەکانی خوراسان کوشنی بێژە دەکەن، نە کوشتی و مەبەست لە کوشنی هەر ئەو زۆرانە پاڵەوانییەیە. کە لە گەڕانی سەدە و سەردەمەکاندا کوردەکانی خوراسان توانیویانە ئەم کەلەپوورە فەرهەنگی و مێژووییە بپارێزن و چراکەییان هەتا ئەمڕۆ ڕاگرتووە. هەروەها کە لە ماوەی چەند ساڵی پێشوودا. ئەم زۆرانە لە خوراساندا گشتییەو بووە و وەکوو پەلی بنچینەیی وەرزشی زۆرانی پاڵەوانی ئەم مەڵبەندە بەربڵاو باو بووە و هۆگران و بینەرانێکی زۆر و خۆڕاگری هەیە. بە جۆرێک کە هۆگرانی ئەم وەرزشە بۆ دیتنی بەربەرەکانی پاڵەوانی خۆیان. چەند سەعاتی پەیسەر لە پێشی بەفر و باران و یان گەرمای سووتێنەری هاویندا لە سەری زەوین یان مەکۆی ئیستادیۆمەکاندا ڕادەوستن و بە هۆشیاری زۆرە و تەماشای دەکەن و بە قارەمانەکانی خۆیان خەڵاتی ئەدەن. کوشنی یان بە وتەی کار بە دەستانی وەرزشی خوراسان، زۆرانی پاڵەوانی بنچینە و ڕاهێڵی زۆرانی خوراسانە و لە ساڵانی ڕابردوودا لۆرەکانی ئەم زۆرانە بە پێی زۆرانگرانی ئەم ناوچە چووەتە هەمووی گۆڕەپانە وەرزشییەکانی جیهان و هەندێک لەم لۆرانە لە مێژووی زۆرانی نێونەتەوەییدا نووسرانە. نووسەر لێرەدا نایوێ زۆرتر لەمە خەریکی ڕوو کردنی مێژووی پێشکەوتن و پاراستنی ئەم جێماوە فەرهەنگییە بێت. چۆنکا پەڕتووکێکی جیاوازم بە ناوی پاڵەوانەکانی خوراسان لەم بوارەدا نووسیوە. تەنیا بە وتنی ئەم خاڵەبەس دەکەم، کە پاڵەوان ئەکبەری خوراسانی و دیکەی زۆرانگرانی بەرزەناوی خوراسان. لەم لۆرە بەربڵاوانە کەڵکیان وەرگرتووە و بە سەری ڕەقیبەکانی خۆیاندا سەرکەوتوونە. لە هەمووی سەردەمەکانی مێژوودا سەرۆکانی کوردەکانی خوراسان لە چاکترین پارێزەران و پەرەپێدەرانی ئەم زۆرانە پاڵەوانییە بوونە. چۆنکا هەر کام لە خانەکان و سەرۆکی هۆزەکان پاڵەوان و خوێنەروژەنیاری تایبەتیان بووە. کە هەموو ساڵی چەند جار لە کۆباری جێژن و زەوماوەندەکاندا لە نێوانیاندا کێبەرکێیان بەڕێوە بردووە و لە ئاکامدا لە کۆباوی نەورۆزدا. پاڵەوانی تایبەتی ئێلخانی زەعفەرانلۆ لە

نێوانی هەمووی پاڵەوانەکاندا هەڵبژێدراوە. سەرۆکانی کورد بۆ پاڵەوانەکانی خۆیان هەستێکی تایبەتیان و قەت نەیاندەویست، پاڵەوانەکەیان خاکی ببێت، یان خوێنەرەکەیان لە خوێنەرێکی دیکە ببەزێن. لە چەند ساڵی لەمەوپێشدا ئەم هەستە نەتەوەییە. لە ئاغای بێهرۆزی بەهادوری بادلانلۆدا زۆرتر لە دیکەی کەسان بەهێزتر بوو. هەروەها لە سەردەمی پێش لە نادر شای ئەفشاردا کونشی ناوچەی زۆرتریکی دەگرتە پێش و لە مەڵبەندەکانی: خارەزم و مەر و سەمەرقەندیشدا باو بووە. پاڵەوانە کوردەکان لەگەڵ پاڵەوانە تورکەکانی ئەو لایەنی سنوورەکانی ئێراندا کێبەرکێیان بەڕێوە بردووە. هەروەها کونشی و بەرزاگری و پەرەپێدانی لە نێوان کوردەکاندا زۆر گرینگ بووە و وەرزشێکی پێویست بووە. چۆنکا دەبوا لاوەکان ب پاراستنی سنوورەکان ئێران خۆیانیان بەهێز و ئامادە دەکرد. کە لە شەڕ لەگەڵی ڕەقیبە هێرشگەرەکاندا بتوانن بە سەریاندا زاڵ بن و لە گیان و ماڵ و نامووس و ئاو و خاکی خۆیان بەرەوانی بکەن. ئێستایش یۆ وێنە و ڕێز گرتن لە یادی پاڵەوانەکانی ئەم وەرزشە مێژووییە چەند لاپەڕەیەک بۆ پیشاندانی وێنەی پاڵەوانەکان تەرخان ئەدەم. هیوادارم کە ئەو ڕۆژە بێتەدی. کە بە بڵاو کردنەوەی پەڕتووکی پاڵەوانەکانی خوراسان لە شەرمەزاری برایانی دیکەی پاڵەوانی خوراسانی چ کورد و چ تورک و چ فارس بێمە دەرو خزمەتە بایخدارەکانیان لەم بوارەدا پێشکەشی خوێنەرانی خۆشەویست بکەم.

سەحرایی:

موحەممەد عەلی سەحرایی کوڕی خوالیخۆشبوو لە کوردە پاچانلۆوەکانەوە کە لە ساڵی ١٣١٩ی کۆچی هەتاویدا لە گوندی دەوڵەتخانە لە باکووری قووچان لە دایک بوو و لە تەمەنی ٣٠ ساڵیدا لە ئاکامی بەرزەناوی و بە هێزیدا لە ڕۆژی ١٣٤٩/٧/٧ی کۆچی هەتاوی لە ڕووداوی هەڵدێرانی ماشێنە فۆلۆسکەکەیدا لە ڕێگای قووچان– مەشەددا کۆچی دوایی کرد و کۆمەڵگای وەرزشی ئێران و خەڵکی خوراسانی ئازیەتبار کرد. خوالیخۆشبوو سەحراییش هەر وەکوو لاوانی دیکەی خوراسان لە کۆباوی زەماوەند و جێژنەکاندا لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆیدا زۆرانی دەگرت و بە گەشەی گەورەکانی هۆز ڕۆژ بە ڕۆژ سەرتر دەکەوت. هەتا لە کێبەرکێی کوتشی خوراسان لە ساڵی ١٣٤٤ی کۆچی هەتاوی لە کێشی قورسدا

گەیشتە پلەی قارەمانی و هەر لەو ساڵەیشدا لە پلەی دووهەمی قارەمانی ولاتدا جێگای گرت. هەروەها لە کێبەرکێیەکانی قارەمانی ولاتدا کە لە شاری کرماشاندا بە ڕێوە چوو. لە کێشی حەوتەمدا پلەی قارەمانی بە دەست هێنا و لە ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی هەتاویش بە پاش هەموو کاتێ لە ڕشتەکانی ئازاد و فەرەنگیدا لە کێشی خۆیدا پلەی قارەمانی بە دەست هێنا. هەروەها لە ساڵی ١٣٤٦ی کۆچی هەتاویدا لە کێبەرکێی جیهانی ماردل پلاتادا کە لە ولاتی ئارژانتیندا بەڕێوئە چوو بە سەری چەند ڕەقیبی بەرزەناودا وەکوو: مۆنک پاتی مەغوولستانی خاونی پلەی دووهەمی کایەکانی ئۆلەمپیکی ساڵی ١٩٦٨ی زایینی میکزیکۆ و هەروەها بە سەری فرانسیس باڵۆ قارەمانی ڕۆمانیدا زاڵ بوو و بە سەرکەوتنی بە چاوی خۆی سەرەنجی کارناسانی زۆرانی جیهانی بۆ لایەنی خۆی ڕاکێشاو هەروەها سەحرایی فۆجی گاوای قارەمانی بەرزەناوی ژاپۆنیشی خاکی کرد و لە کێبەرکێ لەگەڵی هێنگ شێنگ قارەمانی ئەمریکاییشدا مساوی کرد و لە ئاکامین زۆراندا لە لێهاتووی زۆری ڕووسی پترۆف قارەمانی بەرزەناوی بولغارستانی بەزاو بە جێگای ئەوەی کە دەبوا لە پلەی دووهەمی جیهانیدا جێگا بگرێ بە بۆنەی ئەو ماف خۆرییانەی کە کرا هێنایانە خوارە و بۆ پلەی چوارەم هەروەها سەحرایی لە کێبەرکێیەکانی تەفلیس کە لە شەورەویدا بەڕێوە چوو پلەی دووهەمی ئەو کێبەرکێیانەی بە دەست هێنا و لە کێبەرکێی ئالیامری «موحەممەد ڕەزا شا پاوشای پێشووی ئێران» تارانیشدا پلەی قارەمانی بە دەست هێنا. سەحرایی تازە لە کاتی سەرکەوتن و بە دەست هێهنانی شانازییە جیهانییەکاندا بوو کە ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە ڕووی‌دا و هاوڕێیەکانی ئازیەتبار کرد و ڕۆژنامەی کەیهان لە ژمارەی ڕۆژی پێنجشەمەی نوێ ٩ی ڕەزبەری ساڵی ١٣٤٩ی کۆچی هەتاوی خۆیدا. لەم پێوەندییەدا وەهای نووسی هەمووی ئەو کەسانەی کە سەحراییان بینیو خۆشیان دەویست نە تەنیا بە بۆنەی ئەوە کە خۆش ئەندام و بە هێز بوو، بەڵکوو بەو بۆنەیەو کە: با ئەدەب و بەخشەر و پاک سفەت و لە خۆگەڕ بوو یانێ هەمووی ئەو تایبەتمەندییانەی پاڵەوانە مێژووییەکانی ئێرانی هەبوو و بە بۆنەی ڕێز گرتن لە ئەم خووە چاکانەی خوالیخۆشبوو سەحرایی بوو. کە گەورەترین هۆڵی زۆرانی شاری مەشەد لە گردۆڵەی وەرزشی سەعداوادا بە ناوی ئەوە و ناوندا کە ئەمڕۆ ناوەندی چالاکی کۆڕی زۆران و زۆرانگرانی خوراسانە و لە مانگی جۆرەدانی

ساڵی ١٣٥٨ (هەزار و سێ سەد و پەنجا و هەشتیشدا) ئیدارەی وەرزشی شاری قووچان بە بۆنەی ڕێز گرتن لە یادی خوالیخۆشبوو سەحرایی کێبەرکێیەکانی سەحرایی بە سەر پەرشتی خوالیخۆشبوو بە وادی دایی لەم شارەدا بە ڕێوە برد. کە پاڵەوانە قووچانییەکان لەم کێبەرکێیەدا پلە قارەمانییەکانیان بە دەست هێنا و چنارانییەکانیش کە ڕەقیبی قووچانییەکان بوون. پلەکانی دووهەمیان بە دەست هێنا. با نەوترا و نەمێنێ کە ئاغەکان حەسەنی سەحرایی و عەبباسی سەحرایی براکانی خوالیخۆشبوو سەحراییش لە زۆرانگران و قارەمانەکانی خوراسانن.

**خوالیخۆشبوو موحەممەدی سەحرایی:**

لە ماوەی ١٩ دەقیقەدا پاڵەوان ئەحمەدی بەهمەنی چنارانی خاکی کرد. بە بۆنەی ئەم سەرکەوتنە تیمی قووچان پلەی یەکەم و تیمی چنارانیش پلەی دووهەمی بە دەست هێنا و لە زۆرانی پاڵەوانیشدا هەموو کاتێ پاڵەوانە کوردەکانی قووچان و چناران بۆ بە دەست هێنانی قارەمانی ڕەقیبی یەکترینن. وێنەی کۆباوی بە ڕێوە بردنی کێبەرکێ فێرگەی باڵای ئەمیر کە بیری شاری قووچان دەبینن کە ئەحمەدی وەفادار پاڵەوانی بەرزەناوی جیهان لە گۆشەی چەپە و لە پشتی تەختی داوەرییە و بینەری کێبەرکێیەکەیە.

**پاڵەوان غولامڕەزای قەشەنگ:**

غولامڕەزای قەشەنگ کوڕێ حوسێن لە کوردە ڕەشوانلۆوەکانی ناوچەی چنارانی خوراسان. لە نزیکای ساڵی ١٣١٥ی کۆچی هەتاویدا لە گوندی گەوارەشکدا لە دایک بوو. پاڵەوان غولامڕەزای قەشەنگ هەر لە سەرەتای منداڵییە و زۆر هۆگری زۆرانی پاڵەوانی بوو و لەگەڵی منداڵان و تازە لاوەکانی و تەمەنی خۆیدا لە کۆباوی جێژنی نەورۆز زەماوەندەکانی ناوچەییدا زۆرانی دەگرت، هەتا ئەو جێگایە کە لە تەمەنی جوانیدا بە سەری هەمووی ڕەقیبانی سەردەمی خۆیدا سەرکەوت لەم وێنەدا پاڵەوان غولامڕەزای قەشەنگ لە کێبەرکێیەکان قارەمانی خوراسان لە شاری شێرواندا پلەی یەکەمی بە دەست هێناوە. ئالای کێبەرکێیەکەی لە دەست دایە و کەسی دووهەمی کنیشی پاڵەوان ئەحمەدی بەهمەنی چنارانییە. پاڵەوان غولامڕەزای قەشەنگ جگە لە گۆڕەپانی زۆران لە بواری ئیخلاق و بەخشەرایەتی و دلێریشدا پاڵەوان و لە سەری زمانی خەلکەو بوو و پێشوازی و میوانداری کردنی لە

خوالیخۆشبوو پاڵەوان تەختی لە ساڵی ١٣٤٢ی کۆچی هەتاویدا. سەر سووڕی هەمووی ئەو دوژمنانەی زۆری دەرباری و ساواکی پاڵەوان تەختی دەرهێنا.

**پاڵەوان مەحموودی قەشەنگ:**

مەحموودی قەشەنگ کە ئێستا (ساڵی ڕێکەوتووی ٦٦- ٦٥) ئەرکی سەرۆکایەتی کۆڕی زۆرانی پارێزگای خوراستنی لە سەر شانە. کوڕی حوسێنی ڕەشوانلۆو برای خوالیخۆشبوو پاڵەوان غولامڕەزای قەشەنگە. لە ساڵی١٣٣٢ی کۆچی هەتاویدا لە گوندی قارەمان پەروەری گەوارەشکدا لە دایک بوو و هەر لە سەرەتای منداڵییەو بۆ ئەوەی کە بلیمەتی پاڵەوانی هەبوو. سەرەنجی براکەیی ڕاکێشا و لە ژێری چاودێری براکەیدا زۆرانی پاڵەوانی درێژەدا. مەحموود هەتا گەیشتە ڕادەی شارەزایی. لە ژێری چاودێری پاڵەوان حەمیدی تەوەکول مامۆستای زۆرانی فێرگەی خوراسان. لە زۆرانی پاڵەوانی دەستی کێشا و زۆرانی ئازادی دەست پێ کرد و هەروەها لە کنی درێژەدان بە خوێندکاری لە فێرگە باڵاکانی شاری مەشەددا ڕاهێنانی سەخت و گۆشراوەکانیشی درێژەدا بە جۆرێک لە پێنج جار لە کێبەرکێی زۆرانی فێرگەکانی وڵاتدا پلەی قارەمانی نێوانی فێرگەکانی ئێرانی بە دەست هێنا و هەروەها لە ساڵی ١٣٥٥ی کۆچی هەتاویشدا لە کێبەرکێیە قارەمانییەکانی وڵات لە شاری ڕەشت و هەروەها لە ساڵی ١٣٥٦ی کۆچی هەتاویدا لە کێبەرکێیە قارەمانییەکانی وڵات لە شاری سێرۆدا پلە قارەمانی وڵاتی بە دەست هێنا و لە کێبەرکێیەکانی ئالیامردا کە لە ساڵی ١٣٥٦ی کۆچی هەتاوی لە شاری تاراندا بە ڕێوە چوو. دیسان لە پلەی دووهەمدا جێگای گرت و جارێکیش پلەی یەکەمی بە دەست هێنا و بە سری نیکلاپترِ نیکۆف قارەمانی ڕووسیشدا سەرکەوت لەم وێنەیەدا داوەری فەرانسەوی دەستی پاڵەوان مەحموودی قەشەنگی بە نیشانەی سەرکەوتووی کێبەرکێیەکە بەرز کردووەتەوە. ئاغەی یۆری شاهمورادوف قارەمانی جیهان و سەرمورەبی زۆرانی ڕووسیا و مامۆستای زانکۆ دەبینرێت. کە لە لایەنی چەپی پاڵەوان قەشەنگە و بە شێوازی دانیشتان و پەنجەی هەڵپێکاو و پەکەرە بینەری بەزینی قارەمانی خۆی لە پاڵەوان قەشەنگە. هەروها لە کێبەرکێیەکانی نێ نەتەوەیی و دیسان لە کێبەرکێی سەرۆک کوماری ئەفغانستاندا پلەی قارەمانی نێ نەتەوەیی بە دەست هێنا و لە کێبەرکێی نێو نەتهوەیی تەفلیسیشدا کە لە وڵاتی

ڕووسیادا بە ڕیوە چوو. پلەی دووهەمی بە دەست هێنا و لە کێبەرکێی ئۆلانباتۆر لە وڵاتی مەغوولستانیشدا پلەی دووهەمی بە دەست هێنا. لە زۆرانە لە بیر ماوەکانی پاڵەوان قەشەنگ. زۆرانی لەگەڵی ئەلکساندر مایتۆف ئەندامی تیمی نەتەوەیی شەوڕەوی لە تاراندا بوو کە لێی بەزی، بەڵام لە ڕووسیادا ئەلکساندر ماتیۆفی خاکی کرد و سەرکەوتنی خۆیی ڕاگەیاند. هەروەها پاڵەوان قەشەنگ خاونی ١٣ پارچە خەڵاتی تەلا و خەلاتی نوقرەی زۆرێک لە کێبەرکێیەکانی قارەمانی زۆرانە. پاڵەوان قەشەنگ بە زۆرانی مێژووی پاڵەوانی کە یادگاری باپیرانیە هۆگرایەتی زۆرێکی هەیە و دەڵێ: هیچ کام لەو زۆرانانەی دیکە وەکوو زۆرانی پاڵەوانی ناتوانن بە سەری ڕۆح و گیانیدا زاڵ بن. چۆنکا هەمووی خاڵ و تایبەتمەندییەکانی پاڵەوانیدا کۆوە و گەورەترین و گرینگترین کەلەپووری فەرهەنگی ئێرانییەکانە. ئەو لە سەری ئەم بڕوایەیە کە زۆرانی پاڵەوانی پلان و ڕاهێلی زۆرانی خوراسان و بەڵکوو ئێرانیشە کە دەبێ زۆرتر لەبەرچاو بگیرێت و لە ڕووکاری جیهانیدا ڕوو بکرێت و لە بواتری پەرەپێدانیدا تێبکۆشرێت. پاڵەوان قەشەنگ ئەو زۆرانە خۆی لەگەڵی قوربان قولی کەریمی شەڕانلۆ پاڵەوانی قووچانی بە چاکترین و لە بیرماوترین زۆرانی پاڵەوانی دەزانێت کە چەند ساڵی پەیسەر قارەمانی گۆڕەپانەکانی زۆرانی خوراسان بوو. پاڵەوان مەحموود قەشەنگ بە سەر کەوتن بە سەری پاڵەوان قوربان قولی شەڕانلۆدا ئاکامی بەرزەناوی و سەرکەوتنی بە دەست هێنا و بە قارەمانییەکانی قوربان قولی کەریمی کۆتاییدا. هەروەها کە قوربان قولی کەریمی بە قارەمانییەکانی فەرهادی شەعبانی میلانلۆی ئەسفەراینی کۆتایی داو. پاڵەوان مەحموودی قەشەنگ کە دەروون و دیمەنێکی جوانی بوو. جوانترین و پڕ شوورترین زۆرانی پاڵەوانی ئەویش هەر وەکوو زۆرانی پاڵەوانی پاڵەوان ڕەمەزانی شوکفتەی قووچانی شەپۆلی شوور و شایی زۆرێکی لە دڵی بینەرانی زۆرانی پاڵەوانی و بینەرانی بەرنامە تەلەفزیوونییەکاندا ئەخستە ڕێگا. بە جۆرێک کە هەموویان هاودەنگ هاواریان دەکرد. قەشەنگە، قەشەنگە، قەشەنگە...

ڕۆژنامەی ڕەستاخێزی سەردەمی ڕژێمی ڕابردوویش لە دەربڕینی بڕوای خۆی سەبارەت بە حەڤدەهەمین قۆناغی کێبەرکێیە نێو نەتەوەییەکانی زۆرانی ئازاد کە لە ٧ هەتا ٩ی ڕێبەندانی ساڵ کە لە تەفلیسدا بەڕێوە چوو، سەبارەت بە پاڵەوان

قەشەنگ نووسی. یۆری شاهمورادوف مامۆستای پلە بەرزی زۆرانی یەکیەتی کۆمارەکانی شەورەوی و خاونی پلەی مامۆستایی هێژای وەرزشی شەورەوی لە وتووێژ لەگەڵی هەواڵنێری ئاژانسی هەواڵنێری و ڕۆژنامەوانی نووستیدا وتی ئەگەر لە کێبەرکێی نێو نەتەوەیی زۆرانی ئازادی تەفلیسدا. بۆ سەرکەوتوو خەلاتێک بواتا، بێ‌گومان دەبووە هی قەشەنگی ئێرانی. هەروەها ڕۆژنامەی ئاماژە پێ کراو زۆری کرد. کە پاڵهوان مەحموود قەشەنگ کە لە کێشی ٦٨ کیلۆییدا زۆران دەگرێت. بە بۆنەی ئەو سەرکەوتنە جوانەی کە لە کێبەرکێ لەگەڵ نیترای پترپینکۆ زۆرانگری لێهاتووی شەورەویدا بە دەستی هێنا. شایانی ئەم بەراوەردەی بە دەست هێنا و لێهاتووی و خۆڕاگری پاڵەوان قەشەنگ لەگەڵ دەربڕینی شور و شایی هەزاران بینەر کە لە کۆشکی وەرزشی شاری تەفلیسدا کۆ بوونەوە بەرانبەر بوو. هەروەها ڕۆژنامەی دنیای وەرزشیش لەم بارەیەو بە دێڕێکی گەورەیەو نووسی. شانۆی ئافەرین هێنەری قەشەنگ- لە کێشی ٦٨ کیلۆدا زۆرانی پاڵەوان مەحموود قەشەنگ بە ڕاستی سەرسووڕ هێنەر بوو. بەشداری کردنی بۆ بینەرانی گورجی شایی هێنەر بوو. چۆنکە شانۆیەکی پاڵەوانی بوو و بە هەڵمەتە پەیسەرەکانی خۆی وەها پێناوی لە ڕەقیبەکانی تەنگ دەکرد. کە زۆربەی کێبەرکێیەکانی خۆیی بە سێ ئیختار[...] کردنی ڕەقیبەکانی دەگەیاندە کۆتایی. هەروەها قەشەنگ لە کێبەرکێیەکانی زۆرانی خوراسانیشدا ئەرکی داوەری لە ئەستو بوو. هەروەها کە لە وێنەی ژێرەودا دەبینن لە کێبەرکێیەکانی زۆرانی پاڵەوانی گولانی ساڵی ١٣٥٨ی کۆچی هەتاویدا کە بە بونەی ڕێز گرتن لە یادی پاڵەوان تەختی پاڵەوانی ئێران و جیهان بە ماوەی سە ڕۆ[...] هۆڵی سەعدا و (تەختی هەنووکەی) شاری تاراندا بە ڕێوە چوو. لە کەلێنی لایەنی چەپی گۆڕەپانە چیمەلانییەکەدا لە سەری تەختەی لە سەردا دانیشتنەو دانیشتوو[...] و بە هۆشیارییە و زۆرانی زۆرانگرانی پاڵەوانی لە ژێری چاودێری دایە و داوەری نێوانیش ئاغی قەدیری نوخودچی قووچانی لە قارەمانەکانی زۆرانی ئێرانە. ژەنیارانی کورد دەژەنن و وەرزشگا کە هەمووی هاوار و دادە. بۆ ئەوەی کە پاڵەوا[...] مەحموودی قەشەنگ لە تایبەتمەندی پیاوەتی و دروستکاری و خووی چاکە بەخشەرایەتی بەشدارە. بەم بۆنەیە و هەمووی وەرزشکاری پێشوو و کۆمەڵگای زۆران و وەرزشی خوراسان خۆشیان دەوێ و هۆگرین و بەم بۆنەیە و ئێستا (ساڵ[...]

ڕێکەوتووی ٦٦- ١٣٦٥ی کۆچی هەتاوی) ئەرکی سەرۆکایەتی کۆڕی زۆرانی پارێزگای خوراسانی گرتووەتە ئەستۆ. ئێمەیش هیوای سەرکەوتن و بەختەوەرەی لە هەمووی بوارەکانی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیمان بۆ ئاغەی قەشەنگ و هاوڕیانی بەڕێزیان هەیە و هیوادارین بە بۆنەی هەوڵ و تێکۆشانی شەو و ڕۆژی ئەوان و تێکۆشانی ئاغەی قەرە بە ڕێوە بەری گشتی وەرزشی پارێزگای خوراساندا، خودای گەورە یارمەتییان بدات کە چرا ڕۆشنی زۆرانی خوراسان کە نزیک بوو بکوژێتەوە، زۆرتر لە ڕابردوو گڕی پێ بدەن و ئاوی ڕۆیشتوو ڕاگەڕێننەوە بۆ جۆگەلەکە و پیشان بدەن کە خوراسان مەڵبەندی ناو و ناوهێنەرانی بەرزەناوی ئێرانە و خوراسانییەکانی هاوشاری فردەوسی داواکاری زۆرێکیان لێیان هەیە. برایانی ئۆغازی- ئاغەکان دوکتور حوشمەتوڵلای ئۆغازی و نەسرەوتوڵلای ئۆغازی و قودرەتوڵلای تۆغازی کوڕەکانی خوالیخۆشبوو عەلی پاڵەوانی کوڕی حاجی مووسای پاڵەوانی زۆرتانلۆ لە هۆزی سیوکانلۆن کە پاڵەوانی لە بنەماڵەیاندا پێگەیشتنییە. ئەو زۆرانە پاڵەوانییەی خوالیخۆشبوو عەلی پاڵەوانی زۆرتانلۆ لەگەڵ عەلی موحەممەد پاڵەوانی بەرزەناوی بوانلۆ کە زەماوەندی خوالیخۆشبوو حاتەم خانی کیکانلۆ لە ناوچەی ئۆغازدا لە پێش چاوی گەورەکان و خانە سنوورییەکانی قووچاندا گرتیان و لە پێش نیوەڕۆ هەتا پاش نیوەڕۆی خایاند، هێشتا لە ناوچە سنوورییەکاندا مەتەڵە. عەلی موحەممەد پاڵەوانی بوانلۆیی کەسێکە کە هاری ئاسیاوی دەناسەری سینگیەو و لە دەوری گۆڕەپاندا دەیگەڕاند.

لە ئەم زەماوەندە خۆشەدا «بووک کچی مامی عەلی پاڵەوانی زۆر تانلۆیی بوو» زۆرانی پاڵەوانی ئەم دوو کەسەی ناوبراویش ژیانی بوو و لە ئاکامدا عەلی پاڵەوان خاکی بوو. چۆنکا عەلی موحەممەد پاڵەوانی بوانلۆیی قەت پشتی نەیدا و لە خاک و لە پاشانیش قەت خاکی نەبوو. برایانی ناوبراویش لە بابیانە و پاڵەوانییان پێ گەیشتوو و ساڵانێکی زۆر لە خوراساندا قارەمانی گۆڕەپان بوونە. ئێستایش وێنەی پاڵەوان نەسرەتی ئۆغازیان دەبینن. کە لە کێبەرکێیەکانی قارەمانی خوراسان کە لە ڕێکەوتی ٥٣/٦/٦ی کوچی هەتاوی لە شاری فەریماندا بە ڕێوە چوو. پلەی یەکەمی ە دەست هێناوە و قودرەتوڵلای برایشی لە پلەی دووهەمدا جێگای گرتووە. لە وێنەی ژێرەویشدا پاڵەوان قودرەتوڵلای ئۆغازی لە سەری سەکۆی یەکەمی کێبەرکێیەکانی زۆرانی قارەمانی تایبەت بە گوندەکانی وڵاتدا دەبینن.

## کۆچی دوایی گەورەکانی کورد

له سالّی ١٣٦٥ی کۆچی هەتاویدا چەند کەس لە هاوڕیان و هۆگرانی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کورد کۆچی دنیایان دوایيکـرد، هيـوادارين ئـەم خۆشەويـستانەی کـۆچ کردوومان لە سێبەری بەخشەرایەتی خودای گەورەدا جێگایان گرتبێـت و هـەروەها بۆ بنەماڵە و خزمان و هاوڕيانی ئەم خۆشەويـستانەی هـاوڕێ خـۆڕاگری و سـەر لـە خۆییمان لە خودای کەورەدا وایە. یەکەم کەس لەم خۆشەویـستانەی کـۆچ کـردوو، خواليخۆشبوو ئاغەی حاتەمی باجگیرانی بوو. کـە یانەکـەی پـەناگا و نەخۆشـخانە و میوانخانەی بێکەسان و هەزاران بوو لە ڕۆژی ١٣٦٥/٢/٢٩ی کۆچی هەتاويدا کـۆچی دوایـی کـرد و هاوڕيـانی ئازیـەتبار کـرد. کۆبـاوی پرسەکەیـشی لـە گرینگتـرین و خۆشترین پرسەکان بوو کە لـە ئاکامدابـە کـۆڕی هـۆنراو و هۆنـەری بـە زمانـەکانی کوردی و فارسی و تورکی گۆڕدرا. یەکێکی دیکە لەو چەند گەورەیـە خواليخۆشـبوو غولام حوسێنی ڕەحیمیان پیاوی گەورە و ڕامیاری بەرزەناو بوو. کە نەوتێ ئێران بـە پێی خالـە یاسـای ئـەوان نەتەوەییـەو بـوو. و لـە هاوڕیـان و هاوکـارانی وەفـاداری خواليخۆشبوو دوکتور موسەدق بوو و ئەو بەڵگەیە کە ئەوان پەیـدایان کـرد. بـوو بـە هۆی سەرکەوتنی دوکتور موسەدق لە دیوانی لاهـەدا و لـەم دادگەیـە مـافی ئێـران پارێزرا. خواليخۆشبوو ڕەحیمیان کە لە نێوانی کوێ خەڵکەو هەستا و سـالانێکی زۆر لەگەڵی دەوڵەتە دەست نوێنراوەکانی شای گـۆڕ بـە گـۆڕدا بەربـەرەکانی کـرد، لـە کوردە کیکانلۆوەکانی خوراسان بوو کە لە هاوینی سالـی ١٣٦٥ی کـۆچی هەتاویـدا کۆچی دوایی کرد. لـە دیکـەی کـۆچ کردووەکـان خواليخۆشـبوو غـولام حوسـێنی بافکری باجگیرانی بوو کە لـە خـەرمانانی سالـی ١٣٦٥ی کـۆچی هەتاویـدا کـۆچی دوایی کـرد و هـەروەها خواليخۆشـبوو موحەممـەد خـانی کـەیوانلۆنژاد لـە بـەرەی ئێلبەگی کوردی ڕادەکانیش لە خەرمانانی سالی ١٣٦٤ی کـۆچی هەتاویـدا کـۆچی دوایـی کـرد و هـەروەها کـۆچی دوایـی خواليخۆشـبوو مامۆسـتا هـێمن هۆنـەری بەرزەناوی کورد و کۆچی دوایی خواليخۆشـبوو مـەلا ئیدریـسی بـارزانی سـکرتێدی حێزبی دێموکراتی کوردستانی عێراق لە ڕووداوە دڵتەزێنەکانی سالـی ٦٥ی کـۆچی

هەتاوی بوو. هەروەها برای کۆچ کردوومان ئاغەی موختاری شـەرەفپووری بوانلـۆیی لە هاوڕیانی فەرهەنگیمان لە شاری بجنۆردیش لە مانگی خاکە لێـوەی ساڵـی ٦٦ی کۆچی هەتاویدا کوچی دوایی کرد. خودایان لێ خۆش بێت. هەروەها خوالیخۆشـبوو بەهمەنی قەراچورلۆیش کەباب و باپیرانی هەموو لە پارێزەرانی سنووری ئێران بوونـە و لە ساڵی ١٣٠٥ی کۆچی هەتاویدا. لە شاری بجنـۆرددا لـە دایـک بـوو. لـە ڕۆژی ٢٦ی نوێ ساڵی ٦٥ی کۆچی هەتاویدا بە بۆنەی ڕاوەسـتانی قـەلبی کـۆچی دوایـی کرد و خەڵکی بجنۆردی ئازیەتبار کرد و بە پێشوازی تـەرمێکی بەرچاوێکـە و نێـژرا. خوالیخۆشبوو بەهمەنی قەراچورلۆ لە خزمەتکارانی ڕاستەقینەی خەڵکی بجنۆرد بوو و براماں ئاغەی کیانی ڕەبانی دێرانلۆیی لە هۆنەرانی بـەرزەناوی شـاری بجنـۆرد لـە ئازیەتی ئەم خوالیخۆشـبوویەدا پارچـە هـۆنراوێکی هۆنیوەتـەوەو ناردوویانـە کـە بـە دەستنووسی جوانیان لەگەڵی وێنەی خوالیخۆشبوو بەهمەنی قەراچورلۆدا دەیبینن.

## کرمانج لە گۆڕەپانی شەڕدا

کوردەکانی خوراسـانیش هـەر وەکـوو هاوولاتیـانی دیکـەیان هـەر لـە ڕۆژانی سەرەتای دەست پێ کردنی شـەڕی ئێـران و عێـراق کـە بـە دەسـتووری کوێخـا و ستەمکارانی جیهانی ڕووی‌دا. لە هێڵی بەرینی شـەڕدا بەشـدارییان بـووە. هـەروەها بەشداری چالاکانەی هێزی ٧٧ی سەرکەوتوو خوراسان، بە تایبەت هێـزی ڕاپـەڕەی قووچان کە زۆربەی سەرپەلان و سەرلەکان و سەربازەکانی کرمانجن، لە شـەڕەکانی خووزستان و وەرگرتنەوەی خوڕڕەمشار و ڕاگەڕاننەوەی ئەم مەڵبەندە زێر هێنەرە لە دەستی دوژمنی خوێنڕێژ بۆ هەمووی کار بە دەسـتان و ئاگایـان ئاشـکرایە. دەڵـێن شەڕی هێزی قووچان لە ئەم کاتە لە شەڕە خوێناوی و ئازایەتی هێنەرەکانـدا. وەهـا سەر سووڕ هێنەر بوو کـە چـەمران سـەری سـووڕ مـاو و بـە سـەرلەک کەهتـەری سەرپەلی هێزی قووچانی وتوو، ئەمانـەت لـە کـوێ هینـاوە؟ هـەروەها کوردەکـانی خوراسـان لـە پـشتی گۆڕەپـانی شەڕیـشەو بەشـدارییێکی چالاکانـەیان بـووە و بـە پێشکەش کردنی کەل و پەلی پێویست لە یامەتی‌دانی برایانی ڕەزمەریاندا. لە هـیچ هەوڵ و تێکۆشانێک کۆتاییان نەکردووە و ناکەن. هەروەها بۆمب بارانی وەحـشیانەی

شار و گوندەکانی ئێران بە دەستی سەددامی خوێنڕێژەوەها خەڵکی ئێمەی ئاڵۆز کرد و خستە سەری بیری ماف ستاندنەوەو خستیانیە ڕێگا بۆ گۆڕەپانی شەڕ. کە دوژمنی خوێنخۆر خۆیشی لە تاوانی ڕامیاری و چەکداری خوێ تێگەیشت و لە وەها جەنابەتێک دەستی ڕاگرت. هەروەها دێمە کوردەکانی خوراسان لە کن بە تاوان زایینی خوێنڕێژییەکانی سەددام. سەرەنجی ڕێکخراو نێونەتەوەییەکانی بەرگری لە مافی مرۆڤ بووە حشیگەرییەکانی ئەم شێتە زنجیرییە ڕادەکێشین. کوردەکانی خوراسان شەهیدی زۆریان داوە و هیچ گوندێک نیە. کە چەند شەهیدی نەبێت و هەندی گوند وەکوو لاین و نۆدەی بجنۆرد هەرکامیان زۆرتر لە بیست شەهیدیان داوە و گیانبەختکار و بێ سەر شوێنیشمان هەیە، بەڵام دیلمان زۆر کەم هەیە. ژمێری دیلەکانی کرمانجی خوراسان لە ژمێری ئەنگوستانی دەست زۆرتر نیە و ئەم مەبەستە هێزی شەڕایەتی کوردەکان و دیل نەبوونیان بە دوژمن دەگەینێت. ئێستا کە خەڵک وێنەی هەندێ لە شەهیدانی شەڕی ئێران و عێراقیان ناردووە بۆم، بە بۆنەی ڕێز گرتن لە یاد و بیرەوەری خۆشەویستەکانیان لە چاپ ئەدەم و پەڕتووکەکە بە ناو و یادی ئەم خوشەویستمە خوێناوییانە بە کۆتایی دەگەینم.

## شەهید کەلاتەیی نوێنەری هەژاری بجنۆرد

شەهید موحەممەدی کەلاتەیی کرێکاری هەژار و ڕاستوێژ و دلێنەر بە پشتیوانی گشتی خەڵکی بجنۆرد. ڕۆیشتە ڕاوێژگەی ئیسلامی ئێران. دەبێ شەهید کەلاتەیی‌یەکە نوێنەرێک بێت. کە خەڵکی بجنۆرد بە شوور و خۆشییە و متمانەیان داوە پێ و لە کرێکاری لە کوورەی ئاجۆڕەو ڕۆیشت بۆ نوێنەرایەتی پارلەمان و خەڵکی بجنۆرد شاناز بوون کە چاکترین نوێنەریان هەڵبژاردووە. شەهید کەلاتەیی ڕۆیشت و ژن و منداڵەکەی لەمەی کە خۆشەویستی خەڵکن. شاناز بوون منی نووسەریش لە کۆتایی ڕێبەندانی ساڵی ١٣٦٤ کۆچی هەتاویدا. بە داخوازی ڕێکخراوەی کۆچەرایەتی ئێران. کە لە لایەنی سەرۆک کۆمارە و لە تاراندا بە ماوەی سێ ڕۆژ لە ڕێکەوتی ٣٠ی ڕێبەندان هەتا کۆتایی ڕۆژی دووهەمی ڕەشەمە بە ڕێوە چوو. وەکوو کارناسی کۆچەرایەتی خوراسان لەگەڵ ئاغەی دوکتور پاپلی و ئاغەی

وەحدەتی سەرپەرشتی ناوەندی کۆچەرایەتی خوراساندا. ڕێکەوتین بۆ تاران. لە پاش کۆتایی هاتن بە کۆڕەکە بەیانی ڕۆژی هەینی دووهەمی ڕەشەمە کە ئەمانویست ڕاگرپینەوە بۆ خوراسان، لە ڕادوێیە و هەواڵێکی دڵتەزێن بڵاو کرایەوە. بریتی لەمەی کە ڕژیمی بەعسی عەرەبی عێراق فڕۆکەیەکی مسافیر بەری ئێرانی لە ناوچەی خووزستاندا تەقاندووەتەوە. کە تاقمێک لە نوێنەرانی پارلەمان و شەهید کەلاتەیش لە دانیشتوانی ئەو فڕۆکەیە بوون و ئێمەیش لە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر خەمبار و پەکەر بووین و هەروەها تەرمەکەی شەهید کەلاتەیی بە پێشوازی پڕ شوور و ئازیەتبارانەی خەڵکی بجنۆرد کە ژن و پیاو و منداڵ و دارا و هەژار لێیدا بەشدارییان کرد بە خاک نێژرا. هەروەها لە نامەیەکدا کە برامان ئاغەی عەلی ڕەحمەتی بە هاوکاری برایانمان ئاغەکان: موحەممەد ئیبراییمی کەلاتەیی و ڕەجەب عەلی نەیری و غولامڕەزای عێفەتی و قوربان موحەممەدی جەعفەری و قدرەتوڵلای ئەمانی و مەحموودی ڕەشیدی پێکەوە نووسییانە و ناردوویانە بۆ منی نووسەر. وتوویانە. گوندێ کەلاتەیی لە دایک بووی ساڵی ۱۳۳۱ی کۆچی هەتاوی کوڕی ئیبراییمە. دانیشتوانی ئەم گوندە لە کوردەکانی زەعفەرانلۆن کە لە ناوچەی شادلۆدا نیشتەجێن و هەتای ئێستا سێ شەهیدیان پێشکەشی شۆڕشی ئیسلامی کردووە. کە ناوەکانیان بریتین لە:

١- شەهید موحەممەدی گەلاتەیی نوێنەری جاری دووهەمی ڕاوێژگی ئیسلامی

٢- شەهید حەمیدی نەیری

٣- شەهید سوڵتان ڕەزای عێفەتی و هەروەها دەبێ ئاماژە بکەم. کە زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە زۆرانگر و پاڵەوان و تێکۆشەرن و هەروەها شەهید کەلاتەییش لە زۆرانگرانی چالاکی بجنۆرد بوو.

تا ئەو کاتە جەجوو کە ناوی تازە کەوتبووە سەرزاران نەهاتبوو بۆ کەلات و لاین و کەس بە باشی لەو ناوچە نەیدەناسی، لەم سەر و بەندەدا هەواڵیان هێنا کە جەجوو لەکانی موراد (کانی موراد لە پشتی زیارەتگای هەزامەسجدە) کەوتۆتە ڕێ و ڕوو بە خێوەتەکانی ئێمە دێت، بابم نوور وێردیخان لەگەڵ حاج عەلی تا بەیانی پاسەوانی خێوەتەکانیان‌دا تاڵە ئەگەری زیان پێگەیشتن لەلایەنی سوارانی جەجوو بیانپارێزن.

بەڵام جەجوو ڕۆیشتبوو بۆ خێوەتەکانی کەربەلایی سوڵتان کوڕی حەمەعەلی سۆفیانلوو و لەوێ حەسابووەوە. کاتێک هەواڵی کوشتنی جەجوو گەیشتنە لاین ئەم سترانە کەوتە سەرزاری خەڵکی ناوچەکە:

جەجوو خان، جەجوو خان

دوشمەن ژەتە هەراسانو

لە دلێ تەما ئەرمانو

قەواڵەیەک کە نیشاندەری کڕینی پارچەیەک زەوینە لە لایەن کەریمخان دوایین ئیلبەگی ڕەشوانلوو لە حسێن قولی تاریخچی دانیشتووی حەڵوا چشمە، لەم قەواڵە دەردەکەوێت کە کوردەکانی فیرووزە دوای داگیرکردنی ئەوێ لەلایەن ڕووسەکانەوە لە قووشخانە نیشتەجێ بوونە، ژمارەیەک لە قەتلیش و دەستەیەک لە یەنگی قەلعە (قەڵای نوێ). ئەم پارچە زەوینە ئاوییە لە زەوینەکانی یەنگی قەلهەیە. کە حدوود بەم جۆرەیە: لای ڕۆژهەلات زەوینی غولامڕەزا سەباغ، مولکی چولانلووەکان لە ڕۆژئاوادایە، لە باشوورەوە دەگەیتە مەمەر عام (شاڕێگە) لە باکوورەوە دەگەیێتە وینی ڕووستەم فیررۆزەیی کە بە نرخی ٢٩ تمەن ئەحمەدشاهی لەوانەیە لە ساڵی ١٣٣٠ کۆچی مانگی سەندرابێت. لە مۆرە سەرەنجڕاکێشەکانی پەراوێزی قەواڵە کە مۆرێکە کە بە زمانی فارسی و ڕووس لە سەری نووسراوە. فارسیەکەی قوربان دوکتور نووسراوە کە ئەمە دەگەینێت لە قووشخانەیەک کە لە نزیکی سنوورەوە بووە. دوکتۆرێکی نیوە ڕووسی تێدا بووە.

لە چەپەوە: سەرتیپ عەزیزوڵڵا شادلوو (سەردار موعەزەزی دوایی)،
حەبیبوڵڵاخان شادلوو (کوڕەکانی دیار موحەممەدخانی سەهاموددە)

موسی ز را وکا نلود رکنا رپرج را د کا ن
٨/٨، ٦٥

مسابقات بین تیم جوانان امریکا و تیم جوانان قوچان
پیروزی عباس‌صحرائی‌باچیانلو ( برادر مرحوم محمدعلی صحرائی ) باعث پیروزی تیم‌قوچان

رمضان‌خان سرتیپ
نایب‌الحکومه

موقع سفر اول مظفرالدین‌شاه بروسیه و فرنگ
نشسته : مظفرالدین‌شاه
ایستاده : ۱- امین‌السلطان اتابک صدراعظم ۲- میرزا رضاخان(پرنس‌ارفع)
۳- وزیرمختار ایران ژنرال روس مهماندارشاه

۱- مصرخان میلانلو حاکم جربستان معروف به پیران ویسه
۲- شناخته نشد ۳- محمد ابراهیم خان روشنی ۴- آقا یار
محمد پسر عموی روشنی

از چپ: ۱ـ شیخ حسین مصباح ۲ـ سید ابراهیم پیشنماز
۳ـ شیخ علی محب سراجی ۴ـ شیخ باقر ۵ـ میرزا لطف الله
۶ـ مرحوم آیت الله نجفی روحانی معروف قوچان ۷ـ هاشمی نژاد
۸ـ شیخ ابراهیم برادر شیخ اسدالله پیشنماز ۹ـ حاج شیخ گلمحمد
۱۰ـ شیخ عبدالله اردغانی بقیه شناخته نشدند.
در عکاسی قهرمان قوچان ناسمی ۱۳۴۷ قمری برداشته شده است.

عثمانی
(ترکیه)
گلستان
باکو
تبریز
ترکمانچای
تهران
گرگان
مشهد
خراسان
کرمانشاه
کاشان
اصفهان
یزد
شیراز
بندرعباس
بیرجند
هرات
افغانستان
بخارا
پایتخت
شهرها
معاهدات
مرز ایران در اول دورهٔ قاجار
مرز ایران در آخر دورهٔ قاجار
مرز منطقهٔ نفوذ انگلیس در ۱۹۵۷
مرز منطقهٔ نفوذ روس در ۱۹۵۷

یکی از سه مرخ کهنه اوغاز با هزاران سال طول عمر

١- حسینقلی خان قراچورلو

٢- دکترمحسن خان پدرسپهبدرضا زاهدی (( پسر عموی

حاج رحمان بگ لاینی از
اولاد ذوالفقار شیخوانلو

شکنجه اسرای ایرانی بوسیله ترکمانان در خیوه و بخارا

( ادونوان ) افسر ومأمور زیردست انگلیسی در لباس ترکمنی

محمد علیشاه قاجار

١ ٢ ٣

١ـدردی خان رئیس ایل گوگلان ٢ـآرازخان لوهوندری ٣ـگلدی بای تکه .
عکس در تکه لـه قوز بجنورد گرفته شده ـ سال ١٣٢٨ ـ هردو عکس از آلبوم
آقای خانلرخان قراچورلو

عین الدوله به آصف الدوله نوشت:
اگر مردم فرزندان خود را هم بفروشند، مالیات را باید بپردازند!

وطن
۱۳۲۳

سید حسن تقی زاده از وکلایی کەبرای
اسرای کرد فعالیت چشمگیر داشت

۱ـ امیر قلی خان سرهنگ ۲ـ یساولباشی ۳ـ شجاع الدوله (عبدالرضاخان)
۴ـ صولت نظام ۵ـ غلامحسین ایشیک آغاسی ۶ـ محمد عظیم خان شجاع
نظام هراتی ۷ـ هژبرالملک قلیچی ۸ـ جلال دیوان افشار (محمدرضا)

قارا فاطمة احدى نساء الاكراد على فرسها وحولها رجالها

خنجروشمشیروباروت دان
مرحوم فتح الملک جلایر

یحیی خان پسر اللهیارخان
نفر سمت چپ در دربار افغانستان

منصورالملک با ریش سفید، شاهزاده نیر همایون
رئیس تلگراف درگز، ایستاده مامور نظمیه
۱ ـ خاوران گوهر ناشناخته ایران ـ قاسمی ص ۲۳۲

دولت علیه ایران
The Imperial Persian Government

نسخهٔ اول — Official Cash Receipt No. ٥٢٠٢٣

Ministre of
Administration of — Service of
Province of — District of
Due by
for period from — to — ۱۳۰۹

Kind of tax

| Amount Kra. / مبلغ | Items / شرح | |
|---|---|---|
| ٤٤٠ | [illegible] ۱۳۰۹ [illegible] | |
| ۱۱٠ | [illegible] | |

جوراب نقش دولخانی،
کارفاطمه‌سعادتمندا وغازی

چاروخ دوزی قوچان ـ استادبخشنده

دوزندگی چهارفصل لباس‌های زیبای کرمانجی

پوستین دوزی قوچان

عروسی چا درنشینا ن کرما نج

تیرزنان هنرمند کلاوستا و لاین با لباس دستباف زیبای خودشان

ای غزال جنگلهای گلستان، ای مرال نازنین، ای گل رنگارنگ هزار مسجد و شاهجهان، ای برف سپید آلاداغ
ای چشمه سرد و زلال آرموتلی، ای بلبل خوشخوان، ای مرخ و سرو سرافراز گولیل و زیلان، ای صخره ی سرسخت
تپه دو چنگ و کیسمار، ای دژ تسخیرناپذیر کلات و دمدم، ای مظهر صبر و قناعت، ای
سرمشق شرافت و متانت، ای عصاره ی شجاعت و عزت نفس، ای ونوس
کوهساران، ای الاهه ی زیبائی، ای خداوندگار مهر و هنر، من به تو و هنر تو و صفات
نیک تو میبالم و هر بار که به لباس زیبای رنگارنگ اصیل تو می نگرم که پنجهزار سال
تاریخ نیاکانم را مجسم میسازد، از شادی و غرور سر از پا نمی شناسم و اطمینان می یابم که
تا فرهنگ نیاکان خویش را از یاد نبرده و همچون من و برخی دیگر بی قید و بند نگشته و
از کوشش نایستاده و کورکورانه از دیگران پیروی نکرده ای، میتوانی مادری شایسته
و نمونه باشی و فرزندان برومند و چو گونه ای از برای پاسداری مرز و بوم ایران زمین

بپروری و نسل دلاور و بلخشور کورمانج را از وابستگی و نابودی برهانی و ...   خواهرم فراموش مکن، روزی که پشت پا به فرهنگ
نیاکان بزنی و زبان و لباس زیبای خود را نسنجیده و به تقلید از دیگران تغییر دهی دیگر مرا با تو هیچ پیوند و خویشاوندی نیست و امیدوارم چنین نشود. برادر کورمانج تو کلیم

عمارت امیریه بجنورد ـ از بناهای یار محمد خان

یار محمد خان و رجال بجنورد

پشت سر یار محمدخان پسرش سلیمان خان ایستاده، پسران دیگرش عزیزالله خان و حبیب الله خان در سمت چپ

عکس سعادتقلی خان قبادی مربوط بەسال ۱۳۰۶ خورشیدی که در عشق آباد گرفته است. سیگاری که در دست دارد علامت رمز است.

عکس‌هایی از بریده‌جراید کردی

چهره‌هایی از کردهای رادکان و چناران

۱ـ حاج اسماعیل سیوکانلو رادکانی ۲ـ علی اصغر جافکانلو، رادکان

آقای حیدرخان شیخکانلو و پدر و همسرش، آماده برای خوردن گوشت کبک

برای کلیم الله توحّدی

باسلام شما برادر ارجمند کلیم الله توحّدی

کتاب ارزنده شما جلد دوم حرکت تاریخی کرد به خراسان را مطالعه نمودم و از زحمات
ایثارگرانه شما که یقیناً متحمل زحمات فراوان شده اید برای جمع آوری این مجموعه نفیس
و این امر مهم که باعث زنده نگهداشتن فرهنگ کردی است که متاسفانه در پی
سالیان سال بفراموشی سپرده میشد. شما با زحمات بیش از حد خود باعث شکوفائی
این فرهنگ شده اید و ادامه میدهید از زحمات گذشته شما برادر دانشمند تشکر میکنم
و موفقیت آینده شما را از خداوند متعال خواهانم، والسلام. سید عبدالله بیگ زاده

۱۳٦٩/۳/۱۲

زچپ: آقای قرنی زاده امام جمعه مهاباد و شعرا و روحانیون کرد

ازراست: آقای تهرانی زاده ـ آقای دکتر توکلی ـ آقایان صالحی ـ
ایلخانی زاده ـ دکتر ابراهیمی ـ ماموستا حقیقی ـ آقای فدائی شاعر
آقای دکتر فریدون جنیدی ـ حجت الاسلام محمدی ـ استاد صدیق صفی‌زاده
توحدی .

قوچان :
نفر وسط مثل بدست، مرحوم مجتبی هاشمی
سمت راست ، مرحوم مدرس زاده
سمت چپ ، مرحوم عدل بدرآقای حاج احمد پهلوانی

مسابقات کشتی چوخه خراسان - ۵۳/۶/۶ درقوچان
مقام اول نصرت الله اوغازی - مقام دوم قدرت الله اوغازی

از راست: آقایان پرویز جبانی، سیرانی زاده، موحدی، جلالی نظامی، عبدالسلام برهانی باسملو

«دعوت»

بسم الله الرحمن الرحیم

# بمناسبت هشتمین سالگرد

## رهبر مجاهد مسلمان کرد عراق ـ

# ملا مصطفی بارزانی

## و چلمین روز

## رهبر مجاهد مسلمان کرد (عراق)

# ادریس بارزانی

که این دو تا مجاهد مسلمان کرد عراق ـ ملامصطفی بارزانی و ادریس بارزانی تمام عمر خود را در راه اسلام و حق و آزادی برای ملت عراق بخصوص ملت کرد سپری نموده همیشه در سنگر حق علیه رژیمهای ستمگر منطقه بخصوص رژیم بعث عراق جنگیده و بارزانی و فرزندش یار مستضعفین و خار چشم دشمنان ـ و هشتمین سالگرد ملامصطفی بارزانی و چهلمین فرزندش ادریس بارزانی نوری چشم ملت کرد را گرامی میداریم بهمین مناسبت مجلس یاد بود در روز پنجشنبه (۲۱/۱۲/۱۳۶۵) از ساعت (۸) صبح الی ۱۲ از ۲ الی (۴) بعد از ظهر بمدت یکروز

**(در مسجد جعفری)**

واقع در خیابان توحید جنب کوچه اردی منعقد میباشد متمنی است با تشریف فرمائی خود روح آن (۲) مرحوم را شاد و تسلی خاطر بازماندگان را فراهم آورید

**لذا از عموم اهالی مشهد و طبقه روحانیت و کلیه بازاریان وفرهنگیان و کارمندان و کارگران و سایر دوستان و آشنایان بخصوص ملت کرد عراق مقیم استان خراسان و حومه دعوت میشود در این مراسم شرکت و با قرائت فاتحه روح آن مرحومانرا شاد فرمائید**

**از طرف پناهندگان کردهای عراق مقیم استان (خراسان) (ر)**

## محمود قشنگ بحقش میرسد

فدراسیون کشتی سرانجام پس از گذشت ۲ سال و اندی قبول کرد که درمورد محمود قشنگ کشتی گیر خراسانی درمسابقه های نهمین دوره جام آریامهر دچار اشتباه شده و مدال طلای مسلم اورا به حاج احمدی داده است.

جریان این واقعه ازاین قرار بود که عبداله حاج احمدی و قدیر بیکف روسی‌برسر تصاحب مدال طلای ۶۸ کیلو مبارزه داشتند که براثر یک واقعه که ناشی از گاز گرفتن بود، اوراز‌پیروزی ضربه فنی قهرمان روسی بی تفاوت گذشت و کشتی گیر روسی به این خاطر از ادامه مسابقه سرباز زد و به این ترتیب حاج احمدی پیروز اعلام شد.

این درشرائطی بود که قدیر بیکف بخاطر نقض مقررات از جدول حذف شده بود. بواسطه اینکه قشنگ فاتح حاج احمدی درجدول حضور داشت بطور طبیعی بمقام قهرمانی میرسید. ولی بجهت اینکه داوران آن مسابقه دراوراق داوری نتیجه را پیروزی ضربه فنی و باخت ضربه فنی به ثبت رسانده بودند اشتباه فوق موجب گردید و جدول نویس که ناظر مبارزات و حوادث روی داده درتشک نبود طبق جدول حاج احمدی را قهرمان معرفی کرده بود. درحالیکه وقتی کشتی گیر روسی از جدول حذف میشود بجهت پیروزی قشنگ برحاج احمدی مدال طلا حق قشنگ بود.

بهرحال فدراسیون کشتی قول داده که بزودی مدل طلا و حکم قهرمانی او را به مشهد بفرستند و بیش از این موجب گلایه قشنگ نگردند.

مسابقات کشتی کردان شیخکانلو جناران ، کردهای شیخکانلو ، سال جدید نوبو می‌بندند .

کشتی حسن‌خان شیخکانلو با امیرخدائی در استادیوم سعدآباد مشهد ، سال ۱۳۶۳ که حسن‌خان به مقام قهرمانی این دوره رسید .

پهلوان شیخکانلو سوار بر اسب جایزه‌ی مسابقات در مقابل استقبال کنندگان

واینهم دوعکس از مسابقات آموزشگاهی استان خراسان ـ درشهرستان طبس بهار سال ۱۳۵۵ ـ رسم اعزامی دختران و پسران نوجوان در دو عکس مشاهده میشود.

**هو الحی‌الذی لایموت**

درگذشت تاثرانگیز آقای غلامحسین رحیمیان نماینده اسبق مردم قوچان و گرامی فرزند خراسان را به خانواده آنمرحوم تسلیت گفته شادی روح آن بزرگمرد راازخدای بزرگ خواهانیم.

**مشهد** : خانواده‌های نجفی قوچانی - روشنی زعفرانلو - سیدعلی میرنیا - مهندس کریمزاده رشوانلو - حاج ذوالفقار جلایر - غلامرضا محمدی باجگیران - قاسم علی قدیمی - مختار زراعت‌پیشه بیچراناو و کلیم‌الله‌توحدی کیکانلو.

روژ روزنامه اطلاعات ۳۰/تیر/۶۵

شهید کلاته ای نماینده بجنورد

ملاحظه بفرمائید (درصفحه ۵۶۶)

**خانواده محترم کیوانلونژاد**

درگذشت مرحوم مغفور محمدخان کیوانلونژاد (بزرگ خاندان) را بههمسر وفرزندان وبرادرگرامی وفامیل وابسته مجددا تسلیت عرض نموده بقای عمر برای بازماندگان آرزومندیم ضمنا بهمین مناسبت مجلس یادبودی امروز صبح وعصر ازساعت ۸ الی۱۱ و۳الی۵ بعدازظهر درمسجدالنبی واقع درخیابان کوهسنگی منعقد است تشریف فرمائی دوستان وآشنایان موجب شادی روح آنمرحوم و تسلی بازماندگان خواهدبود.

خانوادههای نعل‌نور، ازدری، طیلاقی، ایلبیگی، اربابی، خندان.

**روزنامه خراسان ۷/شهریور/۶۴**

**عمهجان عزیز فاطمه خانم ودائی وپسرهای دائی ودخترهای دائی عزیزمان**

فوت جناب‌آقای محمدخان کیوانلونژاد را صمیمانه تسلیت می‌گوئیم .

ش ٤٤٣٠

ازسوئد ـ نادر ونازی

دو ۱۲۱

**هوالحی الذی لایموت**

با نهایت تاثر وتاسف درگذشت عارف عالی مقدار و سالک بزرگوار عالم و عارف ربانی حضرت استاد عبدالغفور ابوالحسنزاده مقدم قوچانی درویش ناصرعلی، رضوان‌الله علیه شیخ جلیل سلسله علیه نعمت‌اللهی رضوی اثنی عشریه را به اطلاع برادران و خواهران ایمانی و اخلاء روحانی می‌رسانند بهمین مناسبت مجلس ترحیمی از ساعت ۲ بعدازظهر روز دوشنبه ۲۲ر٤ر٦٦ تا ٦ بعدازظهر روز سه‌شنبه ۲۳ر٤ر٦٦ درمسجد آذربایجانی‌های قوچان منعقد می‌باشد .

فقرای نعمت‌اللهی قوچان

در سوگ بهمن قهرمانلو

تا دمی بی جان گشت جسم بی قرار بهمنم
آسمان از غم گریست بر جان زار بهمنم

سایه افکند بر وجودش مرگ ناباوری
این چه دردی بود خدایا شد دچار بهمنم

رفته بود از بهر صید و شد اجل صیاد او
کاش بودم می نمودم جان نثار بهمنم

بهمن آن تنها امیدم رفت و اندر سوگ او
من نه تنها خطه‌ای شد سوگوار بهمنم

شهره شهری بُد اندر مردی و مردانگی
من بخود می بالم از این افتخار بهمنم

نغمه خوانان خسرو ما را چو نور دیده بود
چشم نابینای اوست در انتظار بهمنم

لیلا رضازادلو

